## گوندێ شەریفا

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** چیایێ مەتینا و هێسی و چارچەلن.

**باشووری،** گوندێ بێبادێ یە.

**رۆژهەلاتی،** ئامێدیێ و گەلیێ مزیرکانە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بۆتیایە.

ل دووڤ گۆتنێن خەلکێ گوندی ناڤێ گوندی ژ ناڤێ کەسەکی هاتییە دگۆتنێ (شەریف) ژبلی کو خەلکێ گوندی هەمی سەیدن[٨٦]. یاسین ئەلعومەری ئاڤریەکێ ل چەرخێ سێزدێ مشەختی/ نوزدێ زایینی ددەتێ، دبێژیت: شەرەفان ناڤێ ئەشیرەتەکێ یە، وان گەلەك گوند یێن هەین، وان تویتنەکا ناڤدار ب (شەرەفان) یا هەی[٨٧]. ژبەر ڤێ چەندێ نەدوورە ناڤێ شەریفا ب ئەشیرەتا شەرەفانیڤە یا گرێدای بیت.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

**کانیك بوون ژوان،** قولتەبین کو کۆمەکا ئاڤێ یا بچویك بوو، سەرسرکێ دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی، کانییا رمێش ئاڤا وێ یا تەزی بوو لڤان داوییا کربوو بۆری، کانییا بیستانێ سەید حەموی، کانییا برکا وارا دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی، کانییا بن گویزا، ئاڤا بیرا، بەلێ ل سالا (١٩٧٠)ێ ئاڤ ب بۆرییا ژ چیایی (کێری) ئینابوو عمبارەکێ ل گوندی، درێژییا وان بۆرییا نێزیکی (٣کم) بوو.

### پێکهاتا گوندی:

سێ بنەمالێن سەریشك ل گوندی هەنە، ئەو ژی: مالا قەسری، مالا رەشێ، مالا رەجەبی.

کۆمەکا جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەنە، ژ وان: گەلیێ مەزن، گەلیێ ئاستەنگێ، شکەڤتا خال بەکری دکەڤیتە نێزیك گەلیێ مزیرکا، شکەفتا مریا، شکەفتا رەش، شکەفتا حێسیلکێ، شکەفتا حاجی رەشکێ.

مزگەفتەکا دیرۆکی ل گوندی هەیە، نها ژی کاڤلێن وێ یێن ماین، خەلك دبێژیت کو ئەو هوستایێ ئەڤ مزگەفتە ئاڤاکری، هەر ئەو هوستایە یێ منارا مزگەفتا ئامێدیێ ئاڤاکری، مزگەفت ژ ژوورەکێ پێکدهات، زێدەباری ژوورەکا بچویك کو خەلکی دگۆت گۆرێن تێڤە، دەرگەهێ وێ دکەڤتە رەخێ ژێری، دو پەنجەرکێن بچویك هەبوون، دکەڤتنە رەخێ ژێری، هەتا سالا (١٩٨٧)ێ ژی مابوو، بەلێ نها کاڤلە.

چەند مناسب و گۆڕستان یێ ل گوندی هەین، ئەو ژی: مناسبێ ئاستەنگێ دکەڤیتە رەخێ ژێریێ گوندی، مناسبێ دەرێ گەلی دکەڤیتە رەخێ ژێریێ رۆژئاڤایێ گوندی، مناسبێ شەهیدا ل دووڤ چیڤانۆکا دبێژن (٩) زەلامێن گوندی ل وێرێ هاتینە شەهیدکرن. گۆڕستانا گوندی هەتا سالێن هەشتێیان بکاردئینا، دیسان گۆڕستانا (دارێ زینا) ئەو ژی گەلەك یا کەڤنە[٨٨].

د کتێبا (المعجم التاریخی لامارة بهدینان) سالۆخا ڤی گوندی دکەت: گوندەکە ل رەخۆدۆرێن ئامێدیێ، دکەڤیتە رۆژئاڤایێ وێ. ئەشیرەتا شەرەفانی ئێك ژ دو ئەشیرەتا بوو کو (قوباد پاشا) ل سالا (١٢١٨مش/١٨٠٣ز) ل گوندێ (بیباڤا) گرتی. تیارییێن ویلایەتا جۆلەمیرگێ کو ژ (چەلێ) هاتبوون، بسەر دا گرت، (١٦) کەس ژ میرزادەیێن وان کوشتن، بەلێ (ئسماعیل پاشا) نەشیا تۆلا وان ڤەکەت، خەلکێ گوندی ب جلکێن وان کوشتیاڤە یێن ب خوین هەوارا خۆ برە دەڤ (بەدرخان بەگێ)، دا تۆلا وان ڤەکەت، بۆ ڤێ مەرەمێ میرێ بۆتا دو هەوێن لەشکەری یێن تەنبیکرنێ برنە سەر تیارییا[٨٩].

ل رۆژا (١٩٧٨/١٠/١)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ هەتا پۆلا چارێ لێ هاتییە ڤەکرن، بۆ پۆلا پێنجێ و شەشێ خەلکێ گوندی دچوونە بێبادێ.

ل سالا (١٩٧٩)ێ جادە گەهشتیە گوندی. گوند ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە وێرانکرن، بەری وێ سالێ (٢٧) مالبات لێ دژیان، نها گوند یێ بەردایە[٩٠].

## گوندێ دێرەش

**(١٦كم) یا ژ ئامێدیێ دووره.**

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ كانێیە.

**باشووری،** گوندێ گیزێ یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سپیندارێیە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ رەزیكێ یە.

ژبلی رووبارێ سپنەی كو ژێدەرێ سەریشكێ ئاڤا گوندییە، كۆمەكا كانییا ل گوندی هەنە، ئەو ژی: كانییا گوندی، كانییا بەرمزگەفتێ، مێرگا خێ، خەندەكێ، كانییا بناڤێ، كانی درینێ، كانی جەبەر، رەزێ حەجی، گلە سۆرێ، ملێ گەركێ.

كۆمەكا جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەنە، ژبەركو ئەو دەلیڤا پێدڤی نینە ل سەر هەمیان ب راوەستین، دێ وان هژمێرین و بكورتی بەحسێ (شێخ ئیسلامی و دێرا دێرەشێ) كەین. جهێن بەرنیاسێن گوندی ئەڤەنە: دێرا دێرەشێ، برێما حەجیا، برێما گوندۆرا، برێما گۆلا، شێخولئیسلام (گۆڕستان)، تەشیكا كچا كافری[٩١]، دێرەشا خراب و گۆڕستانا وێ، رێكا گەلیێ دێرەشێ دو جهـ بەرنیاسن تێدانە ئەو ژی (خاچا فەلەی و پۆزا فەلەی). گەلیێ دێرەشێ، چیایێ زەنگلی، تەحتا دێرەشێ، زەرێ، گەڤرێ زەرێ، ملێ مەحمیدا، هەڤشیێ بكەزان، چالێ، تربێ فەلەی[٩٢].

گۆڕستانا شێخولئیسلامێ دێرەشی، شێخولئیسلام سەركێشێ تەسەوفێ بوو ل كوردستانێ هەمیێ، ئێك ژ زانایێن ناڤدار بوو، ژێدەرێ ژ هەمیا كەڤنتر كو بەحسێ وی زانای كری، كتێبا

مەزارا شێخولئیسلام ل دێرەشێ



(الانساب)ە یا عەبدولكەریمێ تەمیمی یە، ئەوێ ل سالا (٥٦٢ مش) مری[٩٣]. شێخ ئیسلام سەیدایێ سەیدایێ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی بوو، كو تەریقەتەكا دینی بناڤێ وی یە، شێخولئیسلام سالا (٤٨٦مش/ ١٠٩٨ز)ێ مریە[٩٤]. دناڤ گۆرستانێدا گەلەك جهێن بەرنیاس هەنە، ژوان (دارا هرچێ)، خەلكی گەلەك چیڤانۆك پێڤە چێكرینە.

ژبەركو دێرا دێرەشێ گەلەك یا ناڤدارە، فەرە ئەم پیچەكێ ل سەر دیرۆك و شوینوارێن وێ راوەستین. دێر دكەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتێ گەلیێ دێرەشێ، ژووریێ رۆژهەلاتێ گوندێ نوی، بەرامبەر رێكا دەڤەرا بەرێگاریێ یا دیرۆكی[٩٥]، موسلمان د بێژنێ (دێرا دێرەشێ)، نە دووره ژ پەیڤا (دریشا) هاتبیت، بنیاتێ وێ (دارش یان دریشا) بیت[٩٦] مەسیحی دبێژنێ (دێرا مارساوە- مارسابە) دیارە پەرستڤانەكێ (كاهن) فەلە بوویە و خەلكێ ڤێ دەڤەرێ ل سەردەستێ وی باوەری ب مەسیحیەتێ ئینایە، سالا (٤٨٧ز)ێ هاتییە كوشتن[٩٧].

دانەزانا ڤی جهێ شوینواری ل رۆژا (١٩٥٢/١٠/٢٥ز)ێ ل سەردەستێ ڤەكۆلینڤان (ئەحمەد حاج مەهدی) هاتییە كرن، د رۆژناما (الوقائع العراقیة) هژمارە (٣١٩٩) هاتییە بەلاڤ كرن[٩٨] پاشی د ناڤ ئەتلەس و پەرتوكێن جهێن شوینواری دا ل عێراقێ هاتییە قەیدكرن[٩٩].

چەند رەنگێن كاری مرۆڤ دبنیت وەكی ڤەرێژا كەڤناتیێ ل ڤی جهێ شوینواری، سەرەدەری كرن دگەل كەڤری، مرۆڤ شیایە چەند پەیسكێن رێك و پێك د كەڤری ڕا ب كۆلیت، دبیتە پیڤەرەك بۆ تێگەهشتنا دەستودانێ پەرستگەهـ تێدا هاتییە دروست كرن. هەر چەند نڤێسەڤان (عبدالرقیب یووسف) دبێژیت هژمارا پەیسكێن دێرا دێرەشێ (١٧٠) پەیسكن[١٠٠]، بەلێ د راستی دا هژمارا پەیسكێن دیار (١٩٠) پەیسكن[١٠١]، درێژیا هەر پەیسكەكێ نێزیكی (٧٧سم)، بلندیا وان دناڤبەرا (١٠-١٥سم)، پەحنی یا وان نێزیكی (٤٠سم)[١٠٢]. ئەڤ پیڤەرێن هاتینە ب كارئینان هەتا نها ژی دناڤ خەلكی دا د بەلاڤن و پیڤەرێن ئاڤاهیێن نها نە.

پشتی مرۆڤ چەند پەیسكەكا سەردكەڤیت ناوسكەكا بچویك دكەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتێ رێكێ (پەیسكان)، بلنداهیا وێ (١،٦٠م) و پەحنیا وێ (٣٠،١م)، نە دووره جهێ پەرستنا پەرستڤانا بیت، نە خاسمە هەیامێن ب كارئینانا ڤی جهی وەكی پەرستگەهەكا فەلا، دبیت جهێ زێرەڤانێ پەرستگەهێ بیت، ژبەركو دكەڤیتە بەراهیا هاتنێ بۆ پەرستگەهێ. دیوارەكێ دی هاتییە نیساندن ب ڤێ نەعویسكێ ڤە لێ مخابن چ ژێ نەمایە[١٠٣].

ل ئەڤێ پەرستگەهێ چەند كۆركەك هاتینە كۆلان، وەكی تیڤەرێژەكێ ئێك ل دووڤ یادی هاتینە نكراندن، كویراتیێن وان دناڤبەرا (١٢-٢٦سم)، فرەهیا وان دناڤبەرا (١٥-٢٢سم)، هژمارا كۆركێن دەركەفتی (٥) كۆركن، نە دووره ئەگەر ڤەكۆلین بهێنە كرن كۆمەكا مەزنا ڤان كۆركا دەركەڤیت.

دیسان ژوورەكا درێژ ب رەخڤە هاتییە نژنین، هەر چەندە جهێ دەرگەهێ وێ دیار نینە، لێ یا بەرچاڤە ئەو دكەڤیتە رەخێ رۆژئاڤای، ژبەركو جهێ جوگرافی سەرەدەری دگەل دارێتنا خەریتە و كەتوارێ پەرستگەهێ كرییە، بلنداهیا دیوارێن وێ (٧٥سم) و پەحنیا دیوارێن وێ (٤٠سم) ژ مادێن بەر و كسلا هاتییە ئاڤاكرن[١٠٤]، درێژیا ڤێ ژوورێ (٧،٥م)، رەخ ڤێ ژوورێ ڤە ژۆرەكا دی یا بچویك هەیە و ب ژوورا ئێكێ ڤە هاتییە نیساندن، درێژیا دیوارێن وێ (٢،٦٤م) و بلندیا ژێ مای (٣٠،١م)، ل دۆماهیا پەرستگەهێ كانییەكا ئاڤێ دەردكەڤیت و دیارە یا دەستكارە، قوترێ وێ (١،٢٥م) و بلنداهی یا وێ (٩٠سم)[١٠٥].

ل دۆر سەخلەتێن دینی ل دێرا دێرەشێ ئەم چەند تشتا دبینین:-

١- جهەكێ ئاسێ و بلند و ل هنداڤ گەلیەكێ كویر و سر و سەقەما چیایێ گارەی، كەتنا وێ بەرامبەر رێكا دەڤەرا بەرێگاریێ یا دیرۆكی، سەخمەراتی ڤێ چەندێ دبیتە رێكا ئێكانە ژ كەڤن كو د دەڤەرێ را دچوو، گەهشتە كۆمەكا گوندێن كەڤنێن دەڤەرێ وەكی دێرەشا كەڤن و

صارکێ و بیێ و گویزێ.

٢- چەند سەخلەت تێدا هەنە وەکی دەرکەفتنا کۆرکێن پاراستنا خۆلیا پیرۆز، ئەڤ سەخلەتە تنێ ل دەڤ دینێ زەردەشتی هەیە[١٠٦].

٣- ئەڤ جهە یێ تایبەتە ژ سەخلەتێن ئاڤاهی و ژ رەخێ ئاڤاهی ڤە چ پیڤەرێن دینێ مەسیحی تێدا نینن، زێدەباری پشككرنا وێ بۆ سێ پشكێن سەرپشك، دەرکەڤتنا ژوورا و کۆرکێن پاراستنا خۆلیێ و دەرکەڤتنا جوهنیا ب مەرەما قوتانا متایێ دەخل و دانی.

هەکە ئەم ڤەگەرینە سەر دیرۆکا ڤێ پەرستگەهێ، چەند نێرینەك هەنە بۆ خەملاندن و ڤەگەراندنا دیرۆکا وێ بۆ هەیامێن ب کارئینانا وێ ژ رەخێ مرۆڤی ڤە وەکی پەرستگەهـ ئێك ژ ئەوان نێرینا یا لێکەر (عەبدولرەقیب یووسفی) یە، دبێژیت: (مارساوە) کەسەکێ بیروباوەر میترائی بوو (گەلەك ژ سالۆخێن ڤی دینی دناڤ ئێزدیاتیێ دا هەنە)، ناڤێ مارساوەی یێ دروست (کوشنەردادە) خەلکێ دەڤەرا (بلشفرێ) بوو، ئەڤا نێزیك خانەقین و قەصر شرینێ، پاشی وی باوەری ب مەسیحیەتێ ئینا و گەلەك ژ خەلکی ژ باوەرێن میترائی و زەردەشتی ئینانینە سەر دینێ مەسیحیەتێ، ل سالا (٤٨٧ز)ێ هاتیيە کوشتن[١٠٧].

هەکە ئەم نێرینەکێ سەر قانوون و بنواش و پەرستنا زەردەشتیێ بکەین، دێ بینین چەند تشتەك ل دەڤ وانا د پیرۆز بوون، وەکی ئاخ و ئاگر و ئاڤ و هەوا، ژبەر ڤان سەخلەتا، دینێ زەردەشتی ناڤەکێ تایبەت بۆ خۆ دروست کر[١٠٨].

د بیروباوەرێن زەردەشتیێ دا خۆدایەك هەیە، ناڤێ وی (ئاهورا- مزدا)یە، مەعنا ئاهورا (خۆدا، خۆدان، روح)، مەعنا مزدا (خێرکەر یان عاقلمەند) و هندەك جارا دگوتێ (مزدا- ئاهورا)، زێدەباری دەرکەفتنا رەخێ خراب یێ دبێژنێ (ئەهریمەن)[١٠٩]. دیسان زەردەشتیيا چەند خۆداێن دی د پەرستن نەخاسمە خۆدایێ میترا و هەیڤێ[١١٠].

ل دووڤ پیڤەرێن دینێ زەردەشتی پەرستگەها دێرەشێ دبیتە جهەکێ زەردەشتی، هەمی پیڤەرێن جهێن زەردەشتیێ لێ د بەرچاڤن، وەك دەرکەفتنا ئاڤ و ئاخ و جهێن ئاگری و شوینوارێن سۆتنێ گەلەك جهێن وێ دیارن، هەر چەندە چەپ و چیرێن جۆگرافی یێن ڤێ دەڤەرێ سەمتا ئاڤاکرن و نژنینا ڤێ پەرستگەهێ دیار کرییە وەکی جهەکێ ئاسێ و ئێکانە.

ل سەر دەرکەڤتنا دینێ مەسیحییا ل ئەڤێ پەرستگەهێ ئەم دوور نابینین ل سەدسالییا دووێ زایینێ و ویڤە هاتییە ئستغلالکرن بۆ ڤێ مەرەمێ، نە خاسمە ل سەدسالییا دووێ و سیێ زایینێ مەسیحی ل ژێر کۆتەکیێن دینی بوون ل سەردەستێ ساسانی و رۆمانیا، ل وی سەردەمی مەسیحییان قەستا جهێن ب تنێ و بێ دەنگ دکر ب مەرەما ئەداکرنا رێورەسمێن خۆیێن ئایینی، ئەڤ جهێ رۆحی پتر بۆ ڤێ مەرەمێ هاتییە ب کارئینان، ئەڤە تشتەکێ خۆرستییە کو هەر دینەکێ بهێن دینێ دی ژێ بەتن.

دیسان خەلکێ ڤێ دەڤەرێ گەلەك چیڤانۆك پێڤە گۆتینە، نە خاسمە دناڤبەرا هەردۆ چمبلێن دەڤەرێ، مارساوە و شێخ ئیسلامێ هەکاری[١١١]، دیسان موسلمان ژێ ب کاردئینن هەتا نها، ب تایبەت ئەو کانییا ئاڤێ یا دبێژنێ (حەودێ گوری) ب مەرەما تبەرك و نۆژداریێ[١١٢].

خواندنگەهەك ل مزگەفتا ڤی گوندی هەبوو، کو گوندێ شێخ ئیسلامێ دێرەشی بوو[١١٣]. بەلێ خواندنگەهەکا حکومی ل سالا (١٩٧٦)ێ گەهشتیە گوندی، وی وەختی دخانیەکیڤە بوو، پاشی خەلکێ گوندی دەست ب ئاڤاکرنا خواندنگەهەکێ بۆ خۆ کر.

سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٢٠ کەس بوو[١١٤]، گوند سێ جارا هاتییە ڤەگۆهاستن، جارەکێ دێرەشا کەڤنە، کو نوکە کاڤلە گوندە، پاشی دێرەشا بەری سالێن نوتا، ل داویێ ئەڤ دێرەشا نوکەیە. بەری سالا (١٩٨٨) سیهـ مالبات ل گوندی دژیان، نها (١٥) مالبات لێ دژین. سالا (٢٠٠٦)ێ جادە گەهشتییە گوندی[١١٥].

# ناحیا سەرسنكێ

**كۆڤان ئیحسان یاسین**

## جهێ جۆگرافییێ سەرسنكێ

ل دەمێ ڤەكۆلین ل سەر جهەكێ جوگرافی دهێتە كرن، پێدڤییە هەمی رەخێن ژیانێ لێ بهێتە ڤەكۆلین، وەكی توپوگرافی[1] و دیموگرافییا[2] وی جهی، هەر چ رەخێ جوگرافییە پێدڤیە توخیبێن جهی بهێتە دیاركرن، ل ڤێرە ئەم دێ سەرسنكێ ب خۆ وەرگرین وەكی باژێركەكێ سەربەخۆ، نەك ئێكەكا كارگێری، ژ رەخێ رۆژهەلاتی یا هەڤ توخیبە دگەل ئامێدیێ، ل دووڤ پیڤەرا (٣٥كم) یا ژ ئامێدیێ دویرە[3] . ژ رەخێ باكووری یا هەڤ توخیبە دگەل ناحیا بامەرنێ.

گوندێ باوەركا كەعبێ، باوەركا كەڤری، سەرگركی، رەخێ باكوورێ رۆژهەلاتێ سەرسنكێ د خەملینن، رەخێ رۆژئاڤایێ سەرسنكێ گوندێ ئاشەوا، سكرینێ، بیباڤا، گوندكی یە. ژ رەخێ باشوورێ سەرسنكێ چیایێ گارەیە و ناحیا چەمانكێ یە. كۆمەكا ژێدەرێن ئاڤێ ل سەرسنكێ هەنە، نەخاسمە كانیێن كەڤن، وەكی كانیا گەلی و شیڤێ و كانیكا عەبۆی و كانیێن بادەرەشكێ و كانیێن كانی چناركێ. ل هاڤینا سەقایێ سەرسنكێ یێ هینە، ل زڤستانا گەلەكێ سارە، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم گەلەك جارا دبێژینێ زڤستانگەهـ دووراتییا سەرسنكێ ژ دهۆكێ، ئەم ب چەند پیڤەرەكا دبینین، هندەك ژێدەر ب (٦١كـم)[4] د خەملینن، دیسان هندەكێن دی ب (٤١كم) د خەملینن[5] ، لێ یا نزیكتر ژ هەمیان سەرسنك (٤٣كم) یا ژ دهۆكێ دویرە. دیسان دووراتییا سەرسنكێ ژ تۆخیبێن وەلاتێ تركیا (١٩كم) هەوایی یە[6].

ل دوویڤ راپورتێن جیولوجی ئەردێ سەرسنكێ وەكی هەمی دەڤەرێن دی یێن رۆژهەلاتا ناڤەراست، ڤەدگەریتە وان لڤینا ئەڤێن ل هەیامێن جیولوجی یێ سیێ چێبۆوی، نەخاسمە دگەل وان گوهرینا ئەڤێن ل دەریا (تیس) دروست بووین، گوهرینێن دژوار ئەڤێن ل هەیامێن تەخا جیولوجی (برمی) یا ئێكێ دروست بووین[7]، ڤەرێژا ڤێ لڤینێ دروست بوونا چیایێ گارەی بوو، ئەڤ لڤینە بوویە ئەگەرا چێبوونا كەڤرێن خیزی و گرانێتی، ئەڤ رەنگێ كەڤری ل سەرسنكێ یێ مشەیە، هەر ئەڤ لڤینە بوویە ئەگەر كو سەرسنك كرییە جهێ گەریان و گۆزاریێ مەلیك و سەركێشا.

بلنداهییا سەرسنكێ ل سەر ئاستێ ئەردی، جوداهییەك د ژێدەرا دا هەیە، پتریا ژێدەرا ب (١٠٤٦م) ل سەر ئاستێ ئەردی د خەملینن[8]، هندەك ژێدەر ب (١٠٥٠م) ل سەر ئاستێ ئەردی د خەملینن[9]. دیارە ئەڤەژی پتر پێدڤی دووڤچوونێ یە داكو بگەهینە

راستیا بلنداهیا سەرسنکێ ل سەر ئاستێ ئەردی، هەر چاوابیت دیارە پیڤانێن وان نزیکی ئێکن و ئەڤە ژی سەخلەتەکێ تایبەت بۆ سەرسنکێ، سەقایێ وێ جودا دکەتن ژ دەڤەرێ.

ئاخا سەرسنکێ ژ رەنگێ ئاخا هێدروجینا ناڤەراستە، ل هندەك جهـا ئاخا سپی و سۆر و ترش ژی یا هەی، دیسان رەنگێ حەلانێن خویزی ژی دیار دبن، وەکی هەمی جهێن دی، نەخاسمە ل دۆل و شیڤێن ئاڤی، پتریا رەنگێن دار و گیایا ل سەر ڤێ ئاخێ شوین دبن. بلندترین پلا گەرمێ ل سەرسنکێ دناڤبەرا (-٣٤ ٣٦) پلێن گەرمێ یە[١٠]. نزمترین پلا سەرمایێ دگەهیتە (١٠) پلا ل ژێر سفرێ دا[١١]. کۆمەکا ئەگەرا هەنە کو سەرسنك ب ڤی رەنگی ل دانسالێ زڤستانێ یا سار بیت، ژبەر بارینا گەلەك بەفرێ، سەرسنك دکەڤیتە دانگا چیایێ گارەی، ل رەخێ نزاری یە، ل دانسالێ زڤستانێ هەتاڤ زوی لێ نادەت، نە خاسمە گەلیێ سەرسنکێ.

ئەگەر ئەم بنێرینە پێکهاتا مرۆڤی یا خەلکێ سەرسنکێ، پێزانین د ئەڤی بوواری دا دکێمن، ژ بەرکو حەتا ئەڤرو چ سەرژمێریێن راست و دروست مە نەبووینە، نە ژ رەخێ هژمارا خەلکی ڤە، نە ژی زانینا توخمی وەکی نێر و مێ ژ رەخەکێ دیڤە، ژبەر گوهرینا بەردەواما هژمارا خەلکی، نەخاسمە ل ڤان دوماهیا، گەلەك خەلکی قەستا باژێری (دهۆکێ) کریە، لێ ل دۆر سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ سەرسنکێ (وەکی ناحییە) د گەهشتە (٢٠٢٦٠) کەسا[١٢] و ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ هژمارا خەلکێ ناحیا سەرسنکێ ٢٥٢٥٥ کەسن، ژ وانان ١٧٨٩٩ کەس ل باژێرك و کۆمەلگەهان دژین و ٧٣٥٦ کەس ل گوندان دژین و پشتی ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل سەر پێکهاتا خەلکێ سەرسنکێ، دیار بوو خەلکێ (٥٢) گوندا لێ د ژیتن، ئەڤێ چەندێ ژی تایبەتمەندییەك دایە سەرسنکێ.

سەرسنك



## ناڤێ سەرسنکێ

ل دۆر ناڤێ سەرسنکێ کۆمەکا بیروبۆچوونێن جودا هەنە، ژ وان ئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە ناڤێ سەرسنکێ دێ بینین ژ دو برگێن جودا هاتییە، (سەر+ سنک)، پشتەڤانێن ڤێ بۆچوونێ پشتا خۆ ب وێ چەندێ راست دکەن، کو سەرسنک دکەڤیتە دانکا سرتا چیایێ گارەیی، جهێ جوگرافیێ سەرسنکێ دبیتە ڤەرێژا ئاڤێ، ئاڤا سەرسنکێ ل ڤێرە دبیتە دو پشك، پشکەك بەرەڤ رەخێ ئامێدیێ ڤە دچیت، تا دگەهتە سەر زێ مەزن، پشکا دووێ بۆ رەخێ صپنەیی ڤە دچیت، تا دگەهیتە سەر خابویری[١٣]. ل تاخێ مەیدانکا روڤیا[١٤] سەرسنك وەکی زیارەتەکی دەردکەڤیت، بەلێ زیارەتەکێ ژێهەل و ژووردایە، ژبەر ڤێ چەندێ هندەك دبینن کو سەرسنك ب مەعنا سینگێ ئاڤێ دهێتن[١٥]. بیروبۆچوونەکا دی یا هەی ل سەر ناڤێ سەرسنکی، دبێژیت: کو ل سەرێ گارەی گەلەك ژ کێزا (سنکێ) هەیە، لەوا دبێژنە ڤی جهی سەرسنك[١٦]. سەر د زمانێ کوردی دا دهێن ب مەعنا (بلنداهی)، ل ڤێرە دبینن کو ناڤێ سەرسنکێ ژ (سەرێ گری) هاتییە[١٧]، ئەگەر ئەم ڤێ بۆچوونێ وەربگرین نە دویرە یا دجهێ خۆدابیت، ژبەر کو گوندێ کەڤن دکەڤیتە سەر گرەکی ل هنداڤا سەرسنکا نوی. نە دویرە سەرسنك وەکی زیارەتەکی دەربکەڤیت، ئاڤ لێ دبیتە دو قەد، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنە سەرسنکێ (سینگێ ئاڤێ)[١٨]، ئەڤەژی دیاردەکا خۆرستی یە، پتریا ناڤا ژ کارێ وان دهێنە وەرگرتن، ناڤێ سەرسنکێ ژی ژ جوگرافییا وی جهی هاتییە وەرگرتن. دڤێن ژبیر نەکەین کو (سەرسنکە)کا دی ل چیایێ (قەرەچ داخێ) ل باکوورێ کوردستانێ هەیە[١٩].

بۆچوونەکا دی هەیە، ناڤێ سەرسنکێ ڤەدگەرینیتە دیاردەکا خۆرستی، ئەوژی کەفتنا وێ ل سەر سینگێ چیایێ گارەی، دبێژن واتا وێ (سەرێ بەری) یە[٢٠]. ل دووڤ ژێدەرێن گوتنێن پیرەمێرا، دبێژن ئەو (٢٥) مالباتێن مەسیحییا ئەڤێن قەستا سەرسنکێ کری، ب مەرەما خۆجهیێ، ژ گوندێ (شینکێ) ژ دەڤەرا زاخۆ هاتبوون[٢١]. ئەڤ بۆچوونە بێ دو دلی گەلەك یا لاوازە، راستە نێزیکییەك دناڤبەرا پەیڤا (سنگ و شنك) هەیە، ژبەرکو ناڤێ هەر جهەکێ ژ کارێن وی دهێنە وەرگرتن. هندەك دبێژن هەکە مرۆڤ ژ دوور سەحکەتە ئەو گوندێ کەڤن یێ سەرسنك ل سەر ئاڤاکری، وەکی سینگێ تەیرەکی یە، ئەو سرتا چیایی ئەوا دکەڤیتە پشت سەرسنکا کەڤن، وێ ئاڤریێ دەت[٢٢].

دیتنەکا دی یا هەی کو پەیڤا سەرسنکێ دکەتە دو پشك:

١- سەر مەعنا وێ د زمانێ کوردی دا جهەکێ بلندە.

٢- سن پەیڤەکا بیانی یە ب مەعنا گر دهێن، مەعنا ناڤێ سەرسنکێ ب (سەرێ گری) دهێت[٢٣]. ئەڤ دیتنە ژی گەلەك یا لاوازە.

## دیرۆکا سەرسنکێ

راستە چەند نڤێسینەکێن بچویك ل سەر سەرسنکێ هاتینە کرن، بۆ میناك رێبەرێن گەریان و گۆزاریێ، راپورتێن (نڤێسی- دیتی)، ل ڤێری و وێراهەنێ ل سەر سەرسنکێ هاتینە کرن. نەخاسمە پتریا ڤان هەلشکافتنا پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ز)ێ هاتینە کرن، لێ ژێدەرێن وان نڤێسین و هەلشکافتنا هەر پیرەمێر و دانعەمرێن سەرسنکێ بووینە، هێشتا گەلەك ژ وان د ساخن، ئەڤە ژ رەخەکی ڤە، بەلێ ژ رەخەکێ دیڤە قەیدێن فەرمانگەها جار جار پێزانین کۆمکرینە، بەلێ پتریا وان پێزانینا ڤەدگەرنە سالێن پێنجییا و وێڤەتر. ئەڤ چەندە بتنێ دیرۆکا سەرسنکێ نینە بەلکی مەرەم ژێ (٥٠٠) سالێن بووری یە بەری نها و وێڤەتر[٢٤]. نەخاسمە دەورێ سەرسنکێ و کەفتنا وێ دناڤبەرا دو کەلایێن دیرۆکی ل دەڤەرێ (کەلا ئاشەوا و کەلا ئامێدیکا خراب).

دیارە پشتی میرگەها بەهدینان ل چەرخێ دووازدێ زایینی هاتییە دامەزراندن، سەرسنك ژی وەکی هەمی دەڤەرێ سەر ب میرگەها بەهدینان ڤە بوو، نەخاسمە نێزیکییا سەرسنکێ ژ کەلا ئاشەوا و ئامێدیکا خراب. هەر چ نەبیت هندەك بریارێن بچویك

ژ ڤان كەلا دەركەفتینە، سەرسنك ژی وەكی هەمی دەڤەرێن دەوروبەر ل ژێر حوكمێ ڤان كەلا بوو. ئەڤەژی ژبەر چەند سەدەما، ژ وان: كەلا ئاشەوا پتر یا ل هنداڤی سەرسنكێ، هەكە ئەم هەڤبەری بكەین دگەل كەلا ئامێدیكا خراب. دیارە سەرسنك رێكا ئێكێ بۆ دناڤبەرا كەلێن ئامێدیكا خراب و ئاشەوا[٢٥].

لێ وەكی یا دیار سەرسنك جهەكێ بلند و ئاسێ نینە ژبەر ڤێ چەندێ چ حوكما پویتە پێ نەدایە، نەبوویە جهێ رێڤەبرنێ. راستییا ڤێ چەندێ نەبوونا كەلا و قەصر و جهێن مەزنێن دیرۆكی[٢٦].

ژێدەرێ ژ هەمیا كەڤنتر كو بەحسێ بادەرەشكێ كری، ڤەدگەریت بو بیرهاتنێن هاریكارێ قونسلێ ئنگلیزی ل مووسلێ (جورج برسی بادجەر) ل سالا (١٨٤٢ز)ێ، هەیامێ ب رێكێ ڤە دا بەرەڤ باكوورێ كوردستانێ ڤە (ئاشویتێ) چیت. دیار دكەت كو شەڤەكێ ل بادەرەشكێ نڤستیە[٢٧]. بەلێ مخابن چ بەحسێ سەرسنكێ نەكرییە، یا ئەم دزانین كو سەرسنك و بادەرەشك ئێك توخیبن و بتنێ شیڤەك د ناڤبەرا وان دا هەیە[٢٨].

ژ رەخەكێ دی ڤە ئەو زەلامێن بۆ جارا ئێكێ شەنگستێن سەرسنكێ دانایین، بۆ نەڤیێن خۆ ڤەگێرایە، كو سەرسنكێ گوندەكێ پتر ژ (١٠٠) سالا بەردایی بوو، چ كەس و مال لێ نە دژیان، ئەڤ دەڤەرە یا تژی بۆ ژ دارێن مەزن، وەكی دەحل و پیشەكێ تاری بوو[٢٩].

هەكە ئەم ڤەگەرینە سەر دیرۆكا سەرسنكێ بەری سالا (١٩٢٢ز)ێ، وەكی مە ئاڤری داینێ، گەلەك جارا خەلكی قەستا سەرسنكێ كرییە و جارەكادی بەردایە، هەر ژ وان كۆمێن مرۆڤا ئەڤێن قەستا سەرسنكێ كری، ژ گوندێ سیارێ هاتینە، پاشی ل هەلەفیێ[٣٠] خۆجهـ بووینە. بەلێ ژبەر سەرمایێ و خلتێن كوژەك، سەرسنك ب جهـ هێلایە[٣١].

یا دیارە جهەكێ تژی ئاڤەكا بۆش، ئاخەكا بەردار، دێ یا تژی دەحل و پیش بیت، نەخاسمە هەكە مرۆڤ هەر لێ نەژیت. دێ پێكولێ كەین چەند روهنكرنەكا بدەین ل سەر سەرسنكێ بەری سالا (١٩٢٢ز)ێ:

سەرسنك



١- ئێشێن كوژەك و قوتبر دەمێ سەرسنك ڤەدگرت، پتریا خەلكێ وێ د هاتە ڤەبراندن. خەبەردانا ڤێ مرنا ب كۆم ل ڤێرێ و وێراهەنێ بەلاڤ دبوو، ڤێ چەندێ سەهم و ترس د دەروونێ خەلكی دا پەیدا دكر، حەتا ل ئەوی هەیامی جیڤانۆك پێڤە هاتبوونە چێكرن، د گوت: ژ بلی سەید و وەلیا كەس ل ڤێرێ ناژیت. خەلكی ئێشەك ب ناڤێ (ئێشا سەرسنكێ) ناڤ كر بوو[٣٢]. بۆ میناك، سەیدایێ (زەكی عودیشو) بۆ مە ڤەگێرایە: كو هندەك جارا گوندیێن مە دەمێ نەفرەت ل ئێكی د كر، د گۆت: ئێشا سەرسنكێ بهێتە مالا هەوە[٣٣]. پتریا ڤان ئێشا وەكی دیرۆكێ دا دیار، (كولێرا و تاعوون و سۆرك) بوون[٣٤].

٢- بارینا بەفرەكا ئێكجار مەزن، نەخاسمە د دانساليا زڤستانێ دا. سر و سەقەما دژوار و گران و ب ناڤ و دەنگ، ل چاڤ هەر جهەكێ دی ل صینێ بەهدینان، وەكی ئەم د زانین كو سەرسنك د كەڤیتە بن سیها سرتا چیایێ گارەی. جهەكێ نزار و بلند و بەر با. ژبەر ڤێ چەندێ ئەم گەلەك جارا د بێژینێ خۆش (زڤستانگەهـ).

٣- قەچاغچی و رێگر و جەردەچی، ژبەركو سەرسنك جهەكێ بەردایی بوو، تژی جۆم و جەلال بوو، خۆدان دەحل و پیشەكێ مەزن بوو، وەكی بەری نها مە ئاڤری دایێ. نە بتنێ ڤان دەحلا دەهبە د ناڤ خۆدا د ڤەشارتن، بەلكی ببوو حەوینگەهەكا باش بو ڤی رەنگێ مرۆڤی[٣٥]. ئەڤ دیارۆكە گەلەكا بەربەلاڤ بوو، نەخاسمە ل ئەوی هەیامی هندەكا ب شانازی ڤە د كر.

ل ڤێرە پرسیارەك سەرهەلدەت و د بێژیت، چاوا فەلە رازی بوون بهێن ل ئەڤی جهی خۆجە بن، زێدەباری زانینا وان ب ڤان رێگرێن بەری نها مە ئاڤری دایێ؟. بۆ بەرسڤدانا ڤێ پرسیارێ دو تشتێن سەرەكی مە هەبووینە:

١- وەكی ئەم د زانین كو دوماهیا سالێن بیستێ دوماهیا شەرێ جیهانێ یێ ئێكێ بوو، (١٩١٤-١٩١٨)ز)ێ، دنیا بەرەف گوهرینێ ڤە د چوو، رەنگە

سەرسنك



سیهەكا تەناهیێ ل دەڤەرا رۆژهەلاتی پەیدا بوو، ئەڤێ تەناهیێ دەڤەرا مە ژی ڤەگرت بوو[٣٦]. یا ئەم د زانین كو دەولەتا ئۆسمانی ب ئێكجاری هەرفت، پاشی هەڤپەیمانا دەست هاڤێنە پشككرنا وان دەڤەرێن ل ژێر حوكمێ ئوسمانی. ئەو بۆ بەخت رەشیا كوردا كەڤتنە د ناڤبەرا (٤) دەولەتا، پاشی كوردستانا عێراقێ كەفتە بن دەستێ بریتانیا[٣٧].

٢- ئەڤ چەند مالێن مەسیحییا ئەڤێن بۆ جارا ئێكێ قەستا كاڤلێن سەرسنكێ كری، ب مەرەما ژیان و ئاكنجی بوونێ، ژ نەچاریا خۆ هاتبووونە سەرسنكێ، چ رێكێن باشتر ل بەروانا نەبوون[٣٨]. فەلە ب رەنگەكێ گشتی پشك دبنە سەر حەفت تیرا (تیاری ژێری، تیاری ژووری، تخوما، بازی، جیلو، شەمدینان، دیز)[٣٩].

ئاشووری بەری شەرێ دنیایێ ل ویلایەتا هەكاری ل باكوورێ كوردستانێ د خوجهبوون، دیسان ل دەوروبەرێن بازێرێن ئورمیە و سەلماسێ ل رۆژهەلاتێ كوردستانێ. ئەو نەچار بوون مشتەخت ببن، ژبەر شەرێن تورك و رۆسا، پاشی هاتنە عێراقێ و وەلاتێ قەوقازێ. ئەو پشكا هاتینە عێراقێ، ئنگلیزا ل بازێرێ (بعقوبە) خۆجهـ كرن. هندەك فەوجێن لەشكەری ژێ چێكرن و كرنە دناڤ لەشكەرێ ئنگلیزی دا. دانانە سەر توخیبێن تركیا -عێراقێ[٤٠]. پشتی جڤاتكەها ئاشووریا ل بەعقوبە، ئێكسەر ئنگلیزی ڤەگوهاستنە دەڤەرێن كوردستانێ، نەخاسمە دەڤەرا ئامێدیێ. ئەڤ (٢٥) مالباتێن هاتینە سەرسنكێ ڤەرێژا وان شەرایە[٤١].

نڤێسەڤان (عەلی سەیدو گەورانی) ل هەیامێ (١٩٣١/٨/٥)ێ ژ دهۆكێ ب رێكەفتییە، بەرەف دەڤەرێ، پشتی (١٨كم) گەهشتیە زاویتە، پەسنا زاویتە دكەت ل دۆر دارێن كاژێ. پشتی بوورینا (٤٠كم) گەهشتیە سوارەتویكا، پاشی رێك بەرەف خوارێ ڤە دچیت، جارەكادی راست دبیت، پاشی چەپ و چیر دكەڤنێ حەتا ئامێدیێ[٤٢]. پشتی سوارەتویكا ئەم گەهشتینە ڤان گوندێن ل خوارێ: گورامار (كورەماركێ)، رۆستینك و سەرسنكێ، تومبێلێ ئەم ل سەرسنكێ داناین، ژ بەركو ئەم نەشیاین بەردەوامی چوونێ بین، تومبێل ڤەگەریا مویسلێ. مە بریار دا بمینە دناڤ پالا دا، ئەڤێن رێكا ئامێدیێ ڤەدكر. خەلكێ گوندێ سەرسنكێ (ئاشووری)نە، د (٤٥) مالا دا خۆجهن، وانا خواندنگەهەك و كەنیسەك یا هەی، (٥٠) خویندكار ل خواندنگەها وان دخوینن، زمانێن سریانی (ئاشووری) و ئنگلیزی و عەرەبی دخوینن[٤٣].

دەمێ ئەم چووینە سەر گرەكێ چیایێ گارەی، من و قەشەی[٤٤] بێهنەكێ بۆ خۆ ئاخفت، د ناڤ دارا را ئاڤەكا بۆش و ب هێز دهات. من بەحسێ گوندی بۆ كر، من پێزانینێن خۆ ل سەر خواندنگەهـ و كەنیسێ و هژمارا مالا ژ قەشەی وەرگرتن. سەروسیمایێ ڤی قەشەی[٤٥]، جهێ وی یێ دینی دیار نە دكر، جلكێن وی وەكی جلكێن كوردا بوون، مە نەدزانی ئەو قەشەیە هەكە كولاڤێ وی یێ فرەنجی د سەری نەبا. پشتی ئەم گەهشتینە سەر لێڤا ئاڤێ، مەسیحییا بۆ مە ئەو جهـ رائێخست، ماستەكێ ترش دا مە، هەكە قەشەی نە ئاخفتبا، من -جودا نە دكرن ژ كوردا، چ جوداهی دناڤبەرا جلك و عەدەت و كەلەخێ وان و كوردا دا نینە. مە سەعەتەك ل سەر وێ ئاڤا بۆش بۆراند، من هەست ب -جوداهییەكا مەزن كر د ناڤبەرا سەقایێ عێراقا عەرەبی و ڤی وەلاتێ جوان، د راستی دا ئەڤ هاڤینگەهە ژ هەمی هاڤینگەهێن دنیایێ جوانترە، هەكە دەستێ ئاڤاكرنێ ب گەهیتێ وەكی گەهشتیە هاڤینگەهێن دی. مە شەڤا خۆ د گەل پالا بۆراند، ئەوێن هژمارا وان دگەهشتە هزارا، هەكە ژبەر خۆشیا سەقایی نەبا، ژبەر پێشیا چاڤێن مە نە دچوونە سەرئێك، ئەوێن ژ ئاڤێن حەودكێن برنجێ ل دەوروبەرێن سەرسنكێ چێ دبوون. ژ رەخێ جوگرافی ڤە، ئەڤ گوندە ئاڤێ دكەتە دو قەد، یان خەتا پشككرنا ئاڤێ یە، جۆكا (ئاڤی ساركێ) بۆ رەخێ رۆژئاڤایی ڤە دڤیت، دگەهیتە سەر خابیری، (ئاڤا كارا) بۆ رەخێ رۆژهەلاتی دچیت، د رێژتە سەر زیێ مەزن[٤٦].

# گوندێن سەرسنكێ

## (١)
## گوندێن دانگا چیایێ گارەی یێن سەر ب ناحیا سەرسنكێڤە

كوڤان ئیحسان

### گوندێ سیارەتویكا

هاڤینگەهەكا چیاییە كو (١١٢كم) یا ژ مووسلێ دویرە، بلنداهیا وێ ل سەر ئاستێ بەحرێ (١٠٥٧م)، پلا گەرماتیێ یا ژ هەمیا بلندتر ل ڤی گوندی (٣٣پلەیە). سەقایێ ڤی جهی ژ خۆشترین سەقایێن دنیایێە، زێدەباری داروبار و چیا و كەڤتنا وێ د نهالەكا بلندا، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی ئەڤ جهە بوویە گەشت و گۆزار. ل سەر ناڤێ وێ سەیدایێ سادق بهائەددین دبێژیت: رامانا سوارەتویكا گرەكێ بلندە و هەردو رەخێن وێ پەسارن. بەلێ (تاها باقر) د بێژیت: رامانا ناڤێ سوارەتویكا گەلێ تویایە، بەلێ راستیا ڤێ چەندێ ئەم نزانین، ژبەركو (سوار) د زمانێ كوردی دا رامانا وێ سیارە ئەوە یێ ل جهەكی سیاردبیت[٤٧].

ل سپێدەهیا رۆژا (١٩٣٩/٨/٨)ز)ی شاندێ مەلكێ عێراقێ ب سەرۆكاتیا (وەصی عبدلله) و چەند كەساتی و وەزیرێن عێراقێ ژ زاویتە برێكەت و پشتی دەم ژمێر و نیڤەكا ب رێكێ چووین، گەهشتنە گوندەكێ بچویك، هندەك كۆخ تێدا هەبوون دگوتنێ (سوارەتوكە)، بەرپرسێ راگەهاندنا مەلكی سالۆخا ڤێ دەڤەرێ دكەت و دبێژیت: ئەڤ دەڤەرە جوانترین جهە، چیایێن بلند یێن ب دار و گیایا خەملاندی، گەلیێن كویرێن كەسكاتی و فرەشین بوو بێهنڤەدانا شاندی، كانییەكا ئاڤێ ژ ئەردی دەردكەڤیتن تاما وێ گەلەكا خۆشە و رەنگێ بەلوریە، تەزیاتیا وێ بەفرا ئامیرێن بەغدا و ئاڤتەزینكێن فریجیور بەرزەدكەتن.

قائمقامێ ئامێدیێ بەرێز (مەروان....) و مەتران فرەنسیس (مەترانێ ئەبرەشیا ئەرەدنا و دەوروبەرێن وێ) و گەلەك ژ رهـ سپیێن دەڤەرێ ل سوارەتویكا ل پێشوازیا مەلكی بوون، ئەو زەلامە هەمی د رژد بوون ل سەر وێ چەندێ كو بایێ سوارەتویكا ژ بایێ چیایێ (بحمدون) ل لبنانێ خۆشتر و باقژترە.

ل سەر رامانا ناڤێ (سوارەتوكە) تالب مشتاق كو بەرپرسێ راگەهاندنا شاندی بوو، دبێژیت: من پرسیار كر رامانا ناڤێ سوارەتوكە چییە؟ گۆتە من: رۆژەكێ دو كوردا گەریانەكا دوور و درێژ كر، چ دگەل وان دا نەبوو ژ بلی كەرەكی كو هەر بێهنەكێ ئیك لێ سویار د بوو، پشتی گەهشتینە ئەڤی جهی لدەڤ كانییا ئاڤێ بێهنا خۆ ڤەدا، پاشی خو بەرهەڤ كر دا برێكەڤن، وی دەمی ئەڤێ بۆ جارا ئێكێ سوار بووی گوتە هەڤالێ خو (سوارە توكەم) ب رامانا (سیار بە) ل وی دەمی ئەڤ ناڤە گۆتییە ئەوی جهی. بەلێ ئەڤ رەئیە نە یا دجهێ خودایە[٤٨].

ل سەر ناڤێ سوارەتویكا (عەلی سەیدو گەورانی) دبێژیت: پشتی ئەم (٤٠كم) هاتین، ئەم گەهشتینە ئێكەم مەخفەرا قەزا ئامێدیێ، ناڤێ وێ ژی (سوارەتوكا)یە، رامانا ناڤێ وێ ژی (سوارا توركا) هاتییە، ئەو ژی (سیارێن تركیا)یە، ئەڤە ژی ژ وێ چەندێ هاتییە كو میرێن بەهدینان دگەل لەشكەرێ

تورکا ل ڤێرە ب شەرکەڤتن، شیان سەرکەڤتنەکا مەزن ل سەر لەشکەرێ تورکا بینن، ژبەر ڤێ چەندێ ئەڤ ناڤە دانا سەر دا هەتا هەتایێ بمینیت[٤٩].

## گوندێ سکرینێ

نێزیکی (٧کم) یێ ژ رۆژئاڤایێ ناحیا سەرسنکێ دویرە، تۆخیبێن رۆژهەلاتی گوندێ "گوندکی"یە، گوندێ بەربانکێ رۆژئاڤایێ ویێە، ژێریێ وێ گوندێن بیباڤا و تاژیکانە، ژووریێ وێ دچیتە سەر نهالا سپنەی، هەر ژ کەڤن ژی هەر جهێ گوندی ل ئەڤی جهی بوو، خەلکی نها بۆ خۆ خانیێن سەردەمی ئاڤاکرینە و ئەڤ گوندە گەلەکێ مەزن بووی. ئەو خەلکێ ل ئەڤی گوندی دژین، بەربابێن چەند عەشیرەتانە، وەکی (دۆسکیا کو ژ هەردو گوندێن شێخ مەما و کانیکا قەستکریێ، رێکانی و نێروەی، زێدەباری چەند مالباتێن فەلا). ژیانا وان یا کەڤن پتر ل سەر چاندن و خودانکرنا تەرشوکەوالی بوو، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٧٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٠] و نها (٩٥) مالبات لێ دژین و ژیانا وان پتر گرێدایی مۆچایە[٥١].

هندەك شکەفتێن مەزن یێ ل دانگا گوندی هەین، چ ڤەکۆلینێن شوینواری ل سەر نەهاتینەکرن، نە دویرە جهێن شوینواری بن ژ بەرکو دکەڤنەسەر جهەکێ ب ئاڤ و راست، بەلێ خەلکی بۆ مەرەمێن خۆ بکارئینایە، نەخاسمە بۆ ڤەحەواندنا پەزێ خۆ. ژێدەرێ ئاڤێ گەلیێ ئاشەوایە، زێدەباری کانیەکی بەلێ نها هشك بوویە. ل سەر ناڤێ سکرینێ چ پێزانین ڤ بەردەستێ مە نەکەڤتن، بەلێ نەدویرە گرێدایی روبارێ سپنەی بیت ژبەرکو نە دویرە ل ئەڤی جهی بەری نها سکرێن ئاڤێ هەبن و هەر ئەڤ ناڤە ژێ هاتبیت.

ل رۆژا (٩/تەباخا/١٩٣١)ێ نڤیسەڤانێ ئوردنی (عەلی سەیدو گۆرانی)، پشتی ژ بامەرنێ دەرکەڤتی دا بەرەڤ ئوردنێڤە بچیت، هوسا د ئاخڤیت: ئەز و شێخ غیاسەددین پێکڤە ژ بامەرنێ دەرکەڤتین، ئەو دا چیتە پێشوازیا (مەلك غازی)، دەمژمێر (١٢) نیڤرۆ ئەم گەهشتینە سەرسنکێ و مە زاد ل وێرێ خوار، پاشی شێخ غیاسەددین چوو، کەسەك دا دگەل من دا من پارێزیت و ژ من ئێمن بیت، زێدەباری کو بۆ من ترۆمبێلەکێ بگریت دا پێ بچم. ئەم گەهشتینە گوندی و ئەم ل چایخانێ روینشتینە خارێ، چاڤەرێ هاتنا ترۆومبێلەکێ بووین، بەلێ دەمێ نەهاتی من دەلیڤە دا ئەو رێبەرێ دگەل من هاتی دا بزڤریتەڤە، من هەر خۆ گرت بەلێ یا بێ فایدە بوو چ ترۆمبێل نەهاتن، من ژی نەدڤیا گەلەك ژ دەمێ خۆ ژ قەستا بۆرینم، من دەست هاڤێتێ هندەك پێزانینا ل سەر دەڤەرێ و خەلکێ وێ وەربگرم، بەلێ ژبەر نەزانینا من بۆ زمانێ کوردی و سریانی ئەز نەشیام چ پەیداکەم، پاشی باشبوو من کچکەکا فەلە دیت هندەك عەرەبی دزانی، وێ ترجمانی دناڤبەرا من و موختارێ گوندی دا دکر، پاشی من زانی کو خەلکێ ڤی گوندی و دەوروبەرا وەکی (بیباڤا، گوندك، سەردەراڤ، ئاشەوا) هەمی کورد و ئاشوورینە. ئەز وێ شەڤێ مامە ل سکرینێ، رۆژا پاشتر من دەوارەك کرێکر دا بچمە سوارەتویکا بەلکی ترۆمبێل ل وێرێ هەبیت، من ل وێرێ ژی (محمد ئاغایێ بەرئاشی)دیت[٥٢].

ل سالا (١٩٨٥)ێ خواندنگەهـ ل ئەڤی گوندی هاتیە ئاڤاکرن، بەلێ خەلکێ گوندێن دی، وەکی (گوندکی و بیباڤا و ئاشەوا و سەردەراڤی و بەربانکێ) دهاتنە ڤی گوندی، ل سالا (٢٠١٠)ێ بنکەهەکێ نۆشداری ل ڤی گوندی هاتیە ئاڤاکرن. مزگەفتەکا مەزن ل جهێ مزگەفتا کەڤن یا هاتیە ئاڤاکرن.

ل سالا (١٩٦١)ێ گوند ژلایێ حکۆمەتا عێراقێڤە هاتیە تۆپبارانکرن، دو کەس ژێ شەهید[٥٣] بوونە و چەند کەسێن دی ژی بریندار بووینە و خەلکی گوند هێلایە و بەرەڤ سەرگەلیێ ئاشەواڤە رەڤینە.

## گوندێ سەردەراڤی

دبێژنێ "سەردەراڤ" ژبەرکو دکەڤیتە سەر دەراڤێ ئاڤێ، ئەڤ ناڤە کوردییە و ژ کریارەکا خۆرستی هاتییە. (٦کم) یێ ژ رۆژئاڤایێ ناحیا سەرسنکێ دویرە، رۆژهەلاتێ ڤی گوندی ناحیا سەرسنکێ و گوندێ بادەرشکێیە، گوندێ ئاشەوا و تاژیکا رۆژئاڤایێ

وێیە، گوندێ گوندكی دكەڤیتە ژووریێ وی، ژێریێ وی ژی چیایێ گارەیە. ژێدەرێ ئاڤا گوندی ئاڤا گەلیێ ئاشەوایە[٥٤].

خەلكێ ڤی گوندی فەلەنە، ل سالا (١٩٢٢)ێ و ژبەر كاودانێن دەڤەرێ وەكی شەرێ تیارێ قەستا ڤی گوندی كریە، فەلێن وێ ژی ژ تیرا (بازی)نە، كو وی دەمی (٢٥) مالباتێن مەسیحییا قەستا ڤی گوندی كربوو. گوندێ كەڤن دكەڤیتە هنداڤی ڤی گوندی، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٥]. هەر چەندە ل سالا (١٩٨٩)ێ ژلایێ حكومەتا عێراقێڤە شویرهەكا مەزن لسەر كاڤلێن ڤی گوندی هاتییە ئاڤاكرن، بەلێ هەتا ئەڤرۆ شوینوارێن وی ماینە و زێدەباری كو ناووسكەكا دیرۆكی لێ مایە.

ل سالا (١٩٨٦)ێ گوند هاتییە بەردان، هەتا سالا (٢٠٠٤)ێ جارەكا دی خەلكی قەستا گوندی كریە، نها ژی (٣٧) مالبات لێ د خۆجهن، ژیانا وان گرێدای كارێن پیشەیە و زێدەباری كو هندەك ژ وان د خانەنشینكرینە.

خەلكێ وێ ژ كەڤن بۆ خواندنێ قەستا سكرین و سەرسنكێ كریە. هەر لسالا (١٩٢٢)ێ كەنیسا (مارزەیا) هاتییەئاڤاكرن، هەر ئەو كەنیسە ل ڤان دوماهییا ل نێزیك گوندێ نوی هاتییە ڤەژاندن[٥٦].

## گوندێ ئاشەوا

كەلا ئاشەوا ئێك ژجەڤەنگێن ڤی گوندییە، باهرا پتر ژ ژێدەرێن دیرۆكی ناڤێ كەلا (ئاشەب) دانایە سەر ڤی جهی، لێ د هەیامێن نوی دا، ناڤێ وی بوویە (ئاشەوا)، ئەڤ پەیڤە ژ دو برگا پێك دهێن، (ئاش+ ئاڤ)، مەعنا وێ ئەوە جهێن ئاشێن ئاڤێ، حەتا نها ژی ئەڤ دیارۆكە لێ مایە، زێدەباری هەبوونا ئاڤەكا بۆش كو ئاش دشێن ل سەر كاركەن[٥٧].

ئەڤ كەلایە دكەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتێ باژێركێ سەرسنكێ، ل درێژاهییا سرتا چیایێ گاررووكی، هنداڤێ گوندێ ئاشەوا، ل سەر كۆمتەكێ بلند هاتییە دانان، دبێژنێ (سەرێ كەلێ)، بلنداهییا ڤی گری نزیكی (٣٠٠م)، ئەڤ كۆمتە دكەڤیتە دناڤبەرا دو كومتێن دی، سەرێ (خارا) ل رۆژئاڤایی، سەرێ (ناڤ سەرا) ل رۆژهەلاتی، دو گەلی ڤان هەر سێ كۆمتا ژێك دادبرن، ل رۆژهەلاتی گەلیێ ئاشەوا و ل رۆژئاڤایی گەلیێ تاژیكا[٥٨]. كەلا ژ سێ رەخاڤە یا خۆرستی یە، یا ئاسێ یە، بتنێ ل رەخێ باشووری نەبیت، هندەك یا بەرتەنگە و شویرهە و دیوار بۆ هاتینە چێكرن، شوینوارێن ڤان دیوارا ل ڤی رەخێ دهێنە بەرچاڤكرن، رێكا سەرەكی یا كەلێ ژ رەخێ باشووری ڤە سەردكەڤیت، د ناڤ دۆلەكێ را دچیت، هەرچەند چ ژێ نەمایە[٥٩].

دەرگەهێ كەلێ دكەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتی، شوینوارێن كەلێ هەمی د خرابووینە، ژبلی شەنگستا كو د ئاخێ را ماینە[٦٠].

ژێدەرێن دیرۆكی چ پێزانینێن هویر ل سەر دیرۆكا كەلێ نەداینە بەردەستێ مە، پتریا پێزانینێن هەی، بۆ هەیامێن حوكمێ (عیمادەدینێ زەنكی ٥٢١-٥٤١م/ ١١٢٧- ١١٤٦ز) دزڤریت.

ل سالا (٥٣٧م- ١١٤٢ز)ێ زەنكی لەشكەرەكێ مەزن ب سەركێشیا شوینگرێ خۆ، (نصرالدین جقر) هنارتە كەلا ئاشەوا، بریارا ژ ناڤبرنا وێ دا، پاشی كەلا ئامێدیێ ئاڤاكر، مەرەما وی ژ خرابكرنا ڤێ كەلێ دەست دانانا سەر دەڤەرێ بوو، داكو بەرژەوەندێن وی تێكنەچن ل دەڤەرێ[٦١].

دێ هێینە سەر خەریتا كەلێ، وەكی بەری نها مە ئاڤری داین، كو ئەڤ كەلایە دكەڤیتە سەر كۆمتەكێ بلندێ گاررووكی، جهەكێ بلند و هنداڤێ دەڤەرێ، چەند پەیسكەك دیارن، د كەڤری را هاتینە كۆلان. كەلا وەكی كڤانەكا كێشایی (هێكێ) هاتییە ئاڤاكرن، رەخێ باكووری و پشكەك ژ رەخێ رۆژئاڤایی نەهاتییە شویرهەكرن، ژبەركو ژ خۆرستێ دوڤەرێ یێ ئاسێ یە، مرۆڤ نەشێت ب سەركەڤیت، چەند شوینوارەك ژ دیوارێ كەلێ ماینە، بلنداهییا پشكا مای ژێ (٢م)، دەرگەهێ كەلێ دكەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتی، بەلێ مخابن چ شوینوار ژێ نەماینە، بتنێ هندەك ژ رەخێن دەرگەهی نەبن، كەلا ل سەری نە یا

راستە بەلكی چەند مرۆڤ بەرەف رەخێ باشووری ڤە بچیت، كەلا نزمتر لێ دهێن، ژبەر خۆرستێ ئەردی و توپوگرافییەتا وی[١٢].

بیرەكا ئاڤێ دهێتە دیتن، وەكی سریچ هاتییە بكارئینان بۆ عمباركرنا ئاڤێ، قەلافەتێن وێ (٩×٤م)، كویراتییا وێ ئەڤا مایی (٢م)، ژبەركو گەلەك ئاخ و بەرمایێن مرۆڤا كەفتینە تێدا، ئەڤ رەنگێ بیرا ل گەلەك جها ل كوردستانێ دهێنە دیتن، پشت راستیا عمباركرنا ڤان بیرا ئاڤا بارانا بوو. هاونەكێ مەزنێ بەری ل سەر كەلێ یێ دیارە، تیرەیا (قوتر) دەرگەهی (١٥-٢٠سم) و كویراتییا وی (٨-١٠سم)، ژ ناڤدا بەرمایێن سوتنێ دیارن، دبیت جهێ رۆناهیێ بیت، یان بۆ مەرەمێن ئاڤری دانا یێ بەرامبەری كەلێ هاتبیتە چێكرن، ئەڤ دیاردەیە ل گەلەك كەلا دهێنە دیتن[١٣].

ژ هەژی گوتنێ یە، كەلا ئاشەوا گەلەكا كەڤنە، بەلێ مخابن هاتییە تێكدان، گەلەك سەركێشا حوكم لێ كرییە، ئەڤێ چەندێ كێنجی ل سەر بەرزەبوونا جەڤەنگێن ئاڤاهی كرییە، رەخێ دەرگەهێ وێ هاتییە تێك شێلان، ئەڤەژی یا بوویە رێگر بەرامبەر ڤەكۆلڤانا كو بشێن ڤەكۆلینێن دروست ل سەر بكەن، نەخاسمە دیاركرنا خەریتا كەلێ، زێدەباری ڤێ چەندێ ژێدەرێن دیرۆكێ كێم بەحسێ ڤێ كەلێ كرییە[١٤].

ل دووڤ گوتنا خەلكێ گوندی كو ئەو ل سەردەمێ حوكمێ ئۆسمانییان هاتینە دەڤەرێ، خەلكێ وێ ژ عەشیرەتێن (بەرواری و زێباری و مالەكا هەركیا) پێكدهێن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦١٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٥]. گوندێ نوی هەر ل جهێ گوندێ كەڤن هاتییەدانان، ١٥٠ مالبات ل گوندی دژین، مزگەفتا گوندی یا كەڤن نەمایە، بەلكی ئێكا نوی یا هاتییە ئاڤاكرن. خواندنگەهـ بەری نها لێ هەبوو، بەلێ ئەڤا نها سەرژنوو هاتییە ئاڤاكرن.

ژ ناڤدارێن كەڤنێن ڤی گوندی (محمدێ میرا)

ئاشاوا



كو ل سەر وەختێ سولتانێن ئۆسمانی بوو. ل سالا (١٩٨٨)ێ پشتی خەلك هاتییە دەرێخستن، رژێما چوویی چەند قەسرەك لێ ئاڤاكرن. نها ژی ئەڤ گوندە ب گەشت و گۆزارێ یێ بەرنیاسە[٦٦].

## گوندێ گوندكی

ئەم ب دوور نابینین كو ئەڤ گوندە ل دەستپێكێ یێ بچویك بیت، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ گوندك، د زمانێ كوردی دا ئەڤ دیاردەیە گەلەكا مشەیە، (وك، ئەك) پێڤە دهێنە نیساندن، بۆ بچویككرنا تشتی وەكی (خانیك، كۆلك...)، هەر ل دووڤ چیڤانۆكا چێبوونا ڤی گوندی كو دبێژیت (ل دەستپێكێ سێ مال لێبوون). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢١٨ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٦٧] و نها (٦٧) مالبات لێ دژین و ژ ڤان عەشیرەتانە (بەرواری، دۆسكی، هندەك مزیری، هندەك بامەرنی، مالەكا رێكانییا). ژێدەرێ ئاڤا وان هەر ژ گەلیێ ئاشەوا بۆ دهێت، زێدباری كو بیرەك ژی یا هەی. ژیانا وانا كەڤن ل سەر چاندن و خودانكرنا تەرشوكەوالی بوو[٦٨].

بۆ خواندنێ دچنە سكرینێ. مزگەفتا كەڤن نەمایە، كو ژ ژوورەكێ پێكدهات، بەلێ مزگەفتەكا نوی بۆ هاتییەچێكرن. ئەڤ گوندە ل سالێن شێستادا بۆ جارا ئێكێ هاتییە چۆلكرن، پاشی ل سالا (١٩٨٨)ێ بۆ چەند جارا هاتییە چۆلكرن[٦٩]. پشتی سەرهەلدانێ جارەكا دی خەلكێ گوندی ڤەگەریانە سەر گوندێ خۆ.

## گوندێ بەربانگێ

ل دووڤ گوتنێن خەلكێ گوندی كو گوندێ كەڤن فەلە لێ هەبوون. گوندێ كەڤن دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ نوی، بەری سالا (١٩٦٠)ێ بتنێ مالەك ل گوندی هەبوو، ئەو ژی مالا (سەید سەلیم)ی بوو. ئەڤ گوندێ نها ل سالا (١٩٧٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، نها ژی (٢٠) مالبات لێ دژین كو هەمی ژی ئێك بنەمالن. ل سالا (١٩٩٣)ێ خواندنگەهـ یا لێ هاتییە ئاڤاكرن، بەری سالا (١٩٨٧)ێ بۆ خواندنێ د چوونە خواندنگەها سكرینێ. ل رۆژا (١٩٨٧/٤/١٧)ێ شەفەرێ دەڤێ خۆ دایە ئەڤی گوندی و خرابكرییە. ئەڤ گوندە نێزیكی (٨كم) یێ ژ ناحیا سەرسنكێ دویرە، رۆژهەلاتێ وێ سپنە و سكرینن، ژێریێ وێ گوندێ تاژیكایە و رۆژئاڤایێ وێ ژی گوندێ سەیداڤایە. ژێدەرێن ئاڤێ بەری نها كانی بوون بەلێ نها بیر یێن بۆ هاتینە كۆلان[٧٠].

## گوندێ سەیداڤا

رۆژهەلاتێ وی تاژیكایە، رۆژئاڤا ژی گوندێن رۆستینك و گەربەراسكن، ژووریێ وی ژی گوندێ شێخمەما و گۆلێ و سپنەیە، ژێریێ وی ژی چیایێ گارەیە، نێزیكی (١٠كم) یا ژ ناحیا سەرسنكێ دویرە. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ سەییدا هاتییە، وەكی گوندی دبێژن كو ئەو بەرەبابێن سەییدێن (عانوراما)ینە، دیارە بۆ جارا ئێكێ ئەڤ گوندە ژ لایێ سەییداڤە هاتییە ئاڤاكرن.

گوندێ نوی ل رەخێ رۆژهەلاتێ گوندێ كەڤن هاتییە ئاڤاكرن، بەری سالا (١٩٦١)ێ نێزیكی (٣٠) مالبات ل گوندی دژیان و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٨٧ كەس بوون[٧١]، بەلێ نها هژمارا وان پتر لێ هاتییە و بوویە (٧٥) مالبات، ل سالا (١٩٦١)ێ ژبەر كاودانێن دەڤەرێ گوند هاتییە چۆلكرن، ل سالا (٢٠٠١)ێ جارەكادی خەلك زڤریە گوندی. خواندنگەها وێ هەتا پولا (٦)ێ هەیە.

ژ تشتێن بالكێش ل ئەڤی گوندی هەبوونا مزگەفتەكا دیرۆكییە كو ل سەر دەرگەهێ وێ سالا (١٢٢٣مش) هاتییە نڤیساندن، وەكی دیار كو دیرۆكا وێ بۆ پتری (٢١٠) سالا دزڤریت، بێ دودلی ئەڤە جهەكێ دیرۆكی گرنگە، پێدڤیە جهێن شۆلەژێ زوی دتانێ بچن بەلكی تشتێ باشتر تێدا بیت، ئەڤ مزگەفتە ژ سێ ژوورا پێكدهات، هێشتا دیوارێن وێ نیڤ هەرفتەنە، ژ مەلایێن ناڤدارێن گوندی (سەید میسا و مەلا رەشید)، مزگەفتا نوی یا گوندی ل سالا (٢٠٠٨)ێ هاتییە ئاڤاكرن[٧٢].

## گوندێ گەربەراسكێ

ئەڤ گوندە نێزیکی (١٥کم) یێ ژ سەرسنکێ دویرە، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ رۆستینکێیە، رۆژئاڤایێ وێ گوندێ ئەلکیشکێیە، ژووریێ وێ دکەڤیتە سەر سپنەی، ژێریێ وێ ژی چیایێ گارەی و گوندێ کۆرەمارکێنە، کانیا گەربەراسکێ ژێدەرێ ئاڤێ بوو، بەلێ نها پتر بیر بۆ هاتینە کۆلان.

دبێژنێ گەربەراسکێ کو گەرێن بەرازا لێ هەبوون[٧٣]، گوندێ نوی هەر ل جهێ گوندێ کەڤن هاتیە دانان، نها (٦٥) مالبات لێ دژین. هەر ژ سالا خواندنێ (١٩٧٢-١٩٧٣)ێ خواندنگەها دەستپێکی یا لێ هەی، نها ژی هەتا پۆلا شەشێ یا هەی، پاشی خەلك د چوونە سوارەتویکا بۆ تەمامکرنێ.

مزگەفتا وێ یا کەڤن نەمایە، بەلێ ل سالا (١٩٧٠)ێ مزگەفتەکا دی ل گوندی ئاڤاکرییە، ژ مەلایێن ناڤدارێن ڤی گوندی (مەلا ئەحمەدێ گەربەراسکی). مەزارێ سەید عەلی مەزارەکێ پیرۆزە ل گەربەراسکێ بەلێ دیرۆکا وێ یا دیار نینە[٧٤].

## گوندێ تاژیکا

نێزیکی (٨کم) یا ژ ناحیا سەرسنکێ دویرە، ژووریێ وێ گوندێ بیباڤایە، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ ئاشەوا و سەردەراڤینە، رۆژئاڤایێ وێ گوندێ رۆستینك و سوارەتویکانە، ژێریێ وێ ژی چیایێ گارەیە. سەرۆکانییا تاژیکا ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، ژ بلی ئاڤا گەلیێ ئاشەوا. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٥]. خواندنگەها گوندی ل سالا (١٩٧٠)ێ هاتیە ئاڤاکرن، بەلێ ئەڤا نوی ل سالا (٢٠٠٠)ێ هاتیەئاڤاکرن، هەتا پۆلا شەشێ یا لێ هەی. مزگەفتا وێ ل سالا (١٩٧٠)ێ هاتیە ئاڤاکرن، بەلێ گەلەك جارا خرابببوویە و جارەکا دی خەلکی ئاڤاکرییە، مزگەفتا نوی ل سالا (٢٠٠٢)ێ هاتیە ئاڤاکرن.

ل سالا (١٩٦٣)ێ گوند هاتیە بەردان، ئەڤە ژی ژبەر کاودانێن دەڤەرێ، دیسان ل سالا (١٩٨٧)ێ بۆ جارا دووێ گوند هاتیە بەردان، بەلێ ل سالا (٢٠٠٠)ێ خەلکێ گوندی قەستکریێ، (٣٠) مالبات لێ خۆجهبوونە.

ژ شوینواریێن ڤی گوندی هەبوونا "خانا تاژیکا" یا دیرۆکی، بەلێ مخابن پشتی حکۆمەتا عێراقێ جادە چێکری ل سالێن هەشتیا دا هاتە خرابکرن، ئەم ب دوور نابینین کو ئەڤە رێکەکا دیرۆکی بیت ژ دەڤەرێ بەرەڤ دەڤەرا بەرواری ژێری و دەڤەرێن دۆسکی و مزیریاڤە دچوو، وەکی دیار کو گەلیێ وێ ل ئەڤی جهی نزم دبیت و دەلیڤا هاتنوچوونێ تێدا هەیە، ژ بلی ڤێ چەندێ ژی شوینوارێن دو ئاشا هەتا نها لێ ماینە[٧٦].

## گوندێ رۆستینکێ

نێزیکی (١٢کم) یا ژ رۆژئاڤایێ ناحیا سەرسنکێ دویرە، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ بیباڤا و تاژیکایە، رۆژئاڤایێ وێ گوندێ گەربەراسك و کۆرەمارکێنە، ژووریێ وێ سپنەیە و ژێریێ وێ گوندێ سوارەتویکایە. ژێدەرێن ئاڤێ چەند کانینە، ژ وان (کانیا گوندی ئانکو دبێژنێ کانیا رۆژهەلاتی، کانی قەرەچکێ، کانیا گرێ قەسرێ).

دو بۆچوون ل سەر ناڤێ گوندی هەنە، یا ئێکێ کو جهێ گوندی یێ راستە وەکی مێرگەکا راستە، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ "رۆستینك"، هەکە مرۆڤ سەحکەتە دەستودانێ جۆگرافیا گوندی دبیت ئەڤ چەند یا بەرئاقل بیت، بۆچوونا دووێ ئەوە کو خەلکێ ڤی گوندی مرۆڤێن راستن[٧٧].

ل دۆر دیرۆکا گوندی، خەلکێ گوندی دبێژن کو ئەڤە شەش بابە ئەم هاتینە گوندی، یا بەرئاقلتر ئەوە کو خەلکێ گوندی ل چەرخێ (١٧) زاینی قەستا ڤی گوندی کرییە، ل رویدانێن "سەفەر بەلەکێ" ل سالا (١٩١٥)ێ دو ژ خەلکێ رۆستینکێ برینە و هەتا نها ژی چ ژێ نزانن[٧٨]. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧) ێ ٢٠٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٩] و بەری سالا (١٩٦١)ێ نێزیکی (٢٦-٢٧ ) مالبات لێ بوون، بەلێ د سالێن حەفتێیان دا هژمارا وان بوونە (٤٠) مالبات، بەری سالا (١٩٨٨)ێ جارەکا دی بەرەڤ کێمبوونێ ڤە چوون، بوونە (١٨) مالبات، ل سالا (١٩٨٤)ێ گوند هێدی هێدی هاتە بەردان، هەتا سالا (١٩٨٨)ێ گوند

ب تەمامی هاتە بەردان، ل سالا (١٩٩١)ێ خەلکێ گوندی ڤەگەریا سەر گوندێ خۆ، سالا (١٩٩٣)ێ ب ئێکجاری گوند هاتە بەردان و نها یێ چۆلکرییە.

خواندنگەها وێ ل سالا (١٩٧٦-١٩٧٧) هاتە ڤەکرن، وی دەمی ژ پۆلا ئێکێ دەستپێکر، نێزیکی (٤٠) خویندکار لێ هەبوون. ل سالا (١٩٧٦)ێ بۆ جارا ئێکێ کارەب گەهشتە گوندی. مزگەفتا گوندی یا کەڤن چەند جارا خرابوویە و ژ جهێ وێ هاتییە ڤەگوهاستن، ژ ئێك ژوور پێکدهات و یا درێژ و درێژ بوو، سێ پەنجەرك لێ هەبوون و دەرگەهێ وێ دکەڤتە کۆژیێ رۆژئاڤایی.

ژ جهێن دیارێن ڤی گوندی، کانییا تبەرکێ یا کو دبێژنێ (کانییا پیر نسرەتێ) کو خەلك بۆ مەرەمێن نۆژداری و ساخلەمیێ بکاردئینن، زێدەباری هەبوونا گۆرێ (سەیدە ئامینا)یێ، دیسان بەرەکێ (مداری) یێ هەی کو هاتییە ڤەگوهاستن بۆ گوندێ رۆستینکا ژێری، دیاردکەت کو جهێ هێرانا دەخلودانی ل ڤی گوندی هەبوویە[٨٠].

## گوندێ بیباڤا

وەکی ژ ناڤێ وێ دیار کو بۆ جارا ئێکێ ژ لایێ (بیبو)یڤە هاتییە ئاڤاکرن، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ بیباڤا، رۆژهەلاتێ گوندی گوندێ "گوندکییە"، رۆژئاڤایێ وی گوندێ سەیداڤایە، ژێریێ وی گوندێ تاژیکایە و ژووریێ وی گوندێ سکرینێیە. ژێدەرێ ئاڤا وان ژ گەلیێ ئاشەوا دهێن، زێدەباری کانییا بیباڤا کو نها کەڤتە بن بەنداڤا بیباڤا دا.

گوندێ کەڤن (٢٠) مال لێ هەبوون و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٨١] و گوندێ نوی ژێ ل نێزیك گوندێ کەڤن هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ گوندی ژ سێ عەشیرەتا پێك دهێن، (بەرواری، دۆسکی، فەلێن بەرواریا). بۆ خواندنێ خەلکێ گوندی دچنە خواندنگەها سکرینێ، ل سالا (١٩٨٧)ێ گوند هاتییە بەردان[٨٢].

بەلێ پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ جارەکا دی خەلکێ گوندی ڤەگەریانە سەر گوندێ خۆ.

ژ شوینوارێن ڤی گوندی ل نێزیك گوندی بۆ رەخێ ژووریێ رۆژهەلاتی، قەبرستان و شوینوارێن دێرەکا مەسیحیيا هەنە، کو هەتا نها بەرێن دێرێ دیارن دگەل پارچەکا دیواری کو ژبەر و کسلا هاتییە چێکرن، زێدەباری کو گۆرێن وێ قەبرستانی جارەکا دی هاتینە ب سەروبەرکرن، جهێ وان ژێ هاتییە بەرژانکرن[٨٣].

رویدانەکا گەلەکا ناڤدار یا ل ڤی گوندی چێبووی، ئەو ژی دەمێ عەشیرەتێن (مزیری و شەرەفانیا) ب شەڤ ل ڤی گوندی کەمینەیەك بۆ (قباد پاشا)ی و دویڤەلانکێن وی ڤەدای، ل سالا (١٢١٨مش/ ١٨٠٣ز) و شیان وی بگرن و برە ئامێدیێ و دا دەستێ میرێ ئامێدیێ (عادل پاشای) و کرە د زینداڤێڤە[٨٤]. ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ دی بۆ مە دیاردکەت، ئەو ژی کو ئەڤ دەڤەرە رێکا سەرێشکا میرگەها بەهدینان بوو، هەر جهێ خانا تاژیکا ژی رێکا بتنێ بۆ د دەڤەرێ را دچوو.

## گوندێ کانی چنارکێ

دبێژنێ (کانی جنارکێ) ژبەر هەبوونا کانیەکا ئاڤێ ل وی جهی و شوینبوونا دارا چنارێ. دکەڤیتە سەر صینێ بەهدینان، نها جادا د ناڤبەرا ئاشەوا-قەدشێ د ناڤرا دچیت، کو ل سالا(١٩٣٦ز)ێ خەلکێ گوندێ ئەرەدنا لێ خۆجهببوون، وی دەمی بتنێ (٨) مالبات هاتبوونێ و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠١ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٨٥]، بەلێ ل سالا (١٩٦٣ز)ێ ل سەر دەستێ حکۆمەتا عێراقێ هاتییە سۆتن. پشتی سالا (١٩٨٨)ێ جادەك دناڤ ڤی گوندی را چوو، ئەو بوو کاڤلێن گوندی ژی هەمی بەرزەکرن، تنێ کانییا گوندی مایە[٨٦]. ژ هەژی گوتنێیە کو نها تاخەکێ سەرسنکێ ب ڤی ناڤییە، کو ل سالا (١٩٧٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن.

## گوندێ بادەرەشكێ

ئـەڤ گـونده یـێ هەڤتوخیبه دگــەل ناحیا سـەرسـنكـێ و بتنێ شیڤەكا د نیڤەكا وان دا هەی، ژێدەرێن ئاڤا هەردو گوندا هەر كانییا سەرسنكێیە. ل سەر ناڤێ وێ ژی چەند بۆچوونەك هەنە:

١- بادەرەش ژ پەیڤا (بیث دراشا) هاتبیت، (كـێ) ژی یا بچویكرنێیە، د زمانێ عەرەبی دا دبێژنێ (بیت الدراسە)، د كوردیێ دا (مالا خواندنێیە)، ژڤێ بیروبوچوونێ دیاردبیت كو بادەرەشكێ جهێ خواندن و زانینا بوو.

٢- پەیڤا بادەرەشك ژ پەیڤا (بوتراثا) یا سریانی هاتبیت، كو د زمانێ عەرەبی دا رامانا وێ (بیادر) و د زمانێ كوردی دا (بێدەرا دەخلودانی)، دیارە ژ كەڤندا گەلەك بێدەر ل وێرێ هەبووینە[٨٧].

٣- یا كو پتر بادەرەش پێ بەرنیاس ئەوە كو بهارا وێ زوی دهێن، هەروەكی كورد بۆ گیرۆبوونا هەر تشتەكی دبێژن (بهارە ل بادەرەشكێ....)، نە دویرە ڤی ناڤی گرێدانەك دگەل كریارا خۆ هەبیت.

ژێدەرێ ژ هەمیا كەڤنتر كو بەحسێ بادەرەشكێ كری، ڤەدگەریت بو بیرهاتنێن هاریكارێ قونسلێ ئنگلیزی ل مویسلێ (جـورج برسی بادجەر) ل سالا (١٨٤٢ز)ێ، هەیامێ ب رێكێڤە دا بەرەڤ باكوورێ كوردستانێ (ئاشویتێ) چیت. دیار دكەت كو شەڤەكێ ل بادەرەشكێ نڤستیە[٨٨]. ل سالا (١٩٢٣)ێ چەند مالباتەكێن مەسیحیا قەستا ڤی گوندی كرییە. كەنیسا (مارگوركیس) ل سالا (١٩٢٦)ێ لێ ئاڤاكرییە، خەلكێ ڤی گوندی پتر فەلێن بازینە، زێدەباری چەند مالباتێن كوردا. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٨٦ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٨٩]. بۆ خواندنێ خەلكێ وێ دچیتە سەرسنكێ، ل دەستپێكێ چەند مالەكبوون بەلێ نها گەلەك بەرفرەهـ بوویە، وەكی تاخەكێ سەرسنكێ دهێتە هژمارتن.

گوندێ كانی چناركێ



## گوندێ مەیدانكا رویڤیا
## (تاخێ ئازادیێ یان بەفرین)

نها بوویە كۆمەلگەهەكا گەلەك بەرفرەهـ دكەڤیتە رۆژهەلاتێ سەرسنكێ، د سالێن سیهادا وەكی جهێ چاندنا برنجی بوو، جۆكا ئاڤێ ژ سەرسنكێ د چوو سەر.

پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ چەند مالباتێن گوندێ چێیا (دۆسكی ژووریا) قەستكرینێ، پاشی هێدی هێدی خەلكی قەستا وێ كرییە، سێ خواندنگەهـ لێ هەنە، زێدەباری بنكەهەكێ نۆشداریێ.

## گوندێ دهیكێ

دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گەلیێ گەرەگۆ و گوندێ باوەركا كەڤری، گوندەكێ بچویكە كو نها بتنێ دو مالبات لێ هەنە، ل سالا (١٩٣٤-١٩٣٥)ێ چەند مالباتێن مەسیحییا قەست كربوویێ، هژمارا وان دناڤبەرا (٢٠-٣٠) مالباتا بوون، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٠ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٩٠] و ژێدەرێ ئاڤا وان ژ گەلیێ گەرەگۆیە، قەبرستانا وان نێزیكی گوندییە، ژ ناڤدارێن وان (رەئیس گلیانا). دێرەك ل ڤی گوندی هەبوو هەر چەندە نها هندەك ژ دیوارێن وێ ماینە و دبێژنێ مارزەیا. ل سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەها سەرەتایی گەهشتییە گوندی[٩١].

## گوندێ سەرگركێ

دبێژنێ سەرگركی ژبەركو دكەڤیتە سەر گرەكێ بلند، گوندێ نوی هەر ل جهێ گوندێ كەڤن هاتییە دانان، نەدویرە ئەڤ گرە جهەكێ شوینواری بیت ژبەركو دەمێ خەلك بنیاتێ خانییێن خۆ دكۆلن جارا جارا گۆزكا دبینن، ناڤ ناڤەكێ كوردییە كو گرێدایی جهەكێ جۆگرافییە. ژووریێ وێ دكەڤیتە سەر سپنەی، ژێریێ وێ ژی گوندێ باوەركا كەڤرییە، رۆژهەلاتێ وێ باوەركا كەعبێیە و رۆژئاڤایێ وێ گوندێ

گوندێ بادەرەشكێ



دهیكێیە. ژێدەرێ ئاڤا وان ژی هەر گرێدایی كەلیێ گەرەگۆیە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٩٢] و ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند ب ئێكجاری هاتییە بەردان، پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندی جارەكا دی قەستكرێ، نها بتنێ مالەك لێ دژیت.

ئەو خەلكێ قەستكرێ ژبەر ئاریشەكا جڤاكی هاتینە ڤی گوندی، كو ژ دەڤەرا ئۆرەمارێ هاتبوون[٩٣]. ل سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ گەهشتیە ڤی گوندی. ل رویدانێن شۆرشا كوردی ڤی گوندی ژی باهرا خۆ تێهەبوویە، ل نیسانا سالا (١٩٦٢)ێ مەفرەزەكا پێشمەرگەی ل ڤی گوندی دربەكی مەزن ل هێزێن عێراقێ دا[٩٤].

## گوندێ باوەركا كەڤری

گوند ل سەر مێرگەكا پەحن و بلند هاتییە ئاڤاكرن، نێزیكی (٦كم) یا ژ رۆژهەلاتێ باژێرێ سەرسنكێ دویرە، دكەڤیتە دانگا چیایێ گارەی، بلندیا وی ژ ئاستێ بەحرێ (١٤٠٠م). جهەكێ سار و بەفرینە و رێژەكا باشا بارانێ لێ دباریت كو دناڤبەرا (٨٠٠-١٠٠٠ملم)[٩٥].

ل سەر ناڤێ گوندی (د.عماد عبدالسلام) ب میرێ ئامێدیێ (بەیرامێ كورێ میر سەیفەددینی)ڤە گرێددەت، پشتی كو (حەبیبەخانا) مزیری بۆ خۆ ئینای، گوندێ باوەركا كەعبێ دكەڤیتە ژێریێ رۆژهەلاتێ باژێرێ ئامێدیێ، نێزیكی گوندێ دهیك و سەرسنكێ، ئاڤ ژ رویبار و كانیێن دەوروبەرا ب رێكا كەهریزا گەهاندیێ، قەسر بۆ خۆ و داردەستێن خۆ لێ چێكرن، هەتا نها ژی گوند یێ هەی، پاشی بوویە وەقف، ناڤێ وێ ژ بایرام بوویە باوەركێ[٩٦].

لێ خەلكێ گوندی بۆچوونەكا دی دبێژن، كو ناڤ یێ ژ دو گەها پێك هاتییە، ئەو ژی (باوەرك+ كەڤری)، وەكی دهێنە گۆتن كو باوەرك ژ پەیڤا باوەری هاتییە، لدویڤ چیڤانۆكا ل سەر گوندی هەی دو كەس ژ دەڤەرا دۆسكییا ب ناڤێ (محەمەد و لاوی) هاتینە

ناوسكێن گوندێ دهیكێ



ئامێدیێ. ل وێرێ د خواند، پاشی ژبەر رەوشت و زیرەكاتییا وان، سەیدایێ ئێك ژ وان داخواز ژێ كرییە كو كچا وی مەهر بكەت، پاشی وی خۆ ژێ دایە پاش و ژێ قەبیل نەكرییە، هوسا پاشی هاتینە ڤی جهی، ژبەر كو مرۆڤێن دیندار و باوەری بوون، خەلكی ئەڤ ناڤە دانایە سەر، ژبەر هندێ دبێژنێ باوەرك، پەیڤا كەڤر ژی ئەوە یا ل سەر كەڤرەكێ مەزن و پەحن هاتییە ئاڤاكرن[٩٧].

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٩٨]. سالا (١٩٧٣)ێ خواندنگەهـ گەهشتیە گوندی[٩٩]. بەلێ ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتییە بەردان، خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٧٣)ێ بزاڤكرییە كو جادێ بەرەڤ گوندی ببەن، ل سالا (١٩٩٤)ێ مزگەفتەكا نوی هاتییە ڤەكرن، بەلێ مزگەفتا كەڤن لێ نەمایە.

سێ جارا گوندێ باوەركا كەڤری هاتییە خرابكرن، داوی جار ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ بوو، كو (١٨) كەس ژ وی گوندی هاتییە ئەنفالكرن. نها ژی گوندەكێ ئاڤایە و هەمی پێدڤیێن ژیانێ لێ هەنە، نها خەلكێ گوندی بووینە (٧٥) مالبات، پشك دبنە سەر چەند بنەمالەكا ئەو ژی (بنەمالا حەجی بنگەلی و بنەمالا بیتاریا و بنەمالا گۆلێ)[١٠٠].

## گوندێ باوەركا كەعبێ

نێزیكی (٨كم) یا ژ رۆژهەلاتێ ناحیا سەرسنكێ دوورە، ژێریێ وێ باوەركا كەڤری و گوندێ مێركەتییە، ژووریێ وێ ژی سپنە و گوندێ بیناتانە، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ زێوەیە، رۆژئاڤایێ وێ ژی گوندێ سەرگركی و دهیكێ یە. ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی كەلەكن ژ وان (جۆكا گوندی یا كو بەیرەم بەگێ ئاڤاكری، كانییا مالا، كانییا بنەفشۆكێ، كانییا بەرۆژی). كۆمەكا جەڤەنگێن شوینواری و كەڤن ل ئەڤی گوندی هەنە، وەك (مەزارێ تەفال، سەید ئۆسمان و سەید قۆریش، پیرخۆخ و پیر گەوەر، جۆكا قەنتەرێ و كەڤنەئاش، دیسان چەند شكەفتەك لێ هەنە: شكەفتا بانەسۆر و شكەفتا بانەرەش و شكەفتا نەخشین).

بەری كو میر (بەهرام بەگ) بارەگەهێ خۆ ڤەگوهێزیتە گەلیێ مزیركا كو پشتی (حەبیبەخانا) مزیری بۆ خۆ ئینای، باوەركێ ئاڤاكربوو، گرەكێ بچویك ل وێرێ هەبوو، قەسرا خۆ ل سەر دانا، گرەكێ ل خارتر جهێ داردەستێن خۆ ل سەر ئاڤاكر[١٠١]. بەهرام بەگ كۆرێ میر سێفدینییە، ل سەدسالییا شازدێ ژیایە، ئەو كەسەك بوو های ژ خۆ نەبوو و چ شۆل ب ناڤێ ویڤە نەهاتینە گرێدان، پشتی رویدانەكێ دگەل (قوباد پاشا)ی ئەو دهێنە كوشتن[١٠٢].

ل دووڤ چیڤانۆكێ كو دو كەسێن دیندار ل ئەڤی گوندی هەبوون، (سەید قورەیش و سەید ئۆسمان)، دبێژن: دەمێ سەید قورەیش چوویە مزگەفتێ، دەنگەك ژ پێلاڤا وی هات، گۆت یا خودێ ئەز ئەردێ خۆ هەمیێ بكەمە وەقف بەس دەمێ ئەز ژ مزگەفتێ دەردكەڤم، دەنگ ژ پێلاڤا من بهێن، برایێ وی ژی سەید ئۆسمانی های ژێ بوو، وی ژی گۆت یا ئەردێ من ژی بۆ مزگەفتێ بەس دەنگ ژ پێلاڤا وی بهێن. ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ باوەركا كەعبێ[١٠٣].

ل سالا (١٩١٤)ێ "میرخان ابراهیم اسماعیل" ژ گوندێ "ئۆكا" دەڤەرا دەشتا زێ هاتە گوندی، هوسا گوند ئاڤاكر، خەلكەكێ دی ژ بەرواری ژووریێ قەستا گوندی كر، وەكی (تەیارێ بیتكاری و صوفی زاهری، تاجەدینێ مەغربی و دەرباس ژ گوندێ كولان هاتن، میرزا ژی ژ باوەركا كەعبێ و ئەحمێ ژ هەڤندكا هاتن)، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٧ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٠٤] و بەری گوند خرابببیت (٢٨) مالبات لێ دژیان، پشتی شۆرشا ئیلۆلێ خەلكێ گوندی بەرەڤ نزاریڤە چوون، دو سالا ل وێرێ مان، ل سالا (١٩٦٣)ێ جارەكا دی زڤرینە سەر گوندێ خۆ، ل سالا (١٩٦٦)ێ جارەكا دی گوند هاتە بەردان، دیسان ل سالا (١٩٦٨)ێ گوند جارەكا دی ژی هاتە بەردان، هەتا بەیانا (١١ ئادارێ) خەلكێ گوندی ڤەگەریانە سەر گوندێ خۆ، ل سالا (١٩٨٦)ێ جارەكا دی خەلكێ گوندی چوونە نزاری، بەلێ ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند ب ئێكجاری هاتە بەردان. پشتی سالا (١٩٩١)ێ چەند مالەك چوونە گوندی هژمارا وان دناڤبەرا (١٥-١٦) مالباتا بوون، بەلێ ژبەر كاوادنێن دەڤەرێ ل

سالا (١٩٩٧)ێ گوند هاتە بەردان، نها ژی بتنێ (٢) مالبات لێ دژین.

خواندنگەها دووێ ل دەڤەرا بەرێگارێ هاتییە ئاڤاكرن، خواندنگەها باوەركا كەعبێ بوو، كو ل سالا (١٩٧١)ێ هاتبوو ئاڤاكرن، نێزیكی (٢٠-٣٠) خویندكارا لێ دخواند[١٠٥].

## گوندێ مێرگەتیێ

رۆژئاڤایێ وێ گوندێ باوەركا كەڤرییە، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ زێوەیە، ژێریێ وێ چیایێ گارەیە و ژووریێ وێ سپنەیە. ژێدەرێن ئاڤا وان ژ جۆكا گەلیێ گەرەگۆ و چەند كانیەكا دهێن، وەكی (كانییا مناسبی و كانییا زمێ، كانی جۆلانك و شیڤێ). وەكی ژ ناڤێ وێ دیار كو ژ(مێرگا+ تۆیا) پێكدهێن، ئەو ژی مێرگا تیایە بەری گوند بهێنێ، هەر چاوابیت دیارە كو كەڤنە گوندەكێ ل نێزیكتر هەی، بەری گوندی بهێنە مێرگەتیێ.

خەلكێ گوندی پتریا وان ژ گوندێ "هنارە" یێ زێبارییا هاتینە، وەكی دیار ل چەرخێ ١٧ مشەختبووینە ڤی گوندی، زێدەباری نێروەی و سەیدا ژی ل گوندی هەنە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤١ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٠٦] و بەری سالا (١٩٨٨)ێ (٣٥) مالبات ل گوندی هەبوون.

سالا (١٩٧٧)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ گەهشتە گوندی، نێزیكی (٤٠- ٥٠) خویندكارا لێ دخواند، هەر چەندە ل دەستپێكێ خواندنگەهـ د مالەكێڤە بوو[١٠٧]. پاشی ل سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ بۆ هاتە ئاڤاكرن.

مزگەفتا گوندی ل سالا (١٩٧٢)ێ هاتییە ئاڤاكرن، هەر چەندە بەری وی دەمی مزگەفت هەبوو، چەند فەقەكا لێ دخواند.

ل سالا (١٩٦٦)ێ گوند هاتییە بەردان، پاشی جارەكا دی خەلكێ گوندی زڤرینە سەر گوندێ خۆ، ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند ب ئێكجاری هاتییە بەردان،

گەرەگۆ



(١٨) ئەنفالكری ل گوندی هەنە، (٧) ژ وان هەر ل گوندی هاتبوونە گرتن و گولەبارانكرن[١٠٨]. نها ژی گوند یێ بەردایە.

## گوندێ گەرەگۆ

دكەڤیتە بن سیها سرتا چیایێ گارەی، ناڤێ وی پتر یێ گرێدایی چیایێ گارەیە، دوماهیك گوندێ دەڤەرا بەرێكارێ یە، ژ رۆژئاڤایڤە، تۆخیبێن وێ دگەل ناحیا سەرسنكێ نە، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ گارەبایە، ژێریێ وێ گوندێ دهیك و سەرگركییە. پەیڤا گەرەگۆ ژ دو پەیڤا پێكدهێن (گەر+گۆ) وەسا دهێنە شرۆڤەكرن كو (مەلەڤانگەهەكا خۆرستییە)، ژبەركو چیایێ گارەی ل ڤی جهی دبیتە دو چەق، گوندێ گەرەگۆ دكەڤیتە دنیڤا وان چەقادا، زێدەباری كو جهەكێ كویر و گرتییە[١٠٩].

ژ جهێن شوینواری یێن ناڤدار ل ئەڤی گوندی، قەبرستان وخلوەتا "مارزەبای" دكەڤیتە سرتا چیایێ گارەی ل هنداڤا گوندێ گەرەگۆ ل دەڤەرا بەرێكارێ، جهەك دژوار و ئاسێ و دوور و تژی داروبار، جهەك ڤەكری لسەر گۆما خۆرستیا گەرەگۆ، ئەڤ جهە گرێدایی دینی و بیروباوەرایە. بوسلمان دبێژنێ (كورێ مزگەفتا) نە دویرە ئەڤ رێزكە هاتبیتە سڤك كرن ژ (گۆڕێ مزگەفتا) ژبەركو دۆ گۆڕ دناڤ ڤێ شكەفتێ دا هاتینە ڤەشارتن[١١٠]. ل دەڤ مەسیحییا ناڤێ شكەفتێ (مارزەیا)یە، هەروەكی د چیرۆكا ژیانا (تشیعیتێن) مارزەیایی دا هاتی، ل سالا (٣٠٩ز)ێ مارزەیای دینداری ل ڤێرێ بەلاڤكرییە و ناڤێ چیایێ گارەی هەر ب (گارە) هاتییە.[١١١].

ئەڤ ئاڤاهییە نیڤ دەستكارە و نیڤ خۆرستی یە، بالا دیندارا ژ كەڤن كێشایە، بوویە خالا پێوەرهاتنێ بۆ هەمی خەلكی ژ بوسلمان و مەسیحییا[١١٢].

ئاڤاهیێ كورێ مزگەفتا ژ سێ پشكێن سەرەكی دهێنە دیتن، یا ئێكێ بەرمایێن دیوارەكێ مەزنن، ئەڤ دیوارە شكەفتێ ژ دەرڤە د نخێڤیت، ژبەر و ماددێ كسلێ هاتییە نژنین، بلنداهییا وی (ئەوا هەتا ئەڤرۆ مای) (١،٦٠م)، پەحنیا دیواری (٨٤سم)، دەرگەهەك ل رەخێ باكوورێ دیواری هاتییە دروست كرن و ژ رەنگێ دەرگەهێن دەركەفتیە ئەوا د كارێ ئاڤاهیادا دا ب عەرەبی دبێژنێ (الطلعات و الدخلات) ب مەرەما ب هێز ئێخستنا بنیاتێن ئاڤاهی، زێدەباری دانا جوانییەكێ بۆ ئاڤاهی، فرەهییا دەرگەهێ (٧٥سم)[١١٣]، درێژاهییا هەمی دیواری (٨،٤٠م)، پێكۆل هاتییە كرن كو دەرگەهێ ڤی جهێ دینی وەكی هەمی پەرستگەهێن مەسیحییا ل دەڤەرێ ل رەخێ رۆژهەلاتێ بیت.

دۆ گۆڕ دناڤ ڤێ شكەفتێ دا هاتینە ڤەشارتن، بوسلمان دبێژنێ گۆڕێ (خویشك و برا)[١١٤]، فەلە دبێژنێ (مارزەیا) ئەو دیندارەكێ مەسیحییا بوو ل ئەڤی جهی هاتییە ڤەشارتن. دیسان ئاڤەكا كێم ل ڤێ شكەفتێ دزێتن و ژێدەرێ ئاڤێ یە بۆ هەمی لڤینێن ل وێرێ دهێنە كرن[١١٥].

دەرگەهەكێ بچویك مرۆڤی دبەتە دناڤ خلوەتێ دا، پەحنیا دەرگەهی (٣٧سم)، بلنداهییا وی (٩٣سم)، نە دویرە ژ دارێ توبییێ هاتبیتە چێكرن[١١٦]، دگەل بزمارێن كەڤن، مخابن خەلكی چەند پیتێن ل سەر نڤێسین، ئەڤێ چەندێ كەڤناتییا دەرگەهی تێكدایە، خلوە نە گەلەكا ب سەروبەرە ژبەركو خۆرستێ دەڤەرێ یێ ئاسێ و بەرتەنگە، درێژاهییا خلوەتێ (٥م) و فرەهییا وێ (٢،٥م)، ژ ناڤ خلوێ دا ناوۆسكەك هاتییە گوگراندن، نە دویرە ل هەیامەكێ دیرۆكی جهێ پەرستڤانێن (كاهنێن) مەسیحییا بیت[١١٧].

هەژی گوتنێ یە ژ رەخێ دی یێ چیایێ گارەی، ل بەرامبەر گوندێ سیارێ و پەسارێن چیای، قەبرستان و خلوەتەكا دی هەیە ب ناڤێ (ماراداود- خەلكی ئەڤ ناڤە بچویك كرییە و دبێژنێ مەرداود)[١١٨]، هەر چەندە دەستودانێ وی یێ شوینواری باشترە ژ كورێ مزگەفتا و هەتا نها چەند جەرك و لینك دناڤ دا ماینە زێدەباری هەبوونا كانیەكا ئاڤێ و گۆڕێن پەرستڤانێن فەلا.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٨١ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١١٩] و بەری سالا (١٩٨٨)ێ (١٥-٢٠) مالباتا لێ د ژیان، گوند ژ (٤) ئیجاچا پێكدهێن، (ئیجاخا ناڤ گوندی، ئیجاخا مام حەجی، ئیجاخا

عەلی سێڤا، ئێجاخا عەلی رەحیما).
كۆمەكا ژێدەرێن ئاڤێ ل ئەڤی گوندی هەنە، وەك (كانییا مەلا ئەمەدی، كانییا بەستكی دەراڤێ مەلكێ "مەلك سلیۆ"، كانییا بەرێ پێنج جۆنی، كانییا قرقركێ، كانییا زیزەبەرێ، كانییا خدرا.....).
ژ تشتێن ناڤدار و جهێ حێبەتیێ ل ئەڤی گوندی، كۆمەكا شوینوار لێ هەنە، وەكی (شوینوارێن سەر قەسرێ، دو ناووسك، گۆرستان)، زێدەباری چەند دیاردەكێن خۆرستی، وەك (كۆن ڤاقیچكێ، كانی گرسیلێ كو بۆ چارەكرنا نەخۆشا دهاتە بكارئینان، شیڤا چەلكێ هەلزێ، كەزانەكا گەلەك مەزن لێ هەبوو بەلێ د ئەنفالا دا هاتە هشككرن، دارا خەندەكۆكێ).

## گوندێ گارەیا

رۆژهەلاتێ وێ گوندێ زێوا سەیدایە، رۆژئاڤایێ وێ گوندێ گەرەگۆیە، ژێدەرێن ئاڤا وان سێ كانیێن سەریشكن، (كانی شكەفتێ و واركێ و سنكا). ل دووڤ چیڤانۆكێن خەلكی، خەلكێ ڤی گوندی د بنیات دا (ئێزدی و شەرەف و زێدكن).
ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٦٤ كەس ل ڤی گوندی دژیـــان[١٢٠] و بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی (٥٠) مالباتا لێ دژیان[١٢١]، خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ گەهشتیێ[١٢٢]. (٦٠) خویندكارا لێ دخواند، ژ گوندێن گەرەگۆ و زێوە ژی دهاتنێ، مزگەفتا گوندی ژ كەڤن ژ بەرا هاتبوو ئاڤاكرن، پەنجەرێن وێ بەرەڤ رۆگەهێ (قیبلێ)ڤە بوون.
ژ تشتێن ناڤدار ل ڤی گوندی، هەبوونا گۆرێ (شێخێ مەزری) لدویڤ گۆتنێن خەلكێ گوندی كو ئەڤ شێخە (دینا چێدكەتەڤە)، گۆرێ وێ ب بەرا هاتیە چێكرن و دیارە دەمێ هاتیە سەخبێركرن چیمەنتو هاتیە بكارئینان و بهایێ وێ یێ شوینوارێ هاتیە تێكدان[١٢٣].
ناڤێ ڤی گوندی ژ ناڤێ چیایێ گارەی هاتیە، د.عیماد عبدولسەلامی نڤیسیە: گارە سرتەكا چیایە دكەڤیتە هنداڤی ئامێدیێ، ل سەر نهالا ژێری ژ لایێ ژێریڤە، گوندێ زێوكان دكەڤیتە دانگا وێ یا رۆژهەلاتی، ئەڤا كو مالباتەكا شێخا لێ ئاڤا بوو و خۆ گەهاندییە میرێن بەهدینان، ل چەرخێ (٧مش/١٤ز) ئاڤرێ پێ هاتییەكرن، بەلێ ناڤێ وی چیایی ب (كاری) تێدا هاتیە، (یاسین ئەلعومەری) د پەرتۆكا خۆ دا (غایە المرام، بپ٩٤) سالۆخا وی دكەت و دبێژیت: چیایەكێ نێزیكی ئامێدییە، گەلەك گوندێن لێ هەین، بەرهەمێ وان ژی گەلەكە، دبێژیت: گەلەك گوند یێن لێ هەین و تویتنەكا باش دچینن[١٢٤]. نها ژی گوند ب تەمامی یێ بەردایە.

## گوندێ بەلیتێ

رۆژهەلاتێ وی گوندێ گیزێ یە، رۆژئاڤایێ وی گوندێ زێوە و گارەیایە، ژووریێ وی گوندێ هەڤندكایە، ژێریێ وی ژی چیایێ گارەیە. ژێدەرێن ئاڤا وان كۆمەكا كانیانە (كانی سارکێ، كانی شیڤێ، كانی سلێ، كانی بهارێ، كانییا رەزا). ل دووڤ گۆتنێن خەلكێ گوندی ئەو ژ گوندێ (گێرەرەشا) هەكاریا هاتینە بەلیتێ، رامانا ناڤێ گوندی ژی نەهاتییە زانین، هەر چەندە هندەك دبێژن كو ژ (بلوت) ئانكو (بەڕی) د زمانێ كوردی دا هاتییە[١٢٥]، بەلێ ئەڤە نەیا بەرئاقلە. ل سەر بەلیتێ د.عماد عبدالسلامی نڤیسیە: گوندەكە دكەڤیتە دناڤبەرا سەرسنك و ئامێدیێ دا، ل ژێریێ رۆژئاڤایێ ئامێدیێ، هەتا نها ژی یا ئاڤەدانە، ب بەرهەمئینانا "تویتنێ" یا ناڤدارە. یاسین ئەلعومەری دبێژیتێ (بلوتێ) و دبێژیت: ل ئەڤی گوندی تویتنەكا باش یا هەی، خەلكێ وێ هەمی دكێشن[١٢٦].
چوار ئیجاخ ل ئەڤی گوندی هەنە، (مالا ژێری، مالا بەرۆشكا، مالا ژووری، مالا دەحێ). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣١ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٢٧] و بەری گوند بهێتە خرابكرن (٣٣) مالبات لێ دژیان. ل سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ گەهشتیە ڤی گوندی، هژمارا خویندكارا (٣٣) بوون. مزگەفتا گوندی ئێك ژوور بوو و دو پەنجەرك لێ هەبوون. ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند ب ئێكجاری هاتە بەردان و هەتا نها ژی كەس لێ ناژیت[١٢٨].

ژ جهـ و کەسێن بەرنیاس ل ئەڤی گوندی، (گۆڕستانا شەهیدا) کو ژ چێرۆکەکا جڤاکی هاتیە. ژ کەسێن بەرنیاس ل ئەڤی گوندی (مەلا حەسەن بەلیتی) کو ناڤێ وی د پەرتووکا (فضلاء بهدینان) یا (محمد سعید یاسین دهۆکی)دا هاتییە، کو د ناڤبەرا سالێن (١٩٣٨-١٩٤٩)ێ مەلایێ گوندێ ڕەتکێ بوو[١٢٩].

## گوندێ گیزێ

گوندی بێ ڕۆژهەلاتا ویە، ڕۆژئاڤایێ وی گوندێ بەلیتێیە، ژێرێ وێ چیایێ گارەیە، ژووریێ وێ ژی گوندێ دێرەشێیە[١٣٠]. کۆمەکا ژێدەرێن ئاڤێ ل ئەڤی گوندی هەنە، ژ وان (کانییا گوندی، کانییا برکێ، کانییا درێ، کانییا مەغدرا، زێدەباری چەند کانێن دی وەکی برکا تاژدینی و برکا گرێ زەر)[١٣١].

ل سەر گوندێ گیزێ د.عماد عبدالسلام دبێژیت: ئەو گویزێ و گۆزێیە، گوندەکە دکەڤیتە ڕەخێ ژێریێ ڕۆژهەلاتێ ئامێدیێ، ل دەڤەرا بەرێگارێ، یاسین ئەلعومەری ئاڤرێەکێ ل چەرخێ سێزدێ مشەختی (١٩ زایینی) ددەتێ، دبێژیت: گوندەکە ژ گوندێن ئامێدیێ، وان ژی تویتنەکا باشا هەی. خەلکێ ڤی گوندی مشەختی ئامێدیێ بووینە، تاخەکێ ب ناڤێ وێ چێبووی، دکەڤیتە ژێریێ دەرگەهێ مووسلێ[١٣٢].

گوند ژ (٧) بنەمالا پێکدهێن ئەو ژی (حەمە ڕەسیل و حەمە شێخ و حەمە زەینەل و مالێن شەیدا، ئیسڤێن حەجیا، عەلی مان، مالێن خەلێ). ناڤێ گوندێ گیزێ د پەرتۆکا (معجم البلدان) یا (یاقوت حەمەوی) دا هاتییە، کو تێدا بەحسێ زانایەکێ گوندێ گیزێ یێ ناڤدار دکەت، ئەو ژی (ابو محمد بن عبدالله بن محمد بن عبدالله البحری الجوزی)، ژ ڤێ چەندێ دیاردبیت کو خەلکێ گوندێ گیزێ هەر ژ کەڤندا بوسلمان بووینە. دیسان (د.فەرسەت مەرعی) ئاڤرێەکێ دەتە گوندی، کو د کەڤندا ئەڤ گوندە وەکی بازێرەکێ بچویك بوو، ژ بۆ ڕێڤینگا ژ بەرکو گەلەکێ ب بەرەکەت بوو[١٣٣]. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣٤].

هەر چەندە ئەم نەشێن دیرۆکەکا تێروتژی بدەینە گوندی، بەلێ دێ بزاڤێ کەین کو هندەك ڕویدانا دیارکەین، ل سالا (١٩٦٦)ێ کونفرانسەك ل گوندێ گیزێ هاتە گێران، دا کو بۆ کونگرێ حەفتێ یێ (پ.د.ك) ئەندامـا دەستنیشانبکەن، مەلا ئەحمەدێ دوتازای وەکی سەرپەرشتێ کونفرانسی بوو، هەر ئێك ژ هاشم حەسەن ئاکرەی و نعمان عیسا بارزانی دگەل دابوون. پاشی ل سالا (١٩٧٣)ێ خواندنگەها سەرەتایی ل گوندی هاتەدانان، هەر ل سالا (١٩٧٣)ێ بنکەهەکێ ساخلەمیێ ل گوندێ گیزێ هاتەدانان، هاریکارێ نۆژداری (بەهجەت سەرنی) ب ڕێڤەدبر. ل سالا (١٩٦٥-١٩٦٩)ێ عبدالرحمن گۆرجێ گیزی موختارێ گیزێ بوو[١٣٥].

تشتێ کو چ جار ژ بیرا خەلکێ ڤی گوندی نەچیت، ئەنفالە، ل ڕۆژا (١٩٨٨/٨/٧)ێ ڕژێما عێراقێ دەڤەر تۆپبارانکر، خەلك نەچار بوو گوندێن خۆ بەردەت، پاشی ل ڕۆژا (١٩٨٨/٨/٨)ێ جارەکا دی خەلك زڤری گوندی، بەلێ حکۆمەت یا بەردەوام بوو ل سەر دەردەسەریێن خۆ ب سەر وی خەلکی دا[١٣٦]، پاشی خەلکێ گوندی بەرەڤ دەڤەرەکا ڤەدەرڤە ڕەڤین، ئەو ژی (پەرێن شکەفتا) بوو، بۆ دەمێ (٩) ڕۆژا مانە ل وێرێ. پاشی حکۆمەتێ نە دهێلا چ بکەهتێ و ل داویێ ب سەرداگرت، ئەو زەلامێن ژێ وان ژ (١٠) سالا پتر ژ مالێن وان ڤەدەرکرن، پشتی زولمەکا مەزن لێ هاتییەکرن (٩٧) زەلام ژ گوندی کرنە شەهیدێن ئەنفالێ[١٣٧]. نها ژی گوند یێ بەردایە، هەر چەند هندەك خانی ل وێرێ هاتینە ئاڤاکرن بەلێ کەس ل وێرێ ناژیت.

## گوندێ ردێنیا

دۆماهیك گوندە ژ لایێ ڕۆژهەلاتیڤە سەر ب ناحیا سەرسنکێڤە، ژووریێ وی گوندێ سپیندارێیە، ژێریێ وی چیایێ گارەیە، ڕۆژهەلاتێ وی گوندێ شێرانەیە، ڕۆژئاڤایێ وی گوندێ سارکێ یە. ژێدەرێن ئاڤا وانا ژ گوندێ سارکێ یە، زێدەباری کانیێن ئاڤێ وەکی

(كانییا گیزانێ، كانییا بونتژی كو ل جهێن زۆمێن گوندییە، زێدەباری كانییا دودێ كو ئەو ژی دكەڤیتە چیایی).

وەكی دیار خەلكێ گوندی (٩) بابە ل گوندی دژین، دیارە ل چەرخێ ١٧ هاتینە گوندی. چەند جهێن كەڤن ل ئەڤی گوندی هەنە، وەكی شكەفتا گیزانێ و شكەفتا بەر شكەفتی، زێدەباری چەند دەورناووسكا كو دكەڤنە بن گۆڕستانا (شێخ عەلی)، دیسان گۆڕستانەكا دی ژی یا هەی ب ناڤێ (شێركێ).

ل سالا (١٩٤٥)ێ دەمێ (مەلا مستەفا بارزانی) هاتییە دەڤەرێ، ئێك ژ رۆژا بۆ دەمێ فراڤینێ هاتییە ڤی گوندی، پاشی بەرەڤ بارزان چوویە. ل سالا (١٩٥٧)ێ بۆ جارا ئێكێ سەرژمێری گەهشتییە دەڤەرێ و ل دووڤ وێ سەرژمێریێ ٧٦ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣٨]، ل سالا (١٩٧٧)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ گەهشتیە گوندی، وێ سالێ هژمارا خویندكارا (٤٢) خویندكار بوون. مزگەفت ل نیڤا گوندی بوو، ژ ژوورەكا مەزن دگەل ژوورا مەلای و تەزكەرێ پێكدهات. ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتەخرابكرن، (٤)كەس ژ خەلكێ گوندی هاتینە ئەنفالكرن و هەتا ئەڤرۆ كەس نزانیت ل كیڤەنە[١٣٩]. نها ژی گوند یێ بەردایە.

## گوندێ بیێ

هندەك ڤێ پەیڤێ بۆ بنیاتەكێ سریانی دزڤرینن، رامانا وێ ژی (ئێمنی یان بێدەنگییە)، هەكە ئەم بنێرینە جهێ جۆگرافیێ گوندی، دبیت ئەڤە یا دجهێ خۆ دابیت، هندەكێن دی ژی دبێژن كو ژ دارا بیێ هاتییە، ئەو دار ل وێرێ هەیە. رۆژهەلاتێ وێ گوندێ ساركێ یە، رۆژئاڤایێ وێ گوندێ گیزێ یە، ژێرێ وێ چیایێ گارە و سێ دەرایە، ژوورێ وێ ژی گوندێ سپیندارێ یە. كۆمەكا كانییا ل ئەڤی گوندی هەنە، دبنە ژێدەرێ ئاڤێ بۆ خەلكێ گوندی، ئەو ژی (كانییا گارەی، كانییا مۆجێ، كانییا كوتلكی، كانییا پەرێ، كانی درینكێ، كانی سارکێ). خەلكێ وێ پتر مژۆیلێ

گوندێ صاركێ



چاندنێ و ب خۆدانکرنا تەرشوکەوالی بوون. گوند ژ سێ ئیجاخا پێکدهێن، ئەو ژی (مالا سیار و مالا شاهین و مالا مەلا ئەحمەدی). خەلکێ وێ ژ گوندێ (شلۆکو) ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، دیارە کو ل چەرخێ (١٧) زایینی قەستا ڤی گوندی کریە.

کۆمەکا جهێن شوینواری و پیرۆز ل ڤی گوندی هەنە، ژ وان چەند سەید و شێخن کو د چاڤێ خەلکی دا دپیرۆزن، وەکی (شێخێ بەناسۆرێ، سەید "نازدارە" ل وێرێ و خەلك ژێ د ترسیت، دەرجکا قەبرێ شکەفتێڤە، زێدەباری ١٠ مناسبا). چەند شوینوارەك ل ئەڤی گوندی هەنە، ل سالا (١٩٥٢)ێ ل سەر دەستێ ڤەکۆلینڤان (ئەحمەد حاج مەهدی) هاتینە قەیدکرن، کەفتینە دناڤ پەرتووك و ئەتلەسێن جهێن شوینواری، ژ وان (ناووسکا بیێ[١٤٠]، شکەفتە سۆرێ، شکەفتا بەلیتێ، شکەفتا مالا رەوشەنێ).

ژ هەژی ئاڤری پێکرنێیە کو رێکا دەڤەرا بەرێکاری یا دیرۆکی، ئەڤا د دێرەشێ را دبۆریت، بتنێ د دەریێ بیێ را ب سەردکەڤیت، دیارە رێکا سەرپشکا ڤێ دەڤەرێ بوو، ب بەرا هاتییە چێکرن، کو دگەهیتە دەڤەرا بەرواری و مزیری و زێباریا.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤١] و بەری سالا (١٩٨٨)ێ (١٨) مالبات لێ دژیان، مزگەفت دکەڤتە نیڤا گوندی، هۆلەکا درێژۆك بوو تێرا (٤٠-٥٠) مرۆڤا دکر. ل سالا (١٩٨٠)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ هاتییە ڤی گوندی، ل دەستپێکێ د خانیەکیڤە بوو، پاشی ئاڤاهیەك بۆ هاتە چێکرن، بەلێ بتنێ سێ سالا بەردەوام بوو. نێزیکی (٣٠) خویندکارا لێ دخواند.

ل سالا (١٩٨٨)ێ دەستێ ئەنفالا گەهشتیە ڤی گوندی، چەند مالباتەك کەتنە دەستێ رژێمێ و ئەڤێن دی خۆ قۆرتالکر، د ناڤ وان مالباتێن کەتینە دەستێ رژێمێ زەلامێن ژێ وان دناڤبەرا (١٠-٤٥) سالیێ برن و هەتا نها د بێ سەروشوینن، هژمارا وان (١٤) کەس بوون، هندەك ژ وانا (٣) کەس ژ مالەکێ بوون[١٤٢]. نها ژی گوند یێ بەردایە.

## گوندێ صارکێ

گوندێ سارکێ یێ هەڤتوخیبە ل رۆژهەلاتی دگەل گوندێ (ردێنیا) و ژ لایێ رۆژئاڤایڤە دگەل گوندێ (بیێ) و ژێریێ وێ چیایێ زەنگلیە و ژووریێ وی چیایێ گارەیە و گوند دکەڤیتە رەخێ نزاری ل سەر سینگێ گارەی.

ناڤکرنا گوندی ب ناڤێ سارکێ دو بۆچوون هەنە:

١- دبیت ژبەر ئاڤا کانیێن وێ یێن سار، یان ژی سەقایێ وێ ل وەرزێ زڤستانێ گەلەك یێ سارە و تژی بەفرە.

٢- دبیت ناڤێ سارکێ ژ هەبوونا وێ کانیا ناڤدار یا کو دبێژنێ (کانیا سرکێ) ئانکو گوندێ سرك لێ هاتبیت.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤٣] و سالا (٢٠١٤)ێ هژمارا مالباتێن گوندی گەهشتنە (٦٠) مالباتا و یێن هاتینە پشککرن ل سەر سێ بنەمالا:

١- **بنەمالا حەجی حەموی،** ئەڤ خێزانە د بنیاتدا خەلکێ دەڤەرا (نەهلێ) نە .

٢- **بنەمالا سلێمان بەکری،** ئەڤ خێزانە د بنیاتدا خەلکێ دەڤەرا (بارزانن).

٣- **بنەمالا شینوی،** ئەڤ خێزانە پشکەکن ژ بنەمالا شینو (ردێنی)[١٤٤].

ژێدەرێن ئاڤێ یێن سەرەکی ل گوندی هەمی کانینە ژوان (کانیا سرکێ، کانیا زاڤای، کانیا گیزێ گلاس، کانیا گیزێ جڤاتێ، کانیکا مشتەلا). زێدەباری چەند کانیکێن دی وەکی کانیکا (کورکێ) و کانیکا کەندالێ (شۆرێ ) و کانیکا (نیشاڤێ) ژ لایێ بەرۆژی و کانیکا (کورا کەندالی) ژلایێ گارەی. پێنج جویێن سەرپشك هەنە، ژوان (٥) کانیا تژی ئاڤ دبن بناڤێ (جۆکا مەشتەلا، جۆیا قەسیلا، جۆیا بەر سێڤا، جۆیا ئاڤیکا، جۆیا چەمێ مزگەفتێ).

گوندەکێ بەرنیاسە ب چاندنا (تویتن و کونجی و برنجی ) و خودانکرنا تەرش و کەوالی. و هەبوونا

ژمارەكا زۆرا دار گویزا و كەزوانا و مازیا و دار بەڕویا و گوهیشك و گرسكا و كنێرا. كۆمەكا شوینواران ل ئەڤی گوندی هەنە بەلێ هەتا ئەڤرۆ چ دویڤچوون بۆ نەبووینە، ژوان (كەلا گوزینەی گۆرێ، شێخ سندی، شوین پێ كافری، لینێن سەرێ لینەی، چەندین گوڕستانێن مەزن).

هەژی گوتنێیە كو چەند گۆڕستانێن دێرین و مەزن ل ڤی گوندی هەنە ئەڤە ژی ڤەدگەریت بو كەڤناریا گوندی و بەر دەوامیا ژیانێ ل ڤی گوندی ژوان ژی (هەجرا درێژ: بۆ زانین درێژیا ڤێ گۆڕستانێ نێزیكی ١٠٠٠ مەترایە هەمی یا تژیە ژ گورێن كەڤن، گۆڕستانا مەوتیا، گۆڕستانا دەشتا سەر بانێ، گۆڕستانا سەرێ سیارێ، گۆڕستانا كەلیا گوزینەی).

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٨)ێ ل بەر هەموێن ئەنفالێ دكەڤیت، دهێتە وێرانكرن و ل سالا (١٩٩٦)ێ جارەكا دی دهێنە ئاڤاكرن، بەلێ ل سالا (١٩٩٧)ێ جارەكا دی ژبەر دەستودانێ دەڤەرێ ل وی سەردەمی دهێتە چۆلكرن. بۆ جارا ئێكێ ل (١٧/ ٩/ ٢٠٠٢)ێ جادە گەهشتیە گوندی[١٤٥]. بەلێ نها گوند یێ بەردایە.

## گوندێ زێوا سەیدا

رۆژهەلاتێ وی گوندێ بەلیتێیە، رۆژئاڤایێ وێ ژی گوندێ گارەیایە، ژێریێ وی چیایێ گارەیە، ژووریێ وێ چیایێ زێوەیە، یان ب رەنگەكێ دی دكەڤیتە دناڤبەرا دو چیادا. چەندین گوندێن دی ب ناڤێ زێوە ل كوردستانێ هەنە. كۆمەكا ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، كو پشك دبنە سەر جۆك و كانییا ژ وان (كانییا كولندكی كو سەرۆكانییا رویبارێ زێوەیە، سەرۆكانی، كانییا سپی، كانییا ئاڤاركی، كانییا سەرسكری...).

ل دووڤ ئاخفتنێن خەلكێ گوندی، كو دەمێ خەلیفە (هارون رەشیدی) ل سەردەمێ عەباسی، خەلك ژ بەغدا كریبەدەر، چوونە ئیرانێ (دەڤەرا بەرزنجی)، بەری چوار سەدسالا هاتینە ڤی گوندی. هەر چەند بۆ جارا ئێكێ هاتینە گوندەكی ل خارێیا گوندی نوی، پاشی هاتینە ڤی گوندی. گوند ژ سێ ئیجاخا پێكدهێن (ئیجاخا كەرا، ئیجاخا براهیم شەرا، مالێن سەیدا).

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٠ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤٦] و بەری سالا (١٩٨٨)ێ (٢٠-٢٢) مالباتا لێ دژیان، ل ئەنفالا ژی (٢) كەس ژ گوندی ئەنفال بووینە، ل سالا (١٩٧٧)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ گەهشتیە گوندی، بەلێ د (خانیێ سەید ئوسمانی) ڤە بوو، دو سەیدا بۆ وان هاتبوونە فرێكرن، نێزیكی (٣٠- ٤٠) خویندكارا لێ دخواند، بەلێ بتنێ بۆ سێ سالا بەردەوام بوو، ئەو سەیدایە ژی چوون. مزگەفتا گوندی ژ دو نهۆما پێك دهات، ژبەر و كسلا هاتبوو ئاڤاكرن، دو دەرگەهـ لێ هەبوون، ئێك ل ژووریێ وێ و ئێك ژی ل رۆژهەلاتێ وێ، گۆرێ (سەید عەمەری) تێڤەیە، دیارە ئەو كەسە یێ مزگەفت ئاڤاكری، نێزیكی (٦٠- ٧٠) مرۆڤا دشیان بچنە ژوورڤە. كۆمەكا جهێن شوینواری و بالكێش ل ئەڤی گوندی هەنە، ژوان (تربا سەید میسای: دیارە جیڤانۆكەكا پیرۆز پێڤە هەیە، خەلكێ گوندێ زێوە و بەلیتێ د رۆژەكا دیاركری دا پەزێ خۆ دبرە وێرێ و مەلایەكی پێڤە دخواند و پاشی هندەك ئاخ ب سەر پەزی را دهاڤێژت، شیرێ پەزی ژی هەمی دكرە خێر، ئەڤ تربە یێ شویرهە كریبە، ل وێ دەڤەرێ بتنێ گیایێ زەركی ل سەر ڤی تربی هەیە. دیسان سێ پرێن دیرۆكی ل ئەڤی گوندی هەنە، ل دووڤ ئاخفتنا خەندان ئاغای یێن ئاڤاكرین. دیسان سەید گراڤی و شكەفتێن مناسبی ژی ل ئەڤی گوندی هەنە)[١٤٧]. نها گوند یێ بەردایە.

# گوندێن سەرسنكێ
# (٢)
# پشكەكا دی ژ گوندێن ناحیا سەرسنكێ

**جەمیل محەمەد شێلادزی**

## گوندێ قەدشێ

### كورتیەكا جوگرافی:

كۆمەلگەها قەدشێ دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ هاڤینگەها سەرسنكێ ب دووراتییا (١٥كم)، و هاڤینگەها ئینشكێ ب دووراتییا (٢كم)، و بازێرێ ئامێدیێ و هاڤینگەها سیلاڤێ ب دووراتییا (١٥كم).

### كورتیەك دیرۆكی:

**ناڤێ قەدش،** ل دووڤ گۆتنا دانعەمرێن گوندی دبێژن: قەدش گوندێ مەسیحیان بوو، و ناڤێ وێ ژ (قەشە دیشۆ هاتییە[١٤٨])، دقۆناغێن دیرۆكێ دا گۆهارتن كەفتییە سەر و بوویە (قەدش).

قەدش تا نها د سێ قۆناغان را بووریە، لەوما دێ كورتیەكێ دەینە سەر ڤان قۆناغان، ئەوژی:

### أ ـ قەدشێ وەك گوندێ مەسیحییان:

هەر چەندە چ ژێدەرێن گۆمان بڕ ل نك مە نینن كا كەنگی ئەڤ گوندە هاتییە ئاڤاكرن، لێ تەنێ تشتێ ڤێ چەندێ دوویات دكەت (دێرە)، كۆ ل قەدشا كەڤن (بنێ گوندی = ناڤ ئاڤاری)، كاڤلەك لێ هەیە دبێژن مزگەفتە، بەلێ ل دووڤ گۆتنا دانعەمران ئەڤە د بنەرەت دا دێر بوو، كرییە مزگەفت.

بەلێ ئەگەر ئەم سەحكەینە هندەك ژێدەرێن دی یێن دیرۆكی، ئەوژی خانا قەدشێ ل سەر دەمێ (سۆلتان حسین وەلی) هاتییە ئاڤاكرن هەر وەكی (ئەنوەر مایی) خۆیادكەت دەمێ دبێژیت: (... خواندنگەهـ و مزگەفت و پر هاتنە ئاڤاكرن و رێك چێكرن، دناڤبەرا قۆناغەكێ و قۆناغەكا دی دا خان بۆ رێڤینگ و كاروانییان ئاڤاكرن، كو رێڤینگ و كاروانی قەست بكەنێ و خزمەتكاری و پێدڤیێن رێڤینگان ل دەمێ بێهنڤەدانێ تێدا ئامادەكربوون، و هەتا نهۆ شوینوارێن ڤان خانان ماینە، ژ وان شوینواران ل قەدشێ[١٤٩] و ئەرەدنا و كۆرا هندەكێن دی[١٥٠].

## ژ شوینوارێن گوندێ قەدشێ:

### خانا قەدشێ:

بەری نها مە ئاماژە پێ كر كو ژ لایێ (سۆلتان حسین بەگێ) دناڤبەرا سالێن (١٥٣٤ز ـ ١٥٨١ز)ێ هاتبوو ئاڤاكرن.. بەلێ نها شوینا وێ ژی نەمایە چونكە ئاڤاهییەك ل سەر هاتییە ئاڤاكرن، كو دكەڤیتە نیڤەكا گوندێ قەدشێ، باكوورێ جادا گشتی..(نها كرییە گازینو، جهێ بلیاردێ یە).

### دێرا قەدشێ:

ل نیڤا گوندێ قەدشێ یێ كەڤن ئاڤاهییەك لێ هەیە دبێژنێ مزگەفت، و باشتر گرۆڤێ گۆمان بڕ

هەتا نهۆ خاچا وێ دێرێ ل سەر بەرەكی بازی هاتییە كۆلان و نەخشاندن، و مە ئەو خاچ وێنەكرییە بوو گرۆڤە.. ل دووڤ سەرەدانا مە بۆ جهێ دێرێ و بەرێ خودانا شوینوارێن وێ، ئەڤ دێرە بشێوێ لاكێشە (١٣م×١٢م)، و ژ دو بێشان پێك دهێت، دیوارێ دناڤبەرا هەردو بێشان، هندەك دنگ دانانە و بشێوێ ئاقدی (كڤانی) هاتییە ئاڤاكرن، بێشا باكووری (١٣م×٦م)ە و دەرگەهێ وێ دكەڤیتە دناڤ ژوورا ئێكێ ژ بێشا پێشیێ، و بێشا باشوور (پێشیێ) ژ دو ژووران پێكدهێت، ژوورا ڕۆژئاڤای و دەرگەهێ سەرەكی دكەڤیتە د وێ ژوورێ دا، و دەرگەهێ ژوورا دووێ و بێشا دووێ دكەڤنە دناڤ ژوورا ئێكێ دا، پەحناتی (فرەهی)یا دیوارێ (١م)ە، ب بەر و كسلێ هاتییە ئاڤاكرن، و هەتا نهۆ دیوارێن وێ نێزیكی بلنداهییا (١م) ژێ ماینە، بەلێ هندەك ژ لایێ ڕۆژئاڤای (لایێ دەرگەهی و پەیسك)ێ هاتییە خرابكرن و خانی لسەر هاتییە ئاڤاكرن. و د پەرتووكا (حەمكێ تۆڤی) دا ناڤێ مزگەفتا قەدشێ د ڕیزبەندا (٦٦)ێ دا هاتییە: (مزگەفتا قەدش ئامێدیێ[151]).

ئەڤ مزگەفتە ل ڕێكەفتی(٢٢/١٢/١٩٥٢)ێ ژ لایێ ڤەكۆلەر (أحمد حاج مهدی) د ڕۆژناما (الوقائع العراقیە) ژمارە (٢١٩٩)دا، وەك شوینوارێ مزگەفتێ و ئێك ژ شوینوارێن دەڤەرێ هاتییە ڕاگەهاندن[152]. و دبێژن: ل وێ سالێ مۆختارێ گوندێ قەدشێ (بابیر پیرموس[153])بوو.

**كەلا ئامێدیكا خراب:**

ل باشووری گوندێ قەدشێ ب دووراتییا نێزیكی(٦كم) كەلایەك لێ هەیە ب ناڤێ (كەلا ئامێدیكا خراب)، كو تا نها گەلەك ژ پاشماییێن شوینوارێن وێ ماینە، لێ ژ لایێ دیرۆكێ ڤە هەتا نهۆ نەهاتییە زانین، كا ل كیژ سەردەمی هاتییە ئاڤاكرن، چونكە ژ لایێ دیرۆكنڤیسان ڤە چەندین دیتنێن جیاواز هەنە ل سەر (كەلا ئاشەوا، كەلا ئامێدیكا خراب، كەلا ئاشیب، كەلا ئامێدیێ).. لێ ل دووڤ هندەك ژێدەران وەسا دهێتە زانین كو ئەڤ كەلایە ل

**پاشمایی دیوارێ دێرا قەدشێ**



سەر دەمێ (عمادالدين زنكى بن آق سنقر) ل سالا (٥٣٧ز) هاتييە نويژەنكرن[١٥٤].

**ب ـ قەدشێ وەك گوندێ موسلمانان تاكو سالا ١٩٧٦ێ:**

وەكى بەرى نها مە خۆياكرى كۆ گوندێ قەدشێ د كەڤن دا گوندێ مەسيحيان بوو، لێ ل دەمەكێ نەديار هاتييە چۆلكرن، پاشى ژ لايێ موسلمانان ڤە جارەكا دى هاتييە ئاڤاكرن و وەك گوندێ موسلمانان هاتييە نياسين.. هەر چەندە ب دورستى نەهاتييە زانين كا كەنگى بوويە گوندێ موسلمانان.

لێ دبيت دناڤبەرا سالێن (١٧٥٠ز ـ ١٨٠٠ز) بۆ يەكەمين جار موسلمان ل ڤى گوندى خۆ جهـ ببن، چونكە بنەمالا دووێ، پشتى بنەمالا (حەجى باپيرى)، بنەمالا (دێروينتە)يا ل سالا (١٨٣٥ز) هاتييە قەدشێ خۆ جهـ بوويە.

**پێكهاتێن گوندێ قەدشێ:**

گوندێ قەدشێ ژى مينا هەمى گوندێن هەرێما كوردستانێ ژ چەندين بنەمالان پێكهاتييە، و هەر يەك ژ ڤان بنەمالان ژ جهەكى يان دەڤەرەكێ هاتينە قەدشێ و بووينە خۆ جهێن گوندى، ئەوژى ئەڤ بنەمالەنە:

١ ـ **مالا حەجى باپيرى،** د بنەكوك دا ژ گوندێ ئۆرە ـ بەروارى بالا هاتييە بامەرنێ، پاشى دناڤبەرا (١٧٥٠ز ـ ١٨٠٠ز) هاتينە گوندێ قەدشێ، كو ل دووڤ گۆتنێن دانعەمران ئەڤە يەكەم بنەمالە ژ موسلمانان هاتييە قەدشێ.

٢ ـ **مالا دێروينتەی،** هەر وەكو هاتييە زانين ل سەر دەمێ مير محەمەد رەواندۆزى (ميرێ كورە)، كۆ ل سالا (١٨٣٣ز) ميرگەها ئامێديێ داگيركرييە و چەندين گوندێن وێ كاڤلكرينە، كو يەك ژ وان گوندان گوندێ دێروينتە بوو، خەلكێ وێ ژ وێرێ بەرەڤ شكەفتا بەرۆژى ل سپنەی چووينە و پاشى هاتينە گوندێ قەدشێ ئاكنجى بووينە، بوويە بنەمالەك ژ گوندێ قەدشێ و پشتى بنەمالا حەجى باپيرى دووەم بنەمال هاتييە قەدشێ دێروينتەی بوون، ل سالا (١٨٣٥ز)ی.. و ئەڤ بنەمالە ژ سێ بابكان پێكدهێت، ئەوژى ئەڤەنە: (مالا پيرمويسى، مالا صۆفى حسێنى، مالا عەلا).

٣ ـ **مالا شێخێن نەقشەبەندیێن بامەرنێ،** ئەڤە يەك ژ وان بنەمالانە، كو دهێنە نياسين ب خۆ جهێن گوندێ قەدشێ، چونكە پڕانييا ئاخا گوندێ قەدشێ يا ڤێ بنەمالێ يە ژ لايێن خەلكێ دی هاتييە شينكرن وەك مرێباتى، ل دووڤ گۆتنا (شێخ عەبدۆلسەلام[١٥٥]) دبێژيت: (ئەم دبنەرت دا ژ گوندێ بەنستانێ نە ژ دەڤەرا رێكان، يا مە گۆلێ بووی، كو (شێخ تاهر) ژ گوندێ بەنستانێ هاتييە ئامێدیێ، ماوەيەكى مايە ل وێرێ.. لێ ل دووڤ هندەك ژێدەرێن ديرۆكى هاتييە: شێخ تاهرێ ئامێدى، دامەزرێنەرێ بنەمالا نەقشەبەنديا ل بامەرنێ[١٥٦] ديسان (مستەفا بامەرنى) ژ زار دەڤێ (محەمەد رەئوف عەلائەددين) ڤەدگوهێزيت: شێخ تاهر كورێ مەلا حاجى كورێ مەلا پيرێ كورێ مەلا محەمەدێ كورێ مەلا ئەحمەدی يە سەر ب هۆزا رێكانيياڤەيە..(١٥٧) ل سالا (١١٩٨مش/ ١٧٨٩ز)ێ ل باژێرێ ئامێدیێ هاتييە دونيايێ[١٥٨] پشتى شێخ (عبدالوهاب شۆشى) ژ ئامێدیێ هاتييە هنارتن بۆ (ستەمبولێ) و ل (خەربوت)ێ، شێخ (تاهر نەقشەبەندى) زڤرى تەكيا نەقشەبەندى ل ئامێدیێ وەك نيشاندەرێ رێبازا نەقشەبەندى، ئەڤ تەكيايە دكەڤيتە سەر شيرها ئامێدیێ ژ لايێ رۆژهەلاتى ڤە ل هنداڤى دەشتيلۆكێ، ژ ئەگەرا پەيدابوونا ئاريشا دناڤبەرا (ئيسماعيل پاشايێ دووێ) و شێخ (تاهر نەقشەبەندى) دا، شێخ (تاهر) ژ ئامێدیێ دەركەت و هاتە بامەرنێ[١٥٩]، پاشى چووينە بامەرنێ و ل وێرێ خۆ جهـ بووينە، د سالێن شێستاندا پڕانييا خێزانێن ڤێ بنەمالێ ژ بامەرنێ بەرەڤ باژێرێ مووسل چووينە، و ل سالا (١٩٧٥)ێ هندەك ژ خێزانێن هە ژ مووسلێ هاتينە گوندێ قەدشێ

و تا نها خۆ جهـ بووینه[١٦٠].

٤ ـ **مالا مکائیلی،** ژ گوندێ ڕەزیکێ ـ دەڤەرا بەرێ گارێ هاتییە قەدشێ.

٥ ـ **مالا مویسویێ عەلیێ،** ژ گوندێ ئۆرە ـ دەڤەرا بەرواری بالا هاتییە قەدشێ.

٦ ـ **مالا ئەمینێ فەتحی،** ژ گوندێ مێرکاجیا ـ دەڤەرا بەرواری بالا هاتییە قەدشێ.

٧ ـ **مالا محەمەدێ تویلەری،** دەمێ ژ گوندێ تویلەرێ هاتین، دوو بابك بوون، یەك ژوان هاتییە قەدشێ، یێ دی چوویە بلێجانکێ، هەردو خودان پەز بوون، پاشی بابکێ دی ژی ژ بلێجانکێ هاتییە قەدشێ.

٨ ـ **مالا تۆڤی (مەحمویدێ خرابەی)،** ئەڤ بنەمالە د بنەکۆك دا ژ گوندێ تۆڤی ـ پارێزگەها هەکاری هاتییە گوندێ خرابەی ـ دەڤەرا بەرواری بالا، پاشی هاتییە گوندێ قەدشێ.

٩ ـ **مالا حەجی ئەمینی،** ژ گوندێ گویلکا ـ دەڤەرا بەرواری بالا هاتییە قەدشێ.

١٠ ـ **مالا عەبدوللایێ حسێنی،** ئەڤ مالە ژ گوندێ بێدوهێ ـ بەرواری بالا هاتییە قەدشێ.

١١ ـ **مالا لێلەکیا،** ئەڤ بنەمالە ژ گوندێ لێلەکا[١٦١] ـ دەڤەرا بەرواری بالا هاتییە قەدشێ، ژ سێ بابکان پێکدهێت، ئەوژی مالا سەعیدێ ڕەجەبی، مالا غەزالێ، مالا شەریفایێ.

دیسان ل ڤان دوومهیان هندەك خێزانێن دی ژی هاتینە قەدشێ ئاکنجی بوونە وەك:

١٢ ـ **مالا سالحێ تاژدینی،** ئەڤ مالە د بنەکوك دا ژ گوندێ مەغریبیا ـ دەڤەرا بەرواری بالا چوویە گوندێ باوەرکێ ـ بەرێ گارێ، پاشی ژ وێرێ هاتییە قەدشێ.

١٣ ـ **مالا سەعدولایێ تویلەری،** ژ گوندێ تویلەرێ ـ بەرواری بالا هاتییە گوندێ ئەرەدنا، پاشی ژ وێرێ هاتییە گوندێ قەدشێ و بوویە گاڤانێ گوندی تا چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ.

١٤ـ **مالا عەمەرێ میرویێ دەشتانی،** ژ گوندێ دەشتانێ هاتییە گوندێ بۆتیا، پاشی ژ وێرێ هاتییە گوندێ قەدشێ.

١٥ـ **مالا عەبێدی (سالحێ چایچی)،** ژ بامەرنێ هاتییە قەدشێ.

١٦ـ **مالا ڕەشۆیێ ئاڤشرینکێ،** د بنەکۆك دا ژ ناڤ ڕێکانییا هاتییە گوندێ بامەرنێ، پاشی ژ وێرێ هاتییە قەدشێ[١٦٢].

و ئەو بنەمالێن ژ گوندێ ئیسفکا هاتینە قەدشێ و ئاکنجی بووین و پڕانییا وان خودان مولکن ل قەدشێ، و ئەڤ بنەمالە ل دەسپێتێکا چەرخێ (٢٠)ێ یان بەری هینگێ هاتینە گوندێ قەدشێ، ئەڤ بنەمالەنە:

١٧ ـ **مالا ئەبابەکری (سماهیلی).**

١٨ ـ **مالا داخوازا.**

١٩ ـ **مالا برەهیمێ لەیلێ.**

٢٠ـ **مالا مستەفایێ عەبدوللایێ فات مستێ.**

٢١ـ **مالا حەجی عەبدۆللایێ.**

٢٢ ـ **مالا باصا (حسێنکێ سلۆیی).**

٢٣ ـ **مالا عەبدوللایێ ئاسێ.**

٢٤ ـ **مالا مەلا حەمێ.**

٢٥ـ **مالا ئیسفێ حەسێ.**

٢٦ـ **مالا عوسمانێ ئیسفکی.**

٢٧ـ **مالا ئیسفێ حەسێ.**

٢٨ـ **مالا عوسمانێ ئیسفکی (مەحمویدێ موختار).**

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٣٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٦٣].

### ج ـ گوندێ قەدشێ پشتی (١٩٧٦)ێ وەك کۆمەڵگەهـ:

دناڤبەرا سالێن ١٩٧٦-١٩٧٨)ێ حکۆمەتا عێراقی هندەك گوندێن سنووری یێن کوردستانێ ژ خەلکی چۆلکرن ب تایبەت گوندێن دەڤەرا نێروە و ڕێکان و دۆسکی ژووری و بەرواری بالا و گەلەك ژ وان بەرەڤ

ڤێ کۆمەلگەهێ و گوندێن هەمزیك و بێناتا ئینان و ل وێرێ ئاکنجی بوون، ژ گوندێن دۆسکی ژووریان کو ئینایێن (ئێتویتی و چێ یی) و ژ نێروەیان: (دووتازای و سەرنی و کانیسارکی و بێزنۆری و زێوە شکان و شیڤی..)، و ژ خێزانێن رێکانییان ژی (پیرەسنی و بێدەی و پیرئاڤدەلی و بالەسینی و هنێشی و هۆرەی) و ژ خێزانێن گوندێن بەرواریا (کارەی و سپیندارێ و مایی و بێدوهی).. هەروەسان گەلەك ژ خەلکێ گوندێن دی ژی ژبەر سەختیا ژیارێ بەرەڤ قەدشێ ڤە هاتن، ب تایبەت گوندێن (شێلازی و گویلکی و هێسی و سەرگرکی و باوەرکی و رەزیکی و گەرەگۆیی و زێوا سەیدا و ئەرەدنی ژووری و بامەرنی و کانیکی و هەمزیکی و بۆتی و شەریفی و بێبادی و ئامێدی و .. هتد) و قەدشێ وەك کومەلگەهـ هاتە ناسین.. پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ گەلەك ژ وی خەلکێ ئەنفالا (١٩٨٨)ێ بەرەڤ ترکیا و ئیرانێ چووین ڤەگەریانەڤە ئاخا کوردستانێ ژ بەرکو پرانییا گوندێن کوردستانێ د چۆلکری بوون، ئەو خەلك بەرەڤ ڤان کۆمەلگەهان هاتن و د ناڤ ئاڤاهیێن میری دا ئاکنجی بوونەڤە و خانی ل کۆمەلگەهێ ئاڤاکرن و نها قەدشێ وەك کۆمەلگەهەك ژ چەندین پێکهاتێن عەشیرێن (نێروە و رێکان و بەرواری بالا و بەرێ گارێ و سپنەی) پێکهاتییە.

**شکەفتێن گوندێ قەدشێ:**

١ـ شکەفتا هێسترا.
٢ـ شکەفتا کاروانیا.
٣ـ شکەفتا دەرەجێ.
٤ـ شکەفتا ناڤێلا.
٥ـ شکەفتا بەرۆژی.

**کانیێن گوندێ قەدشێ:**

١ـ کانییا خاتوینا.
٢ـ کانی گەلیکێ.
٣ـ کانییا مێرا.
٤ـ کانییا قەدشێ.
٥ـ کانیسارکێ.
٦ـ برکا ئاڤسکێ.
٧ـ کانیکا بنێ گویزا.

## گوندێ دێروینتەی:

دێروینتە: دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندێ قەدشێ ب دووراتییا (١٥٠٠م)، نها تەنێ کاڤلە گوندە، ژ وان شوینوارێن تا نها ماینە ل ڤی کاڤلە گوندی، شوینوارێن خانی و مزگەفتێ ماینە، و دگەل گۆرستانەکا مەزن، تاکو سالا (١٩٨٠)ێ مرێن گوندێ قەدشێ ژی دبرنە گۆرستانا دێروینتەی ڤەدشارتن، هەر ژ وان شوینوارێن ل بانییا دێروینتە ماین، شوینوارێن هندەك دویرگەهان ماینە ئەوێن بۆ لەشکەری هاتینە ب کارئینان. گوندێ دیروینتە ژ سێ بابکان پێکدهێت، ئەوژی:

١ـ مالا پیرمویسی.
٢ـ مالا صۆفی حسێنی.
٣ـ مالا عەلا پێکدهات.

## ژ شوینوارێن گوندێ دێروینتە:

ژ بلی تا نها شوینوارێن مزگەفت و کاڤلێن گوندێ ماینە، و گورستانەکا مەزن ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا (٣٠٠م) هەیە.. تشتێ گەلەك گرنگ دویرگەهە، ئەوا دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی (بانییا دێروینتە) ب دووراتییا (١٥٠م) ژ گوندی، کو دکەڤیتە هنداڤی کاڤلە گوندی.. ئەڤ دویرگەهە دیوارێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤای (٧م) درێژی، و باکوور و باشوور (٥,٥م) فرەهی، هندەك بەرێن وێ (٢,٢٠م درێژی X٨٠سم بلنداهی ٨٠ Xسم فرەهی)، ئانکو دبیت سەنگا هندەك ژ ڤان بەران بگەهتە(١٠٠٠کیلو) وا.. و ل باکوورێ ڤێ دویرگەهێ ب دووراتییا (١٣٠م) دیسان شەنگستێ دو دیوارێن دویرگەهەکێ دیارن، لێ نزانم کا ئەڤ دویرگەهە هاتبوو ئاڤاکرن یان نیڤ تەمام هێلابوو؟ چونکە بەرێن وێ نە ل دەور و بەرانە، هەر دیسان ل لایێ رۆژهەلاتی ڤان دویرگەهان ل هنداڤی گوندێ بەرێ کەر ژی شوینوارێن ئاڤاهییەکی هەنە لێ دیسان نزانم کا دویرگەهە یان کەلەکا بچویکە؟

کۆژیەك ژ دیرگەها گوندێ دیروینته



## خرابوونا گوندێ دیروینتە:

ل دووڤ گۆتنا (یونس عەبدۆلا) دبێژیت: (هندی مە ژ بابێن خۆ گولێ بووی، دگۆتن گوندێ دێروینتە ل سەر دەمێ میرێ کورە هاتیبە کاڤلکرن و خەلکێ وێ رەڤینە شکەفتا بەرۆژی ل سپنەی، و ماوەیەکی مابنە ل وێرێ پاشی هاتینە گوندێ قەدشێ و خۆ جهـ بووینە و ئەڤە نەهـ بابکن ئەو ل قەدشێ دژین، هەتا نها وەك خەلکێ قەدشێ هاتینە نیاسین)[١٦٤].

ل دووڤ ژێدەرێن دیرۆکی (د. صلاح هرۆری) دبێژیت: (پشتی میر محەمەد رەواندۆزی (میرێ کورە) میرگەها ب هێز و موکم دامەزراندی بەر ب کارێ فرەهکرنا ئەردێ میرگەهێ چوو، و ژێدەرێن دیرۆکی خۆیادکەن، کو میر محەمەدی دناڤبەرا سالێن (١٨٣١_ ١٨٣٢ز)ێ دەستێ خوە دانایە سەر دەڤەرا بەهدینان، و لەشکەرێ میری ل سالا (١٨٣٢ز)ێ ل زنێ مەزن (زنێ بەهدینان) دەربازبوویە، هەر ل سالا (١٨٣٣ز)ێ لەشکەری میر محەمەدی بازێرکێن ئاکرێ و ئامێدیێ و دهۆك و زاخۆ و چیایێ شنگال و دەڤەرێن دەردورێ بازێرێ جزیری هەتا نسێبینێ ستاندن[١٦٥]. ((تشتێ پێدڤی گۆتنێ، کو ل شورشا سالا (١٩٧٤)ێ بارەگایێ لقێ (پ د ك) ل گوندێ دێروینتە بوو)).

## گوندێ ئیسفکا:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە باکوور کۆمەڵگەها قەدشێ ل بنارێ چیایێ مەتینی و دکەڤیتە دناڤ دۆڵەکا گرتی ژ لایێ باکوور و رۆژهەلات و رۆژئاڤایی، بتنێ ژ لایێ باشووری ڤە نەبیت کو چاڤێن مرۆڤی سپنێ بەهدینان دبینن، رۆژهەلاتێ وێ گوندێ بۆتیایە باکوورێ وێ چیایێ مەتینایە و هنداڤ دەڤەرا بەرواری بالا و گوندێ شیلازایە، و باشوورێ وێ درێژدبیت تا دگەهیتە سەر نهالا سپنەی و رۆژئاڤایێ وێ دگەهیتە سەر سنورێن ئینشکێ[١٦٦].

## پێکهاتێن گوندێ ئیسفکا:

گوندێ ئیسفکا ژ لایێ جڤاکی ڤە ژ چەند بنەمالەکان پێکدهێت، ئەوژی ئەڤەنە[١٦٧]:

١ _ **مالا ئیسفا (مالا زێری)**، (دبنەکۆك دا ژ دەڤەرا زێبارێ هاتینە ئیسفکا).

٢ _ **مالا ئەبابەکری (مالا سماهیلی).**

٣ _ **مالا داخوازا.**

٤ _ **مالا مستەفایێ عەبدوللایێ فات مستێ.**

٥ _ **مالا عاشووری**، ئەڤ مالە ژ گوندێ مەرزانێ[١٦٨]، دەڤەرا جۆلەمێرگێ، باکوورێ کوردستانێ، هاتیبە گوندێ ئیسفکا، پاشی ژ وێرێ هاتیبە قەدشێ، تا نها ب مالا سەیدا دهێتە نیاسین.. و عاشوور ل سالا (١٩٦١ز)ێ ل گوندێ ئیسفکا دەمێ گوند هاتیبە بومبەبارانکرن ژ لایێ فرۆکێن عێراقێ ڤە، هاتیبە شەهیدکرن.

٦ _ **مالا سەلیمێ عەبێ.**

٧ _ **مالا مەحمویدا**، ئەڤ مالە د بنەرت دا ژ گوندێ سپێری _ دەڤەرا نێروە هاتیبە گوندی ئیسفکا.

٨ _ **مالا برەهیمێ لەیلێ (ئومەری).**

٩ _ **مالا حاجا (هاجا)**، وەك عەشیرەکا کۆچەرا ژ باکوورێ کوردستانێ دهێتە هژمارتن هاتیبە دەشتا سێمێلێ و نها نێزیکی (٢٠) گوندا هەنە دکەڤنە سەر توخیبێ سلێڤانەیا، ئەڤ بنەمالا حاجا ژ وان هاجایێن سێمێلێ هاتیبە ئیسفکا و

پەیڤا (هاجا) ل نك خەلكێ بوویە (حاجا).

**١٠ ـ مالا حەجی عەبدۆللایی.**

**١١ ـ مالا مەلە حەمێ،** ئەڤ مالە ژ گوندێ بێدۆهێ ـ دەڤەرا بەرواری بالا هاتبوو ئیسفکا.. و ژ وێرێ هاتییە قەدشێ.

**١٢ ـ مالا باصا (حەجی حسێنكێ سلۆیی).**

**١٣ ـ مالا عەبدۆللایێ ئاسێ،** ئەڤ مالە ژ گوندێ مایێ ـ دەڤەرا بەرواری بالا هاتییە گوندێ ئیسفکا، پاشی ژ وێرێ هاتییە قەدشێ[١٦٩].

و ل سالا ١٩٦١ێ ێ دگەل دەستپێكا شۆرشا ئیلۆلێ ئەڤ گوندە ژ لایێ فرۆكێن حكۆمەتا عێراقێ ڤە دهێتە بومبەبارانكرن و گوندێ ئیسفکا دهێتە سۆتن و خەلكێ گوندی بەرەف شكەفتێن سپنەی درەڤن، و مەسیحیێن گوندێ بێناتا ژی ل وی دەمی گوندێ خۆ بەردابوون، لەوما خەلكێ گوندێ ئیسفکا ژ نەچاری ل گوندێ بێناتا و د شكەفتێن سپنەی دا خۆجە دبن.

**١٤ـ مالا عوسمانێ ئیسفكی (مەحمویدێ موختار).**

**١٥ـ مالا ئیسفێ حەسێ.**

و ئەڤ بنەمالە: (مالا داخوازا، مالا مستەفایێ عەبدۆللایێ فات مستێ، مالا عاشووری، مالا مەلە حەمێ، مالا عەبدۆللایێ حەجی، مالا ئومەری ، مالا عوسمانێ ئیسفكی، مالا ئیسفێ حەسێ)، د نیڤا دووێ ژ چەرخێ (١٩)ێ و نیڤا ئێكێ ژ چەرخێ (٢٠)ێ، پرانییا ڤان بنەمالان ژ گوندێ ئیسفکا بەرەف گوندێ قەدشێ ب خوار كەفتنە و پرانییا وان مولك ل ئاخا قەدشێ هەیە، ژ بلی مولكێ وان یێ گوندێ ئیسفکا.

**شكەفتێن گوندی[١٧٠]:**

١ـ شكەفتا پشت ستوین
٢ـ شكەفتا سۆر
٣ـ شكەفتا هەلزێ
٤ـ شكەفتا قەلا
٥ـ شكەفتا مەلایی
٦ـ شكەفتا ئومەری
٧ـ شكەفتا ئۆسێ
٨ـ شكەفتا چەپا باهیڤا
٩ـ شكەفتا دەر تەنگێ
١٠ـ شكەفتا مامێ عەل
١١ـ شكەفتا خان ئاڤدەل
١٢ـ شكەفتا مام هەسن.

**كانیێن گوندی:**

١ـ سەرۆكانی
٢ـ كانی درەوینكێ
٣ـ كانیكا بركا سەعدێ
٤ـ بركا قەسیلێ
٥ـ كانیاكا سێفكێ
٦ـ كانیكا هاڤری
٧ـ كانیسارکێ
٨ـ كانیكا شهاجا
٩ـ كانیكا شكەفتا هێسترا.

**جهێن ناڤدار:**

١ـ سیفكێ
٢ـ رەزێ عەرەبی
٣ـ باگیلێ
٤ـ بن لاتێ
٥ـ خاركا
٦ـ ئاخا ئاسنی
٧ـ خارێ نۆكا
٨ـ كاڤلكێت ئیسفکا
٩ـ رەزێت ملێ
١٠ـ شهاجا
١١ـ كۆرا خەندەكێ
١٢ـ كۆرا گراڤی
١٣ـ ملا حافزی
١٤ـ ملا مزگەفتێ.

**خواندنگەهـ:**

ل گوندێ ئیسفكا خواندنگەهـ تا خراببووی نە هاتیە ڤەكرن، بەلێ ل سالا (١٩٥٧)ێ زارۆیێن وێ دگەل زارۆیێن قەدشێ و بێناتا و ئینشكێ چووینە خواندنگەها ئینشكێ، تا خواندنگەهـ ل گوندێ قەدشێ ل سالا (١٩٧٤)ێ هاتیە ڤەكرن، پاشی چووینە وێرێ خواندنگەهێ.

**خرابـبوونا گوندی:**

ل سالا (١٩٦١)ێ گوندێ ئیسفكا ب بومبێن فرۆكێن عێراقێ دگەل گوندێن دەور و بەران هاتیە خرابكرن، پاشی پشتی چەند سالان جارەكا دی هندەك خانی لێ هاتینە ئاڤاكرن ڤە، ل پشتی بەیانا (١١)ێ ئاداری (٦)خانی بۆ خەلكێ گوندی هاتنە ئاڤاكرن، لێ نە ل جهێ گوندی یێ كەڤن، بەلكو ب خواركەفتی نە پشتا گوندێ قەدشێ.. لێ ل سالا (١٩٧٦)ێ ب تەمامی گوند هاتیە خرابكرن و چۆلكرن و ئێدی تا نها مایە چۆل.

## چەند شوینوارەك ل گوندێ ئیسفكا:

**مزگەفتا گوندی،** یەك ژ شوینوارێن گوندێ ئیسفكا یێن هەتا نها ماین مزگەفتا گوندی یە، كو د بنەرەت دا دێر بوو، پاشی كریە مزگەفت.

ئەگەر ل ڤێ دویڤچوونا مامۆستا (كۆڤان ئحسان) بچین: (ئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە هونەرێ بیناكاریێ ئەڤێ مزگەفتێ كو دو ژوورن دناڤ ئێك ئاڤاهیێ لاكێشەیدا و دەرگەهێ رۆژهەلاتی و هەبوونا دەرگەهەكێ بچووك ل باشوور، ئەڤ چەندە مە دبەتە سەر راستیەكا دی ئەوژی ئەڤ جهە دبنەكوكا خودا كەنیسەكا كریستیانا یە چونكە ئەگەر ئەم هەڤبەركرنەكێ بكەین دگەل ئەوان دێرێن دی ئەڤێن ل

مزگەفتا گوندی ئیسفكا



دەڤەرێ هەبن وەکی دێرا شیرستانێ ل دەڤەرا بەرواریا دێ بینین هەر ئەو ستایلێ بیناکرییە و چ جوداهی دناڤبەرا هونەرێ دروستکرنا وان دا نینە..[١٧١].

### ناوسکا و کوچکا میرێ ئۆما:

هەر دیسان بەری نها مە ب فرەهی بەحسێ ڤێ ناوسکێ کرییە

### چەپەرێ کەڤرێ عیسێ:

دکەڤیتە باکوورێ ڕۆژهەلاتێ گوندی، ژ دیوارەکێ (١م) فرەهی و ژوورەکا لاکێشەی (٧م) درێژی پێکدهێت، ئەڤ چەپەرە یێ نێزیکی کوچکا شێرێ ئوما و شکەفتا ئومەری یە، دیارە گەلەك ئەفسانە ب ئوما (عمر ـ ئومەر)ڤە هاتینە دروستکرن دهێتە بەحسکرن وەکی مێرخاسەك و شەڕزانەکێ میرگەها بەهدینان وەکی ناڤ بەحسێ شێر و مێرانیێ دهێتە کرن نە وەك کەسەکێ کۆمەلایەتی ئایینی، دیسان بەرەبابێن ئەڤی سەردەمی ب وێ چەندێ ڤە دهێتە گرێدان هەبوونا بنەمالەکا تایبەت ب ڤی ناڤی ئەڤەژی راستیەکا دی ددەتە بەر دەستێ مە ل سەر ئومای و کەسایەتی یا وی[١٧٢].

### چەپەرێ پاشای:

دکەڤیتە سەرێ گەلیێ ئیسفکا ژ لایێ ڕۆژهەلاتی ڤە ب دووراتییا (٢٠٠م).. بۆ لایێ سەرێ ئامێدیێ، نێزیکی (٦کم) ژ سەرێ ئامێدیێ دویرە، ئەڤ چەپەرە یێ پێکهاتییە ژ دوو مەزەلان، درێژیا دیوارێن وی (١٠،٥م) فرەهی (٧م)، پەحناتیا دیواری (٩٠سم)، بلنداهییا دیواران ژ (١ـ ٥ ,١م) ماینە یێن دی ژێ هەرفتینە، مەزەلا ئێکێ (٥ ,١٠م X ٧م) جارەکا دی د نیڤەکێ ڕا ڤەبریە ڤە ب دیوارەك دی، دبیتە دو مەزل، مەزەلا پشتێ جهێ پاشای بوو، مەزەلا سینگی، جهێ خێریزا پەزێن کویڤی بوو، دەمێ پەزا قەستا خێریزێ دکر، پاشای د مەزەلا پشتێ ڤە، دەرگەهـ لێ دگرت (جا کا ب چ ڕەنگ)، و دا ئەو پەزا قەلەوا ب دلێ وی با ژێ گریت، یێن دی بەرددانەڤە.. کو ئەڤ چەپەرە دزڤریتەڤە بۆ سەردەمێ (میر بەهرام پاشایێ مەزن، (١٦٩٥ـ ١٧١٦ز)) [١٧٣].

### ناوسك و کوچکا میرێ ئۆما:

ئەڤ ناوسکە دکەڤیتە ڕۆژهەلاتا گوندی ل جهەکێ بلند هاتییە دروستکرن، ژ سێ تەختا پێکدهێتن، تەختێ لایێ باکووری درێژاهییا وی(١,٩٥م)ە و (٦٠سم) فرەهییا وی یە و بلنداهییا وێ (١,١٠م)ە، و تەختێ باشوور ب هەمان قەبارەیە هەر چ تەختێ ناڤەراستێ یە (٤٥سم) یێ فرەهەیە و درێژاهییا وی (١م)ە و بلنداهییا وی (٧٠سم)ە، فرەهییا شکەفتێ بڕەنگەکێ گشتی (٢,٤٠م)ە، دبێژنە ئەڤێ شکەفتێ (شکەفتا ئومەری یان شکەفتا ئۆما)، ستایلێ دروستکرنا (دۆخما) یان ئەو جهێ دیندار و پیرەکێن زەرەدەشتییا ئایین ب ئاگری تێدا ئەنجام دا، ئەڤ ڕەنگە بوو، لێ ل ناڤەراستێ قۆرەك هەبوو خۆلی تێدا دهاتە پاراستن، ئەڤ ناوسکە دهاتنە بکارئینان دەما پیرەك و ڕەبەن و ئاییندارێن مەسیحی ل ژێر کونترۆلا ئایینی دهاتنە ئەڤان جها دا بشێێن ب ئازادی پێرابوون و بیرەوەرێن ئایینی ئەنجام بدەن، هەر چەندە ئەڤ ناوسکە یا تۆشی هڕیانەکا سرۆشتی و دەست درێژیکرنا مرۆڤا بووی، دیارە ژ ناڤدا بەرمایێن دیوارەکی هەنە و ڕەنگە یا دو نهۆمی بیت، نهۆمێ سەری بۆ ئەنجامدانا کارێن ئایینی هاتبیتە دروستکرن و نهۆمێ خوارێ بۆ گەنجینەکرنا تشتێن پێدڤی هاتبیتە بکارئینان[١٧٤].

### کولۆزکێن گۆڕان:

ئەگەر چاڤ خشاندنەکێ ل هندەك گۆڕان بکەین، ئەوێن ل دەور و بەرێن گوندێ ئیسفکا، کو گۆڕەك هاتییە دیتن ل ملا ڕەزی، ل باشوور ڕۆژئاڤایێ گوندێ ئیسفکا یێ کەڤن، کۆ دناڤ ڤی گۆڕی دا کولۆزکەکێ مەزن تێدا خۆلی تێ بوو، و دناڤ ڤی کولۆزکێ مەزن دا کولۆزکەکێ بچویك ژی تێدا بوو[١٧٥]، هەر خۆلی تێدا بوو، و جیولۆجی بۆ وێ چەندێ دچن، ئەڤە گۆڕێ

ئافرەتەکێ یە و زارۆیێ وێ ژی دگەلدا هاتییە سۆتن و خۆلیا وان کرینە ڤان کولۆزان و پێکڤە ڤەشارتینە.. و باراپتر ئەڤ شێوێ سۆتن و ڤەشارتنا مریان دزڤریتەڤە بۆ سەردەمێ زەرەدەشتییان.

### دێرا باگویلێ:

ل رۆژئاڤایێ گوندێ ئیسفکا ب دووراتییا نێزیکی (١کم) ل سەرێ چیایێ مەتینا جهەك هەیە دبێژنێ زەڤیا باگویلێ، ل رۆژهەلاتێ ڤێ زەڤیێ کاڤلە دێرەك لێ هەیە، کۆ ئەڤ دێرە هاتییە ئاڤاکرن ل سەر رووبەرێ (١٨م درێژی ١٢ Xم فرەهی) و فرەهیا دیواری (١م)، ئەڤ دێرە دبیتە دو بێش، بێشا رۆژئاڤای (١٨م X ٦م) و دەرگەهێ وێ ژ بێشا رۆژهەلاتی دچیتێ، و بێشا رۆژهەلاتی دبیتە دو ژوور، ژوورا باشوور (٨م ٦ Xم) و دەرگەهێ وێ ژ باشوور دچیتێ، وەسا دیارە ئەڤ ژوورە وەك جهێ پێلاڤ و پێدڤیێن دێرێ هاتییە بکارئینان، و ژ ناڤ وێ ژووری دەرگەهـ دچیتە ژوورا دووێ و ژ وێ ژووری دەرگەهـ دچیتە بێشا رۆژئاڤای، پێتریا پاشمایێن دیواری یێن ماین ب بلنداهیا (٨٠سم ـ ١م) ماینە، وەکو دی هەرفتی نە.

## گوندێ بێناتا (بێناثا):

بێناثا: پەیڤەکا کلدانیە و ل دووڤ گۆتنا ئێك ژ خەلکێن گوندی دبێژیت: دو رامانا ددەت، یەك ژوان ب رامانا (نك مە)، یەك ژی ب رامانا (مالا کانیا= بیت العیون).

ئەڤ گوندە دکەڤیتە باشوورێ گوندێ قەدشێ ب دووراتییا نێزیکی (١٥٠٠م)، ئەڤ گوندە یێ

پاشمایێ دیرا گۆندی بیناتا



مەسیحییانە و ژ كەڤن وەرە هاتییە ئاڤاكرن. بەلێ گوندێ بێناتا یێ كەڤن نێزیكی (٥٠٠م) ژ گوندێ نوی، پێدا ترە بۆ لایێ باشوور.. كو تەنێ ژ گوندێ كەڤن شوینوارێن دێرا وێ و گۆڕستانا وێ ماینە.. ئەڤ گوندە نها نێزیكی (٧٠) خانییان ژ لایێ حكومەتا هەرێما كوردستانێ د سێ قۆناغان دا هاتینە ئاڤاكرن، ل سالێن (٢٠٠٥ ـ ٢٠٠٦ ـ ٢٠٠٧)ێ، و نها نێزیكی (٢٤) خێزانان تێدا ئاكنجینە.. هەروەسان ل دەستپێكا سالێن (١٩٨٠)ێ خواندنگەهەكا سەرەتایی لێ هاتبوو ئاڤاكرن، لێ پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ هندەك خێزانێن ژ ئاوارەی زڤرین تێدا ئاكنجی بووینە، و نها خویندكارێن ڤی گوندی بۆخواندنێ د چنە خواندنگەها ئینشكێ یا سریانی. هەروەسان نها دو دێر د ڤی گوندی دا هەنە، یەك ژ وان ل پشتی پێكهاتنا ١١ ی ئادارا سالا ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاكرن، یەك ژی د سالا (٢٠٠٦)ێ .. هەر وەسا (كۆمەلا شیرەتكاریا چاندنێ) و (یانا صپنا یا وەرزشی) ل ڤی گوندێ هەنە.

## ژ شوینوارێن گوندی:

گوندێ بێناتا یێ كەڤن چەندین شوینوارێن كەڤن لێ هەنە، كو كەڤناتییا گوندێ دسەلمینیت، ئەوژی ئەڤەنە:

### دێرا گوندێ بێناتا:

گوندێ بێناتا یێ كەڤن دكەڤیتە باشوورێ كۆمەلگەها قەدشێ ب دووراتییا نێزیكی (١٥٠٠م)، گوندێ كەڤن یێ بێناتا، ل سالا (١٩٦٣)ێ هاتییە خرابكرن و خەلكێ وێ هەر هندەك بۆ رەخەكی ڤەرەڤینە، تەنێ ژ شوینوارێن گوندێ كەڤن هندەك ژ پاشمایێن دێرا گوندی ماینە، كۆ ئەڤ دێرە ژ دو ژووران پێكهاتییە، ژوورا سینگی رووبەرێ وێ (٦م ٤ Xم)، پاشی دەرگەهەكێ بشێوێ كڤانی (قوس = ئاقدی) دچیتە ژوورا دووێ ئەڤ دەرگەهە (١,٥م) فرەهە و (٢م) یێ بلندە، ژوورا دووێ (١٢م ٦ Xم)، دیوارێ بێشا دووێ ژ لایێ باشوور دو پەنجەرێن مەزن تێدا هەنە، و د دیوارێن ژ ناڤدا چەند پەنجەركەك تێدا هەنە بشێوێ (لاكێشە و چوارگۆشە)، كۆ چرا تێدا هەلدكرن و دیسان تشت دكرنە تێدا. دیوارێن وێ د ناڤبەرا (٢ ـ ٣م) ماینە نە هەرڤتین، ئەڤ دێرە ژ بەری و كسلێ هاتییە ئاڤاكرن.

هەر باشوورێ دێرێ دیوارەك نیڤ كڤانی ب درێژیا (٢٢م)، كو ئەڤە وێ چەندی دیاردكەت ئەڤە دیوارێ حەوشا دێرێ یە.. و سێ ژوورێن دی ل باشوور رۆژئاڤایێ هەنە، ئەوژی ژوورا باكووری (٣,٦٠م ٣,٨٠ Xم)، و ژوورا باشوور (٧م ٣,٨٠ Xم)، ژوورا رۆژئاڤای (٣,٨٠م ٧ Xم)ە.

### كۆتەلێن ئاشی:

ل رۆژئاڤایێ گوندێ بێناتا یێ كەڤن ب دووراتییا (٢٥٠م) دو كۆتەلێن ئاشی تا نها شوینوارێن ماینە، ئەوژی ئەڤەنە:

**كۆتەلا سەری:**

ئەڤ كۆتەلە د كەڤرەكێ بەرێ خێزی هاتییە كۆلان ببلنداهییا (١١٠سم)، و پاشی دەرێ وێ ب بەران بشێوێ كۆتەل هاتییە نژنین، دیسان بنێ كۆتەلێ ژی ب بەران هاتییە نژنین، فرەهییا دەرێ كۆتەلێ (١٦٠سم)، و فرەهییا دیوارێ كۆتەلێ (١م) بلنداهییا كۆتەلێ نێزیك (٣م)ە.

**كۆتەلا دووێ:**

ئەڤ كۆتەلە دكەڤیتە باشووری كۆتەلا ئێكێ ب دووراتییا (٢٠٠م) دكەڤیتە دوو شاخا شیڤا ملێ میرا و شیڤا بێناتا، ئەڤ كۆتەلە هەمی ب بەر و كسلان هاتییە ئاڤاكرن، فرەهییا دیوارێ كۆتەلێ (١٦٠سم) و بشێوێ كۆتەل (بازنەی) هاتییە ئاڤاكرن، بلنداهییا كۆتەلێ ئەوا مای ل هندەك جهان (٣,٥٠م)، كویراتیا كۆتەلێ ژبەر وان بەر و گلێشێن كەفتینە دكۆتەلێ دا، تەنێ (١٢٠سم) دهێتە دیتن، وەكو دی تژی بەر و گلێش بوویە، نژنینا وێ بشێوەكێ ئەندازەیێ گەلەك جوان هاتییە نژنین.

## گوندێ هەمزیكێ:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ كۆمەلگەها قەدشێ ب دووراتییا نێزیكی (٤كم)، پێكهاتێن وێ (موسلمان و مەسیحی)نە.. پێتریا ئاخا ڤی گوندی

پارچەك ژ دنگەکێ دیرا گۆندێ هەمزیکێ



یا بنەمالا مفتیێن ئامێدیێ یە، ل سالا ١٩٧٦ێ دەمێ گوندێن دەڤەرا نێروە و ڕێکان ب کوتەکی ڕاکرین، هندەك ژ خێزانێن نێروەییان هاتینە ڤی گوندی ئاکنجی بووینە.

مەسیحیێن ڤی گوندی (کلدانی نە).. و موسلمانێن وێ ژ بنەمالا مفتیێن ئامێدیێ نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٢ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧٦]. مەسیحیان گوندێ خۆ ل سالا (١٩٦١)ێ بەردایە دەمێ هەمی گوندێن مەسیحیان د ڤێ سالێ دا هاتینە بەردان و چۆلکرن، و پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارێ دەمێ خەلکێ گوندێن مەسیحییان زڤرینە سەر گوندێن خۆ، خێزانێن ڤی گوندی نەزڤری بوون، بەلکو ل سالا ١٩٧٤ێ هندەك خێزان ڤەگەریا بوون، بەلێ خانی نە ئاڤاکریبوون، ماوەیەکی مان و جارەکا دی گوندێ خۆ بەردانەڤە.. خێزانێن موسلمانێن ڤی گوندی هەر ماینە د ڤی گوندی دا و گوند نە بەردایە.. ل سالا (٢٠٠٨) ێ مزگەفت لێ هاتییە ئاڤاکرن، و ل سالا (٢٠٠٩) ێ خواندنگەهەکا بنەرەتی بۆ هاتییە ئاڤاکرن (بەلێ قوتابیێن مەسیحی د چنە قوتابخانێن سریانی ل ئینشك و سەرسنکێ و قوتابخانا عەرەبی ل ئەرەدنا)، هەروەسان گوندێ مەسیحیان ل سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە ئاڤاکرن و دێرا وان ل سالا (٢٠١١)ێ هاتییە ئاڤاکرن، نها (٢١) خێزانێن مەسیحی تێدا د ئاکنجی نە، دگەل (١٠) خێزانێن موسلمانان.

## ژ شوینوارێن گوندی:

### دێرا کەڤن

نها ل ڤی گوندی تەنێ نیڤ دیوارەك ژ دێرا کەڤن مایە، کۆ دیوارێ باشووری یە، درێژیا (١١,٣٠م)، بلنداهیا وی (٢,١٠م)، فرەهیا دیواری (٧٠سم)، ل نیڤا ڤی نیڤ دیواری دەرگەهێ دێرێ یە، فرەهیا وی (٨٠سم)، بلنداهیا وی (١,٧٠م)، دەرگەهـ بشێوێ ئاقدی (کڤانی) هاتییە ئاڤاکرن.

## بەرەكێ ستوینا دێرێ:

دیسان ژ پاشمایێن ڤێ دێرێ بەرەكێ بشێوێ بازنی بلنداهیا وی (٥٥سم) و تیر (قطر)ێ بازنەیا وی (٥٠سم) و نیڤا ڤی بەری ژ لایەكی ڤە وەكە جۆهنییان هاتییە كۆلان داكو بەرێ دی بكەڤیتە تێدا ژ بۆ موكومكرنا ڤان ستوین (دنگ) ێن كەڤری و نە كەڤن.

## گوندێ بەرێ كەر:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ كۆمەڵگەها قەدشێ ب دووراتییا (٢كم).. ل دووڤ هندەك گۆتنان دبێژن دو بۆچوون بۆ ناڤێ گوندی هەنە، یەك ژبەر گری هاتییە، كو دكەڤیتە بەر گرەكی، یا دی ژ بەرێ گرِ هاتییە (چونكە بەرێن ڤێرە دگرن)، و ل داویێ بوویە بەرێ كەر.. ئەڤ گوندە د كەڤندا نە ل ڤێرە بوو، بەلكو جهێ گوندی یێ كەڤن ب دووراتییا (٢٥٠م) ژ جهێ نها ل ئەڤراز ترە، نها ژی كاڤلە گوندێ وێ دیارە، لێ پاشی هاتییە ڤەگوهاستن بۆ رەخ جاددا سەرەكی ڤە.

هەر چەندە ئاكنجییێن سەرەكی یێن ڤی گوندی تەنێ ژ بابكەكی پێكدهێن، بەلێ ژ بلی خێزانێن كەڤنێن ڤی گوندی هندەك خێزانێن گوندێ بۆتیا ژی هاتینە ڤی گوندی.

ل سالا ١٩٨٧ێ ئەڤ گوندە هاتییە چۆلكرن، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن ڤە.. ل سالا (٢٠٠١)ێ مزگەفتەك بۆ گوندی هاتییە ئاڤاكرن، و ل سالا (٢٠٠٩)ێ، و بیرەكا ئاڤێ ژی ل دەرێ گەلیێ كویركی بۆ هاتییە كۆلان و دگەل چێكرنا دو عومبارێن ئاڤێ، دیسا ل سالا (٢٠٠٩)ێ خواندنگەهەك ژی بۆ گوندی هاتییە ئاڤاكرن.. نها (٣٠) خێزان د ڤی گوندی دا دژین.

## ژ شوینوارێن گوندی:

ل باشوورێ رۆژهەلاتێ ڤی گوندی ب دووراتییا (٥٠٠م) كەڤرەك بلند لێ هەیە ب ناڤێ بەرێ قەسرۆكێ، كو ئەڤ ناڤە دزڤریتەڤە بۆ وێ چەندێ د كەڤن دا ل بن ڤی كەڤرێ مەزن قەسرەك هاتییە ئاڤاكرن، كو نهاژی هندەك ژ شوینوارێ بناغەیێ ڤێ قەسرێ مایە، دیوارێ رۆژهەلاتی درێژیا (٧,٧٠م) و یێ باشوور ١٢م) و یێ رۆژئاڤای (٨,٥٠م)، و ل بەر سینگێ ڤێ قەسرۆكێ جوهنییەك د نیڤا كەڤرەكی هاتییە كۆلان، نهاژی ئەو جوهنی مایە.

## گوندێ ئینشكێ:

دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كۆمەڵگەها قەدشێ ب دووراتییا (٢كم)، ئاكنجیێن ڤی گوندی مەسیحی نە، و گوندێ كەڤن دكەڤیتە نێزیك سویلاڤێن ئینشكێ، نها ژی پرانیا شوینوارێن خانیێن وێ یێن كەڤن ماینە و دگەل شوینوارێ دێرا گوندی، هەروەسان هندەك شوینەوارێن زۆرێن كەڤن لێ هەنە مینا ناوسك و كۆتەلێن ئاشی.

گوندێ كەڤن یێ ئینشكێ ل سالا (١٩٦١) ێ د گەل گوندێن دی یێن مەسیحییان هاتییە چۆلكرن.. تشتێ ژ شوینوارێن گوندێ ئینشكا كەڤن ماین، شوینوارێن چەندین كاڤلێن خانییان ماینە نیڤ هەرفتی، و ژ دێرا وێ بێشا دووێ ژێ مایە نیڤ هەرفتی.

پشتی پێكهاتنا ١١ی ئادارێ سالا (١٩٧٠)ێ جارەكا دی (٣٠) خانی بۆ هاتینە ئاڤاكرن، بەلێ گوند ل جهێ كەڤن نەهاتییە ئاڤاكرن، بەلكو ب خوار ئێخستیە و دگەل ئاڤاكرنا گوندی دێرەكا كەڤن ل رۆژهەلاتێ گوندی هەبوو جارەكا دی هاتییە نویژەنكرن.. ل سالێن (٢٠٠٥ـ ٢٠٠٦ـ ٢٠٠٧)ێ (٦٠) خانی بوو هاتینە ئاڤاكرن.. و دێرەك دی ل نیڤا گوندێ نوی ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧٧] و نها (١١٥)ە خێزان لێ د ئاكنجی نە.

## ژ شوینوارێن گوندێ ئینشكێ:

گوندێ ئینشكێ یەك ژ گوندێن دێرینێن دەڤەرێ یە، لەوما چەندین شوینوارێن كەڤن لێ هەنە، كۆ ئەڤەژی گرنكترین شوینوارێن وێ نە:

## دێرا گوندێ ئینشکێ:

هەرچەندە بێشا رۆژئاڤایێ دێرا ئینشکێ کەفتییە بەرجادێ هاتییە ژ ناڤبرن، لەوما تەنێ بێشا رۆژهەلاتی مایە، ئەوژی درێژیا دیوارێ وێ (٥,٦٠م)ە و فرەهییا وێ (٧,٤٠م)ە، و دەرگەهێ وێ فرەهییا وی (٢,١٣م) و بلنداهی (٢,١٠م)ە و بشێوێ ئاقد (کڤانی) هاتییە ئاڤاکرن، فرەهییا دیوارێ وێ (١م)ە، و ل هندەك جهان بلنداهییا دیوارێ یێ مایی (٣م)ە.. و هەتا بەری چەند سالا بانێ ڤێ بێشێ مابوو کو ب بەری و بشێوێ ئاقد هاتبوو ئاڤاکرن و بۆ نژنینا وێ بەر و کسل بکارئینانینە.

## کۆتەلا ئاشی:

ل رۆژهەلاتێ گەلیێ ئینشکێ ب دووراتییا (١٥٠م) شوینوارێن کۆتەلەکا ئاشی ماینە، کو بلنداهییا کۆتەلێ (٦,٧٠م) مایە، و فرەهییا دیوارێ کۆتەلێ (١,٤٠م)ە، بشێوێ بازنەی ب بەر و کسلان هاتییە ئاڤاکرن، بەلێ کۆتەل تژی بەر و گلێش بوویە.

## ناوسکا رۆژهەلاتی:

ب رەخ کۆتەلا ئاشی ڤە، ناوسکەك هەیە، کۆ بلنداهییا دەرگەهێ وێ ژ عەردی (٢,٢٠م)ە، فرەهییا دەرگەهی (٥٠سم)ە و بلنداهییا وی (٨٠سم)ە.. و فرەهییا ڤێ ناوسکێ ژ ناڤدا (٤م X ٢,٣٠م X ٨٠سم بلنداهی).. د ناف ڤێ ناوسکێ دا سێ تەختێن بەری هاتینە چێکرن ژ کەڤری و ب رەخ هەر ئێك ژ ڤان تەختان پەنجەرکەك نیڤ کڤانی ژ بۆ دانانا تشتان و چرایان تێدا هاتینە کۆلان.

## ناوسکا رۆژئاڤای:

ل رۆژئاڤایێ گەلی ب دووراتییا (١٠٠م) دیسان ناوسکەکا دی هەیە، بلنداهییا دەرێ ڤێ ناوسکێ ژ عەردی (٧م)ە، و دەرگەهێ وێ فرەهییا وی (٥٥سم)ە و بلنداهییا وی (٩٠سم)ە، و ناڤا ناوسکێ (٣,٣٠م X ٣م X ١,٦٥م بلنداهی)ە.. هەر ڤێ ناوسکێ ژی سێ تەختێن بەری تێدا هەنە و ب رەخ هەر یەك ژ وان

شکەفتا ئینشکێ



پەنجەرکەکا نیڤ کڤانی ژ دانانا بۆ تشتان و چرایان د کەڤری هاتینە کۆلان.

دیسان ناوسکەکا دێ هەبوو کو ژ جهێ خۆ کەتیبە خوارێ ل سەر رێکا شکەفتێ .

### شکەفتا ئینشکێ:

ل رۆژئاڤایێ گەلیێ ئینشکێ، شکەفتا ئینشکێ یە، کۆ یەك ژ ناڤدارترین جهێن گۆزاری یێن دەڤەرێ یە، شکەفتەکا سرۆشتییە، لەوما تا نهۆ وەك شکەفتەك شوینواری نەهاتیە ڕاگەهاندن، دبیت هندەك دەستکاری د ماوەیەکی دا تێدا هاتبنە کرن، بەلێ پێتر دهێتە نیاسین وەك شکەفتەکا سرۆشتی، پێدڤی زانینێ یە ئەڤ شکەفتە ل سالا (١٩٧٤)ێ وەك نەخۆشخانا پێشمەرگەی بوو ل دەڤەرێ، بریندار و نەخۆشێن پێشمەرگەی هەتا خەلکێ دەڤەرێ د هاتنە وێرێ بوو چارەسەرکرینێ.

### گوندێ کانی هاجەرێ[178]:

دکەڤیتە باکوور ناحیا سەرسنکێ ب دووراتیا نێزیکی (٥کم)، رۆژئاڤایێ باشوورێ گوندێ ئینشکێ ب دووراتیا (١کم)، رۆژئاڤایێ باکوورێ کانی هاجەرێ گوندێ ئەرەدنا ژێری (مەسیحییان)ە ب دووراتیا (٣کم)ا و ئەرەدنا ژووری (مۆسلمانا) نێزیکی (٦کم) ژێ دویرە.

ل سالا (١٩٦٩)ێ ژ لایێ چەند خێزان ئویجاخێن ئەرەدنا ژووری ڤە هاتیبە ئاڤاکرن، ئەوژی ژ ئویجاخێن (بارانی و بیبوی و زالێ) ڤە.. مەرەم ژ ڤێ ئاڤاکرنێ پێتر خەلکی خۆ نێزیکی رەزێن خۆ کرینە، دیسان بۆ خودانکرنا تەرش و کەوالێ ژ جهێ ئەرەدنا ژووری پێتر هاریکارە.. سالا (١٩٨٦)ێ ژ لایێ حکۆمەتا عێراقێ ڤە هاتە خرابکرن و ل سالا (١٩٨٨ـ ١٩٩٠)ێ، جهێ گوندێ حکۆمەتێ دوو سکرێن ئاڤێ لێ دورستکرن، دەور و بەر ژێ کرنە تەلار (قصر) و ب دیوارەکێ بلنداهیا وی (٤م) هاتە پەژانکرن، ئێدێ کەس نەشیا قەستا وی جهی بکەت.. پاشی پشتی سەرهلدانێ ئەو قەسر هەمی ژ لایێ هندەك کەسانڤە هاتنە خرابکرن و نهۆ ئەو سکر بووینە ئێك ژ جهێ گەشت و گۆزاری.

### گوندێ چەمی[179]:

دکەڤیتە دناڤبەرا کانی هاجەرێ و کانی چنارکێ و ئەرەدنا دا ب دووراتیا (١کم) ژ کانی هاجەرێ دویرە.. ل سالا (١٩٦٧)ێ هاتیبە ئاڤاکرن، ئەو خێزانێن ژ گوندێ ئەرەدنا چووینە وێرێ ژ ئویجاخێن (مەلاکێ و بیبوی و حەجێ و بارانی و زالێ) بوون.. پاشی ل سالا(١٩٧٩)ێ ژ لایێ رژێما عێراقێ ڤە هاتە خرابکرن.

پشتی خرابکرنا وی خەلکێ وێ هند چوونە (ئەرەدنا) و هندەك ژ چوونە (مووسل و دهۆك و سەرسنك و قەدشێ) ئاکنجی بوون، ئێدی گوند مایە کاڤل و نەهاتییەڤە ئاڤاکرن ڤە.

سەرژمێریا سنوورێ بازرڤانییا قەدشێ سالا ٢٠٠٩ ـ ٢٠١٠ێ

| ناڤێ گوندی یان کۆمەلگەهێ | ژمارا ئاکنجیبوویا | ژمارا سەرۆك خێزانا | ژمارا ئاڤاهیا | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| کۆمەلگەها قەدشێ | ٥٨٨٢ | ٩٦٤ | ٩٩٣ | |
| گوندێ ئینشکێ | ١٧٦٢ | ٢٩٦ | ٢٩٨ | |
| گوندێ بێناتا | ٢٧٤ | ٥٦ | ٦٩ | |
| گوندێ بەرێ کەر | ١٤١ | ١٩ | ٢٤ | |
| گوندێ هەمزیکێ | ٢٢٠ | ٣٨ | ٤٢ | |
| گوندێ بۆتیا | ٢١٠ | ٢٧ | ٢٧ | |
| سەرجەم | ٨٤٨٩ | ١٤٠٠ | ١٤٥٣ | |

# ناحیا شێلادزێ

**هێرش کەمال ڕێکانی**

## جهێ جوگرافی یێ مەلبەندێ شێلادزێ:

ناحیا شێلادزێ دکەڤیتە ڕۆژهەلاتێ قەزا ئامێدیێ سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەیە، دەشتەکا بەرفرەهـ و مەزنە ل دانگا چیایێ ناڤدارێ (کورەزاری)، دەڤەرەکا گەشت و گوزاری سنووریا گرنگ و ستراتیژی دهێتە هژمارتن، دەرگەهەکێ سەرەکی یە بۆ گرێدانا چەند لایەنەکان ژ ئابووری و پەیوەندیێن سیاسی ڤە، دکەڤیتە سەرهێلا درێژیا (٤٣-٤٤°) پلە باکووری، هێلا پانیا (-٣٧ °٣٨) پلە ڕۆژهەلاتی، ژ ئالیێ سنوورێ جوگرافی ڤە ژی، سەنتەرێ شێلادزێ ب ڤی ڕەنگی یە:

**باکوور:** چیایێ (کورەزار٣٦٠٣-م)؛ کوبلندترین کوپیتکە ژ زنجیرا چیایێ (مەتین)ێ.

**باشووری:** ڕووبارێ (زێیێ مەزن- زێ - کەلیا -زێ بەهدینان).

**ڕۆژهەلاتی:** کۆمەلگەها (سیریێ)، ڕووبارێ شەمدینان (ڕوویێ شین)، (باکوورێ ڕۆژهەلاتی: گەلیێ بالندا)، دەڤەرا (بارزان).

**ڕۆژئاڤایی:** کۆمەلگەها هێتوت، ناحیا دێرەلوك ب دووراتیا (١٣کم)ان، ب دووراتیا (٣٠کم) ژ ڕۆژهەلاتێ قەزا ئامێدیێ.

## ڕامانا ناڤێ دەشتازێ (شێلادزێ):

ژ کەڤندا دەڤەر ب (دەشتازێ) دهاتەنیاسین، پتر ژ جهەکێ بخۆڤەدگرت، ئانکو شێلادزێ دگەل دەوروبەرا ب (دەشتازێ) دهاتەناڤکرن، دەشتەکا بەرفرەهە و ل سەر ڕووبارێ (زێ)یە، لەوما ب دەشتا ڕووبارێ (زێ) هاتبوونیاسین، کو هەر ژ (گەلیێ بالندا) ژ ئالیێ باکوورێ ڕۆژهەلاتی ڤە، هەتا گەلیێ (ڕەشاڤە) ل باکوورێ ڕۆژئاڤای بخوڤەدگریت. دەشتازێ ژ سێ ڕێزە گوندان پێکدهات، ئەو ژی پشتی سنوورێن شێلادزێ بەرفرەهـ بووین هندەك ژوان گوندان وەك (ئاوکا، هاجی مەندا، ملێ مەیدانێ) نها بووینە تاخێن شێلادزێ، ئەو ڕێزە گوند ئەڤەنە:

١- **ڕێزا ئێکێ:** ل باکووری ڕێزا سەری (بنارا چیایێ کورەزاری) ژ ڤان گوندان پێکدهات (ئاوکا، هاجی مەندا، هەسن بەکرا، کەلیانکێ) هەتا ڕەخێ گەلیێ (ڕەشاڤە).

٢- **ڕێزا نیڤەکێ:** گوندێن (سیریا ژووری - کەڤن، شێلادزا کەڤن، ملێ مەیدانێ، کولان، ڕەشانکێ (ڕەشان)، بادان، بێخیرێ، مێرگێ) بخوڤە دگرت.

٣- **ڕێزا ژێری (خوارێ):** ل باشووری نێزیك ئاڤا ڕووبارێ (زێ- زێ مەزن)، کو ژ گوندێن (سیریێ، هەڤنکا، خوشکا، کانی دیرەکێ، بیماڤا، پیران، باوان، چەلکێ) پێکدهێت.

ناڤێ (شێلادزێ) یێ ژ سرۆشتێ هاتییەوەرگرتن، جهەكێ چاندنێ یێ بەرفرەهـ بوویە، ئەو ژی (شێل = دەشت) و (دزێ) = كورتكرن و سڤكرنە د گوتنێ دا ئانكۆ دو زێ (دو ڕووبار)، دەشتا دو ڕووبارا، (زێ) ڕامانا ڕووبارە، ژبەركو دكەڤیتە د ناڤبەرا دو ڕووبارێن زێ یێ مەزن ل باشووری و ڕووبارێ (ڕوویێ شین) ل ڕۆژهەلاتی، لەوما ب (شێلادزێ- دەشتا دو ڕووباران) هاتییە ناڤكرن[1].

## ژێدەرێن ئاڤێ:

### أ-ڕووبارێن دەڤەرا شێلادزێ:

هەروەكی دیار ناڤێ شێلادزێ ژ سرۆشتێ وێ هاتییە وەرگرتن، كو دو ڕووبارێن گرنگ (زێیێ مەزن) و ڕووبارێ شەمدینان (ڕوویێ شین) بخۆ ڤە دگریتن، و مفا بۆ ڤەخوارنێ و دەرامەتی و چاندنێ و گەشت و گوزارێ ژێ دهێتە وەرگرتن:

#### ١- ڕووبارێ زێیێ مەزن:

ژ مەزنترین لقێن ڕووبارێ (دیجلە)یە، درێژاهیا وی (٣٩٢كم)[2]، زێیێ مەزن ل دەڤ گوندێ (نەمرود) نێزیكی (٤٩كم) ل باشووری مووسل دگەهیتە ڕووبارێ (دیجلە)، و (١٦٦٠٠كم) كیلومەترێن چوارگۆشەیی ژێ دكەڤیتە دناڤ عیراقێ دا، ڕووبەرێ بركا (حەوزا) وی (٢٦٤٧٣كم٢) چوارگۆشەیە، شیانێن وی یێن ئاڤێ یا سالانە ٦٨.١٣ ملیار م٣ یە[3]، سالانە د هەر چركەیەكێ دا (٤٥٧م٣)مەترێن سێ جاری یێن ئاڤێ پێدادهێن[4]، پتر (٣٣٪) ژ ئاڤا ڕووبارێ دیجلەی ژڤی ڕووباری دهێتن[5]، سەرۆكانییێن وی یێن سەرەكی دكەڤنە چیایێن دەڤەرا (هەكارێ) ئەوێن دناڤبەرا دەریاچێن ئورمیێ و وانێ دا و ژبەر كو ب خورتی دچیت هەتا كو تیشكا ڕۆژێ كار لێ ناكەت دبێژنێ ڕووبارێ شێت[6]، ل دەڤ ناحیا (چەلێ) باكوورێ باژێرێ ئامێدیێ نێزیكی (٢٠كم) دهێتە دناڤ هەرێما كوردستانێ دا[7]، ل دەڤەرا بەروارێ بالا ل

شێلادزێ



نێزیك گوندێ (هەلوە) دهێتە دناڤ ئاخا باشوورێ كوردستانێ دا، ل پتریا دەڤەرێن تێرا دەرباز دبیت دبیتە سنوورێ ناڤبەرا عەشیرەتان، وەكی نێرەوەیی و بەرواری و نهێلی و زێباری و بارزانی و هەتا خوارێ، ل باشوورێ رۆژهەلاتێ كۆمەلگەها (سیریێ) دگەل رووبارێ شەمدینان (روویێ شین) د گەهنە ئێك و هەتا ڤێرێ درێژاهیا وێ نێزیكی (٥٠كم)یە[٨]، رووبارێ زێیێ مەزن ژ گەلەك لقێن بچویك و مەزن پێكدهێتن ئانكو درژنە سەر رووبارێ زێی وەك (دەرەی خەشكان، روو كۆچووك كو ژ رووبارێ حاجی بەگ و بەرازگرد پێك دهێتن، رووبارێ رەواندوز: ژچیایێن دەڤەرا حاجی ئومەران دهێتە خوارێ و ژ دو لقێن سەرەكی (رووبارێ حاجی ئومەران و رووبارێ دوورماران) پێكدهێت[٩]، هەروەسا ل دەڤەرێ ئەڤ رووبارە ب هندەك ناڤێن دیتر (زێ، كەلیا، زێیێ بەهدینان) دهێتە نیاسین.

نهالا گەڤەرێ كو ب قەرسینا ئاڤێ ل وەرزێ زڤستانێ ناڤدارە، گەلەك ئاڤ لێ كۆم دبیت دكەڤیتە سینگێ ڤی رووباری ل بهارەكا درەنگ دەریاچا گەڤەرێ دپەقیت و چەند رۆژەكا ژ ئەگەرێ ڤێ چەندێ ئاڤا وێ بۆش و شێلی دبیتن، پشكەكا زۆر ژ وێ ڤەرێژێن كەڤیێن بەفرا زۆزانا یە، ژ بلی ئاڤا بارانا و هندەك رووبار و رووباركێن بچویك.

هەژییە بێژین كەلەك و قایغ ئامرازێ دەربازبوونێ بوون ژ ڤی رووباری، زێدەباری مەلەڤانیا د هندەك وەرزاندا، سەبارەت وان پرێن هەر ژ كەڤندا ل سەر رووبارێ زێیێ مەزن هاتینە دانان گەلەكن كو هندەك ژوان ب تنێ شوینوارێن وان ماینە:

- **پرا كەرمم ئاغا**، ل دەریاچا گەڤەرێ یە.
- **پرا گێمانێ**، گەلیێ تیارێ یە.
- **پرا بلبل**، گوندێ هەلوە ل دەڤەرا بەرواری ژووری یا.
- **پركا بێزنور**، گوندێ بێزنور ل دەڤەرا نێرەویا یە.
- **پرا دوشاڤێ**، ناڤ گەلیێ زەرەی ل دەڤەرا نێرەویا.
- **پرا كەلیا**، راستا گوندێ كەلیا بن گەلیێ رەشاڤە، ل سەردەمێ میرێ بەهدینان (سولتان حسێن وەلی -١٥٣٤ ١٥٧٦ز) هاتیبەئاڤاكرن، ئەڤ پرە گرێدانە دگەل دەڤەرێن رۆژهەلات و باكوورێ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ ئەو ژێ دەڤەرێن نێروە و رێكانیا و زێباری و باژێرێ ئامێدیێ، درێژاهیا پرێ (٥٠)م، و فرەهی (٥ ، ٣)م، و بلنداهیا وێ (٧) مەترە[١٠].
- **پرا حەلانكێ**، جهێ كۆمەلگەها دێرەلوكێ بوو.
- پرا بالۆكا، دەڤەرا نێروە ل گوندێ بالۆكا.
- **پرا دێرەلوك**، كۆمەلگەها دێرەلوك.
- **پرا هاریكا**، راستا گوندێ هاریكا ل باشوورێ رۆژهەلاتێ كۆمەلگەها دێرەلوك.
- **پرا خالانە (مەلا موسای)**، ل گوندێ (خالانە) دەڤەرا زێبار.

## ٢- رووبارێ شەمدینان (روویێ شین-زێی شین)

ئەڤ رووبارە ژ رووبارێن گرنگە ل دەڤەرا نێروە و رێكان و دۆسكی ژووریان، ل گوندێ (چەمێ توو- چەمتی/ دۆسكی ژووری) دهێتە د ناڤ ئاخا هەرێما كوردستانێ[١١] و دبیتە سنوورێ سرۆشتی و كارگێری دناڤبەرا هەردو پارێزگەهێن هەولێر و دهۆكێ هەتا خالا گەهشتنێ دگەل رووبارێ (زێیێ مەزن) ل باشوورێ رۆژهەلاتێ كۆمەلگەها (سیریێ) ب درێژاهیا (٥٨كم)[١٢].

## ب-بیرێن ئیرتوازی:

سەرەرای وان هەردو رووباران، خەلكێ دەڤەرێ گرنگی ب بیرێن ئاڤێ یێن ئیرتوازی بۆ كار و بارێن رۆژانە ژێ داینە، ژبەر كو د وەرزێ زڤستانێ دا ئاڤا رووباری شێلی دبیت.

## - چیایێن شێلادزێ:

ژ چیایێن مەزن و بەرنیاس ل دەڤەرا شێلادزێ ئەڤە نە:

### ١- چیایێ كورەزاری:

مەزنترین و بلندترین چیایێ دەڤەرێ یە (٢٠٠٢م)،

دکەڤیتە هنداڤ باکوورێ شێلادزێ، رۆژئاڤایێ چیایی ژی دبیتە چیایێ (لینك) کو چیایەکێ ناڤدارە، ل باکوورێ چیایی (کانیێن میرا)یە، کانیێن ناڤدارن و مەروماڵاتێ میر (محەممەد بەگێ ساتی) ل سەدسالیا شازدێ زابینی بۆ چەرێ دئینانە وێرێ، ڤەگێران و سەرهاتیێن خەمگین دەربارەی چیایێ کورەژاری یێن هەین.

**- ڤەگێرانا سەرهاتیا وی و هندەك ناڤكرنێن دی:**

سەبارەت ناڤێ چیایی پەیڤەکا کوردی یا لێکدایە ژ دو پەیڤان (کور + ژار) دگەل ناڤبرا (ە) پێکدهێتن و دبیتە (کورەژار) ئانکو (کۆرکێ ژار یان کۆرکێ هەژار)، ل سەر زارێ خەلکێ دەڤەرا دەشتازێ دهێتە ڤەگێران: سەردەمەکێ کەڤن خاتینەکێ دەسەلاتداری ل دەڤەرێ دکر، دەمێ چلێ هاڤینێ دهات، ئەڤ خاتینە دا قەستا زۆزان و جهێن هوین و دلڤەکەر کەتن، جهێ وێ خۆشترین جهێ دەڤەرێ بوو، ئەو ژی سەرێ چیایێ کورەژاری کانیەکا تەزی و زۆزانەکا گەلەك خۆشە، ل بهارا دەمێ ئاڤا سویلا چیایی دهێتە خوارێ گەلەك خەمل و دیمەنەکێ گەلەك جوان ددەتە شێلادزێ، خزمەتکارێن خاتینێ کەپرەك بۆ ل سەر کانیێ چێدکرن و دەمێ خۆ ل وێرێ دبووراند، سەرەرای دەولەمەندی و دەسەلاتداری و شیان و پێچێبوونێن وێ، ل کۆرکەکێ هەژار عاشق دبیت و دڤێتن ب رێکێن نەرەوا حەز و ڤیانا خۆ دگەل ڤی کۆرکی بجهـ بینیت!، داخوازا ئینانا وی کۆرکی د کەتن و خزمەتکارێن خۆ ڤرێدکەتە دووڤرا، دەمێ نۆبەدار یان بێژین زێرەڤان دچن و قەستا وی گەنجی دکەن و ڤێ ئاگەهیێ دگەهیننێ، کۆرك حێبەتگرتی دبیت و دبێژیت: (ئەز و خاتین و خاتین و ئەز!؟)، ب هەر حالەکێ هەی پشتی کورك بریبە دیوانا خاتینێ و خاتینێ ئەو تنێ هێلای، خاتینێ ئەو داخوازی ژێ کر، وی خۆ رادەستی ڤێ داخوازیێ نەکر، دەمێ خاتینێ زانی یێ رژدە، گەف لێکرن و ترساندن، بەلێ هەر رازی نەبوو، گۆتێ دڤێت تۆ ژ من ب گەڕی و من ئازاد بکەی، کارێن هۆسا ب چ رەنگان قەبیل ناکەم، لەوما دەمێ خاتینێ زانی کو هەر یا ژ خۆیە و ب چ رەنگا دووڤ داخازا ناهێت، بریارا ئەشکەنجەدانا وی دا و ب داربیهۆکەکێ ڤە گرێدا و ب دژواری هاتەئێشاندن هەتا وەغەرکری، ب ئەگەرا ڤێ سەرهاتیا خەمگین ئەڤ ناڤە ب ناڤێ (کورەژار - کورکێ ژار/ هەژار ) هاتە ناڤکرن و گۆڕێ وی ل سەر لێڤا کانیێ و ل بن تلێ داربیهۆکێ هاتە ڤەشارتن.

ل دۆر ناڤێن چیایی ل بەری ڤێ روویدانێ خەلکێ دەڤەرێ وەسا ددەنە دیارکرن کو ئەڤ چیایە ب ناڤێن (چیایێ بێکەس، جێمێ بێ مرادان، چەلەسۆر) دهاتە ناڤکرن.

**- ڤەگێرانەکا دی دەربارەی سەرهاتیا چیای یا هەی تێدا هاتییە:**

ل (گرێ قۆبان) میرەکێ خودان شیان و دەسەلات هەبوو، مالات و پەزەکێ مەزن هەبوو، پەز و مالاتێ خۆ ڤرێدکرە زۆزانێن (سەرێ سویلێ) ل چیایێ (کورەژار)ی، میری شڤانەکێ ژێهاتی و خورت هەبوو ب شڤانێ میرێ قوبان بەرنیاس بوو، جارەکێ چاڤ ب بێریڤانەکێ دکەڤیت، لێ ب ئەڤین دچیت، میر ب ڤێ چەندێ دحەسیێت، ئەو ژی دبێژیتە شڤانێ خۆ: ئەز دێ بۆ تە بێریێ خوازم!، بەلێ ب مەرجەکێ کو هندی تۆ هەبی دێ شڤانەتیا میرێ خۆ کەی!،شڤان ژی گەلەك دلخۆش بوو و رازی بوو، پشتی بوورینا چەند رۆژەکان میری بێری بۆ شڤانی خواست و ل سەرێ سویلێ دیلانەکا هەژی بۆ رێکخست، گەلەك دگەل ئێك دلخۆش بوون، شڤانی ل پاییزان پەزێ میری دبرە دەشتێ و ل بهاران دبرە زۆزانان ل (سەرێ سویلێ- کورەژاری)، پشتی بوورینا سێ سالان، بێریا وی دوگیان دبیت و د دەلیڤەکا نەخۆش دا ب زارۆك بوونێ نەساخ دبیت و شڤان وێ د بەتە دناڤ جهێ وێ ل سەرێ سویلێ، ل وێرێ د بنە خودان زارۆکەك، لێ ل پاییزێ بێری وەغەردکەتن هێشتا زارۆکێ وێ ب گرنژینا دایکێ شاد نەبووی، شڤان دکەڤیتە دکاودانەکێ نەخۆشدا، خەما وەغەرکرنا هەڤژینێ و زارۆکەکێ ژ نوی پەیدابووی ددەستان دا و

ڤەدەرکرنا پەزی دچەروانیێ دا، ب وان خەم و کوڤانانڤە هەڤژینا کەلەخێ بێ گیان کرە پشتا خۆ و زارۆك ژی د بەرسنگێ خۆ ڤە هەلگرتن، هێدی هێدی بەرەڤ سەرێ سویلێ چوو، و ب هەر حالێ هەی خو گەهاندە بن کوینێ ڤەحەویانێ، هندەك شیرێ پەزی دا زارۆکی و ڤەدەکا پاتەی ب سەر دادا، و کەلەخێ بێریێ ل تەنشت بەرێ بێریێ ڤەشارت. سال بوورین و زارۆکێ شڤانی یێ ب پشتا وی ڤە و مژوولی چەراندنا پەزیبە، دەمێ میری ب ڤی سەروبەری زانی، گەلەك دلێ وی ما ب حالێ وی ڤە، لەوما گۆتێ دڤێت بۆتە هەڤژینەکا دیتر بخوازین، هەر چەندە شڤانی دلێ چ ڤیانێن دیتر نە بوو، بەلێ دەمێ رەوشا زارۆکێ خو ب وی سەروبەری د دیت، جەرگێ وێ دسۆت، لەوما رازی بوو، ب ڤێ چەندێ شڤان بووڤە خودان هەڤژین، بەلێ زارۆك کەفتە بن گڤاشتنێن ژنبابێ، گەلەك جارا ب پێخواسی و برسی، و ب ئاخڤتنێن رەق و دژوار کورك ڤرێدکرە بەر پەزی و دسەر هندێ را یا دەڤ گلەو گازندە ل سەر کۆرکی، لەوما رۆژەکێ ل دەمێ چوونا بەر پەزی کورك ل سەرێ سویلێ ل سەر کانییا وێ وەریسی ب دارا بیهۆکێ ڤە گرێددەت و دئێختە حەفکا خۆ و داویێ ب ژیانا خو دئینیتن[١٣]، ژ وێ رۆژێ وەرە دبیتە (کورەژار) ئانکو (کورکێ هەژار) و بۆ سڤککرنێ بوویە (کورەژار)،(کور + پیتا ناڤبر و گرێدانێ (ە)+ ژار (هەژار)= کورەژار (کورێ ژار / هەژار).

## ٢- چیایێ مام ڕەشا:

بلنداهییا وی ١٧٣٢م ل سەر ئاستێ دەریای، ئەڤ لۆتکا چیایی دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ شێلادزێ هنداڤ کۆمەلگەها (سیریێ).

دیمەنەکێ چیایێ (مام ڕەشا) ب تەرزێ سەرۆچاڤێن مرۆڤی



## دیرۆكا شێلادزێ
## - كەنگی شێلادزێ بوویە ناحیە؟.

دەڤەرا شێلادزێ سەردەم و قوناغێن جودا جودا دا بووریە، ژ سەردەمێ میرگەها بەهدینان (١٢٦٢-١٨٤٢)، دەسەلاتداریا ئوسمانی (١٢٩٩-١٩٢٣)ێ، دامەزراندنا دەولەتا عیراقی یا شاهینی (مەلەكی ١٩٢١-١٩٥٨)، یا كۆماری (١٩٥٨)، قۆناغەكێ تایبەتمەندیەكا جودا هەبوویە و خورستیەكا ب موكومی یا چیاییێ كورەزاری رهـ و ریشالێن خو د مێژوویا گەلێ كوردا راگرتینە.

## یەكەیا كارگێری:

دەڤەرا شێلادزێی ژ لایێ سنوور و گرێدانا كارگێری سەر ب دەڤەرا رێكان ڤەبوویە، نەخاسمە كو ل وی دەمی پشتی یەكەیێن كارگێری هاتینە دانان ژ ئالیێ دەولەتا ئوسمانی ڤە، ئێك ژ وان ناحیان ناحیا (رێكان) بوویە، دەڤەرا شێلادزێ ژی سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەبوویە، هەروەكی د سالنامێن ئوسمانی دا یێن (١٨٩٢، ١٨٩٤، ١٩٠٧، ١٩٠٩، ١٩١٢)زێدا هاتی، وی دەمی ئامێدیێ ژ پێنج ناحیان پێكدهات:

١- ناحیا داودیێ: گوندەكێ فەلانە ل دەڤەرا بامەرنێ.

٢- ناحیا بەرواری بالا.

٣- ناحیا بەرواری ژێری.

٤- ناحیا نێروە.

٥- ناحیا رێكان.

دەڤەرا شێلادزێ ل سالێن دەسپێكێ ژ سەدساليا بیستێ یا بەردای و چۆلكری بوویە و خەلك لێ نەبوویە، لێ وەكی دەڤەر سەر ب ناحیا (رێكان) بوویە، د ناڤبەرا سالێن (١٩١٤-١٩١٨)زێ دەسپێكا خۆجهیا خەلكی بوویە ل وێرێ، پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ یا شاهی (مەلەكی)، ناحیە هاتینە كێمكرن و هەردو ناحیێن (نێروە) و (رێكان) كرنە ئێك و ناڤێ وێ بۆ ناحیا (نێروە و رێكان)[١٤]، سالا(١٩٥٧)زێ شێلادزێ وەكی گوند ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ ڤە هاتەگرێدان، بەلێ هەتا سالا (١٩٧٦)زێ ناحیا نێروە - رێكان ل گوندێ (بێبو) بوو، ئێكەم رێڤەبەرێ ناحیێ پشتی چێبوونا دەولەتا عیراقێ (ئەحمەد بەگێ سەرنی- نێرویی) بوو، پاشی (زەینەل بەگ، شەوكەت، شێخ عەبدولحەمید ئەترۆشی، كەمال حەسون، رەشید تالەبانی) بووینە رێڤەبەرێن ناحیێ[١٥]. دەمێ رژێما عیراقێ كۆمەلگەهێن سالا (١٩٧٨)زێ نوی ئاڤاكرین و خەلكێن گوندێن دەڤەرێن نێرە و رێكان و دۆسكی ژووری ب زۆری ل كۆمەلگەهێن (سیریێ، شێلادزێی، دێرالوك) ئاكنجیكرن، سالا (١٩٧٩)زێ دووبارە ئەڤ ناحیە ئانكو ناحیا (نێروە و رێكان)هاتە پێكئینان، لێ ڤێجارێ هاتە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەها (دێرالوك)ێ و دێرالوك بۆ ناڤەندا ناحیێ، شێلادزێ ژی بۆ ئێك ژ كۆمەلگەهێن سەر ب ناحیا (نێروە رێكان - دێرالوك)ڤە.

## بریارا گرێدانا (شێلادزێ) ب ناحیا (نێروە و رێكان - دێرەلوك) ڤە:

سالا (١٩٧٨)زێ پشتی حكومەتا عیراقێ خەلكێ گوندێن دەڤەرا نێروە و رێكان و دۆسكی ژووریان ڤالاكرین و ڤەگوهاستینە ڤان كۆمەلگەهان، چەندین بریارێن كارگێری دەرئێخستبوون، ژوان ژی بریارا گرێدانا شێلادزێ و دەڤەر و دەوروبەرێن وێ ب ناحیا (نێروە و رێكان - دێرالوك)، كو بەری هنگی سەر ب سەنتەرێ قەزائامێدیی ڤە بوون[١٦].

## دەڤەرا شێلادزێ ل سەردەمێ دەسەلاتدارییا میر محەممەد بەگێ ساتی:

ئێك ژ میرێن بەرنیاس كو ماوەیەكێ دەسەلاتداری ل دەڤەرێ كری و گرنگی و پویتەیەكا باش دایە جهێن ل ژێر حوكمرانییا خۆ میر (محەممەد بەگێ ساتی)یە، لێ میر (محەممەد بەگێ ساتی) كی بوو؟:

ناڤهاتی ژ بنەمالەكا بەرنیاس و بەگ بوون، ئێك ژ میرێن ساتیا و خەلكێ گوندێ (ساتێ: كو ئێك ژ (٥٢) گوندێن دۆسكی ژووریانە سەرب بالێ (ئۆرەمار) ە و گوندەكە ژ بەگزادەیێن دۆسكی ژووریان) بوو، ناڤێ وی میر محەممەد بەگێ كورێ پیرۆز (بەهروز بەگێ - میرێ دەڤەرا هەكاری) كو ژمالباتا (خالد

بەگێ ساتی)یە، میر (محەمەد بەگێ ساتی) ل سەردەمێ دەسەلاتا ئوسمانییان پێگەهەکێ ب هێز ل دەڤەرێ هەبوو، ل دووڤ گۆتنێن چەند دانعەمرەکان ناڤبری دەسەلاتا خۆ ل سەر دەڤەرا رێکان و دۆسکی ژووریان ژی هەبوو، د وەرزێ هاڤینێ دا ژبەرکو خۆدانێ مەر و مالاتەکێ زۆر بوو بەرەف (کانییێن میرا) ڤەدبر، کو چیایێ (کورەژاری) ژ رووبێ باکووریڤە دکەڤیتە هنداڤی گوندێن دەڤەرێن رێکان و نێروە ، دەما ناڤهاتی پەزێ خۆ دبرە (کانییێن میرا) رووبارێ مارکی ل گوندێ (سیتە)ی ێ سەر ب عەشیرەتا رێکان ڤە دکەڤتە بەر رێکا وی، لەوما نەچار بوو پرەکێ دروستبکەتن داکو پەز و مەرومالاتێ خۆ تێرا دەربازبکەتن وبەرەف (کانییێن میرا)ڤە ببەت، و ل وەرزێ پاییزێ دا ل هەمان رێك جارەکا دی د زڤراندە گوندێ ساتێ، ل دۆر بنەکۆکا میرێن ساتیا دیرۆکڤان (عەبدولرەقیب یوسف) دبێژیت: میرێن ساتیا ژ عەشیرەتا (هەزەبانی)نە، ژ بنەمالا (صەلاحەددین ئەیوبی -١١٣٨ ١١٩٣ز)نە، ل سەردەمێ ئوسمانییا دەسەلاتداری ل دەڤەرا (هەکاری)یا کریە[١٧].

ژ میرێن ناڤدارێن (ساتیا) کو دەسەلاتداری ل دەڤەرا (شێلادزێ) کری و رۆلەکێ بەرچاڤ د ئاڤاکرنا رێك و پرا و مزگەفت و کەلاتان دا هەیی، (میر محەمەد بەگێ ساتی) بوویە، کو ژ بنەمالا (خالد بەگێ ساتی - هەکاری )بوویە، خالد بەگ کورێ عمادەددین هەکاری بوویە، سالا (١٠٧٢مشەختی - ١٦٦٢زایینی) هەتا پشتی سالا (١٠٨٤ مشەختی - ١٦٧٤زایینی) ل سەردەمێ میرێ میرگەها ئامیدیێ (قوباد بەگێ دووێ کورێ سەعید خان بەگ -١٦٦٢ ١٦٧٩ز).

## ژ شوینوارێن شێلادزێ:

### ١- گرێ قوبان:

ئەڤ گرە دکەڤیتە دانگا چیایێ کورەژاری ل بنارا گری گۆڕستانەکا مەزن کو ئەو دیوارێ دوێنەیدا دیار دیوارێ گۆڕستانێ یە، دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ

گرێ قوبان (وێنە ژ ڤەکۆلەری)



(ملێ مەیدانێ)، نێزیکی (٢٢م) ل سەر ڕوویێ ئەردی یێ بلندە، ل دەردورێ وێ هندی ب گەڕی گۆڕستان خویا دکەن، ل ئاڤا کرن و نژارتنێ دا پر بالکێشە وەکی قوبان هاتییە ئاڤاکرن، نها خراب بوویە (٨٠سم) تا (١/٥)م ل ژێر ئاخێ دا هاتییە نخافتن، پشتی ڤان دوماهییا دیار بوویە (سرێجە و سۆلین و ژمارەیەکا ئاڤاهیان) دەرکەفتینە کو هەر ئێک ب ڕەنگەکێ هاتییە ئاڤا کرن، ل ڕۆژئاڤا گری شیڤەك هەیە و کانییەك خویا دکەت، ژ کانیێ هەتا گری سۆلینەك ب (٢/٥)م فرەهـ دیار دکەت، وب بەرێن گری و ب قەبارێ جودا بەر خویا دکەن، پرانیا ڤان بەران مەزن و لاکێشەنە، تشتێ ژ ڤێ بالکێش تر (ژێر زەمینەك/ ئەردەك، زیندانەك) خویا دکەت ب شێوێ بازنە هاتییە نژنین، و ل تەنشت وێ دا چ دەرگەهـ یان پەنجەر یان کولەك خویا ناکەن، تنێ مرۆڤ هەست دکەت کو دەرگەهەك هەبوویە[١٨].

**٢- شکەفتا زازیکی و کەلا زازیکی ل ڕۆژهەلاتا چیایێ کورەزاری.**

**٣- شکەفتا باپیرا:**

دکەڤیتە گوندێ (هاجی مەندا) ل باکوورێ ڕۆژئاڤا شێلادزێ، شکەفتەکا گەلەك سەیرە، و دو نهوم (تەبەق)ە، ڕم و تیر و گۆزك و قەلوین و کۆلاڤ تێڤە هاتینە دیتن[١٩].

**٤- دێرا گوندێ کۆلان:**

کولان ئێك ژ دووازدە گوندێن کەڤنارێن دەڤەرا شێلادزێ یە، ب دووراتییا (٢کم) دکەڤیتە باکوورێ ڕۆژئاڤایێ شێلادزێ بەرامبەر گوندێ شیڤ چنارکێ، سالا ٢٠٠٩ێ ڕۆژێ (١٩) خانیا لێ هاتبوونە ئاڤاکرن[٢٠]، سالا ٢٠١١ێ گوند ب تەمامی کەفتە دناڤ تخوبێ بازێرڤانیا شێلادزێ دا، دەسپێکا سەدسالیا بیستێ

شوینوارێ دێرا گوندێ (کۆلان)



(مەسیحی) ل ڤی گوندی ئاکنجی ببوون، بۆ دوماهیك جار ژی ل سەردەمێ شێخ (عەبدولسەلام بارزانی) بوو، کو (فەلەیێن تیاری) لێ ئاکنجی ببوون[21]، سەردەمێ ئاڤاکرنا دێرێ نەهاتییە زانین یان کا ب چ ناڤ هاتییە ناڤکرن.

## شێلادزێ ل سەدسالییا بیستێ و بیست و ئێکێ دا:

### - دەڤەرا شێلادزێ ل سەردەمێ شەرێ جیهانیێ ئێکێ (-١٩١٤ ١٩١٨ز)دا:

د بۆیەرێن شەرێ جیهانیێ ئێکێ دا، کوردستان ژی و نەخاسمە دەڤەرا بەهدینان تووشی هندەك شەران بوویە، دەڤەرا شێلادزێ ژی ئێك ژوان دەڤەران بوویە، کو ئەڤ گوریا تووشبوونێ لێ روویدای، ئێك ژ وان شەرێن ل دەڤەرێ قەومی ئەو شەرە کو خەلکێ دەڤەرێ دبێژنێ شەرێ (ئویرسی- ئویرسی)، ل (٧/ ٣/ ١٩١٦ز)ێ هێزێن ئویرسی هاتبوونە دناڤ سنوورێ باشوورێ کودستانێ ل دەڤ بازێرێ (خانەقین)، هەروەسا ژ لایێ باکوورێ رۆژهەلاتی ژی ڤە، د شیانێن هێزێن ئوسمانی دا نەبوویە کو هێزێن وان راوەستینن، خۆ بەرەڤ لایێ باشووری ڤەکێشان، ل دەستپێکێ کوردان بەرگری نەکر، لێ پشتی خراب رەفتارکرنا هێزێن ئویرسی دگەل وان دا، عەشیرەتێن کوردان و خەلك پالدان رابن و بەرەڤانیێ بکەن، ٢٠٠ زەلامان ل دەڤەرا ئامێدیێ بۆ بەرگریکرنێ دەست دا چەکی، هەروەکی د. تارق پاشا ئامێدی ژ زاردەڤێ دیدەڤانەکێ پشکدار د رووداناندا (عەبدولمەجید مستەفا) ڤەدگێریت و دبێژیت: هێزا مە یا لەشکەری چوو بەرەڤ پێش ل ١٩١٦/٦/١ێ ، ل سەر رێکا (دێرالوك - سیارێ) ب رێککەفتن دگەل عەشیرەتێن کوردی ل دەڤەرێ، هندی ئەم دچووینە پێشیێ هژمارا شەرکەران زێدە دبوو، هێز هاتە دابەشکرن بۆ دو بەشان، ئێك ژ وان ب سەرکردایەتیا ئەفسەرەکێ ئوسمانی بەرەڤ گوندێ (بێبو) ل دەڤەرا (نێروە)، و یێ دووێ ب سەرکردایەتیا (حسێن نەعمان) بەرەڤ پرا (حەلانکێ - ل نێزیك دێرەلوك) ل سەر رووبارێ زێ، رابوون ب هەرفاندنا پرێ بۆ رێگریکرن ژ دەربازبوون و هاتنە پێشیا لەشکەرێ ئویرسی بەرەڤ ئامێدیێ، وپاشی بەرەڤ ئاراستەیێ دەڤەرا (سیارێ) چووین، ل وێرێ ئەم تووشی شەرەکی بووین دگەل هێزەکا ئورسی یا رەخێ رەواندزێ ڤە هاتی، پاشی مە پرەك ل سەر رووبارێ زێی دانا و دەربازبووینە قاما دیتر، ئەم هەر د پێشرەویێ دا بووین هەتا گەهشتینە گوندێ (شێلادزێ)، ل ڤێرێ دەملدەست و ژ نشکەکێڤە ئاگر باراندنەکا زۆر ل سەر مە هاتەکرن و سێ ژ شەرڤانێن مە هاتنە شەهیدکرن، ئەم شیاین خۆسارەتیەکا مەزن تووشی دوژمنی ب کەین و هێزا ئویرسی نەچاربکەین خۆ ڤەکێشیتن پشتی کوشتیێن خۆ هێلاینە گۆرەپانا شەری، پشتی ڤی شەری ئەم ماینە ل دەڤەرێ بۆ بەرسنگرتنا هەر پێشهات و تەنگاڤی و کاودانەکێ بەرتەنگ، تا کو لەشکەرێ ئوسمانی ژ مووسلێ هاتی و ل بوورینا رووبارێ زێ ل (١٩١٧/٧/٢٠ز)ێ گەهشتنە دەڤەرا (چەلێ) و راوەستیان ل سەر هێلا (کانی رەش - کوزە رەش)، پاشی مە گوهلێ بوو کوهێزێن ئویرسی دەست ب خۆڤەکێشانێ کرییە، لەوما ژ نوی ئەم زڤرینەڤە بازێرێ ئامێدیێ[22].

هەژییە بێژین دەمێ ل سالا ١٩١٧ێ هێزێن ئویرسی (روسیا) بەرەڤ کوردستانێ بۆ داگیرکرنا دەڤەرێن رێکان و وەلات ژووریێ هاتین هێزێن ئویرسی ل ناڤ گوندێن رێکانییا را هاتن و بەرەڤ دەشتازێ چوون و ژئالیێ وەلات ژێری ڤە ژی ل ناڤبەرا گوندێن (کانی بۆتێ) یاسەر ب عەشیرەتا (شێروان) ڤە و گوندێ (شنکێل) یا سەر ب دەڤەرا (وەلات ژێری) ڤە هاتن هەتا گەهەشتینە دێرەلوکێ ل سەر (پرا حەلانکێ) کو دکەڤیتە ژێریا پرا ئاسنی یا دناڤ سەنتەرێ بازێرێ دێرەلوکێ، ل وێرێ و ل سالا ١٩١٧ێ دەمێ خەلکێ دەڤەرا ئامێدیێ زانی کو هێزێن ئویرسی یێ بەرەڤ دەڤەرێ دهێن (شێخ بهائەددین نەقشەبەندی ١٨٥٥-١٩٥٢ز) سەرکێشیا جەماوەرێ دەڤەرێ کر و ل رێکا گەلیێ (بالندا- باکوورێ رۆژهەلاتێ شێلادزێ) و نەخاسمە ل گەلیێ نێزیك گوندێ (سیدان-رێکان) کو نها ب ناڤێ (گەلیێ ئویرسی) بەرنیاسە

بەرهەنگاری هێزێن روسی بوون، دەلیڤە نەدا وان ب ناڤ دەڤەرێ ڤە بهێت، پشتی کو وان بەرسینگێن لەشکەرێ ئویرسی گرتین و نەشیيان دەربازی لایێ دی یێ پرا حەلانکێ ببن و هەر دوی دەمی دا ژێ دەمێ هێزا پشتەڤانی بۆ وان نەهاتی نەچاربوون قەستا دەڤەرا رێکان و وەلات ژێری کرن هەتا گەهەشتینە ژێریا گوندێ سیتەی (ل گەلیێ بالندا) نێزیکی هێزێن رێکانیيا بوون، ل وی دەمی ب سەرکێشیا (سەنعان ئاغایێ رێکانیيا) خەلکێ دەڤەرێ شەرەك دگەل کر، پاشی ئویرس ل وێرێ ژێ شکەست و رەڤ کەفتێ هەتا کو گەهەشتینە بن ئاستەنگا (سیدا) ل سەر رووبارێ شین دەمێ ژ هەردو لایاڤە هاتینە بەراهیێ هەردبن ئاستەنگێ دا جهەکێ تەنگ یێ هەردو رەخێن رووباری حەلان بوون هێزێن روسی ژێ پرێن دەمکی ڤێبوون هەر ئێکسەر پر دانا سەر رووباری و تنێ لەشکەر ل سەر دەرباز بوو دەوارێن خو ژێ هێلان، دەمێ ل پرێ دەربازبووین بەرەڤ دۆلەکا تەنگ و تاری پری داروبار چوون ل لایێ دی یێ رووباری کودکەڤیتە سەر ئاخا وەلات ژێری وهەتا نها ژێ دبێژنە وێ دۆلێ (دۆلا ئویرسی) و ب وی ناڤی دهێتە نیاسین ژ ئەگەرێ چوونا وان بۆ دۆلێ ئەو بوو کو نەدوێران د گوندارا بچن ژبەر خەلکی کو هەمی لێ رابوون و شەر دگەل دکر، هەروەسا خۆ د دا جهێن ئاسێ، دا خەلك دووڤرا نەچووبا، دەمێ ژدۆلێ قورتال بووین خەلکێ وەلات ژێری شەرەك دگەل کر و چوار لەشکەرێن وان بریندار‌بوون و پاشی ژبەر گرانییا برینێن وان بو دەمەکێ کێم ئەو ژێ مرن، هەروەسا کەسەك ژێ ب ناڤێ (تاهر محەممەد بابسێڤی) برینداربوو، هەتا گەهەشتینە گوندێ شنگێل و خەلکێ گوندی رێکێن وان گرتن و خۆدا چیایی و هەتا کو سنوورێ وەلات ژێری دەرباز بووین وبەرەڤ دەڤەرێن دی چوو، دەمێ ل سەر پرا حەلانکێ و ل گەلیێ رێکان شکەستین لەشکەرێ وان تەرابەرابوو، هندەك لەشکەرێ وان قەستا دەڤەرا رێکان کر و ئێك ژوان هەتا گوندێ (هیل- رێکان) چوو، ل وێرێ ژنکێن گوندی ب دارو بەران کوشتن، ژ لایێ دەڤەرا رێکان ژێ لەشکەرێ ئویرسی ل باکوورێ کوردستانێ را بۆ دەڤەرا دۆسکی ژووریان هاتن و دوێرێ را هاتنە دەڤەرا رێکان هەتا کو گەهەشتینە شکەفتێن (بێصەمتێ) ل دانگا گوندێ کونیشکا دەمێ لەشکەرێ وان شکەستی و تەرابەرابووین، هندەك ژوان لەشکەران بەرەڤ دەڤەرا رێکان چوون ل شکەفتا (بێصەتمێ) گەهەشتنە[٢٣]!.

هەژی گوتنێ یە کو دەمێ لەشکەرێ ئویرسی ژ ئالیێ دەڤەرا هەرکیا (هەرکی بێن بنەجهـ)ڤە هاتین ئێکسەر دەڤەرا دۆسکی ژووریێ ژێ گرت، هەتا هاتییە گوندێ (نێروا سیتوی)، ل وێرێ شەرەك دناڤبەرا ئویرسی و دۆسکی ژووریان ب سەرکردایەتیا (سیتو ئاغا ئۆرەماری (١٨٤٧-١٩٢٨ز) هاتەکرن، دئەنجامدا برایێ سیتوی ب ناڤێ (چاڤشین) و مەلایێ وی ب مەلا گرگشا هاتبوو نیاسین خەلکێ گوندێ گرگاشێ بوو دگەل (١٠) چەکدارێن وی هاتنەکوشتن، ل وی دەمی لەشکەرێ ئویرسی ژ (٣٠٠) کەسان پێکدهات، لەشکەرێ سیتوی ئەو رامالین هەتا گەهاندینە گوندێ کونیشکا یێ دەڤەرا رێکان ڤە پشتی کو لەشکەرێ ئویرسی ل سەر پرا حەلانکێ شکەستی وبەرسڤ بۆ (سەنعان ئاغای) چووی، ئەوبوو هەردو لەشکەرێن رێکانیيا کو ب سەرکردایەتیا (سەنعان ئاغای) و لەشکەرێ دۆسکی ژووریێ ب سەرکردایەتیا (ئوسمان سیتو ئۆرەماری) رەخ و دۆرێن وان سێ سەد ئویرسا ل کونیشکا گرتن و هەمی کوشتن و ڤەبراندن![٢٤].

## -دەڤەرا شێلادزێ ل سەردەمێ بزاڤا شێخ ئەحمەد بارزانی (١٩٣١-١٩٣٢ز):

دناڤبەرا (١٩٣١-١٩٣٢ز)ێ ل دەڤەرا بارزان بزاڤەکا چەکداری دژی سەرەدەیا حکۆمەتا عیراقێ دگەل دەڤــەرا (بــارزان) پەیدابوو، ڤێ بزاڤێ ترسەك ل دەڤ حکۆمەتێ پەیداکر، لەوما ل کانوونا ئێکێ ١٩٣١ێ بریاردا هێزەکا لەشکەری دژی بزاڤا شێخ ئەحمەدی ب کاربینیت پشتی پشتەڤانیا هێزێن بەریتانی پشتراستکری، بەلێ ژبەر زڤستانێ هاتە پاشئێخستن بۆ پشتی بهارێ، بۆ ڤێ چەندێ ژێ

عیراقێ بەرهەڤیەكا لەشكەریا باش كر، هێزێن خو سەر چەند بەرۆكا دابەشكرن، ژ وان ژی بەرۆكێ ئامێدیێ - بالندا ئەڤ بەرۆكە ب بەرۆكێ رۆژئاڤا یان تەوەرێ (رتل بۆل) ب سەركردایەتیا (عزرا) دهاتە ناڤكرن[٢٥].

**- دەڤەرا شێلادزێ ل سەردەمێ بزاڤا بارزان یا دووێ (١٩٤٣-١٩٤٥ز):**

خەلكێ دەڤەرێ رۆلێ خۆ د بزاڤا بارزان یا دووێ (١٩٤٣-١٩٤٥ز) ب سەركردایەتیا مەلا مستەفا بارزانی هەبوو و چووبوونە دناڤ ریزێن وان دا[٢٦]، ژ پشكداران:

حەجی ئەحمەد ماشو ئۆرەماری[٢٧]، فەق صالحێ بخشی دەشتازێی، شوكری سەلام بێزەلی- رێكانی، جاسم مستەفا بێزەلی، رەشید جاسم بێزەلی و برایێ وی ئەمین جاسم بێزەلی - رێكانی ، مستەفا یەحیا بێزەلی - رێكانی[٢٨])، هەژی یە بێژین كو (حەجی ئەحمەد ماشو شێلادزی) و (صەدیق بخشی دەشتازێیی) و برایێ وی (صالح بەخش) ژ وان (٥١٨) كەسان بووینە یێن ل سالا ١٩٤٧ێ دگەل مەلا مستەفای چووینە ئێكەتیا سوڤێتی یا بەرێ[٢٩].

**- شێلادزێ وەك گوند د ڤەگێرانا ئێكەم مالا لێ ئاكنجیبووی دا:**

هەلبەت ئەگەر ژێدەرێن نڤیسكی نەبن ڤەگێران و سەرهاتی ئێك ژ ژێدەرێن دیرۆكێ نە، ژ بۆ ڤێ چەندێ ژی ل دۆر دەستپێكا خۆجهیا خەلكی ل دەڤەرا شێلادزێ، هێژا (عصمەت سەعدوللا محەمەد ئۆرەماری) موختارێ گوندێ (شێلادزا كەڤن)، كو یەكەمین بنەمال بوویە هاتینە دەڤەرا شێلادزێ، سەبارەت دەستپێكا ئاكنجیبوونێ ل ڤێ دەڤەرێ گوتییە: وەكی من ژ زاردەڤێ بابێ خۆ بهیستبوو، كو ئەم ژ گوندێ (ئۆرەمار)ێ ل باكوورێ كوردستانێ دناڤبەرا سالێن (١٩١٤ - ١٩١٨ز)ێ ئاوارەبووینە و هاتینە باشوور، ل ڤێ دەڤەرێ (ئەوا نها ب شێلادزا كەڤن بەرنیاس ل باكوورێ رۆژهەلاتێ شێلادزێ) جهواربووینە و ئەوان د گۆت ئەڤ جهە نە گوند بوو، بەلكو هندەك كاڤل وەكی كاڤلێن بەریهاران لێ هەبوون، دەڤەرەكا تژی دار و بارێن تێكرابوون و وەكی دارستانەكا سرۆشتی یا تژی دارێن زۆر مەزن بوو، و بەهرا پتریا دارا ژ دارێن بەرویێ كێمەك دارێن مازی بوون، زۆر گیانەوەرێن كیڤی و یێن درندە وەك: گورگ، هرچ، بەراز، و پەز كیڤی و خۆ پلنگ ژی ل چیایێ كورەزاری هەبوون، هەروەسا ژمارەكا زۆر یا جۆرێن تەیر و تەوالان وەكو: كەو، پۆر، قورتێن كەلەخا، بالندەیێن ئاڤی ... لێ هەبوون، ژیانا خەلكی یا هنگی پتر ل سەر جۆت و كێلانێ و خۆدانكرنا مەرومالاتی وەكو پەز و گارەشان بوو.

پشتی ل سالا (١٩٧٨ز)ێ رژێما عیراقێ كۆمەلگەهێن نوی وەك (سیریێ و شێلادزێ و دێرەلوك) ئاڤاكرین، ئەڤ دەڤەرە ژ دارستانەكا سرۆشتی بۆ دەشتەكا ئاڤاكری.

## شێلادزێ وەك كۆمەلگەهـ:

ل دەسپێكێ شێلادزێ جهەكێ تژی دەحل وگژوگیا و داروبارەكێ تێكرابوویە، ژبەر كو جهەكێ دارستانی و یێ بەردایی بوو، ل جهێ كو د سەردەمێن كەڤن دابوویە جهێ ئاكنجی بوون و ڤەحەویانا مرۆڤان نها ب (شێلادزا كەڤن) دهێتە نیاسین، دكەڤیتە لایێ باكووری یێ شێلادزێ، دەمێ سالا (١٩٧٦ز) گوندێن سەر سنوورێ تركیا (بێدە، پیرئاڤدەلا، خواری، قەسركێ، هیش، ئستپ، مەیدانێ، نێروەسیتو، ئەرتیس، بیرێ) ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە هاتینە كاڤلكرن و خەلكێ وان گوندان ب زۆری ژ سەر گوندان راكرن و ئینانە دەڤەرا (دەشتازێ) و و ل دەوروبەرێن شێلادزێی ئاكنجیبون، شێلادزێ هەتا سالا (١٩٧٥)ێ ژ (٣٠ تا ٤٠) مالا پێكهاتبوو، دەمێ سالا (١٩٧٨ز)ێ رژێما عیراقێ بەهرا مایی ژ گوندێن دەڤەرا (نێروە) و (رێكان) و (دۆسكی ژووری) سۆتین و ویران و كاڤلكرین، د هەمان دەمدا دەست ب ئاڤاكرنا كۆمەلگەهێن (دێرەلوك، شێلادزێی، سیریێ) كر، كۆمەلگەها شێلادزێ كو ژ ٦٥٠ خانیێن ئاخێ پێكهاتبوو د سێ هەیڤاندا هاتەئاڤاكرن، دەمێ خەلكێ گوندان ئینانە كۆمەلگەهێ و ل سەر وان

خانیان بەلاڤكرین هێژ هندەك خانی نیڤەرو بوون و پشتی خەلك چووینە تێڤە ئاڤاكرنا وان داویهات، خەلكێ گوندێن (بەنستان، مروانس، دێركێ، دهیكا رۆژهەلات، رزێی، شابەكەما، هولیانی، دەعەلكی، مێرگاڤا، رەزگە، شامكی، سنجی، هورە، كوكەرێ، بێبو، سپێر) ل كۆمەلگەهێ شێلادزێ ئاكنجیبوون، پشتی سەرهەلدانا (١٩٩١)ێ زۆر ژ ئاوارەیێن دەربەدەری ئیران و تركیا ڤەگەریاینەڤە كوردستانێ و ل شێلادزێ ئاكنجیبوون[٣٠].

## -ئامارێن خەلكێ دەڤەرا (نێروە و رێكان) دناڤبەرا (١٩٣١-١٩٨٧ز):

ل ڤی دەمی دەڤەرا شێلادزێ ژی ئێك ژ گوندێن گرێدای ب ناحیا (نێروە و رێكان)ڤەبوو.

**ئامارا سالا (١٩٣١ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (١٠٣٠٠) كەس بوون[٣١].

**ئامارا سالا (١٩٤٧ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (٧٩٦٣) كەس بوون، ب رێژەیا (٧،٦٪) ژ سەرجەم ئاكنجیبوویێن دەڤەرا دهۆكێ.

**ئامارا سالا (١٩٥٧ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (١١٢٠٨) كەس بوون، ب رێژەیا (٥،٧٪) ژ سەرجەم ئاكنجیبوویێن دەڤەرا دهۆكێ.

**ئامارا سالا (١٩٦٥ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (١١٧٧٣) كەس بوون، ب رێژەیا (١،١١٪) ژ سەرجەم ئاكنجیبوویێن دەڤەرا دهۆكێ.

**ئامارا سالا (١٩٧٠ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (١٣٤٣٧) كەس بوون، ب رێژەیا (٣،٧٪) ژ سەرجەم ئاكنجیبوویێن پارێزگەها دهۆكێ.

**ئامارا سالا (١٩٧٧ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (١٣١٨٦) كەس بوون، ب رێژەیا (٣،٥٪) ژ سەرجەم ئاكنجیبوویێن پارێزگەها دهۆكێ.

**ئامارا سالا (١٩٨٧ز)ێ،** ژمارا ئاكنجیبوویان (١٢٢٦٤) كەس بوون، ب رێژەیا (٢،٤٪) ژ سەرجەم ئاكنجیبوویێن پارێزگەها دهۆكێ[٣٢].

شێلادزێ



خشتەیێ ئاماران (١٩٣١-١٩٨٧ز)

| سالا ئامارێ | ژمارا ئاکنجیبوویان | رێژا سەدی ٪ |
| --- | --- | --- |
| ١٩٣١ | ١٠٣٠٠ | ........ |
| ١٩٤٧ | ٧٩٦٣ | ٪ ٦،٧ |
| ١٩٥٧ | ١١٢٠٨ | ٪ ٧،٥ |
| ١٩٦٥ | ١١٧٧٣ | ٪ ١١،١ |
| ١٩٧٠ | ١٣٤٣٧ | ٪ ٧،٣ |
| ١٩٧٧ | ١٣١٨٦ | ٪ ٥،٣ |
| ١٩٨٧ | ١٢٢٦٤ | ٪ ٤،٢ |

لێ ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ هژمارا تەبایا خەلکێ ناحیا شێلادزێ ٣٦١٥٣ کەسن، ژ وانان ٣٥٢٩٦ کەس ئاکنجیێن باژێر و کۆمەلگەهانن و ٨٥٧ کەس ئاکنجیێن گوندانن.

## -پێکهاتەیا ئایینی، نەتەوەیی، عەشیرەتایەتی (عەشیرەتی):

هەموو خەلکێ شێلادزێ کورد و موسلمانن ژ عەشیرەتێن: (رێکانی، دۆسکی ژووری، زێباری، نێروەیی...)نە، و تنێ مالەکا مەسیحیان لێ دژیت، کو خەلکێ گوندێ (هیش)ێ رێکانە، یەکەم مزگەفت (مزگەفتا شیلادزێ یا کەڤن) ل سالا ١٩٨٠ێ هاتییەئاڤاکرن و یەکەم پێشنڤێژ و خوتبەخوینێ وێ مەلا یاسینێ رێکانی بوو، نها ١٦ مزگەفت لێ هەنە.

## دەڤەرا شێلادزێ د ئەنفالا بەهدینان (١٩٨٨ز)دا:

ژ کریارێن نەمرۆڤانە یێن رژێما عیراقێ جینوسایدا گەلێ کورد بوو د هەوێن ئەنفالاندا، دەڤەرێن نها سەر ب ناحیا شێلادزێ ژی کەتنە بەر ڤێ هەوێ و فرقەیا (٣٥) ب ڤێ هەوێ رابوو[٣٣]:

**ئێك**: دەستپێکرن ژ (بالندا - باکوورێ رۆژهەلاتێ شێلادزێ) بەرەڤ شەمدینان و شەت یونس و بێبو و هیش و ئەرتیش.

**دو**: ب جهـ ئینان (٥) رتلا، کو یێن گرێدا دەڤەرا شێلادزێ ئەڤە بووینە:

رتلا ئێك: دەسپێکرن ژ (بالندا) بەرەڤ گوندێ (سیتە- رێکان) و گوندێ (مامیسا - رێکان).

رتلا دو: دەستپێکرن ژ (مامیسا) بەرەڤ کانی زول پاشی ئەرتیش (رێکان).

ئەڤ گوندێن دەڤەرا شێلادزێ کەتبوونە بەر ئەنفالان: (سیتە، سیدان، رێنجبراخە، شاجا، صارکێ رێکان، دهیك رۆژهەلات، کوکەرێ، بێزەلێ، کاڤلکا، بێباکرێ، بێسەپێ، رێشمە، هوص، هورە، ئاوکا، بانسرا، هیل، مازی، چەم جوو، باوان رێکان، دهیك رۆژئاڤا، رزێ، مروانس، بەنستان، رەزگە، هیش، ئستپێ، دەعلکێ، هول، سنجێ، شامکێ، خالکا، سوریان، هرباشکێ، بێدە، هنێش، کێربادێرێ، بیارێ، مێزێ، مێرباڤا، قەسرکێ، خاری، پیرئاڤدەلی، جارمەندی، هلوری، صارکا زێباری، خاستو ژووری، خاستو ژێری، لاتکا، دێویکێ، بەرێزکێ (بەرێسکێ)، پیرهەستا (پیرەسنا)، وەرەخەل، زێوە، تتمی، ئەرتیسی، چێ، چەم تی، بیری، نێروە سیتو (نێروەك)، رندێلا، زێوکێ، ئەرتیشی، شابەکەما، شەتونس، مامیسا ، باغەلا ، هادیفسا ، مەیدانێ ، کولان ، ملێ مەیدانێ ).[٣٤]

## -سەرهەلدانا شێلادزێ ل سالا ١٩٩١ێ:

ل رۆژا ١٩٩١/٣/١٣ێ سەرهلدان گەهشتە شێلادزێ و هاتە رزگارکرن، ئەڤە ژی بۆ دەرگەهەك بۆ پێشڤەچوونا دەڤەرێ و دەست ب ڤەژینەکا دی کرن.

## - دامەزراندنا چەندین دام ودەزگەهێن حکۆمی:

پشتی سەرهەلدانێ گەلەك دام و دەزگەهێن فەرمیێن حکۆمی لێ هاتنەدامەزراندن، ئەڤە ژی بارسڤکیەك بوو بۆ خەلکێ دەڤەرێ، کو بەری

هنگی بۆ پتریا كاروبارێن حكۆمی قەستا دێرەلوكێ یان ئامێدیێ دكرن، ئەڤێن ل خوارێ ژی چەند دام ودەزگەهێن د ناڤبەرا سالێن (١٩٧٨-٢٠١٤ز)ێ هاتینە دامەزراندن.

-خواندن و خواندنگەهـ :

بەری دامەزراندنا خواندنگەهێن رەسمی یێن حكۆمەتێ هندەكان ژ خەلكێ دەڤەرێن رێكان و دۆسكی ژووری و نێروە بۆ خواندنا خۆ كو وی سەردەمی خواندنا ئایینی ل مزگەفتان (ئانكو فەقیاتی) بوویە، قەستا دەڤەرێن دیتر وەك ئامێدیێ و بامەرنێ و هندەك جاران مووسلێ ژی دكر. هەتا كو دەلیڤەیا ڤەكرنا خواندنگەهێن رەسمی ل چەند گوندان پەیدابووی، یەكەمین خواندنگەها حكۆمەتێ یا ل سنوورێ هەرسێ عەشیرەتێن رێكان، دۆسكی ژووری و نێروە هاتییەڤەكرن خواندنگەها گوندێ هۆرە بوویە كو ل سالا ١٩٣٧ێ هاتییەڤەكرن، دووەمین خواندنگەهـ ل سالا ١٩٥٢ێ ل گوندێ بێبۆ هاتییەڤەكرن، پشتی وان هێدی هێدی چەند خواندنگەهەك ل دەڤەرێ هاتینەڤەكرن، هەمی ژی خواندنگەهێن سەرتایی بوونە و چ خواندنگەهێن ناڤنجی یان بلندتر ل دەڤەرێ نەبوون، تنێ ل سالا ١٩٧٦ێ رێژەكا ناڤنجی دگەل خواندنگەها سەرەتاییا هۆرە هاتەڤەكرن، دەمێ ل سالا ١٩٧٨ێ گوندێن هەرسێ عەشیرەتان بۆ كۆمەلگەهان هاتینەڤەگوهاستن، هەر هەموو خواندنگەهێن دەڤەرێ ژی هاتنەگرتن و خویندكار و مامۆستایێن وان ژی دگەل خەلكێ گوندان بۆ كۆمەلگەهێن ئاماژەپێكری هاتنەڤەگوهاستن[٣٥].

هندی پەیوەندی ب شێلادزێی وەك گوندێ كەڤن، سالا ١٩٧٦ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەكرن، د ژوورەكا خانیێ (عصمەت سەعدوللا محەمەد ئۆرەماری) ڤە بوو. دەمێ سالا (١٩٧٨)زێ كۆمەلگەهـ هاتییە ئاڤاكرن، ل دەستپێكێ خواندنگەهـ دخانیێن ئاخێ ڤەبوویە، كو نها مالێن ئاكنجی بوویان لێ هاتینە ئاڤاكرن، و پاشی (خواندنگەها سەرەتایی یا كچان) (ئەوا ل رەخێ رۆژهەلاتیڤە ل تەنشت مزگەفتا شێلادزێی یا مەزن) هاتییەئاڤاكرن، و ل سالا (١٩٧٩-١٩٨٠ز)ێ (قوتابخانا ناڤنجی یا شێلادزێی یا تێكەل) هاتییەدامەزراندن، ل دەستپێكێ ناڤنجی و پاشتر بوو دواناڤنجی و ل سالا (٢٠٠٣)ێ ئامادەییا شێلادزێ یا تێكەل هاتییە دامەزراندن.

كەڤنترین خواندنگەهێن (سەرەتایی و ناڤنجی و ئامادەیی) ژی ئەڤە بووینە:

- خواندنگەها شێلادزێ یا كچان: ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییە دامەزراندن، ژ كەڤنترین رێڤەبەرێن وێ (ئەحمەد مەحمود تۆڤی) بوو.
- خواندنگەها شێلادزێ یا كوران: ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییە دامەزراندن، نها ب ناڤێ (خواندنگەها رەڤەند یا بنەرەت یا تێكەل) هاتییە ناڤكرن[٣١].
- خواندنگەها ئامادەیا شێلادزێ: ل سالا (٢٠٠٣ز)ێ هاتییە دامەزراندن، ئێكەم رێڤەبەر ژی مامۆستا (عەبدوللا ئیسماعیل هاجم) بوو، بۆ ماوەیەكێ كێم و پشتی وی مامۆستا (محەممەد غەزای رەجەب- ٢٠٠٩ێ وەغەركری) ببوو رێڤەبەر.

- بنگەهێ ساخلەمیا شێلادزێ:

دگەل ئاڤاكرنا كۆمەلگەهێ ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەڤەكرن.

- سالا ١٩٧٨ێ كەلا شێلادزێ، سالا (١٩٧٩)ێ بنگەهێ پولیسان، سەردەمێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ل (٢٧/ ١١/ ٢٠٠٥ز)ێ ل شێلادزێ مەخفەرا پولیسان، ل ٩/١٠/ ٢٠٠٦ێ بنگەهێ پولیسێن شێلادزێ هاتینە دامەزراندن.

-بازێرڤانیا شێلادزێ:

پشتی ل رۆژا (٢٦/٥/٢٠٠١)ێ هەلبژارتنێن بازێرڤانیان هاتینەئەنجامدان، بازێرڤانیا شێلادزێ ژی هاتییە دانان، و ئێكەم سەرۆكێ وێ (نوری حەسەن بەلو ٩/٦/٢٠٠١ - ٢٩ /٧ /٢٠٠٨ ز) بوو، و جڤاتا بازێرڤانیێ ژ حەفت كەسان پێكدهات.

سەرۆكاتییا بازێرڤانیێ ژ (١٦) هۆبان پێكدهێتن،

تا نها ڤان كەسان سەرۆكاتییا وێ كرییە:
نوری حەسەن بەلو، مەسعود مەحمود حەبیب، هێژا عەبدولواحد صالح، هەژار محەمەد نەصرولا.

- ل سالا ٢٠٠٤/١٠/١٣ێ بانكا (شێلادزێ)هاتییە دامەزراندن، دەستپێكێ د خانیەكێ بەرتەنگدا بوو، و ل ٢/ ٥/ ٢٠٠٧ێ ئاڤاهیەكێ نوی هاتییە ڤەكرن[٣٧].
- ٢٠٠٥/١/٢ دامەزراندنا سەنتەرێ ڕەوشەنبیریێ شێلادزێ.

**- بنگەهێ ئاگرڤەمراندنێ ب فەرمی ل ٢٠/٤/ ٢٠٠٧ ێ لێ هاتییە دامەزراندن[٣٨].**

- بنگەهێ پۆستە و گەهاندنێ.
- بنگەهێ فیتەرنەریێ.

**-ئامارا ئاكنجیبوویێن شێلادزێ ل سالا (٢٠٠٩ و٢٠١٢ ز)ێ:**

* ل سالا ١٩٥٧ێ ئامارا خەلكێ گوندێ شێلادزێ تنێ (٣٧)كەس بوو[٣٩].

* ژمارا خەلكێ كۆمەلگەها شێلادزێ ل سالا ٢٠٠٩)زێ (١٩٥٢٥)كەس بوون[٤٠].

* ل دووڤ ئامارا سالا (٢٠١٢)زێ ل باژێرڤانی یا شێلادزێ (٣١٠٦٩) كەس بوون[٤١].

**-بزاڤا ڕۆژنامەگەریێ و ڕاگەهاندن و چاپكریان:**

- یەكەمین گۆڤار ل سنووری ناحیا شیلادزێ هاتییەبەلاڤكرن گۆڤارا (نیژەن)ە، ئێكەم هژمار ل رۆژا چوارشەمبی (٢٦/٢/ ٢٠١٤)زێ دەركەتییە.

ژ لایێ ڕاگەهاندنێ و نەخاسمە یا تێلەفزیوونی، بۆ ئێكەم جار ل ٢٥ ێ ئادارا ٢٠١٤ ێ كەنالێ (حەداد تیڤی) وەك كەنالەكێ ناڤخۆ و یێ سەربەخۆ ب رێڤەبەرییا (ئازاد محەمەد حەسەن ئۆرەماری) هاتییە دامەزراندن، كو ناڤێ وێ ژی ژ پیشەیا ڤێ بنەمالێ هاتییە .



## -کەنگی شێلادزێ بوویە ناحیە؟:

پشتی بەرفرەهبوونا شێلادزێ ل ٢٠١٣/٧/٧ێ بریار ئەنجومەنێ وەزیران یا هەرێما کوردستانێ یا ژمارە (٨٤٦) دەرکەفت و ل رۆژا ٢٠١٣/١٢/١٧ ێ ب شێوەکێ فەرمی بوویە مەلبەندێ ناحیێ و (٩٢) گوندان بخۆڤەدگریتن کو (٧٦) ژوان بەردایینە و (١٦) ژێ دئاڤانە.

بۆ ئێکەم جار (ئەیسەر جەرجیس حەمید) بوویە رێڤەرێ ناحیێ، پشتی بوویە سەنتەرێ ناحیێ، سنوورێ وێ یێ جوگرافی و کارگێری ب ڤی رەنگی یە:

**باکووری:** گوندێن عەشیرەتا رێکان و دۆسکی ژووریيان هەتا سنوورێ ترکیا.

**باشووری:** هەڤسنوورە دگەل ناحیا (دینارتە) قەزا ئاکرێ.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ (رووبێ شین)، دبیتە سنوورێ دناڤبەرا پارێزگەهێن هەولێر و دهۆکێ.

**رۆژئاڤایی:** هەڤسنوورە دگەل ناحیا (دێرالوك)ێ، هەتا شیڤ چنارکێ.

پالپشت ب یاسا سەرۆکاتییا هەرێما کوردستانێ یا ژمارە: (١) سالا (٢٠٠٥)ێ یاراست ڤەکری و ل سەرنڤیسارا سەرۆکاتییا ئەنجومەنی وەزیران یا ژمارە (٨٤٦)ل ٢٠١٣/٧/٧ بریارا ب ناحیەبوونا شێلادزێ و(٩٢)گوند پێڤەهاتنە گرێدان[42].

ئەڤە ژی دەقێ بریارا ناحیبوونا شێلادزێ یە :

**سەرۆکایەتی هەرێم**

**ژمارە ١٠٤١ لە ٢٠ /٨/ ٢٠١٣**

**فەرمانی هەرێمی**

**ژمارە (١٠٦)ی سالی ٢٠١٣**

**پالپشت بەیاسای سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان ژمارە (١)ی سالی (٢٠٠٥)ی هەموار کراو، وە ل سەر رۆشنایی نووسراوی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٨٤٦) رێکەوتی ٢٠١٣/٧/٧ بریارماندا بە :**

**- هێنانەکایەی ناحیەی (شێلادزێ) لە سنووری پارێزگای دهۆك، و لە (٩٢)گوند پێك دێت، کەلە لیستی هاوپێچدا هاتووە بە گوندی (خاستوو ژووری)دەست پێدەکات و بە گوندی (ئاوکا) کۆتایی دێت.**

**- ئەنجومەنی وەزیران ئەم فەرمانە جێبەجێ دەکات لە رۆژی دەرچونیەوە .**

**- لە هەولێر نووسرا لە رۆژی (٢١)ی مانگی (٧)ی سالی (٢٠١٣).**

**مەسعود بارزانی**

**سەرۆکی هەرێمی کوردستان**

١- خاستوو ژووری -٢ لاتکا -٣ دێوکێ -٤ چێ -٥ ئەرتیس -٦ پیراڤدەلا -٧ هارەی -٨بەنستان -٩ مروانس -١٠ نێروە سیتو -١١ بیری -١٢ دهیکی -١٣ رزێ -١٤ مامیسا -١٥ میرەڤا -١٦ هولیان -١٧ بەرێزکی -١٨سنجێ -١٩ ئۆرەمار -٢٠ شامکێ -٢١ خاری -٢٢ کوکەری ٢٣ - بێدە -٢٤ بێزەلێ -٢٥ کاڤلکێ -٢٦ سارکا رێکان -٢٧ چەم جیانی -٢٨ برائێکێ -٢٩ بێباکرێ -٣٠ دێرکێ -٣١ قەسرکێ -٣٢ کێربادێرێ -٣٣ باوانی ٣٤ - سوریانی -٣٥ هریاشی -٣٦ ئەرتیش -٣٧ زێوکێ -٣٨ هیلی -٣٩ رەزگە -٤٠ شاجی -٤١ سیتە -٤٢ دەعلکێ -٤٣ بانسری -٤٤ هوسی -٤٥ سارکا زێبار -٤٦ خاستوو ژێری -٤٧ سیدان -٤٨ دهیك رۆژهەلات -٤٩ بێسەپی -٥٠ چەم جوو -٥١ مازی -٥٢ هلوری -٥٣ بیاری -٥٤ دهیك رۆژئاڤا -٥٥ برجێلا -٥٦ رێشمە -٥٧ فەقیا -٥٨ رەبا -٥٩ باڤێ -٦٠ ئاتێرا -٦١کونیشکا -٦٢ شکەفتێ -٦٣ بێزیڤە -٦٤ بلبل -٦٥ مرگاش -٦٦ ئاوکا رێکان -٦٧ رێشبراخە -٦٨ پێپەرخا -٦٩ مەمکا -٧٠ وەرەخەل -٧١ بێکروب -٧٢کارفی -٧٣خالکە -٧٤ هنیشی -٧٥ناڤ سورێ -٧٦ مێزی -٧٧ ئستپ -٧٨ هیش -٧٩ مەیدان -٨٠ بالەسینا -٨١ شەتینس -٨٢ تتم -٨٣ زێوە -٨٤ شێخ مەما -٨٥حاجی سفلی -٨٦ بێدە سفلی -٨٧ کەڤزۆنە -٨٨ سەرێ ملێ -٨٩ بیرا خدر -٩٠ باغەلا -٩١ سەرۆکانی -٩٢ ئاوکا[43].

هەژی گۆتنێ یەكو ژبۆ ڕاستڤەكرن د هندەك ناڤان دا شاشی دنڤیسینێ داكریە وەك (هارەی/ هورە، میرەڤا / میرگەڤا، چەم جیانی/ چەم جوو، مەمكا/ مامكا، خالكە/ خالكا، سپە/ ئیستپ، هیشە/ هیش، حاجی سفلی / هادیسفا، كەنزانە/ گەڤزۆنە)، و هەروەسا ناڤێ ڤان گوندان ژی (شیڤەڕەزا، جارمەندا، ڕەشانكێ) نەهاتینە نڤیسین، كو د بنیات دا ئەڤە ژی یێن سەر ب ناحیا شێلادزێ ڤە.

## كۆمەلگەهێن سەر ب ناحیا شێلادزێ ڤە:

### كۆمەلگەها سیریێ:

ژ كۆمەلگەهێن گرنگ و گەشت و گوزارییە، دكەڤیتە ناڤبەرا دو ڕووباران، ل باكوورێ ڕۆژهەلاتی ڕووبارێ شەمدینان (ڕوویێ شین) ژ گەلیێ بالندا دهێتن، ل باشوورێ ڕۆژهەلاتێ وێ ئەڤ ڕووبارە و ڕووبارێ (زێ) دگەهنە ئێك، سالا ١٩٧٨ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن، و سنوورێ وێ ب ڤی ڕەنگی یە:

**باكووری:** گەلیێ بالندایە و چیایێ مام ڕەشایە.

**باشووری:** ڕووبارێ (زێ - زێیێ مەزن)ە،و هندەك گوندێن دەڤەرا زێبار.

**ڕۆژهەلاتی:** ڕووبارێ (ڕوویێ شین)، و گوندێ بالندا و دەڤەرا (بارزان) ە.

**ڕۆژئاڤایی:** سەنتەرێ ناحیا شێلادزێ یە، نها سیریێ و شێلادزی گەهشتینە و بووینە باژێرەك.

### سیریێ ل سەردەمێ (شێخ عەبدولسەلام بارزانی ١٨٧٤-١٩١٤ز) دا:

دهێتە ڤەگێران كو ئێكەم كەس دەسەلاتداری ل ڤێ دەڤەرێ كری ناڤێ وی (قادر سیری- ب قادوییێ سیری)هاتییەنیاسین، ئێك ژ پشكدارێن شوڕشا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی (١٩٠٧- ١٩١٤) بوویە، دەمێ شێخ عەبدولسەلام بەرهەنگاری هێزێن دەولەتا ئوسمانی بووی، قادر سیری سەركردایەتیا بەرۆكێ هێزا بارزان ل ئامێدیێ بۆ بارزان دكر، پشتی شكەستنا شوڕشێ و مشەختبوونا شێخ عەبدولسەلامی بۆ ڕۆژهەلاتێ كوردستانێ و شەهید بوونا چەند شەرڤانێن وی و بریندار بوونا وی و برایێ وی پاشتر مرنا برایێ وی یێ بریندار، دەمەكی ب نهێنی دمینتە ل دەڤەرێ هەتا برینا وێ چاكدبیتەڤە و پاشتر ئەو ژی بەرەڤ ڕۆژهەلاتێ كوردستانێ دچیت



و دگەهیتە شێخ عەبدولسەلامی[٤٤].

**ڕامانا ناڤێ سیریێ :**

وەك دیار جهێ جوگرافیێ کۆمەلگەهێ ل سەر دو ڕووبارێن گرنگە، و ل بەر سنگێ گەلیێ بالندایە، ل وەرزێن پاییز و زڤستانا هرەبایەکێ دژوار و حێل یێ سەقایێ ڕووباران و گەلی بەرەڤ سیریێ دهێتن، کو دگەل دەنگێ وی هرەبایی سریانا هەوای دهێن، لەوما ناڤێ وێ ژی ژ ڤێ چەندێ هاتییە وەرگرتن ئانکو ژ سەقایێ سرۆشتێ وێ.

**سیریێ وەك کۆمەلگەهـ :**

سیریێ وەکی کۆمەلگەهـ ل سالا (١٩٧٨ز)ێ ژ ئالیێ عیراقێ ڤە هاتییە ئاڤاکرن.

**ئاکنجیبوویێن وێ:**

هەتا سالا ١٩٧٨ێ سیریێ گوندەکێ بچووکێ چەند مال بوو، کۆمەلگەه سالا ١٩٧٨ێ هاتییە ئاڤاکرن، پێکهاتا وێ ژ خەلکێ وان گوندان پێکدهێتن یێن ل سالا (١٩٧٨ز) ژ دەڤەرا ڕێکان و دۆسکی ژووری یا هاتینە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهێ، هژمارا ئاکنجیبوویێن وێ ل دووڤ ئامارا سالا (٢٠٠٦)ێ (٨٣٧٠) کەس بوون و ل سالا (٢٠٠٩ز)ێ (١٢٤٥٢) کەس بوویە[٤٥].

**بازێرڤانیا سیریێ:**

پشتی ل ڕۆژا (٢٠٠١/٥/٢٦)ێ هەلبژارتنێن بازێرڤانیان هاتینە ئەنجامدان، بۆ ئێکەم جار بازێرڤانیا کۆمەلگەها سیریێ ژی هاتە دامەزراندن، کو سنوورێ بازێرڤانیێ ژ شیڤا دناڤبەرا گۆڕستانا (کێریادێرێ) و مالێن گوندێ (بیرێ ڕۆژهەلات) دەست پێدکر هەتا دگەهشتە گەلیێ بالندا، و ئێکەم سەرۆکێ بازێرڤانیێ مامۆستا (عوسمان حەسەن عەبدولرەحمان هیلی) بوو، ل ٢٠٠١/٦/٩ێ ب فەرمی دەست بکار ببوو هەتا ٢٠٠٨/٧/٢٨ێ، پاشی ئەندازیار (هەژار محەممەد نەصروللا بێدەی) دبیتە سەرۆکێ بازێرڤانیێ و پشتی سالەکێ دگەل بازێرڤانیا شێلادزێ دهێتە گرێدان و دبنە ئێك بازێرڤانی بناڤێ (بازێرڤانیا شێلادزێ).

## گوندێ سیریێ
## (سیریا کەڤن/ سیریا ژووری)

کەڤیتە ل باکوورێ ڕۆژهەلاتێ شێلادزێ، و ل ڕۆژهەلاتێ وێ ڕووبارێ ڕوویێ شین و ل باکوورێ ڕۆژهەلاتی گەلیێ (بالندا)یە، ل دۆر ڕامانا پەیڤا سیریێ ژی: ئەڤ پەیڤە یا ژ سیریێت بای ئانکۆ (هەوای) یاهاتی ژبەر کو دکەڤیتە دگەلیێ بالندا دا و بایەکێ دژوار دوەرزێ زڤستانێ دا دهێتن زۆرێ سارە و سیرێنەکا ب هێز ژێ دهێتن لەوما یا ب سیریێ هاتییە بناڤکرن و د تۆمارێن حکومەتا عیراقێ دا ژی ناڤێ (سووری السفلی/ سیریا ژێری)هاتییە، کو ل دووڤ بڕیارەکا ل سەردەمێ وەزیرێ ناڤخو (سەعید قەزاز) ناڤێ وێ ب (سوری) هاتییە کو تێدا هاتییە دیارکرن ئێك ژ وان گوندان بوویە یێن سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ ڤە ئەڤ چەندە د (الوقائع العراقیة ، العدد ٣٩٣٧، السنة الخامسة والثلاثون١١/ ٢/ ١٩٥٧، ص ٣-٤) هاتبوو بەلاڤکرن، هەر ل نیڤا ئێکێ ژ سادسالیا بیستێ ئەڤ بەرەبابکە ل ڤی جهی جهوار بووینە کو خەلکێ گوندی ژی ئەڤە بووینە:( تاها محمد صالح سعدین، بنیامێن عبدالرحمن، ڕەشید(ڕەشو) عبدالرحمن، عبداللە تاهر عەلی، شوکری عبداللە عەلی، حەجی عبداللە عرفات صالح، ڕەمەزان عەرەفات صالح ، ئەحمەد ئیبراهیم) ئانکۆ ئەڤە ل ڤی جهی ئاکنجی بوون بەری کو کومەلگەهێن نوی ئاڤاکری بەرهەڤ ببن، کو ژیانا وان ل سەر چاندن و تەرش و تەوالی و خودانکرنا مەر و مالاتی بوویە و ل سالێن دەستپێکا سیهان ژ سەدسالیا بیستێ و هەتا نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتیان (کەلەکا سیریێ) یا ڤەگوهاستنێ ل سەر ڕووبارێ شین (ڕوویێ شین) هەبوو، ئەڤێ کەلەکێ مفایێ ڤەگوهاستنێ هەبوو دناڤ بەرا کاروانیێن دەڤەرا شێلادزێ و دەڤەرا بارزان و ئاکرێ... ژبەر کو گەلەك هاتن و چوون و دەرباس بوون ل سەر هەبوو نەخاسمە ل دەمێ شۆڕشا ئەیلولێ (کو پێشمەرگە بێ بەرامبەر دەرباس دکرن) کەلەکڤان حەجی عەبدوللا سیری دل پتر بشێت کارکرنێ ل سەر کەلەکێ بکەتن وی (محەممەد

حەجی بالندی: ئەوێ ل سالا ١٩٨٣ دگەل بارزانییان هاتییە ئەنفالکرن)کربوو هەڤپشکێ کارێ خو، پاشی (رەشید عەبدولرەحمان سیری، تاها محەممەد سالح سیری) ببوونە هەڤپشك، و ل دەمێ ئاوارەبوونا خەلکی بۆ ئیرانێ ل نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتیان ژ سەدسالییا بیستێ خەلك بێ بەرامبەر دهاتە دەربازکرن، پشتی ل سالا ١٩٧٨ێ پرەك ل سەر ڕوویێ شین هاتییە دانان ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە ئێدی گرنگی و کارکرنا ڤێ کەلەکێ نەما !

و پشتی خەلکێ دەڤەرێ ب کوتەکی ژلایێ رژێما بەعسا عیراقێ ڤە ژ گوندێن وان ڤەگوهاستین ل سەر ئەردێ گوندێ سیریێ ئاکنجی کرن، هەر دڤی گوندی دا کاڤلە ئاشەکێ کەڤنار هەبوو کو هاتییە زانین ئاشەکێ بوهاری بوو، جوویا وێ ل شیڤکا لایێ رۆژهەلاتا گوندی دهات لێ ئەو ژی نەهاتییە دیارکرن کا کەنگی هاتییە چێکرن و خراب بویە، و سێ کانییێن لێ هەبن (کانیا مەزن ، کانیا ئاقدووك , کانیا براهیم تەیمەز)، و گورستانەکا کەڤنار ژی یا لێ هەی، ژین و ژیارا وان هەر ژ کەڤندا و تاکو نها ل سەر چاندنا دەرامەتی بویە ژ چاندنا گەنم و جەهی و بیستانێن فێقی و کەسکاتیا

پشتی کومەلگەهێن نوی هاتینە ئاڤاکرن ل سالا ١٩٧٨ێ وەك (سیریێ ، شێلادزێ، دێرەلوك ، قەدش...) ئەڤ گوندە ژی بوویە پارچەك یان ژی بێژین وەك تاخەکێ گرێدای کومەلگەها سیریێ ڤە.(*).

## عەشیرەتێن ناحیا شێلادزێ:
## عەشیرەتا (رێکان) و گوندێن وێ:

عەشیرەتا (رێکان)، جهێ وێ یێ جوگرافی دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ ئامێدیێ و سنوورێ عەشیرەتا (رێکان) باکووری رۆژهەلاتی ڤە عەشیرەتا (دۆسکی ژووریان) و عەشیرەتا (هەرکی-هەرکیێن بنەجهـ)ن، ژ ئالیێ باشووری ڤە دەڤەرا (شێلادزێ)یە، ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە رووبارێ (رووبێ شین)ە، کو دبیتە ناڤبرا جوداکرنێ ژ دەڤەرا (بارزان) و عەشیرەتا (مزووری بالا)یە[٤١]، ژ ئالیێ رۆژئاڤا ڤە

گوندێ سیریێ



ژی هەڤسنووره دگەل عەشیرەتا (نێرۆەیا عولیا)[٤٧].

ژ کەڤنترین ژێدەرێن کو هەتا نها ب دەستمە کەفتین کو بەحسێ هۆزا رێکان کری یان ژی بێژین ناڤێ وێ ئینای، ئەو ژی دیرۆکڤان (ئیبن شەداد حەلەبی ٦١٣_٦٨٤مش/١٢١٥_١٢٨٦ز) بوویە دەمێ دپەرتووکا خو (الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام و الجزيرة)دا ناڤ ئینای و بەحسێ میرەکێ کورد بناڤێ (میر سەیفەددین ئەبو بەکر کورێ عومەر رادکی/ رادەکی)کری و ئاماژە دایە وێ چەندێ کو مەلکێ حەلەبێ (الملك ناصر يوسف) میر (سەیفەددین)ل سالا (٦٤٢مش/١٢٤٤ز) کریوو والیێ باژێرێ (حەران) و یێ بەردەوام بوو هەتا ل سالا (٦٥٧ مش _ ١٢٥٩ز) ێ[٤٨] ل حەلەبێ مری[٤٩]، دیسا دیرۆکڤانێ کورد (شەرەفخانێ بەدلیسی ١٥٤٣ - ١٦٠٤ز) ژی، خودانێ پەرتووکا (شەرەفنامە) یا کو ل سالا (١٥٩٧ز) ێ نڤیسی، ناڤێ رێکان ب ناڤێ (رادکان/ رادکی) ئینایە[٥٠]، هەروەسا دیرۆکنڤیس و جوگرافیناسێ ناڤدارێ عوسمانی (تورکی)ژی (ئەولیا جەلەبی ١٦٠٩-١٦٥٧ز) د پەرتووکا خۆ (جهان نما)دا ناڤێ (رادکانی)ئینایە[٥١]، ئانکو ب بوورینا قوناغێن دیرۆکی دا ناڤێ (رادەکی) ناڤێ کەڤنێ عەشیرەتا رێکان بوو، کو بەلگەیا ڤەبر ژی بۆ ڤێ چەندێ زانایێ مەزن (مەلا عەبدوللاهێ مامیسی یێ رێکانی - ئەوێ ل سالا ١٧٩٥ز مری)، د دەستنڤیسێن خۆدا جار ناڤێ (الريكاني) و هندەك جارا ژی ناڤێ (الرادكاني) بۆ دیارکرنا ناڤێ عەشیرەتا خۆ دەست نیشانکریوو، هەروەکی دڤان نموونەیێن دەستنڤیسێن وی دا دیار دبیت.

هەروەسا ڤەکۆلەر (د.مەسعود کتانی) دنڤیسینێن خودا بۆ ناڤێ رێکان ناڤێ (رادەکی_ رێکانی)ئینایە.

سەربارەت رامانا ناڤێ رێکان (رادکان) ئەڤ بووچوونە یێن هەین:

- و ل دۆر پەیڤا (رادکان) ژی مامۆستا ونڤیسەرێ مێژوویێ (نزار ئەیوب گولی) دایە دیارکرن کو (راد) د زارێ (لوری)دا ب رامانا (جوامێر_جامێر)دهێتن، و (رادکان) رامانا کۆما رادان ددەت ئانکو دبیتە کۆما جوامێران، و ب ڤی رەنگی ژی هۆزا رێکان (رادکان) ژی رامانا وێ دبیتە (کۆما جوامێران).
- رێکان: ژ دو پارچە پەیڤان پێك دهێتن و رامانا (الطريق الجديد_ رێکا نوی) ددەت.
- رێکان: ژدو پارچە پەیڤان پێك دهێتن و ب رامانا رێکا کانییا (رێ+کانی/ طريق الينبوع) دهێت، و هەروەسا ب رامانا (رووبار و کانی )ژی ددەت.

عەشیرەتا (رێکان) رێکخستنەکا رێك و پێکا هەی، دابەشکرییە سەر چەند بەلیکەیان، هەر بەلیکەیەك چەندین گوندان بخۆڤەدگریت دا رێڤەبرنا کاروبارێن گوندان ژئالیێ جڤاکی و سەروبەرێن ژیانێ ب ساناهی بێخیت.

هەژی یە بێژین کو دەڤەرا (رێکان) ل سەردەمێ ئوسمانییان ناحیەکا سەربەخۆ بوویە، ئەڤ چەندە ژی دسالنامەیێن ئوسمانیا دا یا دیارە، بۆ نموونە ئەڤە هندەك زانیارینە سەبارەت ناحیا رێکان و دیارکرنا رێڤەبەرێن ناحیێ:

- دووڤ سالناما ئوسمانییا سالا (١٨٩٢ز)ێ ناڤێ رێڤەبەرێ ناحیا (رێکان) (تاهر بەگ) بوو.
- سالا ١٨٩٤ێ ژی رێڤەبەرێ ناحیێ هەر (تاهر بەگ) بوو.
- سالا ١٩٠٥ێ مەئمورێ دەڤەرا رێکان (عەبدوللەتیف ئاغا زادە تاهر ئاغا) بوو.
- سالا ١٩٠٧ێ تەتەر ئاغا (تەتو ئاغا) رێکانی ب وەکالەت رێڤەبەرێ ناحیێ بوو، رێڤەبەرێ فەخری یێ ناحیا رێکان بوو ل سەردەمێ ئوسمانی[٥٢].
- سالا ١٩١٢ ێ رێڤەبەرێ ناحیێ (حاجی عەبدولباقی ئەفەندی) بوو[٥٣].

## ڕووبارێن سەرەکییێن دەڤەرا رێکان:

### - ڕووبارێ شەمدینان (ڕوویێ شین):

ژ سنوورێ باکوورێ کوردستانێ دهێتن، ل گوندێ (چەمتی - دۆسکی ژووری) دهێتە دناڤ ئاخا باشووردا.

**- ڕووبارێ ئاڤا مارك:**

ژ باكوورێ كوردستانێ ل (شلكو - ئەرش) دهێتن و دەمێ دهێتە گەلیێ مازێیێ (گوندێ مازێیێ - ڕێكان) هەتا دووكەرا مازێیێ دبێژنێ (ڕووبارێ مازێیێ)، دەمێ ژ وێرێ دهێتن هەتا گوندێ (سیتە) دبێژنێ ڕووبارێ (ئاڤا مارك) و د ڕژتە سەر ڕووبارێ ڕوویێ شین، ئاڤا مارك ژ سێ تا پێكدهێت، یێ ئێكێ ژ بن چیایێ ماركێ ل گوندێ (ئەرییش) ل باكوورێ كوردستانێ دزێت، یێ دووێ ل گوندێ (مركانش) ل باكوورێ كوردستانێ دزێت، یێ سێیێ ل گوندێ بالەسینا ل دەڤەرا ڕێكان دزێت، هەرسێ ڕووبار ل گوندێ بانسرا دگەهنە ئێك هەتا دگەهیتە دوكەرا مازێیێ ڕووبارەكێ دی ل دەڤەرا ڕێكان د ڕژێتە سەر و مەزنتر لێ دهێت و ل گوندێ (سیتە)ی درژیتە سەر ڕووبارێ ڕوویێ شین، دبێژنێ ئاڤا مارك كو سەرۆكانییا ڕووبارێ ژێن چیایێ (مارك) دهێت كو ناڤێ وی ژ چیایێ (مارك)ە، ل هنداڤی گوندێن (ئەرییش وشیڤەرەزا و هرگاش وجارمەندا).

**- ڕووبارێ هەسنەكا (هەسناڤەكێ):**

ئەڤە ل ڕەخێ گوندێ (كارە - نێروە) دهێتن وبەرەڤ گوندێن (كوكەر و بێسەپێ ....) هەتا دگەهیتە سەر ئاڤا مارك دبێژنێ (ڕووبارێ هەسناڤەكێ).

**- ڕووبارێ كونیشكا:**

ئەڤ ڕووبارە ژ ئالیێ گوندێ (نێروەكا سیتو/ نێروەك - دۆسكێ ژووریان) دگەلیێ كونیشكا دا دهێتە خارێ ل گوندێ (كونیشكا- ڕێكان) هەتا دگەهیتە دووكەرا مازێیێ دبێژنێ (ڕووبارێ كونیشكا).

**-بەلیكەیێن عەشیرەتا ڕێكان:**

بەلیك: ڕەنگە ڕێكخستنەكە بۆ ب ڕێڤەبرنا كاروبارێن عەشیرەتا ڕێكانییان، هەر چەند گوندەك د بەلیكەكێدا هاتینەڕێكخستن، ب ڕەنگێ ژێری:

**١- بەلیكا خالكا (سەرێ بەلیكێ یە)، (٧)گوندن،**

(خالكا، مامیسا، بەنستان، مروانس، دێركێ، دهیك ڕۆژهەلات، ڕزێ).

**٢- كێریادێرێ (سەرێ بەلیكێ)، (٥)گوندن،**

(كێریادێرێ، مێزێ، هنێش، بیارێ، ڕەبا).

كو دبێژنە ڤان هەردو بەلیكا بەلیكا مشارێ.

**٣- بەرسیك (دێم)، (٥)گوندن،**

(باوان (سەرێ بەلیكێ)، وەرەخەل، هریاش (هریاشك)، سوریان، سیدا).

كو ئەڤ هەر(سێ) بەلیكەیە ب (ڕێكانا دێم) دهێنە هژمارتن.

**٤- پشتا چیای، دیسا دبێژنێ بەلیكا (حولیكا) ژبەرهەبوونا زۆریا دارێن ڤێقیێ حولیكان، (١٤)گوندن،**

(پێپەرخا (سەرێ بەلیكێ)، سیتە، شاجا، ساركێ، دهیك ڕۆژئاڤا، كوكەرێ، بێزەلێ، كاڤلكا، بێباكرێ، باغەلا، بێستەپێ، چەمێ جوو (چەمجی)، هادیسڤا، ڕێشبراخە/ ڕێنجبراخە).

**٥- ئاڤی (بەلیكا ڕووباری)، (١٠)گوندن،**

(هیل (سەرێ بەلیكێ)، مازێ، هورە، بانسرا، ئاوكا، بالەسینا، زێوكێ، ئەرتش، هوص، ڕێشمە).

**٦- شیڤەرەزا (سەرێ بەلیكێ)، (٨)گوندن،**

(شیڤەرەزا، جارمەندا، خارێ، قەسركێ، مەیدانێ، مركانش، برجێل، جبلی).

**٧- شابا بێدە (سەرێ بەلیكێ)، (٥)گوندن،**

(بێدە، هیش، پیرئاڤدەلا، گەڤزونە، میرگاڤا).

**٨- بەلیكا مەرزا (٨)گوندن،**

(سنجێ-(سەرێ بەلیكێ)، ئستپ، شامكێ، ڕەزگە، هول (هولیان)، شابەكەما، دەعلكێ، پیرەسنا).

گەلەك كاڤلە گوندێن دی هەبووینە د خرابە و وێرانن وەك: (فەقیان، كونیشكا، بەرشكەفتنا، بێبنێ، باڤێ، بەرباڤێ، مرەزە، بێبشرێ، كانیتێ، پیرئومەرا، ئاتێ، ئاشیش، مازی ژێری، بێكروب، گوندكێ، بیشێ، بێسەلمێ، خانی خەزالێ، بەنستانكێ، كولا، باغەلا، ئاوكا خراب، باژێری، بلبل، ڕەبا، قەلەندەرا، خالكا خراب، مامكا، گەراڤ، نەهشك).

# گوندێن عەشیرەتا رێكان

## گوندێ چەمێ جوو[٥٤]

ژ گوندێن (رێكان) یێن بەلیكا (پشتا چیای)یە.

گوند یێ تژی ئاڤە، نەخاسمە رووبارێ (ئاڤا مارك) كو ب رووبارێ (چەمێ جوو) ژی دهێتە ناڤكرن، ژ حەفت جووێن ئاڤێ پێكدهێتن، لەوما هاتییە ناڤكرن ب (چەمێ جوو) ئانكو (چەمێ جووێن ئاڤێ)، ئەو رووبارێ ژ دووكەرا مازێیێ هەتا دگەهیتە گوندێ (سیتە)ب رووبارێ (ئاڤامارك - چەمێ جوو) دهێتە نیاسین[٥٥].

### جوگرافیا گوندی:

**باكووری:** گوندێ (مازی)یێ یە.

**باشووری:** گوندێ (سیدان)ە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (باوان)ە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (پێپەرخا)یە.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك بابكالەكی پێكدهێتن كو ناڤێ وی (ئیبراهیم) بوویە، وی دو كور ب ناڤێن (شێخسن) كو دبێژنێ (شێرو)، و یێ دووێ (رەشید) هەبوون[٥٦]. پێكهاتەیا گوندی ژ ئالیێ ئایینی ڤە هەمی مۆسلمانن، د سەردەمێن كەڤن دا ئایینێن دیتر ژی لێ هەبووینە، نەخاسمە ئایینێ جوهیان كو (٣)مالێن وان ل گوندی دئاكنجی ببوون[٥٧].

### ئویجاخێن گوندی:

گوند ژ هەشت ئویجاخان: مامكا، ئامێدیكا، گرێ جب، چەمێ جوو، چەمێ سالێ، چەم فەلەیێ، هەرداڤا، چەم بەرۆژی پێكدهێت.

### ژكانیێن گوندی:

كانیا ساركێ، كانیا شڤانكێ، كانیا ئاشی.

گوندێ چەمێ جوو



**شكەفتێن گوندی:**

**- شكەفتا كونا ئاڤێ:**

مەزنترین شكەفتا گوندی یە، دكەڤیتە رۆژئاڤایا گوندی، ژبەركو ئاڤا دناڤا وێ دا هەی لەوما دبێژنێ شكەفتا (كونا ئاڤێ)، هەروەسا دبێژنێ شكەفتا (كونا پیركێ)، شكەفتەكا گەلەكا سەیرە، ژ مەمەران پێكدهێت، هەر مەمەرەك ب درێژاهیا (٢٠)مەترایە، سێ ژوورێن (٦) مەتری بخۆڤەدگریت.

چەند شكەفتێن دیتر ل گوندی یێن هەین وەك: شكەفتا جانگا، شكەفتا گارانێ، شكەفتا كێلویێ، شكەفتا قاڤژا، شكەفتا دمدمی، شكەفتا ساركێ، شكەفتا كویركێ، شكەفتا خەیاتا: چونكی كارێ جلك دروینێ تێڤە دهاتەكرن.(٥٨)

**گۆرستانێن گوندی:**

ل گوندی سێ گۆرستان: گۆرستانا مشایخێ بالیل، گۆرستانا پیر جب (پیر رەجەب)، گۆرستانا سەیدی هەنە(٥٩).

**ژ جهـ وشوینوارێن گوندی:**

گەلەك شوینوار و جهێن مێژوویی لێ هەنە، وەك:

- **ئامێدیكا خراب:** جهەكێ گەلەك كەڤنە، وەكی بازێرەكێ ئاڤا بوو، گەلەك جۆرێن پێدڤیاتییان لێ هەبوونە، ل كاڤلێ وێ گەلەك جارا جەرك و ئامیر و ئامان و بكارئینانێن وی سەردەمی لێ هاتینە دیتن.
- **پرا ئامێدیكا خراب:** ل رۆژئاڤا گوندی، كو ب گێچ و كسلێ هاتبوو چێكرن، و گەلەك ژ مێژە خراب بوویە، شوینوارێن وێ یێن مایین .
- **كەلا چەمێ جوو (كەلا چیایی).**
- **ئاشێ گوندی:**

**بازرگانی یا گوندی:**

چەمێ جوو ژ گرنگترین گوندێن دەڤەرێ بوویە بۆ بازار و بازرگانیێ، ل گەلەك دەڤەران وەك (ئەرتووش، پنیانش، ئامێدیێ، دهۆك، ئاكرێ، مووسل...)، بۆ

شكەفتا (كونا ئاڤی)



بازرگانیێن جۆراوجۆر وەكو: جل و بەرگ و خوارن و ڤەخوارن وپەز و مەرومالاتی وچەكی .... ڤەستدكرنێ، و هەتا دەمێ ئەنفالان ژی بازار لێ هەبوو.

چەم جی ژ وان گوندان بوویە یێن د سەردەمێ شۆرشا گولانی دا ل سالێن هەشتێیان هاتییەڤە ئاڤاكرن و ٣٢ خێزان لێ ئاكنجی ببوون، بەلێ د ناڤبەرا ٢٥/- ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند كەتییە بەر هەوا ئەنفالێن بەهدینان سەر ژ نوو گوند هاتەڤە سۆتن و خرابكرن و خەلكێ گوندی مشەخت بوونە كەمپێن پەنابەران ل باكوورێ كوردستانێ[٦٠].

پشتی سەرهەلدانێ خەلكێ گوندی ل كۆمەلگەها سیریێ و شێلادزێ و دێرالوكێ ئاكنجیبووینە، هەتا نها ژی خەلكێ گوندی و یێن دەڤەرێ و ل گەلەك جهان ڤەستا گوندی دكەن، و دەرامەت و چاندنا كەسكاتی و زەرزەواتی لێ دهێتە كرن[٦١].

## گوندێ كونیشكا:

### جوگرافیا گوندی:

گوندێ كونیشكا دكەڤیتە ناڤەراستا عەشیرەتا رێكانیا د ناڤا گەلییەكی دا و هەردو لایێن رۆژهەلات و رۆژئاڤا چیانە، ژ دو ئویجاخا پێكهاتییە، رووبارەكێ بچویك دناڤدا دەربازدبیتن ، گوندەكێ ئاڤی یە، ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و خودانكرنا پەزی بوو.

### دیرۆكا گوندێ كونیشكا:

كونیشكا گوندەكێ كەڤنارە، سالا (١٩٥٠ز)ێ پشتی كو ئێشەكا كوژەك و مەترسیدار گوند ڤەگرتی، گوندی تووشی مرنەكا مەزن بووینە، مرۆڤێن مایی ژی بووینە دو پشك پشكەكا وان چوینە باكوورێ كوردستانێ و پشكا دن بەرەف گوندێ شاجا چووینە كو ب تنێ مالەك بوویە ب ناڤێ (مالا عومەر) تا كو سالا (١٩٨٨ز)ێ، پشتی ئەنفالا بەرەف تركیا چووینە و نها ل كۆمەلگەها سیریێ ئاكنجی نە، تنێ ئێك مال ژێ مایە و مالا دی ل مووسل ئاكنجی بووینە.

ئانكو ژ ١٩٥٠- ١٩٨٨ێ گوند بێ بەردای بوویە[٦٢]، و هێژ نەهاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوارێن گوندی:

ئەڤ گوندە ب شكەفتێن كونیشكا هاتییە نیاسین و ب دو دەرگەهێن مەزن هاتییە كۆلان، ئێك ژوان ب شێوەیێ چوارگوشەیە و یێ دیتر ژی ستوونی یە، سێ پەنجەرێن بچویك ب شێوەیێ چوارگوشەیی بۆ رۆناهیێ هاتینە ڤەكرن، (جەبارعومەر) ژ دایك بوویێ (١٩٤٨ز) خەلكێ گوندی یە دبێژیت: ژ باب و باپیران هاتییەڤەگێران كو بەری سەدان سالان د كەڤری را ئەڤ شكەفتەهاتییە كۆلان، ل وی دەمی دا شەر دمشە بوون، و دبیت وان بۆ خۆ ڤەشارتنێ ئەڤ شكەفتە كۆلابن، شكەفت ژی ژ دو ژووران هاتییە كۆلان، ئێك ژوان یامەزنە و جهێن رووننشتنێ ب كەڤری وەكی تەختانە تێدا هاتینە چێكرن، نێزیكی (١٠٠) كەسان تێدا دهێنە ڤەحەواندن، ژ سێ پەنجەران پێكهاتییە، یادیتر بچووكترە و یا بێ پەنجەرە و دو دەرگەهـ دچنێ، ئێك ژناڤ ژوورا مەزن را دچیتێ یا دیتر ژی ژ ئالیێ دەرڤە دچیتێ، تنێ ئێك رێك دچیتێ ئەو ژی ژ ئالیێ سینگی ڤە و د بەردا ژی رووبارە و چەند دارچنارەك د بەررا شین بوینە درێكا وان دار چنارا را مرۆڤ دشێت بچیتە تێدا و زۆرا ئاسێی یە، هەر د ڤی گوندی دا ئاشەكێ مەزن لێ هەبوویە تنێ شوینوارێن وی ماینە كو ل سالێن بیستاندا ژ چەرخێ بیستێ خەلكێ دەڤەرا رێكانییا و دۆسكی ژووریان بۆ هێرانا دەخل و دانێ خو ڤەستا ڤی ئاشی دكر .

### شكەفتێن گوندی:

شكەفتا هەرفتە، شكەفتا كافرا[٦٣].

## گوندێ باوان:

ژ گوندێن بەلیكا (بەرسیك- دێم)ە، و ب گوندێ سەرێ بەلیكێ دهێتە هژمارتن[٦٤].

**جوگرافییا گوندی:**

دکەڤیتە رۆژهەلاتێ رووبارێ (رووبێ شین)، دناڤبەرا گوندێ (گەراڤێ) و گوندێ (کولان) و دناڤبەرا گوندێن (وەرەخەل) و (سوریان).

**باکووری،** گوندێ (کولان)ە، و ل باکوورێ رۆژهەلاتی گوندێ (وەرەخەل)ە.

**باشووری،** ل باشوورێ رۆژئاڤا گوندێ (گەراڤێ)یە.

**رۆژهەلاتی،** ل باکوورێ رۆژهەلاتی گوندێ (سوریان)ە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (چەمێ جوو)یە.

**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالا مەمێ، بنەمالا تەتێ، بنەمالا ئەمیخان، بنەمالا لاڤێ، بنەمالا حەمێ، بنەمالا ئالەدین.

**کانیێن گوندی:**

کانیا گوندێ باوان، کانیا سەر لاتێ، کانیا بیشێ پیرە مەند، کانیا کێفتێ.

**شکەفتێن گوندی:**

ب ناڤێن جانگا، مهیم، حەمە شانکێ، رەوێ، مەرزی ، ئاسیە، باسانی، تیێ تاتەبانێ ، شیڤا جی گوشتی، بادین و خاسیێ هاتینەناڤکرن.

**ژ شوینوارێن گوندی:**

-پرا ماصەکا: یان د بێژنێ (پرا باوان) چونکی یا ل بن گوندێ (باوان)دا، پرەکا کەڤنە و ژ مێژە یا هەرفتی و ژ ناڤچوویی[٦٥].

**هێلانا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٧٨)زێ هاتیە وێرانکرن و ل کۆمەلگەهێن (شێلادزێ و سیریێ) هاتینە ئاکنجیکرن.

## گوندێ سوریان:

سوریان ژ گوندێن بەلیکا بەرسیك (دیم)ێن رێکانە.

شکەفتێن کونیشکا[٦٦]



**جوگرافییا گوندی:**

سوریان: ژ گوندێن دێمە، دناڤ چیای رابە و بەر بەرۆژە، دكەڤیتە بەر سیكێ خالكا د ناڤبەرا گوندێن هریاشك و باوان و وەرەخەل، دووراتییا دناڤبەرا گوندێ سوریان و گوندێ هریاشك (٤كم)ە و دناڤبەرا سوریان و گوندێ وەرەخەل (٢،٥كم)ە.

**باكووری،** گوندێ (رزێ)یە.

**باشووری،** ل باشووری رۆژئاڤا گوندێ (باوان)ە.

**رۆژهەلاتی،** ل باكووری رۆژهەلاتی گوندێ (هریاشك)ە.

**رۆژئاڤایی،** باكووری رۆژئاڤا گوندێ (وەرەخەل)ە، باشووری رۆژئاڤا گوندێ (باوان)ە.

**رامانا ناڤێ گوندی:**

دهێتە ڤەگێران شیڤەكا ئاڤێ ل بنێ گوندی هەبوویە، دەمێ هروبا (بابێن دژوار و ب هێز) د هاتن سیرێن ژێ دهات لەوا دگۆتێ سیریا بای هەتا كو گوهرین كەڤتینە پەیڤێ و بۆ سڤكی یا ناڤی بوویە سوریان .

**پێكهاتا گوندی:**

بنەمالا بژیكێ، بنەمالا هەمزا، بنەمالا قوتاس، سالا ١٩٨٨ێ ژ (٥٧) خێزانان پێكدهات[١٧].

**رەوش و كاودانێن ئابووریيا گوندی:**

خەلكێ گوندی ب هیڤیا چاندنا دەخل و دانی بوون و چاندنا وان هەمی دێمی بوو، ژ بلی ب خۆدانكرنا تەرش و كەوالی (پەز و بزن و پەلەوەر و دەواران) بوون، دیسان كو گوند نێزیكی رووبارێ (روویێ شین) بوو، خەلكێ گوندی كەلەكەك و داڤەرستەك چێكربوو و خەلك دەرباز دكر و داهاتییەكێ رۆژانە ژێ دهات.

**شوینوارێن گوندی:**

گوندێ سوریان ژی چەندین شوینوارێن كەڤن

شوینوارێ پرا كركاكی



وەك: گوندێ دەلان، کاڤلێ کومەی، کاڤلێ ئاشی، شکەفتا کونا رەبەن.

**- پرا کرکاکێ:**

پرا (کرکاکێ) ئێك ژوان شوینوارانە کوخزمەتەکا بەرچاڤا خەلکێن دەڤەرێن (رێکان) و (بارزان) کری، ناڤێ پرێ ب ناڤێ بالندەکێ (کرکاکێ) هاتیە ناڤکرن، دهێتە ڤەگێران ل سەردەمێ کەڤن دا جوهیا ل وی جهی کار دکر ژ نشکەکێ ڤە دەنگێ (کرکاکێ) هات، دەنگێ وێ یێ ب ترس و ب سەهم بوو جوهی زۆر ترسیان، ژ ترسادا خۆ ژ ڤی رەخێ رووباری هاڤێتە رەخێ دی کو ل وی جهێ رووبارێ (بەرتەنگ) بوو، هەردو لا کەڤربوو، ژبەر ڤێ چەندێ ب پرا (کرکاکێ) ب ناڤ کریە.

**- ئاڤاکرنا پرێ:**

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (۱۹٦۳ز)ێ ب بریارا مەلا مستەفایێ بارزانی دەست ب چێکرنا پرێ ل دووڤ ئەندازەیەکا باش هاتەکرن، ژ (شەش) کوچکا پێکهاتیە، دو د ناڤا رووباریدا و (چوار) ژی ل هەردو لایێن رووباری ل سەر کەڤران هاتینە دانان، دناڤبەرا هەرکوچەکێ ژی (پێنج) بەنگە بوون، هەربەنگەکێ (حەفت گاریتە دهاڤێتنێ کو درێژاهیا (نەهـ) قائیمان بوون، سەرێ هەر کوچکەکێ ژی نێزیکی (شەش) مەتران بوو، دو هۆستایێن دەڤەرا بارزان ب ناڤێن (مەلائەحمەد ئەرگۆشی وبرایێ وی صالح ئەرگۆشی) ئینان، زێدەباری بەرهۆستایان و هژمارەکا زۆرا کرێکاران ژ هەردو دەڤەرێن مزووری ژووریێ و رێکان و بەرێن پرێ ژی ژ لایێ (لاچێ هریاشی و چومار سوریانی) ڤە دهاتنە شکاندن کو هەردو هۆستایێن بەر برینێ بوون[٦٨].

ئەڤ پرە ب کەرەستەیێن بەرێن بازی و کسلێ هاتە دروستکرن وگاریتێن پرێ ژی ژ گوندێن (سیدا و باڤێ و خالکا و بەنستان و دێرکێ و مروانس و نێروا سیتوێ و رەزگە و هیل و هورە) دئینان و ب وەریسان ئەڤ گاریتە ب ئاڤێ هەلدبرن هەتا کو (پر) هاتیە دروستکرن، پشتی دو سالان ئاڤا رووباری زێدە بۆش بوو (پر) ب ئێکجاری هەرفاند، سالا (۱۹٦٦ز)ێ چوونە د دووڤ هۆستایێن گوندێ (چەم سەیدیا - بەرواری بالا) و دو هوستایێن برایێن ئێك ب ناڤێن (سەید عەبدولرەحمان و سەید ئەحمەد) ئینان و بۆ جارا دووێ ئەڤ پرە هاتە دروستکرن، ژنوی بنێ هەردو کەڤران کۆلا و کۆڤکێت خۆ ب رەملێ و چیمەنتوی لێ دانان و دروستکر کو ل وی دەمی دا چیمەنتو ب ترومبێلا دئینا گوندێ (سێلکێ) ژ وێرێ ب دەواران ئینا سەر پرێ، لێ ژبەر کو وێ جارێ ژی پر ب بلنداهیا ئاڤێ نەچێکربوو هەر د وێ سالێ دا ئاڤێ دارێن پرێ برن و بۆ جارا سێیێ جارەکا دی هۆستایێن (ئەرگۆشیا) ل سەر کار کرەڤە و کوچکێن وێ بلندتر لێ کرن وهاتە دروستکرن. د سەردەمێ شۆرشا ئەیلوولێدا چەند جاران فرۆکێن عیراقێ بزاڤێن خرابکرنا پرێ کرن، ب تایبەت د ناڤبەرا ئادارا ۱۹۷٤- ئادارا ۱۹۷٥ێ، لێ ژبەر جهێ سەخت و ئاسێ یێ پرێ نەشیان زیانەکا وەسان بکەهینن.

**- خرابکرنا پرێ:**

سالا (۱۹۷۷ز)ێ دەما لەشکەرێ عیراقێ هاتیە دەڤەرێ ئەڤ پرە بۆ ئێکەم ئارمانجا وان و ب تێزابێ سۆت، ب تنێ کوچێن وێ یێن ماین و بەرچاڤن[١٩]، گوند ژی هەر د ڤێ سالێ دا هاتیە کاڤلکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهان هاتینەئاکنجیکرن.

**-کەلەکا سوریا:**

(کەلەك) دا هندەك داران ملێن وان دەنە ئێك و باش پەیتکەن و گرێدەن و بۆ دەربازبوونا ل ئاڤێ دهاتە بکارئینان)، پاشی بوویە داڤەرستا سوریان و نها ب پرا (بادین) هاتیە ناڤکرن.

## گوندێ بێسەپێ:

ئێك ژ گوندێن دەڤەرا(رێکان)ەو ژ بەلیکا (پشتا چیای)یە.

ناڤێ گوندی ژ سرۆشتێ گوندی هاتیەوەرگرتن، د بنیاتدا ژ (ب سەر پێ) هاتیە وەرگرتن، رێکا هەمی

گوندێن بەلیکا (پشتا چیای) دڤی گوندی را دبۆرن، ئانکو یا سەر رێکێ یە و جهێ بوورینا وان گوندێن پشتا چیایە، بۆ سڤکرن ناڤێ وێ بوویە (بێسەپێ).

## جوگرافییا گوندی:

**باکووری:** باکووری رۆژهەلات گوندێ (هادیسفا)یە.

**باشووری:** چیایێ کورەژار و ناحیا (شێلادزێ)یە.

**رۆژهەلاتی:** باکووری رۆژهەلاتی گوندێ (دهیکا ژێری) و گوندێ (سارکێ) و گوندێ (کوکەرێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** ل باکووری رۆژئاڤا گوندێ (کاڤلکا)یە.

## پێکهاتا گوندی:

ژ دو بنەمالان: بنەمالا حەسەن و بنەمالا سەیدێ پێکدهێت.

## کانیێن گوندی:

کانییا بێسەپێ، کانییا کەندێلێ، کانییا سەبرکێ، کانییا زێوەکێ، کانییا بێرێ[٧٠].

## شکەفتێن گوندی:

شکەفتا بەدرێ، شکەفتا فاتکێ، شکەفتا بێسەپێ، شکەفتا سەر سۆیلێ، شکەفتا گابەرێ، شکەفتا سینی، شکەفتا شیڤە کویرێ، شکەفتا کلۆخکی ، شکەفتا پێ کافری[٧١].

سالا (١٩٧٨ز)ێ گوند ژ لایێ عیراقێ ڤە هاتییە کاڤلکرن، وخەلکێ گوندی ل (شێلادزێ) هاتینەئاکنجیکرن.

بێسەپێ ژ وان گوندان بوویە یێن د سەردەمێ شۆرشا گولانی دا ل سالێن هەشتێیان هاتییەڤە ئاڤاکرن و ٣٧ خێزان لێ ئاکنجی ببوون، د ناڤبەرا ٢٥/- ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند کەتییە بەر هەوا ئەنفالێن بەهدینان سەر ژنوو گوند هاتەڤە سۆتن و خرابکرن و خەلکێ گوندی مشەخت بوونە کەمپێن پەنابەران ل باکووری کوردستانێ[٧٢].

دیمەنەك ل گوندێ بێسەپێ، دەڤەرا رێکان



## گوندێ بێزەلێ

ژ گوندێن دەڤەرا (رێکان) بەلیکا (پشتا چیای)یە، دووراتیا دناڤبەرا بێزەلێ و گوندێ بێباکرێ (٥کم)ە، د ناڤبەرا بێزەلێ و گوندێ (ئەرتش)دا (١٠کم)ە[٧٣]، گوندەکێ ناڤداربوویە ب هەبوونا خواندنگەها ئایینی (تەکیا بێزەلێ)[٧٤]، ژ گەلەك گوند و دەڤەران قەستا بێزەلێ ب مەرەما زانین و شەهرەزابوونا د کاروبارێن ئایینی دا دکرن.

### جوگرافییا گوندی:

**باکووری:** گوندێ (ئەرتش)ە ب دووراتیا (١٠کم).

**باشووری:** گوندێ (کاڤلکا)یە.

**رۆژهەلاتی:** ل باشوورێ رۆژهەلاتی گوندێ (باغەلا) و (کوکەرێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (سینیا: گوندەکێ نێروەیی) یایە.

### پێکهاتا گوندی:

ژ بنەمالێن: زادێ (زادە)، مصتێ، سەئیدا، حسێن، عەباس، شیڤ چەلانی، ژووری و گەلەش پێکهاتییە.

### کانیێن گوندی:

کانیبا بێزەلێ، کانیبا باغەلا.

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨)زێ هاتییە وکاڤلکرن و خەلکێ وی ل (شێلادزێ، سیریێ، باگێرا) هاتینەئاکنجیکرن.

بێزەلێ ژ وان گوندان بوویە یێن د سەردەمێ شۆرشا گولانی دا ل سالێن هەشتییان هاتییەڤە ئاڤاکرن و ٣٠ خێزان لێ ئاکنجی ببوون، د ناڤبەرا ٢٥/- ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند کەتییە بەر هەوا ئەنفالێن بەهدینان سەر ژنوو گوند هاتەڤە سۆتن و خرابکرن و خەلکێ گوندی مشەخت بوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ[٧٥] .

گوندێ بێزەلێ



## گوندێ پیرئاڤدەلا:

ئێک ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان)ە ژ بەلیکا (شابا بێدە)یە.

### جوگرافیا گوندی:

**باکووری:** سنوورێ گوندێن ترکیایە.

**باشووری:** گوندێ (هیش)ە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (نێروەك- دۆسکی ژووری)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (مەیدانێ)یە، و ل باشوورێ رۆژئاڤا گوندێ(ستپێ)یە.

### رامانا ناڤێ گوندی :

د کەڤن دا دهێتەڤەگێران کەسەکێ دیندار و زانایەکێ ئایینی ب ناڤێ شێخ (پیر ئاڤدەل) ژ گوندێ (بێگشکێ) ل دەڤەرا (ئەرتوش– باکوورێ کوردستانێ) هاتیە و ل جهێ گوندێ (پیر ئاڤدەلا) ئاکنجی بوویە و ب ناڤێ وی هاتیەناڤکرن[٧٦]، بۆ دوپاتیا ڤێ بۆچوونێ ئێك ژ کەسێن گوندێ (ئستپ) ب ناڤێ (سادە ئادەم رێکانی) کو ئەڤ گوندە نێزیکی گوندێ (پیرئاڤدەلا)یە دبێژیت: ل چەرخێ شازدێ ل سالا (١٥٧٤ز)ێ ملك صلیوی کەسەك ل دەڤەرا باکوورێ کوردستانێ ب ناڤێ (پیر عەڤدەل) ئینا بوو گوندێ ئستپ بۆ کاروبارێن سەرژێکرنا پەزی، پاشی ئەڤ جهێ نها یێ گوندێ (پیرئاڤدەلا) دا پیرعەڤدالی، لەوما ئەڤ جهە ب ناڤێ وی هاتە ناڤکرن و هەتا نها ژی ب ڤی ناڤی یێ دیار و بەرنیاسە.(بنێرە گوندێ ئستپ).

### بنەمالێن گوندی:

مالا سەلیم، مالا حسێن، مالا ئەحمەد.

### کانیێن گوندی:

کانیا بێرکێ، کانیا رەزی (رەزا)، کانیا چەفرە

گوندێ پیرئاڤدەلا



بیبا (بیها: ناڤێ جۆرەكێ دارێ یە)، كانییا بركێ، كانییا سەرۆكانی.

**چیا:**

چیایێ كێرێ.

**هێلانا گوندی:**

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٧٨)زاێ هاتییە ڤالاكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێن وەكی (شێلادزێ، قەدشێ[٧٧]) ئاكنجیكرینە.

## گوندێ خوارێ (خارێ):

ژ گوندێن دەڤەرا (رێكان) بەلیكا (شیڤە رەزا)یە.

**جوگرافییا گوندی :**

**باكووری:** گوندێ (قەسركا)یە.

**باشووری:** گوندێ (بانسرا)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (بێدە)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (جارمەندا)یە.

دووراتی دناڤبەرا گوندێ خوارێ و گوندێ (مەیدان)دا (١كم)ە، و دناڤبەرا خوارێ و گوندێ قەسركێ دا ژی (١كم)ە[٧٨].

**بنەمالێن گوندی :**

بنەمالا جەلال، بنەمالا خەلیل[٧٩].

**كانییێن گوندی:**

كانییا حلولێ (هلولێ) ل باشووری گوندی، كانییا بێبارکێ: سەرۆكانییا وێ ژ گوندێ (قەسركێ)یە، وئەڤە ل رۆژهەلاتا گوندێ خوارێ یە.

سالا (١٩٧٨)زاێ هاتییە ڤالاكرن، خەلكێ گوندی ئینیانە كۆمەلگەهێن وەك (شێلادزێ).

## گوندێ سنجێ:

ژ گوندێن دەڤەرا (رێكان) بەلیكا (مەرزا)یە دو گوندێن (گوندك) و (پیرئومەرا) گرێدای جوگرافییا بەلیكا سنجێ نە، بەلێ گوندێن كەڤن و خرابەنە و بووینە كاڤلە گوند.

**جوگرافییا گوندی :**

**باكووری:** رووبارێ (كونیشكا) و گوندێن (هیش) و (ستپ) و (پیرئاڤدەلا)یە.

**باشووری:** گوندێ (مازی ژێری)یێ یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن (شامكێ ) و (هۆل - هولیان) و (مێرباڤا) و (دەعلكێ) و (رەزگە)یە.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ مازێیێ و گوندێن (مازێیێ) و(هیل) و (ئاوكێ) و (بانسرا)یە.

**پێكهاتا گوندی:**

ژ بنەمالێن زەینەل، بالیل، گوران، سلێمان، حەسەن و حەمێ پێكدهێت.

**كانییێن گوندی:**

كانییا گراڤێ، كانییا رەزا، كانییا سێڤێ (سێڤكێ)، كانییا كانیتوكێ، كانییا مزگەفتێ (گوندكی)، كانییا كولێ.

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا پشتا چەما، شكەفتا باسكێ صەی، شكەفتا گوندكی، شكەفتا بەركۆنا كادینكێ، شكەفتا چالێ، شكەفتا سێنا[٨٠].

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

ژ جهێن ناڤدار ل گوندی: نزارێ سنجێ، دەربێ سنجێ، چیایێ كاكوش، پشت تالیێ، و كانییا سێڤێ و رێلێ زۆمێن خۆش و هوینن.

**جە و شوینوارێن گوندی:**

كاڤلێ دێرێ، بازێرگەهـ، كەڵەكا خزینێ، مزگەفتا سنجێ، دو گۆرستان یێن لێ هەیین.

ل سالا (١٩٧٥)زێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن[٨١]. ئەڤ گوندە ژی ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەڤالاكرن و خرابكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەها شێلادزێ هاتینەئاكنجیكرن.

سنجێ ژوان گوندان بوویە یێن د سەردەمێ شۆرشا گولانی دا هاتییەڤە ئاڤاكرن و ٢٠ خێزان لێ ئاكنجی ببوون، د ناڤبەرا ٢٥/- ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند كەتییە بەر هەوا ئەنفالێن بەهدینان سەر ژنوو گوند هاتەڤە سۆتن و خرابكرن و خەلكێ گوندی مشەخت بوونە كەمپێن پەنابەران ل باكوورێ كوردستانێ[٨٢].

## گوندێ سیتە:

ژگوندێن دەڤەرا (رێكان)ە، ئێكەم گوندێ عەشیرەتا رێكانە ژ گەلیێ (بالندا) دا دەست پێدكەت، ژ بەلیكا (پشتا چیای)یە. دەسپێكێ خەلكێ وێ ل گوندێ (نەهشك)بوویە ل سەراڤا گوندێ سیتە، پشتی كاڤلبووی، خەلكێ وێ هاتینە جهێ نها یێ گوندێ (سیتە) جهوار بووینە.

## جوگرافییا گوندی:

گوندێ (سیتە) د كەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتا عەشیرەتا (رێكان)، ل باشوورێ كۆمەلگەها سیریێ، باكوورێ گوندی دبیتە گوندێ (سیدان) كو ب رووبارێ (ئاڤامارك) سنوورێن گوندی دگەل گوندێ سیدان دهێنە ژێك جوداكرن، باكوورێ رۆژئاڤا گوندێ (رێنجبراخە)یە، رۆژئاڤایێ گوندی گوندێ پێپەرخا و گوندێ (دهیك)ە، باشوورێ رۆژئاڤای گوندێ (پێستەیێ) یە. رۆژهەلاتا گوندی رووبارێ (روویێ شین) سنوورێن گوندی دگەل دەڤەرا بارزان ژێك جوداكەت، هەروەسا گوندێ سیتا دكەڤیتە ناڤبەرا هەردو رووبارێن (روویێ شین) و (مارك) دا، هەڤسنوورێ وێ دگەل گوندێ (هریاشك) چیا و رووبارە و دووراتییا دناڤبەرا وان دا (١٣كم) ە.

گوندێ سیتە



**رامانا ناڤێ گوندی:**

خەلكێ گوندی بۆچوونێن جودا ل دۆر ناڤێ گوندی هەنە:

١- دووڤ گوتنا هندەك ژ خەلكێ گوندی رامناوی (جهەكێ سیبەرە)كو پتریا رۆژێ سیبەر لێ ددەتن لەوما د گۆتنێ سیتا و ئەڤ پەیڤە یا هاتیە كورتكرن بۆ سیتا. لێ ئەڤە رامانەكا لاوازە، چونكی پەیڤا سیبەر و سیتا ژێك جیاوازن.

٢- هندەك دبێژن رامانا وێ ژ دانانا (سیتان) ئانكو: (سیتێن كەوان)هاتیە، ئەڤە ژی رێكەكا نێچیرێ یە كو د كەڤندا گوندی ئەڤ جۆرێ نێچیركرنێ هاتیە بكارئینان.

**پێكهاتا گوندی:**

گوندێ سیتە (سیتا) ژ پێنج بنەمالان پێكدهێت، ئەو ژی: ئویجاخا چومار، ئویجاخا خدرێ، ئویجاخا عیسێ، ئویجاخا شێخكێ، ئویجاخا مەندالی.

**جۆرێن نێچیریێ ل گوندی:**

١- ب رێكا سیتا: ژدارێن: تویێ، هەلهەلۆك، گویزێ ژ دەهـ پارچان پێكدهێت: دو دەپ و دو بالیفە.

٢- ب رێكا داڤان: ژ چلە و دارێن هەلهەلۆكێ و دەرزی: ژ بۆ خاپاندنێ شەما و پێنڤا.

٣- ب رێكا چەكی.

٤- ب رێكا تەلهان.

٥- ب رێكا بێڤان: ژ درێن هەلهەلۆكا وبیبا (بیها) و ب گشتی ئوبەران و ل دوماهیا وەرزێ بهارێ.

٦- ب رێكا نێكان (شوك).

٧- ب رێكا تۆران:

٨- ب رێكا سیلان: مێروخە

٩- دو شاخ: ژ دارێ سپینداری و ئاسنی پێكدهات.

**بیرێن ئاڤێ:**

گوندێ سیتا گوندەكێ دێمە، خەلكێ گوندی باراپتر ئاڤا خو ژ بیرێن ئاڤێ دابیندكر، لەوما ژمارەكا زۆرا بیران لێ هەیە، هەربیرەكێ ناڤەكی هەیە وەكی:

(بیرا ئومەر، بیرا شنیا، بیرا نیڤەكێ، بیرا شەعبانی، بیرا قادر، بیرا ئاڤدەل، بیرا جونی، بیرا شیڤكێ، بیرا مێرویێ، بیرا گای، بیرا بن پەرجانی).

**كانیێن گوندی:**

كانیا نهشك، كانیا دەمێ كانیكێ، كانیا چیایی، كانیا سەرسیلێ، كانیا هرچا، كانیا چنارێ، كانیا بنەبەرا، كانیاسەریركێ، كانیا بابلكێ، كانیا كانی ساركێ.

**چیایێن گوندی:**

چیایێ مام رەشـــا، چیایێ داسیكی ،چیایێ بەزەرێ.

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا مالا، شكەفتا گارانێ، شكەفتا مرێ، شكەفتا مێشەكێركێ، شكەفتاجەمێ، شكەفتا رەشێ، شكەفتا بازیدگرێ، شكەفتا گای، شكەفتا بەزەرێ، شكەفتا كەركا، شكەفتا زێرو، شكەفتا بابەرێ، شكەفتا رۆژە، شكەفتا كون پلنگی، شكەفتادولا، شكەفتا گولە، شكەفتا ئێزدێ، شكەفتا گاڤانەی، شكەفتا شیڤەكیرێ، شكەفتا مصتوی، شكەفتا بەرێ مەمكا.

**بەرێن ناڤدار ل گوندی:**

بەرێ مێوێ، بەرێ كلوخكی، بەرێ كایێ، هەسپا، مەمكا، نێرگزا، كەتیكێن كافری، بەرێ ساڤاری، رونا، رەش ، كیژا.

**شوینوارێن گوندی:**

**١- پرا میر (محەمەد بەگێ ساتی):**

میر (محەمەد بەگێ ساتی): ژ بنەمالەكا بەرنیاس و بەگبوون، ئێك ژ میرێن ساتیا و خەلكێ

گوندێ ساتێ: كو ئێك ژ (٥٢) گوندێن دۆسكی ژووریانە، د بەرپەرێن چوویدا ب بەرفرەهی ئاماژە ب ژیان و سەردەمێ وی هاتییە كرن.

## جوگرافییا پرێ:

ئەڤ پرە دكەڤیتە گەلیێ ئاڤامارك ل سەر رووبارێ (ئاڤامارك) ل گوندێ (سیتە) ل رۆژئاڤا پرا (ئاڤا مارك).

مێژوویا چێكرنا پرێ نە هاتییەزانین، لێ وەكی دیاربووی میر (محەممەد بەگێ ساتی) ئاڤاكریە و سالا (١٧٠١ز)ێ میر محەممەد میرێ هەكارێ بوو[٨٦]، لەوما دۆرنابینین ل دەسپێكا سەدسالیا هەژدێ زابینی هاتبیتە ئاڤاكرن.

## پیڤانێن پرێ:

درێژاهیا پرێ (٣٠م)ە، دناڤبەرا هەردو كوچان دا (١١م)ن، ئەو كوچا مایی فرەهیا وێ (٤،٨٠م)ە، درێژاهیا وێ (٤،١٠م)ە، بلنداهیا وێ (٢،١٠م)ە، ئەو بەرێن دانایینە پرێ وەكی حێسیلانە كو ئێك ژوان درێژاهیا وی (٨٨سم)ە، و بلنداهیا وی(٦٠سم)ە[٨٧].

## هەرفتن وخرابیوونا پرێ:

سالانە ئەڤ پرە ژ ئەنجامێ لەهیان دهاتەهەرفتن و نووژەنكرن، پشتی محەممەد بەگێ ساتی پەزێ خو نەدئینا كانیێن (میران)، هەر ب ئێكجاری نەدهاتە نویژەنكرن، سەردەمێ (تەتەر- تەتو) ئاغایێ رێكانی و (سیتو) ئاغایێ ئۆرەماری رابوون پرا ماركی ب ئەندازەیەكا باشتر و موكومتر و بلندتر ل دانكا وێ پرێ چێكر، ئانكو ل رۆژهەلاتا پرێ[٨٨].

### ٢- پرا ئاڤامارك:

پرا مارك ژ ئالیێ رۆژئاڤا ڤە (ڤەكولەر ١ / ٨ / ٢٠١٤ز).

ئەڤ پرە دكەڤیتە باكوورێ گوندی ل سەر زێیێ مارك، تاكە پر بوو بۆ دەربازبوونا خەلكی ژ ئاڤێ بۆ ئامێدیێ، نها یا هەرفتی و تنێ كوچكەكا مایی، پر یا ژ

پرا مارك ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە



بەرا و كسلێ هاتییە چێكرن، فرەهیا كوچا باكووری نێزیكی (٤م)یە، بلنداهیا پرێ (٤،٩٥م)ە، ستویراتیا كوچا پرێ (١٥م)ە، و بلنداهیا كوچا وێ (٣،٢٥م)ە، و ژ (١٤) ریزە بەران پێك دهێتن، كوچا باشووری یا پرێ ل سەر كەڤرەكێ مەزن هاتییە چێكرن.

## - چێكرنا پرێ:

دەمێ چێكرنا ڤێ پرێ ڤەدگەریتن بۆ داویا سەدساليا نوزدێ و دەسپێكا سەدساليا بیستێ، پشتی پرا (محەمەدبەگێ) ژ ناڤچووی، ل دووڤ گۆتنا دانعەمران بۆ چێكرنا پرێ دەست ب دانانا بناغێ وێ هاتەكرن، كوچكا لایێ سەری هەمی وەكی عوقدەكێ مینا پرا دەلال ب بەرا هاتبوو چێكرن، لایێ بنی ژی بەرەكێ زۆرێ مەزن ل رەخێ رووباری بوو وەكی دیوارەكێ بچویك ل سەر هاتییە چێكرن كو بهێتە راستا كوچكا دی ژلایێ هۆستایەكێ مەسیحیێ تیاری ڤە دیوارێ وێ هاتبوو نژنین، خەلكێ دەڤەرێ بەشداری د ئاڤاكرنا وێ دا كربوون، ژ كەرەستەیێن پر پێهاتییە دروستكرن بەر و كسل و گاریتە بوون، گاریتێن وێ ژگوندێ (سیدا) دئینان، بۆ كسلێ ژی چەندین هێتوین سۆتن و ب پێنج هەیڤان پرە ب داوی ئینا، پشتی چەند سالەكان ژبەر لەهییان هەرفت، جارەكادی ل سالا (١٩٣٤)ێ هاتە نویژەنكرن و سێ هۆستا كو ژ ئامێدیێ بناڤێن (حەكیم و ماهر و تاهر) ئینابوون دگەل خەلكێ دەڤەرێ كو هێتوینێن كسلێ چێكرن و گاریتێن شەش قاهیمە ل سەر دانان و دارێن مازیێ وەكو دەپەبەندی هاڤێتنێ ودروستكرەڤە سالا (١٩٧٢ز)ێ جارەكادی هەرفتەڤە و ئاڤاكرنە ڤە، ل سالا (١٩٧٧ز)ێ پشتی پرا ئاسنی ل دانكا وێ هاتییە دروستكرن، ئەڤ پر هاتە پشت گوە ئێخستن.

## پیڤانێن پرێ:

درێژاهیا وێ (٢٧،٢٠م)، دناڤبەرا هەردو كوچكان (١٢،١٠م)، درێژاهیا كوچكا كڤانەی (٧،٩٠م)، فرەهیا وێ (٤،٨٠م)ن، بلنداهیا وێ (٥م)، و بلنداهیا كڤانەیا وێ ژی ئانكو عوقد (٣،٢٠م)، بەرێن وێ ژ بنی مەترەكێ درێژن و (٦٣سم) بلندن، گەر بۆ گەرێ ژی بەرێن بچویكتر لێ هاتینە دانان، كوچكا بەری ژی ب بلنداهیا (٩،٥٠م) و فرەهیا (١٥م) ئێك مەتر ژی هاتییە دیواركرن، (٤،١٠م) فرەهیا دیواری نە و (٤م) ژی درێژاهیا وێ یە.

## ٣- پرا كوچكا:

پرەكا كەڤنارە و وەكی شوونوارێن دەڤەرێ یا مای، دووڤ گۆتنان سەردەمێ شێخۆمەر ئاغایێ هەركی هاتبوو چێكرن، دەڤەرێن (رێكان – گوندێ سیتە)و (بارزان- گوندێ بالندا) پێكڤە گرێددان، تنێ ئێك كوچك ژێ مایە و ئەو ژی بەرەڤ هەرفینە، سەردەمێ (ئوسمانی)یا هاتییە چێكرن.

ل دووڤ بۆچوونا دانعەمرێن گوندێ سیتەی دبێژن شێخۆمەر ل سەر كیستێ خۆ چێكرییە، دا بشێن پەزێ خۆ ب ساناهی بەرەڤ زۆزانان دەرباز بكەن و هێتوینێن كسلێ هەر ل وێرێ هاتبوونە چێكرن و جهێ وان هێتوینان هێشتا یێ دیارە، ب بەرێن بازی و كسلێ هاتییە چێكرن، نڤیسەر (محمد عەبدوللا ئامێدی) وێ چەندێ پشتراست دكەت كو پرەكا كەڤنارە و ڤەدگەرێتەڤە بۆ سەردەمێ ئوسمانییان و بەری پرا كەلیا ژی هاتییە چێكرن، دیسان دبێژیت: من گوهـ لێ بوویە كو شێخۆمەر یا چێكری، وی دەمی گوندێ سیتەی نەهاتبوو ئاڤاكرن ئەگەر دا ب ناڤێ وی هێتە ناڤكرن.

ل دۆر ناڤكرنا پرێ وەسا هاتییە گۆتن كو ل سەر كوچا هاتییە ئاڤاكرن لەوما ب وێ چەندێ هاتییە ناڤكرن. پر ل سەر پێنج كوچكان هاتبوو ئاڤاكرن، سێ ژ وان سەر ئەردێ گوندێ سیتەی، ئێك ل سەربەرەكێ دناڤا رووباریدا، یا دی ژی ل سەر بەرەكێ مەزن كو تنێ جهێ گاریتا هاتبووچێكرن ژئالیێ دی یێ ئاڤێ كو دەڤەرا بارزانە، پرە ژ (پێنج) بەنگا پێكهاتبوو، هەر بەنگەیەك نێزیكی (دەهـ) مەتران بوویە، هەر بەنگەیەك ب گاریتێن مەزن و ستویر هاتبوونە تانكرن (تهانكرن)، پر ب بەرێن بازی

و كسلێ و سەر ڕووبەرەكێ بەرفرەهـ هاتییەئاڤاكرن كو ئاڤ ژلایێ سەری كارتێكرنێ لێ نەكەتن مینا سێ گۆشەیەكی هاتینە چێكرن، ئاڤ ژ هەردو لایاڤە دبەررا دچوو دانەبیتە ئەگەرێ شكەستنا وان ئەو بەرێن ل بنێ كوچكان هاتینەدانان، زۆر مەزنن و نێزیكی (٦٠سم) و درێژاهیا (١) مەترانە رێزا دووڤدا بچووكترن، ب هەمان شێوە هەتا كو سەرێ كوچكێ بەرێن بچووكتر دانانە، لێ هەمی كوچك ژ ئەگەرێ سەقای ژ ناڤچووینە، تنێ ئێك ب بلندیا (٥،٥٠سم) ستووریا وێ (١٤،٢٠سم) یا ژێ مای، ئەو ژی یابەرەڤ نەمانێ دچیتن خراببوونا ڤێ پرێ ڤەدگەریتن بو سالێن دناڤبەرا (١٩٤٥ و ١٩٤٧ز) ێ دا[٨٩].

**٤- شەخسێ ب كنجر:**

كاڤلەكە، ل رۆژهەلاتێ گوندی، چ ژێ نەهاتییە زانین، چ كەسە یێ كێژ سەردەمیە؟.

**٥- شوینوارێ ستوینێن مزگەفتێ.**

**ئەنفالكرینێن گوندی:**

گوندێ سیتە ئێك ژ وان گوندان بوو یێن د سالێن هەشتییاندا دكەڤتە دەڤەرێن ژێر دەسەلاتێ شۆرشێ و هاتبووڤە ئاڤاكرن و ٧٠ مال لێ ئاكنجی ببوون، سالا ١٩٨٨ێ كەتە بەر هێرشێن حكۆمەتا عیراقێ و هژمارەك ژ خەلكێ گوندی هاتنەئەنفالكرن و هەتا نها ژی ب دەهان د بێ سەروشوینن، ئەڤە ژی ناڤێن وانن:

**ئویجاخا چومار:** جانگیر ئەسعەد مرادخان (ژدایكبوون ١٩٣٩/٧/١)، مرادخان جانگیر ئەسعەد (ژ دایكبوون ١٩٦٠)، هاشم جانگیر ئەسعەد (ژ دایكبوون ١/١/ ١٩٧٢)، عەزیز كامل ملحەم (ژ دایكبوون ١٩٦٥)، جەمیل كامل ملحەم (ژدایكبوون ١٩٦٩)، تەیب فەریق مرادخان (ژدایكبوون ١٩٥٤)، یوسف فەریق مرادخان (ژدایكبوون ١٩٤٧)، فەهمی شوكەت تەیب (ژدایكبوون١٩٧٢).

**ئویجاخا شێخكێ:** تەمەرخان عادل صام (ژ دایكبوون ١٩٤٣)، میرخان تەمەرخان عادل (ژ دایكبوون ١٩٧٣)، مەحمود تەمەرخان عادل (ژ دایكبوون ١٩٧٠)، بەیاز عادل صام (ژ دایكبوون ١٩٥٣)، محمد بەیاز عادل (ژ دایكبوون ١٩٧٣)، ئەحمەد بەیاز عادل (ژ دایكبوون ١٩٧٢) ، صالح بەیاز عادل (ژ دایكبوون ١٩٧٢)، سەعدوللا سەعدوللا عادل (ژ دایكبوون ١٩٦٤).

**ئویجاخا مەندالی:** داود عومەر، عەبدوللا ئیسماعیل محەممەدصالح (ژ دایكبوون ١٩٥٤).

**ئویجاخا عیسێ:** ئیسماعیل بادر كابائیس (ژدایكبوون ١٩٦٣)، بازید صەدیق حامد (ژدایكبوون ١٩٧١)، خورشید صەدیق حامد (ژدایكبوون ١٩٥٦)، مامەند ئەمیر حامد (ژدایكبوون ١٩٥٥).

**ئویخاخا خدرێ:** رەمەزان عبدالهادی شینو (ژ دایكبوون ١٩٦٤/٥/٧)، زیاب عبدالهادی شینو (ژ دایكبوون ١٩٦٦/٩/١ )، صادق عەبدولهادی شینو (ژ دایكبوون١٩٦٨/٤/٢)، قاسم عبدالهادی شینو (ژ دایكبوون ١٩٧٠)، خالد ئیبراهیم خاجە (ژ دایكبوون ١٩٧٢)، مستەفا شێخومار مستەفا (ژ دایكبوون ١٩٧١)، شێخومار مستەفا رەشید (١٩٥١)، ئاڤدەل شێخومار مستەفا (ژ دایكبوون ١٩٧٠)، خضر كەرەم محەممەد (ژ دایكبوون ١٩٥٦)، عبدالقادر شینو قادر (ژ دایكبوون ١٩٥٠)، عوسمان مسیح كەكو (ژ دایكبوون ١٩٥٦)، مەرعان كەرەم محەممەد (ژ دایكبوون ١٩٥٣/٧/١)، خەلیل نصرالله خاجە (ژ دایكبوون ١٩٦٥)، شوكری نصرالله خاجە (ژ دایكبوون ١٩٦٩)، شاهین مستەفا رەشید (ژ دایكبوون ١٩٥٢)، خاجە نەسروللا خاجە (ژدایكبوون ١٩٧٥)، عەبدولرەزاق سەعید حەجی[٩٠].

## گوندێ رەزگە:

رەزگە: دكەڤیتە رۆژهەلاتێ عەشیرەتا رێكان، و ژبەلیكا (مەرزا)یە.

**جوگرافیا گوندی:**

**باكووری:** گوندێ (پیرەسنا- پیرهەسن)ایە.

**باشووری**: گوندێ (میرباڤا)یە .

**ڤۆژهەلاتی**: گوندێ دەعلکێ و گوندێ هولی (هولیان)ە.

**رۆژئاڤایی**: گوندێ (شامکێ)یە.

## پێکهاتا گوندی:

بنەمالا زاهێر (ئاغایێن عەشیرەتا رێکان) کو بنیات و بنەرها وان خەلکێ گوندێ (خالکا - رێکان)ە، بنەمالا میرخان، بنەمالا عەدێ، بنەمالا عەمەر (عومەر).

## رامانا ناڤێ گوندی:

ناڤێ رەزگە ژیەیڤا (رەشگەه) هاتیە، ئانکو بەفر زوی د حەلیێت و نامینت و گوند هەر زوی رەش دبیت ژبەر جوگرافیا گوندی بەرۆژە[91].

## کانییێن گوندی:

گوند یێ ب ئاڤە، زۆر کانی لێ هەنە، لەوما گوند ب چاندنا برنجی و گەنمۆکێ و ماشا و کونجیا و گارسی و ئەرزن و هەمی بەرهەمێ ئاڤی یێ ناڤدارە، ژ کانیێن گوندی: کانیا رەنگین جهەکێ هوین و خۆشە، ب شێوەیێ ئاڤد (کڤانەیی)یە، کانیا بیشکێ، کانیا فەقیا، کانیا سلەیمینێ.

## شوینوارێن گوندی:

ل ژێریێ گوندی بەرەکێ مەزن وەکی ژوورەکا بچویك هەیە، ژ ناڤدا هاتییە نکراندن و چارچوڤێ دەرگەهی ب شێوازەکێ ئەندازیاری هاتییەدروستکرن، دبێژنێ (تەمتەمینك- ناوسك).

دیسا تا نها شوینوارێن بورجا قەسرا رەزگە یێن ماین.

## شکەفتێن گوندی:

شکەفتا هەشتا، شکەفتا دەریێ بەرازا، شکەفتا تەمتەمینك[92].

## ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ بوو، هەروەسا خودانکرنا ئاژەلان، نها زۆربەیا خەلکێ گوندی ل شێلادزێ و سیریێ و هندەك ل دهۆکێ دئاکنجینە.

گوندێ رەزگە



سالا ١٩٧٧ێ بۆ یەکەمین جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، سالا ١٩٧٨ێ ژبەر ڤالاکرن و ڤەگوهاستنا گوندێن دەڤەرێ ئەڤ خواندنگەهە ژی هاتەگرتن.

رەزگـە ژی ژ وان گوندان بـوو یێن د سالێن هەشتێیاندا هاتییەڤەئاڤاکرن و ٢٠ مال لێ ئاکنجی ببوون، ئەو ژ کەتە بەر ئەنفالێن بەهدینان و خەلکێ وی مشەختبوونە کەپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ[٩٣].

## گوندێ ئەرتش:

ئەرتش: ژ گوندێن دەڤەرا (ڕێکان)، بەشێ (ئاڤی) و بەلیکا (ڕووبار)ی یە، پێنج کیلومەتران ژ گوندێ (هوس)دوورە[٩٤].

### جوگرافییا گوندی:

**باکووری،** گوندێ (ڕێشمە)یە.

**باشووری،** گوندێ (بێزەل)ە کو دووراتی دناڤبەرا وان دا (١٠کم)ە[٩٥].

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (زێوکێ)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (بێبو-ئێك ژگوندێن نێروەیی)یایە.

### پێکهاتا گوندی:

ژ سێ بنەمالان: بنەمالا بابکێ، بنەمالا سێڤا، بنەمالا تەمەرا پێکهاتییە.

### کانیێن گوندی:

(ئەرتش) سێ کانی هەنە، هەر سێ ب ڕێز ب دووراتییا (٦٠ تا ٧٠)م ژ ئێك دوورن و ژ لایێ باکووری بۆ باشووری دەستپێدکەن:

- کانییا دەرمزگەفتێ یان (دەرحەدێ).
- کانییا ژنان: تایبەت بوو بۆ ژنان و بالاڤان.
- کانییا مێران ئانکو (زەلامان) : چونکی یا تایبەت بوو ژ بۆ کارۆبارێن زەلامان.

دو کانیێن دی پیچەك ژ گوندی ڤەدەربوون، ل باکووری ڤە کانییا (بوتکێ)، و ل رۆژئاڤای ڤە کانییا

تەمتەمینکا ئانکو (ناوسکا) گوندێ ڕەزگە



(گویزکێ) کوجهێ مەخەلا پەزێ گوندییان بوو[٩٦]، هەروەسا تاخەك ل گوندی ب ناڤێ تاخێ (زێوا) هەیە کو جهەکە بۆ کرنا برنجی و کونجیا و دەرامەتێ ئاڤی، تاخەکێ دیتر ژی د بێژنێ تاخێ (دەرنێ).

**شکەفتێن گوندی[٩٧]:**

شکەفتا بەرایێ، شکەفتا دولامنکا، شکەفتا میر.

ئەڤ گوندە ژی ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی هاتینەڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهان.

ئەڤ گوندە ژ وان گوندان بوو یێن ل سەردەمێ شۆرشا گولانێ هاتینەڤە ئاڤاکرن و بەری ئەنفالا بەهدینان ل ١٩٨٨ێ ٤٢ مال ل ڤی گوندی دژیان، د ئەنفالاندا ئەو ژی کەتە بەر هێرشا رژێمێ و گوند هاتەسۆتن و خرابکرن و خەلکێ وی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ و هەتا نها ژی گوند نەهاتییەئاڤاکرن[٩٨].

## گوندێ بەنستان

بەنستان: ئێك ژ گوندێن دەڤەرا (رێکان)، پشکا (دێم) بەلیکا (خالکا)یە.

**جوگرافیا گوندی:**

**باکووری:** زۆما سەرێ دارێ، گوندێ چێی (گوندەکێ دۆسکی ژووری یانە).

**باشووری:** گوندێ بێلانێ، گوندێ رزێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کێریادێرێ، گوندێ مامیسا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مروانس.

**پێکهاتا گوندی:**

- بنەمالا نەقشەبەندی (مالا شێخی): ئەڤ بنەماله هەر ژ کەڤن دا ل سەردەمێ (شێخ تاهر نەقشەبەندی کورێ مەلا حاجی بەنستانی) چووینە ئامێدیێ، ژ وێرێ چووینە بامەرنێ.

گوندێ ئەرتش



- بنەمالا مام گولی: ژ کەڤندا چووینە دەڤەرا سندیيا ل زاخۆ و لێ جهوار بووينە، نێزيكی (١٦) گوند هەنە، ب بنەمالا (پیری) ژی دهێنە ناڤكرن[٩٩].
- بنەمالا مال باپیری (مالا مەلای، مالا شیڤكێ)، بنەمالا مال ژووری (مالا زێندێ، مالا عەلیێ، مالا خدرێ، مال ژێری)، بنەمالا مەلا شێخ، بنەمالا سەركانیێ، بنەمالا مال مامكی.

**ڕامانا ناڤێ گوندی:**

(بەنستان) پەیڤەکا کوردی یە ژ دو برگەیان (بەن + ستان): (بەن) ئانكو (بەنۆك): كو دارەكا دێمی یە و ل چیایی شین دبیت، قورمێ وێ یێ ستووره و وەكی دارا بەڕوییێ بلند دبیت، بەرێ دارا بەنۆكێ دبێژنێ (كەزان). و (ستان) ژی ب ڕامانا (وار، جهـ، وەلات)، ئانكو بەنستان دبیتە جهێ یان وارێ كەزانان[١٠٠].

**كانیێن گوندی:**

كانیيا كانی: تايبەت بوو بۆ ژنان. كانیيا كانیك (ئاڤد) بوو ئانكو یا خودان كڤانەیی بوو، و یا تايبەت بوو ژ بۆ زەلامان. كانیيا شیڤكا پیر خدر.

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا گوندی، شكەفتا كێرخەی.

**بیرێن گوندی:**

ئەڤ بیرێن ئاڤێ یێن گوندی دكەڤنە ل (سەرێ دارێ)، كو جهەكێ خۆش و زۆمە: بیرا مالا، بیرا فەلەی، بیرا بن بیهێ، بیرا چێلا.

مێرگێ ژی ئاقارەكە سەر ب گوندێ (بەنستان) ڤە دهێتە هژمارتن، و هندەك خرابە گوند سەر ب گوندێ (بەنستان)ن، ژ وانا:

-**گوندێ بێبشرێ**، گوندەكێ گەلەك كەڤنە، جهەكێ شوینواری یە، كەلا (بێبشرێ) ل ڕۆژئاڤایێ گوندی یا لێ هەی.

گوندێ بەنستان



**کانیێن گوندی:**

کانیا بێبشرێ، کانیا گێزگر (ئاڤا ڤێ بەرەڤ گوندێ مروانس دچیت، و ئاڤا کەلا بێبشرێ ژ ڤێ کانیێ دهاتەبرن)، کانیا شیڤا ئاقارکی کو ژبەر جهێ خۆشێ وێ دبێژنێ ئاقارکێ بەهەشتێ.

**- گوندێ بلبل:** کەڤنە گوندە، شوینوارێن دێر و مزگەفتێ یێن لێ هەین، کانیا بلبل دکەڤیتە باشوورێ گوندی، شکەفت یێن لێ هەین وەك (شکەفتا بن نزاری، شکەفتا ئاسێ)، و کانی ژی ب ناڤێ (کانیا کەوا)، دو کانی ب ڤی ناڤی هەنە، ل رۆژئاڤا گوندی گۆرێن دو برایان ب ناڤێن (صالح و رەش - رەشید) یێن لێ هەین، ل رۆژهەلاتێ گوندی زەڤیەك ب ناڤێ (خارێ میرا : کو جهێ میرێن کەلا بێبشرێ بووینە) هەیە.

**-گوندێ دێرکێ:** گوندەکێ کەڤنە، لێ گوندێ (بلبل) کەڤنترە، لەوما ب ناڤێ کەسەکێ بلبلی ناڤکریە کو دبێژنێ (دێرکا ئالێ: ئالێ خەلکێ گوندێ بلبل بوو)، شوینوارێ دێرەکێ یا لێ هەی، لەوما ناڤێ گوندی ژی بوویە (دێرك).

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا دێرێ، شکەفتا سەرحەلانکا، کانیێن گوندی: کانیا سارکێ، کانیا هەسپا: کانییەکا بۆشە و بۆ چاندن و ئاڤدانێ دهاتە بکارئینان، کانیا خارپیشکێ[١٠١].

**- گوندێ بێللان (بێدلان):** کانیا بێللان یا لێ هەی، و شوینوارێ دێر و مزگەفتێ ژی یێن لێ هەین، واتە نیشانە کو دبەرێ دا فەلە ژی یێن لێ ژیاین.

هەژی یە بێژین کەلایەك ل وەلاتێ مسرێ ب ناڤێ کەلا کوردێن بەنستانیا یا هەی (قلعة الأكراد البنستانيين)[١٠٢]، دیسا ل نێزیك گوندێ (ئالوشێ) سەر ب عەشیرەتا (گویی)ڤە گۆڕستانەك ب ناڤێ (گۆڕستانا بەنستان) هەیە، هەروەسا ل نێزیك هەمان گوند گرکەك ژی ب ناڤێ (گرکێ بەنستان) هەیە[١٠٣].

**شوینوارێ کەلا بێبشرێ**



## جهـ و شوینوارێن گوندی:

### ١- کەلا بێبشرێ:

ئێك ژ کەلایێن گرنگ و دیرۆکی بوویە، کو ژ ناڤدارترین جهێن شوینواری یێن گوندی یە، کەلایەکا کەڤنار یا سەردەمێ میرگەها بەهدینان بوویە.

**- سنوورێ جوگرافی یێ کەلایێ :**

سنوورێ کەلایێ ژ ئالیێ جوگرافی ڤە ب ڤی رەنگی یە:

**باکووری:** چیایێ سەرێ دارێ (بەنستان)، چیایێ دێنیکێ مروانس.

**باشووری:** گوندێن (بێبشر و بلبل و دێرکێ) و گوندێن (دهیکا رۆژهەلات ) و (رزێ).

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەنستان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مروانس.

**- جهێ کەلایێ:**

کەلا دکەڤیتەسەرێ چیایێ هنداڤی گوندێ (بێبشرێ) کو ئێك ژ گوندێن (بەنستان) ل دەڤەرا رێکان دهێتە هژمارتن، هەر ژ نەمانا میرێ بێبشرێ تا نها ئەڤ گوندە هاتییە چۆلکرن، ل دووڤ زانیارییێن ژ دانعەمرێن گوندێ بەنستان هاتینە وەرگرتن کو خەلکێ گوندی تووشی ئێشەکا گران ببوون و ب ئێکجاری مربوون !.

**-ئاڤاکرنا وێ و ناڤێ وێ د ژێدەرێن دیرۆکی دا:**

یەکەم جار ناڤێ وێ د پەرتووکا (شەرەفنامە)دا هاتییەنڤیسین:

کەلا (بشری) دکەڤیتە عەشیرەتا (رادکانی)، کەلەك ژێدەرێن دیتر ناڤێ کەلایێ ئینایە، لێ وان ژی نەگۆتیە کەنگی هاتییە ئاڤاکرن؟، تنێ ژ زاردەڤێ چەند دانعەمرێن گوندێ بەنستان هاتییە کو ناڤێ میرێ کەلایێ (میر بادین) بوویە، چ زانیارییێن دی نەبوون تنێ ژبەر وێ یەکێ کو ل دانگا کەلایێ ژی کاڤلەکێ هەی ب ناڤێ گۆڤا (میر بادین) کو دبێژن ئەوژی یا وی بوو، ئەگەر بنێرینە سەردەمێ ناڤ ئینانا کەلایێ د

شوینوارێ مزگەفتا گوندێ (بەنستان)



شەرەفنامەیێ دا کو (١٥٩٧ز)بوویە، ئەڤە سەردەمێ میرێ بەهدینان، سۆلتان حسێن بەگ کورێ حەسەن بەگ (-١٥٣٤ ١٥٧٦) بوویە کو ب (حسێن وەلی) ژی بەرنیاسە. بەلێ دیرۆکا کەلا بێبشرێ گەلەك ژ سەردەمێ وی کەڤنترە.

**ئەو کەرەستێن کەلا پێ هاتییە ئاڤاکرن:**

کەلا (بێبشرێ) ژی ژ بەرێن بازی و کسلێ هاتبوو ئاڤاکرن، ژ دو خانیێن مەزن و چوارێن بچووك پێکدهات، ب گاریتە و دار و ئاخێ ب ئەندازیارییەکا جوان و باش هاتبوو نهانکرن، لێ ژبەر کو کەلا (بێبشرێ) جهێ وێ ل سەرێ چیاییە و بەرخوار و پتریا وێ کەڤربوو لەوما تا نها ب تنێ ژ لایێ ژێری و رۆژهەلاتێ ڤە دیوارەك لێ مایە و د ناڤدا ژی چەند دیوارەکێن بچویك لێ مابنە، دهێتە گۆتن تا سالێن دناڤبەرا سیهان و چلاندا پتریا ئاڤاهی وەك خۆ مابوو، تنێ ئێك رێك ژلایێ باکووریڤە دچیتێ کو ل وی دەمی دا وەکو دەرەجکا هاتبوو چێکرن و دەوار تێرا دبرن، لێ نها ب دەست کەڤر دچنە دناڤا وێ دا، ئاڤا کەلایێ ژی ل کانییا (گێرگز) ل چیایێ بەنستان ب رێکا سولینێن ئاخێ ئینا بوو.

**٢- مزگەفتا گوندی،**

**٣- کاڤلێ مەزارێ پیر خدر (خضر)،**

## هێلانا گوندی:

بەنستان ژ گوندێن رێکانیان بوویە کو ل رۆژا شەمبی (١٩٧٨/٦/٢٤ز)[١٠٤]ێ هاتییە سۆتن و وێرانکرین، خەلکێ وی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهێن (شێلادزێ و سیریێ).

## گوندێ بلبل[**]:

ئێك ژ گوندێن هۆزا رێکانە ل سەر سنوورێ (عیراق - ترکیا)، گۆندەکێ گەلەك کەڤنە ، و شوینوارێن دێر و مزگەفتێ بێن لێ هەین، هەر چەندە سرۆشتێ وێ دێمی یە بەلێ هندەك کانی ژی یێن لێ هەین ژ کانیێن وێ: کانیا بلبل دکەڤیتە باشورێ گوندی،

گوندێ وەرەخەل



و (کانیا کەوا) کو دوو کانی ب ڤی ناڤی هەنە، و شکەفت ژی یێن لێ هەین وەك (شکەفتا بن نزاری، شکەفتا ئاسێ...)، و ل رۆژئاڤا گۆندی گورێن دوو برایان یێن لێ هەین بناڤێ (صالح، رەش/ رەشید)، و ل رۆژهەلاتێ گوندی ژی زەڤیەك هەیە بناڤێ (خارێ میرا، کو جهێ میرێن کەلها بێبشرێ بووینە)، لێ نەهاتیە زانین کا چ میر بووینە و ل چ سەردەم بوویە؟، کو هەژی یە بێژین کەلا بشری (بێبشرێ) ئێك ژ کەلهێن دیرۆکی بوویە ل گوندێ بەنستان و مێژوونڤیسێ کورد شەرەفخانێ بەدلیسی ژی دپەرتوکا خو (شەرەفنامە)یێ دا ئینایە ئەوا کو ل سالا (١٥٩٦/١٥٩٧)ز)نڤیسی ناڤێ وێ ئینایە ئەڤ گوندە بێ خرابەیە و کەلەك ژ مێژە هاتیە بەردان و بوویە پارچەك (وەك تاخەکێ) بۆ گوندێ بەنستان.

## گوندێ وەرەخەل:

### جوگرافییا گوندی:

ژ گوندێن (رێکان) بەلیکا بەرسیکیانە، دەردۆرێن وی گوندێن سوریان و هریاش و باوان و خالکا و رزێ و دهیك و شابەکەما و دەعلکێ و رەزکە و مێریەڤا و سنجێ و شامکێ و مازیێ، سرۆشتێ وێ دارێن: داربەری، دار مازی، کەزان، گوهیشك.... یێن لێ هەین.

### پێکهاتا گوندی:

ئویجاخا ئالێ ئیسڤی، ئویجاخا گراڤی، ئویجاخا هاجووت. هەرسێ ئویجاخ دبنەرەتدا بنەبابەکن، دەمێ ئەنفالا (١٩٨٨)ز)ێ رویدای گوند ژ (٢٠٠) سەرۆك خێزانان پێکهاتبوو، نها بووینە ٣٠٠ سەرۆك خێزان، (٨٠) کەس ژوانا د ئەنفالاندا بێ سەروشوین بووینە[١٠٥]، پتریا مالێن وان ل دهۆکێ و باگێرانە و چەند مالەکێن کێم ل کۆمەلگەها (سیریێ) نە.

### کانیێن گوندی[١٠٦]:

کانیا گونی، کانیا بن قەصرێ، کانیا بێکێمژێ، کانیا بەرچەلێ، کانیا مارا، کانیا گیزا (گویزا)، کانیا رێلکێ، کانیا بیکێ.

### چیایێن گوندی:

چیایێ سەرکەلوتکێ، چیایێ سەرێ کێلیێ،چیایێ چەلێ وەرەخەل.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا دویێ، شکەفتا زێرو.

ئەڤ گوندە ژی وەك گوندێن دیترێن دەڤەرێ ل سالا ١٩٧٨ێ هاتیەکاڤلکرن و خەلکێ وی هاتیە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهان.

ئەڤ گوندە ژی ل سەردەمێ شۆرشا گولانێ هاتیەڤە ئاڤاکرن و بەری ئەنفالا بەهدینان ل ١٩٨٨ێ ٣٤ مال ل ڤی گوندی دژیان، کەتە بەر هێرشا دوژمنی و هاتەسوتن و خرابکرن و خەلکێ وی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ و هێژ گوند نەهاتیەئاڤاکرن[١٠٧].

## گوندێ ئاوکێ[١٠٨]:

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان)ە، بەلیکا ئاڤی (رووباری)یە، گوندەکێ کەڤنارە و کەلایەکا کەڤنا دیرۆکی ب ناڤێ (ئاوکا خراب)یا هەی، دەسپێکێ خەلکێ گوندی ل ویرێ ئاکنجیببوون، ل ڤان دووماهیان گوندێ خۆ ل چەمی ئاڤاکربوو، هەتا سالا (١٩٧٨)ز)ێ ڤەگوهاستنە کۆمەلگەهێن نوی ئاڤاکری و نەخاسمە سیریێ و هندەك ژی ژوانان ل سەنتەرێ پارێزگەها دهۆکێ دئاکنجی بووینە.

### جوگرافی یا گوندی:

**باکووری**، گوندێ (بانسرا)یە.

**باشووری**، گوندێ (هیل)ە.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ (سنجێ)یە.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ (رێشمە)یە.

### بنەمالێن گوندی:

بنەمالا زیاب، بنەمالا ئاڤدەل.

**کانیێن گوندی:**

کانیا ئاوکا خراب، کانیا چنارکێ، کانیا پیر ئومەرا، کانیا دوی پرێ.

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا خزنێ، شکەفتا کەڤرێ کەنیرێ، شکەفتا کویرکێ.

**چیایێن گوندی:**

چیایێ لاتێ، چیایێ ئاشیش.

گەلەك دارێن بەردار ل گوندی هەبوون وەك: گویز، چنار، بەروی، مازی، کەڤۆت. ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دەرامەتێن ئاڤی بوو زێدەباری خودانکرنا پەز و مالاتی[109]. گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەکاڤلکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهێن شێلادزێ و سیریێ.

## گوندێ زێوکێ:

زێوکێ ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان) و بەلیکا ئاڤی (رووباری)یە، خەلکێ وی ژیانا خۆ ب رێنجبەریێ و جۆتیاریێ ڤە دبۆراند، سالا ١٩٧٨ێ کەتنە بەر ڤەگوهاستنێ و ل کۆمەلگەها سیریێ ئاکنجیکرینە[110].

**جوگرافییا گوندی:**

**باکووری:** چیایێ ئاشیشە کو چیایەکێ ب ناڤ و دەنگە.

**باشووری:** چیایێ سەرێ هورێ یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (هیل)و(هورە)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (ئەرتش)ە. کو ئەڤ گوندە سنوورێ عەشیرەتێن رێکان و نێروە عولیا ل هەڤ جودادکەتن .

**پێکهاتا گوندی:**

هەر ژ کەڤندا گوند ژ دو تاخان (نزاری و بەرۆژی) پێکدهات، و هەر تاخەك چەند بنەمالەك بوو، تاخێ بەرۆژی چوار بنەمال بوون و تاخێ نزاری سێ بنەمال بوون.

بنەکۆکا خەلکێ گوندی وەکی دهێتەڤەگێران

گوندێ زێوکێ



ڤەدگەریتەڤە بۆ سێ بران، سەرەدەمێ میرگەها بەهدینان ژ دەڤەرا (شویکە- باکوورێ کوردستانێ) هاتینە، ئەو سێ برا هاتبوونە چیایەکێ ناڤبەرا گوندێن هیش و ڕێشمە، هندەك هاتن پەزێ نێرەوەییا دزی، ئەوان ژی ل چیای ژێ وەرگرت و برایەکێ وان ژی هاتە کوشتن، دەنگ و باس بۆ میری چوو، گوتنێ سێ کەسا ئەو تالانی زڤراندی، میری هنارت دووڤ وانرا و گۆتێ : هەوە دەستویری یا هەی هەر جهێ هەوە بڤێت لێ ئاکنجی بن، ئینا هاتنە ل زێوکێ کو کاڤلە گوند بوو جهوار بوون، ئانکو بنەمالێن گوندی ژ وان دو برانە و نها ب ڤی ڕەنگی دابەشکرینە:

١- بنەمالێن کانیا.

٢- بنەمالین پێکڤە گرێداین: -١ بنەمالا حەسێ و حێری -٢ بنەمالا سیڤا -٣ بنەمالا حەجی بالند ٤ - بنەمالا هیمکێ -٥ بنەمالا مەلای[111].

## شکەفت و جهـ و شوینوارێن گوندی:

شکەفتا ئاسێ: ئێك دەرگەهـ دچیتێ و بۆ پەزی بکاردئینا، شکەفتا گیای، مزگەفتا گوندی (مزگەفتا گلیتکا)، گورێ مەلا خدر بێدەبی: ژ کەسانێن دیندارێن دەڤەرێ بوو.

## کانیێن گوندی:

کانیا مەلا خدر، کانیا گوندی، کانیا بیستانی، سەرۆکانییا بەرۆژی، کانیا زێدێ، کانیا سەرۆکانیێ، کانیا بوتکێ، کانیا برکا مناصبی، کانیا صالح، کانیا دەمالێ، کانیا بینك، کانیا برکا خەزایێ.

## ژین و ژیارا خەلکێ گوندی:

وەکی هەمی گوندێن ئاڤی ژیانا وان ل سەر چاندنا دەرامەتێن ئاڤی و خودانکرنا پەزی بوو، پتریا داروبارێن گوندی: گویز، چنار، بەڕوی، مازی، کەڤۆت، دیندار بوون.

## گوندێ ڕێشمە:[112]

ژ گوندێن (ڕێکان) بەلیکا ئاڤی (ڕووباری)یە، بەری موسلمان لێ ئاکنجی ببن گوندێ مەسیحییان بوو، نها کاڤلە دێرەك یا لێ هەی و جهێ وێ دیارە، سالا ١٩٧٨ێ ئەو ژی کەتییە بەر هەوا ڤەلاکرن و ڤەگوهاستنا گوندان و خەلکێ وێ ل کۆمەلگەها سیریێ ئاکنجیکرینە.

## جوگرافییا گوندی:

**باکووری،** گوندێ (ئەرتش)ە.

**باشووری،** گوندێ (زێوکێ)یە.

**ڕۆژهەلاتی،** گوندێ (هوص)ە

**ڕۆژئاڤایی،** گوندێ (بێبو - نێرەوەیا عولیان)ە.

دووراتی یا دناڤبەرا گوندێ ڕێشمە و گوندێ هوس (٤کم)ە، و دناڤبەرا ڕێشمە و گوندێ (جانمەندا) (٥کم)ە.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن: سەرکەلەکێ ، توخمێ شبلی، مالێت ژووری، و شێخکێ پێکدهێت.

## کانیێن گوندی:

ب ناڤێن بنگەلی، ڕەش، خاتینێ، شکەفتێ، ژێری، دانش(دانیشێ)، خاری، قەرەچکێ، بالیل، گویزکێ، گەرماڤا، و دوی دێرێ هاتینەناڤکرن.

## چیایێ گوندی:

خەلکێ گوندی هەر جهەك یان بلنداهییەك یان کۆمتەك ژ چیایێ دورماندۆرێ خوە ب ناڤێ چیایەکی ناڤکریە وەك: چیایێ سەرلاتێ، چیایێ ئاشیش، چیایێ سەر بەرێ، چیایێ کێری، چیایێ نێرەبوو، چیایێ دولێ، چیایێ شیڤاسولتی، چیایێ خەتیبەر، چیایێ شیڤ سەلمان، چیایێ شیڤادێهم، چیایێ چاوێ، چیایێ بریم سورکی،

## ژین و ژیارا گوندی:

ژیانا وان ل سەر چاندنا دەرامەتێن ئاڤی و خودانکرنا

پەزی و دارێن وەك: گویز، چنار، بەڕوی، مازی، کەڤۆت، دیندار بوو.

گوند ل سالا (١٩٧٨)زای هاتیە کاڤلکرن و خەلکێ وی هاتینەڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهان. بەلێ ل سەردەمێ شۆڕشا گولانێ هاتیەڤە ئاڤاکرن و بەری ئەنفالا بەهدینان ل ١٩٨٨ێ ٢٥مال ل گوندی دژیان، د ئەنفالاندا ئەو ژی کەتە بەر هێرشا دوژمنی و هاتەسۆتن و خرابکرن و خەلکێ وی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ و هەتا نها ژی گوند نەهاتیەئاڤاکرن(١١٣).

## گوندێ جارمەندا(١١٤)

ژ گوندێن (رێکان) بەلیکا (شیڤەڕەزایە)یە، ژ دو تاخان پێکدهات، تاخەك لایێ ترکیا (دەڤەرا چەلێ)، تاخەك ل لایێ عیراقێ.

### جوگرافییا گوندی:

**باکووری:** گوندێ (شیڤەڕەزا) و (هرکاش)ە.

**باشووری:** گوندێ (برجێلا)و (زێر - نێروە) و (رێشمە)یە.

**رۆژهەلاتی:** سنوورێ ترکیا (شلکو- ئەرش/ باکوورێ کوردستانێ).

**رۆژئاڤایی:** گوندێن (دزگە) و (هێشەت) کو گوندێن عەشیرەتا (نێروە)نە.

دووراتییا دناڤبەرا جارمەندا و گوندێ قەسرکێ (٤کم)ە، وەدناڤبەرا جارمەندا و گوندێ (رێشمە)دا (٥کم)ە.

### بنەمالێن گوندی:

بنەمالا ژێری، بنەمالا گاگی (تاتی)، بنەمالا شێخی.

### سرۆشت و کانیێن گوندی:

جارمەندا گوندەکێ ئاڤی یە، ب چاندنێ تایبەت چاندنا برنجی بەرنیاسە، هەروەسا ب هەبوونا بەرێ ریخن ژی بەرنیاسە (بەرێ کیرێ) کو دهاتە بکارئینان

گوندێ جارمەندا



بۆ ئاڤاكرنا خانیان و ب مشاری ل دووڤ نەخشە و شێوێ مرۆڤی دڤێت دهاتنە برین، زۆمێن هوین و خۆش وەك : سیلاڤا بەرێ ئاڤێ ، خەرەگول، شیڤ ئوسمانكا یێن لێ هەین.

كانیێن گوندی: دەرنێ، تراش، بیشی، سینالا و ریخن.

**شوینوارێن گوندی:**

مــەزارێ شێخ میكائیل، مناسبێ زندێ بەرێ ئاڤێ.

**ئاوارەبوون و هێلانا گوندی:**

سالا (١٩٧٥)زێ و جارەكادی ل دەمێ ئەنفالان خەلكێ گوندی ئاوارەی ئیرانێ ببوون، و ل دەڤەرا قەزوین و ئورمیێ ئاكنجی ببوون، و هندەك ژی چووبوونە تركیا و ل كەمپا مۆشێ ئاكنجی ببوون، پشتی سەرهەلدانا ١٩٩١ێ هاتینە كۆمەلگەهێن (شێلادزێ و دێرەلوك) و هندەك ژی چووینە كۆمەلكەها (تەناهیێ - دهۆك) و لێ جهوار بووینە[١١٥].

## گوندێ شیڤەرەزا:

ئێك ژ گوندێن عەشیرەتا (رێكان)ە، و ب گوندێ سەرێبەلیكا (شیڤە رەزا) دهێتە هژمارتن[١١٦]، گوندەكێ سنووری ودەمێ سنوورێن تركیا وعیراقێ ل سالا(١٩٢٦)ێ دەمێ (هێلا برۆكسل) هاتینە دانان شیڤەرەزا ژی ئێك ژوان گوندێن رێكانییان بوو كو پارچەك كەفتیە بەر سنوورێ دەولەتا تركیا وپارچە یا دیتر بەر سنوورێ عیراقێ كەفتی، پاشی حكۆمەتا تركیا ل سالا ١٩٩٥ێ پشتی كو شەرێن دژوار دناڤبەرا تركیا و چەكدارێن pkkێ رووداین گوندێ وان هاتە كاڤلكرن و ل ویلایەتا وانێ هاتنە ئاكنجی كرن و نێزیكی ١٠٠ سەرۆك خێزانانە، و ١٥ سەرۆك خێزان ژی ل باشوورێ كوردستانێ ل كۆمەلگەها شێلادزێ و سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ دئاكنجی نە[١١٧]، د دیرۆكێ دا دناڤ گوندێ (شیڤە رەزا) سێ خۆشمێرین ناڤدار و چەلەنگ ومێرخاس هەبوون بناڤێ (لەشكەر، محێ، كەهی كو محێ و كەهی برایێن ئێك بوون)، و ناڤێ وان دسترانێن دیرۆكی یێن فلكلوری د ئاژی هاتییە گوتن[١١٨].

**جوگرافیا گوندی:**

شیڤەرەزا دكەڤیتە دناڤبەرا گوندێن هەلالە وژەبەرا و برجێلا و مركانش ورووبارێ ماركی ژی دبەر گوندی رادچیتن و گوندەكێ ئاڤی یە .

**بنەمالێن گوندی:**

گوندێ شیڤەرەزا ژ ڤان بنەمالان پێك دهێتن:

مالا كەلوی، مالایاسین، مالا كەریما، مال ژێری.

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا قەدرێ، شكەفتا میرا[١١٩].

ئەڤ گوندە ژی وەك گوندێن دی یێ دەڤەرێ ل نیڤا دووێ ژ سالێن هەفتییان هاتییەخرابكرن و ڤەگوهاستن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهان ئاكنجیكرینە، بەلی ل سەردەمێ شۆرشا گولانێ هاتییەڤە ئاڤاكرن و بەری ئەنفالا بەهدینان ل ١٩٨٨ێ ٢٥مال ل ڤی گوندی دژیان، كەتە بەر هێرشا دوژمنی و هاتەسوتن و خرابكرن و خەلكێ وی مشەختبوونە كەمپێن پەنابەران ل باكوورێ كوردستانێ و هێژ گوند نەهاتییەئاڤاكرن[١٢٠].

## گوندێ هنێش:[١٢١]

ئێك ژ گوندێن دەڤەرا(رێكان)ە ژ بەشێ (دێمی)، بەلیكا (كێریادێرێ) یە.

**جوگرافیا گوندی:**

**باكووری:** سنوورێ دەڤەرا دۆسكی ژووری یانە.

**باشووری:** گوندێ(بیارێ)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (مێز)ە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ(كێریادێرێ)یە.

دووراتــی دناڤبەرا گوندێ هنێش و كێریادێرێ (٤كم)ە، و دناڤبەرا هنێش و گوندێ مێز (٢٢كم)ە.

**پێکهاتا گوندی:**

گوندێ هنێش ژ پێنج بنەمالێن: ئالێ (مالا عەلێ)، ڕەشێ: ئەڤ ب (بنەمالا بن کەندالی) دهێنەنیاسین، محێ، جبێ، کانی ژوری: دبێژنە ڤان هەر سێ بنەمالا (گوندی ژووری)پێکدهێت.

**کانیێن گوندی:**

کانیا گلەرەشا، کانیا مالا عەلێ، کانیا بیهێ.

**هێلانا گوندی:**

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٧٨ز)ێ هاتیە خرابکرن و خەلکێ وی بۆ کۆمەلگەهێن وەك (قەدش[١٢٢] و باگێرا) هاتینەڤەگوهاستن.

## گوندێ هوس (هوص):[١٢٣]

ژ گوندێن عەشیرەتا ڕێکان بەلیکا ئاڤی (ڕووباری)یە.

**جوگرافیا گوندی:**

**باکووری:** ل باکووری ڕۆژهەلاتی گوندێ (بالەسینا)یە.

**باشووری:** ل باشووری ڕۆژهەلاتی گوندێ (زێوکا)یە.

**ڕۆژهەلاتی:** گوندێ (بانسرا)یە.

**ڕۆژئاڤایی:** ل باشووری ڕۆژئاڤا گوندێ (ڕێشمە)یە.

دووراتیا دناڤبەرا گوندێ هوس و گوندێ ڕێشمە (٤کم)ە، و دناڤبەرا هوس و گوندێ ئەرتش (٥کم)ە.

**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالا مەلا نەصرەددین:ئەڤ بنەمالە دبنیات دا ژ گوندێ (بەنستان) هاتینە، بنەمالا سەیدا، بنەمالا شەرەفیا، بنەمالا گوندیا.

**کانیێن گوندی:**

کانیا ڕەش، کانیا خاتینێ، کانیا خوین بیڤێ، کانیا بێشە بەگێ، کانیا خارا، کانیا بیهێ، کانیا ئاشیش، کانیا شکێرکا.

**گوندێ هنێش**



### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا ئاسهێ، شکەفتا هەڤندێ، شکەفتا گامە خەلکێ.

### شوینوارێن گوندی:

مەزارێ کەسایەتیەکێ ئایینی ب ناڤێ (سەید رەشید هۆصی)، کو دناڤ گۆڕستانا (سەرملێ) هاتیە ڤەشارتن[١٢٤].

ئەڤ گوندە وەك گوندێن دیترێن رێکان سالا ١٩٧٨ێ هاتیە ڤالاکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهێن شێلادزێ و سیریێ.

## گوندێ شامکێ:[١٢٥]

شامکێ ژ گوندێن دەڤەرا (رێکان) بەلیکا (مەرزا)یە.

### جوگرافیا گوندی:

**باکووری:** ل باکوورێ رۆژهەلاتی گوندێن (پیرەسنا) و (بێدە)یە.

**باشووری:** گوندێ (مازێیێ )یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن (رەزگە) و (هولیان) و (دێرکێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن (بالەسینا) و (هوص)ە.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ ژووری، مالا هاجیەلا، مالا تەهای ، مالا مەلای ، مالا گوران، مالا ئومەرا.

### ناڤێن کانیێن گوندی:

کانیا رەش، کانیا سپی، کانیا ئومەرا، کانیا گوندی، کانیا بن بەری، کانیا مێوکێ، کانیا کرکێ، کانیا ئیسفا، کانیا سەبێ، کانیا شیڤا شامکیێ، کانیا رەزا، کانیا کیسکێ، کانیا دەشتانا، کانیا گویز خانوتك.

### کەلایێن گوندی:

کەلا سەرێ سەر کەلێ، کەلا سەر باژێرگەهی،

شینوارێ کەلا دیشوی



کەلا دیشوی: ئەڤ کەلایە ب ناڤێ کەسەکێ فەلە (دیشۆ) هاتییە ناڤکرن، ل جهەکێ بلندە دبێژنێ (گرێ سەر قەسرێ) جهێ میری بوویە، ژبۆ زالبوونا ل سەر هەر کاروانەکێ ل وێرێ را دبووریت[١٢٦].

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا شامکێ، شکەفتا کەڤرێ تویێ: هەروەسا دبێژنێ شکەفتا دو تەبەق، شکەفتا کنا کۆترا، شکەفتا هیش، شکەفتا کریفیێ، شکەفتا ڕەش.

### شوینوارێن گوندی:

- شوینوارێن سێ کەلایێن ئاماژە پێکری.
- شوینوارێ مەزارێ (پیر شەرەف): کو برایێ پیر(خضر)ێ بەنستانی یە.

### پێکهاتەیا گوندی یا ئایینی:

هەتا سالا ١٩٤٨ێ پێنج مالێن جوهییان ل ڤی گوندی هەبوون، نها تەڤایی موسلمانن، گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی بۆ کۆمەلگەها شێلادزێ هاتینە ڤەگوهاستن.

## گوندێ هورە:

هورە ژ گوندێن دەڤەرا (رێکان) و بەلیکا ئاڤی (ڕووباری)یە. ژ گوندێن هەرە مەزنێ ناحیا نیروەرێکان بوو، عەلی سەیدو گورانی د دەمێ سەرەدانا خۆدا بۆ قەزا ئامێدیێ ئاماژە پێکریە کو د ناڤ (٧٩) گوندێن ناحیا نێروە رێکان مەزنترین گوندە و هژمارا خانیێن وی (٨٠) خانی بوو[١٢٧]، یەکەمین خواندنگەها سەرەتاییا دەڤەرا نێروە رێکان ل سالا ١٩٣٣ێ و یەکەمین خواندنگەها ناڤنجیا ڤێ دەڤەرێ ل سالا ١٩٧٦ێ ل ڤی گوندی هاتینەڤەکرن، ل دووڤ راپۆرتا پشکێنەرێ رێڤەبەریا زانیاریا (پەروەردا) مووسلێ یێ ٢٥-٢٦ گولانا ١٩٥٧ێ سەرەدانا گوندی و خواندنگەها گوندی کری، د سالا (١٩٥٧)ێدا سەرژمێریا خەلکێ گوندێ یا بەرچاڤ ٢٥٠-٣٠٠ کەس بوو، دو دەمژمێران

گوندێ هورە



ب پێیان یان ب دەواران ژ مەلبەندێ ناحیێ و دو رۆژان ژ ئامێدیێ دوور بوو، رێك ژی رێكەكا چیایی یا ئاسێ بوو[128].

**جوگرافییا گوندی:**

**باكووری،** گوندێ (ئاوكێ)یە.

**باشووری،** گوندێن (شاجا)یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (مازی)یێ یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (زێوكێ)یە.

**پێكهاتا گوندی:**

بنەمالا بەگا، بنەمالا ئاتێ، بنەمالا شینوی، بنەمالا ئیسڤێ كەرێ، بنەمالا تەتكێ، بنەمالا بەسێ، بنەمالا مەحمیدی، هەژی یە بێژین كو چەند بنەمالێن توڤی یا ژی دناڤ ڤی گوندی دا ژباینە و رولەكێ باش د پێشڤەچوونا گوندی دا هەبوویە. هەتا سالا ١٩٤٨ێ پێنج مالێن جوهییان ل ڤی گوندی هەبوون[129].

**كانیێن گوندی:**

كانیا سەرۆكانی، كانیا رەش، كانیا گیزێ، كانیا كوتولوكی، كانیا چەڤەبیرێ، كانیا ئاتێ، كانیا مى شەرەف، كانیا تویانێ.

**چیایێن گوندی:**

چیایێ سەرێ هورێ.

**شكەفتا گوندی:**

شكەفتا شیڤە هیرو.

**ژجهـ و شوینوارێن گوندی:**

**خواندنگەها هورە:**

ئێك ژ كەڤنترین خواندنگەهێن فەرمی یێن سنوورێ دەڤەرا ئامێدیێ بوویە كو ل سالا (١٩٣٣ز)ێ هاتینە ڤەكرن، و زارۆیێن گوندێن دەوروبەر ژی یێن گوندێن (ئاوكێ، ئەرتش، بانسرا، زێوكێ، هوس، هیل) د هاتنە ڤێ خواندنگەهێ، د قۆناغێن بوورینا

بەرمایێن دنگێن خواندنگەها هورە



سەردەمێن خواندنێ ل ڤی گوندی گەلەك ئاستەنگ بۆ پەیدابووینە و كاودانێن جودا جودا لێ قەومینە، ل دووماهیيا سالا خواندنێ (١٩٥٢-١٩٥٣)ز)ێ دەمێ پشكینەرێ زانیاری، سەرەدانا ڤێ خواندنگەهێ كری د راپۆرتا خو دا پێشنیازكر بوو كو ئەڤ خواندنگەهە بهێتە گرتن، لێ ڤێ چەندێ دلگرانیەكا مەزن ل دەڤ خەلكێ گوندی و گوندێن دەوروبەر یێن زارۆكێن وان قەستا ڤێ خواندنگەهێ دكرن پەیداكر، لەوما ل (٣١/ ٧/ ١٩٥٣)ز)ێ رابوون ب نڤیسارەكێ وەك سكالانامە و گازندە و نەرازی بوون هەمبەر ڤێ پێشنیازێ دیاركری و هاتە بلندكرن بۆ موتەسەرفێ مووسلێ (ئەحمەد زەكی ئەلمودەرس ١٩٥٢/١٢/٣٠ - ١٩٥٤/٧/١)ز)[١٣٠]، و وێنە ژێ دانە (قائیمقام)ێ ئامێدیێ و رێڤەبەرێ زانیاریا (پەروەردا) لیوا مووسلێ. ئەڤ سكالانامەیە ژ ناڤێن (٥١) كەسان پێكدهات دگەل مۆر و ئیمزایێن وان، ژوان ژی موختارێن گوندێن (ئەرتش، ئاوكێ، بانسرا، هورە، هوس، هیل) و پێشنڤێژێن گوندێن (هۆرە) و (زێوكێ) و هژمارەك ژ خەلكێ گوندی و سەمیانێن قوتابیان. جهێن پەیوەندیدار ل

دووڤ داخوازا خەلكێ وان گوندان هاتن و بەردەوامی ب خواندنگەها وان هاتەدان، هەتا كو دەستپێكا سالا خاندنێ (١٩٦١-١٩٦٢)ز)ێ ژبەر رەوش و كاودانێ نەگونجایێ وی سەردەمی خواندنگەهـ هاتە گرتن، ل سالا (١٩٦٧-١٩٦٨)ز)ێ هاتە ڤەكرن ڤە ژ ئالیێ سازیێن پەروەرد و فێركرنێ یێن شۆرشا كوردستانێ، پشتی رێكەفتناما (١١ئادارا ١٩٧٠)ز)ێ جارەكا دی ب فەرمی ژ ئالیێ رێڤەبەریا پەروەردە و فێركرنێ یا پارێزگەها دهۆكێ ڤە هاتە ڤەكرن، و بەردەوامی ب خواندنێ هاتیە دان هەتا كو ل سالا (١٩٧٥- ١٩٧٦)ز)ێ رێزەكا ناڤنجی ژی لێ هاتە ڤەكرن.

ل سالا ١٩٧٨ێ ئەڤ گوندە ژی كەتە بەر هەوا خرابكرن و ڤەگوهاستنا گوندان و خەلكێ وی ل كۆمەلگەها شێلادزێ هاتنە ئاكنجیكرن و مامۆستا و خویندكارێن ڤێ خواندنگەهێ ل رۆژا (١٤/ ٨/ ١٩٧٨)ز)ێ بۆ خواندنگەها شێلادزێ هاتنە ڤەگوهاستن.

ل سالێن هەشتییان و سەردەمێ شۆرشا

گوندێ هورە



گولانێ هژمارەك ژ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە سەر وارێ خۆ و گوند ئاڤاكرەڤە، دەمێ روودانا ئەنفالێن بەهدینان ٥٠ مال ل گوندی ئاكنجی ببوون، ئەڤ گوندە ژی د وێ سالێدا كەتە بەر ئەنفالان و خەلكێ وی مشەختبوونە كەمپێن پەنابەران ل باكوورێ كوردستانێ، پشتی سەرهلدانێ زڤرینەڤە ل كۆمەلگەهێ شێلادزێ و جهێن دیتر نیشتەجێبوون و هەتا نها گوند نەهاتییەڤە ئاڤاكرن[١٣١].

## گوندێ بێدە[١٣٢]

بێدە: ژ گوندێن عەشیرەتا (رێكان)ە، یێن ب رێكانا ئاڤی دهێنەناڤكرن، بەلیكا (شابا بێدە) یە، ب سەرێ بەلیكێ دهێتە هژمارتن.

### جوگرافییا گوندی:

**باكووری:** سنوورێ تركیا یە.

**باشووری:** گوندێن (رەزگە)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (مروانس)یێ یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (هیش)ە.

دووراتی دناڤبەرا گوندێ بێدە و گوندێ هیش دا (٥كم)ە.

### پێكهاتا گوندی:

گوندێ (بێدە) ژ هەشت بنەمالێن سەرەكی: بنەمالا شەریفكی، بنەمالا تەمەر، بنەمالا سیڤانی، بنەمالا بەرۆژی، بنەمالا مامەبدەلی، بنەمالا ملحەم، بنەمالا خازێ، بنەمالا عندەل پێكدهێت. خەلكێ بێدە هەمووموسلمان بوون، تنێ سێ مالێن جوهییان لێ هەبوون، پشتی دامەزراندنا دەولەتا ئیسرائیلێ نەماینە و چووینە ئیسرائیلێ[١٣٣].

### رامانا ناڤێ گوندی:

وەكی دهێتە ڤەگێران د سەردەمێن كەڤندا، دەمێ ئاغا یان دەرەبەگان خۆیكا (باجا) دەرامەتی و چاندنێ ژ گوندێن دەڤەرێ وەردگرت ب رێژا (دەهـێك)، خەلكێ (بێدە) ئەڤ ب دلی نەبوو، رازی نە بوون ژ ڤێ چەندێ و ئەڤ رێژا باجێ نەددا ، لەوما بـ( بێدە) هاتەناڤكرن، ئانكو (بێ دەهـ یان بێ دەهـ یەكی) .

### كانییێن گوندی:

كانییا مزگەفتێ، كانییا گەڤزونە، كانییا كورتەكێ، كانییا كورانكێ.

### شكەفتێن گوندی:

شكەفتا بەرشكەفتێ، شكەفتا بەرایێ، شكەفتا كورا دیكلی،شكەفتا چل مێرێن میزراج.

### ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

مەزارەكێ كەسەكێ چاك و دیندار ب ناڤێ (پیر مەحمود) پیر مەحموود ل گوندی هەیە..

بێدە ژ گوندێن بەراهیێ یێن دەڤەرا رێكان بوویە كەتینە بەر هەوا خرابكرنا گوندان، ل هاڤینا ١٩٧٦ێ گوند هاتییە خرابكرن و ڤالاكرن، بێدەیی ژی ل جهێ نهایێ گوندێ (شیڤ چنارکێ - باشوورێ رۆژئاڤایا شێلادزێ) ئاكنجیكرینە و وان ب خۆ ئەو جهـ ئاڤاكریە، سالا (١٩٨١ز) ێ نێزیكی دەهـ مالێن بێدەیان زڤرینەڤە گوندی و هەتا ئەنفالا ١٩٨٨ێ لێ ژیاینە، د ئەنفالاندا جارەكا مشەختبووینە كەمپێن ئاوارەیان ل باكوورێ كوردستانێ، پشتی سەرهلدانێ زڤرینەڤە شیڤ چنارکێ و شێلادزێ و جهێن دیتر، هێژ بێدە وەك گوندێن دی یێن دەڤەرێ نەهاتییەئاڤاكرن.

هەژیە بێتە گۆتن ل داویا سالێن پێنجییان خواندنگەها سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن، بەلێ ژ ئەنجامێ روودانێن ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا ١٩٦١ێ ب سەرێ گوندێن دەڤەرێ هاتین گوند ب خواندنگەهـ ڤە هاتییەبەردان، هەتا مووركرنا پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ب فرمانەكا رێڤەبەرییا پەروەردە و فێركرنێ ل پارێزگەها دهۆكێ یا ٧ كانوونا دووێ ١٩٧١ێ سەر ژ نوو خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەڤەكرن[١٣٤].

## گوندێ بانسرا[١٣٥]

### جوگرافییا گوندی:

بانسرا دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ رێکان، گوندێن (هیل، هوص، ئاوکا، بالەسینا) سنوورێن گوندی پێکدئینن، بەری ڤەگوهاستنا گوندان ژ (٢٠) سەرۆك خێزانان پێکدهات[١٣٦].

### شینوارێن گوندی:

کەلایەکا مەزن و کەڤن ل هنداڤی گوندی هەبوو، بەلێ چ پێزانین ل دۆر دیرۆکا وێ نینن، هەروەسا دو کاڤلە ئاشێن کەڤنار ژی لێ هەنە.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دەرامەتێ ئاڤی و دێمی و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو. دیسان هەر د کەڤندا کارێن دەستی ژی ل ڤی گوندی هەبوون وەك: چێکرنا کەڤچك و هستیك و ملخاڤ و بەفریك زێدەباری ڤەهاندنا دوخوینێن شەلوالا و چانتك و کولاڤا و چەند بەرهەمێن دی.

### رووبار و کانی:

ئاڤا خۆ ژ رووبارێ (ئاڤامارك) کو دبەر گوندی را دهات و سەرۆکانییا وی ژ گوندێ شیڤە رەزا دهات و هەروەسا کانی ژی ل گوندی هەبوون و ژێدەرێن سەرەکی بوون بۆ چاندنا دەرامەتێ، و ناڤێن کانییان: کانییا چەم برگاگی، کانییا سیلا، کانییا سوفی بوون.

سالا ١٩٧٨ێ ئەڤ گوندە هاتییەڤالاکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهان، پشتی دەسپێکرنا شۆرشێ ل ١٩٧٦ێ هندەك ژ گەنجێن گوندی ل سالا ١٩٨١ێ گوندێ خۆ ئاڤاکرەڤە و لێ ئاکنجی بوون، بەری ئەنفالان ٢٠ مال ل گوندی هەبوون، ل ئەنفالا ١٩٨٨ێ دوبارە گوند هاتییەڤە کاڤلکرن و خەلکێ وی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ.[١٣٧] نها خەلکێ گوندێ بانسرا نێزیکی (٦٠) سەرۆك خێزانە، ل کۆمەلگەهان و جهێن جودا جودا دژین.

## گوندێ هریاشك:

هریاشك: ژ گوندێن رێکانییان و بەلیکا (بەرسیکا) یە گوندەکێ دێمە.

گوندێ بانسرا



## جوگرافیا گوندی:

دكەڤیتە ناڤبەرا گوندێن خالكا ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە و وەرەخەل و سوریان ژ لایێ رۆژئاڤایڤە و ڕووبارێ (ڕوویێ شین) ژ لایێ باشووریڤە.

## پێكهاتا گوندی:

گوند ژ سێ بنەمالان پێك دهێتن ئەوژی ئەڤەنە: بنەمالا مامكێ، بنەمالا حەیدەر، بنەمالا شیدا.

## ژلایێ ژیارێ ڤە:

ژن و ژیاراوان وەكی هەمی گوندان دەخل و جەهـ و نیسك و نۆك دكرن، هەروەسا كاروانی دكرن و تەرش و كەوال ب خودان دكرن مینا پەزی و چێل.

## جهـ و شوینوارێن گوندی:

شكەفتا (گاڤێ) ل ڤی گوندی ناڤدارە، دكەڤیتە سەر ڕووبارێ شین د وەرزێن هاڤین و پائیزان دا پەزێ خو لێ ڤە دحەواند هەتا دبوو زڤستان.

## ڕووبار و كانی:

گوندێ هریاش سێ كانی هەنە و ئێك ژوان زۆرا بۆشە، لێ تێرا وان نە دكر ئەگەر ژمارا وان بەرەف زێدەبوونێ ڤە چووبانە دا میننە بێ ئاڤ و ڕووبارێ ڕوویێ شین ژی دووری وانە.

ئەڤ گوندە ژی دگەل گشت گوندێن دەڤەرا رێكان ل نیڤا دووێ ژ سالێن هەفتییان هاتییەخرابكرن و خەلكێ وی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەهان. د سالێن هەشتییاندا هندەك ژ گوندیان زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاكرەڤە، بەری ئەنفالان ٢٠ مال ل گوندی دژیان، ئەو ژی د ناڤبەرا ٢٥/-٨ ١٩٨٨/٩/١٥ێ كەتنە بەرئەنفالان و گوند سەرژنوو هاتەوێرانكرن و خەلكێ گوندی مشەختبوونە كەمپێن پەنابەران ل باكوورێ كوردستانێ.[١٣٨]

# گوندێ هیل:

هیل ژ گوندێن ئاڤی یێن رێكان و سەر ب بەلیكا ڕووباری یە.

## جوگرافیا گوندی:

گوندێ هیل دكەڤیتە رۆژئاڤایێ دەڤەرا رێكان و دناڤبەرا گوندێن سنجێ، مازیێ، ئاوكێ و بانسرا و هورە و وەرەخەل ، و سنوورێن وان ژی ئاڤ و چیانە .

شوینوارێ پرا مەدرەسێ ل گوندێ هیل



## بنەمالێن گوندی:

گوندێ هیل ژ چوار بنەمالان: بنەمالا عەبدولرەحمانی، بنەمالا جەهوەری، بنەمالا حەمێ و بنەمالا ئەحمەدی پێكدهێت.

د دەمێ خۆدا ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنا دێم و ئاڤی بوو، پتریا عەردێ وان ئاڤی بوو، هەروەسان مژوولی خودانكرنا تەرش و كەوالی بوون و مفا ژ بەرهەمێن كەزان و گویز و سماقێ وەردگرت.
بەری ڤەگوهاستنا گوندی ژ (١٧) سەرۆك خێزانان پێكدهات، ژمارا وان نێزیكی (٦٠) كەسان بوو، نها (٥٠) سەرۆك خێزان و پتر ژ (٣٥٠) كەسانە.

## شوینوارێن گوندی:

- پرا مەدرەسێ: د وی دەمی دا مەدرەسا ئایینی هەبوو لەوما بڤی ناڤی هاتبوو ناڤكرن.
- گۆرستانا فەقییان: چونكی تنێ فەقی لێ دهاتنە ڤەشارتن.

## كانی و رووبار[139]:

كانییا چەڤرە پیرێ، ئاتیر، هیلێ كو تنێ ئاڤ ژ ڤێ ڤەدخوار، گەرمكێ، مەسینێ، سویلە ژنێ، سێڤێ،حەودا ژنا، حەودا مێرا، رووبارێ ئاڤا ماركی، رووبارێ هورێ.

## چیایێن گوندی:

ملكێ خلوكێ، گلیسارێ، كانی گەرمكێ، رویكی، نزاركی، سەرێ هورێ.

## جهێن ناڤدار:

ناڤانێ جووت لێ دهاتەكرن، بیرا دەشت، خاركێ برینكا چولی برینێ بوو، زومكا، بەرجوكا، بەرێ گر، ملكێ قورقوری، چەما ، چەمێ بەر گەڤری.

## شكەفت وكەڤرێن ناڤو دەنگ:

شكەفتا سڤوكێ، شكەفتا جوخینا، شكەفتا رویكی، شكەفتا بنیامێ، شكەفتا مازێ، شكەفتا هەرفتەی، شكەفتا كون هرچێ، كەڤرێ كەلەسوور، كەڤرێ صا، كەڤرێ رویكی، كەڤرێ سەر گشتكێ، كەڤرێ هرچێ.

## هێلانا گوندی:

ئەڤ گوندە ژی دگەل گوندێن رێكانیان ل سالا (١٩٧٨)زای هاتییەخرابكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێ (سیرێ) ئاكنجیكرینە.

## گوندێ مروانس:

مروانس ژ گوندێن گەلەك كەڤنار و دیرۆكییە، ب گوندێ بەگ و میران هاتییەنیاسین، ژ گوندێن سەر ب بەلیكا (خالكان)ە ژ عەشیرەتا (رێكان). جهەكێ بێهنفرەهـ و ب دارگویزان هاتییە خەملاندن، ل كێم جهێن گوندی هەتاڤ ژبەر دارگویزان لێ ددەتن. چ ژێدەرەكی ئاماژە ب ناڤێ مروانس نەكریە، لێ ژبەر كو شوینوارێ دێرەكا كەڤن لێ هەیە، لەوما دوور ناهێتەدیتن كو ژ ناڤێ (مار یونس)هاتبیت ، ژبەركو دگەل ناڤێ گەلەك دێر و كەنیسەیان پەیڤا (مار)یا دگەل دا هەی.

## جوگرافییا گوندی:

مروانس دكەڤیتە باكوورێ دەڤەرا (رێكان)، ژلایێ باكوورێڤە هەڤسنوورە دگەل عەشیرەتا (دوسكی ژووری)، ژلایێ رۆژهەلاتیڤە گوندێ بەنستان، ژلایێ رۆژئاڤایڤە گوندێ (نێروا سیتوی)، سنوورێ وێ دگەل گوندێ (مێز) دەشت و نهالە و دووراتییا دناڤبەرا وان دا (٢٨كم)ە و دووراتی یا دناڤبەرا گوندێ مروانس دگەل گوندێ بەنستان (٤كم)ە[140].

## ئویجاخ و بنەمالێن گوندی:

بەری ڤەگوهاستنا گوندان نێزیكی ٤٠ سەرۆك خێزانان بوون و ژ چوار ئویجاخان و ژنەهـ بنەمالان پێكدهات:

- **ئویجاخا بەگا**، چوار بنەباب بوون (ئیبراهیم خان بەگێ، صالح بەگ، میربەگ، سەید بەگ).

- **ئویجاخا گوڤەیا،** دو بنەباب بوون (مالا زەینێ و مالا شاهین).
- **ئویجاخا بێزیڤە،** دو بنەباب بوون (مالا عومەرو مالا صەمەد)
- **ئویجاخا خێمبیڤا** : کو ئێك بنەبابە.

دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێ خەلکێ گوندی (١٩٨) خێزان و (١٤٣٢) کەس بوون[١٤١].

### کانیێن گوندی:

کانیا ئاڤە دو، کانیا خجیج، کانیا جەراتا.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا ئاڤەدو، شکەفتا قائدا، شکەفتا بەراکی، شکەفتا سوور.

### گوند ب چ یێ ناڤدارە؟:

گوندێ مروانس ب زۆزانەکێ یێ ناڤدارە کودبێژنێ زۆما سەرێ دارێ یان کانیا سەرێ دارێ، ئەڤ کانییە یا(شێخ حسێن بەگێ) بوو کوخۆشترین جهە ل دەڤەرا نێروە و رێکان، هەروەسا ب چیایێ دێنیکێ مروانس کو چیایەکێ زۆرێ بلندە[١٤٢].

ئەڤ گوندە گوندەکێ تێر ئاڤ بوو، خەلکێ گوندی مژوولی چاندنا بەرهەمێن ئاڤی وەك برنج و ماش و گەنمۆك و بیێن دی بوو، هەروەسان مژوولی خودانکرنا پەزی و مالاتی بوو.

ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٧٨ز)ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێ شێلادزێ ئاکنجیکرینە، پشتی سێ سالێن ئاکنجیبوونێ ل ڤی جهی پتر ژ دەهـ مالان جارەکا دی قەستا گوندێ خۆ کرن، تا ئەنفالا سالا ١٩٨٨ێ جارەکادی گوندێ خۆ چۆلکرن و بەرەف ترکیا چوون پاشی ل ئیرانێ ئاکنجی بوون تا پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ زڤرینەڤە شێلادزێ.

## گوندێ کوکەرێ:[١٤٣]

ئێك ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان)یێن بەلیکا (پشتا چیای)یە.

ناڤێ گوندی ژ سرۆشتێ وی هاتییە وەرگرتن، دکەڤیتە جهەکی دبێژنێ (گرێ قەسرا)، ژبەر کو

گوندێ مروانس



گوند دکەڤیتە د بناڤا ڤی جهی لەوما دبێژنێ کوکەرێ ئانکو (کورا بن کەلێ).

## جوگرافییا گوندی:

**باکووری:** گوندێ بێباکرێ و گوندێ کاڤلکایە.

**باشووری:** سنوورەکێ چیایی یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سارکێ و گوندێ دهیکا رۆژئاڤایە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێزەل و گوندێ کارە (گوندەکێ نێروەیان)ە.

## پێکهاتا گوندی[١٤٤]:

کوکەرێ ژ دوو پارچە بنەمالان پێکدهێت، یێن کوکەری و یێن گوندێ هادیسڤا (ئەڤ گوندە یێ کەڤنە و هەر ب کوکەرێ د هێتە هژمارتن:

**یێن کوکەری:**

بنەمالا سەیدێ، بنەمالا زاهێر (بنەمالا ئاغایێن رێکانییانە)، بنەمالا شێخکێ، بنەمالا قەرێ، بنەمالا عەبدێ.

**یێن هادیسڤا:**

بنەمالا بازیدا، بنەمالا مەروان.

بنەمالەك هەر ژ کەڤن دا ژ گوندێ کوکەرێ چووبوونە بامەرنێ کو دگۆتنێ بنەمالا (تاهرێ شەمامێ)[١٤٥].

## کانیێن گوندی:

کانییا قاقوس، کانییا ساریا، ئەڤ کانیە یا هەڤپشکە دگەل گوندێ (سارکێ)،کانییا بێجالێ، کانییا خرابەی، کانییا زێدا، کانییا کەندا، کانییا ناڤ گوندی، کانییا ئاقدی، کانییا کافرا: یا هشکبووی و بێ ئاڤە.

هەروەسا بیرێن ئاڤێ ژی هەبووینە وەکی: بیرا ناڤ دەشتێ، بیرێن چیایێ ژوور.

## شکەفتێن گوندی:

شکەفتا هەسنابەکی، شکەفتا زێوە[١٤٦].

ل ٧ کانوونا دووێ ١٩٧١ێ ب بریارەکا رێڤەبەریا پەروەردە و فێرکرنێ ل پارێزگەها دهۆکێ خواندنگەها

گوندێ کوکەرێ



سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، خەلکێ گوندێ سارکێ ژی هەر بۆ خاندنێ دهاتنە ڤێرێ[147].

ئەڤ گوندە ژی ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهان و هەتا نها ژی وەك گوندێن دی نەهاتییە ئاڤاکرن.

د سالێن هەشتییاندا هندەك ژ گوندییان زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاکرەڤە، بەری ئەنفالان ٢٥ مال ل گوندی دژیان، د ناڤبەرا ٢٥/-٨ ١٩٨٨/٩/١٥ێ کەتنە بەرئەنفالان و گوند سەرژنوو هاتەوێرانکرن و خەلکێ گوندی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ.[148]

## گوندێ خالکا:

ژ گوندێن عەشیرەتا رێکان سەر ب بەلیکا (خالکا)یە و سەرێ بەلیکێ یە.[149]

### جوگرافی یا گوندی:

**باکووری،** گوندێ (مامیسا)یە.

**باشووری،** گوندێ (هرباشك)ە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (بیارێ)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (رزێ)یە.

دناڤبەرا گوندێ خالکا و گوندێ بیارێ دەشتە و دووراتی یا دناڤبەرا وان دا (٥کم)ە، سنوورێ د ناڤبەرا گوندێ خالکا و گوندێ وەرەخەل چیانە و دووراتییا دناڤبەرا وان دا (١٣کم)ە[150].

### کانیێن گوندی:

کانییا برکێ، کانییا بەرشکەفتێ، کانیا بێبنێ، کانیا بەرباڤێ.

### شکەفتا گوندی:

شکەفتا باڤێ.

### پێکهاتەیا ئایینی:

گوندێ خالکا ژبلی مۆسلمانان، پێشتر کو (٢٠) مالێن جوهیان لێ هەبوون، کو ناڤێن هندەك ژوان ئەڤە بووینە: (پەرە، مردەخ، مهخیك، یونس)، پاشتر هندەك ژێ موسلمان ببوون و یێن دیتر ژی پشتی سالا (١٩٤٨ز)ێ چوونە ئیسرائیلی[151].

ئەڤ گوندە ژی ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهان و هەتا نها ژی وەك گوندێن دی نەهاتییە ئاڤاکرن.

د سالێن هەشتییاندا هندەك ژ گوندییان زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاکرەڤە، بەری ئەنفالان ٢٥ مال ل گوندی دژیان، د ناڤبەرا ٢٥/-٨ ١٩٨٨/٩/١٥ێ کەتنە بەرئەنفالان و گوند سەرژنوو هاتەوێرانکرن و خەلکێ گوندی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ.[152]

## گوندێ کێریادێرێ:

ژ گوندێن عەشیرەتا رێکان سەرێ بەلیکێ و ژ پشکا (دێم - مشاری)یە.

### جوگرافیا گوندی:

**باکووری،** گوندێ (بەنستان)ە.

**باشووری،** گوندێ (خالکا)یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (هنێش)ە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (مامیسا)یە.

دووراتی دناڤبەرا گوندێ کێریادێرێ و گوندێ بەنستان (٥کم)ە، و دناڤبەرا کێریادێرێ و گوندێ هنێش (٤کم)ە[153].

د کەڤندا دێرەك ل گوندی هەبوویە، جهێ (دێر) لێ هاتییە ئاڤاکرن گرێ ئاخێ بوو ئانکو کێری بوو، لەوما ب (کێریادێرێ) هاتەناڤکرن ئانکو (دێرا ل سەر کێرێ)[154].

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا پلنگ، بنەمالا خازێ، بنەمالا تەتێ، بنەمالا شیڤکی[155].

## کانیێن گوندی:

کانیا زێندین، کانیا کەوکێ، کانیا هەسەدا، کانیا هەسەدا ژووری، کانیا هەسەدا ژێری، کانیا سەرێ دارێ، کانیا سرکێ، کانیا کمکێ، کانیا شافرکێ، کانیا ناڤ گوندی ، کانیا عەفرا، کانیا سمێ، کانیا مێرگا ژێری، کانیا مێرگا ژووری، کانیا بێرکێ، کانیا هندوس، کانیا کەندالی. گەلەك کانیێن دیتر ل دەرڤەی گوندی یێن هەیین وەکی: کانیا بێمکێ، کانیا نژێ، بیرا کانیکا ژووری، بیرا کانیکا ژێری، کانیا ئاڤشخێ، کانیا کرکێ، کانیا بیشی، کانیا رەبا، کانیا ملێ کولکا.

## شکەفتێن گوندی:

ب ناڤێن رەبا، رانا، پیرهاجی، لولیا، دالیتێ، بانیێ، هەرفتەی، میرا، میرا یا مەزن، پێ رەشکێ، باڤیا، سەرچەلکی، دەریوکی، شێخێ، هین، بەراکێ، ئاسیێ، ملێ نیمویێ، کانیا نژێ ل سەرێ دارێ هاتینەناڤکرن.

## ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

- شوینوارێن دێرەکێ و کەلایەکێ دگەل مزگەفتەکێ لێ هەنە.

- خواندنگەهـ: ل سالا ١٩٥٨ێ بۆ یەکەمین جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیەڤەکرن.

ئەڤ گوندە ژی مینا گوندێن دی ل سالا ١٩٧٨ێ هاتیەخرابکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهێن شێلادزێ و سیریێ و پاشتر هندەکان قەستا باژێرێن مەزنتر وەکی دهۆکێ و مووسلێ کریە.

## گوندێ مێزێ:

ژ گوندێن عەشیرەتا رێکان بەلیکا (کێریادێرێ)یە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ (چێ - دۆسکی ژووری)یە .

**باشووری،** گوندێ (بیارێ)یە.

گوندێ کێریادێر



**رۆژهەلاتی:** سنووری ترکیایە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (مروانس)ە.

دووراتییا دناڤبەرا گوندێ مێز و گوندێ بیارێ (٢كم)ە، و دناڤبەرا مێز و گوندێ هنێش (٢كم)ە[١٥٦].

## پێکهاتا گوندی:

- ئویجاخا ئومەرا: ئەڤ ناڤە یا ژ بابکالێ وان (عومەر) هاتی، و ژ پێنج بنەمالان پێکدهێت.
- ئویجاخا ناسرا: ئەڤە ژی ژناڤێ بابکالێ وان (ناصر)ی هاتییە ، ژ پێنج بنەمالان پێکدهێت.
- ئویجاخا وێدیا: ژ ناڤێ بابکالێ وان (وێدی) هاتییە، دو بنەمالان بخو ڤە دگریت[١٥٧].

## کانیێن گوندی:

ئەڤ گوندە ژ نێزیکی (١٥) کانیان پێکدهێت، ناڤێن هندەك ژ وان: کانیا سپینداری، کانیا گولی، کانیا نزاری، کانیا گویزێ: ژمارەکا زۆرا دار گوێزان یێن ل ڤی جهی هەین، جهێ کومبوونێن گوندیان بوون، ئەگەر کەسەکێ مەزن سەرەدانا گوندی کربایە ل ڤێرێ پێشوازی لێ دهاتەکرن.

## شکەفتێن گوندی:

شکەفتا ئاڤێ: ئەڤ شکەفتە نێزیکی (١٠٠) مەترا درێژە، ل گەلەك جهان ئاڤ ژێ دەردکەفیت، لەوما ب ڤی ناڤی هاتییەناڤکرن. شکەفتا رەشا، شکەفتا مەم وزینا: دهێتەڤەگێران سەردەمەکی گەنجەکێ ئەڤیندارا خو رەڤاندبوو، ل ڤێ شکەفتێ ڤەحەویابوون هەتا کو بنەمالێن هەردوکان پێك هاتین، لەوما خەلکێ گوندی ئەڤ ناڤە دانا سەر ڤێ شکەفتێ[١٥٨].

## جهـ و شوینوارێن گوندی:

**ژ ئالیێ باکووری ڤە:** بەرۆژێ گۆڤانی، نهالا پان، سورە زەڤیێ، وارێن هنێشیان، سەرێ کێریێ، مولی، بەرچەلان: ناڤێ چیایەکێ ناڤدارە و ژمارەکا زۆرا کەڤیێن بەفرێ یێن لێ هەین.

**ژ ئالیێ باشووری ڤە:** شکەفتا ئاڤی، کەلا مەغولیا، خارێ دەپرێ، شکەفتادالیتێ[١٥٩]، دراڤکێ، بەرەز کولێ، وەزیرێ.

**ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە:** بەرکولکا، سەرخیرێزێ، بەرۆشکێ، سەر پشتا رۆژێ، گەرەسیتێ، بن سیتێ.

**ژ ئالیێ رۆژئاڤا ڤە:** ملێ مزگەفتا، دوو شاخێ، دولا ئالەدین، بەهشیارێ، مەزینگێ.

هەروەسا چەندین پرێن کەڤنار ل گوندی هەبووینە وەك:

- خوارێ دەپرێ: پرەکا کەڤنار بوو[١٦٠]..
- پرا دارکێ مێزێ: پرەکا کەڤنارە شوینوارێ وێ یێ مای.
- پرا زەرك: ل دانگا گوندێ مێز، ل نێزیك گوندێ (رەبا- رنکان).

## ژ شەهید و ئەنفالکرییێن گوندی:

گوندێ مێزێ رولەکێ دیار و مەزن د بزاڤا رزگاریخوازا کوردی دا یێ هەی تنێ د ئەنفالاندا (٢٤)کەس ژێ بووینە قوربانی ژ وانا: جەبار روستەم محەممەد، حەجی مبارەك محەممەد، حەفزوللاعەبدوللا سینیار، خالد سیار حەسەن، شەکر تاهر شەکر، سەلام عەلی رەسول، سەعدی صادق سەعدی، خەمو چیچو مبارەك، صەباح محەممەد ئەمین صالح، صالح فەرحو شەریف، صالح عەبدوللا سەعید، صادق صالح عەبدوللا، عەبدوللا سینیار حەسەن، عەبدولرەزاق صادق سەعدی،تاهر شەکر تاهر.

## هێلانا گوندی:

گوند ل سالا (١٩٧٨)زێ هاتییە کاڤلکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهان ئاکنجیکرینە.

## گوندێ شاجا:

ئێك ژ گوندێن رێكان، بەلیكا (پشتا چیای)یە.

### جوگرافی یا گوندی:

**باكووری:** گوندێ (هورە )یە.

**باشووری:** گوندێ (دهیك)ە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (پێپەرخا)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (سارکێ)یە.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ سێ ئویجاخان: ئویجاخا کوسا، ئویجاخا چاڤیرا، ئویجاخا مەرزا پێکدهات.

### كانیێن گوندی:

کانیا چاڤیرا، کانیا دەپکێ، کانیا بێ دلێ، کانیا سێلکێ، کانیا مام گراڤیکێ، کانیا رەزا، کانیا ملا، کانیا باپیرکێ، کانیا گوندی.

### شكەفتێن گوندی:

شکەفتا بەرایێ، شکەفتا بێجالکێ، شکەفتا تویێ، شکەفتا تەمبیرکێ، شکەفتا خارسا، شکەفتا دولا تەوکێ، شکەفتا کلولکێ، شکەفتا رەش، شکەفتا سێڤێ.

### ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

دێرا (بێدلو): ل رۆژهەلاتا گوندی، دێرا (ملێ میشێ): ل رۆژئاڤایا گوندی، قەسرا(ملێ).

وەکی گوندێن دی ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٧٨)ێ هاتییەکاڤلکرن و ڤالاکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن وەکی: سیریێ وشێلادزێ و دێرالوکێ ئاکنجیکرینە، پاشتر قەستا بازێرێن دی کرینە.

د سالێن هەشتێیاندا هندەك ژ گوندیان زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاکرەڤە، بەری ئەنفالان ٣٣ مال ل گوندی دژیان، د ناڤبەرا ٢٥/-٨ ١٩٨٨/٩/١٥ێ کەتنە بەرئەنفالان و گوند سەرژنوو هاتەوێرانکرن و خەلکێ گوندی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ.[١٦١]

گوندێ شاجا



## گوندێ پێپەرخا:[162]

پێپەرخا ژ گوندێن رێکان سەر ب بەلیکا (پشتا چیای) یە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ (چەمێ جوو )یە

**باشووری:** گوندێ (سیتە)یە

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (رێنجبراخە)یە

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (شاجا)یە.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا حەجی، بنەمالا تەتوی، بنەمالا ئەمین.

### رامانا ناڤێ گوندی:

دهێتەڤەگێران سەردەمێ پەیدابوونا ئایینێ مەسیحی ل دەڤەرێ، کەسەك ل ڤی گوندی ب ناڤێ (بەرخۆ) هەبوویە، گوند ب بناڤێ وی (بیت بەرخو - مالا بەرخوی) هاتیبەناڤکرن، هەر ل گوندی دێرەك ب ناڤێ (دێرا بەرخوی) هەبوو هێژ شوینوارێن وێ ماینە[163].

### کانیێن گوندی:

کانیا بێدلو: ل رۆژهەلاتێ گوندی، کانیا گا: کانیا سەرەکی ڤەخوارنێ بوویە، کانیا بەرێ کانیکێ، کانیا گوندی.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا بالێ و شکەفتا شەکەڤیا: دکەڤنە باشوورێ گوندی، شکەفتا تویێ (تویرە مێرگێ)، شکەفتا بەراێ، شکەفتا خەبازا (نانپێژا)، شکەفتا زراڤکێ، شکەفتا تەوکێ.

### جهـ و شوینوارێن گوندی:

- دێرا پێپەرخا: ل باشوورێ گوندی.
- کەلا گرێ قەصرێ: ل رۆژهەلاتا دێرێ.
- مزگەفتا گوندی:
- منا جوی (منا جی): کەڤرەکێ مەزنە، دکەڤیتە

شوینوارێ دێرا (بەرخوی) ل گوندێ پێپەرخا



باشووریٚ گوندی.

- گۆڕستانا حجر فەقیا (ژوورا فەقیا): ل رۆژهەلاتا گوندی، ئەو جهـ بوویە یێ کو فەقەیان لێ دخواندن، پشتی هنگی بەس فەقە لێ دهاتنە ڤەشارتن، لەوما ب گۆڕستانا (حجر فەقیا) هاتییە ناڤکرن.

- گۆڕستانا ملێ بازیا.

گوند ل سالا ۱۹۷۸ێ هاتییەڤالاکرن و خەلکێ گوندی ل کۆمەلگەهان ئاکنجیکرینە.

د سالێن هەشتییاندا هندەك ژ گوندییان زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاکرەڤە، بەری ئەنفالان ۲۰ مال ل گوندی دژیان، د ناڤبەرا ۲۵/-۸ ۱۹۸۸/۹/۱۵ێ کەتنە بەرئەنفالان و گوند سەرژنوو هاتەوێرانکرن و خەلکێ گوندی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکووریٚ کوردستانێ[١٦٤].

## گوندیٚ هولیان:[١٦٥]

هۆلیان ژ گوندێن (رێکـان) جوینا (ئاڤی) و بەلیکا (مەرزا)یە

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندیٚ (پیرەسینا)یە.

**باشووری:** گوندیٚ (مێرگەڤا)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندیٚ (شابەکەما)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندیٚ (ڕەزگە)یە.

### پێکهاتا گوندی:

مالا برویی (ئیبراهیم -عومەری)، مالا مەلای (مەلا زادە).

### سرۆشتێ گوندی:

ژ گوندێن (ئاڤی)یە، دەرامەت و چاندنا وان ژی بەهراپتر ئاڤی بوویە وەك: برنج، کونجی، گەنمۆك، ماش، داروبارێن دێمی ژی وەك (کەزان،گوێز...) یێن لێ هەین.

### کانیێن گوندی:

کانیا مەزن، کانیاچەکا، کانیا گەفرا، کانیا بیشەنگێ.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا نخوینێ، شکەفتا دوی ئاستەنگێ، شکەفتا هۆلی (هۆلیانی).

### ژچیایێن گوندی:

- چیایێ سویکی:

گۆڕستانێن گوندی:

- گۆڕستانا پیر زەینەل و پیر عەینەل:

- گۆڕستانا کەنیشك (کونیشکا): دهێتە ڤەگێران ئەڤە ناڤێ ژنەکێ بوویە و هاتییە شەهیدکرن و ل وێرێ هاتییە ڤەشارتن لەوما ژی ب ناڤێ وێ هاتییە ناڤکرن، لێ نەهاتە زانین کا ژبەر چ ئەگەر هاتییەشەهیدکرن![١٦٦].

ئەڤ گوندە ژی ل سالا ۱۹۷۸ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی هاتینەڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهێن ئامازە پێ هاتییەکرن.

## گوندیٚ دهیکا رۆژهەلات

دهیکا رۆژهەلات: ژ گوندێن رێکـان پشکا (دێمی)، و بەلیکا (خالکا)یە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندیٚ (بەنستان)ە.

**باشووری:** گوندیٚ (وەرەخەل)ە.

**رۆژهەلاتی:** گوندیٚ (رزێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندیٚ (شابەکەما)یە.

رۆژهەلاتی ڤە شیڤ(نهال)ەك هەیە گوندی دکەتە دوو جوین: بەرۆژ و نزار[١٦٧].

### سرۆشتێ گوندی:

دهیکا رۆژهـەلات: ژ گوندێن رێکان یێن دێمە،

دەرامەت و چاندن و داروبارێن وی بەهرا پتر دێمینە وەك: سماق، كەزان، گوێز.... دەرامەتێن دیتر رەزێن دێمی نە، دگەل ڤێ چەندێ ئەڤ گوند ب مێرگا خۆ (مێرگا دهیك) ناڤدارە، جهێ بێهنڤەدانا رێڤینك و كاروانیان بوو، نەخاسمە بۆ گوندێن رێكانیان ژ (مشارا دێم- بەلیكا دێم)[168].

**پێكهاتا گوندی:**

دهیكا رۆژهەلات ژ چوار بنەمالان پێكدهێت: مالا تەتێ (تەتەر) كۆ مالا عومەر و مالا خاجەی بخۆڤەدگریتن، مالا جوندوی، مالا بادێ (ژ ناڤێ بەهائەدینی هاتییە) و مالا مەلكێ.

**كانیێن گوندی:**

كانیا مزگەفتێ، كانیا گوندی (كانیا مێرگێ)، كانیا بیشێ: بەهرا پتر دەرامەتێ ئاڤێ ل بەر ڤێ كانیێ دهێتەكرن، كانیا گویزكا كەلێ (قەلێ): وەسان دهێتەزانین بالندێ (قەل) ب خوارنا ڤێ گویزا هنداڤێ ڤێ كانیێ رادبیت، لەوما ژی بڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن[169].

ل سالا ١٩٧٨ێ ئەڤ گوندە ژی ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابكرن و ڤالاكرن و خەلكێ گوندی ڤەگوهاستینە كۆمەلگەهان.

## گوندێ بیارێ:

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێكان) بەلیكا كێربادێرێ ڤەیە.

**سنوورێن گوندی:**

دووراتی یا دناڤبەرا گوندێ بیارێ و گوندێ خالكا (٥كم)ە و دناڤبەرا بیارێ و گوندێ مێز (٢٢كم)ە و سنوورێ دناڤبەرا وان دا دەشتە[170].

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ پێنج بنەمالان: بنەمالا میرخانا، بنەمالا هەیدەرا (حەیدەرا)، بنەمالا ئالیكێ، بنەمالا شێخالا، بنەمالا مالا پیری پێكدهێت.

**كانیێن گوندی:**

كانیا ناڤ گوندی، كانیا كێلكێ، كانیا گەڤزكێ، كانیا سیڤی، كانیا چەلكێ.

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا گرێ، شكەفتا چەمی.

**هێلانا گوندی:**

مینا گوندێن دیتر ل سالا (١٩٧٨ز)ێ هاتییە خرابكرن و ڤالاكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێن (شێلادزێ ، سیریێ ، باگێرا) ئاكنجیكرن و هندەك ژێ چووینە باژێرێن مەزنتر.

## گوندێ مامیسا:

ئێك ژ گوندێن عەشیرەتا (رێكان)ە ، و ژ بەلیكا (خالكا)یە.

جوگرافییا گوندی:

**باكووری،** گوندێ (بەنستان)ە.

**باشووری،** گوندێ (هریاشك)ە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (كێربادێرێ)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (دێركێ) و گوندێ (هول / هولیان)ە.

**بنەمالێن گوندی:**

گوند ژ چوار بنەمالان: بنەمالا سەلیم، بنەمالا دەحێ، بنەمالا ئیبراهیم: (سەلیم و دەح و ئیبراهیم) هەر سێ برایێن ئێك بوون، بنەمالا ملحەمی پێكدهێت.

**رامانا ناڤێ گوندی:**

دهێتە گۆتن: دكەڤندا دو برایێن ئێزیدی هەبوون، ئێك مۆسلمان بووو، یێ دی مابوو ل سەر ئایینێ خۆ، ناڤێ گوندی بوویە (مامیسا) كو سڤككرنە بۆ ناڤێ (ماموسا ئانكو موسا ما)، ژبەر ئێك مۆسلمان بووو و یێ دی ما بوو سەر ئایینێ خۆ، لەوما گوند ب ڤی ناڤی هاتییەناڤكرن، هەتا نها ژی ئێزیدیێن مامیسی

هەنە، لێ گوند ب تمامی مۆسلمانن، ڤەگێرانەکا دی د بێژیت بابکالەکێ کەڤنێ گوندی ناڤێ وی پیر موسا بوویە و گوند ژ ناڤێ وی هاتییە.(١٧١).

**کانیێن گوندی:**

کانییا رێزکێ، کانییا بنلاتێ، کانییا گێزکێ.

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا رەشێ، شکەفتا صورێ، شکەفتێن باڤێ کو دبێژنێ شکەفتێن ئاغا.

**هێلانا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨)ز)ێ هاتییە کاڤلکرن و خەلکێ گوندی ل کۆمەلگەهێن (شێلادزێ، باگێرا) ئاکنجیکرینە و ژ وێرێ ژی چووینە دهۆک و مووسل و ئاکنجی بووینە.

## گوندێ دەعلکێ:(١٧٢)

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان) و بەلیکا (مەرزا)یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری ،** گوندێ (پیرەسنا- پیرهەسنا)یە.
**باشووری،** گوندێ (کولا)یە.
**رۆژهەلاتی،** گوندێ (هنێش)ە.
**رۆژئاڤایی،** گوندێ (مێرگاڤا)یە.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند تنێ ژ بنەمالەکێ پێکدهێت دبێژنێ بنەمالا (دەعەلکیا) و بەرنیاسە ب مالا (محەممەد دەعەلکی)، د بنیاتدا خەلکێ گوندێ (فەقیان)ە ، کو گوندەکێ خرابەیە نێزیکی (٥ خولەکان- دەقیقەیان)ژ دەعەلکێ دوورە و ملك یێ ل گوندێ (فەقیان)هەین.

**کانیێن گوندی:**

کانییا مەزن، کانییا جەکا، کانییا کەڤرا: یا ب تەزیاتیێ بەرنیاسە.

**خواندنا گوندی:**

خواندنا خەلکێ گوندی یا فەقیاتیێ بوو، بۆ خواندنا خواندنگەهێ ژی ل دەستپێکێ د چوونە گوندێ (هورە) و پاشی چوونە گوندێ (سنجێ)، دەمێ ل سالا (١٩٧٧)ز)ێ خواندنگەهـ ل گوندێ (رەزگە) هاتییە ڤەکرن، خەلکێ گوندێ دەعلکێ دچوونە رەزگە بۆ خواندنێ، سالا (١٩٧٨)ز)ێ گوندێن دەڤەرێ هاتنە وێرانکرن و خەلکێ گوندان ئینانە کۆمەلگەهێن: سیریێ و شێلادزێ و دێرالوك و لێ ئاکنجیکرن(١٧٣).

## گوندێ رزێ

ژ گوندێن (رێکان) و بەلیکا(خالکا)یە(١٧٤).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ (بەنستان)ە.
**باشووری،** گوندێ (وەرەخەل)ە.
**رۆژهەلاتی،** گوندێ (خالکا) و گوندێ (بیارێ)یە.
**رۆژئاڤا،** گوندێ (شابەکەما) و گوندێ (دهیك)ە.

**پێکهاتا گوندی:**

ژ ئێك بنەمال کو بابکالێ وان (تاجەددین)ە پێکدهێت و سێ کور ب ناڤێن (حەمێ، سەلمان، عەمەر-عومەر) هەبووینە.

**کانیێن گوندی:**

کانییا گوندی، کانییا مسکینێ: بۆ گیانەوەرێن بچویك وەکی (پەزی) دهاتە بکارئینان، کانییا بیها: بۆ گیانەوەرێن مەزن وەك (گارەشان) دهاتە بکارئینان، کانییا باصێ: بۆ چاندنێ دهاتە بکارئینان، دکەڤیتە بەرۆژێ گوندی ئانکو ل لایێ باکووری، کانییا ملکی: ئەڤە یا دناڤبەرا رزێ و گوندێ (دهیك)(١٧٥).

**گۆرستانێن گوندی:**

گۆرستانا مەزن، گۆرستانا بچویك، گۆرستانا کلاڤ سورێ.

## ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

-مەزارێ (دای موم) یان (کاڤلێ دای موم)ی: د کەڤیتە سەرێ چیایێ (سیکێ-سویکێ) ژ ئالیێ باشووری گوندی کو دبێژنە ڤی لایێ چیایی (سیکێ رزێ).

- شوینوارێن سێ مزگەفتان.

سالا (١٩٦١)ز)ێ خەلکێ گوندی ئاوارەی ترکیا بوون و ژ وێرێ چووبوونە مووسلێ، دەستپێکا سالێن حەفتێیان زڤرینەڤە گوندێ، سالا ١٩٧٨ێ گوندێ وان هاتەخرابکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن ئاماژە پێکری ئاکنجیکرن.

## گوندێ سیدان:

ژ گوندێن (رێکان) بەلیکا بەرسیك (دێم)ا یە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** چیایێ خالێ و گوندێ (باوان)ە.

**باشووری،** گوندێ(سیتە)یە .

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (بێکروب)ە

**رۆژئاڤا،** زینیا سیارێ و گوندێ (رێنجبراخە)یە.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ ئویجاخێن (ژووری، ژێری، کەلاتێ، ناڤ گوندی، شکێرا) پێکدهێت، بنەمالێن وێ ژی ئەڤەنە: بنەمالا صالح، بنەمالا عەبدوللا، بنەمالا ئیبراهیم عەبدوللا، بنەمالا حسێن (حسو)، بنەمالا ئیبراهیم مەحمود، بنەمالا بەکر، بنەمالا صالح فەریق، بنەمالا تەمەر قوتاسی[١٧٦].

## کانیێن گوندی:

کانیا مولی، کانیا بۆتی، کانیا مالێن ژووری، کانیا رێ، کانیا مێرا ، کانیا ژنا، کانیا ئاستەنگا، کانیا مەمێ، کانیا کاڤلا، کانیا شکەفتا حسارکێ.

گوندێ سیدان



**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا حسارکێ، شكەفتا چەلیا، شكەفتا كۆشتیا، شكەفتا زیدکێ، شكەفتێن شیڤەكیرێ: دكەڤیتە رۆژهەلاتا گوندی.

**ژ جهـ وشوینوارێن گوندی:**

- **شوینوارێ مزگەفتێ:**
- **پرا ئویرسی (رەواندوزی):** ئەڤ پرە دكەڤیتە كەلیێ بالندا ل نێزیك گوندێ (سیدان) ل سەر رووبارێ (رووبێ شین)، و گرێدانە دناڤبەرا دەڤەرا رێكان و عەشیرەتا (وەلاتی - مزووری ژووری ل دەڤەرا بارزان).
- **پرا سیدان:** هەر دوو دنگێن دیواری ل هەردو رەخا دهەرفتینە و دیارن.
- **پرا وەربەخ:** پرە دكەڤیتە نێزیكی پرا (سیدا) دناڤبەرا گوندێ (سیدا - رێكان) و گوندێ (وەربەخ - مزووری ژووری)، پرەكا سەرنج راكێش و ل جهەكێ خۆشە.
- **ئاشێ سیدان:**
- **دوو گۆرستان:** ب ناڤێ گۆرستانا (مەزن - گوندی) و گۆرستانا (قەرەچۆكا).

ل دەسپێكا سالێن حەفتیيان خواندنگەهـ ل گوندی هاتبوو ڤەكرن، ئەڤ گوندە ژی ل سالا ۱۹۷۸ێ هاتییەڤالاكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێن شێلادزێ و سیرێ ئاكنجیكرینە.

## گوندێ بێباكرێ:

ژ گوندێن (رێكان) و بەلیكا (پشتا چیای)یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ (بێزەلێ)یە.

**باشووری:** چیایێ (كورەژار)ی یە .

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (دوهیك) و(بێسەپێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (كارە- نێروە)یە.

**پرا وەربەخ**



دووراتی د ناڤبەرا گوندێ بێباكرێ و بێزەلێ دا (٥كم)ە، ودناڤبەرا وان دا دەشت و رووبارە، و دووراتییا دناڤبەرا بێباكرێ و گوندێ هریاشكێ (١٣كم)ە [١٧٧].

**پێكهاتا گوندی:**

بنەمالا رەمەزان، بنەمالا مستەفای.

**كانیێن گوندی:**

كانییا بیانێ، كانییا بیشەهرچكێ، كانییا خیلا، كانییا بێباكرێ، كانییا گیزە زومكێ، كانییا جیا، كانییا بەخیلا، وئەڤ كانیە درژنە سەر رووبارێ (هەسنابەكی)، ئەو ژی دهێتە سەر رووبارێ مارك [١٧٨].

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا بیانێ[١٧٩]، شكەفتا فاتیێ.

ئەڤ گوندە ژی سالا ١٩٨٧ێ هاتییەخرابكرن و خەلكێ وی ل سیریێ و شێلادزێ ئاكنجیكرینە.

## گوندێ مازێیێ:

مازییێ ئێك ژ گوندێن (رێكان) بەلیكا ئاڤی (رووبارى)یە، ژ چەند تاخان پێكدهێت، ئەو ژی: (هاجەمیا، ملێ دالكێ، سێڤا لابێ كەڤرێ مێشان، مازیا ژووری، مازیا ژێری، رەخێ تەموی، بەرنهینا، شیڤا هرچا، پیرۆمەرا، چەمكی، ئاشێ ژووری، بانیێ)، رووبارێ ئاڤا مارك د نیڤەكا گوندی را دبۆریت، رووبارێ (كونیشكا) ل رۆژهەلاتێ گوندی د هێتەخوار و ل جهێ دبێژنێ (دووكەرا مازێیێ) دگەهیتە رووبارێ ئاڤامارك.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ (هیل)ە، و دۆلا گوندی سنوورێ د ناڤبەرا مازێیێ و گوندێ (سنجێ)یە.

**باشووری :** گوندێ (چەمێ جوو)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (وەرەخەل)ە، (گەلیێ كونیشكا) دبیتە سنوورێ دناڤبەرا وان دا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (هورە) و (ئاتێر) و (دوولا ممكا)یە.

گوندێ مازێیێ ل سالا (١٩٧٥)زاێ



**پێکهاتا گوندی:**

ژ دو ئویجاخان (مال ژووری و مال ژێری) پێکدهێت:

**مال ژووری:** مالا حەسەنێ حەمان، مالا مەمێ، مالا مەحمید، مالا کەرووی.

**مال ژێری:** مالا حەجی، مالا عەبدولقادر سلێمان، مالا حەجی عەلی.

**رامانا ناڤێ گوندی:**

ناڤێ گوندی ژ سروشتێ وی هاتییەوەرگرتن، پتریا داروبارێن گوندی دار (مازی)نە، لەوما ب (مازیێ) هاتییەناڤکرن، گوندێ بەرنیاسە ب (سەرکێ مازیێ) کو دارێن مازیێ لێ د زۆرن.

**کانیێن گوندی:**

کانیا ناڤ گوندی، کانیا زێوە، کانیا سەرکێ مازێێ، کانیا دولا گوندکی، کانیا کانی چنارکێ.

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا مازی ژوور، شکەفتا قەم بەکر، شکەفتا بێ سەلمێ، شکەفتا سێڤا، شکەفتا چەلەزەرکا[180].

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

کەڤرێ چەلی، کولمپێ ستیێ، خارا، مللێ گارێ، تەڤەجونی، مللێ قەسرێ (قەسرا شەنگێ و قەسرا رەشێ، تیا حندێ، بەرێ بێهنا، بەرێ تەتکێ، چەلەزەرکا، عوقدێ هنارکێ، مللێ خلوکێ، چەپێن حەمە رەشکێ، کێری کەپرا، کوکێ سیتانا، خارێ ستری زەرك، دۆلا میشانا، دۆلا رەزا، دۆلا سێڤی، بالەپەرێ، ناڤا کورێ، ملێ رەزا، گەرا زڤرۆکێ، ئاڤارکێ گولێ، پرا مەزینکێ).

**ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:**

- شوینوارێن دوو قەسرا: قەسرا (رەشێ مازی)، و قەسرا (شەنگێ مازی).
- دوو ئاشێن کەڤن.
- شوینوارێن دووازدە گۆرستانان یێن لێ هەین!.
- چوار سکرێن بچووکێن ئاڤی ئاڤێ یێن هەین.

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨ز)ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن (شێلادزێ، سیریێ، باگێرا) ئاکنجیکرینە.

ل سالێن هەشتییان هندەك ژ گوندییان زڤرینەڤە سەر گوندی و خانیێن خۆ ئاڤاکرن، دەمێ ئەنفالان ١٣ مال ل گوندی بوون، ئەو ژی کەتنە بەر ئەنفالان و مشەختبوونە کەمپێن باکوورێ کوردستانێ[181].

## گوندێ بالەسینا:

ژ گوندێن (رێکان) بەلیکا ئاڤی (رووباری)یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** سنوورێ ترکیایە.

**باشووری:** گوندێ (زێوکا ژێری)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (بانسرا)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (هوس) و گوندێ (زێر - نێروە)یە.

**ژشکەفتنێن گوندی:**

شکەفتا بوزی[182].

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨ز)ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن (سیریێ) ئاکنجیکرینە، پاشتر هندەك ژێ ل (قەدش[183])ێ و دهۆکێ جهوار بووینە.

## گوندێ قەسرکا (قەسرکێ):

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان) و ژ بەلیکا (شیڤە رەزا)یە، ژبەرکو گوند دکەڤیتە د ناڤبەرا هەردو سنوورێن (ترکیا - عیراق)ێ دا، ل سالا (١٩٤٥ز)ێ ژبەر زۆرداریا حکۆمەتا ترکیا، گوندێ خۆ ڤەگوهاستبوو ئالیێ عیراقێ، و ئاخا گوندێ قەسرکێ هەردو سنوورێن (ترکیا و عیراقێ) بخۆڤەدگریت، واتە سنوورێ ترکیا

و عیراقێ گوندێ (قەسركێ) د كەتە دو پارچە، و پتر یا ئاخا گوندی دكەڤیتە لایێ تركیا ڤە .

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ (مركانش)ە، سنوورێ وێ دگەل گوندێ قەسركێ (گلەرەشا، شكەفتە رەشێ)یە.

**باشووری،** گوندێ (گوندێ برجێلا)یە، سنوورێ وێ دگەل گوندێ قەسركێ (گیرا بانیێ)یە.

- گوندێ (خاری - خوارێ)یە، سنوورێ وێ دگەل گوندێ قەسركێ (كونا كەندالی، گیرا سیتێ، كۆركا، ڤەسانكا)یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ(ستپێ)یە، سنوورێ وێ دگەل گوندێ قەسركێ (شكێری پتیووی) و (بەرەكەری)یە.-و گوندێ (مەیدانێ)ە سنوورێ وێ دگەل قەسركێ (شكەفتا مەیدانێ) و(كانییا دوزینێ)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (خوارێ) و گوندێ (جانمەندا- جارمەندا)یە.

دووراتی دناڤبەرا گوندێ قەسركا و گوندێ خواری (١كم)ە، و دناڤبەرا قەسركا و جارمەندا (٤كم)ە[١٨٤].

### پێكهاتا گوندی:

قەسركێ ژ پێنج بنەمالان: بنەمالا میرزای، بنەمالا عەبێد (عوبێد)، بنەمالا سلێمان، بنەمالا قەمبێ، بنەمالا تومەی پێكدهێت.

### كانیێن گوندی:

چوار كانیێن مەزن یێن ل گوندی هەین و رووباركەكێ بچویك پێكدئینن، كانی ژێ: كانییا مزگەفتێ، كانییا دوزینێ، كانییا بێبارکێ، كانییا كۆتەلێ نە.

### جهـ وشوینوارێن گوندی:

- دێرا زال: دكەڤیتە رۆژئاڤا گوندی.

- ئاشێ بەری: ئەڤ ئاشە دكەڤیتە باكوورێ گوندی ل سەر كانییا كۆتەلێ و هەر ژ كەڤندا بۆ هێرانا دەخل و دانی دهاتە بكارئینان، گوندێن دەوروبەران ژی مفا ڤی ژێ وەردگرتن.

- مزگەفتا گوندی:

سالا ١٩٧٥ێ پشتی لەشكەرێ عیراقێ گەهشتیە دەڤەرێ جهەكێ ل ڤی گوندی كو د گۆتنێ (گێرا لاتێ) وەك فرۆكەخانە (خەلكێ دگۆتنێ مەتارخانە) بۆ دادانا فرۆكێن هیلوكوپتەرێن لەشكەری مفا ژێ دهاتەوەرگرتن، هەر د ڤێ سالێدا سەربازگەهەكا لەشكەری و بنكەهەكێ پۆلیسان ل ڤی جهی هاتبوونە دانان[١٨٥].

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨)زێ هاتییەخرابكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێن ئامازە پێكری ئاكنجیكرینە.

## گوندێ ساركێ:

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێكان) و بەلیكا (پشتا چیای)یە.

### جۆگرافیا گوندی:

**باكووری،** سنوورێ چیایی یە.

**باشووری،** گوندێ (دهیكا ژێری)یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (شاجا)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (كوكەر)ێ و گوندێ (هادیسڤا)یە.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا سەلیم، بنەمالا میكائیل ساركی، بنەمالا ئیبراهیمێ باصو.

### كانیێن گوندی:

كانییا مزگەفتێ، كانییا ساركێ، كانییا گەزێ، كانییا ساریا كو یا هەڤپشكە دگەل گوندێ (كوكەر)ێ[١٨٦].

**شکەفتێن گوندی:**

تنێ شکەفتێن دولە مەشکێ و گۆڤا سێڤێ.

**جهـ و شوینوارێن گوندی:**

- کەلا سەرێ خەلایێ.
- مزگەفتا سارکێ.
- گۆرستانا سارکێ.

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨)ز)ێ هاتییە خرابکرن و خەلکێ وی ب زۆری ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهێن (شێلادزێ، دێرالوك)و لێ ئاکنجی بووینە.

## گوندێ کاڤلکا:

ژ گوندێن (رێکان) و بەلیکا (پشتا چیای)یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ (بێزەلێ)یە.

**باشووری:** گوندێ (بێسەپێ)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (هادیسڤا)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (بێباکرێ)یە.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ دو بنەمالان: بنەمالا ئیسماعیل و بنەمالا مستەفای پێکدهێت، ئەڤ دو بنەمالە یێن بووینە دو گوند (کاڤلکا) و (بێباکرێ)، بنەمالا ئیسماعیلی ل کاڤلکا و بنەمالا مستەفای ل بێباکرێ[١٨٧].

**کانیێن گوندی:**

کانییا نزارا، کانییا شیڤ چنارکێ، کانییا سەیدێ، کانییا ملێت خدرا، کانییا مەزن، کانییا بیانێ، کانییا چیا، کانییا خورا، کانییا سیرکێ، کانییا کەوکێ، کانییا بن جەما.

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا فاتکێ، شکەفتا بیانێ.

ئەڤ گوندە ژی سالا (١٩٧٨)ز)ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهێ شێلادزێ.

گوندێ کاڤلکا دڤەرا رێکان



## گوندێ هیش:

هیش(Heash): ئێك ژ گوندێن فەلانە ل دەڤەرا (رێكان) و ژ بەلیكا (شابا بێدە) یە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ز)ێ ژمارا خەلكێ وێ (٢٨٦)كەس بوون و ژ (٨٠) خێزانان و (٢٢) خانییان پێكدهات، سالا (١٩٦١)ز)ێ هاتبوو سۆتن، سالا (١٩٦٣)ز)ێ سەر ژنوی هاتییەڤە ئاڤاكرن، سالا (١٩٨٨)ز)ێ ژی ل ئەنفالان تووشی وێرانكرنێ ببوو[١٨٨].

ڤی گوندی رەنگەكێ ئاخێ یێ هەی تایبەتە بۆ چێكرنا كەرەستەیێن ئاخێ وەك قەلوین و ئامانێن ئاڤێ و جوانكاریێ، هەموو رەخێن هیش هەلزە و چەروانەكێ ئێكجار زۆرە، ل كناری هیش گرەكێ رویت و بلندە كو زێرەڤانیێ ل سەر دەوروبەرێن هیشێ دكەتن دبێژنێ (گرێ هیشێ)، ئەگەر هندەك كەس چەپەری ل گرێ هیشێ ب دانن دێ ئەو دەڤەر هەمی كەفتە بن چاڤدێریا وان[١٨٩].

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ (پیرئاڤدەلا)یە.

**باشووری:** گوندێ (مازێیێ)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (بێدە)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (ئستپێ)یە.

دووراتــی یا دناڤبەرا گوندێ هیش و گوندێ بێدە (٥كم)ە، و دناڤبەرا هیش و گوندێ ئستپ (٤كم)ە[١٩٠].

## كانیێن گوندی:

كانیا مەزن، كانیا زێندین، كانیا شیڤێ.

## شكەفتێن گوندی:

شكەفتا مالا خەوشو، شكەفتا مالا خبو، شكەفتا مالا موشێ.

ل سالا ١٩٥٨- ١٩٥٩ێ خواندنگەها سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن[١٩١].

گوندێ هیش



**پێکهاتا گوندی:**

گوندەکێ مەسیحی نشینە، د کەڤندا مالەکا جوهیيان ژی لێ هەبوو، دێرەك ل گوندێ ب ناڤێ دێرا (مربالقوس) هەبوو.

## گوندێ شابەکەما:

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان) ژ بەلیکا (مەرزا) یە، گوندەکێ ئاڤی یە، و بەرنیاسە ب بەرێن (دستار)و (ئاشان)[192].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن (دەعلکێ) و (هۆل) و (پیرەسنا)یە.

**باشووری:** گوندێ (وەرەخەل)ە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (رزێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (هیل)ە.

**بنەمالێن گوندی:**

ژ ئێك بنەمال بنەمالا (رەمەزانێ شابەکەمی) پێکدهێت.

**کانیێن گوندی:**

-کانیا سرکێ[193].

سالا ١٩٧٨ێ هاتیيە ڤالاکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن سیریێ و شێلادزێ ئاکنجیکرینە.

## گوندێ پیرەسنا (پیرهەسن):

ئێك ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان) ە و ژ بەلیکا (مەرزا)یە.

دهێتەڤەگێران پیرهەسنا گوندەکێ گەلەك بۆش بوو و یێ کەڤنارە و ژ چەندین تاخان پێکدهات ئەوژی (تاخێ کانیا مالا، دەشتکا، دەرگوٚڤێ، رەزێ نزاری، و تاخێ ئاقارێ سالا، تاخێ پشتا کانیا سێڤێ کو قەسرا بەدر ئاغای لێ بوو، تاخێ زێوکێ کو قەسرا

گوندێ هیش سالا (١٩٧٥)زێ، ژ ئەرشیڤێ ماموٚستا (صەدیق حامد نزارکی) بوٚ ئێکەم جار ل گوندی وەك ماموٚستا هاتیيە دامەزراندن.



سیسن ئاغای لێ بوو)، هەروەك ڤەدگێرن بەری (٥٠٠) سالەکان ویڤە ڤی گوندی ب سەرپەرشتیا (سیسن ئاغا) و (بەدر ئاغای) حوکمرانی ل دەڤەرا رێکانا ئاڤی دکر، ژ گوندێ چەمێ جوو و هورە و هەتا ئەڤراز، بەلێ ل سەردەمێ ڤان هەردو برا نەخۆشییەك ل گوندی پەیدابوو، بۆ ئەگەرێ مرنەکا ب کۆم، رۆژ بۆ رۆژێ کێم بوون هەتا وەسا کێم بووین دبێژن سێ مال ب تنێ مابوون![194]، ل ڤی گوندی دوو برا هەبوون، ئێك مابوو ل پیرهەسنا و یێ دی چوو بۆ گوندێ هۆلیان، نها میراتێ گوندی ژ هەردو گوندان دگریت. پیرهەسنا خودان زۆمەکە دبێژنێ میزراج، سەرێ زۆمێ دبیتە خالا سنووری دگەل ترکیا، ل ڤێ زۆمێ شکەفتەکا هەی دبێژنێ شکەفتا چل مێر، نها گوندێ بێدە یێ پشکدارە دگەل گوندێ پیرهەسنا دڤێ زۆمێ دا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ (بێدە)یە.

**باشووری:** گوندێ (هول) و(دەعلکێ)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (مروانس)ە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (هیش)ە.

### راما ناڤێ گوندی:

یا ژ ناڤێ کەسەکێ هاتی کو ناڤێ وی (پیر هەسن)بوویە، مەزارێ وی ژی یێ ل گوندی کو بۆ سەردەمەکێ کەڤن ڤەدگەریت.

### پێکهاتا گوندی:

دو ئالەدین هەبوون (ئالەدینێ کەڤن و ئالەدینێ نوو)، پیرهەسنی دگەهنە ئێك ب (ئالەدینێ کەڤن).

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا گوندێ ژێری، شکەفتا چل مێر.

### کانیێن گوندی:

کانیا زێوکێ، کانیا سێڤێ، کانیا فەقیا، کانیا مالا، کانیا گوندێ ژێری، کانیا کولپیکێ، کانیا خەلیل، کانی مام ئیسڤکێ، کانیا مێرگێ، کانی کیشکا، کانیکا ب شاخك دناڤبەرا پیرهەسنا و گوندێ بێدە، کانیا گورگۆستا.

### گۆرستانێن گوندی:

مرێن گوندی ل گۆرستانێن مەوتیکا و مێرگێن سەرێ گوندی ڤەدشارتن، چەند گۆرستانێن دیتر ل گوندی هەبوون وەك: (خاپیش، مناصبێ جوخوینێ، ناڤ دەشتکا، گۆرستانا بچویکا، تورکان و گوندێ ژێری).

### چیایێن گوندی:

ل پیرهەسنا چیایەکێ هەی ب ناڤێ (خالانە)، چەندین شەر لێ هاتینە روویدان، ژبەر بلنداهی و گرنگیا جهێ وی یێ ئاسێ و کونترۆلا وی ل سەر دەڤەرێ سەردەمێ مەلکیدا رەبیەکا لەشکەرێ ئیراقێ ل سەرێ چیایێ خالانە هەبوو، هەروەسان چەپەرەکێ شەری ل هەسیا کیچێ هەبوو، وەکی کەلایەکا شەری بوو.

### ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

بیرا جی، شکێرکێ مللێ دێرێ، پیرهەسن، گرێ خانیا (گۆرستانا کەڤن).

ژ بەرکو پیرهەسنا ئاڤەکا زۆر لێ هەبوو، دکەڤندا ژیانا وان ل سەر چاندنا برنجێ شەش مەهی دگەل گویز دارێن ئاڤی و خودانکرنا ئاژەلی بوو.

### هێلانا گوندی:

سالا ١٩٧٦ێ ئەڤ گوندە ژی هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن سیریێ و شێلادزێ و قەدشێ ئاکنجیکرینە، ل نیڤا دووێ ژ سالێن هەشتێیان هندەك ژ خەلکێ گوندی زڤریبوونەڤە سەر گوندی و ئاڤاکربووڤە، ل ئەنفالان دەربەدەرێ موشێ ل باکووری کوردستانێ بوون، پشتی سەرهەلدانا ١٩٩١ێ زڤرینەڤە کۆمەلگەهێن سیریێ و شێلادزێ.

## گوندێ مێرگەڤا:

ژ گوندێن عەشیرەتا (رێکان) بەلیکا (مەرزا)یە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ (پیرەسنا)یە.

**باشووری،** گوندێ (کولا)یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (دەعلکێ)یە.

**رۆژئاڤایی ،** گوندێ (سنجێ)یە.

### ژ کانیێن گوندی:

کانیا سلیمینێ[١٩٥].

سالا ١٩٧٨ێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهێن سیریێ و شێلادزێ ئاکنجیکرینە.

## گوندێ ئستپێ

ئستپ (Istip): ژ گوندێن فەلانە ل دەڤەرا رێکان) و ژ بەلیکا (مەرزا) یە.

ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)زێ هژمارا خێزانێن وێ گەهشتبوو (٤٧)خێزانان، د ناڤ (٢٤) خانیێن ئاکنجیبوونێ دا دژیان، سالا (١٩٦١)زێ مشەخت و ئاوارەبووینە و بەهرا پتریا وان ل (مویسل و تلکێف )ئاکنجیبووینە، و گەلەك ژ وان ل وەلاتێن بیانی جهوار بووینە[١٩٦].

### جوگرافیا گوندی:

**باکووری،** سنوورێ ترکیایە.

**باشووری،** گوندێ (هیل)ە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (پیرئاڤدەلا)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (قەسرکا)یە .

دووراتی دناڤبەرا گوندێ ئستپ وهیش دا(٤کم)ە، دناڤبەرا ئستپ وگوندێ (مەیدان) (١کم)ە[١٩٧].

### پێکهات و کورتە دیرۆکەکا گوندی:

ئستپێ ژ دوو بنەمالا پێکدهات: بنەمالا ئێزدو، بنەمالا کەمال، کو ل سالا (١٥٧٤)زێ ملك صلیو کورێ ملك ئیشو، کو (صلیو)ی دوو کور هەبوون: (ئێزدو- یێ کاروبارێن عەشیرەتی و جڤاکی بوو)یێ مەزن بوو، یێ بچویك (کەمال- یێ کارۆبارێن دینداریێ بوو)، ملك صلیوی کەسەکێ مۆسلمان یێ دانعەمر

گوندێ ئستپێ



ب ناڤێ (پیرعەڤدللا) ئینابوو کوچکێ بۆ سەرژێکرنا پەزی بۆ مێهڤانداریان و ژنەکا مۆسلمان بۆ ئینا و پارچە ئەردەك ژی ل وێڤەی ئستپێ دایێ و ب ناڤێ وی هاتەناڤکرن و ئەو ژی جهێ نهایێ گوندێ (پیرئاڤدەلا) بوو[198].

## کانیێن گوندی:

کانییا گری، کانییا رەزگە،کانییا گێزکێ، سەرۆکانیێ، کانییا سارکێ، کانییا تەزی، کانییا هریانە یا ناڤدارە و جهەکێ بەرنیاسە دگوندی دا.

سالا ١٩٧٤-١٩٧٥ێ ژ ئالیێ رێڤەبەرییا پەروەردەیا پارێزگەها دهۆکێ یا سەر ب شۆرشا کوردستانێ ڤە خواندنگەهـ ل گوندی هاتیەڤەکرن و (سادە ئادەم ئستپی) مامۆستایەتی لێ کرییە و نێزیکی (٢٤) خویندکارێن هەردو گوندێن ئستپ و پیراڤدەلا لێ دخواندن، ب تنێ بۆ سالەکێ ڤەکێشا و سالا ١٩٧٦ێ ئەڤ گوندە ژی راکرن.

سالێن هەشتییان ئەڤ گوندە هاتییەڤەئاڤاکرن و بەری ئەنفالان ٣٠ مال لێ دژیان، د ناڤبەرا ٢٥/-٨ ١٩٨٨/٩/١٥ێ گوند کەتییە بەر هێرشا ئەنفالان و هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ.[199]

## شکەفتێن گوندی:

شکەفتا خزنە، شکەفتا کۆترا، شکەفتا بنیامێ.

## دێراگوندی:

دێرەك ل گوندی ب ناڤێ ب ناڤێ دێرا (بنە شمونی)هەبوو[200].

## گوندێ مەیدان:

گوندێ مەیدان (Medan): ئێك ژ گوندێن فەلانە ل دەڤەرا عەشیرەتا (رێکان)، ژ بەلیکا (شیڤە رەزا)یە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا وان (٣١) کەس بوون، و هژمارا خێزانان (٩) بوون دناڤ (٤) خانیاندا د ئاکنجی بوون، سالا (١٩٦١)ێ دەمێ تێکچوونا رەوشا دەڤەرێ گوند هاتییە بەردان و ئاوارەی باژێرێن (مووسل) و (تلکێف) بووینە.

## جوگرافییا گوندی:

**باکووری:** سنوورێ ترکیایە.

**باشووری:** گوندێ (هیل)ە.

**رۆژهەلاتی:** باشوورێ رۆژهەلاتی گوندێ (ئستپێ)، گوندێ (پیرئاڤدەلا)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (قەسرکێ) و گوندێ (خوارێ) یە.

دووراتی یا دناڤبەرا گوندێ مەیدان و گوندێ خواری (١کم)ە، و دناڤبەرا گوندێ مەیدان و گوندێ ئستپ ژی (١کم)ە[201].

## دێرا گوندی:

دێرەك ل گوندی ب ناڤێ دێرا (مەرجەرگیزی) هەبوویە، ژ قەشەیێن وێ ژی ناڤێ وی (ئیسف)بوو[202]، هەروەسا قەشەکێ دیتر ژی ب ناڤێ (ئیرمیا توما شینو).

## گوندێ مرکانش:

ئێك ژ گوندێن دەڤەرا رێکان ، دکەڤیتە سەر هێلا سنووری یا دناڤبەرا ترکیا و عیراقێ ، و ژ بەرکو پارچەکا وێ کەفتییە دناڤ سنوورێ ترکیا ژی (ئەڤە ژی پشتی دەستنیشانکرنا سنوورێ ترکیا و عیراقێ ١٩٢٦)، و ناڤێ وێ ب تورکی (SARP) ئانکۆ کەڤرێ مەزن (گاگ یان حەلان و زنار)، سەرۆکانییا رویبارێ (زال) دناڤ دا یا کو دبیتە هێلا ناڤبرا دناڤبەرا ترکیا و عیراقێ دا.

## بنەمالێن گوندی:

ژ دو بنەمالان پێك دهێتن ، ئەو ژی ئەڤەنە: ( مالا ئوسمان ، مالا شینوی).

## پێکهاتا گوندی:

د بنیاتدا گوندەکێ فەلان بوویە و دگەل ڤێ

چەندێ خێزانەکا ژ گوندێ شیڤەڕەزا لێ جهوار بوویە و نیڤا ملکداریا گوندی بۆ ڤێ خێزانێ هاتییە دان، و پشتی ڤێ چەندێ فەلەیێن دیتر ژ گوندی چووینە گوندێ دەوروبەر یێ ب ناڤێ گوندێ (مەیدان)، مشەختبوونا وان یا ئێکێ بۆ گوندێ شیڤەڕەزا بوو ل سالا ١٩٩٠ و بۆ ماوێ (٥)سالان لێ مابوون هەتا کو مشەختکرنا وان بۆ باژێرێ (وان)ێ، و بەهرا پتریا ئاکنجیبوویێن گوندی ل باژێرێ (وان)ێ نە.

ئەڤ گوندە ژ لایێ سرۆشت و دەرامەتی ڤە ناڤدارە ب چاندنا برنج و گارس و ماش و کونجیا.... و هەروەسا رووپیڤەکێ دێمی بۆ چاندنا گەنم و جەهی و سەرەرای باغ و بیستانێن دارێن فێقی یێن ئاڤی و دێمی(***).

### هندەک خرابە گوندێن رێکان

د هندەك ژێدەر و سەرژمێریاندا ناڤێ ڤان گوندان: باغەلا، رەبا، چەمێ فەقییا، ئاتیرا، پیرئومەرا، بەرشکەفتێ، گراڤێ، بێکروبێ، مومکا، بیارێ و باڤێ هاتییە، راستە وەك ناڤ ئەڤ گوندە هەنە، لێ وەك خرابە گوندن و ل بیرا کەسێ نینە و کەسێ ژ باب و باپیرێن خۆ ژی نەبهیستییە کو د سەردەمێن نێزیکدا ژیان ل ڤان گوندان هەبیت، د ناڤ بەریەرێن ڤێ ڤەکولینێدا مە ئاماژە ب وان کریە وەك خرابە گوند.

## گوندێن عەشیرەتا دوسکی ژووری

### سنوورێ جوگرافی:

هۆزا دۆسکی ژووری ئێك ژ هۆزێن بەرنیاس بوویە ل دەڤەرا بەهدینان، سنورێ هۆزا دۆسکی ژووری ژ لایێ باکووری ڤە کوردستانا باکورە، و ژ لایێ باشوری ڤە دەڤەرا هۆزا(رێکان)ە، وژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە هۆزا (هەرکییێن بنەجهـ)ن، و ژ لایێ رۆژئاڤا ڤە دەڤەرا (ئەرتۆش)ە،کو دۆسکی ژووری ژ (٥٢) گۆندان پێك دهێتن بەلێ یێن دکەڤنە دناڤ سنورێ کوردستانا باشوور(عیراقێ) و سەر ب یەکەیا کارگێریا ناحیا

گوندێ مرکانش



شێلادزێ ڤە ئـەڤـەنـە: گـوندێن (چـێ، بیرێ، ئـەرتیس، ئورەمار، نێروە (نێروەك/نێروە سیتو)،شـەتینس،زێوە، چەم توو، تتم، شێخ مەم)، ژ سـەرۆك عـەشـیـرەتێن وێ (شاهین ئاغا چێی[۲۰۳]، ئیسماعیل ئاغا چێی[۲۰٤]، بازید ئاغا .....)

هـەژی یـە بێژین کـو عـەشیرەتا دۆسـکـی سـێ بەشـە (دۆسکی ژووری،دۆسکی ژێری، دۆستكانی_ كوردستانا باكور)، ل نیڤا ئێكـێ ژ سـەدسالییا هـەژدێ، دۆسکی ژووری سـەر ب میرگەها هەكاری یا ڤە دهاتنە هژمارتن، و ئاغاێێن وان ژی سـەر ب میرێت جولەمێرگێ ڤەبوون، كـو دۆسـكـی ژووری ژ سـێ مالباتێت ئاغا پێك دهات[۲۰٥]، ئەو ژی ئەڤە بوون:

۱- مالا ئاغایێن سـەرانكەلێ

۲- مالا ئاغایێن پشتقەسرێ: ب مالا بازید ئاغایی دهاتە نیاسین.

**گوندێن عەشیرەتا دۆسكی ژووری یێن گرێدای ناحیا شێلادزێ ڤە**

( ٥٣ )

| نمره | ولایت | نمره | اسامی الویه | نمره | قضا | ناحیه |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٨٣ | زور | ٣٧١ | رأس العين | تدمر |
| | | | مستقلا اداره | ٣٧٢ | رقه | سخنه |
| | | | اوتخنده در | ٣٧٣ | عربان | کوکب |
| | | | | ٣٧٤ | عناره | بکیشیر |
| ٢٦ | حجاز | ٨٤ | جده مكة مكرمه | ٣٧٥ | لبد | رابغ |
| | | | | ٣٧٦ | سواكن | |
| | | | | ٣٧٧ | طائف | طائف |
| | | | | ٣٧٨ | لبد | |
| | | | | ٣٧٩ | مصوع | |
| | | ٨٥ | مدينهٔ منوره | ٣٨٠ | سلفكيه | |
| | | | | ٣٨١ | قويم | |
| | | | | ٣٨٢ | مداين | |
| | | | | ٣٨٣ | وطيفون | |
| | | | | ٣٨٤ | ينبوع احمر | |
| ٢٧ | حكارى | ٨٦ | حكارى | ٣٨٥ | مع كوين سدى وكوللى بوت الشباب | داوديه |
| | | | | ٣٨٦ | مع جول مرال وطرخوب | بروارى بالا |
| | | | | ٣٨٧ | عماديه | بروارى زير ريكان شيروه |
| | | ٨٧ | كوار | ٣٨٨ | مع كوردى وهريكى شوش شمدينان | اورمارى |
| | | | | ٣٨٩ | اوراماری دوسكى جلوه علیا وسفلا | جوماره |
| | | ٨٨ | لياق | ٣٩٠ | نوردوز | نغورى عشيرتى |
| | | | | ٣٩١ | شكوفى | شمسكى |
| | | | | ٣٩٢ | محمودى | برهدى شكان |

۳- مالا رەش ئاغایی: کو یێن گوندێ چێی بوون.

ل دوویڤ سـالـنامەیا عـوسـمـانی یا سـالا (۱۳۰٥مش _ ۱۸۸۷ز) ژ لایێ كارگێری ڤە دەڤەرا دۆسكی ژووریا سـەر ب لیوا (گـەڤـەرێ) ڤەبوو یا کـو سـەر ب ویلایەتا (هـەكاری)[۲۰٦].

## گوندێ چێ

گوندێ (چێ)ی: ئێك ژ مەزنترین گوندێن دەڤەرا (دوسـكـی ژووری)یانە، ونێزیكی سنوورێ ترکیایە.

### جوگرافیا گوندی:

د کـەڤـیتـە باکـوورێ دەڤـەرا عـەشـیـرەتا (دۆسکی ژووری یا) و نێزیك سنوورێ دناڤبەرا تركیا وعیراقێ، ژ ئالیێ باشووری ڤە هەڤسنوورێ دەڤەرا عەشیرەتا (رێكان)ە، و دکەڤیتە رۆژئاڤایا رووبارێ ناڤدار (روویێ شین) و دەڤـەرا عـەشیرەتا هەركی یێن خوجهـ هەڤسنوورێن گوندێ (چێ) دگـەل ڤان گوندا ژ رۆژهـەلاتێ ڤـە گـوندێ باسیا، بزین، دریكی بێ و ژ ئالیێ باكووریڤە گوندێن بیرێ، ئەرتیس، ژ رۆژئاڤاڤە گوندێ سێڤێ، تتم، نێرواسیتۆ، ژ باشووریڤە گوندێ مروانس، بەنستان، هنیش، كێریا، دێرێ ومێز. وەك یا دیار ل سـەر نەخشـەی ئاخا ل بەر ب گوندێ (چێ) ڤە شێوازێ لاكێشەییە ژ رۆژهەلات بو رۆژئاڤا پتر ژ (۲٥كـم) ب رێكا پتر ژ (٤) دەمژمێرا، ژباكوور بۆ باشووری پتر ژ(۱٥كم) و ب رێكا پتر ژ (۲,۳۰) دەمژمێرونیڤان، ئەڤ پارچە ئەردە دكەڤیتە دناڤبەرا دو چیایێن كو ژ رۆژهەلات بۆ رۆژئاڤا دكێشایینە.

د كـەڤندا ئەڤ گوندە ژ چەند گوندا پێكدهات و ب بوورینا سالان بووینە تاخێن گوندێ (چێ) ئەوژی ئەڤەنە: ناڤ گوندا (چێ)، ناڤخرابا (كێرێ كانیێ)، نێوارا، دیملكێ، كاتۆلا، بەركەپرا (دارامێشكا)، همبێ، گوندكا خراب، كەندالێ كەرا، رندێلا، دولكا تارێ.

### ئویجاخێن گوندی:

(چێ) ژ (پێنج) ئویجاخان پێكهاتییە ئەو ژی ئەڤەنە: ئویجا خابیبا، ئویجاخا مالێ مەمەدا، ئویجاخا

ماڵ مەختێ، ئویجاخا ئۆمەرا، ئویجاخا بیبەكرا و هەر ئویجاخەك ژ چەند بنەماڵ ورەڤێشت و قنێتان (٣ تا ٦) پێكدهێن كو ژ كەڤندا ب ڤی شێوەی و ناڤان دهاتن ناڤكرن و هەر بنەماڵەك ژی ژ چەند خێزان و مالان پێكدهاتن هەروەكی چەندین كەسێن پیر وناڤساڵڤە چوویی دبێژن بەری (٦٠) سالان گوندێ (چێ) پتر ژ (١٢٠) خێزانا پێكدهات وخێزانێن وی سەر دەمی ژ (١٥ تا ٣٠) كەسان بوون، چونكی پێدڤی بوو خێزان یا ئێكگرتیێ بیت وهەر خێزانەكا خودان مرۆڤ بارێ ئابووریێ وێ خێزانێ زۆر یێ باش وزەنگین بوون.

## رامانا ناڤێ گوندی:

پەیڤا (چێ) یا ژ پەیڤا (چیا) وەكی سرۆشت هاتییە، ب تایبەت دەڤەرا دۆسكی ژوریا، ئەڤە ژی ناڤێ هندەك چیایانە:

- چیایێ سپی و چەلێ.
- بلنداهیا چیایێ همبێ وحولیسك وسەرێ كاتولا هشارێ وسەرێ كەلاشكێ كو ئەڤە د كێشایی ودناڤەراستا ئەردێ گوندێ (چێ) دایە.
- چیایێ ناڤدار سەرێ دارێ تا دگەهیتە كێریێ ئافیف، ب دۆل و نهالا وئاخەكا نەرم و نە هند یا ئاسێ ب بەر.

## سرۆشت و سەقایێ گوندی:

گوندەكێ ناڤ چیا و بلندە ل سەر ئاستێ (دەریا)، د هاڤینادا سەقابەكێ هوین هەیە و د زڤستانادا تا رادەیەكێ گەرمە ل دۆر وێ بەفرا كو پتر ژ دو مەتران ل زڤستانان و بۆ ماوێ پتر ژ (٤) هەیڤا دباریت، لێ ئێك ژ بەلگەیێن راستی یا خوشیا سەقایێ هوین و بەفرین هەبوونا جۆرەكێ دارا كوئەوژی داردینداره، هەروەسا هەبوونا زۆر جۆرە دارێن چیایی و رووەك و گیایێن سرۆشتی وەك گوینی و كڤار ومێخل وهەسپست و رەسە.

## كانیێن گوندی:

وەكی دیار گوندەكێ مەزنە، لێ ل دەڤەرێ ب

گوندێ چێ



كێم ئاڤی (دێم) یێ ناڤداره، ل هاڤینان ئاڤ ب مەنجەلوكێ ل سەر خێزانان دهاته دابەش كرن و تنێ بۆ خوارن وڤەخوارنێ، هەروەسان دچوونە ڕووبارێ ربێ شین یان كانیێن گوندێن جیران ب رنكا پتر ژ دەمژمێرەكێ چوون وهاتن، بەلێ ئەڤ كانیە ژی لێ هەبوون وەك:

كانیا (چێ)، كانیا گەهای، كانیا نێوارا، كانیا سێریجا بهاری، كانیا همبێ، كانیا ڕەندێلا، كانی زەرك ونیڤا كەلاشك ودو بیر وچەند كانی كەو، لێ هەمی بهێنە سەر ئێك نابنە ئێك ئینج بووریا ئاڤێ، بۆ زانین مەزنترین گوندە بۆ مرۆڤ و ب خودانكرنا پەز و مالاتی وكێمترین جهە بۆ بێ ئاڤیێ (دێمی).

## چاندن وخودانكرن:

خەلكێ گوندێ (چێ) ب (ڕەز و پەز)ان ب ناڤ ودەنگن، و دانان و چاندن و سەخبێركرنا ڕەزا تایبەتی دێمی و مێوا و ترێێ زەركی، و ترێێ وان یێ ب ناڤ ودەنگە بۆ ڕەنگ و تاما خو ژبەر سەقا و ئاخا وێ. چاندنا گەنم و جەهی و نۆك و نیسك ژی هەیە لێ زۆر كێم، سەبارەت خودانكرنا پەزی د شەهرەزانە بۆ سەخبێریكرنا پەزی و هەبوونا ئالف وئالیكێن بەرفرەهـ وەك ڕەسە، چولی، بەڕوی، گوینی و هەمی گیایێن زۆزانی و مفادار و چەروانەكێ باش و سەقایەكێ هوین. هەروەسا خودانكرنا مێشێن هنگڤینی تارادەیەكی دشارەزا و خەم خۆربوون، ئەڤی پەزی گەرمیان وكۆز وپاوان و پاییزخێر و بهاران هەبوون و ل هاڤینان وار و زومێن باش هەبوون، وەك بەری سەدان سالان خەلكێ گوندێ (چێ) وار و زۆمێن ب ناڤ ودەنگ ل ناڤ ئاخا تركیا ل دەڤەرا دۆسكی ژووریێ ل چیایێن ساتێ وئۆرەمار ل تركیا هەبوون وەك: زۆزانێن سەرتاتا و تەرگولكێ وخارەمیر و كەپرێ و وارێ سورا. ل دەوروبەرێن گوندی ئەڤ زۆمە هەنە: زۆما همبێ، زۆما كانی زەركێ، زۆما ناڤ خرابا وزۆما كەلاشك، هەروەسا زۆمێن گوندێن جیران وەكی زۆما ئەربر یا نێروا سیتو وزۆما سەرێ دارێ یا رێكانیا و..... هتد.

## ژین وژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر (ڕەز و پەز)ان بوو ب پلا ئێكێ، لێ ژێدەرێن دیتر ژی هەبوون وەك: بازرگانی وكاروانی ژ دەڤەرێن تركیا بۆ عیراقێ، هەروەسا بەرهەمێن سرۆشتی وەك كەزان و كەنگرۆك و مازی و گەلەك تشتێن دی، خەلكێ گوندێ (چێ) د شارەزا بوون د كارێ پیشەسازیێ و دروستكرنا شەلوشەپك و رۆتكاندا و پتر ژدەهـ كەسان ژ خەلكێ گوندێ (بێرە - كارگەهێن وی سەردەمی) هەبوون و كارێ (جوولیی) دكرن، زێدە باری دروستكرنا بەڕ و مافوور و جل و تێر و بەریشت وهەر كارەكێ ژ هریێ و موی و دار و ئاخ و هەر پێدڤیەكا وی سەردەمی، خەلكەكێ بەهرەمەند و كارزان بوون.

## مزگەفت و خواندنا گوندی:

هەر ژ كەڤندا كەسانێن خواندنا ئایینی ل مزگەفتا هەبوو و زانا مەلایێن مەزن د ناڤ گوندێ (چێ) دا هەبوون وەك: مەلا عیسا، مەلا سەعدی، مەلا حسێن ، مەلا ئیبراهیم (چێ)ی كو پلەیا قازی هەبوویە، مەلا خالد، مەلا عەبدولقادر، مەلا فەتاح، مەلا عەلی وگەلەكێن دیتر و هەردەم مزگەفتا گوندێ (چێ) فەقی هەبوون و خواندنا ئایینی یا بەردەوام بوو، بۆ زانین مزگەفتا (چێ) ل سالا (١٢٢٢) زایینی ل جهێ دێرێ هاتیە ئاڤاكرن ل دووڤ وان پێزانینێن ژ زاردەڤێ خەلكێ دانعەمر هاتیە گۆتن و ڤەگێران.

## خواندنگەها گوندی:

سەبارەت خواندنگەها گوندی د سێ دەماندا خواندنگەهـ ل گوندێ (چێ) هاتیە ڤەكرن، ئانكو ڤەقەتیان كەتیە بەردەوامیا خواندنا وێ: ل سالێن ١٩٥٨-١٩٥٩ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیەڤەكرن، پشتی دەسپێكرنا شۆڕشا ئەیلوولا ١٩٦١ێ و ڕوودانێن د وێ قوناغێدا ب سەرێ دەڤەرێ هاتین خواندنگەهـ هاتیەگرتن، پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ سەر ژ نوو ب بریارا ڕێڤەبەریا پەروەردە و فێركرنێ یا پارێزگەها دهۆكێ ل ٧ كانوونا دووێ ١٩٧١ێ سەر

ژنوو هاتییەڤەڤەكرن[٢٠٧]، پشتی شكەستنا شۆڕشا ئەیلوولێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ گوند هاتییەبەردان و خەلكێ وی مشەختبوون و خواندنگەهـ ژی هاتیە گرتن. ل سالا ١٩٨٧ێ ژ ئالیێ سازیێن پەروەردەییێن سەر ب شۆڕشا گولانێ ڤە جارەكا دی خواندنگەهـ ل ڤێ گوندی هاتییەڤەكرن[٢٠٨]، د وان سالاندا ١٣مال ل گوندی دژیان،[٢٠٩] بەلێ ئەڤە ژی هەتا ئەنفالا ١٩٨٨ێ بەردەوامبوویە و دگەل بەردانا گوندی خواندنگەهـ ژی نەمایە و هەتا نها ژی گوندێ بەردایە و كەسەك لێ ناژیت.

## كۆچ وكۆچبەری:

خەلكێ گوندێ (چێ) ژ ئەگەرێ ئاڤ و ئاخ و پاڤژیا سەقایێ وێ گوندەكێ گەلەك بەر ب زێدە بوونێ بوویە، لەوما خەلكێ گوندێ (چێ) كۆچ وكۆچبەر بوویە، چ ژبەر زیدەبوونا مرۆڤان یان ژبەر كاودانێ ئابووری یان ژبەر كارەسات وشەر و هەڤركاتیكرنا دگەل ژیانێ ودیتنا جهێ باشتر ژ وێ دەڤەرێ، عەشیرەتا دۆسكی ژێری و ئەوێن ل گوندێن دهۆكێ و دەوروبەرێن ناحیا مانگێشكێ دژین د بێژن ئەم (چیایی و هەمبی وكاتۆلێ و گوندكی...هتد)، ئەڤ ناڤ و جهە كاڤلە گوندن ل دەورو نێزیك ئاخا گوندێ (چێ)، هەروەسا هندەك ژ عەشیرەتا دۆسكی ژێری دبێژن ئەم شوكەیی (شیكەی)، ئەرتیسی، شەتونسی، شێخ مەمی، چم توو (چەمتی)، ساتی، ئۆرەماری، خیارتەیی و... هتد) كو ئەڤە ژی گوندێن دۆسكی ژووریانە دكەڤنە سەر سنوورێن تركیا و عیراقی، هەروەسا ژ كەڤندا و تا سالێن پێنجییان زۆر كەس و ماڵ هەبوون ل زڤستانان دهاتنە دهۆكێ كاردكرن و ل هاڤینان دچوونە گوندێ (چێ) و زۆر ژ وانان د مان و نە دڤەگەریانە ڤە.

## پێكهاتەیا خەلكێ گوندێ (چێ):

پشتی سالێن حەفتیان وهەشتیان گوند بەرەف كاڤلبوون وخەلكێ گوندێ (چێ) ئاوارە و دەربەدەری ئیرانێ وتركیا بوون، پتریا وان د سالێن ١٩٧٤ێ هەتا

شوینوارێ كاڤلێ مزگەفتا گوندێ (چێ)



١٩٧٥ێ و پشتی ئەنفالان ئاوارەی ئیرانێ بوون، ل سالێن (١٩٩٢،١٩٩١)ێ و پێـهەل ژ دەربەدەریێ و ئاوارەیێ ڤەگەریان هەتا سالا ٢٠٠٣ێ ژی یا بەردەوام بوو و چەندین خێزان ژی ماینە و ژ ئیرانێ نە ڤەگەریاینە. خەلكێ گوندێ (چێ) پشتی سالا(١٩٩١)ێ ل ڤان جهان (كۆمەلگەها شێلادزێ، سیریێ، دێرەلوك، كۆمەلگەها ئازادی و سەرسنكێ، كۆمەلگەها كورا، زاویتە، بازێرێ دهۆكێ، كۆمەلگەها تەناهی و رزگاری، مەعەسكەرێ موقبلێ و بازێرێ دیانا (سۆران) و بازێرێ مەسیف صەلاحەددین و (هەولێر) و گەلەك جهێن دی ئاكنجی بووینە.

## ئامارا گوندی:

(بەهرام جبرائیل یاسین چێی) دبێژیت: ل رێكەفتی (٢٠٠٥/٧/١)ێ رابووم ب ئامارکرنا خەلكێ گوندێ (چێ) و ئەو جهێن لێ ئاكنجی، ئامارا خێزانێن وان ل سالا (٢٠٠٥)ێ (١٠٨٧) خێزان بوون كو ژمارا كەسان (نفوس) دبیتە (٥١٥٢) كەس[٢١٠].

## گوندێ ئەرتیس:[٢١١]

ئەرتیس: ئێك ژ گوندێن دەڤەرا (دۆسكی ژووری)یە ل سەر سنوورێ عیراق- تركیا.

## جوگرافیا گوندی:

گوند ژ لایێ باكوورێ رۆژهەلاتی هەڤسنوورە دگەل باكوورێ كوردستانانێ دگەل هەردو گوندێن (برویێ و سێڤی) وارەكێ زۆزانی یە، ژ ئالیێ رۆژهەلاتێ ڤە ژ دەراڤێ (رندێلا) بەرەف باكوور د (هەڤشێكێ بوسی) را دبووریت بەرەف (تلێ دودێ) و بەرەف (گرویا بەرزە كولا و بەرمێشكێ) هەتا (لاتا بەرمێشكێ) دبیتە هەڤسنوور دگەل گوندێ (بیرێ)، ژ لاتا (بەرمێشكێ) بەرەف باكوور دچیت و تا دگەهیتە (بەرێ بسیس) و هۆسا دبیتە هەڤسنوور دگەل گوندێ (شێخ مەما)، ژ ئالیێ باكوور ژ (بەرێ بسیس) بەرەف رۆژئاڤا دچیتە د كیریێ (ماكوكەی) را دەرباسی بۆ سرتا (شكێری) و (گرێ ب دار) و (كێریێ كێفتێ) و سەرێ (سویلكێ ب رێڤاس) و هۆسا دچیتە (هویركی) كو دبیتە سەرێ چیایێ (حسارێ) بەرەف (داركا بێریا) دچیت

ڤوتابخانا گوندێ چێ ل سەردەمێ شۆرشێ (١٩٨٧-١٩٨٨)



و هۆسا دبیتە هەڤسنوور دگەل گوندێ (بروێ)، ژ ئالیێ رۆژئاڤاڤە ژ سەرێ (دارکا بێریا) بەرەف باشوور (دملێ دەهولێ)را دبووریت (کێریێ سیڤێ) و تا دگەهیتە (قوپێ کادینکا) بەرەف باشوور تا سەرێ (درینێ) وهۆسا بەرەف باشوورێ رۆژهەلاتی د کێریێ درینێ را بۆ سەرێ (بەرێ مێرا) دەرباز دبیت و سەرێ (چیل وچەمی) و سەرێ هرچکا هەیانێ قوپێ (مشایخێ هرچکا) بەرەف باکوور بۆ سەرێ کانی زەرکێ هەتا قوپێ کانی زەرکێ و دبووریت بۆ هنداڤی زۆما کیریێ (کانی زەرکێ)، و د بیتە هەڤسنوور دگەل گوندێ (تتم) ،و ژ ئالیێ باشوور ژقوپێ کانی زەرکێ بەرەف رۆژهەلاتی دزوما کانی زەرکێ را دبووریت بۆ باسکێ دناڤبەرا (رندێلا وئیسف هەرین) و کورێت (کولیلکێنزەر) هەتا دەراڤێ رندێلا دبیتە هەڤسنوور دگەل گوندێ (چێ).

### ئویجاخ و بنەمالێن گوندی:

گوندێ ئەرتیس ژ هەشت بنەمالان پێکدهێتن: بنەمالا محێ (شێخی)، بنەمالا قاسێ. دبێژنە ڤان هەردو بنەمالان (ئویجاخا شێخێ)، بنەمالا قتاس، بنەمالا کەکێ، بنەمالا شەلال: دبێژنە ڤان سێ بنەمالان پێکڤە (ئویجاخا مرتوی، بنەمالا عەبدولرەحمان (بەفریکی)، بنەمالا هەدرەش، بنەمالا هەسن: و ڤان سێ بنەمالان پێکڤە دبێژنێ (ئویجاخا عەبێ)[٢١٢].

### رامانا ناڤێ گوندی:

ل دۆر رامانا ناڤێ گوندێ (ئەرتیس) ب رامانا (ئەردێ ب تویسی) دهێتە دیارکرن، کوناڤێ گیایەکێ یە، ل دووڤ بۆچوونەکا دی (ئەرتیس) ژ ناڤێ سەرۆکێ شورشێن میدی هاتییە وەرگرتن کو ناڤێ وی (فراڤ ئەرتیس) بوویە، بۆچوونەکا دی ژی هەیە کو ژ ناڤێ (ئەرجیش) هاتبیتە وەرگرتن ب رامانا (سەرباز-لەشکەر)[٢١٣].

### سرۆشتێ گوندی:

سرۆشتێ ئەرتیس گوندی دابەش دکەت ل سەر

گوندێ ئەرتیس



دو تەوەرا، ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە تا نێزیکی گوندی دبیتە سرۆشتەکێ دارستانی و هەمی جۆرێن داروباری وەکی (داربەڕوی، مازی، دیندار، کەڤۆت، کنێر، کەزان، بێمك، گویز، گوهیشك، گرسك، گرك، هەڤرست، تەڤری، سماق، باهیڤ، حاج باهیڤ، هژیر، و دیکانە و گشت تەراش و دار وبارە)، ژ لایێ رۆژئاڤایڤە هەتا سنووری سرۆشتەکێ زۆزانی یە و گەلەك جۆرێن گل وگیایێ ل ڤێ کویستانێ هەنە، وەك (ڕەسە، کەرکول، گەڤرە، با، چەڤر، وکارباکەلێ، سیرك، کەنگر، سترك، خەلەندور، ریڤاس، کیڤارك، هنگەدان، تیسی، گیابەند، کەری وهن جۆرێن دن) لێ ب (تیسی وکەنگر)ان ب ناڤ دەنگە، سیمایێ گوندی پرە ژ دیمەنێن رەنگین و گول و کولیلك و تەڤ جۆرێن تەیر و تەوالان، کەش و بایەکێ فێنك و کەڤی و کانی و دۆل و نهالێن هەمە جۆر هەروسا وارگەهێ کەوا و پەرندانە. ل زڤستانێ سەقایەکێ دژوار و ب بەفر و باکوزیرك و بارانە، هندەك جارا (٢-٣) مەترێن بەفرێ لێ دبارن!.

## کانیێن گوندی:

١- **کانیا گوندی:** ژێدەرێ ئاڤا وێ ژ هەردو کانیێن (بێرا شێرا، و کانیا پالا) یە. هەردو د سۆلین کری نە هەتا سەرێ گوندی ژ ئالیێ رۆژ ئاڤاڤە، ژ بۆ (ڤەخوارنێ و کارۆبارێن ناڤمالێ) دهاتە بکارئینان، ب تێرا (٢) دۆنەمێن ئەردی ل بەرشین د بن و ژبۆ چاندنێ دهات بکارئینان، هەروەسا گویز وتوی ژی ل بەر لێڤا جۆکێ شین دبن.

٢- **کانیا پەزی:** دکەڤیتە رۆژئاڤا کانیا گوندی ژ ئالیێ نزاری ڤە، هاتبوو بەرهەڤکرن ژ برکەکێ کو ژ بەرا دروستکربوون و ژمارەکا بۆتا ل بەر دروستکرنە، ئاڤا وێ بۆ تەرش وکەوالان دهاتە بکارئینان، ب ڤاسی (...-٢...٣) سەرێن پەزی و (٢٠٠-٣٠٠) گارەش و دەوار ل بەر د هاتن ئاڤدان، ئانکو یا تایبەت بوو ب ئاژەلان ڤە.

٣- **کانیا هیزلی:** دکەڤیتە رۆژئاڤا کانیا پەزی، جهوارەکێ زۆزانی یە، گوندیا مفا ژێ دیتنە دەما هاڤینا دچوونە زۆمێ و ناڤدارە ل دەڤەرێ هەیە ژبەر کو ئاڤا وێ گەلەك یا تەزی و سارە.

٤- **کانیا دەشتا مالا:** د کەڤیتە باکوورێ کانیا هیزلی ب ڤاسی (٩) دۆنەمێن ئەردی ل بەر دهێنە ئاڤدان کو هەمی جۆرێن فێقیێ هاڤینێ لێ دهێن چاندن مینا باجان، خیار، پیڤاز، رتاخ، باجان رەشکو....هتد)، ل گۆر گۆتنا دانعەمرێن گوندی دبێژن: ئەرمەنا ئەڤ ئاڤە ڤیر کرنە، وشوینوارێ ئاشەکێ کەڤن ل بنێ زەڤیێن دەشتا مالا خویانە کو دکەڤیتە پشتا بەرێ گر.

٥- **کانیا هرچکا:** دکەڤیتە باشوورێ گوندی، دهاتە بکارئینان ژبۆ ئاڤدانا تەرش و کەوالی، هندەك جارا ئەڤ کانیە دانەڤ خەلکێ گوندێ (چێ) یا ژبوی ئاڤدانا پەزێ خو.

٦- **کانیا کانی زەرکێ:** دکەڤیتە باشوورێ کانیا هرچکا، گوندیا ژبەر دووریا وێ چ مفا ژێ نە وەرگرتنە، دیسان دانەڤ گوندێ (چێ) ژبوی ئاڤدانا کەوالێن خوە.

٧- **کانیا تاتەرەشا:** دکەڤیتە باکوورێ گوندی، ل ناڤەندا چیایێ حسارێ.

٨- **کانی کویسەلکێ:** دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤا گوندی و ئاڤا وێ هندەك یا کێم بوو.

٩- **کانیا جیل وجەما:** دکەڤیتە رۆژئاڤا کانیا هرچکا ئاڤا وێ گەلەکا کێمە و ل پەسارەکێ رژد دەردکەفت و کێم مفا بوو، لێ وارگەهێ کەوان تێ زانین.

## گۆڕستانێن گوندی:

گۆڕستانا (ناڤ ڕەزکا)، گۆڕستانا (ملێ زیارەتا)، گۆڕستانا (تربە سیسکێ)، گۆڕستانا (گەویا کەنیشکێ)، گۆڕستانا(بن تەنگەدەرێ).

## دۆلێن (نهال)گوندی:

**دۆلا رەزا:** نهالەکێ پری رەز بوویە و مێو وتریەکێ هەژی لێ هەبوویە، ناڤدارترین جۆرێن تری (زەرك،

ڕەش مێو، سەودالی، سلێمانی ...هتد) لێ هەنە.

**دۆلا هرچکا:** دکەڤیتە باشووریێ گوندی و دبیتە چەند دۆلەکێن بچووك وكانیيا هرچکا دکەڤیتە ناڤەنداوی، پری ڕەسە و هەلز و وکیڤارك وکەنگرە.

**دۆلا کانی زەرکێ:** دکەڤیتە باشووریێ دۆلا ڕەزا، پرە ژ ڕەسێ وکیڤارکا.

**دۆلا ئیسف هەرین:** دکەڤیتە رۆژهەلاتا کانی زەرکێ ، رووبەرکێ زەڤێن بەرفرەهـ لێ هەیە و هن جار گوندیان کۆلك لێ چێکرنە و پەزێ خۆ لێ خودانکرنە.

**دۆلا خارکینێ:** دکەڤیتە رۆژهەلاتا گوندی ل کێلەکا گوندێ بیرێ، دارستانەکا چرو تارییە، گوندیان هندەك جاران ل زڤستانان خانی و کۆل بۆ خودانکرنا پەزێ خۆ لێ چێکرنە.

**دۆلا بیرا سوتی:** دکەڤیتە رۆژئاڤا خارکینێ وژمارەکا زەڤیان لێ هەنە، هن رەز و کاڤل لێ هەنە، ل زڤستانا پەز لێ خودانکرن.

**دۆلا نێکویر:** دکەڤیتە رۆژئاڤا بیرا سوتی و ژمارەکا زەڤیان لێ هەنە، سەرێ وێ پرە ژ ڕەسێ و کیڤارکا.

**سەرێ دۆلا نێکویر:** دبێژنێ تەنگا سیارێ و دبەردا دئالیێ گوندی دا دبێژنێ سەرکیشکا، ئەڤەژی پرن ژ ڕەسێ.

**دۆلا بەرێ زین:** کەڤرەکێ گەلەك مەزنە و وەکی (زینی) دیارە.

**دۆلا هیزلی:** دکەڤیتە رۆژئاڤا گوندی و زۆزانا گوندی یە، نهالەکا گەلەك بەرفرەهە و ل کناریێ باکوور (کانیا کریێ) کانیەکا زۆر رند لێ دەردکەڤیت وئاڤەکا سپی یە هندی جۆکا ئاشەکێ یە، لێ زوی هشك دبیت، ل کناریێ باشوور (کانیاهیزلی) یە و ژ بۆ خوارن و ڤەخوارنێ دهات بکارئینان، ئاڤەکا شرین و تەزی ژێ دەردکەڤیت.

**دۆلا بەرێ مێرا:** بەرەکێ وەکی سەیوانانە (شەمسی) و نهانی یە، دکەڤیتە باشووریێ هیزلی بەشێ باکووریێ ڤێ دۆلێ دبێژنێ درینی دۆلەکا زۆر بەرفرەهە، ل بهارا پری گیایێ ڕەسە و کیڤارکن، کەڤێن بەفرێ هەتا هاڤینێ ژی لێ دمینن.

## چیایێ گوندی:

چیایێ حساریێ: چیایەکێ بلندە و مفا دارە، پرە ژ گول و گولزار وگیایێن مینا (گیابەند، جاتر، هنگەدان، رێڤاس، خەلەندور، تویسی، کەرکول، تۆلکا کەلێ، لویش، سترك.. هتد)، هێلا سەری پێکدهێت ژسویلکێ ب رێڤاس، هویرکی، دارگابیری یا. هێلا ناڤەندیێ: کویرکێ تاتەرەشا، کویرکێ سەعید، کویرکێ نەعمان، ملێ دهولێ. هێلا ژێری ژێ: بەرێ زین، زیاریێ، دولکێن تەرازنا، زەڤیلکێ.

## ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

- دێرا ئەرتیس (تربەسیسکێ):

دێرەکا کەڤنارە ل سەرگرەکێ هاتییە دروستکرن، دکەڤیتە رۆژهەلاتا گوندێ نوی، ژمارەکا زۆر ژ زەڤیێن گوندیان یێن لێ هەین.

- مزگەفتا گوندی.

## خواندنگەها گوندی:

سالا (١٩٧٠)ز)ێ خواندنگەهە ژ ئالیێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتبوو ڤەکرن، پشتی کو قشلێن لەشکەری یێن حکۆمەتا عیراقێ هاتینە گوندێ (ئەرتیس)[٢١٤].

ئەڤ گوندە ل سالێن هەشتییان سەردەمێ شۆرشا گولانێ ژ ئالیێ خەلکێ وی ڤە هاتبووڤە ئاڤاکرن و بەری ئەنفالێن ١٩٨٨ێ ١٥ مال لێ دژیان، د ئەنفالاندا مشەختبوونە باکووریێ کوردستانێ گوند هاتەخرابکرن و هەتا نها نەهاتییەئاڤاکرن[٢١٥].

# گوندێ بیرێ:

## جوگرافییا گوندی:

گوندێ بیرێ ئێك ژ گوندێن دۆسکی ژووریانە دکەڤیتە سەر سنووریێ ترکیا.

**باکووری،** گوندێن چەمتی و شێخ مەمانە.
**باشووری،** گوندێ (چێ) یە.
**رۆژهەلاتی،** ئاڤا رووبارێ (ڕوویێ شین)ە.
**رۆژئاڤایی،** گوندێ (ئەرتیس)ە.

**نویجاخێن گوندی:**

گوند یێ دابەشکریە سەر پێنج ئویجاخان ب ڤی رەنگی:

مالا حسێنی، مالا نزاری، مالا دوولێ، مالا میرزای، مالا گری (تاخێ گری)، ژمارا خێزانێن وان ل باشوورێ کوردستانێ د دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێدا (٣٤٠) خێزانن، (١٥٠) خێزان ژ وان ل کۆمەلگەها شێلادزێ دئاکنجی نە، یێن دی ژی (٥٠) خێزان ل تەناهیێ و (٢٠) خێزان ل مقوبلێ و (١٢٠) خێزان ل دیانا، ژ بلی(١١٢) ل باکوورێ کوردستانێ و (٦٠) خێزان ل رۆژهەلاتا کوردستانێ.

**زێن و زیارا گوندی:**

بیرێ گوندەکێ دێمە و ژیارا وان ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنا گەنم و جەهی بوو، هەروەسا بەرهەمێ کەزان و مازی و رەزا دفرۆت.

**کانیێن گوندی:**

کانیا بن چەلی، کانیا سەر دولکان.

**چیایێن گوندی:**

چیایێ سپی کو دکەڤیتە باشوورێ گوندی، یێ خەملاندیە ب دار بەڕوی و مازیان و مفایەکێ باش بۆ سۆتنێ ژێ وەردگرتن، هەروەسا چلویێ وێ بۆ پەزی.

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا نێزیرێ، شکەفتا سوور.

**شوینوارێن گوندی:**

خانیێ کافری کو دکەڤیتە رۆژئاڤا گوندی ب شێوەیێ ئەهرام ئاڤاکریە، خانی ژێر ئەردی یە و دەرگەهێ وێ ژووردا د چیتێ، گرانیا هەر بەرەکێ وی ژ (٦٠٠-٨٠٠ کگم)انە.

**گوندێ بیرێ**



**داروبارێن گوندی:**

دارێن فێقی: (١١) جۆرێن هرمیان هەبوون وەكی: شریانی، هومبانی، شینێك، خوەرستی، تەباخی، كیمەهی، هرمیسێڤ، گوڤانی، حاجی ئەحمەدی، هرمیسوور، گرێك.

دارێن بەرگر: دار مازی، بەڕوی، دیندار، كوهیشك.

**رۆلێ خەلكێ گوندی د شۆڕشێن كوردیدا :**

سالا ١٩٧٦ێ پشتی شۆرشا ئەیلولێ تێكچووی گوند بۆ دو پشك، پشكەك ژێ بەرەف ئیرانێ چوون و یادن ژی ل گوندی مان، هەردوێ سالێدا رژێما عیراقێ گوند چۆلكر و سۆت و ل شێلادزێ ئاكنجیكرن، سالا ١٩٨٦ێ خەلكێ گوندی هەمی بەرەف گوندێ خۆ چوون تا سالا ١٩٨٨ێ دەمێ ئەنفال ب سەر دا هاتی ١٢ مال ل گوندی دژیان،[٢١٦] ئەو ژی مشەختبوونە باكوورێ كوردستانێ، هندەك ل مۆشێ ئاكنجی بوون و هندەك ژی ل ئیرانێ ل ئوردیگایێ (زێوە)، پشتی سەرهلدانێ جارەكا دی هەمی ڤەگەریانەڤە، نها ل شێلادزێ (ل باكوورێ رۆژئاڤا كو دبێژنێ بیرا شێخوی و ل باشوورێ رۆژهەلاتی كو دبێژنێ بیرا هەڤنكا) و سیریێ ئاكنجی بووینە[٢١٧].

**گوندێ نێروەك:**

ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسكی ژووریانە، دكەڤیتە باكوورێ دەڤەرا وان و هەڤسنوورە دگەل عەشیرەتا رێكانییان، ئەڤ گوندە ب ناڤێ (نێروەكا سیتو)ی ژی بەرنیاسە.

**جوگرافی یا گوندی:**

**باكووری،** گوندێ (تتم)ە.

**باشووری،** گوندێ (بێدەیە- رێكان).

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (مروانس- رێكان)ە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن (زێوە) و (كنیانش)ە كو ئەو ژی سنوورێ (باكوورێ كوردستانێ) یە.

**بنەمالێن گوندی:**

گوند ژ ڤان بنەمال و ئویجاخان پێكدهێتن:

گوندێ نێروەك



ئویجاخا مەلکا، ئویجاخا میرێ، ئویجاخا مرێ، ئویجاخا ماروی، ئویجاخا شێر زێندینا، ئویجاخا مالا قاسم.

**کانیێن گوندی:**

کانیا مەلا فەتاح، کانیا نێروا ژووری، کانیا سرکێ، کانیا جیا، کانیا برکێ، کانیا ئەحیای، کانیا صوفی، کانیا زێندین، کانیا موراد.

**شکەفتێن گوندی:**

شکەفتا دوو دەر، شکەفتا چار ستین، شکەفتا رەش، شکەفتا هۆستا بادین، شکەفتا دیپرێ، شکەفتا سورێ کوخی، شکەفتا مرێ، شکەفتا بەراك، شکەفتا گوندی، شکەفتا ترار، شکەفتا خارکی، شکەفتا لاتە زەرا، شکەفتا بیشی.

**سرۆشت و ژینگەها گوندی:**

ژینگەها ڤی گوندی گەلەکا ب دار و بارە و ژ گەلەك جۆرێن دارا وەکو: گویز، کەزان، سێڤ، هرمیك، حلیك، بیهـ مژمژە، کروستك، هژیر، بەڕوی، مازی، کەبوت، دیندار، سپیندار ... پێکدهێت، ژ ئالیێ چاندنێ ڤە یا ناڤدارە ب چاندنا: برنجی، کونجی، رتاخا (بتات)، گەنمۆك، باجان، خیار، گارس، تەعلەی، ماش، دەخلی ....، هەروەسا جهەکێ ئیستراتیژی یە بۆ بازرگانیێ چونکی هەڤسنوورە دگەل ترکیا.

**خواندنگەها گوندی:**

سالا (١٩٨٧ز)ێ خواندنگەهەك ل گوندی ژ ئالیێ شۆڕشێ ڤە هاتە دامەزراندن ل ژێر سەرپەرشتی یا خاندنگەهێن شۆڕشێ ڤە، ژ (٤٨) خویندکاران پێکدهات و ژ ئالیێ چوار مامۆستایان ڤە دهێتە ب رێڤەبرن، ئەو ژی: شوکری ئیسماعیل (رێڤەبەر)، محەممەد صەدیق یاسین، تەحسین عەبدوللا بیری، حەسەن رەشید[٢١٨].

ل دۆر جهێ خواندنگەهێ مامۆستا (شوکری) گۆت: جهێ ئاڤاهیێ خواندنگەهێ جهێ ئالفێ ئاژەلان (گیانەوەران) بوو، مە پاقژکر و کرە خواندنگەهـ و ناڤێ وێ کربوو (دیاربەکر)، ئەو بابەتێن دهاتنە خواندن

خواندنگەها (دیاربەکر) ل گوندێ (نێروەك- دۆسکی ژووری) ل سالا ١٩٨٧ ێ مامۆستا (شوکری ئیسماعیل)[٢١٩]



ئەڤە بوون: خواندن و نڤیسین، پەروەردا ئیسلامی، بیركاری، سرۆودێن نیشتیمانی، كشتوكال، هۆنەر، وەرزش .....، بۆ ماوێ سالەكێ تا ئەنفالان یا بەردەوام بوو، پشتی هینگێ خەلكێ گوندی دەربەدەری تركیا و ئیرانێ بوون.

### شوینوارێن گوندی:

ل ڤی گوندی گەلەك شوینوار یێن لێ هەیین، وەكی شوینوارێن كنیشتا وكەلایێن دێرین و نورینێن كانییا و شكەفتێن كەڤنار، سەردەمێن كەڤن دا (جوهی) ل گوندی هەبووینە، پاشی فەلە هاتینە، پشتی هینگی مۆسلمان، ل سالێن ١٩٠٥ تا ١٩٠٩ێ ئەڤ گوندە ژئالیێ هێزێن ئینگلیزی ڤە هاتبوو سۆتن، سالا (١٩٧٦ز)ێ گوند ژ ئالیێ عیراقێ ڤە هاتبوو وێرانكرن و خەلكێ وێ ئاوارەی رۆژهەلاتێ كوردستانێ ببوون، هندەك ژی ل سالا(١٩٧٨ز)ێ ل كۆمەلگەهێن سیریێ و شێلادزێ ئاكنجی بوون.

گوند ل سالێن هەشتییان سەردەمێ شۆرشا گولانێ ژ ئالیێ خەلكێ وی ڤە هاتبووڤە ئاڤاكرن و بەری ئەنفالێن ١٩٨٨ێ ٧٠ مال لێ دژیان، د ئەنفالاندا مشەختبوونە باكوورێ كوردستانێ گوند هاتەخرابكرن و هەتا نها نەهاتییەئاڤاكرن[٢٢٠].

## گوندێ شەتینس (شەت یونس):

شەتینس: ئێك ژ گوندێن عەشیرەتا (دۆسكی ژووری)یە، ژ وان گوندانە كو دەرامەتێن (ئاڤی و دێمی) لێ دهێنە چاندن، دار و بارێن فێقی یێن لێ هەین و بەرهەمێن ئاڤی و دێمی وەك برنج، گۆیز، كەزان، سماق، مازی).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ (چەمتی)یە.

**باشوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێ (بیرێ)یە.

**رۆژهەلاتی،** سنوورێ تركیایە.

**باكوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ (شێخ مەما ژووری)یە.

**شوینوارێ قەسرا مالا ئەحیای بابێ محەممەد صالح**



**ڕامانا ناڤێ گوندی:**

بۆچوونەك هەیە كو ڕووبارەكێ بۆش دناڤ گوندی دا دبووریتن، ئانكو گوندی شەت دكەتن (شەت ب ڕامانا ڕووبار دهێتن شەتنس یان شەت یونس)[221].

**بنەمالێن گوندی:**

گوند ژ ڤان بنەمالان پێكهاتییە: بنەمالا ئیبراهیم، بنەمالا حەیدەر(هەیدەر)، بنەمالا مامدەل، بنەمالا هادی.

**كانیێن گوندی:**

هژمارەكا باش یا كانیان ل گوندی هەنە، ژوان ژی: كانیا پەمبیا، كانیا گورگاوا، كانیا نهالێ، كانیا زەڤیا مێویشكێ، كانیا سەرۆكانیێ، كانیا سەر گری، كانیا خارانێ، كانیا تاوینكی، كانیا بانە سورێ.

**شكەفتێن گوندی:**

شكەفتا دێرێ، شكەفتا سیریێ، شكەفتا بەرۆژی، شكەفتا دمدمیكێ، شكەفتا بریێ، شكەفتا گەزێ، شكەفتا گایا، شكەفتا چەمێ زورێ، شكەفتا بنرەشێ، شكەفتا گاوێ، شكەفتا صورێ.

**گۆڕستانێن گوندی:**

گۆڕستانا زیارەتێن كەڤن، گۆڕستانا بەرگوندی.

**ئاوارەبوونا گوندی:**

سالا (١٩٧٥)ێ خەلكێ گوندی ئاوارەی ئیرانێ ببوون، پشتی دەمەكی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، لێ گەلەك نەڤەكێشا سالا(١٩٧٨)ز)ێ ژ ئالیێ عیراقێ ڤە تووشی وێرانكرنێ بوو خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێن (سیریێ و شێلادزێ و تەناهی و موقبلێ) جهوار بووینە.

## گوندێ چەمتی (چەم توو):

ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسكی ژووریانە، گوندەكێ گەلەك ب ئاڤە، ڕووبارێ ڕوویێ شین (زێی شین) د نیڤەكا هەردو چەمێن گوندی (چەمێ پان) و (چەمێ

گوندێ چەمتی



تویا) را دبووریت، ئانكو ڕووبارێ (زێیێ شین) ل ڤی گوندی دهێته دناڤ ئاخا باشوورێ كوردستانێ دا، گوندەكێ سنووری یە و دبیتە دو بەش، بەشەك د ناڤ سنوورێ باكوورێ كوردستانێ دایە دبێژنێ (چەمێ پان) و بەشێ دیتر د ناڤ سنوورێ باشووردایە دكەڤیت.

## جوگرافییا گوندی:

**باكووری:** سنوورێ تركیایە.

**باشووری:** گوندێ (بیرێ)یە.

**باشوورێ رۆژهەلاتی:** گوندێ (شەتینس)ە.

**باشوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێ (شێخ مەما ژووری)یە.

## ڕامانا ناڤێ گوندی:

ناڤێ گوندی یا ژ سروشتێ وێ ژ پەیڤا (چەمێ تیا) هاتییە وەرگرتن، ژبەر پتریا دارێن گوندی ژ دارا تویێ (تویا- تیا) پێكدهێتن و بەرنیاسە ب چەم و زەڤییێن تویا، بۆ سڤككرنا پەیڤێ بوویە (چەمتی).

## بنەمالێن گوندی[222]:

بنەمالا حەدادا، بنەمالا گوران، بنەمالا شێخێ.

## كانییێن گوندی:

- كانییا بنكیرەی: كانیەكا گەلەك بۆش و تەزی یە، مەزنترە ژ یا (بێخالێ)، گەلەك یا ب دارو بارو كەسكاتی یە، ئەڤ كانیە ل هەیڤا چوار (نیسانێ) دزێت و ل هەیڤا (١٠) هشك دبیت، كانییا سەرگیرەی: ئەڤە كانیە ل سەر بلنداهیێ دهێتن، كانییا سەرگری.

## شكەفتێن گوندی:

حەفت شكەفت ل گوندی هەنە مفا ژ هەمی یان دهێتەوەرگرتن، چ بۆ مرۆڤان یان مەروماڵاتی، شكەفت ژی ئەڤەنە: شكەفتا حەدادا، شكەفتا مالا گوران، شكەفتا زەرێ، شكەفتا چەمكێت كا كو سێ شكەفتن ب ئێك ناڤ، شكەفتا شیڤا شەناص[223].

## سرۆشت و ژیارا گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی بوویە، تایبەت بزن و میهـ و چێلان، ژ بلی دەرامەتێ چاندنێ وەك: برنج، گەنمۆك، تویتن، كونجی، و گەلەك جۆرێن فێقی وەك: جۆرێن سێڤان و گەلەك جۆرێن هژیران وەكی شنگاری، سپی، ڕەش، و گەلەك جۆرێن تری وەكی تریێ ڕەش و زەرك و هنارێن شرین و ترش و مز و هرمیك و جۆرێ هرمیكا قریشی، هەروەسان گەلەك دەرامەتێ چاندنێ یێ كەسكاتی و زەرزەواتی لێ دهێنە چاندن وەكو خیار و تروزی و باجان و باجان ڕەشك و گوندور و شمتی (شتی) و ڕتاخ (پتات - كرتۆپ)، داروبارێ دێمی ژی: دار بەڕوی، دار مازی، گویز، گوهیشك... یێن لێ هەیین.

## ئاوارەبوونا گوندی:

پشتی سالا (١٩٧٥ز) دەمێ گەلەك ژ گوندێن دۆسكی ژووریان تووشی زۆرداری و هەوا ڤەگوهاستنا گوندان یا عیراقی بووین، خەلكێ گوندێ چەمتی ئاوارە و دەربەدەری تركیا بووینە و ل گوندێن سەر سنووری وەكو: زێرێ و زەرەنی و سەرپێل... ئاكنجی بووینە پشتی ئەفسەرێ توركا ڕازی كری ب (٥٠٠ دینارێن عیراقی)!، پشتی سێ سالان ل (١٩٧٨ز)ێ هاتنەڤە گوندی و لێ ژیاینە، بەری ئەنفالان ٣٠ مال ل گوندی دژیان، جارەكا دی خەلكێ گوندی تووشی دەربەدەریێ بووینە بۆ تۆركیا و ئیرانێ، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ زڤرینەڤە باشوورێ كوردستانێ و ل كۆمەلگەها شێلادزێ جهوار بووینە.

# گوندێ زێوە:

ژ گوندێن دەڤەرا دۆسكی ژووریانە یێن ل سەر سنوورێ تركیا - عیراق.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ (تتم)ە.

**باشووری:** گوندێ (بێدە - رێکان)ە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (شەتینس)ە.

**رۆژئاڤایی:** سنوورێ ترکیایە و گوندێ (کنیانش)ە.

## بنەمالێن گوندی:

بنەمالا حەجی محەممەد، بنەمالا چیلا، بنەمالا حەجی یاسین، بنەمالا صەنعان.

## سرۆشت و کانییێن گوندی:

سرۆشتێ گوندی چیایی یە کو ل رۆژهەلاتا گوندی چیایێ (سەربیشکێ)یە، و ل رۆژئاڤا ژی (گرێ میسا) و چیایێ (پاناڤێ)یە، گوندەکێ ئاڤی یە و بەهرا پتر یا ئاڤا وێ ژ کانییێن ناڤدار ب کانییێن سەربیشکێ زێوە کو دکەڤنە چیایێ سەربیشکێ ل هنداڤی گوندی، ئاڤا ڤان کانیان ب جۆکان بۆ ناڤ گوندی دهێتە ڤەگوهاستن و ژیلی ڤەخوارنێ تێرا ئاڤدانێ ژی دکەتن، ل باشوورێ گوندی زۆما زێوەیە، کو هەڤسنووره دگەل زۆما گوندێ (بێدە- رێکان)، ل وەرزێ هاڤینێ دا گوندیان قەستدکرێ و بۆ ماوەیێ سێ هەیڤان لێ د مان، ئەڤ زۆمە یا ناڤدارە ب زۆما (مێزراج)، کو جهەکێ بلندە و گەلەکێ هوینە و سەقایەکێ خۆشە و کانیەکا خۆش ژی یا لێ هەی[٢٢٤].

## شکەفتێن گوندی:

شکەفتا سیلەجنێ، شکەفتا پاناڤێ، شکەفتا سیخر، شکەفتا خانی، شکەفتا ناڤشەکفتا.

## ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن گوندی، دیوارێن دو مزگەفتێن کەڤن لێ دیارن، هەروەسا شکەفتا (خانی)، کو دکەڤن دا مال ژی تێڤە ژیاینە.

## ژین و ژیارا گوندی:

ژیارا وان ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنا برنجی بوو، سەرەرای هەبوونا رەز و باغ و چاندنا کەسکاتی و زەرزەواتی و دەرامەتی، ژمارەکا زۆرا دارێن گویز و کەزانان لێ هەنە، خەلکێ وی بۆ

زوما مێزراج ل رەخێ گوندێ زێوە



بازرگانیێ دبرنه بازارێن ئامێدیێ و مووسل و د فرۆتن و پێدڤیاتیێن خۆ پێ دكرین، ل ئەنفالا ١٩٨٨ێ خەلكێ گوندی ئاواره و دەربـەدەری تركیا و ئیرانێ ببوون، پشتی سەرهەلدانێ ڤەگەریاینەڤە كوردستانێ و ل شێلادزێ ئاكنجی بووینە.

## گوندێ تتم:

گوندەكێ خودان دەشتەكا بەرفرەهه كو دبێژنێ: (دەشتا دو دۆل - نهال).

### جوگرافییا گوندی:

**باكووری:** گوندێ (ئەرتیس).

**باشووری:** گوندێ (نێروەك - نێروه سیتو)یه.

**باكوورێ رۆژهەلاتی:** گوندێ (چێ)یه.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (سیڤێ- باكوورێ كوردستانێ)یه، و ل باشوورێ رۆژئاڤاژی دبیته (كنیانش).

### بنەمالێن گوندی[٢٢٥]:

گوندێ (تتم) ژ ڤان بنەمالان پێكدهێتن:

بنەمالا حەجی (عەرەفات محەممەد فەتاح)، بنەمالا مستەفا محەممەد فەتاح، كو ئەڤ هەردۆكه برایێن ئێك بوون، بنەمالا محەممەد ئیسماعیل، بنەمالا ئەحمەد ئیسماعیل، بنەمالا خالد یەعقوب.

### خواندن ل گوندی:

سالا ١٩٨٧ێ گوند ژ ١٧ خێزانان پێكدهات و ٢١ زارۆك هەبوون، سازیێن شۆرشا گولانێ خواندنگەهەك ل ڤی گوندی ڤەكربوو و مامۆستایەك بۆ تەرخانكربوو[٢٢٦]، ب دەسپێكرنا ئەنفالان ل سالا ١٩٨٨ێ و بەردانا گوندی خواندنگەهـ ژی هاتەگرتن.

### رامانا ناڤێ گوندی[٢٢٧]:

وەكی دهێته ڤەگێران: كو ل دەستپێكێ مامەك و دو برازایێن خۆ رابوون چوونه جهێ گوندی، ل وێرێ كانیەكێ دبینن و دبێژیته برازایێن خۆ، ئەم دێ چینه وێرێ مال و خانیێن خۆ ئاڤاكەین، وان گۆته مامێ خو، تۆ ب تنێ هەره ئەم ناهێین و ناڤێ گوندی هەر ژ ڤێ رامانێ هاته وەرگرتن ئانكو كورتكری یا پەیڤا (تۆ بتنێ)یه، ئانكو (تتمێ) یا ژ (تۆ بتنێ) هاتی!.

### كانیێن گوندی:

كانیا تتم، كانیا مەرێز، كانیا كەلاشكێ، كانی كەوكێ، كانیا جمهوری، كانیا ریهێت حەجوی، كانیا بن گری، كانیا بن گیزكێ، كانیا بیهێ، كانیا بن هەڤرسا، كانیا هەوالەی، كانیا بەروار، كانیا بۆتكێ، كانی چویچكێ.

### شكەفتێن گوندی:

شكەفتا ئافریف[٢٢٨]، شكەفتا ریخن، شكەفتا جامێر، شكەفتا جمبێلك.

## گوندێ شێخمەما:

گوندێ شێخمەما ئێك ژ گوندێن دۆسكی ژووریایه، ل سەر سنوورێ باكوور و باشوورێ كوردستانێ.

### سنوورێ جوگرافی:

**ژ لایێ باكوریڤە،** گوندێ (شویكه)یه.

**ژ لایێ باشووریڤە،** گوندێ (بیرێ)یه.

**ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە،** گوندێ (چەمێ تیا)یه.

**ژ لایێ رۆژئاڤاڤە،** گوندێ (ئەرتیس)ە.

ل سالا ١٩٨٧ێ بۆجارا دووێ سنوور ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتینه دانان ل ڤی گوندی و ئەڤ گوندی نیڤەك ل كنارێ سنوورێ تركیا و نیڤا دیتر ل كنارێ سنوورێ عیراقێ یه، ژ ٢٦ مالاپێكدهات، ٢٠ مال ل باكوور و ٦ مال ل باشوور ئاكنجی بوون[٢٢٩].

### بنەمالێن گوندی:

(مالا حەسەنا، مالا عومەر)، دیسان ژمارەكا مالباتێن وێ چوونه دەشتێ ل دەڤەرا دۆسكی ژێرێ

کو نها ژی دبێژنێ (گوندێ شێخمەما) و گوندێ (گولێ) د بنیاتدا هەر خەلکێ گوندێ (شێخمەما) نە.

### کانیێن گۆندی:

سێ کانیێن بەرنیاس ل گوندی هەنە ب ناڤێن کانیا زۆمێ، کانیا ناڤکرکا و کانیا سێڤکێ.

### ژ شوینەوارێن گوندی:

- کەلابەرێ بسیس.

## گوندێن عەشیرەتا زێباری

(زێباری) ژعەشیرەتێن بەرنیاسێن دەڤەرا بەهدینانە، (ئەنوەر مائی) ب کەڤنترین عەشیرەتا دەڤەرا بەهدینان دهژمێریتن[230]، دیرۆکڤان محەممەد ئەمین زەکی وەسا دبینیت کو (زێباری) بەرمایێن (سوباریان)ە، زێباری دبیتە دو جوین، زێباری بەرۆژ و زێباری نزار، کو بەهرا پتریا گوندێن وێ دکەڤنە دەڤەرا (نەهلێ) ل قەزا (ئاکرێ) و ناحیا (دینارتە)، ئەردێ وێ یێ بەرفرەهە، ژ بازێرێ (ئاکرێ) ژ ئالیێ باشووری دەسپێدکەتن هەتا چیایێ (پیرس) ل باکووری، ژ رووبارێ زێ مەزن ل رۆژهەلاتی هەتا رووبارێ (خازر) ل رۆژئاڤای، ئەو دەستنیشانکرنا جوداکرنا دناڤبەرا عەشیرەتا (زێبار) و عەشیرەتا (بەرواری ژێریا) و عەشیرەتا (مزووری ژێری)یە[231]، سەرکردێن بەرنیاس دەسەلاتا دەڤەرا زێبار کرییە، هەر ژ سەردەمێ مەغولییێن ئیلخانی، ئێك ژ وان (ئیبراهیم کورێ میرمحەممەد زابی)و یێ دیتر (شەهاب کورێ بەدرەددین) و ژمارا چەکدارێن وان هەردووکان نێزیکی (٥٠٠) چەکداران بووینە، خودان دەسەلات بووینە هەر ژ داوییا سەردەمێ خیلافەتا عەباسی، بەلگە ژی بۆ ڤێ چەندێ سەرکردێ وان (ئیبراهیم کورێ محەممەد) پەیوەندی یێن وی دباش بوون دگەل خەلیفەیێن عەباسی[232]، ل سەردەمێ ئوسمانییان ژی (زێبار) قەزایەکا سەربەخۆ بوو کول دوماهییا سالا ١٨٧٨ێ ب تێکەلکرنا هەردو ناحیێن زێبار و شێروان قەزا زێبار هاتە پێکئینان و هەتا سالا ١٩٠٧ێ قەزا بوو تاکو ڤێ سالێ جارەکا دیتر بوویە ناحیەیەکا گرێدای قەزا ئاکرێ و شێروان و مزووری بالا ژی هاتنە گرێدان ب قەزا رەواندوز ڤە، د سالنامێن ئوسمانی دا هاتییە کو ل سالا (١٨٩٢)ێ مەلبەندێ ناحیا زێبار ل گوندێ (بیرەکەپرا) بوو، رێڤەبەرێ ناحیێ ژی (عوسمان ئەفەندی)بوو، هەژی یە بێژین چەند گوندەکێن عەشیرەتا زێبارێ نها سەر ب ناحیا شێلادزێ نە ل لایێ دی یێ رووبارێ (زێ - زێیێ مەزن)، ئەو ژی ئەڤ گوندەنە:

(خالانە، هلۆرا، سارکێ (سارکا زێباریا)، خاستو ژێری، خاستو ژووری، لاتکا، بەرنسکێ/ بەرێزکێ، دێویك ، سەرۆکانی).

### گوندێ هلۆرا:

ب هلۆرا شێخان بەرنیاسە، گەلەك کەسێن دیندار دناڤ دا پەیدابووینە، ل سالا (٢٠٠٣)زێ رێکا گوندێ (هاریکا - هلۆرا) ب (٢١کم) هاتییە چێکرن[233].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ زێی و گوندێ بالندا. گوندێ (بانیێ)یە.

**باشووری:** گوندێن بانیێ و نەپاخیێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ(شنیێ)یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ(سارکا زێبار)یە.

### بنەمالێن گوندی[234]:

بنەمالا شێخ جەلال، بنەمالا شێخ خالد، بنەمالا شێخ عوسمان، بنەمالا شێخ عەبدوللا، بنەمالا شێخ نوری: کو (شێخ نوری) رۆلەکێ باش هەبوویە وکەسایەتیەکێ بەرچاڤ بوویە ل سەردەمێ شێخ (عەبدولسەلام بارزانی)، نەخاسمە کو ل سالا (١٩١٤)زێ بریندارێن شورشگێر ڤەحەواندینە، ژ وان ژی سەرلەشکەر (قادر سیری) و برایێ وی (عەبدوللا)[235].

### کانیێن گوندی:

کانیا توییێن عەبدوللا کورێ عومەری، کانیا بەرئاڤیا، کانیا خالانە.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا ئالکا، شکەفتا خالانە، شکەفتا ریخینی، شکەفتا شەفتا رەش.

خواندنگەها گوندی ل سالا (٢٠٠٩)زێ هاتییە ڤەکرن، بەری هنگی زارۆکێن وان بۆ خواندنێ دچوونە کۆمەلگەها (سیرێ)، هندەك خەلکێ گوندی چووینە گوندێ (بالندا) و لێ ئاکنجی بووینە، ل سالا (٢٠١٣)ێ ئاڤاهییەکێ نوی بۆ خواندنگەهێ هاتییە ئاڤاکرن.

## گوندێ خالانە:

گوندێ خالانە دکەڤیتە سەر رووبارێ (زێ)یێ مەزن ل باکوورێ باژێرێ ئاکرێ و (٥٠ کم) ل رۆژهەلاتا باژێرێ ئامێدیێ. (٤٠ کم) رۆژئاڤایێ بارزان، ل رۆژئاڤا گوندێ خالانە دبیتە گوندێ (هلۆرا)، گەلەك ژ مێژە گوند هاتییە بەردان و چۆلکرن و بوویە گوندەکێ خرابە، دیار دبیت دەمەکی دۆرێن ٢٠ مالان لێ ژیاینە، د گوندی دا سێ شوینوار و دارەکا چنارێ یا مەزن و کەڤن یێن هەین، ب دیتنا مە چاخێ ئاڤاکرنا وان شوینواران ب تایبەتی پر ڤەدگەرن بۆ سەدسالیێن ١١-١٢ ز ل سەردەمێ میرێن مەهرانی کو ل وی چاخی ئەڤ دەڤەرە ل ژێر دەسەلاتا وان بوویە و وانا ل سەردەمێ خۆ پویتەکێ باش دایە ئاڤاکرنێ و گەلەك کەلا و پر و جهێن گشتی ئاڤاکرینە.

### ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:

**- پرا خالانە (پرا مەلا موسای)،**

ئەڤ پرە ژ پرێن کەڤنار و دیرۆکی یە، لێ سالا ئاڤاکرنا وێ نەیا دیار ودەسنیشانکری یە، پر یا دناڤ گەلیەکێ کویر دا و هەردو لایێن وێ چیایێن بلند و ئاسێ نە، دکەڤیتە سەر رووبارێ (زێ مەزن) و سەردەمێ خو دا گرێدانا دناڤبەرا هەردو دەڤەرا (زێبار) و دەڤەرا (بارزان) بوو، ئەڤ پرە دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ (خالانە)سەر ب عەشیرەتا (زێبار)ڤە، بەلێ گوند خرابەیە و کاڤلە و ژ مێژە هاتییە هێلان و

گوندێ خالانە



چۆلکرن، نێزیکترین گوندێ دەڤەرا بارزان گوندێ (سەڤرە)یە، گوندێ (شلێ) یێ دەڤەرا زێبار دکەڤیتە رۆژهەلاتێ پرێ، و گوندێ (هلۆرا) دکەڤیتە لایێ رۆژئاڤایێ پرێ، پشتی ژ نیڤا دووێ ژ سالێن دووماهیێ ژ چەرخێ بیستێ گوند هاتییە چۆلکرن، ئەڤ پرە بۆ گوندێ هلۆرا وەك شوینوارەك دهێتە هژمارتن.

**پیڤانێن پرێ:**

ئێك ژ کەسایەتیان ب ناڤێ (شێخ زادە) کو بنیاتێ وی ژ ڤی گوندی یە دبێژیت: وەکی مە ژ بێن بەری خو بهیستی و بۆ مە هاتییە ڤەگێران کو هەر ژ کوچا ئێکێ یا دەڤەرا زێبار هەتا کوچا دوماهیێ یا دەڤەرا بارزان (٦٤م) بوو، ب گاریتێن دارا سپیندارێ هاتبوونە دانان و ب تیرکێن دارا مێوێ دهاتنە گرێدان و پێدڤیاتی یا گوندێن هەردو دەڤەران ل هاتن و چوونێ پێ ب رێڤەدچوو، دەمێ برێن پەزی یان جەلەبێن پەزی ل سەرڕا دهاتنە دەربازکرن، دا خودانێ پەزی ل وی دەمی پەزەکێ بۆ کارۆبار و پێدڤیێن پرێ دەتن.

ئەڤ پرە ژ پێنج کوچان پێکدهات، سێ ژ وان دکەڤتنە دەڤەرا بارزان و دو دکەڤتنە دەڤەرا زێبار، لێ نها تنێ سێ کوچ یێن ژێ مایین ئانکو دوو یێن هەڕفتین، و کەرەستەیێ چێکرنا پرێ ژ گێچ و کسلێ هاتییە ئاڤاکرن، ئەڤێن ل خوارێ ژێ پیڤانێن شوینوارێن وێ نە، و دبیت هێشتا پیڤانێن وێ پتر بن، چونکی نیشانێن هەڕفتنا هندەك گەرێن (رێزێن) وێ دیارن[٢٣٦].

**کوچێن پرێ یێن ل دەڤەرا (بارزان):**

**کوچا ئێکێ:** ئەڤ کوچە دکەڤیتە سەر کەڤرەکێ مەزن کو بلنداهییا وێ ژ بنێ کوچێ (٧٠،٧م)ن،و بازنا وێ ژ بنی ڤە (٢١م)ن، و ژ (٥٤) گەرێن یان رێزێن بەران پێکدهێت، کو بلنداهییا هندەك ژ وان بەران دناڤبەرا (٢٠-٦٠سم)یە،و دناڤبەرا کوچا ئێکێ ویا دووێ (٧م)ن.

**کوچا دووێ:** بلنداهییا وێ (٥،٧م)ن، بازنا وێ ژبنی ڤە (١١م)ن، و ژ (١٣) رێزێن بەران پێکدهێت، بلنداهییا

**پرا خالانە (پرا مەلا موسای)**



هندەك ژ وان بەران دناڤبەرا (٣٠-٧٠سم)نە، دناڤبەرا کوچا دووێ و یا سێیێ (٤م)ن.

**کوچا سێیێ،** بلنداهیا وێ (٥م)ە، و بازنا وێ ژنێ ڤە (٨م) ن، و ژ (١٣) ریزێن بەران پێکدهێت، کو بلنداهیا هندەك ژ وان بەران دناڤبەرا (٢٠-٦٠سم)انە.

**کوچێن پرێ یێن ل دەڤەرا زێبار،**

**کوچا ئێکێ،** بلنداهیا وێ (١٢م)ن، و بازنا وێ ژنێ ڤە (١٢م) ن، و ژ(٣٩) ریزێن بەران پێکدهێت، ژ بنێ کوچێ هەتا ل سەر ئاڤێ ئانکو ڕووباری (٥م)ن، و د ناڤبەرا ڤێ کوچێ هەتا کوچا ئێکێ یا دەڤەرا (بارزان) (٢٦م)ن.

**کوچا دووێ،** بلنداهیا وێ (٨م)ە، و بازنا وێ ژنێ ڤە (٥، ١٧م)ن، و ژ(٢٣) گەرێن بەران پێکدهێت، کو بلنداهیا هندەك ژ وان بەرێن ڤان هەردو کوچان دناڤبەرا (٢٠- ٥٥سم)یە، هەژی یە بێژین کو ئەڤ پرە ب ناڤێ (پرا مەلا موسای) ژی دهێتە ناڤکرن، کو کەسایەتیەکێ چاك و دینداربوویە و مەزارێ وی دکەڤیتە رەخ کوچا دوماهیێ یا لایێ دەڤەرا زێبار[٢٣٧].

**- مزگەفتا گوندی،**

ل سەر کڤانێ (ئاڤدێ) کانیێ هاتیە ئاڤاکرن، ئانکو کانی ل بن مزگەفتێ دزێت، قەبارێ مزگەفتێ (٤ ×١٠م)ە ب کسلی هاتیە ئاڤا کرن، لایێ رۆژهەلاتی یێ مزگەفتێ هەرفتیە، دار گویزەکا مەزن د کاڤلێ مزگەفتێ دا شین بوویە کو بازنا بنێ (تلێ) گویزێ (٢٠،٦٠م )ە، ژ دارا گویزێ دیارە کو دەمەکێ درێژ مزگەفت ژی هەرفتی یە و بوویە شوینوار.

**- ئاشێ گوندی،**

بلنداهیا کۆتەلا ئاشی (٣,٢٠م)ە، و جۆکا ئاڤا ئاشی دبن مزگەفتێ دهێتن ب درێژاهیا (٨م)ا هەتا دگەهیتە کۆتەلێ، جۆك و کۆتەل ب کەرەستێ کسلێ هاتینە چێکرن، و چ شوینوارێن دی یێن ئاشی دیار نینن، سەبارەت ئاڤاکرنا وێ ل دووڤ گۆتنا

شوینوارێ کوچێن پرێ و کانیا ل بن دیوارێ مزگەفتێ



(زیاد زوبێر بانی) دبێژیت: د سالێن سیهان دا (بیبو بانی) ل مزگەفتا (هیكێ) چەند پارچێن ئەردی ل گوندێ (خالانە) ژ (تاهر خالانەی) ب (٦٧لیران) كری بوون، د سالێن چلاندا (نیعمەت بیبو)ی هۆستا (شێخ سەعید پرێسەیی) بۆ چێكرنا ئاشێ دەست نیشانكربوو و ژ ئالیێ وی ڤە هاتییەئاڤاكرن[٢٣٨].

- **دارا چنارێ:**

دكەڤیتە بەر دیوارێ مزگەفتێ ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە، دارەكا كەڤنار و مەزنە، بازنەیا بنێ (تلێ) دارێ (٦٠،٢م)ە، نیڤەكا دارێ قولێرە ب قەبارێ (٣×٥،٢م)ان، ژ دو لاڤە (تلێ) دارێ یێ ڤەكریە وەكی دەرۆكا (دەرگەهان)، ل دۆر روخیانا پرێ و ب دوماهیك هاتنا ژیانێ ل گوندی، ب ڤی رەنگی هاتییە دیاركرن:

-(شێخ جەمال محەممەد تاهر) خەلكێ گوندێ هلۆرایە، كو هەڤسنوورن دگەل گوندێ خالانە ژ ئالیێ رۆژئاڤایی ڤە، ل دۆر ژیانا گوندی گوت: ژ زارگۆتنێن باب و باپیرێن مە نێزیكی ١٧٠ سالایە كەس ل گوندی نە ژیایە و خرابە گوند بوویە، سەبارەت پرێ گۆت: وەكو مە بهیستی ل بهارا هەركێین رەڤەند پەزێ خو ل ڤێ پرێ بۆ پرا (گەلیێ بالَندا) و پرا (كركاكێ- رێكان) دەربازدكر و د چوونە كویستانا، و زیانێن وان گوندێن د كەفتنە سەررێكا وان دكرن، ب تایبەت گوندێ سەڤرە كو د وی دەمی دا گوندەكێ مەزن و بۆش بوو، ژ ڤێ ئەگەرێ خەلكی گوندێ سەڤرە پر هاڤێتینە د ئاڤێدا و خرابكرنا وێ ڤەدگەرینتەڤە بۆ بەری ١٧٠ سالان، سەبارەت ئاشی ژی گۆت: تا سالا (١٩٦٠ز)ێ ئاش یێ ئاڤا و دروست بوو و مە خودانی لێدكر.

## گوندێ ساركێ:

ژگوندێن سەر ب عەشیرەتا (زێبار)ڤەیە، گوندەكێ چیایی یە و تژی دار و بارێن دێمە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** رووبارێ زێی - كۆمەلگەها سیریێ یە.

دارا چنارێ



**باشووری،** گوندێ (ئالیکێ - زێبار)ە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (هلۆرا) یە.

**رۆژئاڤای،** گوندێن (خواستو ژێری) و (خواستو ژووری)یە.

## بنەمالێن گوندی[٢٣٩]:

گوند ب تنێ ژ ئێك بابكال پێكدهێتن، ئانكو ئێك بنەمال بخو ڤە د گریتن، ئەو ژی ب ناڤێ بنەمالا (داود)ی.

## کانیێن گوندی:

کانیێن ل جهێ گوندێ کەڤن دبێژنێ (کانیا مێرا، و کانیا ژنا)و یێن ل جهێ نها ژی ئەڤەنە: کانیا ڕەڤ، کانیا سارکێ، کانیا گەلیکی.

## دیرۆکا ئاکنجیبوونێ:

دەسپێکێ ل گوندێ کەڤن دئاکنجی بوون کو دکەڤیتە باشووری گوندێ نوی، ل سالا(١٩٦١ز)ێ چووینە گوندێ (بانیێ- زێبار) و پاشی (شەرمنێ) و پاشی جارەکا دی بۆ (بانیێ)ڤە، ل زڤستانا سالا (١٩٦٤ز)ێ ل وێرێ بووینە، پاشی چووینە مووسل و دەڤەرێن وێ هەتا بەیانا ١١ێ ئادارا ١٩٧٠یێ، سالا (١٩٧١ز)ێ ل ناڤ شەبەکان دو لۆری هەر ئێك ب (١١٠ دیناران) ب کرێ گرتینە و خەلکێ گوندی پێ ئینانینە هەتا گوندێ (برکاهینا) دناڤبەرا بەرچێ و گوهەرزێ دا، پاشی ئێکسەر ل ڕەخێ نزاری ڤە (ل لایێ باشووری یێ ڕووبارێ زێ) هاتینە هەتا گەهشتینە گوندێ (سارکێ) و لێ ئاکنجی بووینە، کو ل وی دەمی هێشتا سیریێ و شێلادزێ چەند خانیێن کێم لێ هەبوون و ئەو ژی گوند بوون.

## گوندێ خواستو ژێری:

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** ڕووبارێ زێی- کۆمەلگەها (سیریێ)یە.

**باشووری،** جهێ کەڤن یێ گوندێ (خواستوا ژێری- زێبار).

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (سارکێ) یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (خواستو ژووری)یە.

گەندێ خواستو ژێری



**بنەمالێن گوندی:**

ل سالا (١٩٤٥)ز)ێ ئویجاخەكا ژ گوندێ (بانیێ - زێبار) كو ب ناڤێ ئویجاخا (بادین) بەرنیاسە، ئانكو بنەكوكا وان ژ گوندێ (بانیێ)نە، (مەحمود عەبو بیبو) و (قادو محەممەد بیبو) كو پسمامێن ئێك بووینە، هاتینە گوندێ (خواستوا ژێری- گوندێ كەڤن)، پاشی ل سالا (١٩٦١ز)ێ ژبەر رەوشا سیاسیا دەڤەرێ و ناكۆكیان، گوند بجهـ هێلایە و ئاوارە بووینە، سالا (١٩٧٤ز) هاتینەڤە گوندی و ل وی دەمی ئەڤ بنەمالە بووینە (مالا رەمەزان، مالا حەجی عەبدوللا، مالا حەكیم كو برازایێ قادوی بوویە)، سالا (١٩٨٧-١٩٨٨ز)ێ ل دەمێ ئەنفالان ئاوارە و دەربەدەری تركیا و ئیرانێ و بەحركێ بووینە، سالا ١٩٩١ێ زڤرینەڤە گوندی، سالا ١٩٩٢ێ جهێ گوندێ نوی ئاڤاكری.

**كانیێن گوندی:**

كانیا (بركا گوندی)، كانیا شیڤكێ، كانیا گۆرگینێ: ئەڤ ناڤە لەوما ل سەر هاتیە دانان، چونكی دەمل دەست و ژ نشكەكێڤە هشك دبیت، لەوما وەكی بێ باوەری یا (گورگی) هاتیە ناڤكرن و دبێژنێ (گۆرگینێ).

**شكەفتا گوندی:**

شكەفتا میرانكێ.

**گۆڕستانێن گوندی[٢٤٠]:**

گۆڕستانا گوندی، گۆڕستانا قەندا سور، گۆڕستانا تەلەخێ، گۆڕستانا بجویك، گۆڕستانا بن گێڕێ.

**ئاڤاكرنا گوندێ نوی:**

دەمێ ل سالا ١٩٩٨ێ رێكخراوێن خێرخوازی هاتینە دەڤەرا ئامێدیێ، كو ئێك ژ وان ژی رێكخراوا (D.G.K) یا ئەلمانی بوو كو ب (حەسەن ئەلمانی) بەرنیاسە، چەندین خانی ل دەڤەرا ئامێدیێ ئاڤاكرن، گوندێ (خواستو ژێری) ژی ئێك ژ وان گوندان بوو كو ئاڤاكرین، كو د كەڤیتە دووراتیيا نێزیكی دو كیلومەتران ل باكوورێ گوندێ كەڤن نێزیك رووبارێ (زێ) گوندێ نوی بێ (خواستو ژێری) هاتیە ئاڤاكرن.

**ژ جهـ و شوینوارێن گوندی:**

شوینوارێن دو مزگەفتان ل گوندی دیارن، و شكەفتا میرانكێ وەسا دهێتە دیاركرن كو میرەك دناڤ دا ژیابیت و دەسەلات كربیت، لەوما ب ناڤێ (میرانكێ) هاتیتە ناڤكرن، كو وەسا دهێتە ڤەگێران ناڤێ وی (میروخان) میرێ (وانێ) بوو، لێ چ پێزانینێن دی ل سەر نینن كا ل چ سەردەم هاتییە و چەند سالان دەسەلاتداری لێ كرییە!.

**خواندنگەها گوندی:**

ل سالا ٢٠٠٠ ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە دامەزراندن.

## گوندێ خواستو ژووری:

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** رووبارێ زێی- سەنتەرێ ناحیا (شێلادزێ)یە.

**باشووری:** جهێ كەڤن یێ گوندێ (خواستوا ژووری)یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (خواستوا ژێری) یە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (لاتكا)یە.

**بنەمالێن گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ ئێك بابكال ئانكو ئێك بنەمال پێكدهێتن دبێژنێ بنەمالا (حەمید)ی ب (حەجی حەمید خواستوی) ناڤدارە، گوند بخۆ ژی گەلەك جارا ب ناڤێ (خواستوا حەمیدی - حەمیدكی) دهێتە ناڤكرن.

**رامانا ناڤێ گوندی:**

ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە هاتییە ڤەگێران: د كەڤندا دەمێ هاتینە ڤی جهی، داخواز یان ژی بێژین ئەرد ژ دەسەلاتدارێ وی دەمی خواستی یە دا كو

لێ ئاكنجی بىن، لەوما ب ناڤێ (خواستو) ئانكو ژ خواستنێ هاتییە، كو ئەڤ هەردو گوندە (خواستو ژووری) و (خواستو ژێری) ب هەمان ڕامان هاتینە دیاركرن.

## جهـ و شوینوارێن گوندی:

دناڤ جهێ گوندی یێ كەڤن دا كو دكەڤیتە باشووری ڕۆژهەلاتێ گوندێ نوی ئاڤاكری، گەلەك شوینوار یێن لێ هەیین وەك:

- شوینوارێن سێ مزگەفتان كو ناڤێن وان ئەڤەنە: (مزگەفتا د ناڤ گوندی، مزگەفتا قەسیلێ، مزگەفتا میتكێ).
- چوار گۆڕستان یێن ل جهێ گوندێ كەڤن هەین، دیسان دو گۆڕێن بەرنیاس ب ناڤێن (مشایخێ سەر قەندالا و پیرگەوەر یان پیر گەهوەر) یێن هەین، دبێژن ئەڤە هەردوكە خویشك و برایێن ئێك بووینە.
- دو (نەعوسك- ناوسك) یێن لێ هەین كو ئێك دكەڤیتە باكووری ڕۆژهەلاتێ گوندێ كەڤن (ل باشووری ڕۆژهەلاتێ گوندێ نوی)، و ئێك ژی ل ڕۆژئاڤا گوندێ كەڤن، كو ب ئەندازەیەكا ڕێك و پێك و جوان هاتینە نكراندن[٢٤١].

## ئاڤاكرنا گوندێ نوی:

دەمێ ل سالا ١٩٩٨ێ ڕێكخراوێن خێرخوازی هاتینە دەڤەرا ئامێدیێ، چەندین خانی ل دەڤەرا ئامێدیێ ئاڤاكرن، گوندێ (خواستو ژووری) ژی ئێك ژ وان گوندان بوو كو ئاڤاكرین، د كەڤیتە دووراتییا نێزیكی كیلومەترەكێ ژ گوندێ كەڤن (ل باكووری گوندێ كەڤن) ل نێزیك ڕووبارێ (زێ) گوندێ نوی یێ (خواستو ژووری) هاتییە ئاڤاكرن.

## خواندنگەها گوندی:

سالا ٢٠٠١ ێ خواندنگەهەكا چوار ڕێزی ل گوندی هاتییە دامەزراندن.

وێنەیێ گوندێ كەڤن یێ خواستو ژووری



## گوندێ دێویكێ:

ژ گوندێن عەشیرەتا (زێبار)ە، گوندەكێ ئاڤی و چاندنی و ب خەمل و داروبارەكێ باشە و نەخاسمە دار سپیندار، دەرامەتێ وێ ژی (برنج و ماش و كونجی ...)نە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** رووبارێ زێی- سەنتەرێ ناحیا (شێلادزێ)یە.

**باشووری،** گوندێ (یابولا )یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (بەرێسكێ)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (سەرۆكانی)یە.

### بنەمالێن گوندی:

گوند ژ پێنج بنەمالان: بنەمالا بشار، بنەمالا صوفی عەبدوللا، بنەمالا قەرەكوز، بنەمالا مالی شوری، بنەمالا ئوزمان گرك پێكدهێت)[٢٤٢].

### شكەفتێن گوندی:

شكەفتا بن نزارا، شكەفتا بەرە سورك، شكەفتا خولی، شكەفتێن ستینك.

### ژ شوینوارێن گوندی:

گۆرستانەكا كەڤن ب ناڤێ (لنكێ ئەصحابی) یا لێ هەی.

### خواندنگەها گوندی:

خواندنگەها گوندی ل سالا (٢٠٠٠ز)ێ هاتییەڤەكرن[٢٤٣].

## گوندێ بەرێسكێ (بەرێزكێ):

ژ گوندێن كەڤنێن (زێبار)ە، سرۆشتەكێ جوان و خشكوك یێ هەی.

### جوگرافییا گوندی:

**باكووری،** رووبارێ زێیێ مەزن، سەنتەرێ ناحیا (شێلادزێ )یە.

**باشووری،** چیایێ نزاری یە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (خواستو ژووری)یە.

**رۆژئاڤا،** گوندێ (سەرۆكانی) یە.

### بنەمالێن گوندی:

گوند ژ چوار: بنەمالا حەجی عەبدولرەحمان، بنەمالا حەجی رەشید، بنەمالا عەبدوللای، بنەمالا مستەفای پێكدهێت.

### رامانا ناڤێ گوندی:

ناڤێ گوندی ژ سرۆشتێ گوندی ژ پەیڤا (بەر رەزكی) هاتییە وەرگرتن، كو د كەڤیتە دبەر رەزی دا، لەوما بوویە (بەرێسكێ یان بەر رەزكێ)[٢٤٤].

### كانیێن گوندی:

كانییا گەلی، كانییا فەلەی، كانییا بن كەڤری.

### شكەفتێن گوندی:

شكەفتا شكەفتە رەزێ، شكەفتا شكەفتە رۆژێ: ژبەر كو تاڤا رۆژێ ل ناڤخویا وێ ددەت، لەوما ئەڤ ناڤە ل سەر هاتییە دانان، شكەفتا چەپەرێ: ژبەر كو دەرگەهێ وێ یێ بچویكە و چەپەرەك ددەرگەهی دا دهاتە دانان.

### ژجهـ و شوینوارێن گوندی:

گوندەكێ كەڤنارە لەوما شوینوار ژی هەنە، وەكو هەبوونا نەعوسكەكێ ب ناڤێ (بەرۆژێ نەعوسكێ) ل رۆژئاڤا گوندی، و كاڤلەك ب ناڤێ كاڤلێ قەسرێ كو دبێژنێ (كاڤلێ نارێ)، دهێتە ڤەگێران كو ئەڤێ ژنكێ حوكمداری كرییە، بەلێ نەهاتییە زانین كو مێژوویا وێ ڤەدگەریتە بۆ چ سەردەمی[٢٤٥].

### ئاوارەبوونا گوندی:

گوند هەتا سالا (١٩٨٨)ێ یێ ئاڤەدان بوو،

پشتی ئەنفالان خەلكێ وی ئاوارەی ئیران و بەحركێ بووینە، پشتی سەرهەلدانا ١٩٩١ێ جارەكا دی زڤرینەڤە دەڤەرێ و ل كۆمەلگەهێن شێلادزێ و گوندێ بەرێسكێ یا نوی (ل سەر كنارێ ڕووبارێ زێ ل باشوورێ شێلادزێ) و گوندێ دێویكێ ئاكنجی بووینە[٢٤٦].

## گوندێ سەرۆكانی:

ژ ناڤێ گوندی دیارە گوندەكێ ئاڤی و ب خەمل و جهەكێ گەشت و گۆزاری یە.

### جوگرافییا گوندی:

**باكووری،** ڕووبارێ زێیێ مەزن، گوندێ (شیڤ چنارك)ێ یە.

**باشووری،** چیایە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (دێویكێ)یە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بیاوێ (بیاڤێ)یە.

### بنەمالێن گوندی[٢٤٧]:

گوندێ سەرۆكانی ژ چوار بنەمالان پێكدهێتن، ئەو ژی: (بنەمالا سەعدو، بنەمالا هیرو، بنەمالا تەیب، بنەمالا عەلی).

### ڕامانا ناڤێ گوندی:

ناڤێ وێ یێ ژ پەیڤا (سەركانی یان سەركانیێ) هاتی، ئانكو یا ل هنداڤ كانیێ، خودان ئاڤەكا بۆشە و سرۆشتەكێ جوان یێ هەی، جهەكێ گەشت وگوزاری یە و ب سیلاڤا خۆ یا ناڤدارە.

### جهـ و شوینوارێن گوندی:

چەندین جهـ و شوینوار ل ڤی گوندی هەنە وەكی: مزگەفتا حەسەنوكا، كەلوتكا سەرۆكانیێ، و شوینوارێن چەندین ئاشا ژی یێن هەین.

### شكەفتا گوندی:

شكەفتەكا مەزن یا ل گوندی هەی ب ناڤێ شكەفتارەش.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندێن ناحیا نێروە و ڕێكانا بەرێ و (شێلادزێ) یا نها ل دووڤ ڤێ خشتێ ل خوارێ دیاركری یە[٢٤٨].

## گوندێ لاتكا:

ئێك ژ گوندێن زێباریا یە ل نزاری ، دكەڤیتە باشوورێ سەنتەرێ ناحیێ(ئانكۆ شێلادزێ دكەڤیتە باكوورێ گوندی)و ڕووبارێ زیێ مەزن (بەهدینان) دبیتە ناڤبرِ دناڤبەرا گوندی و شێلادزێ دا ، سنوورێ وێ دگەل گوندێن دەوروبەر ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە گوندێن (خواستو ژووری) و(خواستو ژێری)نە، و ژ لایێ رۆژئاڤا ڤە گوندێن بەرێسكێ و دێویكێ نە، ژ لایێ باشووری ڤە چیایە ئانكۆ نزارە، گوندێ لاتكا ژ لایێ سرۆشتی ڤە گوندەكێ خودان دار و بارێن دێمی یە، بەهرا پتریا ژیارا خەلكێ وێ ل سەر چاندن و دەرامەتی یە و خودانكرنا پەز و تەرش و تەوالی . ل باكوورێ گوندی ڕووبارێ زێ مەزنە (بەهدینان) كو ئەڤە ژی دبیتە مفاگەهاندنەكا مەزن بۆ پێدڤیێن گوندی و مفا وەرگرتنا بۆ دەرامەتێن ئاڤی ژی، ئەڤ گوندە هەتا سالا (١٩٨٨)ێ یێ ئاڤەدان بوو، پشتی ئەنفالا بەهدینان ئاوارەی ئیران و بەحركێ بووینە، هەتا سالا ١٩٩١ێماینە، و پشتی سەرهەلدانا بهارا ١٩٩١ێ جارەكا دی زڤرینەڤە دەڤەرێ و ل گوندێ خو (لاتكا) ل بەرامبەر شێلادزێ جهوار بوون، ژ جهێن بەرنیاس ( بەرقەندالا لاتكا)، پشتی شێلادزێ ل سالا ٢٠١٣ ێ بوویە سەنتەرێ ناحیێ ئەڤ گوندە ژی بوویە ئێك ژ گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە[٢٤٩].

خشتێ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ، گوندێن رێکان و دوسکی ژووری

| ز | ناڤێ گوندی | ژمارا ئاکنجیان |
|---|---|---|
| -١ | ئەرتیس | ١٨٨ |
| -٢ | بانسرا | ٥٩ |
| -٣ | بێزەلێ | ١٧٢ |
| -٤ | بێسەپێ | ٢١٢ |
| -٥ | بێدە | ٣٢٣ |
| -٦ | بیرێ | ٢٥١ |
| -٧ | بەنستان | ٧٦ |
| -٨ | بێباکرێ | ٢٧٢ |
| -٩ | پێپەرخا | ٦٩ |
| -١٠ | پیرهەسنا | ٦ |
| -١١ | بیارێ | ١٠٩ |
| -١٢ | پیرئاڤدەلا | ١٠٢ |
| -١٣ | چەم توو | ٨٨ |
| -١٤ | چارمەندا | ٢٦ |
| -١٥ | چێ | ٧٤٤ |
| -١٦ | چەمێ جوو | ٢٧ |
| -١٧ | دهیك | ١٢٦ |
| -١٨ | رەزگە | ١٤٥ |
| -١٩ | هۆرە | ٢٨٠ |
| -٢٠ | هیل | ٥٦ |
| -٢١ | هۆص | ١٠٧ |
| -٢٢ | هنێش | ٣٣٠ |
| -٢٣ | هولیان | ٣٨ |
| -٢٤ | هیش | ٢٨٦ |
| -٢٥ | وەرخەل | ٢٣٢ |
| -٢٦ | زێوکێ | ٥١ |
| -٢٧ | خالکا | ١٤٦ |
| -٢٨ | خارێ | ٤٦ |
| -٢٩ | کێریادێرێ | ٢٧١ |
| -٣٠ | مەیدان | ٣١ |
| -٣١ | مروانس | ١٥٥ |
| -٣٢ | مێزێ | ٣١٢ |
| -٣٣ | سیتە | ٢٧٠ |
| -٣٤ | سیدان | ٩٣ |
| -٣٥ | بالەسینا | ١٤٤ |
| -٣٦ | سنجێ | ١٥٠ |
| -٣٧ | سارکێ | ٣١ |
| -٣٨ | قەسرکا | ٣٥ |
| -٣٩ | شامکێ | ١٢٦ |
| -٤٠ | رێشمە | ٩١ |
| -٤١ | شیڤەرەزا | ٦٧ |
| -٤٢ | شێخ مەما | ٢٢ |
| -٤٣ | شاجا | ١١٠ |
| -٤٤ | تتم | ٣٥ |
| -٤٥ | شەتینس | ٢١٧ |
| -٤٦ | مێرگەڤا | ٣١ |
| -٤٧ | شابەکەما | ١٢ |
| -٤٨ | هریاشك | ٦٣ |
| -٤٩ | مازیێ | ٣٩ |
| -٥٠ | دەعلکێ | ٥٠ |
| -٥١ | ئستپ | ٨٦ |
| -٥٢ | مامیسا | ٨٠ |
| -٥٣ | هلۆرا | ١٤٠ |
| -٥٤ | زیوە | ٧٣ |
| -٥٥ | کاڤلکا | ١٠٨ |
| -٥٦ | خاستوو | ١٥ |
| -٥٧ | دێویکێ | ١٤ |

# ناحیا کانی ماسێ

زنار تۆڤی

کانی ماسێ وەکی ناحیە دکەڤیتە داوییا باکوورێ پارێزگەها دهۆکێ و باشوورێ کوردستانێ، ئێکە ژ ناحیێن سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە، سەنتەرێ ناحیێ ب دووراتییا ٣٥کم ژ سەنتەرێ قەزایێ و ١٠٥کم ژ باژێرێ دهۆکێ دوورە، سالا ١٩٢٨ێ بوویە سەنتەرێ ناحیێ.

## سنوورێن ناحیا کانی ماسێ:

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێ مەزنە.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ خابووری یە.

**باکووری:** هەڤسنوورە دگەل باکوورێ کوردستانێ.

**باشووری:** چیایێ مەتینایە.

درێژاهییا ناحیێ ژ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤا دگەهیتە ٥٣کم و ژ باکووری بەرەڤ باشووری درێژترین پانی دگەهیتە ٢٣کم، سەرجەمێ رووبەرێ وێ ٦٠٨کیلومەترێن چوارگۆشەیە، ژمارا گوندێن وێ دگەهنە ٨٢ گوندان، رێژەیا بارانێ ژی دناڤبەرا (٨٠٠-١٠٠٠ملم)انە.

ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا خەلکێ ناحیێ ١٤٨٦١ کەس بوون[1] و رێژەیا ئاکنجیێن وێ ژی ژ سەرجەمێ ئاکنجیێن پارێزگەهێ سال بۆ سالێ هاتییە گوهارتن، بۆ نموونە: ل سالا ١٩٤٧ێ رێژەیا وان ٩,٨٪ ێ بوون، لێ ل سالا ١٩٥٧ێ بۆ ١٠٪ ێ و ل سالا ١٩٦٥ێ بلند بوو بۆ ١٥,٥٪ ێ و ل سالا ١٩٧٠ێ جارەکادی بۆ ١٠٪ ێ و ل سالا ١٩٧٧ێ ئەو رێژە کێمتر لێ هات و بۆ ٦,٨٪ ێ و ل سالا ١٩٨٧ێ ناڤێ ناحیێ ژ ئەگەرێن راگوهاستنان هەر ئێکجار دناڤ لیستا پارێزگەهێ دا نەهاتییە تۆمارکرن[2].

ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینکریا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ سەرجەمێ خەلکێ ناحیا کانی ماسێ (١١١٩٠) کەسن ژ وانا (١٢٦٢) ب باژێری و (٩٩٢٨) کەس گوندنشین دهێنە هژمارتن[*]

ژیانا خەلکێ دەڤەرێ ب رەنگەکێ گشتی ل سەر چاندنێ بوو، گوندێن ئاڤی باراپتر دەرامەتێن ئاڤی د چاندن، مینا: برنج، کونجی، ماش، گەنمۆك، درا، گارس، تەحلە، سپیك، خرۆبی، پتات، سلك، کولند، شێلم، پیڤاز، باجانسۆرك و ... هتد. ل ڤان سالێن داویێ ژی باراپتر بەرێ وان کەتە دارووبارێ فێقی، مینا: سێڤ " کو دەڤەرەکا ب ناڤ و دەنگە بۆ سێڤا " و خۆخ و هنار و تری و هەژیر و گویز و هرمیك و ... هتد. گوندێن دێم ژی باراپتر پشتگەرمێن چێکرنا رەزان بوون و جۆرێن تری و باهیڤ و سماق و... هتد د چاندن، یان ژی جۆت و کێل دکرن و گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گژنیژ و ... هتد د چاندن. هەروەسان خەلکێ دەڤەرێ مێشێن هنگڤینی ژی خوداندکرن، زێدەباری ب خودانکرنا تەرش و کەوالی ب رەنگەکێ گەلەك بەرفرەهـ

ب تایبەت پەز و بزن، هەروەسان چێل و دەوار ژی بۆ کارێن رۆژانە. دیسان خەلکێ دەڤەرێ مشە مفا ژ دەرامەتێن سرۆشتییێن دەڤەرێ ژی وەردگرت، چ بۆ خوارنێ یان ژی بۆ فرۆتنێ و دەڤەر یا دەولەمەندە ب جۆرێن دار و باری و گیایێن سرۆشتی، مینا: بەڕوی، مازی، گرسک، کەزان، گهیشک، کاری، کەنگر، کڤارک، رێڤاز، ترشۆک، لیش، سترک، سۆریاز و ... جۆرێن گولا، مینا: گول شلێر، نێرگز، گول هرچ، تری ریڤیک و ... هتد.

ژیانا گەلەک خەلکێ دەڤەرێ ل سەر کاروانی و کڕین و فرۆتنان ژی بوویە، ب تایبەت ئەڤ گوندێن هەڤسنوور دگەل باکوورێ کوردستانێ.

سرۆشتێ دەڤەرێ یێ هاریکار بوویە کو ب دەهان جۆرێن گیاندارێن کیڤی لێ هەبن، مینا: هرچ، پەزکیڤی، گورگ، حەفتیار، سیخور، کێرویشک، سڤۆرە، بەراز، ریڤی، قوربەشک، ژیژی و جۆرێن فڕندان، ب تایبەتی کەو، دیسان د بەرێ دا پلنگ ژی لێ هەبوویە و نها ئەگەر مابن ژی گەلەک د کێمن.

## کانی ماسێ:

وەکی گوند ناڤەندا ناحیێ یە، ل بەرێ ب ناحیا بەرواری بالا دهاتە نیاسین، سنوورێن کانی ماسێ ژی ب ڤی رەنگی نە:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دۆرێ و ئیاتێ.

**باکووری:** هەڤ سنوورە دگەل گوندێن باکوورێ کوردستانێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێریشکێ.

**باشووری:** گوندێ ئورمەداودا.

نها ل ناڤەندا ناحیێ کۆمەکا دام و دەزگەهـ و فەرمانگەهێن میری و حکۆمی هەنە، هەروەسا نەخۆشخانەیا ب ناڤێ رۆزانا هەیە کو ژلایێ دایکا رۆژنامەڤان رۆزانا هاتیە ئاڤاکرن، هەژییە بێژین رۆژنامەڤانا ناڤبری د کریارەکا تیرورستیدا ل کانی ماسێ هاتبوو تیرورکرن، ل سەنتەرێ ناحیێ فەرمانگەها چاندنێ و ڤێتێرنەری و باژێرڤانی و خواندنگەهەکا ١٨ رێزی دگەل چەندین فەرمانگەهێن

کانی ماسێ



دی هەنە. نها ژی کۆمەکا خێزانێن مەسیحی و موسلمان کو ب سەدان سالە ب هەڤرا ل کانی ماسێ دژین هەنە. هەژیە بێژین کو یەکەمین خواندنگەها سەرەتایی ل دەڤەرا بەرواری بالا ل سالا (١٩٢٣) ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن[٣].

## گوندێ بێدوهێ:

بێدوهێ ب دووراتییا ٧کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا کانی ماسێ. ل دووڤ گۆتنێن خەلکێ گوندی دیرۆکا گوندی ڤەدگەریتەڤە دەوروبەرێن هەشتسەد سالان بەری نها. ل سەر دەمێ میرێن ئامێدیێ (١٠) گوندێن دەڤەرێ (خویك) یان ژی دەهیك نە ددان وان میران، لەورا دگۆتنێ (بێدەهـ) و ناڤێ بێدوهێ ژ ڤێ چەندێ هاتییە، هەژی یە بێژین ئەڤ گۆتنە بۆ گوندێ (بێدە) یێ دەڤەرا رێکان ژی دهێتە گۆتن[٤].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** هەڤسنوورە دگەل توخیبێ باکوورێ کوردستانێ و چیایێ شارانیێ.

**باشووری،** گوندێ مایێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دێریشکێ.

**رۆژئاڤا،** گوندێ ئۆرە و بناڤیێ.

## پێکهاتا گوندی:

بێدوهێ گوندەکێ بۆشە و ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٩٤ کەس ل گوندی دژیان[٥]، گوند ژ گەلەك بنەمالان پێك دهێت، وەکی: بنەمالا بیبەکروکی، سالما، زارکا، برەهیمی، هژکوژی، خەمدارا، د چەرخێ شازدێ دا بنەمالا (دەلی) ژ باکوورێ کوردستانێ مشەخت بووینە و ل گوندی ئاکنجی بووینە. ل وی سەردەمی مرۆڤەکی ب ناڤێ (دەل) برازایەکێ خۆ دگەل خۆ ئینابوو و ڤی کەسی ئەڤ گوندە بەرەڤ زێدەهیێ ڤە بر و ئەو بنەمالێن ل دووڤ (دەلێ) کەفتین ئەڤەنە: بنەمالا رەشێ، مالا سام، مالا هەسن، مالا ئالی، مالا بەهدین، مالا پیرا، مالا مویسێ، مالا ومیسێ.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩٧٦ێ ژ لایێ عێراقێ ڤە هاتییە کاڤلکرن. سالا ١٩٩٢ێ گوند هاتەڤە ئاڤاکرن، لێ ژبەر زێدەگاڤیێن سوپایێ ترکیا گوند ل سالا ١٩٩٣ێ جارەکادی هاتە چۆلکرن ڤە، سالا ٢٠٠٢ێ ٢٠٠ خانی بۆ خەلکێ گوندی هاتنە ئاڤاکرن و نها بوویە کۆمەلگەهـ خەلکێ بێدوهی نها ژ ١٥٠٠ خێزانان پێکدهێت.

ل سالا ١٩٣٧ێ بۆ یەکەمین جار خواندنگەهەکا سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتە ڤەکرن[٦]، ئەو دبیتە دووەمین خواندنگەها دەڤەرێ پشتی خواندنگەها کانی ماسێ یا سەرەتایی، هەلبەت ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان ژی خواندنگەهەك ئایینی لێ هەبوو[٧].

## کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

ل بێدوهێ گەلەك کانی هەنە، وەکی: کانییا برقافکێ، کانییا مەلا محەمەدی، کانییا زەڤیا تاجدین، کانییا نوینێ، کانییا خانوتێ، کانییا رەسکا، کانییا بن گوندی، کانییا بن مالا شەعبانێ پەریێ، کانییا تا، کانییا بن بەری، کانییا بن گویزێ، کانییا قەزەنا وجومێ ،کانییا هشکوژیا و مالا مژدین، کانییا بەستێ، کانییا کونا شکەفتا لاتێ، کانییا گەلی، کانییا بن چیای، کانی سێڤك، کانییا تییا دەلێ، کانییا روخەی، کانییا بەرێ شین، کانییا بن بیێ، کانییا وارزەری، کانییا مێرگا بالا، کانییا کون مشکێ، کانییا دەراڤێ زیادا، کانییا کورا گویزێ، کانییا لەتیف، کانی زرکێتك، کانییا کورا بوهار، کانییا شارانیێ، کانییا خدرێ، کانییا حەمێ زیاد، کانییا خەلندوری، کانییکێن شیرێژی، کانییکێن لاتێ، کانییا تەڤزێنێ، کانییا حەجی خالدی، کانییا کولا و کانییا کەڤوتك. پتریا ڤان کانییان دکەڤنە لایێ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ گوندی. هەروەسا رووبارەکێ ئاڤێ دبەر گوندیدا ژلایێ رۆژئاڤا دهێت و بۆلایێ باشوور و باشوورێ رۆژهەلاتی دچیت، ژێدەرێ ئاڤا وی رووباری ژی گوندێن بناڤیێ و ئۆرەنە، زێدەباری

چەندین كانیێن گوندی دچنە سەر ئاڤا وی رووباری.

**شكەفتێن گوندی:**

هەروەسا كۆمەكا شكەفتان ژی ل گوندی هەنە، وەكی شكەفتا شارانیێ ل ژووریێ گوندی، شكەفتا جافرا، شكەفتا سپی ل ناڤ گوندی، شكەفتا شەری، شكەفتا كەوا، شكەفتا بەهدر، شكەفتا وارزەری ل باشووری، شكەفتا برەهیم رەڤا، شكەفتا لاتێ، شكەفتا سێ دەر، شكەفتا ئومەرا، شكەفتا سەر كەڤری، شكەفتا خزنكێ، شكەفتا مێرگیشكا بندەڤێ، شكەفتا موقبەرا بەستێ، شكەفتا محێ زەبێ.

**زۆمێن گوندی:**

ژ بەر كو گوند دبەرێدا خودان تەرش و كەوال بوون، لەورا ل هاڤینێ قەستا زۆزانان دكرن وەكی، زۆما شارانیێ ل لایێ باكووریێ گوندی ب دووراتییا ٥كم، زۆما سەرێ ئولیێ، زۆما كانییا، زۆما وارزەری، زۆما مێرگا بالا، زۆما ئاخا رەش، زۆما بن چیای.

هەروەسا ل بەرێ پێنج ئاشێن ئاڤێ ژی لێ هەبوون، ئەو ژی: ئاشێ مالا رەشێ، ئاشێ نزاری یێ مالا سادق، ئاشێ خارێ (یێ مالا عەزۆی و مالا عەبدولایێ حەجی)، ئاشێ خنداری، ئاشێ مالا بەسێ.

وەكی دیار جهێ گوندی كەڤر و چیانە، ئەڤێ چەندێ تێرا هندێ نەدكر كو خەلكێ گوندی ل سەر گوندی بمینن، لەورا گەلەك ژوان و هەر ل سالێن سیها و چلان قەستا بازێران كرن و ئەڤێن مایی ژی ژیانا وان پتر ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو ژ بلی كو گوندەكێ سنووری بوو بازرگانی دگەل گوندێن باكووریێ كوردستانێ دكرن، و ئەڤە رێخۆشكەرەك بوو كو ژیانا رێژەیەكا خەلكێ گوندی خۆش ببیت و دەولەمەند بین[٨].

## گوندێ چەلكێ:

گوند ب دووراتییا ٢٦كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ ل سەر جادا سەرەكیا دچیتە كانی ماسێ، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٧٣ كەس ل گوندی دژیان[٩] و نها ژ (٢٠٠) خێزانان پێكدهێت، نها ١٣٠ خێزان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دەرڤەی وەلاتی و ل بازێران. رووبەرێ گوندی ل دۆرێن ٦ هزار دونەمێن ئەردێ ئاڤی و دێمی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هرۆرێ.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ خابووری و سنوورێ دەڤەرا گولییا.

**باكووری:** گوندێن كێستە و چەلكا فەللا.

**باشووری:** گوندێ چەمیكێ.

**پێكهاتا گوندی:**

گوندی چەلكێ ژ چوار ئیجاخان پێكدهێت، ئەو ژی: هەسن، حەسێ، وەیسی و سلێمان.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل ١٩٧٩/٦/١٩ێ ژلایێ عیراقێ ڤە هاتییە كاڤلكرن و خەلكێ گوندی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەها هیزاوا، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ل مەها (١٢) گوند ژلایێ رێكخراوێن بیانیڤە ل سەر رێكا گشتییا دناڤبەرا بێگوڤا و كانی ماسێ هاتە ئاڤاكرن ڤە.

**شكەفتێن گوندی:**

ل گوندی كۆمەكا شكەفتان هەنە، وەكی: شكەفتا گوندی، شكەفتا عەلی بابلا ل باكووریێ رۆژهەلاتی ب دووراتییا ٤كم ژ گوندی، شكەفتا میرا ل لایێ باكووریێ رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٤,٥كم. شكەفتا كونیشكێ جهێ سێ مرۆڤان تێدا هەیە و دەرەجك و جهێ كوچكێ ئاگری و دۆرا دەری دبەری كۆلایە ل لایێ باكووریێ رۆژهەلاتی ب دووراتییا ٥ كم.

**كانیێن گوندی:**

كانی یێن گوندی یێن بەرنیاس ژی ئەڤەنە: كانییا خزێمێ و چەمی و ئاشی و كانییا میرانە، هەمی دكەڤنە لایێ باكووریێ رۆژهەلاتی ب دووراتییا ٤,٥كم.

ل گوندی زۆمەك ژی ب ناڤێ كەدرسمێ ل لایێ باكووریێ رۆژهەلاتی گوندی هەیە و دكەڤیتە دووراتییا

دورێن ٤,٥کم ژ گوندی.

ژیانا گوندییان د بەرێ دا ژ بلی جۆتیارییێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و ل سەر سلتە و گرتنا ماسیان ژی بوو و خواندنگەهـ ژی بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ڤەکرن[١٠].

## گوندێ باتیفا سەیدا:

باتیفا سەیدا ب دووراتییا ١٢کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ناڤێ گوندی ژ بابێ تەزی و ب هێز هاتییە کو ل گوندی دهێت، خەلکێ گوندی ژی سەیدن و ژ ئێك بنەمال پێکدهێت و خەلکێ وی دگەل خانکا سەیدا و سەیدێن وانکێ هەمی مرۆڤێن ئێکن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ تیلەرێ.

**باشووری،** گوندێن ئاسهێ و زەکەریا و چیایێ گابنێرکێ[١١].

**رۆژهەلاتی،** گوندێ راڤینا.

**رۆژئاڤا،** گوندێ ئەلکیشکێ.

گوند سێ جاران ل سەر دەمێ رژێمێن عیراقێ هاتییە سۆتن. ل هەوا ئەنفالان خەلکێ گوندی ئاوارەیی ترکیا بووینە، سالا ١٩٩٢ێ جارەکادی ڤەگەریاینەڤە سەر جهـ و وارێن خۆ و گوند ل سەر جادا سەرەکییا دچیتە کانی ماسێ ئاڤاکرن، خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٤ کەس بوون[١٢] و نها ژ ٣٠٠ خێزانا پێکدهێت و ل گوندی و دهۆك و زاخۆ دژین.

### شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن کەڤن ل گوندی کاڤلکێ شێخ محەمەدی کو ب جهەکێ پیرۆز دهێتە نیاسین و خەلك سەرەدانا ڤی جهی دکەن. ل دۆرێن ٢٠ کونبایا ل ژێریێ گوندی هەنە، کو گەلەك با ژێ دەردکەڤن.

دیسان شکەفتەکا مەزن ب ناڤێ شکەفتا زەکەریای ل ژووریێ گوندی هەیە.

### کانیێن گوندی:

ژ کانیێن گوندی: کانیا سا محەمەدی و کانیا برڤێ و شیفکا رەش وێلەیی و کانیا جنینێ.

خواندنگەهـ ژی پشتی گوند هاتییە ئاڤاکرن ل سالا ١٩٩٣ێ بۆ هاتییە ڤەکرن. نها چەند خێزانەکێن کێم ل سەر گوندی دژین[١٣].

## گوندێ بارزانکێ:

گوندێ بارزانکێ ب دووریا ٣٥کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و خەلکێ گوندی ژ ٦٠ خێزانان پێکدهێت، نها ل زاخۆ و دهۆکێ دژین.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کێستە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ نزدۆرێ و رووبارێ خابووری.

**باشووری،** گوندێ هورکێ.

**باکووری،** بالۆلەی و گوندێ رویسێ.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالێن گوندی ئەڤەنە: بنەمالا عەمۆی، بنەمالا عیسایێ، مالا گەوهەرێ، بنەمالا محەمەد میر محێ، بنەمالا حەسەنێ حەجی پیربابا، ئەڤ بنەمالە دبنەرەتدا خەلکێ گوندێ نزدۆرێ نە.

ب دروستی نەهاتییە زانین کا ناڤێ گوندی ژ چ هاتییە، ل دەسپێکا سەدسالیا بیستێ هەتا سالا ١٩٧٦ێ بێ ئاڤابوویە کو ل وێ سالێ گوند ژلایێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن و خەلکێ وێ ئاوارەی گوندێن کەریتێ و کۆڤکێ بووینە، پاشی چووینە گوندێ گرێ بیێ و لێ خوجهبووینە، سالا ١٩٩٢ێ گوند جارەکادی هاتییەڤە ئاڤاکرن، سالا ١٩٩٦ێ گوند ژلایێ سوپایێ تورکی ڤە هاتە بومبەبارانکرن و خەلك نەچار بوون گوند بەردان، پشتی سالا ٢٠٠٠ێ جارەکادی گوندییا قەستا سەر گوندێ خوە کر و ئاقارێ خوە شینکرن، نها ب تنێ دو مال ل سەر گوندی دژین و پەزی ب خودان دکەن.

### کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی کانیێن دزکێ و بیشی و نهالا بەخی ل سەرێ گوندی هەنە، هەروەسان حەفت جوویێن ئاڤێ ژی بۆ سەر ئاڤاری دچن[14].

## گوندێ بازێ:

گوندێ بازێ پێکهاتییە ژ موسلمان و مەسیحییان، ب دووراتییا ٢٦کم دکەڤیتە باشووری رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ناڤێ بازێ ژ بازا مرۆڤان یا هاتی، ئانکو جهێ دەربازبوونا مرۆڤان.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی مەزنێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هەترشێ.

**باکووری:** گوندێ چەمسەیدا یە.

**باشووری:** چیایێ مەتینا.

**باشوورێ رۆژهەلاتی:** گوندێ بێشیلێ.

**باشوورێ رۆژئاڤای:** گوندێ بێلیزانێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ بازێ ژڤان بنەمالان پێك دهێت: بنەمالا تۆڤیا، بنەمالا عەمەرا، بنەمالا عەبدولایێ رە زەر، بنەمالا سالحایێ، بنەمالا نیعمەتی، بنەمالا کێستەیا (ژ بنیات کێستەیی)، بنەمالا بێ گەوریە، بنەمالا کولندی کو مەسیحینە (ژ ئاروشێ هاتینە)، بنەمالا لازەرکێ، بنەمالا عەلی بەگێ، بنەمالا بناڤییا (ژ بناڤیێ هاتینە)، بنەمالا دەرویش بەگێ کو دگەهنە بەگێن دەڤەرا بەرواری بالا، ژمارا ئاکنجییێن ڤی گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٠ کەس بوون[15] و نها ژمارا خێزانێن گوندی د گەهنە (١٥٠) سەرۆك خێزانان، (٦٠) خێزان ژ فەللە و موسلمانان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و فەیدیێ و مووسل و بەغدا و دەرڤەی وەلاتی دژین.

ل دووڤ گۆتنێن دانعەمرێن گوندی ل بەری گوند بهێتە ئاڤاکرن د گۆتنێ (چەم شێخێ)، گوندەکێ مەزن بوو کو ژ گوندێ چەمسەیدا هەتا دەرێ گەلیێ بازێ ڤەدگرت و پاشی گوند ل دو جهێن دی ژی ب ناڤێن: باز کرمانج و بازێ، یان بازا عەلی بەگێ هاتییە ئاڤاکرن، و هەر ل دووڤ وان گۆتنان ل رۆژێن ئەینی (٨٠) مساسك[16] پالدانە دیوارێن مزگەفتێ، ل ڤی گوندی دو بنەمالێن بەگا ب ناڤێن عارف بەگ و عەلی بەگ هەبوون[17].

ل سالا (١٢٢٠مش/١٨٠٥ز) ل ڤی گوندی شەرەکێ مەزن د ناڤبەرا میرێ بەهدینا، عادل پاشای و ئەحمەد بەگ کورێ سولتان حسێن بەگی کو ل سەر وی یاخیبووی رودا و یێ داویێ هاتە کوشتن[18].

گوند ل سالا ١٩٨٨ێ هاتییە خرابکرن و خەلکێ وی بەرەڤ ترکیاڤە چوون. سالا ١٩٩٢ێ خەلکێ گوندی جارەکادی زڤرینە سەر گوندی و گوند هاتە ئاڤاکرنە ڤە. سالێن ١٩٩٦-١٩٩٧ێ گوند کەفتە بەر هێرشێن سوپایێ ترکیا و خەلکێ وی بەرەڤ باژێران و گوندێن دەور و بەر چوون و گوند هاتەڤە چۆلکرن و نها گوند یێ ئاڤایە.

### شوینوارێن گوندی:

مزگەفتا گوندی ئێکە ژ مزگەفتێن کەڤنار ل دەڤەرێ، هەروەسان گەلەك ناووسك ژی ل باکوورێ گوندی هەنە، دیسان ئاشەکێ ئاڤێ ژی یێ هەی و تا نها ژی دروست مایە. ژ بلی گرکێ خزینێ کو ئێکە ژ شوینوارێن کەڤن ل گوندی.

### شکەفتێن گوندی:

چەند شکەفت ل گوندی هەنە، مینا: شکەفتا بابەکرا (کو شکەفتەکا ناڤدارە ل دەڤەرێ و ل شۆرشان جهێ ڤەحەواندنا خەلکی بوویە، و سالا ١٩٨٧ێ ٣٠ مال تێڤە بوون)، شکەفتا نێچیرڤانا، شکەفتە رەشێ، شکەفتا سۆرێ، شکەفتا بەربەرا، شکەفتا عەبێ بازی، شکەفتا سومتی، ئەڤ شکەفتە دکەڤنە لایێ باشوورێ گوندی.

**کانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

دیسان گەلەك كانی ژی ل ژێری و دۆرمانێن گوندی هەنە، مینا: كانییا بابەكرا ل بەر دەرێ شكەفتا بابەكرا، كانی شیلانكێ، كانی بەربەرا، كانییا بن بەری، كانی كەوكێ، كانییا هاجی، كانییا تا، كانییا واری، كانییا بنگیزێ، كانییا بن نزاری، كانییا ئەوراهێ، كانییا عەبدولای، كانییا میشێ، كانییا مێرگا. دیسان چەند جووەك ژی هەنە، مینا: پشتا ئاشی، بنێزاری، سێهلانێ "كو ملكێ بازێ و چەمسەیدا یێ ل سەر"، پشتا گوندی.

ژ گۆڕستانان ژی: مزگەفتێ، پشت مزگەفتێ، كانییا هاجی، گرێ شاشا " یێ مەسیحییان" .

ژ كەڤرێن بەردەوامی مێشێن هنگڤینی د ناڤدا: مێشا كومتكی، مێشا حەجی، مێشا دەرێ گەلیێ ب شۆرتك، مێشێن گەرۆمەی " كو ئەو ژی ٥ - ٦ مێشانە" [١٩].

ل گوندێ بازێ دو گەلی هەنە:

**١- گەلیێ بازێ، كو ئەڤ جهە لێ هەنە:**

ل رۆژئاڤایێ گەلی: كورکێ قاسێ " كو چەپەرێن نێچیرڤانێن پەزكیڤیانە"، سیلەخا، دۆلا كون بەفرێ " كو بەفر بۆ هاڤینێ دكرنێ"، بەر چەپەرێ عارف بەگێ و د بندا خارێ مەمك و كەڤرێ نێچیرڤانا و ل سەرێ گەلی شكەفتا (قاوخكی) هەیە.

ل رۆژهەلاتێ گەلی: باكوزی، نهالا كویر، پشتا شكەفتێ، نهالا شاپێ.

**٢- گەلیێ ب شۆرتك:**

ل رۆژئاڤایێ وی چەند نهال هەنە، مینا: نهالا ب سۆتك، میرا، چەلێ سمتی، نهالا گیای، نهالا كورتێ و ملا مەحمیدی دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گەلی و دبندا دبێژنێ بن نهالا[٢٠].

ل بەرێ خواندنگەهەك ژی لێ هەبوو[٢١]، بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل سالا ١٩٧٧ێ لێ هاتییە ڤەكرن، بۆ جارا دووێ پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن ل سالا ١٩٩٣ێ خواندنگەهـ لێ هاتەڤە ڤەكرن و سالا ٢٠١٣ێ ئاڤاهیێ خواندنگەهێ هاتییە ئاڤاكرن.

پشتی سەرهلدانێ دێرەك ژی ل سەر جهێ دێرا كەڤن (دێرا مار یوخەنا) هەر ب وی ناڤی هاتە ڤە ئاڤاكرن و كارەب ژی ل سالا ٢٠١٠ێ گەهشتیە گوندی.

بنەمالەكا كریستیانا ل گوندی هەیە كو كارێ جەبارێ دكەن.

وەكی دیار ئاڤارەكێ بەرفرەهـ ل گوندی هەیە، و ژیانا خەلكێ گوندی هەر د كەڤن دا ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو. دیسان جهەكێ باش یێ گەشت و گوزاری ل گوندی هەیە[٢٢].

## گوندێ بالۆكا:

بالۆكا ب دووراتییا ١٥كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ كانی ماسێ ل سەر لێڤا رووبارێ زێیێ مەزن، ل سالا (١٠٠٥مش/١٥٩٦ز) بنگەهێ میرگەهێ بوو و ئاڤدەل بالۆكی میرێ وێ بوو، پشتی ژ میرێ بەهدینان یاخیبووی، ل سەر دەستێ كلائی كورێ مەلك عەزیز هاتەكوشتن و شوینوارێن كۆچكا وی ماینە[٢٣].

گوند ل سالا ١٩٧٨ێ ژ لایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتییەكاڤلكرن و خەلكێ وی بۆ كۆمەلگەهان هاتییە ڤەگوهاستن، سالا ١٩٩١ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن، لێ جارەكا دی ژبەر كاودانێ ناڤخۆ ل سالا ١٩٩٤ێ هاتییە بەردان و تا نها نەهاتییە ئاڤاكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ ئاڤ سارکێ.

**باشووری:** چیایێ مەتینا و گوندێ زێوە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كارە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مەلختە.

**بنەمالێن گوندی:**

گوند پێكدهێت ژ بنەمالێن (بێ سلو، بێ قەندو، بێ تەلو )، ژمارا ئاكنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٠ كەس بوون[٢٤] و نها ٤٥ خێزانن لێ كەس ل سەر گوندی ناژیت.

## شكەفت و كانیێن گوندی:

ل دۆرمانێن گوندی شكەفتێن سەر قەسرێ و شكەفتا زنار و شكەفتا چەمێ مزگەفتێ هەنە، دیسان چەند كانی مینا كانییا بالۆكا و كانییا پوكەر دناڤا گوندیدا هەنە[25].

## گوندێ بەربویرێ:

گوندێ بەربویرێ ب دووراتییا ٨كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ كانی ماسێ سەر رێكا سەرەكییا دچیتە خالا گومركا سەرزێری.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سەرزێری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دوورێ و ناحیا كانی ماسێ.

**باكووری:** گوند هەڤ سنووره دگەل باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری:** گوندێ تروانش.

### پێكهاتا گوندی:

ژ ڤان بنەمالان پێكدهێت: بنەمالا عومەرنافخوش، عادل‌پیرمیس، محەمەدیەحیاحەسەن، عەبدولكەریم سەعدولا، ئەحمەد محەمەد، ژمارا ئاكنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٨ كەس بوون[26] و نها ٥٠٠ خێزانن كو ل دهۆك و زاخۆ جهێن دی دژین.

گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییە كاڤلكرن و خەلكێ وێ ل بێكوڤا خۆجهـ بوون، سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتەڤەئاڤاكرن و ل سالا ١٩٩٤ێ جارەكادی ژبەر تۆپخانا توركی هاتەكاڤلكرن و هەتا نها گوند چۆله و ب تنێ ل هاڤینێ هندەك خێزان بۆ چاندنێ قەستا گوندی دكەن.

### كانی و شكەفتێن گوندی:

ئەڤ كانییە ل گوندی هەنە: كانییا گوندی دكەڤیتە ل ناڤا گوندی ژلایێ رۆژهەلاتیڤە و كانییا بۆتی ل لایێ باكوورێ گوندی و نێزیكی گوندییە.

دیسان دو شكەفت ب ناڤێن شكەفتا سەرگیزا ل لایێ باشوورێ گوندی و شكەفتا بەرسورێ ل لایێ رۆژئاڤایێ گوندی هەنە[27].

## كۆمەلگەها بریفكا:

كۆمەلگەها بریفكا ب دووراتییا ٢٠ كم دكەڤیتە لایێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ.

ناڤێ گوندێ بریفكا ژ تاخێ بریفا هاتییە كو دبنەرەتدا ژ ئەرتووشێ ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە، خەلكێ گوندی وەسا ددەنە دیاركرن كو وان بەری نێزیكی ٤٨٠ سالان گوند ئاڤاكرینە، ل دەستپێكێ ل دەشتا باتكا ل جهەكی د گۆتنێ زیرێ میروی (ب ناڤێ میروی یێ گوند ئاڤاكری) هاتییە ئاڤاكرن. ناڤێ وی یێ دروست میرزو بوو. دۆرێن ١٥٠ سالان ئەو گوند مایە ئاڤا، پاشان (مەلا حوسەین) ژ مرۆڤێن خۆ جودا بوو و گوندەك ب ناڤێ سەركۆلكا ئاڤاكر، كو ئەو ژی چەقەك بوو ژ بریفكا و دۆرێن ٦٠ سالان ئەڤ گوندە مایە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن گركا و قومریێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن چەقەلا ژێری و ژووری.

**باكووری:** زنجیرا چیایێ سەرێ حەمێ وهرۆرێ.

**باشووری:** گوندێن بابیری و هەترشێ.

گوندی وەسا خویادكەن كو بەری ٢٥٠ سالان پشتی هەردو گوندێن دی بووینە ئێك گوندێ بریفكا ل كانییا مشارێ هاتە ئاڤاكرن. سالا ١٩٧٨ێ گوند ژلایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتییە كاڤلكرن و خەلكێ گوندی ل تلكەبەرێ ئاكنجی بوون. سالا ١٩٨٣ێ دۆرێن ٨٠ خێزانان گوندێ بریفكا گاره ل رۆژهەلاتێ گوندێ گركا ئاڤاكرن. سالا ١٩٨٨ێ گوندێ بریفكا گاره هاتە سۆتن و خەلكێ وێ دەربەدەرێ تركیا و ئیرانێ بوون، سالا ١٩٩٢ێ خەلكێ وی گوند ل سێ جهان (بریفكا گارەی و بریفكا چەقەلا و

بریفكا تەحتكا) ئاڤاكرن، سالا ۲۰۰۳ێ كۆمەلگەها بریفكا ل سەر جادا سەرەكییا دچیتە كانی ماسێ دگەل چێكرنا بنگەهەكێ تەندورستی و مزگەفتێ و خواندنگەهێن بنەرەتی و ئامادەیی ل سالێن ۲۰۰۳ێ بۆ هاتینە ڤەكرن.

بریفكا ژ (٥) بنەمالان پێكدهێت و هەمی دبنە مرۆڤێن ئێك، ل دووڤ ئامارا سالا (۱۹٥۷)ێ ژمارا خەلكێ گوندی ۲٦۰ كەس بوون[۲۸]، لێ نها ژمارا خێزانێن وان د گەهنە نێزیكی (٦۰۰) خێزانان، ل كۆمەلگەهێ و زاخۆ و دهۆكێ دژین.

**شوینوارێن بریفكا:**

سەركۆلكا ل رۆژئاڤایێ كۆمەلگەهێ ب دووراتییا ۱كم، گرێ كۆرا مێكیك ل لایێ ژێری، هەروەسا دوورگەهـ ا بركا دارجەلی ب دووراتییا كیلومەترەكێ ل رۆژئاڤایێ كۆمەلگەهێ هەیە.

**شكەفتێن بریفكا:**

ل بریفكا كۆمەكا شكەفتان هەنە، وەكی: شكەفتا كون كێرویشكێ، ل ژوورێ كۆمەلگەهێ ب دووراتییا ۲كم، شكەفتا دەریكێ رەشوێلەی ل رۆژهەلاتێ كۆمەلگەهێ ب دووراتییا ٤ كم، شكەفتا حەمێ ل ژوورێ كۆمەلگەهێ ب دووراتییا ٤كم، شكەفتا میرزای ل باكوورێ رۆژئاڤایێ كۆمەلگەهێ ب دووراتییا ۳كم.

**كانیێن گوندی:**

چەند كانی ل ژوورێ كۆمەلگەهێ هەنە، وەكی: كانییا ئێزدین ئاغایی و بارزانكێ و كانییا هەرفتەیی و مێرگا عەبی زێدی، لێ پتریا عەردێ وی دێمی یە[۲۹].

## گوندێ بناڤیێ:

بناڤیێ جهەكێ بلندە و زۆزان و بەفرینە، ٤كم ژ جادا سەرەكی دوورە و ب دووراتییا ۱۰كم ل لایێ رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ. ناڤێ گوندی ژ بن ئاڤیێ هاتییە، كو گەلەك كانی ل دۆرمانێن گوندی هەنە و یێ ب ئاڤە. لەورا گۆتینێ بناڤیێ.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** هەردو گوندێن بێدوهێ و مایێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن هەدێنە و تویلەر.

**باكووری:** گوندێ ئۆرە.

**باشووری:** گوندێن ئۆرمانا و ئورمەداودا.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند پێكهاتییە ژ ڤان بنەمالان: بنەمالا ژووری، بنەمالا ژێری، بنەمالا شڤانكێ، بنەمالا رەشێ، بنەمالا عەلی هەسنا، بنەمالا حەم مەلا، ژمارا ئاكنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (۱۹٥۷)ێ ٤٤۳ كەس بوون[۳۰]، لێ نها هەمی نێزیكی ۸٥۰ سەرۆك خێزانان.

گوند بۆ جارا ئێكێ ل سالا ۱۹۲۰ێ ل دەمێ شەرێ گەلیێ مزیركا ب دوماهی هاتی هاتییە سۆتن، سالا ۱۹٦۱ێ گوند هاتە بومبەبارانكرن و چەندین مال هاتنە خرابكرن. سالا ۱۹۷۸ێ گوند ژلایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتییەكاڤلكرن و خەلكێ وێ ل هێزاوا و چەندین جهێن دی ل دەوروبەرێن سێمێلی و دهۆكێ و مالتایێ و لەزەكا و گەڤەركێ خۆجهكرن. د سالێن هەشتیاندا هندەك مال ل سەر گوندی دژیان، سالا ۱۹۸۸ێ جارەكادی هاتە خرابكرن ڤە و خەلكێ وی بەرەف تركیا ئاوارەبوون، سالا ۱۹۹۲ێ خەلكێ وی ڤەگەریانە سەر گوندی، لێ ژبەر كاودانێ ناڤخۆ جارەكادی ل سالا ۱۹۹٥ێ هاتە بەردان. نها چەند خانییەك ل گوندی هاتینە ئاڤاكرن و ب تنێ ل هاڤینان خەلك قەستا گوندی دكەن.

**شوینوارێن گوندی:**

مناسبێ كێری ل ژێرێ گوندی ب دووراتییا ٥۰۰م (وەكی كەڤنە باوەری، دەمێ مرن دكەتە پەزێ گوندییا،

دا پەزەکێ ئینننە سەر وی مناسبی و شیرێ وی ددۆت و دکرە خێر)، کێرا موچکێ ب دووریا ٥٠٠م ل ژێریێ گوندی، کو جهەکێ بلند بوو، میرێن ئامێدیێ دهاتنە وی جهی بۆ گەریانێ و کاڤلك لێ هەبوون، دیسان مینا خالا گومرکێ بوو، و مۆچکەك وەکی خویك (باج) ژ هەر متایەکێ دەرباز ببا رادکرن. هەروەسان ناووسکەك ب دووراتییا ٢٥٠م ل ژووریێ گوندی و ٥ گۆڕستانێن کەڤن، کو دیرۆکا وان بۆ دەمێن کەڤنار ڤەدگەرن هەنە، ژ وانان مناسبێ کورکا ب دووریا ١٥٠م ژ گوندی، گۆڕستانا بەر گوندی، گۆڕستانا ملکا (لووا) ب دووریا نێزیکی ١٠٠م ژ گوندی، و مناسبێ کێری ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا ٥٠٠ م، موخبەرا کورکێ ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ.

## کانیێن گوندی:

چەند کانی ل گوندی هەنە، وەکی: کانیا مەزن یا بەر گوندی ل رۆژهەلاتێ گوندی ب دووریا ١٠٠م، بەرێ جهێ بالاڤیا بوو، کانیا کەندێ ل ژووریێ گوندی ب دووراتییا ٥٠م، کانیا بێریا کو جهێ بهێنڤەدانا بێریا بوو، کانیا بن بەری ب دووریا ١٥٠م ژ باکووری گوندی، کانیا کورکێ ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا ٧٥٠م، کانیا بەر مناسبێ کێری، ناڤدارە ب برکا حەجی جبرائیلی ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا ٦٥٠م. کانیا درکا ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ٥٠م، کانیا سپی ل رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٨٠٠م، دۆرمانێن ڤێ کانیێ هەمی دارێن مەزنێن بەڕوی و دینداری و مازی نە.

گوند یێ ناڤدارە ب پتات و سلك و کولند و شێلم و گویز و سێڤان، جۆرەکێ سێڤا پاییزی ل گوندی هەیە کو گەلەك د مەزن بوون و ل دەڤەرێن دی یا کێمە.

هەر ژ کەڤندا ل نهالا بنێ گوندی کلێ چاڤا هەبوو و ل ناڤ گوندی و جهەکێ دبێژنێ کۆرا دەرمانی ب

گوندێ بناڤیێ



دووراتییا ٥٠٠م ل لایێ رۆژئاڤایێ گوندی یێ هەی، ئەڤ کلە هەر دکەڤندا دهێران و ژنان بکار دهینان و د هاتە فرۆتن ژی. ل ڤی گوندی گەلەك سامانێن دی یێن سرۆشتی هەنە[٣١].

## گوندێ بێتەنویرێ:

ئەڤ گوندە پێکدهات ژ جوی و مەسیحیان، پشتی جوی ل سالا ١٩٤٨ێ چووینە ئسرائیلی هاتییە چۆلکرن، گوندە دکەڤیتە دووراتییا ٥کم ل باشوورێ رۆژهەلاتێ کانی ماسێ و ٥٠٠م ژ جادا سەرەکی دوورە، دۆرێن ١٥ دونەمێن ئەردێ چاندنێ ل گوندی هەنە. ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٦١ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٣٢].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ شمایلا.

**باشووری،** گوندێ بیکداودا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تروانش.

جارا دووێ گوند ل سالا ١٩٧٦ێ هاتییە خرابکرن و تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن.

ل ڤی گوندێ کەلایەکا کەڤنار کو جهێ میرێن بەرواریا بوو و شوینوارێن خانییان لێ هەنە، هەر وەسا جهێ گۆرستانەکێ ژی لێ هەیە. ژ بلی کو کانییەکا ئاڤێ و رووبارەك ل لایێ رۆژئاڤایی گوندی را دبووریت هەنە[٣٣].

## گوندێ بێشیلێ:

گوندێ بێشیلێ دکەڤیتە دناڤبەرا دو گەلیێن کوور ب ناڤێن (گەلیێ دێرا و گەلیێ بێشیلێ) دا، و گەلییەکێ بچویك ب ناڤێ گەلی کورتکی دناڤبەرا هەردواندا هەیە، گوند ب دووراتییا ٢٥کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و گوندەکێ پری ئاڤە، دو بۆچوون ل سەر ناڤێ وی هەنە، یا ئێکێ ژبەر گەلەك پێشی ل گوندی هەنە و یا دووێ کو بێش ل گوندی دهاتنە دان (ئانکو قووت ل پاییزان کۆمڤە دکر و بێش دکر)و گوند ب ڤێ چەندێ هاتییە ب ناڤکرن.

کەلا کوژینێ



ل دووڤ گۆتنا دانعەمران بەری پتر ژ ۲۰۰ سالان گوند هاتییە ئاڤاکرن و خەلك لێ ژیاینە، ژ زاردەڤێ ئوسمان مۆسای هاتییە ڤەگوهاستن، کو ژ دایکبوویێ دەستپێکا سەدسالیا بیستێ بوو، بابکێ وی یێ چوارێ ژی ل ڤی گوندی ژ دایکبوویە[٣٤].

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گیلکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بازێ.

**باکووری:** گوندێ میسکا و کانی مەزنێ.

**باشووری:** چیایێ مەتینا.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ حەفت بنەمالان پێکدهێت: بنەمالا عەلی (بنیات ژ بێتکار هاتینە)، بنەمالا محەمەدێ خەزالێ ( بنیات ژ بێدوهێ هاتینە)، بنەمالا مستەفای (بنیات ژ ئورمەداودا هاتینە)، بنەمالا محەمەدێ خەجێ، بنەمالا عیسای (بنیات ژ قەسرکێ هاتینە)، بنەمالا مستەفای (بنیات ژ کێستە هاتینە)، بنەمالا شینوی (بنیات ژ چەقەلا هاتینە)، ژمارا ئاکنجییێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٢ کەس ل گوندی دژیان[٣٥]، لێ نها دبنە ٩٥ خێزان[٣٦].

گوندێ بێشیلێ ل سالا ١٩٨٨ێ سەردەمێ ئەنفالا بەهدینان هاتییەکاڤلکرن و خەلکێ وی دەربەدەری ترکیا بووینە، سالا ١٩٩٢ێ جارەکادی ڤەگەریاینەڤە سەر گوندی، سالا ١٩٩٥ێ گوند ژلایێ سوپایێ تورکی ڤە هاتییەوێرانکرن و تا نها گوند نەهاتییە ئاڤاکرن.

## شوینوارێن گوندی:

گەلەك شوینوار ل گوندی هەنە مینا: کاڤلێ دێرا شوینوارەکێ کەڤنە ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا ۲کم، کاڤلا کەڤنە گوندەکە ل باشووری ب دووراتییا ۲کم، کوپێ قەسرێ ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ١,٥کم. ئاشەکێ گەلەك کەڤن ل گوندی هەیە، ئەو ژی دکەڤیتە ژێریێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ.

## شکەفتێن گەندی:

دیسان چەند شکەفت ژی ل گوندی هەنە، وەکی: شکەفتا پەزی و تیر و کڤانا و نێچیرڤانا ل ژێریێ گوندی ل زنجیرە چیایێ مەتینا و ۲کم ژ گوندی دوورە، هەروەسا شکەفتا حەیوانا کو شکەفتەکا مەزنە و جهێ ۱۰۰ مرۆڤان تێڤە هەیە و ل هنداڤی ڤێ شکەفتێ چەند ناووسك هەنە، دبیت هەتا نها کەس نە چووبیتە تێڤە، ئەوژی دکەڤیتە لایێ باشوورێ گوندی ب دووراتییا ۲کم. هەروەسان گەلەك شکەفتێن دی ژی هەنە وەکی: سیری، هەمزێ، بەرایێ، تلهێ بەرهەلا، سۆتەی، سەر تەحشلی، بن بیڤ، یان هندەك د بێژنێ بن دووڤ کو مینا دووڤەکی یێ پێڤە هەی و ل دووڤ گۆتنان کو دناڤبەرا ڤێ شکەفتێ و شکەفتا بابەکرا ل هنداڤی گوندێ بازێ ل چیایێ مەتینا یا خلۆلەیە!.

## گۆڕستانێن گوندی:

ل گوندی پێنج گۆڕستانێن مەزن هەنە، دو ژ وان تایبەت یێن زارۆکان بوون، ژ بلی سێ گۆڕستانێن شەهیدان (ل دووڤ گۆتنان شەهیدێن جیهادێ) و ئێك ژ وان مزگەفت ل سەر هاتبوو ئاڤاکرن کو ل ئەنفالان هاتییە خرابکرن[٣٧].

دیسان ل گوندی جهەکێ کەڤنار ب ناڤێ زەڤی سۆرا هەیە، جهێ گۆڕستانەکا کەڤنارە و دەمێ خەلکێ گوندی کێل و جۆتان لێ دکەن، جەرکێن پری هەستیێن مرۆڤان، یان پری ئاخ و خۆلی د ناڤدا دەردکەڤن.

## کانییێن گوندی:

هەمی کانییێن گوندی دکەڤنە ژووریێ گوندی، ژ چیایێ مەتینی دهێنە خوار و سویلاڤا گەلیێ بێشیلێ پێ دروست دکەت کو ئەڤ کانییەنە: کانییا گەلیێ دێرا، کانییا بچووك، کو هەردو یێن ل گەلیێ دێرا، کانییا گێرێ، کانییا زەڤیا گوڤێ، شیڤ مرێ، گەرا دەراڤی، ملا مەحمیدی، بن گێرکا، قرمیشك، ساما و گەلەکێن دی کو دکەڤنە گەلیێ بێشیلێ، ژ

بلی كانییا مەلا رەشید ل ناڤا گوندی.

ل سەر سیلاڤا بێشیلێ ل هەردو لایێن گەلی ڤیرەك دهێتە خوار، ل بەرێ زارۆكان مینا بەنیشتی د جوین و یا تام گاز بوو[٣٨].

بێشیلێ سرۆشتەكێ خۆش و سویلاڤێن جوان هەنە و جهەكێ گوزاری یە، ل گوندی گەلەك نێچیرڤان ژی هەبوون[٣٩].

## گوندێ بگداد:

گوندێ بگداد ب دووراتییا ٨كم دكەڤیتە لایێ رۆژهەلاتێ باشووری كانی ماسێ. ناڤێ گوندی (بگداد، بێگداد، بێگدادا، بیگدادا) د تۆمارێن ئوسمانیدا ب ناڤێ (بكداد، بێگداد، بێگداودا، بێگداودە) هاتییە تۆماركرن، د تۆمارێن عەرەبیدا ب ڤی رەنگی ( بك داد، بیگدادودە، بیكداودا، بیكداو داودا) هاتییە نڤیسین، ب شێوەیێ ئاسایی دبێژنێ بگداد. ئانكو رەنگە ناڤێ گوندی ژ (پیرداد) هات بیت، ژبەر كو مەزارێ (پیرداد) ل ناڤ گۆرستانا گوندی هەیە، بەلێ گوند بەری گۆرستانا دهێنە ئاڤاكرن، لێ نها ب زاركرنا (بگداد، بیگداد، بێگداد، بیگداودا) ب زاردكەن، وەك واتا: بگ، بێگ + داد) واتە بەگێ دادوەر، و رەنگە ژ (پیر+ داد) هاتبیت، واتە پیرێ دادكار، دادوەر، ئانكو شێخێ عادل ل كارە.

## سنوورێن گوندی:

رۆژهەلاتی: بەر بهاڤێ گوندێ گەلیكێیە، هەر ژ سەر دۆلێ بۆ كانی ئاڤكێ و ژووردا دهێتە سەر نزارا، رزدە و رزدە ژووردا دهێتە سەر ئاڤرێژەیا سرتا هنداڤ گولقابدێ و رووبارێ تروانش، ژ رووباری هەر (ژ گەرا مرارا و شیڤكا قولپی) و بۆ سرتا مامدەلا و ئاڤرێژەیا بەرۆژی هەتا بەری كەلێ دگەل سنوورێ تروانش دكێشیت، پاشی ژ كەلا بگداد - بیتەنورێ و گوندێ بێتەنورێ هەتا رووباری (بەرێ تومیا)، پاشی رووبار و رووبار دهێتە راستا كانی سماقكێ و بەرەڤ ئەڤراز بۆ شكەڤتا دلۆپێ و ئێخلێ چیایێ گانمێركی و قورنیێ گەرێ دچیت. پاشی سنوورێ شماهیلایە و سرتا گەرێ و ژنهەل دچیتە حەلانێن سەرێ گانمێركی و هەتا سەرێ جادێ و جادە بۆ باشووری (ئانكو رێكا پۆستەی). پاشی رێ و رێ هەتا ئاڤرێژەیا ناڤگركا و كانی فەرشكێ دبیتە سنوورێ گوندێ ئێكمالێ و مێركاجیا، پاشی ژ سرتیا كوناڤێ و سرتیا سەرێ تەحتا هێسێ و خارێ نۆكا و خول بن ناڤدەشتا ئامێدیا ددەت، ئەڤ سنوورە دناڤبەرا گوندێ بێگداد و گوندێ مێركاجیا و هێسێدایە، پاشی سنوورێ گوندی دیسا هەڤسنووری بەربهاڤێ تروانش دبیت، هەر ژ بن كانییا مەلە ئوسمانی بن ناڤدەشتێ بۆ چەلكێ رویتێ مرادخان و شكەفتا شەرەفا، ئانكو سرتیا سەرێ تەحتا بێگداد سرت و سرت هەتا ئێخلێ سەر دەربێ گای ژووردا دهێتە كانی ئاڤكێ و دادگەریتە سەر نزارا، و دیسا ژووردا دهێتە تییێ گولقوبادێ و رووباری.

## پێكهاتا گوندی:

گوند ژ هەفت بابكان پێكدهێت، ل سەر دەمێن كەڤنار گوندێ بگداد مالباتەك بوو، ژ بنیاتێ خۆ ژ كەلا بیگداد بێتەنورێ و كوژەینێ- كویزەنێ هەر ل دەڤەرا بەرواری بالا هاتینە و بەلاڤ بووینە، ئەو ژی: مالا ئومەری ئانكو مالا میر ئومەرێ شاگەلی ژ كەلا كوژەینێ و كەبگداد - بێتەنور بەلاڤ بووینە، بەر بهاڤێن كوژەینێ/ كوزەینێ، هەتا گویلكا و بێشیلێ و ئاسهێ و شێلازا، ئەڤ دەڤەرا سەردەرەجێ، میرێ ب گشتی بخۆڤە دگرت، ئەڤێن خۆجهـ تەڤ مرۆڤێن ئێكن و ژمالباتا میرێ نە. پاشی ژبەر سەرما و كێم ئاڤیێ (هشكە سالییان) پتریان ژوان، دەڤەر بەردان و بەلاڤ بوون، ئانكو: بۆ ناڤ بەرواریا و مزووریا و گۆران و سۆرچی و مووسل و ل باكوور و رۆژئاڤایێ كوردستانێ.. بەلاڤە بوون) ئەو مالا ل گوندێ بگداد ئاكنجی بووی، نها بوویە چوار بابك: بابكێ مالا ئومەرا - ئومەری، بابكێ مالا حەمێ، بابكێ مالا دحێ، و بابكێ مالا یاسین و ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٦ كەس ل گوندی دژیان[٤٠]، لێ ئەڤ بابكە نها نێزیكی ١٧٠ خیزانانە. (لێ ئەڤ بۆچوونا دەرگەهێ مۆزلدەرانێ ل سەر دەشتا كوژەینێ ل بەر

كەلا گوندێ كوژینێ دانایە، و هەر وەسا ناڤێ كەلا مەنجێ/ مەنیجا هەیە و ناڤێ گورگین و بیژەن ل سەر كەلا زیندانا گورگین و بیژەن ئەوا دكەڤیتە ل هنداڤ خرابەی هەیە؛ لێ ئەم نزانین ئەڤ توخمە ناڤە چاوە هاتینە ل سەر ئەڤان جهان). بابكێ مالا ئاغاكێ: ئەو ژ ی ٦٥ خیزانن، و ل دۆرێن سالێن ١٩٣٠ ل گوندێ دەشتان مشەختی گوندێ بیكداد بووینە. بابكێ مالا سەعید ١٢ خیزانن، بابكێ مالا مەحەمەدێ خدرێ ١١ خیزانن، بابكێ مالا مەلا عەبدلای ١٤ خیزانن، بابكێ مالا خلیفەی ١١ خیزانن، بابكێ مالا خانەمیر٧ خیزانن.

مالا ئالیخان ل گوندێ گەلیكێنە ٢٠ خیزانن، وەك گوند دخۆسەرن، لێ گەلەكێ نێزیكی گوندێ بگدادە. هەر چەندە گوندەكێ ب ئاڤ و دەراڤە، و جووەك و ٥ كانی یێن ئاڤا خۆش لێ هەنە، و سێ شكەفت هەنە: ئەو ژی شكەفتا دولێ، شكەفتە تیك، شكەفتە پیتكێ، ئانكو گوندێ بكداد ژ ٣١٠ خیزانا پێكدهێت.

گوند سالا ١٩٧٨ز ێ ژلایێ ئێراقێ ڤە هاتیە كاڤلكرن و خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها بێرسڤێ.

**شوینوارێن گوندی:**

گوندی هەشت جهێن شونواری هەنە، وەكێ: كەلا كویژەینێ (كوزەنێ)، كەلا بگداد - بێتەنورێ، ئاشكێ خراب، ئاشكێ ناڤ گوندی، شكەڤتا دەرشكەڤتێ، شكەڤتا ئیسترا.

**شكەفتێن گوندی:**

ل دۆرمانێن گوندی هەشت شكەفت هەنە، ئەو ژی؛ شكەڤتا ناڤرێ، شكەڤتا ئیسترا، شكەفتا عەلیكێ، شكەڤتا ئەحمەدێ غەزالێ، شكەڤتا ناڤدەری، شكەڤتا دەر شكەڤتێ، شكەفتا كوناڤێ.

**كانی و زێدەرێن ئاڤێ:**

دەست نڤیسەك ل دۆر مالباتێن گوندێ بیكداد


بسم الله الرحمن الرحيم
شجرة الصديقة في آغاوات
البرواريين لسنة غ ت ل
الهجرية كتب فق علي عمر علي من
أعالي الفقهاء [illegible]
من آغاوات وأمراء [illegible] وكل القرى
وكل من [illegible] النصف [illegible]
[illegible]

هەروەسان كانی و جووێن ئاڤێ ژی هەنە وەكی: كانیا بندرەجێ، كانیا بنبەری(بن سكری)، كانیا بلند (كانیا كورەماری)، كانیا خوكێ، كانیا مال ژنری، كانیا بنێ ملكێ (یا ئاشی)، كانیا بن گویزێ، كانیا بن توشەمبیێ، و كانی سماقوك. و رووبارەكێ جوان و پر گەر و سولاڤ ل بەر گوندیدا دبووریت، دو جووێن سەرەكی یێن ئاڤدانێ ل گوندی هەنە: ئەو ژی جووا زێندینان ٥.٥ كم، و گوندێ بگداد و تروانش مفای ژێ دبینن وەك دبێژن (رۆژەك و شەڤەك، دگەل دەراڤەكێ ئاڤێ و ئاڤا دو قولتەینان یێن بگدادیا بوون، هندە دەرامەت ددا كەراخێ بگدادیا. دو رۆژ و شەڤەك یێن تروانشیا بوون)، و جووا ژووری یاگوندی ب تنێیە ٣.٥ كم[٤١].

## گوندێ بێلیزانێ:

بێلیزانێ دكەڤیتە دناڤبەرا دو چیایێن بچووك دا ب دووراتییا ٣٠كم ل باشوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ، و ٧ كیلومەترا ژ جادا سەرەكی دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بازێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كانی بەلاڤێ.

**باكووری:** گوندێ هەترشێ.

**باشووری:** زنجیرا چیایێ مەتینا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ڤان بنەمالان پێكدهێت: بنەمالا سەیدا، بنەمالا محەمەدێ میسێ، بنەمالا بریفكا، بنەمالا سلێمانێ قادری، بنەمالا شێخ كیڤی، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٩ كەس بوون[٤٢] و نها دبنە نێزیكی ١٥٠ خێزانان و چ خێزان ل سەر گوندی ناژین.

گوند ل سالا ١٩٨٨ێ هاتییە سۆتن و خەلكێ

گوندێ بێلیزانێ



وێ دەربەدەری ترکیا بووینە، سالا ١٩٩٢ێ جارەکادی گوند ل جهێ بەرێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، بەلێ ژ ئەنجامێ سەروبەرێ ناڤخۆیی ل دەڤەرێ جارەکادی گوند هاتییە بەردان.

## شوینوارێن گوندی:

گوندی وەسا دیاردکەن کو چوار دوورگەهـ ل گوندی هەنە، جهێ سارکا هەڤدە عومەرا، ل باشوورێ رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ، دبێژن دوورگەهـ ژ دو ژووران ب تنێ پێکدهێن و دیوارێن وێ نها ژی د دیارن و ٧م یا فرەهە و ٣م یا بلندە، هەروەسا دوو (ناووسك) ل ژوورێ گوندی ل ئاستەنگا گوندی ژ لایێ باکووری ڤە ب دووراتییا ٥٠٠ م هەنە، دەرێ ئێکێ ژوان یێ تەنگە و د هەر ناووسکەکێدا جهێ شەش مرۆڤان تێڤە هەیە و وەکی تەختەکی ل کەڤری هاتییە کولان. هەروەسا ل گوندی دوورگەهـ ەکا دی هەیە دبێژنێ زەڤیکێن جهی ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ١٤٠٠م. دوورگەهـ ا زەڤیکا نازێ ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ١٦٠٠م، دوورگەهـ ا خێریزا دکەڤیتە رۆژهەلاتی ب دووراتییا ٢کم، زۆربەیا لایێن وان دوورگەهـ ا خراب بووینە و ژناڤ چووینە.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

گوندێ بێلیزانێ گوندەکێ ئاڤی یە، کۆمەکا کانییان لێ هەنە و هەمی نێزیکی گوندینە، ژوانان:

کانییا میر سەلێ ل ناڤ گوندی، و سێ کانیێن دی ل ژێرێ گوندی، ئەو ژی: کانی رەشێ ب دووراتییا ٤٠٠م، کانییا سنی ب دووراتییا ٤٥٠م، کانی هشکێ ب دووراتییا ١٥٠٠ م، رووبارەکێ ئاڤێ ژی ل رۆژهەلاتێ گوندی هەیە دبێژنێ رووبارێ گوندی و ٦کم یێ درێژە و دچیتە سەر رووبارێ نێنیکی.

## شکەفتێن گوندی:

ل گوندی چەند شکەفت ژی هەنە وەکی: شکەفتا گەلیێ خاری ل گەلیێ خارێ ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا ٥٠٠م، شکەفتا گەلی هشکی کو شکەفتەکا فرەهە ل باشوورێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ[٤٣].

## گوندێ تروانش:

گوندێ تروانش ب دووراتییا ٨کم دکەڤیتە لایێ باشوورێ رۆژهەلاتێ کانی ماسێ.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن مەلختە و سەردەشتێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن بیگداودا و گەلیکی.

**باکووری:** گوندێ بەربیرێ و گوندێ سەرزێری.

**باشووری:** دەڤەرا نهێلیا و چیایێ مەتینایە.

دووڤ گۆتنێن خەلکێ گوندی کو وان ژی ژ بابکالان بهیستییە، دیرۆکا ئاڤا بوونا گوندی ڤەدگەریت بۆ سالا (١٦٥٠)ێ، ل سالا ١٩٧٨ێ گوند هاتییە سۆتن و خەلکێ وێ بۆ کۆمەلگەهان هاتینە ڤەگوهاستن، ل ناڤەراستا سالێن هەشتیان گوند هاتەڤە ئاڤاکرن، لێ ل سالا ١٩٨٨ێ هاتە خرابکرن و خەلکێ وێ ئاوارەی ترکیا بوون، سالا (١٩٩٢-١٩٩٣)ێ گوند هاتە ڤە ئاڤاکرن، لێ جارەکادی ژبەر تۆپخانە و فرۆکەیێن تورکی هاتەکاڤلکرن، سالا ٢٠٠١-٢٠٠٢ێ کۆمەلگەهەك لێ هاتەئاڤاکرن و پێکهاتی بوو ژ (٢٠٠) خانییان.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ گەلەك بنەمالان پێکدهێت وەکی: بنەمالا حەمێ، چەلێ، پیرۆزیا، کوچایا، قەسرێ، شێخوی، محەمەد سەلیمێ کەریم، گێمانیا، تەمەرا، ئالی، ئیسڤێ مەلای، محەمەدێ میرزای، جنێ، ئەحمەدێ سوفی، وەیسێ بەسێ، وەسێ نادر، هاریا، دەشتانیا، فەقەی، بێتروتیا، قەیبلەهدا، خندارا، تۆڤیا، گوندەکیا، مەلای، محەمەدێ خەموی، ئوسێ، سەیدا. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٨٥ کەس بوون[٤٤] و نها ژ نێزیکی ١٤٥٠ سەرۆك خێزانا پێکدهێت، کو پتریا وان ل دهۆك و زاخۆ دژین.

### شوینوارێن گوندی:

ل گوندی چەند جهێن شوینواری هەنە، وەكی: گركێ ملێ دێرێ و سەركەڤرێ گوندی و پشت كوكەلی و كورا كنیشتێ و سەر چەپەرا و بەرێ گورخانێ، هەروەسا ل گوندی مەزارێن وەكی، شێخێ بێتار و مەزارێ تاخی و مەزارێ شێخ سلێمان و مەزارێ بەریریا و مەزارێ بێمسكین و مەزارێ مەلە حەسەن هەنە.

ل گوندی ئاشێن ئاڤێ ژی هەبوون، وەكی: ئاشێ مالا رەسیل و ئاشێ مالا حەمێ و ئاشێ مالا وەیسێ و ئاشێ ئەحمەدێ فیتەر و سلێمانێ حەسەنی.

### شكەفتێن گوندی:

هەر وەسان چەند شكەفت ل دەوروبەرێن گوندی هەنە، مینا شكەفتێن: گەرمافكێ، شكەفتا باریشوی، شكەفتا دوو دەر، شكەفتا كون دولابكێ، شكەفتا كەزانێ و خارێ كویر، شكەفتا گهورا شاركێ، شكەفتا شكێرێ ئیسڤاركێ، شكەفتا زێرەڤانی، شكەفتا شیڤا ب تۆلك.

### كانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

كانیێن گوندی پتریا وان دكەڤنە دەوروبەرێن گوندی، وەكی: كانیا دەرشكەفتا، كانیا گوندی، كانیا سنجوی، كانیا مام سینكێ، كانیا عەلوی، كانیا بەر شێخێ بیتار، كانیا كورا چەلكێ، كانیا جوبارا، كانیا گەرا پلكا، كانیا هندویی، كانیا گوهیشكێ، كانی كەوك، كانیا ئوسمان، كانیا سیر، كانیا گول قبادێ، كانیا بەستێ، پیر مرادا، كانیا جندی و پشت حێسیلەی و كانی گەرمافكێ.

دیسان چەند كانی ل ناڤ زۆمێن گوندی ب دووراتیا (١٢كم) ل ژووریێ گوندی ل بن چیایێ مەتینا هەنە، مینا: كانیا بێمسكینو، كانی لوخ، كانیا مەزن، كانی مەدڤند، كانی سێفك، كانی هەڤرست، كانی درێژ، كانی گەزنگ، كانی بوتك، كانی بوك، كانیا مەلە ئوسمانی.

رووبارەكێ ئاڤێ ژی دناڤ گوندیرا دبووریت و گوندی دكەتە دوو تاخ، تاخێ نزاری و تاخێ بەرۆژی و ل سەر رووباری دوو پر هەبوون، ب ناڤێ پرا ناڤ گوندی و پرا بەر شێخێ بیتار.

بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩١٥ێ مزگەفت ل گوندی هاتیە ئاڤاكرن، خواندنگەهـ ژی بۆ یەكەمین جار ل رۆژا ١٩٥١/٢/١٧ێ ل سەر دەستێ شێخ مەزهەر مایی ل ڤی گوندی هاتیە ڤەكرن و ب هاریكاریا گوندیا ب شێوەیێ زیارە هاتیە ئاڤاكرن، ل دەسپێكێ خواندنگەهـ یا دەستپێكی بوو، ئانكو ژ پۆلا (١-٤) بوو، ئاڤاهیێ خواندنگەهێ ژ لایێ خەلكێ گوندی ڤە هاتبوو ئاڤاكرن، ل سالا ئێكێ ژ تەمەنێ خواندنگەهێ ٣٨ خویندكار هاتبوونە وەرگرتن[٤٥].

## گوندێ تشیشێ:

گوندەكێ خۆشێ مەسیحینشینە ب دووراتیا ١٨كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ. گوندی وەسا ددەنە خویاكرن كو ناڤێ گوندی ژ سەركردەیەكێ یونانی، دەمێ لەشكەرێ وان هاتیە دەڤەرێ ب ناڤێ تشیش هاتیە و بۆ ماوەیەكێ زۆر مایە ل گوندی.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دەرگەلا سەیدا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن قومریێ و گركا.

**باكووری:** چیایێ بادوكێ.

**باشووری:** گوندێ خشخاشا.

### پێكهاتا گوندی:

تشیشێ ژ پێنج ئیجاخان پێكدهێت، چوار ژ وان بێ ژ ناڤ تیاریا هاتین ئەو ژی: ئیجاخا تیاری، ئیجاخا دەنوی، ئیجاخا چەوێ، ئیجاخا رەشوی، ئیجاخا خایێ ژی خۆ جهێن كەڤنن، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٦٣ كەس بوون[٤٦]، لێ نها خێزانێن گوندی نێزیكی ١٤٤ خێزانانە، پتریا وان ل دەرڤەی وەلاتی دژین و یێن دی ل دهۆك و (١٢) مال ژی ل گوندی دژین.

ساڵا ١٩٨٨ێ گوند کەفتە بەر هەوا ئەنفالان و خەلکێ گوندی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گرک سندی. پاشی قەستا دهۆکێ کرن، ساڵا ١٩٩٢ێ خەلکێ گوندی زڤرینە سەر گوندی ڤە.

گوندێ تشیشێ ئێکە ژ گوندێن ئاڤی و ئاڤارەکێ زۆر هەیە، ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا داروباری یە، ب تایبەتی چاندنا سێڤا و هنارا و جۆرێن فێقی، بەرێ دەرامەتێن دی ژی د چاندن، گوندی ساڵانە دو شانەدێر دگێران، یا ئێکێ ل سێ شەمبیا ئێکێ ژ هەیڤا گولانێ و یا دووێ ل ١٥ هەیڤا تیرمەهێ.

ل تشیشێ سێ ئاشێن ئاڤێ هەبوون، پتریا خەلکێ دەڤەرێ ب هیڤیا ڤان ئاشان ڤەبوون کو گەنم و جەهـ و گەنمۆك لێ دهێران و ئاشەك ژ وان یێ تایبەت بوو بۆ تەحینێ.

### کانی و شکەفتێن گوندی:

کانی و شکەفت ژی ل گوندی هەنە، مینا: کانیا ئاشی و کانیا نیسانکێ.

هەر وەسان شکەفتا دەشت خەبەر و شکەفتا نوهالێ ب دووراتیا دۆرێن ٢کم ل ژوورێ گوندی[٤٧].

## گوندێ تیشەمبیکێ:

گوندەکێ موسلمان و مەسیحینشینە دکەڤیتە دووراتیا ٢٠کم باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ، گوندی وەسا ددەنە خویاکرن کو ناڤێ گوندی ژ هەبوونا گەلەك دارێن تیشەمبیا هاتیە کو گەلەك لێ هەبوون، و دۆرێن ١٠٠ دونەمێن ئەردێ ئاڤی هەنە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** گوندێ میسکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن کانی مەزنێ و چەمسەیدا.

**باکووری،** گوندێ جمبلکێ و رووبارێ نێنیکی، کو دبەر گوندیرا دبووریت.

**باشووری،** چیایێ مەتینا و گوندێ بێشیلێ.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل ساڵا ١٩٦١ێ هاتییە سۆتن، پشتی چەند ساڵەکێن کێم گوند هاتییە ئاڤاکرن و جارا دووێ کەتە بەر هەوا ئەنفالان، خەلکێ گوندی دەربەدەری ترکیا بوون، ساڵا ١٩٩٢ێ خەلکێ گوندی گوند ئاڤاکرنەڤە، ساڵا ١٩٩٦ێ و ژبەر کاودانێ ناڤخۆ گوند هاتە بەردان ڤە، ساڵا ١٩٩٨ێ چەند خانییەکێن کێم ل گوندی هاتنە ئاڤاکرن.

خەلکێ گوندی ژ ١١ بنەماڵێن موسلمان و مەسیحییان پێکدهێت، ژمارا وان ل دووڤ ئامارا ساڵا (١٩٥٧)ێ ٤٥ کەس بوون[٤٨] و نها نێزیکی ١٥٠ خێزانانە، ١٥ خێزان ل گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و بەغدا و دەرڤەی وەلاتی دژین.

ب تنێ ئێك کانیا ئاڤێ ل باکوورێ گوندی ب دووراتیا ١٥٠م هەیە. هەروەسان شکەفتێن گرێ بەرجووێ ل ژێرێ گوندی ب دووراتیا ٢٠٠م هەنە.

## گوندێ جدیدکێ:

جدیدکێ ب دووراتیا ١٨کم دکەڤیتە لایێ رۆژئاڤایێ ناحیا کانی ماسێ و مەسیحی و موسلمان ب هەڤرا تێدا دژین، ناڤێ گوندی ژ چنین یان جنیکان هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئەلکیشکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن خشخاشا و چەمسەیدا.

**باکووری،** گوندێ بێقولکێ.

**باشووری،** گوندێ سەفەریا.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ چوار بنەماڵان پێکدهێت، سێ یێن مەسیحییانە: بنەماڵا بێ مەندو، بەچوو، بێ کەڤرا و ئێك ب ناڤێ ماڵا نەعمان بەگێ یا موسلمانانە، ل دووڤ ئامارا ساڵا (١٩٥٧)ێ ٦١ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٩] و نها ژمارا خەلکێ گوندی نێزیکی ٧٠ خێزانانە، ٣٠ ژ وان ل سەرگوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەڤەرێن جودا دژین.

گوند ل ساڵا ١٩٨٨ێ هاتییەخرابکرن، خەلکێ

وی ئاوارەی دەڤەرێن جودا بووینە، سالا ١٩٩١ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٩٥ێ جارەکادی گوند هاتە بەردان و سالا ١٩٩٧ێ گوند هاتەڤە ئاڤاکرن.

ژیانا خەلکێ گوندی سەر چاندنێ یە، ئاڤ ژی بۆ وان ژ گەلیێ دەرگەلێ دهێت و ب تنێ ئاشەکێ کەڤن لێ هەیە، دیسان دارتوویەکا کەڤن ل گوندی هەیە ژیێ وێ دگەهیتە ٢٥٠ سالان[٥٠].

## گوندێ خانکێ:

خانکێ دکەڤیتە دووراتییا ٩کم ژ جادا سەرەکی و ٢٠کم ژ باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ل سەر ناڤێ گوندی ژی گوندی وەسا خویا دکەن کو گەلەک حەلان (بەرێ حەلانی) لێ هەنە و نان ل سەر وان حەلانان کو مینا خانکێن داری نە چێدکرن و بوویە خانکێ. بۆچوونەکا دی هەیە دبێژن گەلەک شکەفت هەنە و خەلکێ گوندی دەوار دکرنە د وان شکەفتان ڤە و جهێ ڤەحەواندنا گیانەوەران خانن، ئانکو خانا دەواران، و ل دووڤ گۆتنا بابکالان دبێژن: دەستپێکا پەیدابوونا خانکێن نانی ژ ڤی گوندی دەستپێکریە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئاسهێ.

**باشووری:** گوندێ بناڤیکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن شێلازا و مەگلانا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن دەرگەلا مۆسا بەگێ و زەکەریا.

ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥١] و نها گوند ژ ١٥٠ خێزانان پێک دهێت، ٣٥ خێزان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دهۆک و زاخۆ و هندەک دەڤەرێن دیتر. سێ جارا گوند هاتییە سۆتن، جارا ئێکێ ل سالا ١٩٦٣ێ و جارا دووێ ل سالا ١٩٨٨ێ ل هەوا ئەنفالان، و خەلکێ گوندی ئاوارەی ترکیا بووینە، سالا ١٩٩٢ ێ جارەکادی خەلکێ گوندی ڤەگەریاینە کوردستانێ و ل هەمان سال گوند ئاڤاکرییە، جارا داویێ گوند ل سالا ١٩٩٥ ێ هاتییە خرابکرن و کاڤلکرن و جارەکادی هاتییەڤە ئاڤاکرن.

### شکەفتێن گوندی:

ل باکوورێ گوندی چوار شکەفت ب دووراتییا دناڤبەرا ٢ تا ٣ کم هەنە، ئەو ژی شکەفتێن خانێ و شکەفتا کونکێنتکێ و شکەفتا بەرایێ و شکەفتا کەرانە.

### کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

کۆمەکا کانییان ژی هەنە دکەڤنە دووراتییا (١ - ١,٥کم) ل دەوروبەرێن گوندی وەکی: کانییا گوندی و کانییا گەزێ و کانییا گوهیشکا مەخەلێ و کانییا شورتانا ئێکێ و شورتانا دووێ و کانییا گەرا کورا. دیسان رووبارەکێ وەرزی ب ناڤێ گوندی ژی ل زڤستانێ دناڤ گوندیرا دەرباز دبیت.

### شیڤک و گرکێن گوندی:

کۆمەکا شیڤک و نهالان ل هەر چار لایێن گوندی هەنە، وەکی: شیڤکا خانێ و نهالا کویر و سیرهێ و جاترێ و کانییا ماڤەکا.

هەر وەسان گرکێن: رەحیمایێ و عەمەرکا و مەحمیدکێ ل ژێریێ گوندی، ملا هندیا و ملا قەسرکێ ل ژووریێ گوندی. گرێ جوخینکێ و سۆتیا و ملابانێ و کون کتکێ ل رۆژهەلاتی گوندی هەنە[٥٢].

## گوندێ خرابەی:

خرابەی ب دووراتییا ١٥کم دکەڤیتە باشوورێ کانی ماسێ، دو بۆچوون بۆ ناڤێ گوندی هەنە. یا ئێکێ: هەر دەمێ ئاڤاهییەک د گوندیدا هاتبا ئاڤاکرن، دیوارێن وان د شکەستن و خراب دبوون. یا دووێ: ژی ب واتایا (خر + ئاب)، واتە (خر ئاڤ) کو ژ (اب) یا فارسی هاتییە وەرگرتن و بوویە خرابە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هیسێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شێلازا.

**باکووری:** سەرێ کلۆخەی و چیایێ مەتینا.

**باشووری:** گوندێ ئێکمالێ.

گوند ژ ئێك بنەمال پێکهاتییە، ئەو ژی بنەمالا سادقی یە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٣] و نها ژمارا وان دبنە ٦٠ خێزان.

دیرۆکا ئاڤابوونا گوندی ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی کو وان ژی ژ بابکالێن خۆ بهیستییە ڤەدگەریت بۆ بەری نێزیکی سێ سەد سالان و د بنیاتدا ژ گوندێ بێدوهێ هاتینە.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩٦١ێ هاتییەسۆتن، بۆ جارا دووێ ل سالا ١٩٨٨ێ و خەلکێ وی ئاوارەی ترکیا بووینە، پشتی ڤەگەریانێ و ژبەر نالەباریا رەوشا ژیانێ گوند نەهاتییە ئاڤاکرن، ب تنێ ل هاڤینان هندەك بۆ کارێن چاندنێ دچنە گوندی.

## کانیێن گوندی:

چەند کانی ل گوندی هەنە، وەکی: کانیا مەحمیدۆکی، کانیا گوندی و سەرقومبەلێ، کانیا زبوی، کانیا مێرگا بیکێ، کانیا گیسکا، کانیا گاڤانا، کانیا هەڤرستکێ و بەستێ، کانیا کورە ماری، کانیا مێرگا رەزی، کانیا پینکێ، کانیا وارێ جەرگیس (کو زۆزانا گوندی بوو)، کانیا واری (زۆزانا گوندیان بوو) و دکەڤیتە سەرێ چیایێ مەتینا ل باشوورێ گوندی.

## شکەفتێن گوندی:

دیسان چەند شکەفت ژی هەنە، وەکی: هاجستا ب دووراتییا ٤کم ژ باشوورێ گوندی و شکەفتا کون ڤاقیژکێ ل لایێ باکووری[٥٤].

## گوندێ خشخاشا:

خشخاشا ب دووراتییا ١٨کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ناڤێ گوندی ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی دبێژن ل بەرێ گۆلەکا ئاڤی لێ هەبوو، دەمێ بای لێدا خشخش ژێ دهات و ناڤ بوو خشخشا.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بێڤولکێ و جدیدکێ.

**رۆژئاڤایی** گوندێ گرکایە.

**باکووری:** گوندێ تشیشێ.

**باشووری:** گوندێن چەم سەیدا و هەترشێ.

## خێزانێن گوندی:

گوندێ خشخاشا ژ (٦) بنەمالان پێکدهێت: بنەمالا حسەینی، بنەمالا جاسمی، بنەمالا ژووری، بنەمالا حەمێ، بنەمالا ئیبراهیمی، بنەمالا رەحیمایێ، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٣ کەس ببوون[٥٥]، لێ نها دبنە (١٢١) خێزان و ل گوندی و باژێرێن دهۆك و زاخۆ دژین.

سالا ١٩٦٦ێ گوند هاتەبۆمبەبارانکرن و ل سالا ١٩٨٧ێ گوند کەفتە بەر لێمشتا عیراقێ و کاڤلکرنێ، ل هەوا ئەنفالان جارەکا دی گوندی دەربەدەربوون و ئاوارەی ترکیا بوون، پشتی سەرهلدانێ خەلکێ گوندی ڤەگەریانەڤە و ل سالا ١٩٩٢ێ گوند هاتە ئاڤاکرن ڤە و کانیێن گوندی:

چەند کانی ل گوندی هەنە، وەکی: کانیا بالاڤا، کانیا سارارا، کانیا کوندی، کانیا گهیشکێ، کانیا بەرێ حەلانی، کانیا شەرا.

نها پرۆژەیێ ئاڤێ و جادە و هێلا کارەبێ ل گوندی هەنە و ل سالا ١٩٩٤ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن.

هەژی ئاماژێ یە کو هۆزانڤان ئەحمەدێ نالبەند گەلەك ژیانا خۆ ل ڤی گوندی بووراندییە و ل ڤی گوندی داوی ب ژیانا خۆ هینایە و خۆ کوشتییە، نها مەزارێ وی ل ڤی گوندی هاتییە چێکرن[٥٦].

## گوندێ دەرگەلا سەیدا:

دەرگەلا سەیدا دکەڤیتە د گەلیەکی دا، هەرسێ رەخێن وی چیانە، ب دووراتییا ٢٠کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و خۆجهێن گوندی (سەیدن)، ل ڤی گوندی خۆجە بووینە. نها پرۆژەیێ ئاڤێ و جادە بۆ

هاتینە دروستكرن و خواندنگەهـ ژی ل سالا ۲۰۰۰ێ لێ هاتییە ڤەكرن، سالا ۲۰۱۱ێ هێلا كارەبێ ژی بۆ گوندی هاتییە راكێشان.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئەلكیشكێ.

**رۆژئاڤی:** گوندێ تشیشێ.

**باكووری:** گوندی ئەدنێ.

**باشووری:** گوندێ بێقولكێ.

خەلكێ گوندی هەمی ئێك بنەمالن و دبنە ۲۰۰ خێزان، ۴۵ ژ وان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ.

سالا ۱۹۷۹ێ گوند هاتە كاڤلكرن و خەلكێ وی ل كۆمەلگەها بێرسڤێ خۆجهكرن، و هندەك ژ وان ل گوندێن دەڤەرا بەرواری بالا خۆجە بوون. پشتی چەند سالەكێن كێم گوند هاتەڤە ئاڤاكرن، لێ ل سالا ۱۹۸۸ ێ گوند هاتەسۆتن و خەلكێ گوندی دەربەردەری تركیا بوون. سالا ۱۹۹۲ێ ڤەگەریانە سەر گوندی و گوند هەر ل جهێ كەڤن ئاڤاكرن.

**شوینوارێن گوندی:**

هندەك ناووسك و دوورگەهـ و ئاشەكێ ئاڤێ یێ كەڤن ل گوندی هەنە، كو دكەڤنە لایێ رۆژهەلات و باكوورێ گوندی، هەروەسا ل لایێ باكوورێ رۆژهەلاتێ گوندی جۆیەكا ئاڤێ ل كەڤری هاتییە كۆلان و ئاڤ بۆ لایێ باشووری هاتییە راكێشان، ب گۆتنا خەلكێ گوندی كو وان ژ بابكالان بهیستییە دیرۆكا چێكرنا وێ جۆكێ بۆ بەری ٤٠٠ سالان ڤەدگەریت[٥٧].

## گوندێ دەرگەلا مۆسا (میسا) بەگ:

گوندەكێ كەڤنارە ب دووراتییا ۲۰كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ دەرێ گەلی هاتییە كو گەلییەك دكەڤیتە لایێ باشوورێ

گوندێ دەرگەلا سەیدا



گوندی و مۆسا بەگ و هەر شەش برایێن خو لێ دژیان، مۆسا بەگ ژ هەمیان ب ناڤ و دەنگتر بوو و كاروبارێن گوندی ب رێڤەدبرن، لەوما ب ناڤێ وی هاتیە ناڤكرن، مۆسا بەگێ دناڤبەرا سالێن (١٩٢٠-١٩٢٢)ێ وەغەر كریە.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی،** گوندێن قەسركێ و ئاسهێ و خانكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن میسكا و جمبلكێ.

**باكووری،** گوندێن ئەلكیشكێ و باتیفا سەیدانە.

**باشووری،** گوندێن كیلكا و بێشیلێ نە.

بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٦٣ێ ژلایێ حوكمەتا عێراقێ ڤە ب فرۆكەیان هاتیە بومبەبارانكرن و گوندیا گوند بجهـ هێلان، پشتی سالا ١٩٦٤ێ جارەكا دی گوند هاتەئاڤاكرن و خەلكێ گوندی زڤرینە سەر گوندی، ل هەوا ئەنفالان سالا ١٩٨٨ێ جارەكا دی گوند هاتەوێرانكرن و خەلكێ وی ئاوارەی تركیا بوون. پشتی سەرهلدانێ خەلكێ گوندی ڤەگەریانە وارێ خۆ و ئاڤاكرن، سالا ٢٠٠٢ێ گوند كەفتە بەر هێرشێن سوپایێ توركی و بۆ ماوێ سالەكێ گوند هاتەچۆلكرن، سالا ٢٠٠٤ێ جارەكادی گوند هاتە ئاڤاكرن.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ بنەمالێن: بنەمالا مۆسا بەگێ، بنەمالا ئەحیا بەگێ، بنەمالا فەتەح بەگێ، بنەمالا حەفزولا بەگێ، بنەمالا سەلیم بەگێ، بنەمالا عەمەر بەگێ، بنەمالا میر محەمەدی، بنەمالا محەمەد سەلیمی، بنەمالا نوری بەگێ پێكدهێت، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٧٥ كەس بوون[٥٨]، نەها نێزیكی (١٠٥) سەرۆك خێزانانە، (٢٠) خێزان ل گوندی و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

**شوینوارێن گوندی:**

دو شوینوارێن كەڤنار ل گوندی هەنە و گوند پێ دهێتە نیاسین، ئەو ژی: یێ ئێكێ دو ئاشێن ئاڤێ نە و یێ دووێ جوویەكا ئاڤێ ل باكوورێ گەلیێ دەرگەلێ كو دكەڤریدا هاتیە كۆلان.

**شكەفتێن گوندی:**

ژ شكەفتێن گوندی ژی: شكەفتا مەلایی، شكەفتا شڤانا ل باكوورێ گوندی.

**كانیێن گوندی:**

كانیا گەلیێ هەسپا كو كانیا سەرەكیا گوندی یە و ئاڤارێ گوندی ل بەر دهێتە ئاڤدان، كانیا گوندی، كانیا دێردزكێ ل ژێریێ گوندی ب دووراتیا (٤-٥)كم.

گوند ب دارێ سێڤێ یێ ب ناڤ و دەنگە و دۆرێن (١٠) هزار بنێن سێڤا لێ هەنە، نها پرۆژەیێ ئاڤێ و كارەبێ و مزگەفت جادە ل گوندی هاتینە چێكرن.[٥٩]

## گوندێ دۆرێ:

گوندەكێ مەسیحییانە دكەڤیتە سەر رێیا سەرەكی ب دووراتیا ٦كم ل لایێ رۆژهەلاتێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ب زمانێ سریانی ب واتایا (دۆرە) ئانكو (چەپ - لۆفە) ب كار دهێت. د زمانێ كوردی ب واتایا دو رێك دهێت، ل سەر دەمێن كەڤن دو رێك دهاتنە گوندی، ئێك ژ رۆژهەلاتی و ئێك ژ رۆژئاڤایی، لەورا ب ڤی ناڤی هاتیەناڤكرن. ل گوندی چەند پرۆژە هەنە، وەكی: پرۆژەیێ ئاڤێ و دێر بۆ گوندی هاتیە دروستكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا ٢٠٠٩ ێ بۆ هاتیە راكێشان و خواندنگەهـ ژی پشتی گوند هاتیە ئاڤاكرن ل سالا ٢٠٠٤ بۆ هاتیە ڤەكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی،** گوندێن هەلوە و تروانش و بەریێ و سەر زێرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێدە و ناڤەندا ناحیێ.

**باكووری،** هەڤ سنوورە دگەل گوندێن باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری،** گوندێن ئیباتێ و شمایلا.

## پێكهاتا گوندی:

گوند پێكهاتییە ژ ڤان بنەمالان: بنەمالا گەلی، بنەمالا زەرنیا، بنەمالا شووێ، بنەمالا مەكو، بنەمالا چیلكا، بنەمالا تیاری، هندەك بنەمال ب ئێكجاری نەماینە. خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٦ كەس بوون[٦٠] و نها خەلكێ گوندی ژ ٦٥٠ خێزانان پێكدهێن. دۆرێن ١٥ خێزانان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

دۆرێ گوندەكێ گەلەك كەڤنارە، شوینوارناسان دیاركرییە كو دیرۆكا ئاڤاكرنا دێرا مار گێوەرگیس ڤەدگەریتە بەری ١٤٥٠ی سالان، هەروەسا دێرا مار قیوما ل باكوورێ گوندی ب دووراتییا ٨٠٠م هەیە، ئاڤاكرنا وێ د زڤریتەڤە سەدسالییا چوارێ – پێنجی زایینێ، ئەڤ دێرە دناڤبەرا ١٦٠٢ هەتا نیڤا سەدسالییا بیستێ بنگەهێ ئوسقفێ نەستووریێن خۆجهی بوو ل دەڤەرێ. دێر د كەڤریدا هاتییە كۆلان، گوند ل سالا ١٩١٤ێ هاتییە سۆتن و خەلكێ گوندی دەربەدەر بووینە، بۆ جارا دووێ ل سالا ١٩٧٨ێ ژ لایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتییە كاڤلكرن و خەلكێ وێ ئاوارەی بازێرێن جودا یێن عیراقێ بووینە، سالا ١٩٩٢ێ گوند ل جهێ كەڤن هاتییە ئاڤاكرن.

## شوینوارێن گوندی:

چەند شوینوار ل گوندی هەنە، مینا: كەلا دۆرێ ب دووراتییا ٥٠٠م ل رۆژهەلاتێ گوندی، نێزیكی ١كم یا بلندە و دیرۆكا كەلێ دزڤریتە بەری ٢ هزار سالا، ل گوندی كارێ ئاسنگەریێ دهاتە كرن و گەلەك جهێن دەرخستنا ئاسنی ل گوندی ل جهێ دبێژنێ سەر گیزان ل ژووریێ گوندی هەنە.

## شكەفتێن گوندی:

چەند شكەفت ل ژووریێ گوندی هەنە، وەكی: شكەفتا بارزانی ب دووراتییا كیلومەترەكێ، شكەفتا ئاڤێ ب دووراتییا ٤كم، شكەفتە رەشێ ب دووراتییا ٢كم.

گوندێ دۆرێ



## کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

ئاڤا گوندی هەمی ژ کانییێن سەر گیزا دهێن کو دکەڤنە باکوورێ گوندی ب دووراتییا ٤ کم، کانییا هومێ دکەڤیتە لایێ باکووری ب دووراتییا ٣کم، کانییا سیلاڤا زاجێ ٤کم ژ گوندی دووره و ژ ڤێ کانیێ زاج دەردکەڤیت و جلکان پێ بویاغ دکەن.

ل گوندی جەبار و ستران بێژ ژی هەبوون.

ل دووڤ گۆتنا سەعدو ئەسنیە شلیمون، یەکەم شەهیدێ شۆڕشا ئیلونێ (ئەسنیە شلیمون)ە کو ل شەڤا ٩-١٩٦١/٩/١٠ شەهید بوویە، ئەڤ ل رۆژناما (التاخی) ل هاڤینا سالا ١٩٧٢ێ بەلاڤکرییە، هەروەسا مارگرێت جۆرج ئێکەمین ژن بوویە د شۆڕشا ئیلونێ دا چەکێ پێشمەرگاتیێ هەلگرتی و خزمەتا شۆڕشێ کری ئەو ژی ژڤی گوندی بوویە[11].

## گوندێ دێریشکا فەلا:

ب دووراتییا ٣کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ، لێ نها کەتییە د ناڤ سنوورێ باژێرڤانییا کانی ماسێ دا، ناڤێ گوندی ژ هەبوونا حەفت دێران کو ل بەرێ هەبوون هاتییە، دیرۆکا ئاڤابوونا گوندی بۆ بەری ٣٥٠ سالان ڤەدگەڕیت.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دێریشکا ئیسلام و ناحیا کانی ماسێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن مایێ نەسارا و مایێ ئیسلام.

**باکووری:** هەڤ سنووره دگەل باکوورێ کوردستانێ.

**باشووری:** گوندێن هێسێ و مێرکاجیا و ئێکمالێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن: بنەمالا هاجی، بنەمالا جە نیشە، بنەمالا سەفەرکێ، بنەمالا ئەودیشکێ پێکدهێت. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٦٧ کەس بوون[12] و نها نێزیکی ٤٠٠ خێزانانە، زۆربەیا وان ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

گوند بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩١٥ێ هاتییە سۆتن، پشتی دەمەکێ کێم هاتییەڤەئاڤاکرن، جارا دووێ ل سالا ١٩٨٧ێ هاتەخرابکرن و خەلکێ وی دەربەدەری دەڤەرێن جودایێن عێراقێ بوون، سالا ١٩٩٢ێ گوند هاتە ئاڤاکرن، نها دۆرێن ٤٠ خێزانان ل سەرگوندی دژین.

ل باکوورێ گوندی شکەفتا بەرێ کەڤری ب دووراتییا ١,٥کم هەیە.

ل رۆژهەلاتێ گوندی ژی کانییا جن جیوەرکێ و کانییا گوندی هەنە[13].

## گوندێ دیشێشێ:

گوند دکەڤیتە د جهەکێ کووردا و دۆرمانێن وی چیانە، جهەکێ گوزاری یە و ٨کم ژ جادا سەرەکی و ٢٥کم ل لایێ باکوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ دووره. ل دووڤ پلانا هۆبا چاندنا کانی ماسێ ل گوندی پتری ٢٥٠ دونەمێن ئەردێ ئاڤی هەنە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن ئۆره و سەرەرو.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن هرۆرێ و قومریێ.

**باکووری:** هەڤ سنووره دگەل باکوورێ کوردستانێ و زۆما دیف ئاڤێ.

**باشووری:** گوندێن ئەدنێ و تشیشێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن: بنەمالا خالدێ عەزەمێ، بنەمالا حەسەنێ سلوی، بنەمالا سرویا، بنەمالا بەگا پێکدهێت، دگەل هندەك بنەمالێن دی یێن بچوك ل گوندی هەنە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٩٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان و نها ژمارا وان نێزیکی ٣٠٠ خێزانانە[14]، دۆرێن ١٠ خێزانان ل گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی.

گوندێ دیشێشێ سێ جاران هاتییە سۆتن، جارا ئێکێ ل سالا ١٩١٩ێ و خەلکێ وی گوند بەردان،

پشتی چەند سالەكێن كێم گوند هاتەئاڤاكرن، سالا ١٩٧٨ێ گوند بۆ جارا دوویێ هاتە سۆتن و هندەك ژ خەلكێ گوندی بۆ كۆمەلگەهێن دەركارێ و تلكەبەرێ هاتنە ڤەگوهاستن و هندەكێن دی مانە ل ناڤا شۆرشێ، سالا ١٩٨٧ێ گوند هاتەئاڤاكرن و سالا ١٩٨٨ێ گوند بۆ جارا داویێ هاتە سۆتن و خەلكێ وی دەربەدەری تركیا، سالا ١٩٩١ێ هندەك خێزان ڤەگەریانە كوردستانێ و سالا ١٩٩٢ێ گوند ئاڤاكرن و هەتا نها لێ دژین.

### شوینوارێن گوندی:

پێنج دوورگەهـ ل گوندی هەنە كو دبێژنێ دوورگەهـ یێن كێركی ل لایێ ژێری دناڤبەرا گوندێن دێشێشێ و ئەدنێ دا و ٢كم ژ گوندی د دوورن.

### شكەفتێن گوندی:

ژ شكەفتێن گوندی ژی: شكەفتا میرزا محەمەد، شكەفتا چۆرێ ل باكووری ب دووراتییا٦٠٠م، هەر وەسا ل گوندی گۆرستانا موهاجرا ل باكوورێ گوندی هەیە و ل دووڤ گۆتنا خەلكێ گوندی كو ژ بابكالان بهیستییە دبێژن دیرۆكا وێ بۆ بەری ٩٠ سالان ڤەدگەریت.

### كانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ژ كانیێن گوندی: كانیا سەریۆتا ل باكووری گوندی ب دووریا ١٠كم، كانیا بن دارێن مەحمیدی ل سەرێ گوندی، كانیا ناڤ گوندی، بركا بن كەزانا ل باشووری ب دووراتییا كیلومەترەكێ، كانیا سپینداریٚ و بركا سەیدا ل رۆژئاڤایی ب دووراتییا كیلومەترەكێ و ژ بلی رووبارەكێ ئاڤێ ژی.

ل گوندی زۆما سەركێ دێشێشێ هەبوو، بەری چل پێنجی سالان خەلكێ گوندی پەزێ خۆ هاڤینێ دبرنە وێرێ و هاڤینا خۆ ل وێرێ دبووراندن. پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن ل سالا ٢٠٠٤ێ خواندنگەهـ هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا ٢٠١١ێ هاتییە راكێشان[٦٥].

## گوندێ راڤینا:

راڤینا ب دووراتییا ١١كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو ل سەر دەمێن بووری هندەك كەس هاتینە ڤی جهی بۆ راڤ و نێچیرا و كانییەك لێ دیتینە، ئەو كانی ڤەكۆلایە و ئاڤ لێ دەركەفتیە و د ئەنجامدا لێ ئاكنجی بووینە و بوویە راڤینا، ب واتایا (راڤ ئینا) و بوویە راڤینا. هندەكێن دی دبێژن راڤینا ب واتایا رەڤێ هاتییە، كو رەڤەك ب سەر خەلكێ گوندیدا هاتییە و قەستا ڤی جهی كریە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئورمانا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن تیلەرێ و باتیفا سەیدا.

**باكووری:** چیایێ كورا بهار و گوندێ هەدێنە.

**باشووری:** چیایێ گابنێركی و گوندێ ئاسهێ.

### پێكهاتا گوندی:

گوندێ راڤینا ژ پێنج بنەمالان: بنەمالا برەهیما، بنەمالا شابا، بنەمالا فەقا، بنەمالا رەندێ، بنەمالا مال ئومەرا پێكدهێت، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٢٨ كەس بوون[٦٦] و نها دبنە نێزیكی ٤٠٠ خێزانان كو ل گوندی و دهۆك و زاخۆ دژین.

راڤینا بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٦١ێ ژلایێ فرۆكەیێن عیراقێ ڤە هاتییەسۆتن، بەلێ هەر زوو خەلكێ گوندی گوند ئاڤاكرەڤە، گوند ل سالا ١٩٦٣ێ ژی هاتییەسۆتن و سالا دووڤدا خەلكێ گوندی گوند ئاڤاكرن، بۆ جارا داویێ گوند ل سالا ١٩٨٦ێ ژلایێ عیراقێ ڤە هاتەسۆتن و خەلكێ وی دەربەردەری گوندێن ئێكمالە و مەگلانا و ئاسهێ و تیلەرێ بوون، ل هەوا ئەنفالان خەلكێ گوندی ئاوارەیی تركیا بوون، سالا ١٩٩١ێ جارەكادی ڤەگەریانە سەر گوندی و ل سەر جادا سەرەكییا دچیتە كانی ماسێ ئاڤاكرن، پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن خواندنگەهەك ل سالا ٢٠٠٤ێ لێ هاتییە ڤەكرن، نها مزگەفت و

بنگەهەكێ ساخلەمیێ لێ هاتینە ئاڤاكرن و كارەب ژی بۆ پرۆژەیێ ئاڤێ هاتییە راكێشان.

**شوینوارێن گوندی:**

ل دەوروبەرێن گوندی حەفت كاڤلە گوند هەنە، دیرۆكا وان بۆ دەمێن كەڤنار ڤەدگەریت، وەكی: ئورمانا خراب، كانییا شەكرینێ (كاڤلە گوندە)، كاڤلكا، كانییا ئاقاری كو دكەڤیتە لایێ رۆژئاڤایێ گوندی ئەوژی كاڤلە گوندە، گوندێ خەلایێ.

شكەفتەك ژی ل باشوورێ گوندی ب ناڤێ كونبایە هەیە، ل زڤستانا یا گەرمە و ل هاڤینا گەلەكا سارە. گوندەكێ ناڤدارە ب كەزان و مێویژ و باهیڤا، خەلكێ وی ژی ب نێچیرێ و داوەتان ناڤ و دەنگێن خۆ ل دەڤەرێ هەیە[٦٧].

## گوندێ زەكەریا:

ئێكە ژ گوندێن خرابەیە ل دەڤەرا بەرواری بالا، ل دووڤ گۆتنا خەلكێ گوندی ئاسهێ ئەڤ گوندە بەری ٧٠ سالان هاتییە بەردان و كەس لێ ناژیت، گوند دكەڤیتە باشوورێ كانی ماسێ، دناڤبەرا گوندێ ئاسهێ و خانكێ و دەرگەلا مۆسا بەگێ و چیایێ گابنێركی، ل دەستپێكێ ب تنێ چوار مال ل سەر گوندی دژیان و هەر ژ زارگۆتنا خەلكێ ئاسهێ ئێشەكا ڤەگر ل ڤی گوندی پەیدا بوو، گەلەك ژێ مرن و یێن دی گوند بەردان و هەتا نها كەس ژ وان نە ڤەگەریایە سەر گوندی و دەڤەرێ هەمیێ، دو كانی ل گوندی ب ناڤێن كانییا زەكەریا و كانییا گەرا دەحلی هەنە، دیسان شكەفتەكا مەزن ب ناڤێ شكەفتا كلۆخەی ل باكوورێ گوندی ب دووراتییا ١,٥كم هەیە كو جهێ پتری ٥٠ مرۆڤان تێڤە هەیە[٦٨].

## گوندێ سەرەرو:

سەرەرو گوندەكێ خۆشێ گوزاری یە، دكەڤیتە دووراتییا ٧كم ژ جادا سەرەكی و ٢٥كم ل باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ، ل دووڤ هۆبا چاندنا كانی ماسێ دیاركری دۆرێن ٦٠٠ دونەمێن ئەردێ ئاڤی لێ هەنە. ناڤێ گوندی ژ سەر رووباری هاتییە، چونكی گوند یێ ل سەر روویێ ئاڤێ. دیرۆكا ئاڤا بوونا گوندی بۆ دەمێن كەڤنار ڤەدگەریت. نها خواندنگەهـ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن و هێلا كارەبێ ژی سالا ٢٠١١ێ گەهشتیە گوندی.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێن هەدێنە و ئۆرە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن دێشێشێ و قومریێ.

**باكووری:** هەڤ سنوورە دگەل گوندێن باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری:** گوندێن ئەدنێ و كانی ساركێ.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩٧٨ێ ژلایێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییەسۆتن، هندەك خەلكێ وی دەربەدەری تركیا بوون و هندەكێن دی ل كۆمەلگەها دەركارێ ئاكنجی بوون، سالا ١٩٨٣ێ گوند هاتە ڤە ئاڤاكرن، پاشی سالا ١٩٨٨ێ ل هەوا ئەنفالان هاتەكاڤلكرن و خەلكێ گوندی دەربەدەری تركیا بوون، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ڤەگەریانە سەر گوندی و گوند هاتە ئاڤاكرن، نها ژی چەند مالەك ل سەر گوندی دژین.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ ڤان چوار بنەمالان: بنەمالا ئەسەمەر، بنەمالا نزاری، بنەمالا مال میرزا، بنەمالا ژێری پێكدهێت، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢٦ كەس بوون[١٩] و نها تێكدا نێزیكی ٤٥٠ خێزانانە كو ل زاخۆ و دهۆك و دەرڤەی وەلاتی دژین.

**شوینوارێن گوندی:**

ل گوندی كۆمەكا شوینواران هەنە، پتریا وان دوورگەهـ ن ل دۆرمانێن گوندی و هەمی وەكی ئێك ژلایێ بلنداهی و فرەهیێ ڤە هاتینە چێكرن.

دوورگەها بەرۆژی، ب دووراتییا ١٠٠م دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی، ٣م بلندە و ٢م فرەهە، دوورگەهـ

ا سەر کەڤرێ مالا ب دووراتییا ۱۰۰م دکەڤیتە لایێ باکووری، دوورگەهـ ا نەقەبا بەری دکەڤیتە باکووری و ۵۰م ژ گوندی دوورە، دوورگەهـ ا شێخ بیتاری ل ناڤ گوندی، هەروەسا دوورگەهـ ا گەلی ل ژووریێ گوندی و دوورگەهـ ا نزاری ب دوورییا ۲۰۰م ل ژێریێ گوندی، دیسان شوینوارەك ل رۆژهەلاتێ گوندی هەیە کو وێنێ شێرەکێ ل سەر کەڤری کۆلایە و ۲۰۰م ژ گوندی دوورە. کەڤرێ بیکێ شوینوارەکێ دیبە کو دکەڤیتە لایێ باکووری ب دووراتییا ۴۰۰م، کو وێنێ مرۆڤان ل سەر وی کەڤری دیارە.

ناووسك: ل گوندی ناووسکێن نزاری ل ژێریێ گوندی هەنە، کو سێ ناووسکن و ل دەف ئێك، د هەر ئێکێ دا جهێ دو سێ مرۆڤان تێدا کۆلاینە و ۱۰۰م ژ گوندی دوورن، هەروەسا ناووسکا بەر موقبەرێ ل ژووریێ گوندی و جهێ سێ تەختان تێدا کۆلاینە، دەرێ وێ یێ تەنگە و یا ل ناڤ گوندی. دیسان شکەفتێن گەلیکی ژی ل ژووریێ گوندی هەنە.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی کۆمەکا کانییان ژی هەنە، ژوانان: کانی رەشێ ل ژووریێ گوندی و ۱کم ژ گوندی دوورە، کانییا ناڤ بیهۆکا ل ژووریێ گوندی ب دووراتییا ۲کم، کانییا بن بیێ ل باکوورێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ، کانییا مالا ئەحمەد و مالا خدرێ کو دناڤا گوندیدانە و کانییا بەرێ رزقو ل لایێ رۆژهەلاتی ب دووراتییا ۲۰۰م، کانییا نۆرین دناڤا گوندیدا و کانییا مال ژێریێ ل لایێ باشوورێ گوندی. دیسان رووبارەکێ ئاڤێ ژ رۆژهەلاتی دهێت و ژ لایێ باشووری را دبەر گوندیرا دچیت. ژیانا گوندییا ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی بوویە، نها گەلەك ئاقارێ گوندی هاتییە شینکرن[70].

## گوندێ سەردەشتێ:

گوندەکێ مەسیحینشینە، ب دووراتییا ۱۷کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ کانی ماسێ. ناڤێ گوندی ژ دەشتێ هاتییە ئانکو ل جهەکێ دەشت ئاڤاکرینە، خەلکێ گوندی وەسا ددەنە خویاکر کو دیرۆکا ئاڤابوونا گوندی بۆ بەری ۱۰۰ سالان ڤەدگەریت، ل دووڤ گۆتنا خەلکێ وان ل سالا ۱۹۱٤ێ هاتییە ئاڤاکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی**، گوندێ کری.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ دۆرێ.

**باکووری**، گوندێ هەلوە.

**باشووری**، گوندێ مەلختە.

سەردەشتێ هەمی ئێك بنەمالن، ئەو ژی بنەمالا (بێلاتینا)یە، ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (۱۹٥۷)ێ ۲۲۲ کەس بوون[71] و سەرجەمێ خێزانێن وان ل نها دگەهنە ۱۸۰ سەرۆك خێزانان، پتریا وان ل دەرڤەی هەرێمێ دژین.

بۆ جارا ئێکێ ئەڤ گوندە ل سالا ۱۹٦۱ێ هاتییە سۆتن، خەلکێ گوندی دەربەدەری دەڤەرێن جودا یێن عێراقێ بووینە، سالا ۲۰۰٥ێ جارەکادی گوند هاتییە ئاڤاکرن و نها ل وەرزێ هاڤینێ چەند خێزانەك ل سەرگوندی دژین و کارێ رەز و بیستانان دکەن.

ل گوندی ب تنێ دێرەك ب ناڤێ (ماریوحەنا) هەیە، دیرۆکا وێ ل دووڤ گوتنا بابکالان ڤەدگەریتە بۆ سەردەمێن گەلەك کەڤنار وجهێن شوینواری و شکەفت و کانی لێ نینن[72].

## گوندێ سەرزێری:

سەرزێری ب دووراتییا ۸کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ کانی ماسێ ل سەر رێیا سەرەکییا دچیتە باکوورێ کوردستانێ، دیرۆکا ئاڤا بوونا گوندی بۆ بەری ۱۰۰ سالان ڤەدگەریت. ناڤێ گوندی ژ هەبوونا زێری و چەند جۆرێن (کانزایی)کو لێ هەنە هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوند هەڤ سنوورە دگەل گوندێن باکوورێ کوردستانێ.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ بەربیرێ.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ زێ.
**باشووری:** گوندێن تروانش و هەلوە.

## پێكهاتا گوندی:

چەند بنەمال ل ڤی گوندی هەنە، وەكی: بنەمالا حەیرانی، بنەمالا سلێمان، بنەمالا مەحمید (حەجی پحەمەد)، بنەمالا جندی، بنەمالا زوبێر، بنەمالا پیرمیسێ تاهر، بنەمالا سەلیمێ هەركی، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٣]، نها ژی سەرجەمێ خێزانێن خەلكێ گوندی دبنە ١٥٠ سەرخێزان و گوند نەهاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ گوندی ژی ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەها دهۆكێ دژین.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩٧٦ێ هاتییە سۆتن و خەلكێ گوندی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ نزاركێ ل دهۆكێ، سالا ١٩٩٢ێ خەلكێ گوندی قەستا جهێ خۆ كرەڤە، لێ ژلایێ فرۆكەیێن توركی ڤە هاتە بومبەبارانكرن و تا نها گوند نەهاتییە ئاڤاكرن.

## شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن گوندی: بەرێ كەرا ئێكە ژ شوینوارێن كەڤن، كو خانییەك ل سەر بەرەكێ مەزن هاتییە ئاڤاكرن و چ رێ ناچنێ و ١٠٠م ژ گوندی دوورە، بەرێ خزینێ كو بەرەك ل سەر بەرەكێ ل لایێ باشووری دانایە و هەر چوار رەخێن وی وەكی ئێكن. دیسان كۆمەكا گۆرستانان ل لایێ رۆژهەلاتی ل نێزیك رووبارێ زێی هەنە.لایێ باكووری گوندی ژی شوینوارێن هندەك گوندێن خرابە هەنە، دیرۆكا وان بۆ بەری چەند سەدسالییەكان ڤەدگەریت.

## شكەفتێن گوندی:

چەند شكەفت ژی ل گوندی هەنە: ل لایێ رۆژهەلاتی: شكەفتە رەشێ و رەفەزا درێژ، شكەفت سیخور، شكەفتا بسترك، شكەفتا مەزن، شكەفتا ئیشو و خەلیلێ خوشەبی، ئەڤ شكەفتە دوێرن ١٠كم ژ گوندی دوورن. لایێ باشووری: شكەفتا چل مەزەلا (شكەفتەكا مەزنە)، شكەفتا دەركاڤلی، شكەفتا گا و بەهدینی و دوێرن ٣كم ژ گوندی دوورن. لایێ رۆژئاڤایی شكەفتا قاسدی كیلومەترەكێ ژ گوندی دوورە و شكەفتا بەر زنارێ ٣كم ژ گوندی دوورە.

## كانیێن گوندی:

ژ كانیێن گوندی ژی: كانیا ئاڤدێ د بن گوندی دا، كانی كوچك، كانیا ئەحمەد، كانیا سار، ئەڤ كانیە هەمی دكەڤنە دناڤا گوندیدا. هەروەسا ل گوندی زۆما كانیا سار و كانی كوچكێ ل باكوور و رۆژهەلاتێ گوندی هەنە.

ژیانا گوندیا هەر ژ كەڤندا ل سەر چاندنێ و تەرش و كەوالی و ب خودانكرنا مێشێن هنگڤینی بوویە، خەلكێ گوندی كەر و چێل ب خودان نەدكرن[٧٤].

## گوندێ سەفەریا:

گوند ب دووراتییا ١٢كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو ل دەمەكێ خەلك بۆ سەفەرا دچوونە وی جهێ و بوویە سەفەریا.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باتیفا سەیدا.
**رۆژئاڤایی:** گوندێن چەمسەیدا و خشخاشا.
**باكووری:** گوندێ بێقولكێ.
**باشووری:** چەمبلكێ.

گوندێ سەفەریا هەمی ئێك بنەمالن، ئەو ژی بنەمالا (مەحمید بەگێ)یە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ گوند ٨٨ كەس بوون و نها دبنە ١٢ خێزان، ل گوندی و دهۆكێ دژین و مالەك ژی ل دەرڤەی وەلاتی.

سالا ١٩٨٨ێ گوند هاتییە سۆتن و خەلكێ وی دەربەدەری دهۆك و زاخۆ بووینە. سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ئاڤاكرن، و پرۆژەیێ ئاڤێ و كارەبێ ل سالا ٢٠١١ێ گەهشتینە گوندی.

ل گوندی چەند ناووسك ل ژووری و ژووریێ رۆژئاڤایێ گوندی هەنە، هەروەسا كەلۆتكا مەحمید بەگێ كو جهەكێ كەڤنارە د ناڤبەرا گوندێ سەفەریا و گوندێ چەمسەیدا، دیسان ئاشەكێ ئاڤێ یێ كەڤنار هەیە كو دیرۆكا وی ڤەدگەڕیێتە بەری ١٥٠ سالان.

ب تنێ كانییەك ل گوندی هەیە كو سەرۆكانییا گوندییە و ئاڤا گوندی ژ وێ كانیێ دهێت [٧٥].

## گوندێ شمایلا:

شمایلا گوندەكێ مەسیحینشینە ب دووراتییا ٤كم دكەڤیتە باشووری رۆژهەلاتێ كانی ماسێ و ٦٠٠م ژ جادا سەرەكی دوورە. ناڤێ گوندێ شمایلا ژ(ئشما+ ئیل) پەیڤا (ئیل) ب زمانێ عبری ب واتایا (خودێ) دهێت و پەیڤا ئشما ب واتایا (مال)، شمایلا ب واتایا مالا خودێ، یان مالا ئەسمانی دهێت، هندەكێن دی دبێژن كو شمایلا دكەڤیتە سەر رووبارەكێ ئاڤێ ب واتایا (ئاڤا بۆش) دهێت.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩١٥ێ هاتییە چۆلكرن و خەلكێ وی بەرەڤ تیارێ چوون، پشتی شەش سالان جارەكادی ڤەگەڕیانە سەر گوندی و ئاڤاكرنەڤە. سالا ١٩٧٨ێ جارەكادی گوند ژ لایێ عیراقێ ڤە هاتە سۆتن و خەلكێ گوندی ل بێرسڤێ خۆجە بوون، سالا ١٩٩٣ێ هاتە ئاڤاكرن ڤە و نها چەند خێزانەك ل سەر گوندی دژین.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** چیایێ بێزرك.

**رۆژئاڤایی:** دەشتا هێری.

**باكووری:** گوندێن یاتێ و دۆرێ.

**باشووری:** گوندێ بێتەنورێ و چیایێ تەلانا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن: بنەمالا زۆمایا، بنەمالا كازو، بنەمالا مەندو، بنەمالا زایا، بنەمالا بەدێ، بنەمالا بەرخۆ پێكدهێن، ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا

گوندێ شمایلا



(١٩٥٧)ێ ١٦٣ كەس بوون[٧٦] و نها دبنە نێزیكی ١٥٠ خێزانان و ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەها دهۆكێ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

**شوینوارێن گوندی:**

ل گوندی دو دێرێن كەڤنار هەنە: دێرا مارت شمونی و دێرا مار ئەفرام كو ل دووڤ گۆتنا گوندییان پشتی هاتنا مەسیحی ب ٢٥٠ سالان هاتییە ئاڤاكرن، پشتی سەرهلدانێ دوبارە ئەو دێرە هاتییە ئاڤاكرن و پرۆژەیێ ئاڤ و كارەبێ ژی بۆ گوندی هاتینە دروستكرن[٧٧].

## گوندێ شێلازا:

شێلازا ب دووراتییا ٢٠كم دكەڤیتە لایێ باشوورێ ناحیا كانی ماسێ. و چیایەكێ بچویك ل باشووری د ناڤبەرا گوندی و چیایێ مەتینی دا ب ناڤێ قوبلە، كو دبیت ب واتایا (قیبلە) هاتبیت هەیە، گوند ب تەنشت گرەكی ڤە هاتییە ئاڤاكرن و ئەڤ گوندە دەڤەرا بەرواری بالا ب برینا چیایێ مەتینی نزار و بەرۆژ ب دەڤەرا سپنە و ئامێدیێ ڤە گرێددەت.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێن خرابەی، هێسێ، ئێكمالێ، مێركا جیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن قەسركێ، كویلكا، دەرگەلێ.

**باكوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێن ئاسهێ، خانكێ.

**باشووری:** دهێتە گرێدان دگەل توخیبێن گوندێن ئەرەدنا ژووری و یوسفكا (ئویسفكا) و بۆتیا ل سەرێ چیایێ مەتینی ئاڤرێژێ ڤە.

ژ لایێ باكوورێ رۆژهەلاتی سێ كاڤلە گوند ب ناڤێن (مەگلانان، سێجاڤا، زڤنگێ) هەنە.

**پێكهاتا گوندی:**

شێلازا ژ ڤان بنەمالان: مال مژدین، پسمیر (بەگ)، عەجەمی، مالا ئاشی پیرمەند، رەمێ (رەندێ)، قەسركی، بێتكاری، ئورمەدادی، مالا شێخی (شێخێن مایێ)، قەریب لەهد (قریب العهد)، مالا زەكەریا پێكدهێت. ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٤٢ كەس بوون[٧٨].

**شوینوارێن گوندی:**

گەلەك شوینوار و كاڤلە گوند لێ دیارن، مینا:

- دیاربوونا گورێن د كولۆزاندا و گۆرستانێن تشتێن خەملا ژنكێ مینا ( ستڤانك و گوهارك و بازن) تێدا.
- مزگەفتا گوندی، كو ژ دو قاتان پێك دهات، قاتێ دووێ ژی دو پشك بوو.
- كاڤلە گوندێ (صارا مەكری)ی ب دووراتییا (١١٠٠م)، ئەڤ كاڤلە دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ گوندی، ژ كەڤنە وارێن وی گۆرستانەكا مەزن هەیە.
- شوینوارێن گوندێ مێردینێ: ب دووراتییا ٢كم دكەڤیتە رۆژهەلاتێ باكوورێ گوندی.
- قەسرا شەرەف بەگێ و مزگەفتا وێ و ئاڤد.
- شكەفتا دەرێ شیش: ب دووراتییا ٣كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی، دەرگەهێ وێ (٣م) ژ عەردی یێ بلندە و دەرەچك دكەڤری دا كۆلاینە هەتا دگەهنە بەر دەرگەهێ وێ، كو مرۆڤ ب ژوور دكەڤیت.
- شكەفتا مەزن ب دووراتییا ٤كم دكەڤیتە بەرامبەر كەلا گابنێركێ، دبیتە سێ مەزەل، هەرمەزەلەكێ تەختەك یان دو یێن بەری و بالیفكێن بەری لێ هەنە، هندەك رەفەتكێن وەك پەنجەركان دیسان جۆرینەكا عمباركرنا ئاڤێ تێدا هەیە.

ل گوندێ شێلازا ل (كانی تیبا) ئەلماس و كلێ چاڤان هەنە، دیسان رەژیا بەری ل كێرێ (سەرێ شێلازا) هەیە و بێ سەر ئاخە.

ڤی گوندی پتر ژ (٢٠٠) دۆنەمێن عەردێ ئاڤی و (١٠٠٠) دۆنەمێن دێمی هەنە و ژیارا گوندییان هەر د كەڤندا ل سەر چاندنێ و پویتە ددانە سامانێ گیانەوەری ب تایبەت پەزی و گا رەشان بۆ جۆت و كێلان، زندەباری هێستران بۆ كاروبارێن مال[٧٩].

## گوندێ چەقەلا:

گوندەکێ کەڤنارە ب دووراتییا ٢٦کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ ل سەر رێیا سەرەکییا دچیتە ناحیێ. گوندی وەسان خۆیا دکەن کو ناڤێ گوندی ل سەر دەمێ ئوسمانییان ب واتایا (کەلا) هاتییە دانان، شوینوارێن ٤٤ دوورگەهـ ان ل دۆرمانێن گوندی هەنە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن چەقەلا سەری وهرۆرێ.

**باشووری،** رووبارێ خابووری و گوندێ چەمیکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن بازیڤا هرۆر و چەلکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بریفکا.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ چەقەلا ژ بنەمالێن: بنەمالا بریخا، بنەمالا شمو، بنەمالا ئوشانە، بنەمالا رەشو، بنەمالا نیسانکێ، بنەمالا خامس، بنەمالا توما، بنەمالا شانو، بنەمالا مریەم، بنەمالا داود، بنەمالا یاقو پێکدهێت. ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا ئاکنجیێن چەقەلا خوارێ ١٩١ کەس بوون و یا سەری (سلال) ١٠٣ کەس بوون[٨٠]، نها هەمی دبنە نێزیکی ٢٠٠ خێزانان.

سالا ١٩٦١ێ گوند هاتییە خرابکرن و تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن، ب تنێ ئاقارێ خۆ شین دکەن.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا باسێ ب دووراتییا کیلومەترەکێ ل ژووریێ گوندی و شکەفتا گرێ ئیسفکا ب دووراتییا کیلومەترەکێ ل لایێ رۆژئاڤایی.

دیسان کانییا چەقەلا و کانییا نوبوا ل گوندی هەنە.

ژیارا گوندیان ل سەر کێلانێ و چاندنێ بوویە. و دەشتا چەقەلا یا ب ناڤ و دەنگە بۆ چاندنا دەخل و دانی[٨١].

## گوندێ چەلکا فەلا:

گوندەکێ کەڤنارە ب دووراتییا ٢٨کم دکەڤیتە باکووری رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و ٤کم ژجادا سەرەکی دوورە. ناڤێ گوندی ژ چالێ هاتییە و هەر چوار رەخ و دۆرمانێن گوندی گرک و چیایێن بچۆکن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ کێستە.

**باشووری،** کۆمەلگەها بێکوڤا و کال گوهورێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ چەلکێ.

**رۆژئاڤایی،** رووبارێ خابووری و هەڤ سنوورە دگەل دەڤەرا گولییا.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ چوار بنەمالان پێکدهێت: بنەمالا شلیمونا، بنەمالا دەنووا، بنەمالا ئاروشی، بنەمالا ناڤ گوندی (کو ژ ئارۆشێ و تیارێ هاتینە)، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥١٩ کەس بوون[٨٢]، لێ نها سەرجەمێ خێزانێن وان دگەهنە ٥٠٠ خێزانان، دۆرێن ١٠ خێزانان ل گوندی دژین و یێن دی ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەها دهۆکێ و بەغدا و دەرڤەی وەلاتی نە.

بۆ جارا ئێکێ گوند د دناڤبەرا سالێن ١٨٤٠-١٨٦٠ێ دا هاتییە سۆتن، و جارا دووێ ل سالا ١٩١٤ێ، ناڤەراستا سالێن ١٩٢٠ێ گوند هاتەئاڤاکرن، و جارا داویێ ل سالا ١٩٧٩ێ هاتییە سۆتن و خەلکێ گوندی ئاوارەی بێرسڤێ و دهۆك و زاخۆ و بەغدا بوون، سالا ١٩٩٢ێ گوند جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن و نها چەند خێزانەك ل سەر گوندی دژین.

### شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن گوندی: دێرا مار مۆسا کو کو ژ حەبەشێ هاتییە ڤی گوندی و ل دووڤ گۆتنان بەری نێزیکی ٥٠٠ سالان هاتییەئاڤاکرن، دێرا مار ئەوراها ل لایێ رۆژئاڤایی ب دووراتییا ٢٠٠م و دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ بۆ سەردەمێن کەڤنار ڤەدگەریت، کوچێن پرەکێ ژێ

مانه ل گوندی دبێژنێ كوچێن بنیامێ، هەروەسان كەلایەك ب ناڤێ كەلا بنیامێ (بیامێ)، ب ناڤێ ئەو كەسێ گوند ئاڤاكری هەیە.

**شكەفتێن گوندی:**

چەند شكەفت ژی ل گوندی هەنە، مینا: شكەفتێن دێرێ و كون سیخورێ ل رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتیا ٥٠٠م، كو یا دووێ یا دەرتەنگ و درێژە و پترە ژ ١٠٠م. شكەفتا بەرێ بۆكا د دناڤبەرا كون سیخورێ و شكەفتا دێرێ و كیلومەترەكێ ژ گوندی دوورە. كەڤرەكێ بلند و ئاسێ ژی ل بەرامبەر گوندی ل لایێ باشووری ب ناڤێ كال گوهورێ هەیە.

**كانیێن گوندی:**

كانیا گەرمكێ ل ژوورێ گوندی و كانیا شێ بەخ بیكێ ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتیا ٣٠٠م.

خەلكێ گوندی ب رستنا بەرگیزا ب ناڤ و دەنگن و تا نها ژی ل سەر ڤی كاری د بەردەوامن[٨٣].

**گوندێ چەمسەیدا:**

وەكی د پەرتووكا (گوندێ چەمسەیدا) دا هاتی دبێژیت:

ل سالا ٢٠٠١ێ رۆژنامەڤانەكێ ئەمریكی ب هاریكاریا چەمسەیدیێن ئاكنجیێن ئەمریكا هاتبوو دەڤەرێ و گوندی د پەرتووكەكێ دا سالۆخەت ددەت، د چەند برگەیەكدا هاتیە:

- "گوندەكێ بچویكێ بێ دەنگ و پێژن، یێ دلڤەكەر و بلند، بەرامبەری چیایەكێ بلند و كەسك ....
- ل باكوورێ گوندی گرێن ئاخا سوور و شین و چیایێن دوور تێن دیتن. ل سپێدەییا پشتی بانگێ دیكلا ژن تەنویرا هلدكەن و دویكێلا تەنویرا جانییەكا دی ددەنە گوندی"[٨٤].

چەمسەیدا ب دووراتیا ٢٣كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ. ناڤێ گوندی ژ چەمێن سەیدا هاتیە، گوندی وەسا خویادكەن كو بەری ٤٧٠ سالان خەلكێ گوندێ ل حاجی مەتینی ل سەر بیرێن زێوەیا ئاكنجی بووینە، ل وی دەمی دو برا بوون، برایەك چوویە گوندێ بانكا و یێ دی چوویە دێریشكێ ل دەڤەرا گولییان و بۆ دەمەكێ مایە ل وێرێ، پاشی ئەو برایێ چوویە دەڤەرا گولییان هاتییە گوندێ چەم شێخی ل باكوورێ گوندێ بازێ و ب هاریكاریا چەم شێخیا ئاڤاكرییە و ل وێرێ ئاكنجی بوویە، هەروەسا ب ئینانا جۆكا ئاڤێ بۆ گوندی دا كو كارێن چاندنێ پێ بكەن، چەمسەیدا ئاڤاكرینە و ب بوورینا دەمی چەندین ناڤ دانانە سەر ڤی گوندی، وەكی: چەمێ كەرا، پاشی بوویە چەمێ غەریبا و ژ نوی بوویە چەمسەیدا[٨٥].

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چمبلكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن خشخاشا و هەترشێ.

**باكووری:** گوندێن سەفەریا و جدیدكێ.

**باشووری:** گوندێن بازێ و كانی مەزنێ.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ دو بنەمالێن سەرەكی پێكدهێت، بنەمالێن (سەیدا و كرمانجا). سەید ژی دبنە سێ بابك: مالا مەلا، مالا ژووری، مالا داودی. و كرمانج ژی ب تنێ بنەمالا شێخی یە كو بەری (٢٥٠ - ٣٠٠) سالان ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە و ل ڤی گوندی ئاكنجی بووینە. گوندێ چەمسەیدا ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٥١ كەس بوون[٨٦] و نها گوند ژ ٢١٣ سەرۆك خێزانان پێكدهێت، (٣٣) خێزان ژ وان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەها دهۆكێ.

سالا ١٩٦١ێ بارزانی هاتییە گوندی و د هەمان سالدا یەكەمین رێكخراوا پارتی ل گوندێ هاتییە دامەزراندن. گوندی وەسا د دەنە خویاكرن كو سێ جاران گوند ژ لایێ عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن، لێ هەر زوو هاتییە ئاڤاكرن ڤە، سالا ١٩٨٨ێ ل هەوا ئەنفالان گوند ب تەمامی هاتە وێرانكرن و خەلكێ

وی دەربـــەدەری ئێران و ترکیا بووینە، سالا ١٩٩٢ێ جارەکادی خەلك زڤری سەر گوندێ خۆ و ئاڤاکرن.

**شوینوارێن گوندی:**

كۆمەكا شوینوارێن كەڤن ل گوندی هەنە، وەكی:

كاڤلە گوند: چەمشێخا، پشتكاڤلا، كاڤلە گوندێ مزەوڤا، مزگەفتا چەمكا، غەریبا.

گۆڕستانێن كەڤن: گۆڕستانا چەمشێخا، چەمكا، مزەوڤا، گەلیكی، بەر حەلانی، پشتكاڤلا رۆژهەلاتی، سەر چەمكێ بێرا، غەریبا، ئاڤارێ سەید مەحموودی، موناسبێ شیفكەرمێ، شیفكا، جەهنەمكا.

ئاش: ئاشێ شینووی، ئاشێ سەید مەحموودی.

ژ بلی مناسبێ پیر هاجی و ناووسك و گەلەك شوینوارێن دی، مینا شوینوارێ چێكرن و دەرئینانا ئاسنی ل بەر كەڤرێ، خەلكێ گوندی باروێت ژی ژ ئاخا شكەفتا بابەكرا چێكرینە و ب كارئینانینە[٨٧].

**كانیێن گوندی:**

چەندین كانی ل گوندی هەنە، وەكی كانیێن: جوهیا، خەیاتا، چەمێ سمی، مێرگە رەش، عەیشێ، شیفكەرمێ، شەمسێ، چەمێ كەهنیكا، جەلالی، دوشیڤانێ، شێخ خەمریكێ، دەرێ ئاشێ چەم شێخێ، كەوكێ، سەرێ مێرگە رەشا عەبدولقادری، سەرێ چەمێ حەجی عەبدولخالقی، گەرمافكا، شافركێ، بنێ رەزێ چەمێ كەهنیكا، بنێ چەمێ تەوفیقی، حوسێن بێدهی، تایا بن مناسبێ شیف گەرمێ، بنێ چەمێ عمتێ، دووڤ بورێ بن تویكا، نورینێ، خەندەكێ، بن ئاڤاری).

چەندین پـرۆژە بۆ گوندی هاتینە دروستكرن، وەكی: چێكرنا بەنداڤەكا ئاڤێ ل سالا ٢٠١٢ێ، ژ بلی جۆكێن ئاڤێ و مزگەفت و رێكا گوندی و هێلا كارەبێ و خواندنگەهـ كو ل سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ڤەكر[٨٨].

**گوندێ چەمیكێ:**

چەمیكێ گوندەكێ ئاڤی یێ كریستیانان بوو، ل دووڤ گۆتنا خەلكێ دەڤەرێ، بەری ٦٠ سالان هاتییە بەردان، دكەڤیتە دووراتییا ٢٠كم ژ باشوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ، رووبارێ نینیكێ دبەر گوندیرا دبووریت و رووبارێ خابووری ل رۆژئاڤایێ وی، نها كەس لێ ناژیت[٨٩].

**گوندێ چمبلكێ:**

گوند ب دووراتییا ٣٠كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ (چەمت بلو) هاتییە و ب درێژاهییا چەند سەد سالان بوویە چمبلكێ.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی،** گوندێن میسكا و خانكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن كانی مەزنێ و چەمسەیدا.

**باكووری،** گوندێن سەفەریا و بێقولكێ.

**باشووری،** گوندێن تیشمەبیكێ و بێشیلێ.

چمبلكێ هەمی ئێك بنەمالن، ئەو ژی بنەمالا (گولای بەگێ) نە، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٢٦ كەس بوون [٩٠] و نها ٤٥ خێزانن.

بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٦١ ێ گوند هاتییە سۆتن و خەلكی گوندی دەربـــەدەر بووینە، سالا ١٩٧٤ێ جارەكادی گوند هاتییە ئاڤاكرن، ل هەوا ئەنفالان گوند هاتییە خرابكرن ڤە و خەلكێ وی ئاوارە بووینە، دووبارە گوند ل سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ئاڤاكرن. نها چەند خێزانەك ل سەر گوندی دژین. ڤی گوندی ٦٠ دونەمێن زەڤییێن چاندنێ هەنە و ب تنێ ئێك كانییا ئاڤێ لێ هەیە، ژیانا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و ب خوادنكرنا تەرش و كەوالی بوو[٩١].

**گوندێ گركا:**

گركا ب دووراتییا دوێن ١٥ كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ و نها نێزیكی جادا گشتییا دچیتە كانی ماسێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی ژ كۆمەكا گران هاتییە، مینا: گرێ گوندی (هنداڤ گوندی)، گرێ جەهسیس، گركێ سلێمانی، گركێ گورجێ، گركێ گەرپایی، گركێ تیژ و گەلەك گركێن دی لێ هەنە.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێن خشخاشا و تشیشێ.

**رۆژئاڤایی:** كۆمەلگەها بریفكا.

**باكووری:** گوندێ قومریێ.

**باشووری:** رووبارێ نێنیكی و هەڤ سنووره دگەل گوندێ هەترشێ.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ ڤان بنەمالا پێكدهێت: بنەمالا مەعریفا، بنەمالا خەلیلا، بنەمالا میدا، بنەمالا سلێمانی، بنەمالا قاسا، بنەمالا سەیدا، بنەمالا باپیری، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٠٢ كەس بوون[٩٢] و نها نێزیكی (٢٥٠) سەرۆكخێزانانە، ژوانان ٢٥ خێزان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل زاخۆ و دهۆك و دەرڤەی وەلاتی و پتریا خەلكێ گوندێ تۆڤی نە، د سەردەمێ جەنگێ جیهانیێ ئێكێ دا ژ باكوورێ كوردستانێ مشەختی گركا بووینە. بەری ئەو بهێن چەند مالەكێن كێم ل گوندی دژیان.

ل دەستپێكا شۆرشا ئیلونێ گركا دگەل دو گوندێن دی یێن دەڤەرا بەرواری بالا، یەكەمین گوندبوون ژ لایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتینە بومبە بارانكرن. پشتی دەمەكی خەلكێ گوندی گوند ئاڤاكرەڤە هەتا ل روژا ١٩٨٧/٩/١٩ێ ژ لایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتە سۆتن و كاڤلكرن و خەلكێ وی دەربەدەری گوندێن دەوروبەر بوون. سالا ١٩٨٨ێ خەلكێ گوندی ئاوارەی تركیا بوون، سالا ١٩٩٢ێ خەلكێ گوندی گوند ئاڤاكرنەڤە.

**شكەفتێن گوندی:**

چەند شكەفتەك ل باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ گوندی هەنە، وەكی: شكەفتا عەمی، شكەفتا خەمێ، شكەفت هناركێ، شكەفتا كون سیخوركێ،

گوندێ گركا بەری خرابكرنێ سالا ١٩٨٧



شکەفتا کونکورکێ.

هەروەسا چەندین ناووسك ژی ل ژێریێ گوندی هەنە.

## کانیێن گوندی:

ل گوندی کۆمەکا کانییان هەنە، ژوانان: کانییا هەرزێلێ (کو سەرۆکانییا ئاڤا گوندی یە) ل ژووریێ گوندی، کانی کەوکێ، کانییا مێرا، کانی گارکێ، کانی کیژولێ، کانیکا چەمێ عەلی میسا، کانیکا قادوی، کانییا هوریێ، کانی بەقبەقوکێ، کانییا مێکرێ و هەمی دکەڤنە دۆرمانێن گوندی.

ڤی گوندی دۆرێن ٦٠٠ دۆنەمێن عەردێ ئاڤی هەنە و یێ ب ئاڤ و دەنگە ب چاندنا جۆرێن دار و بارێ فێقی و باهیڤ و تری و ... هتد. دیسان خەلکێ وی گرنکیێ ب چێکرنا رەزان ددەن کۆمەکا رەزان هەنە. خەلکێ گوندی ل دەستپێکا بهارێ سولتێن ماسییان ژی چێدکرن.

سالا ١٩٥٨ێ خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ لێ هاتیە ڤەکرن و پشتی گوند هاتییەڤە ئاڤاکرن ل سالا ٢٠٠٥ێ خواندنگەهـ جارەکادی هاتەڤە ڤەکرن.

و کارەبا گشتی ل سالا ٢٠١٠ێ بۆ هاتییە راکێشان و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠١٣ ێ بو گوندی هاتییە دروستکرن(٩٣).

## گوندێ گیلکا:

گوند ب دووراتییا ١٥ کم دکەڤیتە باشووری کانی ماسێ و ٥کم ژ جادا سەرەکی دوورە. گوندی پتری ٥٠٠ دونەمێن زەڤییێن چاندنێ هەنە. دیرۆکا ئاڤا بوونا گوندی بۆ بەری ١١ بابکان ڤەدگەریت و ژ بنەمالێن فەقێ و هاجێ و ژووری و محەمەدێ حەجی و عەزووی پێکدهێت، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٨٧ کەس بوون(٩٤) و نها هەمی نێزیکی ١٨٠ خێزانانە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ دەرگەلێ.

**باشووری:** زنجیرا چیایێ مەتینا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شێلازا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن قەسرکێ و بێشیلێ.

گوند ل سالا ١٩٨٨ێ هاتییە سۆتن و خەلکێ وی بەرەف ترکیا ئاوارە بووینە، سالا ١٩٩٢ێ خەلکێ گوندی ڤەگەریاینە سەر گوندێ خۆ، پشتی ماوەیەکێ کێم و ژبەر تێکچوونا رەوشا دەڤەرێ نەچاربوون گوندێ خۆ چۆلبکەن و تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن.

### شکەفت و کانیێن گوندی:

چەند شکەفت ل گوندی هەنە، وەکی: شکەفتا حسەینێ تهای، شکەفتا خالدی، شکەفتا مزگەفتێ و شکەفتا مەحمیدی هەنە. هەروەسا چەند کانی ژی هەنە، وەکی: کانی رەشێ، کانییا گوندی، کانییا هەسپا، کانییا مام عەبدالا، کانی تیکێ و پیشالا و کانییا مالێن ژێری، ژ بلی زۆما کانی رەشێ ل ژێریێ گوندی ل بنێ چیایێ مەتینا ب دووراتییا ٤ کم هەیە(٩٥).

## گوندێ قەسرکێ:

گوندەکێ خرابەیە و نەهاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتییا ٢٥کم ژ باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و ١٠ کم ژ جادا سەرەکی دوورە، و ١٥ دونەمێن ئەردێ ئاڤی هەنە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شێلازا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گیلکا.

**باکووری:** گوندێ ئاسهێ.

**باشووری:** چیایێ مەتینا.

خەلکێ دەڤەرێ وەسا ددەنە خویاکرن کو ئەڤ گوندە بەری ١٥٠ سالان هاتییە بەردان و تا نها کەس لێ ناژیت، ئەڤ گوندە ژ دو بابکان پێکهاتبوو، بابکەك ژوان چوویە گوندێ شێلازا و بابکێ دی چوویە ناڤ بەرواری ژێریێ و ماینە ل وێ دەڤەرێ(٩٦).

## گوندێ قومریێ:

كەلایەكا بلندە، ل سەر دەمێ میرگەها بەهدینان بنكەهێ میرگەها دەڤەرا بەرواری بالابوو[97]، قومریێ دكەڤیتە دووراتییا ١٨كم ژ رۆژئاڤایێ ناحیا كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ قەمەریێ هاتییە، گوندییان ژ بابكالان بهیستییە كو دیرۆكا ئاڤاكرنا گوندی بۆ بەری دەوروبەرێن ٢٥٠ سالان كو هینكێ بازێر بوو دزڤریت، دیسان دبێژن: ژبەر هەبوونا گەلەك مالان ب رەخ ئێكڤە، بێژنگ ل سەر بانێ مالا ئێكێ رێز دكر، بێ كەتن تا دوماهیك مال دچوو.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** گوندێن تشیشێ و ئەدنێ و سەرەرو.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بریفكا.

**باكووری،** گوندێن هرۆرێ و دیشیشێ.

**باشووری،** گوندێن گركا و خشخاشا.

قومریێ ژ چوار بابكان پێكدهێت، ژمارا ئاكنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٣٨ كەس بوون[98] و ژمارا خێزانێن وان ل نها نێزیكی (٥٠٣) خێزانانە، ل گوندی و دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

قومریێ بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٧٨ێ ژلایێ عیراقێ ڤە هاتە كاڤلكرن و گەلەك ژ خەلكێ وی ل كۆمەلگەهان خۆجهكرن، و پتریا وان مانە دناڤا شۆرشێدا، و ل سالێن هەشتییان ژ سەدسالییا چوویی گوندێ خۆ ئاڤاكرەڤە، سالا ١٩٨٨ێ جارەكادی هاتە كاڤلكرن و خەلكێ گوندی دەربەدەری تركیا بوون. سالا ١٩٩٢ێ ڤەگەریانە ڤە و گوند ل سەر جادا گشتییا دچیتە كانی ماسی ل وی جهێ دبێژنێ ئاڤارێ سۆریا ئاڤا كرن.

### شوینوارێن گوندی:

چەندین شوینوار ل گوندی هەنە، وەكی:

كەلا قومریێ ل ژووریێ گوندی، مزگەفتا شەهیدا، كۆمەكا كاڤلە گوندا ل دەوروبەرێن گوندی، هەروەسا (مەزرخانە) كو دبێژنێ زیندان، و دەمێ شۆرشێ جهێ ڤەحەواندن و دەرمانكرنا بریندااران بوو، دیسان دێرەك و چەند گۆڕستان ژی ل گوندی هەنە، و گەلەك جاران ئەرد كێلاینە و دو گۆڕ ل سەر ئێك دەركەفتینە.

چەند زانا ژ ڤی گوندی دەركەتینە، مینا حسن كورێ نۆحێ قومریێ بەرواری (٨٦٢مش/١٤٥٧ز) مریە، خودانێ پەرتووكا (مصطلحات الطب) و میر سەیف محەمەد بەگ كورێ سەعید بەگ ل سەدسالییا (١٢مش/١٨ز) كو یەكەمین پەرەشۆت، یان فرۆكا (شیراعی) داهینای و پێ ژ كەلایێ دادایە بنێ نهالا نێزیك و گەلەك داهێنانێن دی ژی كرینە[99]. هەروەسان سێ ئاشێن ئاڤێ ژی ل ڤی گوندی هەبوون.

### شكەفتێن گوندی:

ل ژووریێ گوندی كۆمەكا شكەفتێن ئاسێ هەنە، وەكی: شكەفتا تەبالا و خەجێ و مێرا و جنكێ و حامدی و بناڤا ستەنكێ و پشت ئاشی و كون حەفتیاركێ و مەهمید و شكەفتا بەرمێشكا وحەیوانا و مشارێ و كون سیخوركێ و حەفت مەزەلا.

### كانیێن ئاڤێ:

دیسان چەند كانی ژی هەنە، وەكی: كانییا بەرچەلی، كانییا شین، كانییا تەحلەبی، كانییا شێخی، كانییا واری، كانییا تا، كانییا جهیا، كانییا سابینی، كانییا جەباری، كانییا تیا پەرخێ.

ل گوندی بنكەهەكێ تەندورستی و دو خواندنگەهێن بنەرەتی ژی ل سالێن ١٩٩٣ێ و ٢٠٠٨ێ هاتینە ڤەكرن، تۆرا كارەبێ و ئاڤێ ژی بۆ گوندی هاتینە راكێشان[100].

## گوندێ كانی سارکێ:

گوندێ كانی ساركێ ژ لایێن باكوور و باشوور ڤە دكەڤیتە د ناڤا نهالەكێ دا ب دوورییا ٢٠كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ و ٩كم ژ جادا سەرەكی یا دوورە.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تیلەرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئەلكیشكێ.

**باكووری،** گوندێ سەرەرو.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئەدنێ.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ سێ بنەمالان: بنەمالا هەمزێ، بنەمالا مەسیحایێ، بنەمالا جامی پێكدهێت، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٩٣ كەس بوون[١٠١] و نها تێكدا ٢٣٠ خێزانن.

گوند سێ جاران هاتییە كاڤلكرن، سالا ١٩٧٨ێ خەلكێ گوندی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەهێن دەڤەرا زاخۆ. ل ناڤەراستا سالێن هەشتییان خەلكێ گوندی گوند ئاڤاكرنەڤە، سالا ١٩٨٨ێ هاتە سۆتن و خەلكێ گوندی ئاوارەی تركیا بوون، سالا ١٩٩٢ێ ڤەگەریانە سەر گوندی و ئاڤاكرن، لێ ل سالا ٢٠٠٠ێ ژ ئەگەرێ هێرشێن تركیا هاتە خرابكرن، و خەلكێ گوندی بەرەف باژێرێن دهۆك و زاخۆ ڤە چووینە، و هەتا نها گوند نەهاتییە ئاڤاكرن.

ب تنێ ئێك كانی ب ناڤێ كانیا ناڤ گوندی لێ هەیە[١٠٢].

## گوندێ كانی مەزنێ:

گوند ب دووراتییا ٢٦كم دكەڤیتە باشووری رۆژئاڤایێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ كانییەكا مەزن ل سەراڤا گوندی هاتییە، گوند هەمی ئێك بنەمالن كو د كەڤندا ژ گوندێ كلیتانێ دەڤەرا هەكاری ل باكوورێ كوردستانێ هاتینە بێدوهێ و پاشی ل سەر دەمێ میرێن ئامێدیێ ل گوندێ كانی مەزنێ خۆجهـ بووینە، خەلكێ گوندی ژ ١٢٠ خێزانان پێكدهێت.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تیشەمبیكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بازێ یە.

**باكووری،** گوندێ مزەوقا (كاڤلە گوندەكێ كەڤنە).

**باشووری،** بێشلێ و چیایێ مەتینا.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩٦٣ێ هاتییە سۆتن و گوندی دەربەدەربوون، پشتی دەمەكێ كێم هاتییە ئاڤاكرن ڤە، سالا ١٩٨٨ێ ل هەوا ئەنفالان گوند ژ لایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتە سۆتن و خەلكێ وی دەربەدەری تركیا و ئیرانێ بوون. سالا ١٩٩٢ێ جارەكادی خەلكێ گوندی ڤەگەریانە سەر گوندی و گوند ل هەمان جهێ كەڤن ئاڤاكرن. هەژی ئاماژێ یە كو پتر ژ حەفتێ خێزانێن گوندێن بەرواریا، پشتی ل نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتیان ژ سەر گوندێن وان راكرین ل ڤی گوندی ئاكنجی ببوون، مینا گوندێن (بێدوهێ، ئۆرە، بناڤی، مایێ، دەرگەلكێ، سەرەروو، دێشیش، باتیفا سەیدا، گركا، تروانش، ئەلكیشكێ).

**كانی و شكەفتێن گوندی:**

ژ كانیێن گوندی: كانیا شەمێ و مێرگا بازێ و دەحلێ ئاشی و گەرمافكا نە.

ژ شكەفتان ژی ب تنێ شكەفتا چۆلێ لێ هەیە.

خواندنگەهـ ل سالا ٢٠٠٢ێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و پرۆژەیێ ئاڤێ و مزگەفت بۆ گوندی هاتینە دروستكرن و ل سالا ٢٠١١ێ هێلا كارەبێ ژی بۆ گوندی هاتییە راكێشان[١٠٣].

## گوندێ كری:

گوندەكێ مەسیحییانە، ب دووراتییا ١٠كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ كری هاتییە، ژبەر سەرۆكانیا ئاڤێ دكەڤیتە سەرێ گوندی و ب ساناهی ل گوندی بەلاڤە دبیت.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئاڤ سارکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مەلختە.

**باكووری،** گوندێ سەردەشتێ.

**باشووری،** گوندێ بالۆكا.

گوند ژ دو بنەمالان پێكدهێت، ئەوژی بنەمالێن:

خەلان و منێ، ژمارا وان ل سالا (١٩٥٧)ێ ٩٦ کەس بوون[١٠٤] و نها ژمارا خێزانێن خەلکێ گوندی دگەهنە ١١٦ خێزانان، پتریا وان ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتە سۆتن و بەردان و خەلکێ وی دەربەدەری زاخۆ و دهۆك و بەغدا بووینە، سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ئاڤاکرن و پاشی ل سالا ١٩٩٤ێ ژ ئەگەرێ هێرشێن سوپایێ تورکی هاتە ڤە بەردان، سالا ٢٠٠٠ێ خەلکێ گوندی زڤرینە سەر گوندێ خۆ، نها چەند خێزانەکێن کێم ل سەر گوندی دژین.

ل گوندی دێرا مریەملعەزرا یا شوینواری هەیە، کو ب بۆچوونا گەلەك ژ خەلکێ گوندی کو وان ژ بابکالان بهیستییە دیرۆکا ئاڤا بوونا وێ بو بەری ١٨٠٠ سالان ڤەدگەریت. دیسان ئێك کانی ب ناڤێ کانییا درێژ ژی ل گوندی هەیە[١٠٥].

## گوندێ کێستە:

کێستە دکەڤیتە بنێ چیایێ زنارا کێستە، ڕەخ و روبێن وی چیانە، ب دووریا ٣٠کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ، ناڤێ وی ژ کیز رەشان ئانکو ژ (بەتەنێن رەش) هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هرۆرێ.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ خابووری و گوندێ رویسێ ل دەڤەرا گولیا.

**باکووری:** گوندێ نزدۆرێ.

**باشووری:** گوندێ چەلکا فەلا.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ کێستە ژڤان بنەمالان بنەمالا عەباسی، بنەمالا حاجی، بنەمالا مال مەلا، بنەمالا عەبدولرەحیمی، بنەمالا سرێ، بنەمالا پیرێ، بنەمالا ئاشوانی پێکدهێت، ژمارا ئاکنجییێن گوندی ل دووف ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٠ کەس بوون[١٠٦]، لێ نها تێکدا دبنە نێزیکی ٤٥٠ خێزانان، کو ل گوندی و ل دهۆکێ و زاخۆ و سێمێلێ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

کێستە ل سالا ١٩٧٦ێ هاتەسۆتن و خەلکێ گوندی دەربەدەربوون و هەر چەند خێزانەك بەرەڤ جهەکێ چوون و هندەك ل کۆمەلگەهان ئاکنجی بوون، گوند ل ناڤەراستا سالێن هەشتیان هاتەڤەئاڤاکرن، دیسان ل ئەنفالان هاتەوێرانکرن، خەلکێ وی بەرەڤ ئێرانێ و ترکیا مشەخت بوون. سالا ١٩٩٢ێ گوند ژلایێ رێکخراوێن بیانیڤە هاتەئاڤاکرن، نها پرۆژێن خزمەتگوزاری ژ بنگەهێ تەندروستی و مزگەفتێ و پرۆژەیێ ئاڤێ و هێلا کارەبێ ل گوندی هاتینەچێکرن و خواندنگەهـ ژی پشتی گوند هاتییە ئاڤاکرن ل سالا ١٩٩٣ێ لێ هاتییە ڤەکرن. نها ٥٠ خێزان ل گوندی دژین.

### شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن کەڤن ل کێستە مەدرەسا کێستەیە کو کەڤنترین شوینوارە و تا نها ژی شوینوارێن وێ مانە، ژلایێ میر حەسەنی، میرێ بەهدینان (٨٧٥-٩٤٠مش/١٤٧٠-١٥٣٣ز)ی دناڤبەرا سالێن (١٤٦٥-١٥٣٤)ێ دا هاتییە ئاڤاکرن، ل دەستپێکا سەدساڵیا (١١مش/١٧ز) ژ لایێ زوبێر پاشای ڤە کو دناڤبەرا سالێن (١١١٣-١١٢٦مش/١٧٠٢-١٧١٤ز) حاکمێ دەڤەرێ بوو هاتییە نووژەنکرن و گەلەك زانایێن ب ناڤ و دەنگ وانە ل ڤێ مەدرەسێ گۆتینە، مینا: ئیبراهیم کێستەیی، خودانێ (الحواشی المتفرقة فی اغلب العلوم و شرح المنهاج فی الفقه)، ڤێ مەدرەسێ پەرتووکخانەکا دەولەمەند هەبوو و پەرتووکێن وێ هاتنە ڤەگوهاستن بۆ مزگەفتا کەڤن یا گوندێ (مایێ) و هندەك ژی ل دهۆکێ هاتنە فرۆتن[١٠٧].

ژ شوینوارێن دی یێن ڤی گوندی دیوارێ مزگەفتا کەڤن و پرا بیامێ کو د کەڤیتە رۆژئاڤایێ دەڤەرا بەرواری بالا ب دووراتییا سێ کیلومەتران ژ گوندێ کێستە و تاکە پر بوو ل سەر رووبارێ خابووری کو دەڤەرا بەرواریا ب دەڤەرا گولییان ڤە دهاتە گرێدان،

ئەڤ پرە ب شێوەیەكێ گرۆڤر و ب بەرا و گێچێ هاتبوو دروستكرن، ل دووڤ گۆتنا دانعەمرێن دەڤەرێ كو بیامێ میرەك بوو و پر ل سەر دەمێ وی و ل سەر ناڤێ وی هاتییە دروستكرن، نها ب تنێ كوچەك ژێ مایە و رەخ و رویێن وێ ژی یێن خرابببوین، ل لایێ دی یێ خابووری، واتە ل رۆژئاڤایێ گوندێن كێستە و چەلكا مەسیحیا ب دووراتییا نێزیكی (٤كم) كەلایەك ژی هەر ب ڤی ناڤی هەیە لێ شوینوارێن ئاڤاهییان لێ نینن، قاسم ئەحمەد حسێن كو دانعەمرەكێ گوندێ كێستە یە د بێژیت: بیرا من دهێن د ناڤبەرا سالێن (١٩٦٧-١٩٦٨)ێ هەرسێ كوچێن ڤێ پرێ د دروستبوون، لێ پشتی هینگێ هەردو كوچێن ل رەخا هەرفتن و یا ناڤێ هەتا نها مایە. دیسان ناڤبری د بێژیت: هەردو رەخێن ئاڤێ جهێ كاڤلێ دو گوندانە و ل هەردو رەخان جهێ دو گۆرستانان ژی لێ دیارە، دیسان چەندین شوینوارێن دوورگەهـ ان ژی ل باكوورێ كەلێ هەنە و هەتا نها چەند ژ وان كو د كەڤنە د ناڤبەرا هەردو گوندێن كێستە و چەلكا مەسیحیا و ب تایبەتی ل گوندێ كێستە هەنە و شوینوارێ ١٠ دوورگەهـ ان د دیارن د دیارن، ئەو دوورگەهـ ژ رۆژهەلاتی دەست پێدكەن هەتا دگەهیتە رۆژئاڤایی، هەروەسان هندەك دوورگەهـ دكەڤنە باشوورێ گوندێ كێستە بخۆدا و ب تنێ وەكی شوینوار مانە.

دیسان ناڤبری ئاماژە ب وێ چەندێ دكەت كو هەر ژ كەلێ هەتا سەر سنوورێ گوندێن باكوورێ كوردستانێ چەندین دوورگەهـ وەكی زنجیرە و ل نێزیكی ئێك هەنە.

**ژ شكەفتێن گوندی ژی،** شكەفتا گەرمكێ و شكەفتا بالۆلەی.

كۆمەكا كانییان ژی ل كێستە هەنە، یێن ب ناڤ و دەنگ كانییا گویزێ و كانییا كێستەنە.

ژیانا گوندییا د بەرێ دا جۆتیاری و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی و مێشێن هنگڤینی بوو. و مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتی وەردگرتن[١٠٨].

## گوندێ مایێ فەلا:

مایێ مەسیحییا دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ و ٦,٥كم ژ سەنتەرێ ناحیێ دوورە. دیرۆكا ئاڤا بوونا گوندی بۆ بەری ٣٠٠ سالان ڤەدگەریت.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دێریشكێ و ناڤەندا ناحیێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بناڤیێ.

**باكووری،** گوندێ بێدوهێ.

**باكوورێ رۆژئاڤایی،** مایا ئیسلام.

**باشووری،** گوندێ ئورمەداودا و هێرێ (گابنێركی).

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ بنەماله ل گوندی هەنە:

بنەمالا هەیدو و بنەمالا شمكێ. گوند ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٥٨ كەس بوون[١٠٩]، سالا ١٩٧٠ێ ژ ١٠-١٥ خێزانان پێكدهات[١١٠]، لێ نها ژمارا خێزانێن وان دگەهنە ١٣٣ خێزانان، زۆربەیا وان ل دەرڤەی وەلاتی دژین.

ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە سۆتن و خەلكێ گوندی دەربەدەر بووینە، جارا ئێكێ ل سالا ١٨٤٧ێ، لێ هەر زوی ئاڤاكرنەڤە، جارا دووێ ل سالا ١٩١٤ێ و خەلكێ گوندی دیسا دەربەدەر بووینە، پشتی چەند سالەكێن كێم ئاڤاكرنەڤە، جارا داویێ ل سالا ١٩٧٨ێ ژ لایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتەسۆتن و خەلكێ گوندی بۆ كۆمەلگەهێن زاخۆ هاتنە ڤەگوهاستن. سالا ١٩٩١ێ دووبارە گوند هاتەئاڤاكرن، نها دۆرێن ٢٠ خێزانان لێ دژین و دێرەك هاتییەئاڤاكرن كو دیرۆكا وێ ڤەدگەریتە سالا ١٩٥٥ێ.

ل گوندی شكەفتا بكو ل رۆژئاڤایێ گوندی هەیە.

هەروەسا دێر و پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتینە دروستكرن و تۆرا كارەبا ژی هاتییە راكێشان[١١١].

## گوندێ مایێ ئیسلام:

گوندەكێ خۆشێ گوزارییە، ئەو دگەل گوندێ بێدوهێ دەڤەرێن هەكاری و بەهدینان پێكڤە گرێددەت، ب دووراتییا ٦,٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ. ل دووڤ گۆتنا گوندییان دو بۆچوون بۆ ناڤێ گوندی هەنە، بێ ئێكێ ژ هەبوونا ئاڤەكا زۆر و ب واتایا (ماء) یا عەرەبی، یا دووێ ژ(مان) ئانكو ماینە ل سەر جهـ و وارێ خۆ.

خەلكێ گوندی د رەگەزدا ژ میرەبەگێن گوندێ (ئەلكێنە) ل نێزیكی جولەمێرگێ ل باكوورێ كوردستانێ و ژ وێرێ هاتینە مایێ و گوند ئاڤاكرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بێدوهێ و چیایێ شارانیێ.

**باشووری،** گوندێن مایا نەسارا (نـزارێ فەلا) و ئورمەداودا و نزار كورتك.

**رۆژهەلاتی،** دێریشكێ و كانی ماسێ و چیایێ شكێری.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بناڤیێ و چەلێ مایێ چیایێ نزاری.

### پێكهاتا گوندی:

ژ بنەمالێن گوندی: مالا شێخی، مالا عەلێ، مالا مەلای، مالا برەهیما، مالا ئاشی، مال زێری. ل سالا (١٨٤٢)ێ ١٥ خێزان ل سەر گوندی هەبوون[١١٢]، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ژی ژمارا خەلكێ گوندی ٢٨٤ كەس بوون[١١٣]، سالا ١٩٧٠ێ ژمارا وان (٦٠-٧٠) خێزانان بوون[١١٤]. نها هەمی نێزیكی ٣٥٠ خێزانانە.

### شوینوارێن گوندی:

وەكی ژ زاردەڤێ خەلكێ گوندی دهێتە گۆتن گوندەكێ گەلەك كەڤنارە و گەلەك جاران كولۆزێن كو مری دكرنە تێدا هاتینەدیتن. هەروەسان دناڤبەرا سالێن ١٩٥٤- ١٩٥٥ێ دا گەلەك كەل و پەل مینا كولۆز، دستار، هستیڤ، ترار، قەلوین، كاسكێت ئاسنی، ل شاویتێ هاتینە دیتن[١١٥]، ژ بلی هەبوونا

گوندێ مایی



چەند جهێن دی یێن شوینواری و دیرۆكی مینا:

**كونینۆكا مەزن و بچویك:** دو شكەفتن ل رۆژئاڤایێ گوندی، دناڤا واندا تەخت و پەنجەرێن ژبەری چێكری و ب دووراتیا ا كم د كەڤریرا هاتینە نكراندن.

**لەهندا كافری:** كەڤرەكە وەكو جولانكەكێ دناڤ كەڤرەكێدا هاتیە كۆلان و ب دووراتیا كیلومەترەكێ دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی.

**گۆرخانە:** ئەو ژی شكەفتەكە ب دەست هاتیە دروستكرن و وەكو كونینۆكایە ل رۆژئاڤایێ گوندی، ئەو شكەفت جهێ ڤەحەوەهانا بارزانی بوو ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولێ.

**بن كەڤروكا:** شكەفتەكا بەردرێژە یا سرۆشتیە ل رۆژهەلاتێ شاویتێ ب دووراتیا ٢٠٠م.

**خواندنگەها مایێ:** كو ب خواندنگەها میر قوباد بەگێ ئێكێ (٩٨١-٩٩١مش/١٥٧٣-١٥٨٣ز) ژی هاتیە ناڤكرن، چونكی ل سەر دەمێ وی سەدسالیا دەهێ مشەختی هاتیە ئاڤاكرن و خەلكەكی مشە بۆ زانینێ بەرێ خۆ داینە وێرێ. ل سەر دەمێ زینێ پاشای جارەكا دی هاتیەنووژەنكرن و هەتا سالا (١٣٤٣مش/١٩٢٤ز)ێ یا ئاڤەدان بوو، لێ ژبەر چەند ئەگەران پەرتووكخانا وێ هاتە سۆتن[116].

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٥٨ێ هاتە هاتە ڤەكرن[117] و پشتی گوند هاتیە ئاڤاكرن ڤە، خواندنگەها سەرەتایی ل سالا ٢٠٠٢ێ بۆ هاتیە ڤەكرن.

گوند سێ جاران هاتیە كاڤلكرن، جارا ئێكێ ل سالا ١٩١٩ێ و خەلكێ وێ دەربەدەری چەلێ و جولەمێرگێ و گوندێن سنووری بوون، جارا دووێ ل سالا ١٩٢٤ێ و خەلكێ وێ دیسان دەربەدەری باكوورێ كوردستانێ بوون ژ ئارۆشێ هەتا بێلاتا چەلێ[118]، دوماهیك جار ل سالا ١٩٧٨ێ بوو، خەلكێ وی ئاوارە بووینە، سالا ١٩٩٤ێ گوند ئاڤاكرنەڤە و نها چەند خێزانەك ل سەر گوندی دژین و ژیارا وان ل سەر چاندنێ و ئاژەلی بوویە.

ڤی گوندی دو ئاش ب ناڤێن ئاشێ مەلاكێ و

گوندێ مایی



ئاشێ عوبەیدوللای لێ هەبوون[119]. بۆ جارا ئێكێ سێڤ (سێڤێن بەرواریا) ل ڤی گوندی ل سالێن چلان ژ سەدسالیا چوویی ژ لایێ شێخ مەزهەر مایی ڤە هاتینە چاندن و پشتی هینگێ ل دەڤەرێ بەلاڤ بووینە.

### ژ شكەفتێن گوندی:

شكەفتا كیژۆلێ، شكەفتا مەخەلێ، شكەفتا كسلێ، شكەفتا عەبولرەحمان، شكەفتا فات حاجیێ[120].

### كانیێن گوندی:

چەند كانییەك ل دۆرمانێن گوندی ب دووراتییا (٥٠٠-١٠٠٠)م هەنە، وەكی: كانیا ناڤ گوندی، كانیا شاویتێ، كانیا خەبیسا، كانیا زاڤا، كانیا گوندێ فەلا، كانیا زەڤێت رەشیدی، كانیا حەسكێ، كانیا عەمەر گوزەلا، كانیا زێوێ، كانیا بەكر و سینا، كانیێت تا، كانیا بهار، كانیا گویزێت كەچەلێ، كانیا كەرا، كانیا بێتبێ، كانیا رەزێت بەنێ، كانیا خاری، كانیا مێرگا فاتێ، كانیا مێرگا شێبەی، كانیا تاوسكا، كانیا خوێرێ، كانیا سپی، كانیا گاخویركی، كانیا نەرسێ كانیا دركێ، كانیا مێرگا سەدرا[121]، هەروەسا رووبارەكێ ئاڤێ دناڤ ئاقارێ گوندی را دهێت و دەربازی گوندێ دێریشكێ ل لایێ رۆژهەلاتی دبیت، ژێدەرێ ئاڤا وی ژی ژ دەشتا هەدینە و گوندێ بناڤیێ و زۆزانێن كانیا و كیكەلا و گوندێ ئۆرەنە.

هەر وەسان كۆمەكا جهێن گوزاری ژی ل گوندی هەنە وەكی: كانیا شاویتێ ل ژوورێ گوندی، سەرجۆخینا، بەرچەلی، ئاخ سپیێ، گرێ زێرینە، بەرێ زەرك، بەرێ رەندولا، بەرێ كێل، پشتا بانا، ریكی، ئاشی[122].

## گوندێ مەگلانا:

گوند دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ كانی ماسێ، گوندەكێ خرابەیە و بۆ ماوێ ٤٠ سالانە نەهاتییە ئاڤاكرن و كەس لێ ناژیت. ب گوتنا (سەعید محەمەد سەلیم) كو ئێك ژ خەلكێ گوندێ ئاسهێ یە، بەری پتر ژ ٤٠ سالان ئێشەكا ڤەگر (تاعون) هاتە خەلكێ ڤی گوندی و پتریا وان مرن، یێن دی ژی گوند بجە هێلا و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن[123].

## گوندێ مەلختە:

مەلختە ب دووریا ٢٠كم دكەڤیتە باشوورێ كانی ماسێ، ناڤێ گوندی ب سریانی ب واتایا (مەلك - شاە) هاتییە و ل دووڤ گوتنا گوندیان دیرۆكا ئاڤابوونا گوندی بۆ بەری ٢٥٠ سالان ڤەدگەریت.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن كری و بالۆكا و سپینداری و بێتكار.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەردەشتێ.

باكووری گوندێ تروانش.

باشووری زنجیرا چیایێ مەتینا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ پێنج بنەمالان: بنەمالا ئیشەی، بنەمالا دنخە، بنەمالا یوخانیس، بنەمالا گەورگیس، بنەمالا خەوشابە پێكدهێت، سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٢٨ كەس ل سەر گوندی بوون[124] و نها ژمارا خەلكێ گوندی ٥٠ خێزانن، خەلكێ وی ل دهۆك و باژێرێن دی یێن عێراقێ و ژ دەرڤەی وەلاتی دژین و تنێ هندەك زەڤی ژلایێ خەلكێ گوندی هاتینە شینكرن.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩٧٦ێ هاتییە سۆتن و خەلكێ گوندی دەربەدەر بووینە، گوند دووبارە ل سالا ٢٠٠٥ێ هاتییە ئاڤاكرن و نها چ خێزان ل سەر گوندی ناژین.

ل ڤی گوندی سێ شكەفت هەنە، ئەو ژی: شكەفت كوركێ، شكەفتا گوندی، ل ژێریێ گوندی، شكەفتا یوسفكێ كو شكەفتەكا مەزنە ب دووراتییا ٢كم ل ژێریێ گوندی.

ژ کانیێن گوندی: کانیا بێناڤینکێ و کانیا گوندی هەنە و سەرۆکانیێن ئاڤا گوندی نە[125].

## گوندێ مێردینکێ:

ئەڤ کاڤلە گوندە ب دووراتیا ٢٠کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ باژێرێ مێردینێ ل باکوورێ کوردستانێ هاتییە، و پیتا (ك) بۆ بچویك کرنێ دهێت و هەبوونا قەسرا میر شەرەف بەگێ ل گوندێ شێلازا پەیوەندی ب میر شەرەف بەگێ باکوورێ کوردستانێ ڤە یا هەی، ل دووڤ گۆتنان ئەڤ گوندە بەری ٢٥٥ سالان هاتییە خرابکرن و هەتا نها کەس لێ ناژیت.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خرابە.

**باکووری ورۆژهەلاتی:** گوندێ شێلازا.

**باشووری:** چیایەکێ بچووکە ل بن چیایێ مەتینایە.

### شوینوارێن گوندی:

ل ڤی کاڤلە گوندی چەندین شوینوار هەنە، مینا: قەسرا محەمەد بەگێ، مزگەفتا گوندی، گۆڕستان، هەروەسا کاڤلێ مزگەفتێ کو ژ دوو قاتان پێکدهێت. ل رۆژئاڤایێ مزگەفتێ ئاقدەك ژی وەك شێوەیێ کڤانی هاتییە ئاڤاکرن هەیە[126].

## گوندێ مێرکاجیا:

مێرکاجیا گوندەکێ مەسیحییانە ب دووراتیا ٢٠کم دکەڤیتە باشوورێ کانی ماسێ، ناڤێ گوندی ژ هەردو پەیڤێن (مێرگ) و (چیا) ئانکو ژ مێرگاچیا هاتییە. ل دووڤ گۆتنا بابکالان دیرۆکا ئاڤابوونا گوندی بۆ بەری ١٥٠ سەد سالان ڤەدگەریت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هێسێ.

**باشووری:** گوندێ خرابەی.

**رۆژهەلاتی:** چیایێ گابنێرکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئێکمالە.

ئەڤ گوندە هەمی ژ بنەمالا (بێیاتە)یە، ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٩ کەس بوون[127] و نها دگەهنە نێزیکی ٥٥ خێزانان، لێ کەس ل سەر گوندی ناژیت.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩٦١ێ ژ لایێ عێراقێ ڤە هاتە بومبەبارانکرن، گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتە سۆتن و کاڤلکرن، پشتی خەلکێ وی ڤەگەریایە سەر گوندی، بۆ جارا سێێ ل سالا ١٩٨٨ێ هاتە ئەنفالکرن و خەلکێ گوندی دەربەدەربوون، سالا ١٩٩١ێ خەلك ڤەگەریانە سەر گوندی و گوند هاتە ئاڤاکرن.

ل گوندی ب تنێ دێرەك وەکی شوینوار هەیە، و ئاڤا گوندی ژی ژ کانی رەشێ دهێت[128].

## گوندێ مویسکا:

گوندەکێ مەسیحینشینە، ب دووراتیا ٢٠کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و ٩کم ژ جادا سەرەکی دوورە، گوندی وەسا خویادکەن کو گوندەکێ کەڤنارە و بەری ٣٠٠ سالان هاتییە ئاڤاکرن، ل گوندی ١٠٠ دونەمێن ئەردێ ئاڤی هەنە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دەرگەلا مۆسا بەگێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ تیشەمبیکێ.

**باکووری:** گوندێ ئەلکیشکێ.

**باشووری:** گوندێ بێشیلێ و چیایێ مەتینا.

### پێکهاتا گوندی:

ژ بنەمالێن گوندی: بنەمالا گوریال، بنەمالا ئیسحاقی، بنەمالا بێمال، بنەمالا هەیدو، بنەمالا شیبیرێ، بنەمالا توما، بنەمالا ولیا بەگێ، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٨ کەس بوون[129] و نها تێکدا نێزیکی ٢٥٠ خێزانانە،

پتریا وان ل دەرڤەی وەلاتی و دهۆکێ دژین.

گوندێ میسکا دو جاران ل سالێن (١٩٦٣-١٩٨٨)ێ هاتیە کاڤلکرن و خەلکێ وی بەرەف ترکیا و ئیرانێ و ژێرێ عێراقێ دەربەدەر بوون. سالا ١٩٩٢ێ هاتیە ئاڤاکرن و نها ١٢ خێزان ل سەر گوندی دژین.

### شوینوارێن گوندی:

ل ژێرێ گوندی ئاشەکێ ئاڤێ هەیە، ل دووڤ گۆتنا (دنخا نەمرود) دیرۆکا وی بۆ بەری ٥٠٠ سالان دزڤریت، دیسان دێرا مار یوسف ژی هەیە و وەکی گوندیان ژ بابکالان بهیستی بەری پتر ژ ٥٠٠ سالان هاتیە ئاڤاکرن.

ل گوندی ب تنێ کانییەکا ئاڤێ ب ناڤێ (کانییا میسکا) ل ژێرێ گوندی ب دووراتییا ٦٠٠م هەیە و ئەو کۆمەکا کانییانە و ئێکە ژ جهێن گوزاری، هەروەسان شکەفتا گرێ بەرچەمی ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ٤٠٠ م هەیە.

ل ڤی گوندی قەشە ئەنویە ئێك ژ حەکیمێن دەڤەرێ بوویە و ناڤ و دەنگیێن خۆ د ڤی کاری دا هەبوون.

خواندنگەهـ پشتی گوند هاتیە ئاڤاکرن ل سالا ١٩٩٢ێ بۆ هاتیە ڤەکرن، دیسان بنکەهەکێ تەندورستی هاتیە ئاڤاکرن و تۆرا کارەبێ ژی ل سالا ٢٠١١ێ بۆ گوندی هاتیە راکێشان[١٣٠].

## گوندێ هەترشێ:

هەترشێ گوندەکێ ئاڤی یە و جهەکێ گوزاری یە، ئاڤارەکێ مشە هەیە، خەلکێ وی ژ مایێ هاتینە ڤێرە. گوند ب دووراتییا ٣٥کم دکەڤیتە باشووری رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و ٦کم ژ رێیا سەرەکی دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بازێ و چەمسەیدا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بابیرێ.

**باکووری:** گوندێن خشخاشا و گرکا.

**باشووری:** گوندێ بێلیزانێ.

ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ١٢ کەس بوون[١٣١]، لێ پشتی گوند ل ئەنفالان هاتیە سۆتن کەس نەهاتیە سەر گوندی و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن[١٣٢].

## گوندێ هەدێنە:

هەدێنە گوندەکێ کەڤنار و سار و بەفرینە، دکەڤیتە جهەکێ دەشتایی و دەشتا وێ ل دەڤەرێ یا ب ناڤ و دەنگە، ب دووراتییا ١٥کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ل باشوورێ گوندی زنجیرە چیایەك هەیە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بناڤیێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن ئەدنێ و سەرەرو.

**باکووری:** گوندێ ئۆرە.

**باشووری:** گوندێن تیلەری و کانی سارکێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی هەمی مرۆڤێن ئێکن و ژ ڤان بنەمالان پێکدهێت: بنەمالا میسێ، بنەمالا ئێزدێ، بنەمالا ئالێ، بنەمالا لەوەندی، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩١ کەس بوون و نها دبنە نێزیکی ٢٨٠ سەرخێزانان[١٣٣].

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩٢٢ێ هاتییە سۆتن و سالا دووڤدا ئاڤاکرن، سالا ١٩٧٨ێ ژلایێ عێراقێ ڤە هاتە سۆتن و کاڤلکرن و خەلکێ گوندی ل کۆمەلگەهێن هیزاوا و دەرکارێ خۆجهکرن. جارەکادی گوند دناڤبەرا سالێن ١٩٨٣-١٩٨٤ێ هاتە ئاڤاکرن، ل هەوا ئەنفالان هاتە سۆتن ڤە و خەلکێ وی دەربەدەری ترکیا بوون. سالا ١٩٩٣ێ گوند هاتە ئاڤاکرن و پاشی ژ ئەگەرێ کاودانێ ناڤخویی سالا ١٩٩٥ێ هاتە خرابکرن و نەهاتە ئاڤاکرن ڤە.

### شوینوارێن گوندی:

دوورگەهەك ل رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٥ م هەیە، هەروەسا کەلایەك کو گوندی دبێژنێ

کەلیتکێ ل ژووریێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ سێ گۆڕستانێن کەڤن ژی هەنە.

ژ کانیێن گوندی: کانییا گوندی دناڤا گوندیدا و کۆمەکا کانیێن بهاری ل رۆژئاڤایێ گوندی.

سالا ۲۰۱۲ ێ تۆرا کارەبێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان[١٣٤].

## گوندێ هەلوا فەلا:

گوندەکێ کەڤنار و ئاڤی یە، ب دووراتییا ۲۱کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ کانی ماسێ گوندی وەسا خویادکەن کو ناڤێ گوندێ ژ پەیڤا عەرەبی (حلوه) ب واتایا شرینی یان جوانی هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** هەڤ سنوورە دگەل گوندێن باکوورێ کوردستانێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دووریێ.

**باکووری:** گوندێ دەشتانێ.

**باشووری:** گوندێ سەردەشتێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن: بێلاتی، رائولی، گپەی، قەسرانی پێکدهێن، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ١٩٤ کەس بوون[١٣٥] و نها دبنە ٦٨ سەرۆك خێزان.

بۆ جارا ئێکێ ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦١ێ ژلایێ عێراقێ ڤە هاتییە سۆتن و خەلکێ گوندی ئاوارەی دەڤەرێن جودا یێن عێراقێ بووینە، سالا ٢٠٠٥ێ جارەکادی گوند هاتییە ئاڤاکرن و نها چەند خێزانەك ل سەر گوندی دژین.

### شکەفتێن گوندی:

کۆمەکا شکەفتان ل گوندی هەنە، لێ یێن مەزن و بەرنیاس ئەڤەنە:

گوندێ هەدێنە



شكەفتێن زاڤێ و شكەفتا قەشەینە ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا ٣كم، هەروەسا شكەفتا (بن سەرزێری) كو شكەفتەكا مەزنە و دەرێ وێ دورێن ١٠م یا بلندە، مرۆڤ ب ساناهی نەشێن بچنە دناڤ دا.

### كانیێن گوندی:

ل دەور و بەر و ناڤ گوندی دا چەند كانی مینا: كانیێن بێ زخیە، كانیا دێرێ و نابووە، كانیا گوندی هەنە و نها چەند خێزانەكێن كێم ل سەر گوندی دژین [١٣٦].

## گوندێ هەلوا ئیسلام:

گوندەكێ كەڤنارە ب دووراتییا ١٠كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ كانی ماسێ، ل سەر رێكا سەرەكییا دچیتە دەرگەهێ سەر زێری.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چەمێ دێركێ و رووبارێ زێیێ مەزن.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن هەلوا ژووری و تروانش.

**باكووری:** گوندێ دەشتانێ.

**باشووری:** گوندێ سەر دەشتێ.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ بنەماله ل گوندی هەنە: بنەمالا مەلای، بنەمالا عوبەیدی، بنەمالا ئوسمانی، مالا ئاغاكێ، بنەمالا حەسەنێ زەلیخایێ، بنەمالا ئیسفی، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٧٦ كەس بوون [١٣٧] و نها تێكدا دبنە ٣٤٠ خێزان، خەلكێ گوندی نها ل باژێرێن دهۆك و زاخۆ و كۆمەلگەهان دژین.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩٧٦ێ هاتییە خرابكرن، سالا ١٩٩٣ێ هاتە ئاڤاكرن و جارەكادی ل سالا ١٩٩٦ێ هاتە سۆتن و بەردان و تا نها نەهاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوارێن گوندی:

جهەك ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووریا ٣,٥كم ب ناڤێ بەرخسمێ وەك دوورگەهـ ان هاتییە چێكرن هەیە، هەروەسا شكەفتەكا بەرفرەهـ ب ناڤێ كون هرچێ ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا ٤كم هەیە.

### كانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ژ كانیێن گوندی ژێ: سەرۆكانییا گوندی ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا كیلومەترەكێ، كانیا كوچكێ ل ژوورێ گوندی، دیسان رووبارەك د باشوورێ گوندیرا دبووریت [١٣٨].

## گوندێ هرۆر بازیڤ:

هرۆر بازیڤ چەقەكە ژ گوندێ هرۆرێ و خەلكێ وی هرۆری نە، ئەون كو ژ تركیا و ئێرانێ پشتی سەرهلدانێ ڤەگەریاین و ل سالا ١٩٩٢ێ گوند ئاڤاكرینە، ب دووراتییا ٢٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ و د چارچۆڤەیەكێ بچووكدا ب دورێن ٨ كیلومەترێن چوارگۆشە دا ل سەر رێیا سەرەكییا دچیتە كانی ماسێ هاتییە ئاڤاكرن. ناڤێ گوندێ بازیڤێ ژ بەرێ زیڤی كو وەكی زیڤی یە و ل وێرێ هەیە هاتییە. گوند ژ سێ بنەمالان پێكدهێت و دورێن ٥٠ خێزانان لێ دژین.

### سنوورێن گوندی:

**لایێ رۆژهەلاتی وباشووری:** گوندێ چەقەلا.

**لایێ باكوور و رۆژئاڤایی:** گوندێ چەلكێ یە.

خواندنگەهـ پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن ل سالا ٢٠٠٠ێ بۆ هاتییە ڤەكرن و پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتینە دروستكرن و تۆرا كارەبێ ژی هەیە [١٣٩].

## گوندێ هرۆرێ [١٤٠]:

گوندێ هرۆرێ جهەكێ ب ئاڤ و گوزاری و كەڤنارە، دكەڤیتە دناڤ گەلییەكێ كووردا و هەمی رەخێن وی ژ بلی رۆژئاڤایی چیانە، ب دووراتییا ٣٠كم

دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ و ٨کم ژ جادا سەرەکی دوورە، جهێ گوندی ژ لایێ ئەسترونومی (فەلەکی) ڤە دکەڤیتە سەر خالا پێکەهشتنا هێلا درێژیێ (١٥, ٤٣) رۆژهەلاتی و هێلا پانیێ (١١، ٣٧) باکووری. رووبەرێ عەردێ گوندی دگەهیتە نێزیکی (٣٨کم) چوارگۆشە، ب پانییا (٤,٥کم) و درێژاهییا (٨,٥کم)، واتە رێژەیا (٦,٢٥٪)ێ ژ سەرجەم رووبەرێ دەڤەرا بەرواری بالا ڤەگریت، ژ لایێ توبوگرافی ڤە ژی دەڤەرەکا چیایی یە و بلندییا چیایێن وێ دگەهنە دناڤبەرا (٢٣٠٠-٣٠٠٠م) ل سەر ئاستێ دەریایێ[١٤١]، ژ لایێ جیولوجی ژی ڤە پێکهاتییە ژ بەرێ رەش (الحجر الجیری العضوی)، کو کەرەستێ (سلیکی) وەکی گومتلا دناڤدا هەیە[١٤٢]. سەر ناڤێ گوندی چەند بۆ چوون هەنە، ژوانان:

١- هرۆر وەکی د ژێدەرەکێ سریانی دا هاتی (ما تناثر من عنقود العنب)، ئانکو دەمێ ئیشێ تری دکەڤیت و دبژکیت و هەبوونا گەلەك رەز و جۆرێن تری دبیت بەلگەك بیت بۆ وێ چەندێ.

٢- هرۆر، ئانکو جهێ شەر و ململانێ و هەڤرکیێ[١٤٣]، و جهێ وێ یێ ئاسێ یێ گونجایە بۆ وێ چەندێ.

٣- بۆچوونەکا لاوازتر هەیە کو پەیڤا هرۆر دبیت ژ پەیڤا ئنگلیزی (Horur) ب واتایا (ترس) هاتییە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** کەڤرێ سۆرێ و کەپێ شابەدرێ و هەڤ سنوورە دگەل ئارۆشێ و شیڤ رەزانێ و شەلەمۆنێ ل باکوورێ کوردستانێ.

**باشووری:** گوندێ چەقەلا و کۆمەلگەها بریفکا و زنجیرا چیایێ سەرێ حەمێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دێشێشێ و قومریێ و شاخێ ئلیاسۆك و کەڤۆتا ب کەزی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن کێستە و چەلکا سەیدا و چەلکا مەسیحییا (ئاڤاری).

## پێکهاتا گوندی:

هرۆرێ ژ پێنج ئیجاخان پێکدهێت: ئیجاخا شەمسا، ئیجاخا ئومەرا، ئیجاخا ناڤ گوندییا، ئیجاخا مال مەلا، ئیجاخا سمیالا. ژمارا خەلکێ هرۆرێ ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٤٧)ێ (٧١٩) کەس بوون و ل سالا (١٩٥٧)ێ بوونە (٨٢٥) کەس[١٤٤]، و ل دووڤ پێزانینێن نها دبیت ژمارا خێزانێن وان ب گەهنە دەوروبەرێن (١٥٠٠) خێزانان، دۆرێن ٦٠ خێزانان ل گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی دژین.

## هرۆرێ د ناڤ ژێدەرێن میژوویی دا:

ژبەر کەڤنیا گوندی ناڤێ وێ د گەلەك ژێدەران دا هاتی، وەکی:

مسکویە، معجم البلدان، الکامل فی التاریخ، الروض الزاهر فی سیر الملك الظاهر، ذیل مرآة الزمان، مسالك الابصار فی ممالك الامصار، تثقیف التعریف، تاریخ ابن خلدون، صبح الاعشی فی صناعە الانشا، عقد الجمان فی تاریخ اهل الزمان، منیە الادباء فی تاریخ الموصل الحدباء، غرائب الاثر فی حوادث ربع القرن الثالث، هەلبەت ژ بلی گەلەك نڤیسینێن ڤی سەردەمی مینا محەمەد ئەمین زەکی و سەعید ئەلدێوەجی[١٤٥].

بۆ جارا ئێکێ گوندێ هرۆرێ ل ١٩٦١/٩/١٧ێ ژ لایێ عیراقێ ڤە هاتییە بومبارانکرن و سالا ١٩٦٣ێ گوند هاتییە سۆتن، سالا ١٩٧٦ێ گوند هاتە کاڤلکرن و خەلکێ وی بۆ کۆمەلگەها بێرسڤێ هاتنە ڤەگوهاستن، هندەك ژی ل گوندێن دەوروبەر خۆجهـ بوون، سالا ١٩٧٨ێ چەند خانی لێ هاتنە ئاڤاکرن و ل ئەنفالان هاتنە سۆتن و خەلکێ وی دەربەدەری ترکیا و ئیرانێ بوون. سالا ١٩٩٢ێ گوند هاتە ئاڤاکرن ڤە.

## شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن گرنگ و دیار ل گوندی هەبوونا گەلەك دوورگەهـ انە ل دەردۆر و دناڤ گوندی و ئاڤارێ گوندی دا، وەکی: هەردو دوورگەهـ یێن زەر و رەش ل رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٣کم، بەرێن ڤان دوورگەهـ ا دمەزنن و درێژاهییا هندەك بەران (١م × ٢م) و کێشا

هندەکان ژێ دگەهیتە نێزیکی ٢ تەنان، ئەو دوورگەهـ ٤م د بلندن و (٥-٦م) د فرەهن. دوورگەهـ یێن چەمکا کو ژ پێنج دوورگەهـ ان پێکدهێت، ل باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی و کیلومەترەکێ ژێ د دوورن، دوورگەهـ ا سەر شێخ خالێ و دوورگەهـ ا ملکێ مالا سوفی عەلی و ئیسفێ ئەبابەکری و خالدکێ هنارێ ل رۆژهەلاتا گوندی و ٥٠٠م ژ گوندی د دوورن، ل باکوورێ گوندی (خاری) ژێ دوورگەهـ یێن قەسرکێ کو دو دۆرگەهن هەنە، ئەوژی ٥٠٠م ژ گوندی د دوورن، دوورگەهـ یێن تەحتا عیسای ل رۆژئاڤایی،دوورگەها حەمێ و دوورگەهـ ا مالا سەینێ دکەڤنە دۆرمانێن گوندی، هەروەسا ل گوندی دوورگەهـ یێن بەرکارێ کو حەفت دوورگەهـ یێن ب کۆمن دکەڤنە رۆژئاڤایێ گوندی و کیلومەترەکێ ژ گوندی د دوورن هەنە، دوورگەهـ ا مزەینا کو کۆمەکا دوورگەهـ انە ب دووراتییا ٢کم ل رۆژئاڤایی و دۆرێن ٤٠ دوورگەهـ ان دکەڤنە رۆژئاڤایی ل هنداڤی ئاڤاری و چەلکا سەیدا، لەوما محەمەد ئەمین زەکی د پەرتووکا خۆ دا (کرد وکردستان) دبێژیت: کەلێن هرۆرێ. دیسان کۆمەکا دوورگەهـ ان ل باکوورێ رۆژئاڤایێ گوندی هەنە ب ناڤێ دوورگەهـ یێن پیڤیێ و ڤان هەمی دوورگەهـ ان دیرۆکەکا کەڤنار هەنە.

هەر وەسان کەلا هرۆرێ ل سەرێ کومتەکێ بلند ل باشوورێ رۆژهەلاتی گوندی و ل هنداڤی گوندێ قومریێ ب دووراتییا ٤کم[١٤٦]، کو بەری ١٥٠ سالان دەسەلات ل کەلێ هاتییە کرن و ئێك ژ جهێن ئاسێ یە ل دەڤەرێ، لایێ باکووری کەڤرە سۆرێ هەیە، کو کەڤرەکێ بلند و ئاسێ یە دکەڤیتە باکووری، ژلایێ باشووری ڤە ژێ سەرێ حەمێ یە کو زنجیرە چیایەکێ بلندە[١٤٧].

دیسان کۆمەکا شکەفتان ژێ ل گوندی هەنە مینا: شکەفتا بێ ستوونێ ل باکوورێ رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٣کم، شکەفتە رەشێ ل باکووری ب دووراتییا ٢کم، شکەفتا چەلکێ سپی ل باکووری ب دووراتییا ٧کم و شکەفتا کەلوێ و چەمبلێ و کۆترا ل رۆژهەلاتی ب دووراتییا کیلومەترەکێ،

دیمەنەك ژ دەڤەرا هرۆرێ



شكەفتا مەندكا جهێ سێ تەختان دناڤدا هەنە ل رۆژهەلاتی ب دووراتییا كیلومەترەكێ، شكەفتا خزینكێ ل باشووری ب دووراتییا ٥٠٠م، هەر ل ڤی لای شكەفتێن ئاخا سپی و پەتایی ل باشووری ب دووراتییا ٣٠٠م، شكەفتێن لاتا سێڤ دینكێ و سەر بیشكێ و ئارمانجوكا و بەرماقورێ ل باكوورێ رۆژئاڤایی ب دووراتییا ٣كم، ل باشووری شكەفتا كولكێ برەهیموكا هەیە و ٣كم ژ گوندی یا دوورە، ژبلی چەند شكەفتێن بێ ناڤ.

كونیشك: مینا ناووسكانە ب دەست د كەڤران هاتینە كۆلان، لێ جهێن تەختان تێدا نینن و مینا ڤان ل باكوورێ رۆژهەلاتێ گوندی ل سەر رێكا سەرەكییا دچیتە باكوورێ كوردستانێ و زۆمان، دناڤ گەلیەكی دا كو دبێژنێ گەلیێ دەرارێ ب رێز هەنە.

**هرۆر د دیرۆكێ دا و ئەو هەو و نژدەیێن هاتینە سەر:**

ژ بەر گرنگیا ڤی گوندی ژ لایێ ستراتیژی و ئابووری ڤە دێ بینین ب بوورینا مێژوویێ ب دەهان هێرش هاتینە سەر، وەكی:

١- بەری پەیدابوونا ئیسلامێ خەلكێ گوندی ئایینێ ل سەر ئایینێ مەسیحیەتێ بوون، ب بەلگەیێ هەبوونا گەلەك ناڤێن سریانی.

٢- ل سالا (٢٠مش) ل سەر دەستێ (عەتەبە بن فەرخو) ئەڤ گوندە بۆ ئایینێ موسلمانەتیێ هاتییە ڤەكرن.

٣- ل سەر دەمێ عەباسییان بێ ئێكێ پویتە دایە كەلاێن دەڤەرێ كو دكەڤنە باكوورێ مووسلێ، ژ وان ژی كەلاێن هرۆر و ئامێدیێ.

٤- ل سەر دەمێ عەباسییان پێ دووێ ئەڤ گوندە سەر ب دەولەتا حەمدانیان ڤەبوو و ژ سالا (٢٨٩مش)ێ تا كو سالا (٣٦٨مش) چوویە سەر ب دەولەتا بووەیهیان ڤە[148].

٥- هەوا عەزدولدەولە یێ بووەیهی ب سەركێشیا (ئیبن نەسر خورشید) ل سالا٣٦٧-٣٦٨مش.

زۆزانا هرۆری



٦- پشتی دامەزراندنادەولەتا ئەتابكی ل مووسلێ ل سەر دەستێ (عیمادەددین زەنكی)، ڤی میری دەستێ خۆ دانا سەر دەڤەرێن كوردی و گوندێ هرۆرێ ژی ل سالا (٥٢٨-٦٣١مش) كەتە ژێر دەستێ وان.

٧- هەوا عیمادەددین زەنكی ب سەركێشیا نەسیرەلدین جقر ل سالا (٥٣٧مش/١١٤٢ز) ی.

٨- هەوا قەراجە یێ تركی ل سەردەمێ خونكارێ ئەتابكی (قوتبەدین مودود) ل سالا(٥٤٨/ ١١٥٣ز) ی.

٩- هەوا بەدرەدین لوئلوئەی ل سالا (٦٢٢مش/١٢٢٤ز) ی.

١٠- پشتی دەولەتا عەباسییان ل سەر دەستێ مەغۆلییان ل سالا (٦٥٦مش)ێ روخیای، ل سالا (٦٦٠مش)ێ هرۆرێ كەفتە ژێر دەستێ مەغۆلییان و (عزەددین ئیباغ) سەرپەرشتییا گوندێ هرۆرێ دكر.

١١- هەوێن قەرەقوینلو و ئاق قوینلو.

١٢- پشتی دامەزراندنا دەولەتا مەملوكی ل مسرێ، میرێ هرۆرێ (بەهائەددین حەسەن بن عیمادەددین) پەیوەندیێن سیاسی و ئابووری دگەل مسرێ هەبوون.

١٣- ل سەر دەمێ ئوسمانییان گوندێ هرۆرێ ببوو سنجەق، ئانكە مەلبەندێ دەڤەرا بەرواری بالا.

١٤- هرۆرێ تووشی هەوا سەركردەكێ مووسلێ یێ ئوسمانی ب ناڤێ (محەمەد پاشا ئاینجە بیرەقدار)، یێ ناڤدار ب (گەمارمەز)ببوو.

١٥- ل سالا (١٨٢٨-١٨٢٩)ێ شێخ محەمەدێ هرۆری دگەل شێخ یوسفێ زاخۆیی و بەدرخان بەگ پشكداری (قولپا پیرۆز) ببوون ب مەرەما بەرەڤانیكرنێ ژ كورد و كوردستانێ.

١٦- دو هەوێن تیارییان ل سالێن (١٩٠٥ و ١٩١٤)ێ كو تێدا سەركردەكێ ب ناڤ دەنگ ب ناڤێ (بیج بیجو) هاتە كوشتن، و (سەعید بەگ بەرواری) ژی تێدا هاتە كوشتن.

١٧- ل سالا ١٩١٣ێ دەمێ خەلكێ گوندی قەستا زۆما كری، ئاگر ب شاشی ڤە ژ دەستێ كەسەكێ سەقەت ب ناڤێ (سالمێ لەنگ) كو نەشیای بچیت دەركەت و گوند هاتە سۆتن.

١٨- خەلكێ هرۆری پشكداری ب نێزیكی ١٥ زەلامان د سەرهلدانا سالا (١٩١٩)ێ ل ئامێدیێ كربوو.

١٩- هەوێن عەشیرەتا گۆیان (هەدریشییان) ل سالا ١٩٥١ێ.

و هەوا درندانەیا حوكمەتا عیراقێ ل پشتی سالا ١٩٧٥ێ[١٤٩].

## كانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

كانیێن گوندی: گوند ب هەبوونا ژێدەرێن ئاڤێ و كانییان یێ ب ناڤ و دەنگە، و مرۆڤ دشێت كانیێن وێ بكەتە سێ پشك:

**پشكا ئێكێ:** سەروكانی (ڕوی)، پێكدهێت ژ (كانییا نزاری، كانییا بەرۆژی، كانییا بن هەژیرێ كو ژێدەرێ ئاڤا گوندی یە، دبن ڤان كانییان دا و هەر ل سەر رووباری كانییا بن تویێت وەقفێ، ل خارتر كانییا رەشێ كو بەری چەند سالان ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، د سەر گەرا بەرخادا، كانییا حەجی عەلی و گەلەكێن دی.

**پشكا دووێ:** گلالەی، كانیێن دەوروبەرێن گوندی: كانییا بەرچەلێ (بەردەراڤی) كو ژێدەرێ ئاڤا كەلا هرۆرێ بوو، كانی گوهشك، كانییا عنكێلێ (بركا گەبالا)، كانیكا بەهەشتێ، كانیكێت سەروكانییا گلالەی، كانییا ملا زەر، ئیسكوركی، بێدەرا. پشتی ئەڤ هەردو پشكە دگەهنە ئێك و دبیتە رووبارەك، چەند كانیێن دی ژی دهێنە سەر، وەكی كانییا مەلا سەلیمی، كانییا نورینا عەلوی، نورینا بەهائەددینی، نۆرینا محێ، كانییا عەین ئەلتاوا، كانییا جەم داودی، كانییا ئۆسێ پیروی، كانییا مویسكوڕا، كانییا مەلا عەبێ، كانییا حەمیدێ حەسێ.

**پشكا سێێ:** كانیێت زۆما: كانییا ناڤا مێرگا، كانییا بن بەری، كانییا ژنا، كانییا مێرا، كانییا مالا ئومەرا، كانییا سەی، ئاقدێ، كانییا حەجی محەمەد

عەلی، كانییا قەبلانی، كانییا بنێ گرێ واری، بیرا (جەلالێ) كەرمەرانێ، كانییا بێلمبیرێ، سەرۆخكی، كانییا بیڤیێ[150].

هەلبەت ژبلی چەندین كانییێن دی ل جهێن جۆرا و جۆر یێن گوندی، وەكی: عەینلبۆق و زەلیخێ و كانییا زیركی (كانییا گلگلەی) كانییا دار بلندی و هشكە مێرگا ل گێمێ و دەرار كو دكەڤنە رۆژهەلاتی گوندی ب دووراتییا (٦كم)، و و خالیسی، دیسان كانییێن كانی رێلك و بەردەراڤێ دولا پارزا و بن مناسبی دكەڤنە باشووری رۆژهەلاتی و كانییێن مالا دامرێ و حەسەنێ عەلی بابەكرا و محێ و گیبەیێ بچووك و مەزن دكەڤنە باكووری رۆژهەلاتی ب دووراتییا ٢٠٠م. هەروەسا دنسەی و نۆرین دكەڤنە رۆژئاڤایی ب دووراتییا ٥٠٠ م، كانییا مالا رەجەبی و محەمەدێ خامێ و پركا داری و سەلیم حەمێ و خالدێ زاهری و دكەڤنە رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا كیلومەترەكێ، كانییا بیشكێ و میشكێ و ئارمانجوكا و سەریۆتا و بەرماقورێ و دەراڤێ فەلەی كیلومەترەكێ ژ گوندی د دوورن.

## زۆمێن گوندی:

چەند زۆم ل گوندی هەنە وەكی: زۆما بێلمبیرێ ل باكووری رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ١٥ كم، زۆما كەرمەران ل ژووریێ گوندی ب دووراتییا ١٥كم و زۆما دەرارێ و واری (وارێ میری یان شێخی) و كانییا بن بەری كو ئەڤ هەرسێ دكەڤنە رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٥كم و نێزیكی ١,٥دەمژمێرا ب پیان.

ل ڤی گوندی چەندین جاران خواندنگەهـ هاتییە ڤەكرن و گرتن ڤە، بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٣١-١٩٣٢)ێ هاتە ڤەكرن و بۆ دەمێ سێ سالا ڤەكێشا. بۆ جارا دووێ ل سالا (١٩٥١-١٩٥٢)ێ هاتە ڤەكرن و (٥٢) خویندكار بخۆڤە دگرتن، لێ دگەل دەستپێكا شۆرشا ئەیلۆلێ ل سالا (١٩٦١)ێ هاتە دائێخستن ڤە. بۆ جارا سیێ ژی ل سالا (١٩٦٧-١٩٦٨)ێ ب زمانێ كوردی هاتە ڤەكرن تا گوند ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە وێرانكرن و داوی جار ژی پشتی سەهلدانێ بوو كو ل ١٩٩٢/٩/٢٨ێ هاتییە ڤەكرن و ل سالا ٢٠٠٧ێ ١٠٠ خویندكاران لێ دخواند[151].

ل سالا ١٩٥٩ێ بۆ یەكەم جار بنكەهێ ساخلەمیێ لێ هاتەڤەكرن و لسالا ١٩٧٦ێ مەخفەرەكا پۆلیسان.

ژیانا خەلكێ گوندی باراپتر ل سەر چاندنێ یە و هـرۆرێ یا ب ناڤ و دەنگە ب فێقی و گەلەك دەرامەتێن دی یێن چاندنێ، ب تایبەتی هنار و هژیر و جۆرێن تری و گویز و سپیندار و ...هتد، هەروەسان تەرش و كەوال و مێشا هنگڤینی ژی لێ دهێتە ب خودانكرن و چیایێ وێ جۆرێن گیایێن سرۆشتی لێ هەنە كو مفا ژێ دهاتە وەرگرتن، مینا گهیشك و مازوی كەزان و بێمك و سترك و سوریاز و لیش و رێڤاز و كەنگر و سێبسك و چەڤر و ...هتد و چونكی گوندەكێ سنووری یە، بازرگانی ژی دگەل لایێ دی یێ سنووری دهاتەكرن[152].

## گوندێ هێسێ:

هێسێ ب دووریا ١٦كم دكەڤیتە باشوورێ كانی ماسێ. دیرۆكا ئاڤا بوونا گوندی بۆ ١١ بابكان ڤەدگەریت.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی**، گوندێن تروانش و بیكداودا.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ خرابەی و شێلازا.

**باكووری**، چیایێ گابنێركی و گوندێ شمابلا.

**باشووری**، زنجیرا چیایێ مەتینا و چارچەلی.

## پێكهاتا گوندی:

بنەمالێن گوندی ئەڤەنە: بنەمالا هورمز، بنەمالا یووانس، بنەمالا ئەیار، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٩٤ كەس بوون[153] و نها ژمارا خێزانێن وان دگەهنە نێزیكی ٣٥٠ سەر خێزانان، لێ كەس ل سەر گوندی ناژیت و ب تنێ ل هاڤینێ ملكی شین دكەن.

سالا ١٩٦١ێ گوند هاتە سۆتن و خەلکی گوندی دەربەدەربوون، سالا ١٩٧٠ێ گوند ئاڤاکرن و ل سالا ١٩٧٨ێ گوند هاتە سۆتن. پشتی ل سالێن هەشتیان گوند هاتیە ئاڤاکرن ڤە، جارەکادی ل هەوا ئەنفالان ب بومبێن کیمیاوی هاتە بومبەبارانکرن و زیان گەهاندنە خەلکێ گوندی، سالا ١٩٩٢ێ گوند هاتە ئاڤاکرن و چەند خانی دگەل دێرەکێ هاتینە چێکرن.

### شوینوارێن گوندی:

ل گوندی دو دێرێن گەلەك کەڤنار ب ناڤێن (رەبن پسیو) و دێرا (مار گورگیس) هەنە، دیسان ل دۆرمانێن گوندی گەلەك گۆرستانێن کەڤنار ژی هەنە.

### شکەفتێن گوندی:

ل باکوورێ گوندی ب دووراتییا ٢٠٠م شکەفتا (ئیخیزایێ) هەیە، ئەو شکەفت وەکی ژوورەکێ یە و جهێ ١٠ مرۆڤێن روینشتی تێدا هەیە، شکەفتا کوناڤێ ئەوژی شکەفتەکا مەزنە ل باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی ب دووراتییا ٥٠٠م.

### کانییێن گوندی:

ل گوندی چەند کانی هەنە وەکی: کانی رەشێ ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا ٢کم، کانییا خیزی ل باشووری ب دووراتییا ٢کم، و کانییا زەنگ دناڤا گوندیدا[١٥٤].

## گوندێ ئاسهێ:

گوندەکێ کەڤنارە، ب دووراتییا ٢٢کم دکەڤیتە باشوورێ کانی ماسێ. ناڤێ گوندی ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی ژ ئاسنی هاتییە، ژبەر کو مادێ ئاسنی و شوینوارێن ٩ کویرهان ل دۆرمانێن گوندی هەنە، دیرۆکا وان وەکی وان ژ بابکالان هاتییە بهیستن ڤەدگەریێتەڤە بۆ بەری ٢٠٠ سالان. خەلکێ گوندی ژ گوندێ بەنانێ ژ دەڤەرا شەمدینان ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە و گوند ئاڤاکرینە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زڤنگێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زەکەریایە کو خرابە گوندە.

**باکووری:** زنجیرە چیایێ گابنێرکی و گوندێ راڤینا.

**باشووری:** گوندێ خانکێ.

### پێکهاتا گوندی:

چەند بنەمال ل گوندی هەنە، وەکی: بنەمالا محەمەدێ ئەحمێ (کو بنەمالەکا کەڤنە ل گوندی)، بنەمالا رەندێ (ژ راڤینا هاتینە)، بنەمالا حەمێ سەعیدی (ژناڤ گولیا هاتینە)، بنەمالا بەگا (ژ گوندێ شێلازا هاتینە)، بنەمالا محەمەدێ بروی (ژ بەنانێ ژ شەمدینا هاتینە)، بنەمالا حەمێ مێردینێ (ژ گوندێ مێردینا رۆژهەلاتێ شێلازا هاتینە)، بنەمالا ئوسمانی (ژ گوندێ قەسرکێ هاتینە)، سەرجەمێ خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٥٤ کەس بوون[١٥٥] و نها دبنە ٣٠٠ خێزان، ٣٥ ژ وان ل گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەرڤەی وەلاتی.

گوندێ ئاسهێ ل سالا ١٩٨٨ێ کەتە بەر هەوا ئەنفالان و خەلکێ گوندی ئاوارەی ترکیا و ئیرانێ بوون، سالا ١٩٩٢ێ جارەکادی هندەك ژخەلکێ گوندی ڤەگەریاینە سەر گوندی و گوند هەر ل جهێ کەڤن ئاڤاکرینە. خواندنگەهەك ژی پشتی گوند هاتییە ئاڤاکرن ل سالا ١٩٩٣ێ بۆ هاتییە ڤەکرن.

### شوینوارێن گوندی:

کاڤلە گوندەکێ کەڤن ب ناڤێ زرافکا ل باکوورێ رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ٢کم هەیە، ل رۆژهەلاتێ گوندی ژی کاڤلە گوندەك ب ناڤێ کانی بهارێ ب دووراتییا ١,٥کم هەیە، و نها ژی گەلەك د دیار و بەرچاڤن.

### شکەفتێن گوندی:

ل گوندی شکەفتێن پحەمەد رەندا ل باکوورێ

گوندی ب دووراتییا ١,٥کم هەنە، کو دو شکەفتێن مەزنن و تێدا جهێ پتری ٢٠ مرۆڤان هەیە، دەرگەهێ وان یێ بچووک و بلندە و مرۆڤ ب زۆری دشێت بچیتە ژوور و دناڤدا دفرەهن. دیسان ناووسکا بەرێ لەهەندکێ ل باکوورێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ هەیە و جهێ دو مرۆڤان تێڤە دکەت.

ل گوندی ب تنێ کانییەکا ئاڤێ ب ناڤێ کانییا گوندێ ئاسهێ ل سەراڤا گوندی هەیە و ئەڤ گوندە یێ بناڤ و دەنگە ب جۆت و کێلانێ و کەزان و رەزان.

ل گوندی جەبارەك بناڤێ محەمەد سەلیم حەمید هەبوو، نها کورێ وی سەعید وی کاری دکەت[156].

## گوندێ ئاڤ سارکێ:

گوندێ ئاڤ سارکێ ب دووریبا ١٠کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ، ل گوندی کانیێن سار و تەزی هەنە لەورا ب ئاڤا سار هاتییە ب ناڤکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ زێیی.

**باشووری:** زنجیرە چیایێ مەتینا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بالۆکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کری.

گوند ژ دو بنەمالان پێکدهێت، ئەو ژی بنەمالا سمایلێ زێرێ و بنەمالا حەسێ، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان[157] و نها ژمارا وان دبنە ٧٠ سەرۆك خێزان.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩٧٨ێ ژلایێ عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن، سالێن ١٩٨٣-١٩٨٤ ێ هاتە ئاڤاکرن ڤە، سالا ١٩٨٨ێ هاتە ئەنفالکرن و جارەکادی ل سالا ١٩٩٣ێ هاتییە ئاڤاکرن، نها چەند مالەکێن کێم لێ دژین.

ل گوندی شوینوارێ دێرەکا کەڤنار هەیە و هێشتا هندەك ژ دیوارێن وێ د دروستن، هندەك ژ بەرێن وێ نەهـ بهۆستان د درێژن و پێنج بهۆستان د بلندن.

ژ شکەفتێن گوندی: شکەفتا فەلەی ل ژێریێ گوندی ب دووراتییا ٤کم، هەروەسا هندەك شکەفتێن بچووك ل دۆرمانێن گوندی هەنە.

ژ کانیێن گوندی ژی: ل گوندی کانیێن گیزا و سرکێ و کانییا بریما ل دۆرمانێن گوندی و نێزیکی هەنە.

هەروەسا زۆما گوندی ب ناڤێ شیرستانێ ل باشوورێ گوندی ب دووراتییا ٤ کم هەیە[158].

## گوندێ ئەدنێ:

گوندێ ئەدنێ وەکی ژ شوینواران ژی دیار گوندەکێ کەڤنارە، ب دووراتییا ٢٥کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسێ. ناڤێ گوندی وەکی دهێتە گۆتن ژ (جنات عدن) هاتییە و دبێژن ل سالا ١٧مش ل دەمێ لەشکەرێ موسلمانان ب سەرۆکاتییا عەبدولایێ کورێ عومەرێ کورێ خەتابی هێرش هینایە سەر دەڤەرا بەرواریبا خەلکێ وی شەرەکێ مەزن دگەل وان دا کر و ٤٥ موسلمان تێدا هاتنە کوشتن، لەوما ئەدنێ ب گوندێ شەهیدێن موسلمانان هاتییە نیاسین. یان ژی دبێژن ئەدنێ ب رامانا بەهەشتێ هاتییە ناڤکرن و جهەکێ چیایی و تێر ئاڤە، لەوما دبێژن وی جهی بیرا ئەسحابییان هینا دەما پێغەمبەری بۆ وان سالۆخەتێن بەهەشتێ کری و وان وەسان هزرکر ئەڤە ئەو بەهەشتە یا پێغەمبەری بۆ وان سالۆخەت دای.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی سارکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن تشێشێ و قومریێ.

**باکووری:** گوندێن سەرەڕو و دێشیشێ.

**باشووری:** گوندی دەرگەلکا سەیدا.

### پێکهاتا گوندی:

ئیجاخێن گوندی: مالا دەرێ نـــالێ، مالا براهیمێ محێ، مالا جەمێ، مالا فەقەی، مالا خدری، مالا مەلای، مالێن سەیدا، مالا حەجی عبدالغنی، مالا ئەسمەر، مالا پیرمیسی، مالا مەلا عبداللە. ژمارا

خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٨ کەس بوون[١٥٩] و نها ١٢٠ خێزانن، ٤٥ خێزان ژێ ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەها دهۆکێ. ئەدنێ سالا ١٩٧٨ێ ژ لایێ عیراقێ ڤە هاتییە کاڤلکرن و خەلکێ گوندی دەربەدەربوون.

## شوینوارێن گوندی:

وەکی دهێتە ڤەگێران ئەدنێ د کەڤندا باژێرەك بوویە و حوکمێ خۆ ل دەورو بەرێن خۆ کرییە، ژلایێ سەربازی ڤە یا ئاسێ یە و هەتا نها ژی شوینوارێن وان د رەوشەکا باش دانە و نەهاتییە زانین کا دیرۆکا ڤان شوینواران بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەرن، ژ ڤان شوینواران:

**کەلا:** کەلا ل سەرێ کوکەلەی کو دبێژنێ (کوکەلێ دێرێ)، کەلا سەرێ لاتا، کەلا بەرێ کەلێ، کەلا لاتا فەلەی، کەلا سەربانکی.

**دوورگەهـ** ژبۆ زێرەڤانیێ گوند ب دوورگەهـ ان هاتییە دۆرپێچکرن، ب شێوەیەکی هاتینە ئاڤاکرن کو ئێك بلند و ئێك نزم.

**ئاشێن ئاڤێ:** ل گوندی ژ ( ٦- ٧) شوینوارێن ئاشا هەنە.

## جووێن ئاڤێ وسولین ل گەلیێ ئەدنێ:

شوینوارێن دو جووێن مەزن ل گوندی هەنە کو ب کەڤرێڤە هاتینە دروستکرن و ب بەران و کسلێ هاتییە ئاڤاکرن، دبێژنێ جووا جەمبی و سولینەك ل بەرۆژێ گوندی بن ئاخ هەیە و جووەك دی ل کەڤرۆکێن پشتا گوندی هەیە.

## گۆڕستان:

ل ڤی گوندی شەش گۆڕستانێن نە نیاس هەنە و ژ کێلیان دیارە کو دیرۆکا وان دزڤریتە ڤە سەردەمێن کەڤنار، چونکی وان مرییێن خۆ د سۆتن و هەستی د کرنە دجەرکان دا.

شکەفت و ناووسك: ل دۆرێن گوندی گەلەك شکەفت و ناووسکێن کەڤنار ژی هەنە، وەکی شکەفتا کەنیسێ،شکەفتا زنگ زنگێ، شکەفتا خەلوێ و... .

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی گەلەك ژێدەرێن ئاڤێ و سیلاڤێن جوان مینا سیڤا (کانییا تا) لێ هەیە کو جهەکێ گوزاری یە.

گوندێ ئەدنێ زەنگینترین گوندە ل دەڤەرێ ب هەبوونا ژێدەرێن ئاڤێ و نێزیکی (٤٠) کانییان لێ هەنە، هەمی دچنە سەرێك و دبنە رووبارەکێ مەزن، و ئاڤا وی ئاڤارێ نەهـ گوندێن دی ژی پێ ئاڤددەن، ژ کانییێن ب ناڤ و دەنگ ل گوندی: کانییا شکەفتێ، کانییا تا، کانییا شەهیدان، کانییا زاڤا، کانییا جەمبی. گوند ب هەبوونا سیڤ و گویزان ژی ب ناڤ و دەنگە.

گوندێ ئەدنێ



خواندنگەهـ ژی پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن ل سالا ٢٠١٠ێ بۆ هاتییە ڤەكرن. نها پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتینە دروستكرن و كارەب ژی ل سالا ٢٠١١ێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان(١٦٠).

## گوندێ ئەلكیشكێ:

گوندێ ئەلكیشكێ ب دووراتییا ١٥كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسی و ٢كم ژ جادا سەرەكییا دچیتە ناحیێ دوورە. گوند یێ مەسیحییان بوو، ب بوورینا سالان ناڤ هاتییە گوهارتن، ناڤێ باژێركێ ئەلكیشێ ژ ڤی گوندی هاتییە، نها خۆجهێن گوندی موسلمانن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باتیفا سەیدا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن بێڤولكێ و دەرگەلا سەیدا.

**باكووری:** گوندێن تویلەرێ و كانی سارکێ.

**باشووری:** گوندێن میسكا و دەرگەلێ.

ل دووڤ گۆتنا خەلكێ گوندی بەری نێزیكی ٢٠٠ سالان یێ هاتییە ئاڤاكرن و خەلكێ وی یێ ژ گوندێ وەستانێ ل باكوورێ كوردستانێ هاتین، ل دەستپێكێ گوند ل مێرگا دركێ هاتبوو ئاڤاكرن، ل دووڤدا هاتن گوندێ ئەلكیشكێ ئاڤاكرن. گوند ل سالا ١٩٨٨ێ هاتە سۆتن وخەلكێ گوندی ئاوارەی تركیا بوون، سالا ١٩٩٢ێ جارەكادی گوند ل جهێ كەڤن ئاڤاكرن و خواندنگەهەك ژی ل سالا ١٩٩٣ێ لێ هاتە ڤەكرن.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ سێ بنەمالان پێكدهێت: بنەمالا محەمەدێ پیرمیسی، بنەمالا ئەحمەدێ عەیشێ، بنەمالا عەبدلایێ شەمسێ، تێكدا ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٨ كەس بوون(١٦١) و نها دبنە ٢٠٠ خێزان، كو ٣٥ ژوان ل گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ.

### شوینوارێن گوندی:

چەند شوینوار ل گوندی هەنە وەكی: شكەفتا عەلێ ل رۆژ ئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ١كم، ناووسكێن ئاستەنگێ ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا ٢كم، د وان ناووسكا دا جهێ نڤستنێ و روینشتنێ بۆ سێ كەسان هەیە، ل رۆژ ئاڤایێ گوندی ژی جۆیەك ب كسل و كێنچێ هاتییە چێكرن و ٣كم ژ گوندی یا دوورە.

ل گوندی كانی ژی هەنە وەكی: كانییا ستێرێ ل نیڤا گوندی، كانییا بن گێزێ، كانییا بركا مەرعانی كو دكەڤنە رۆژ ئاڤا و باكوورێ گوندی(١٦٢).

## گوندێ ئۆرە:

ئۆرە گوندەكێ بەفرینە دكەڤیتە دناڤبەرا دو گەلیاندا، ئەوژی گەلیێ كونبەفرێ و گەلیێ خانێ نە، ب دووراتییا ٢٠كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ. ناڤێ گوندێ ل دووڤ گوتنا خەلكێ وی ژ وار هاتییە، كو پەیڤا ئور ل سەر دەمێ سۆمەریان ب واتایا (وار) بكارهاتییە، كو ناڤێ پایتەختێ سۆمەریان ژی (ئور) بوویە. گوندی وەسا ددەنە خویاكرن گوندەكێ هندی بێژی كەڤنە بەلێ ب دروستی كەڤناتییا وی نەهاتییە زانین.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوند هەڤ سنوورە دگەل باكوورێ كوردستانێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن هرور و دێشێشێ.

**باشوورێ رۆژهەلاتی:** گوندێ بێدوهێ.

**باكووری:** هەڤسنوورە دگەل باكوورێ كوردستانێ و گوندێن ئاشیتێ و ئاروشێ.

**باشووری:** گوندێن هەدێنە و بناڤیێ و سەرەرو.

### پێكهاتا گوندی:

گوندێ ئۆرە ژ بنەمالێن: بنەمالا غازی، بنەمالا سالێ، بنەمالا ئالی، بنەمالا مەرعان، بنەمالا چەلیا،

بنەمالا هەمێ پێكدهێت، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٨٠ كەس بوون[١٦٣] و نها تێكدا نێزیكی ٦٠٠ سەرخێزانانە.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩٧٦ێ هاتییە سۆتن، سالا ١٩٨٢ێ هاتە ئاڤاكرن ڤە و ل دووڤدا ل سالا ١٩٨٨ێ د هەوا ئەنفالاندا هاتە سۆتن ڤە و خەلكێ گوندی ئاوارەی تركیا بوون، سالا ١٩٩٢ێ گوندی زڤرینە سەر گوندی و گوند ل جهەكێ دی ب ناڤێ بەستێ ب دووراتییا كیلومەكێ ل ژێریێ جهێ كەڤن ئاڤاكرن، سالا ١٩٩٥ێ گوند جارەكادی ژبەر كاودانێ ناڤخۆیی هاتە كاڤلكرن، سالا ٢٠٠٠ێ هاتە ئاڤاكرن و چەند خێزانەكێن كێم بۆ كارێن بازرگانیێ دمینینە ل گوندی.

**شوینوارێن گوندی:**

ل باشوورێ گوندی ب دووراتییا كیلومەترەكێ دۆرگەهەكا وەكی ئاڤاهییەكێ مەزن هەیە و ل سەر رووبەرەكێ بەرفرەهـ هاتییە چێكرن. كەلا تی حسارێ ب دووراتییا ٣كم دكەڤیتە ژووریێ رۆژئاڤایێ گوندی، كەلا بنیامێ ب تنێ دیوارێن وێ ماینە و گەلەك پارچەیێن وێ خراب بووینە، دكەڤیتە ژووریێ رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ٣كم. دناڤبەرا كەلا تی حسارێ و كەلا بنیامێ گرەك هەیە بناڤێ (كون توتیا)، ئەو كون ب دەست هاتییە كۆلان و ئاخا وێ بۆ دەرخستنا هندەك كانزایان دهاتە بكارئینان.

گەلیێ خانێ ژی ئێكە ژ جهێن شوینواری و ل سەرێ گەلی دیوارەكێ مەزن هەیە، ئەو گەلی ب ناڤێ گەلیێ خانی هاتە ب ناڤكرن، ل دووڤ ڤەگێرانێن خەلكێ دەڤەرێ وەسا ددەنە خویاكرن كو ئەڤ دیوارە ب ناڤێ خانێ لەپ زێرین هاتییە ب ناڤكرن و خانێ لەپ زێرین ژ ڤێ دەڤەرێ چوویە رۆژهەلاتێ كوردستانێ و ل دووڤ گۆتنا بابكالێن وان بنەمالەك ل گوندی هەیە خانێ موكری ب باپیرێ خۆ دزانن.

**مەزارێن گوندی:**

ل دەوروبەرێن گوندی ٦ مەزار هەنە: مەزارێ شەهیدی، مەزارێ شێخ مەرعان، مەزارێ سەید داود، مەزارێ شێخ میرزا، مەزارێ نالێ، مەزارێ گركێ چەرمینێ، (چەرمین) گیایەكە دكەلینن، مرۆڤ دچیتە دناڤ ئاڤاوێدا و بۆ ئێشا گەلەكا باشە.

**گۆڕستانێن گوندی:**

ل گوندی كۆمەكا گۆرستانان ژی هەنە، ژ وانان: گورێن ئەلمانا " ل دووڤ گوتنا گوندیان كو ئەلمان هۆزەكا ئێزدی بووینە" ئەڤ گۆڕستانە دكەڤیتە باكوورێ گوندی ب دووراتییا ٥ كم، بەرامبەر وێ زیارەتێن میرا هەنە، كو ئەو ژی گۆڕستانەكا كەڤنە. هەردو گۆڕستانێن ئەلمان و میرا بێن ئێك هۆزن.

**شكەفتێن گوندی:**

ژ شكەفتێن گوندی ژی: ل گوندی شكەفتا گەلی هەیە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا ٣كم، و شكەفتا خالەمەدی ب دووراتییا ٣كم ل رۆژئاڤایێ گوندی.

ل گوندی كۆمەكا (كون)ان هەنە، وەكی كون بەفرێ و كون ڤاقیشك و كون توتیا و كون زرزرك، هەمی دكەڤنە دووراتییا (٣-٥)كم ل رۆژئاڤایێ گوندی و هندەك ژ وان كونان گەلەك دكوورن و دەرێ وان یێ تەنگە.

**كانییێن گوندی:**

ژ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤایی كۆمەكا كانییان ب دووراتییا ٢كم ژ گوندی هەنە: وەكی كانییا سەرمێرگێ، كانییا دەحلی، كانی هویرك، كانییا مەمێ، سەرۆكانییا گوندی، كانییا بیاوەركا، كانییێن بنوی، كانییا میر درێژ، كانییا كیزی، كانییا مێردەواس.

ژ گوندی بەرەڤ باكووری ژی ب دووراتییا ٢كم ئەڤ كانیە هەنە: كانییا جالێ، كانییا بەرێ ئاخین، كانییا بەرێ شین، ئاخا رەش، كانییا تەڤ زێنێ و كانییا زلكێتكێ.

هەروەسا كانییێن زۆما ئۆرە وگوریكێ كۆمەكا كانییانە، كانییا شڤانا و كانییا كیكەلا و دەراڤێ

قەرێ و دەراڤێ گلو، ئەڤەژی دکەڤنە ژوورێ گوندی. ژ بلی دو رووبار ژی ل گوندی هەنە، رووبارێ گەلیێ خانێ و رووبارێ گەلیێ کونبەفرێ، هەردو ل ژوورێ رۆژئاڤایی دهێن و ل بەستێ دگەهنە ئێك.

زۆزان ژی ل ڤی گوندی ب دووراتییا ٥کم ژ ژوورێ گوندی وەکی زۆزانا کیکەلا هەنە.

ل ڤی گوندی نەریتەکێ سالانە هەیە، هەر سال خەلکێ وی کون بەفرەکێ ب دووراتییا ٣کم ل رۆژئاڤایێ گوندی ب بەفرێ دادگرن.

گوند ب هنگڤینی و پتات و گویزا و تووتنێ و سێڤا ب ناڤ و دەنگە[١٦٤].

## گوندێ ئۆرمانا:

گوند ب دووراتییا ٨کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ کانی ماسی ل سەر رێکا گشتییا دچیتە ناحیێ.

گوندی وەسا خویادکەن کو بنەمالێن ڤی گوندی بەری چەندین سالان ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە و دەمێ ئۆرمانا و دار و بار دیتین لێ ئاکنجی بوون.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئورمەداودا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ راڤینا.

**باکووری:** گوندێن بناڤێ و هەدێنە.

**باشووری:** چیا گابنێرکی و گوندێ ئاسهێ.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ بنەمالە ل گوندی هەبوون:

بنەمالا مەحمیدی، بنەمالا قتاسی، بنەمالا مستێ، بنەمالا تەتەری، بنەمالا حەجی، بنەمالا سەیدێ، بنەمالا ئومەری، بنەمالا حەمرەشی، بنەمالا ژووری، بنەمالا خەلیلی، بنەمالا سەیدێ مهاجر، بنەمالا مالا مەلا، بنەمالا ئەلماسێ. ژمارا خەلکێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣١٤ کەس بوون[١٦٥] و نها دبنە نێزیکی ٩٠٠ خێزانان، ژوانان ٢٥ خێزان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل دهۆك و زاخۆ و دەرکارێ و دەرڤەی وەلاتی.

گوندێ ئۆرمانا یێ کەڤن



گوند سالا ۱۹۷۹ێ هاتییە خرابكرن و خەلكێ وی ئاوارەی كۆمەلگەهان بوون، سالا ۱۹۹۲ێ جارەكادی ل سەر جادا سەركیبا دچیتە كانی ماسێ هاتە ئاڤاكرن ڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوارێن ل گوندی هەنە، وەكی: بەرێ بویكا (وەكی كەڤنە باوەری وەسا ڤەدگێرن كو دەمێ دو داوەت د ئێك دەمدا هاتینە كرن و هەردو داوەت ل جهەكێ تەنگدا ل گابنێركی گەهشتینە ئێك خودێ خفس لێكر و هەموو بوونە بەر)، منا كافری، كەڤرێ ئاری، كونا هنگڤینی، قەسرا میر شەرەف دكەڤنە باكوور و باشوورێ گوندی، ل گوندی دوورگەهـ ژی هەنە ب دووراتییا ۲كم ل ژێریێ گوندی.

**شكەفتێن گوندی:**

گوندێ ئۆرمانا گەلەك شكەفت لێ هەنە، وەكی: شكەفتا پیرێ، شكەفتا سەلیمێ عەیشێ، شكەفتا شیڤا هەوا. ئەڤ شكەفتە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و بارزانی ل شورەشا ئەیلولێ تا ئێڤاری مایە ل وێ شكەفتێ، و ل ئێڤارێ چوو مالا حەجی عەبدولای و بارزانی گۆتبوو وان: ئەم دێ چینە سوریێ، لێ ژنا ئۆرمانی مریەمێ گۆتە بارزانی كوردا ب تنێ نەهێلن و بلا بەرێ سالەكێ پێن ژنێن كورد بۆ كوردستانێ بیت، دەمێ بارزانی ئەڤ گوتنە گولێ بووی گۆت سۆز بیت ئەم كوردستانێ نەهێلین.

ژیانا گوندییا: ژ بلی چاندنێ و خودانكرنا پەزی خەلكێ گوندی كاروان دكرن، كەزان و مێویژ و مازوی دبرنە بازێران و كەل و پەلێن خوارنێ پێشڤە د كرین. ئەڤ گوندە ب هەبوونا مێویژ و كەزانان یێ ب ناڤ و دەنگە ژمارەكا مشە یا بنێن كەزانا لێ هەنە و دبەرێدا ژیارا وان ل سەر كەزانا ژی بوو.

خواندنگەهـ ژی پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن ل سالا ۲۰۰۱ێ بۆ هاتییە ڤەكرن. هەروەسان مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤێ ژی بۆ هاتینە چێكرن[١٦٦].

## گوندێ ئۆرمەداودا:

گوندێ ئۆرمەداودا د كەڤیتە سەر رێكا سەرەكیبا دچیتە كانی ماسێ ب دووراتییا ٥كم ژ باشوورێ رۆژئاڤایێ ناحیێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن مایێ و بناڤیێ.

**باشووری:** چیایێ گابنێركی و گوندێن ئێكمالێ و هێسێ و شێلازا.

**رۆژهەلاتی:** چیاكێ باروخێ و گوندێن دێریشكێ و كانی ماسێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن ئۆرمانا و راڤینا.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ سێ بنەمالان پێكدهێت: بنەمالا لەشكری، بنەمالا رەجەبی، بنەمالا فەق سەلیمی، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (۱۹٥۷)ێ ۱٦۳ كەس بوون[١٦٧] و نها دبنە نێزیكی ۱٤۰ سەرخێزان، ل دهۆك و زاخۆ و هندەك ژی ل دەرڤەی وەلاتی دژین.

بۆ جارا ئێكێ گوند سالا ۱۹۱۹ێ هاتییە سۆتن و گوند هاتییە بەردان، پاشان هاتییە ئاڤاكرن، سالا ۱۹۷۸ێ جارەكادی گوند هاتییە سۆتن و خەلكێ وی دەربەدەر بووینە كۆمەلگەهان، پشتی چەند سالەكان هاتییە ئاڤاكرن، سالا ۱۹۸۸ێ گوند كەفتە بەر لێمشتا ئەنفالان و هاتە كاڤلكرن و خەلكێ گوندی ئاوارەی تركیا بوون، سالا ۱۹۹۱ێ جارەكادی هاتە ئاڤاكرن ڤە، لێ نها چ خێزان ل گوندی ناژین.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوارێن كەڤن لێ هەنە، وەكی: كەلا باروخێ ب دووراتییا كیلومەترەكێ ل رۆژهەلاتی گوندی، كو كەلایەكا بلندە و یا زالە ل سەر گەلەك جهان، جونیێ كافری كو پتر ژ ۲م یێ بلندە، د

کەڤیتە دووراتییا ٦٠٠م ل ژێرێ گوندی، بەرکێ خزینێ ل رۆژئاڤایێ گوندی، دیسان سەر کاڤلا و ملا سێڤێ و مەخەلا قەندوی و قەسرا شەرەف ل رۆژهەلاتێ گوندی، هەروەسان شوینوارێن سەرێ گری و کانییا خەلایێ ل باشوورێ گوندی، ب دووراتییا دۆرێن (١-٢کم) ژ گوندی و کۆمەکا گۆڕستانێن کەڤن هەنە مینا: گۆڕستانێن گوندی و پشت گوندی و گۆڕستانا رۆژئاڤایێ گوندی و بەیارکێ و تربا و گۆڕستانا چل قەدەری و گۆڕستانا چالیا و بەرێ ئیسلێ کو ل بەرێ بۆ پەرچڤاندنا تری دهاتە بکارهینان، فرەهییا وی نێزیکی (٧-٨م)انە.

## جهێن ناڤدار ل گوندی:

وەکی: دەرێ بەر ئاشێ، پایێسیی، دەرهچکی، کەڤرێ سۆر، دەریکێ گورگا، تەکا کێری "دارا کێری"، شکێرێ عەلی مەلا.

## شکەفتێن گوندی:

ژ شکەفتێن گوندی: شکەفتا زۆما، شکەفتا هرچێ ب دووراتییا ٢کم ل رۆژهەلاتی، هەروەسا شکەفتێن سیلاڤێ و نهالا جها و شکەفتا سەر هەڤشی ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا ٣کم.

## کانییێن گوندی:

کانییێن گیزێ و یالی و بەربرکێ و بن ئاڤاری و باریکێ و کناریکێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، هەروەسا کانییێن دەراڤی و کەندالا ل باشووری و کانی گەرمافکێ ل رۆژئاڤایێ گوندی. ئەڤ کانیە هەمی دۆرێن (١-٢ کم) ژ گوندی د دوورن.

گوندێ ئورمەداودا ب هەبوونا کەزان و رەزان ب ناڤ و دەنگە، ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دەخل ودانی و تەرش و کەوالی و چوونا کاروانان بوو[168].

## گوندێ ئێكمالێ:

ئێكمالێ دەڤەرەکا زۆزانی یە، ب دووراتییا ٣٠کم دکەڤیتە باشوورێ سەنتەرێ کانی ماسێ. ل دەستپێکێ گوند ل جهەکی کو دبێژنێ (لێلەکان) هاتیە ئاڤاکرن. ل دووڤ گۆتنێن خەلکێ گوندی دیرۆکا گوندی بۆ بەری ٢٥٠ سالان دزڤریت.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** میرکاجیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن خانکێ و شێلازا.

**باکووری:** چیایێ کابنێرکی و گوندێن ئۆرمانا و راڤینا.

**باشووری:** گوندێ خرابە و چیایێ مەتینی.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ ڤان بنەمالان پێکدهێت: بنەمالا نوحێ، بنەمالا رەسیلا، بنەمالا سەلمانا، بنەمالا عەلی، بنەمالا دێریشکیا (ژ دێریشکێ هاتینە)، مالا ژووری، مالێن بێتکاریا (ژ بێتکار هاتینە)، محەمەدێ رەشوی. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢١٠ کەس بوون[169] و نها ژ نێزیکی ٤٠٠ خێزانان پێکدهێت.

بۆ جارا ئێکێ گوند ل سالا ١٩١٨ێ هاتیە سۆتن، پاشی بۆ ماوەیەکێ کێم گوند هاتە ئاڤاکرن، سالا ١٩٨٨ێ گوند هاتبوو کیمیا بارانکرن و خەلکێ وی دەربەدەری ترکیا بوون، سالا ١٩٩٢ێ دووبارە گوند هاتە ئاڤاکرن و جارەکادی ل سالا ١٩٩٥ێ گوند هاتە سۆتن، نها کەس ل سەر گوندی ناژیت، ب تنێ ل وەرزێ هاڤینێ خەلکێ وی گوندی شین دکەن.

گوندی تنێ ئێك شکەفت ب ناڤێ شکەفتا خالی شوی ل روئاڤایێ گوندی ب دووراتییا کیلومەترەکێ هەیە، دیسان ئێك کانی ب ناڤێ کانییا سیر ل باشوورێ رۆژهەلاتی گوندی ب دووراتییا ٠,٥کم هەیە.

سالا ٢٠١٠ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان، سالا ٢٠١٢ێ ژی کارەب گەهشتییە گوندی[170].

## گوندێ ئییاتێ:

گوندێ ئییاتێ ب دووراتییا ٢كم دكەڤیتە لایێ باشوورێ رۆژئاڤایێ كانی ماسێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكوور و رۆژئاڤایی:** ناحیا كانی ماسێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن شمایلا و دۆرێ.

**باشووری:** گوندێن هێسێ و مێركاجیا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند بنەمالێن: بنەمالا ملو، بنەمالا گەنجێ، بنەمالا بنو پێكدهێت، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٦٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧١] و نها ژمارا خەلكێ وی نێزیكی ٤٠٠ خێزانا، پتریا وان ل دەرڤەی وەلاتی دژین.

بۆ جارا ئێكێ گوند ل سالا ١٩١٥ێ هاتییە بەردان و خەلكێ وی دەربەدەری جهێن جودا یێن كوردستانێ بووینە، پشتی چەند سالەكێن كێم زڤرینە سەر گوندێ خۆ، بۆ جارا دووێ گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتە كاڤلكرن و خەلكێ وی بۆ كۆمەلگەها بێرسڤێ هاتنە ڤەگوهاستن، سالا ١٩٩٣ێ جارەكادی هاتە ئاڤاكرن، نها ١١ مال ل سەر گوندی دژین.

ل گوندی دێرا مار گیوەرگیس ب دووراتییا ١٠٠م ل باكوورێ گوندی هەیە، كو دیرۆكا وی ل دووڤ گۆتنا گوندییان دزڤریتە بەری ١٤٠٠ سالان و جهێ دێرێ شكەفتەكا مەزنە و د كەڤریدا هاتییە چێكرن، دیسان كۆمەكا شكەفتان ژی ل ژوورێ گوندی ب دووراتییا ١٥٠م هەنە، ژ بلی هەبوونا كانییا دێرێ ل ژێرێ گوندی ب دووراتییا ٣٠٠م و چەند كانیێن دی ژی ل ئاڤارێ گوندی، رووبارەكێ ئاڤێ ژی دبەر گوندیرا ژلایێ باشووریڤە دەرباز دبیت.

تۆرا ئاڤێ و كارەب بۆ گوندی هاتینە راكێشان و دێرەك ژی ل گوندی هاتییە چێكرن[١٧٢].

## گوندێ بێقولكێ:

گوندێ بێقولكێ ب دووراتییا ١٢كم دكەڤیتە رۆژئاڤایێ كانی ماسێ.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** ئەلكیشكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن تشیشێ و خشخاشا.

**باكووری:** دەرگەلكا سەیدا.

**باشووری:** گوندێن جدیدكێ و سەفەریا.

گوند هەمی مرۆڤێن ئێكن و پێكدهێت ژ بنەمالێن: خورشید، ئیبراهیم، حامد، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٤ كەس بوون[١٧٣] و نها ژمارا خێزانێن گوندی دگەهنە نێزیكی ٧٠ خێزانان، ١٨ ژێ ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل گەلەك باژێر و وەلاتان.

سالا ١٩٧٩ێ گوند هاتییە خرابكرن و خەلكێ گوندی ل جهێن جودا یێن دەڤەرا دهۆكێ ئاكنجی بووینە، سالا ١٩٩٣ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن ڤە، لێ نها كەس ل سەر گوندی دژین.

ژ شوینوارێن گوندی: گرێ قەسرێ جهەكێ كەڤنار و دێرینە. ل بەرێ گوندێ بێقولكێ ل سەرێ وی گری وەكی كەلایەكا دێرین بوویە.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٦٩ێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن و ل سالا ١٩٩٣ێ خواندنگەهـ هاتییە ئاڤاكرن، پشتی سەرهلدانێ پرۆژێن ئاڤێ و مزگەفتێ ل گوندی هاتینە چێكرن و تۆرا كارەبێ ژی ل سالا ٢٠١٠ێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان.

### كانیێن ئاڤێ:

ل گوندی سێ كانیێن ئاڤێ هەنە: كانییا خەراجا " ئەڤ كانی یە ل سالێن حەفتیان ژ سەدسالییا بووری جهێ راوەستانا تورمبێلا بوویە، پرانییا گوندێن دەڤەرێ بەرهەمێ خوە ل وێری بۆ فرۆتنێ كۆمدكرن و نها پرۆژەكێ ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوندی ل سەر

هاتیە ئاڤاکرن [١]، کانیا قەرچێ و کانیا بن تیان بۆ ڤەخوارنێ دهاتنە بکار ئینان، ژێدەرێ ئاڤدانا دار و باری ژی کانیا تا بوو کو ژ گوندێ ئەدنێ دهات.

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا برنج و گەنم و گەنمۆك و کونجیا بوویە، نها پرانیا ڤان زەڤیان ب دارێن سێڤان هاتینە چاندن و هەر سال ب دەهان تەنێن سێڤ و خۆخان لێ دهێنە بەرهەم هینان و ژێدەرەکێ ژیارا خەلکێ گوندی یە[١٧٤].

## گوندێ تویلەری:

گوندەکێ کەڤنارە و ژ سێ گوندێن (تویلەرا ژووری و نیڤەکێ و ژێری) پێکدهێت، پتریا مالان ل یا نیڤێ بوون، دکەڤیتە دووراتیا ٤کم ژ جادا سەرەکی و ١٠کم ژ رۆژئاڤایێ کانی ماسێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هەدێنە.

**باشووری:** گوندێن باتیفا سەیداو راڤینا و ئۆرمانا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن کانی سارکێ و ئەلکیشکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بناڤیێ.

## پێکهاتا گوندی:

گوند پێکدهێت ژ چەند بنەمالێن سەرەکی، ئەو ژی: بنەمالا سامێ، بنەمالا ئالێ، بنەمالا عەلێ، بنەمالا بەسێ، بنەمالا مال، بنەمالا ئومەرا کەڤنترین بنەمالا گوندییە و خۆجهێن گوندی بوون و ژ شەرنەخێ هاتینە گوندی، بنەمالا سامێ ژ سێ برایان پێکدهێت، هەر ئێك ژڤان بۆ بنەمالەکا بوّش، دو ژوان ل گوندی دژیان و یێن دی ل گوندێ قەوالێ ل دەڤەرا هەکاریا، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٥٦ کەس بوون[١٧٥] و نها ژ نێزیکی ٦٠٠ مالان پێکدهێت و ل چەندین دەڤەرێن دهۆکێ دژین، نها گوند چۆلە.

ژ کەڤندا جهێ ڤی گوندی (قەرەتوین) بوو، کو باژێرەکێ بچووك بوو، ل سەر دەمێ ئوسمانییان گەلەك خێزان ل ڤێ دەڤەرێ دژیان، پشتی ئوسمانییان کوردستان داگیر کری، ئەڤ پەیڤە هاتە گوهارتن بۆ (تویلەر) کو ژ پەیڤا (تویی) یا کوردی و پاشگرێ (لەر)ێ تورکی هاتییە، ئانکو جهێ گەلەك توی لێ. هندەك ژی دبێژن ناڤێ وێ یێ ژ جهەکی هاتی کو د گۆتنێ (تیرهەکێ) و شیر و تیر ل ڤی جهی د هاتنە دروستکرن.

شوینوارێن گوندی ڤەدگەرن بۆ دیرۆکا بەری ٢٠٠٠ سالان، پتریا عەردێ گوندی کەڤرن، لەورا گوند ب ناڤێ تیپێ کەڤری هاتییە ب ناڤکرن، و بوویە تویلەرا سەر کەڤری، ب گۆتنا گوندییان چەندین کەرستێن مینا (خیز و خوێ و شیشە و گیچ) لێ هەنە.

سالا ١٩٧٩ێ گوندێ تویلەر هاتە کاڤلکرن و خەلکێ وی بۆ باتیفا گولیا هاتنە ڤەگوهاستن و هندەك ژی هەتا سالا ١٩٨٨ێ مانە ل گوندێن دەور و بەر و پاشی دەربەردەری ترکیا بوون، سالا ١٩٩١ێ جارەکادی ڤەگەریاینە کوردستانێ.

## شوینوارێن گوندی:

شوینوارێن گەلەك کەڤنار ل تویلەر هەنە، وەکی: دوورگەهـ بو زێرەڤانیا باژێرکێ (قەرەتوین) هاتینە دانان، یا ئێکێ ل بلنداهیا سەرێ کێری بەرامبەر گوندێ راڤینا ل رۆژهەلاتێ گوندی و دوورگەهـ ا (دەربکێ گورگا) ل لایێ رۆژئاڤایێ گوندی، ل هنداڤی گوندێ ئەلکیشکێ، هەروەسا ٨ گۆڕستانێن مەزن ل گوندی هەنە، وەکی گۆڕستانا شاخکێ ژ کانیا سپی دەست پێ دکەت هەتا دگەهیتە خیریزێن کەڤن ب درێژاهیا ٥٠٠م و فرەهیا ٣٠٠م، گۆڕستانا ئاقاری ژ بن کانیا گوندێ خوارێ هەتا هنداڤ گەلی ب دوماهی دهێت، درێژاهیا وێ دگەهیتە ٨٠٠م و فرەهی٦٠٠م، گۆڕستانا گەرینێ ژ هنداڤ گەلی دەست پێ دکەت هەتا بێدەرا گەرینێ ب درێژاهیا ٥٠٠م و فرەهیا ٢٠٠م، گۆڕستانا ستوکورکێ، گۆڕستانا جنینێ ژ ئاڤیکا دەست پێ دکەت و هەتا جنینێ ب درێژاهیا ٦٠٠م و فرەهیا ٤٠٠م، گۆڕستانا گەلیێ دەرخینکا ژ کێجکا دەست پێ دکەت ل گەلیێ دەرخینکا ب درێژاهی٣٠٠م و فرەهی ١٥٠ م ب دوماهی دهێت،

گۆڕستانا قوپەکێ ژ کانییا دەشتا گەلکی دەست پێ دکەت و ل پیر مرادا ب درێژەیاهییا ١٠٠٠ م ب دوماهی دهێت، گۆڕستانا گوندێ ژووری فرەهییا وێ دگەهیتە ٥٠٠م و درێژاهی دگەهیتە ٦٠٠م، گۆڕستانا گەرێ ژ رۆژهەلاتێ گوندێ ژووری دەست پێ دکەت هەتا دگەهیتە سەر کەڤرا ب درێژاهییا ٧٠٠م و فرەهییا ٣٥٠م، گۆڕستانا سەرێ ملکێ ژ رۆژئاڤا گوندێ ژووری دەست پێ دکەت و ل کورکێ ب درێژاهییا ٣٠٠م و فرەهییا ٥٠م ب دوماهی دهێت.

**کانیێن گوندی:**

چەند کانی ل دۆرمانێن گوندی هەنە وەکی: کانییا سپی، کو ئاڤا وێ یا سپی یە و ژ ناڤ ئاخەکا سپی د زێت، لەورا دبێژنێ کانی سپی، کانییا ئاقاری، کانییا مزگەفتێ، کانییا گەلکی، کانییا مالێ، کانییا سەر رێزکێ، کانییا دەراڤی و بن موقبەرێ، کانییا ناڤ گەلی و شورێ ل گوندی هەنە.

تویلەر ژینگەهەکا خۆش و هەوایەکێ هوین لێ هەیە و گوندەکێ بەفرینە. ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر پەز و رەزان بوویە، هەروەسان ل سەر دەرامەتێ سرۆشتی بوویە. و خەلکێ گوندی بازرگانی ژی دگەل گوندێن سنووری یێن ترکیا دکرن[١٧٦].

**گوندێ دێریشکێ ئیسلام:**

گوندەکێ ئاڤی یە، رامانا ناڤێ گوندی ب واتایا (دێرا ل ئیشکێ) یان ژی دێریشکێ هاتییە، ل دووڤ گوتنێن مەزنان جهێ مزگەفتا گوندی (دێرا مەسیحییان) بوویە و ئەڤ دێرە ل زاویەکا رێکا گوندی هاتبوو ئاڤاکرن ژبەر ڤێ چەندێ گوندێ دیریشکێ کو ژ دو گوندێن سەرەکی پێکدهێن (دێریشکا موسلمانا و دێریشکا مەیسحیان).

**سنوورێن گوندی:**

نها دێریشکێ هەڤسنوورە دگەل کانی ماسێ و دکەڤیتە دناڤ سنوورێ باژێرڤانیا وێ دا.

گوندێ دێرشکا بەرواری



**باكووری:** دگەهیتە سنووری تركیا ل زنجیرا چیایی شارانیێ.

**باشووری:** زنجیرا چیایێ گابنێركی.

**رۆژهەلاتی:** ناڤەندا كانی ماسێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن بێدوهێ و مایێ.

## پێكهاتا گوندی:

دێریشكێ پێكهاتییە ژ (١٢) بنەمالان، ئەو ژی: بنەمالا عەبێ، بنەمالا دێوێ، بنەمالا یەحیای، بنەمالا عەلی سێهنیكا، بنەمالا قادێ، بنەمالا شێخوی، بنەمالا ئاڤدەلی، بنەمالا رەڤێ، بنەمالا عیسای، بنەمالا، حسینێ ئەسمایێ، بنەمالا سەرحانی، بنەمالا تەمەری، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٨٣ كەس بوون[١٧٧] و نها نێزیكی (٣٣٠) سەرۆك خێزانانە، نێزیكی (٩٠) سەرۆك خێزان ل گوندی دژین، رێژەكا خێزانان ژی ل دهۆك و زاخۆ دژین.

## شوینوارێن گوندی:

ل گوندێ دێریشكێ چەند شوینوارێن دیرۆكی هەنە، وەكی:

كەلا (باروخێ) كو كەلایەكا ب ناڤ و دەنگ و دیرۆكی یە، ل گۆر ژێدەرێن مەزنان دبێژن ڤێ كەلێ میرەك ب ناڤێ میرێ كەلا باروخێ هەبوو و دەسەلاتی ل سیهـ گوندان دكر و ل هەیڤا رەمەزانێ میر ژ كەلا باروخێ دهاتە خوارێ و هەر رۆژەكێ و بۆ ماوێ سیهـ رۆژان د چوو گوندەكی هەتا رەمەزان ب دوماهی دهات و بۆ رۆژا جەژنێ دزڤری كەلێ.

بەرێ كەڤرێ: شوینوارەكێ كەڤنە، دیرۆكا ڤی جهی د زڤریتە سەردەمێ بازارێ (هەلەكانێ) كو هەتا نها شوینوارێن ڤی بازاری ل دۆرێن ڤی كەڤری د دیارن.

(كەڤرێ مناسبێ): شوینوارەكێ كەڤن و دیرۆكی یە.

## شكەفتێن گوندی:

چەند شكەفت ژی ل گوندی هەنە، وەكی: شكەفتا (بەرێ كەڤرێ) كو یا بلندە و دوو شكەفتێن دی دناڤ بلنداهیا كەڤریدا هەنە و هەمی كەس نەشێن بگەهنە ڤان شكەفتان، شكەفتا (تەحتا ساركێ)، شكەفتا 'كەڤرێ هنگیڤینی) كو كەڤرەكێ بلندە و هەمی دەما میشێن هنگڤیی تێدا هەنە.

## كانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

رووبارەكێ ئاڤێ د ژێرێ گوندی را د بووریت و ژێدەرێن ئاڤا وی سەرۆكانیێن گوندێن (بیدوهێ و مایێ) نە، ژ (كانیكا بنبەری) و (كانیا تا) و هندە كانیێن دی. دیسان دو جوكێن ئاڤێ یێن سەرەكی د ناڤ گوندی دا دبوورن، ئەو ژی جۆیا (حەدی) و جۆیا (سەفرن)، نها ئەڤ هەردو جۆیە هاتینە كونكریتكرن و جۆتیارێن گوندی مفای ژێ دبینن و چەندین كانی ژی ل ناڤ گوندی و دەور و بەران هەنە ئەوژی:

كانیا گوندی كو كانیەكا سەرەكیا گوندی یە و ب كەڤنترین كانی دهێتە هژمارتن، زڤستانێ گەرم دبیت و ل هاڤینی سار دبیت و رێژەیا ئاڤا وی ل هەمی وەرزا وەكی خۆیە، كانیا بەرێ كەڤرێ، كانی ساركی كانیا بەردەرێ بەراشێ، كانیكا مستوێ زەبێ، كانیا زەڤیا میرا، كانیا كانیكا.

ژیانا گوندی: د سەردەمێن كەڤندا ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر كرنا جۆت و كێلی و چاندنا جۆرێن دەرامەتێن ئاڤی و دێمی بوو، نها پرانیا ملكێ گوندی ب دارا (سیڤێ) هاتیە چاندن، هەروەسان ل سەر خودانكرنا پەزی و چێل و گا و دەواران ژی بوو.

ل چیایێن دەوروبەرێن گوندی گەلەك جۆرێن گیایێن سرۆشتی ژی هەنە.

## سەیرانێن گوندی:

سەیرانا (بێل بێلافكێ): ئەڤ جۆرە سەیرانە ل دەمی باب و باپیراندا ل شوینوارێ بەرێ كەڤرێ دهاتە كرن، گوندیان رۆژا بەری هینگێ بەرهەڤیێن خۆ دكرن ودەست ب چێكرنا خوارنان دكرن و قەستا جهێ ناڤبری دكرن، هەتا ئیڤاری گۆڤەند و دیلان گرێدان و ستران دگۆتن و چەندین یاریێن كەڤن ژی دكرن[١٧٨].

# ناحیا دێرەلۆك

**سەردار هێتوتی**

دێرەلۆك جهەكێ بالكێش و ب دیمەنێن خۆ گەلەكێ قەشەنگە، دكەڤیتە ناڤەراستا هەردو چیایێن مەتین و گارەی، باكوورێ وێ گەلیێ رەشاڤە و لینك، ل باشووری ژی گەلیێ شێرانە هەیە، رووبارێ زێی عەرد و ئاخا دێرەلۆكێ دابەش دكەت، ژێلی ڤێ ئاڤا سپنێ بەهدینان ژی ل تەنشتا باشوورێ دێرەلۆكێ دەرباز دبیت، سرۆشتێ دەڤەرێ ب رەنگەكێ گشتی یێ خەملاندییە ب چیا و داروبار و ئاڤ و كانیێن تەزی.

دێرەلۆك ب رامانا خو واتە (دێر ئالوقا)[1] كو ژ ناڤێ ئنجیلا لوقا هاتییە وەرگرتن، ئەڤ گوندە د سەردەمێن كەڤن دا یێ مەسیحیان بوو و ل ڤی گوندی دو دێر هەبوون كو ئێك ژ وان كەنیسەیە[2]، ئەڤ هەردو جهێن پەرەستنێ دكەڤنە رۆژئاڤا و رۆژهەلاتێ رووبارێ زێ بەهدینان، د سالێن سیهاندا مەسیحی (فەلە) ل دێرەلۆكێ هەبوون، لێ ژبەر گەفێن دەسەلاتداریا وی سەردەمی ل عیراقێ وان ل سالا (١٩٣٣)ێ دێرەلۆك بەرەڤ وەلاتێ شامێ ب جهـ هێلایە[3]، كو ل وی سەردەمی هژمارا مالێن مەسیحی ل گوندێ دێرەلۆكێ ٢٥ مال بوون[4]. پاشان هندەك كەسێن موسلمان كو وی دەمی نێزیكی گوندێ دێرەلۆكێ بوون قەستا ناڤا گوندی كرینە كو نها دكەڤیتە ناڤەراستا دێرەلۆكێ و گوند ئاڤاكرینە[5].

گوندێ دێرەلۆكێ ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٢ كەس بوون[6] و گوندێ نها (یێ رەسەن) ژ ٣٠ مالباتا پێكدهێت[7] و بەری كو گوندێ دێرەلۆكێ وەك سەنتەرێ ناحیێ بهێتە دیاركرن، ئەڤ گوندە ب سنوورێ خۆ یێ كارگێری ڤە سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو، و ب بریارەكا فەرمی ل سالا (١٩٧٩)ێ سنوورێ ڤی گوندی دگەل هندەك ژ گوندێ چەلكێ دبیتە سەنتەرێ ناحیێ و پتریا ئاكنجییێن نها یێن خەلكێ گوندێ دێرەلۆكێ تۆڤی و مالێن سەیدان و هاریكی و زێبارینە.

ناحیا دێرەلۆكێ ئەوا ل ١٩٧٩/١/١ێ هاتییە دامەزراندن[8]، ئێكە ژ ناحیێن سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە، د بەرێ دا ب ناڤێ ناحیا نێروە و رێكان (بێبۆ) هاتییە نیاسین، ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی یا سالا ١٣٣٠مش/ ١٩١١- ١٩١٢ز ناحیا نێروە رێكان یەك ژ ناحیەیێن سەر ب قەزا ئامێدیێ بوو[9]، هەتا ب داویهاتنا دەستەلاتێ ئوسمانی ناحیا نێروەرێكان یا بەردەوامبوو د كارێن خۆدا و وەك د پاشبەندێ بەیانا وەزارەتا ناڤخۆیا عیراقی هژمار ١١٢ رۆژا ١٥ ٩ اوكتوبر/ ١٩٢٢یدا هاتی د سەردەمێ حكومەتا مەلكیا عیراقێ ژی وەك یەك ژ ناحیەیێن سەر ب قەزا ئامێدیێ بەردەوامبوویە[10]، ل نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتییان حكۆمەتێ گوندێن نێروە

رێکان و دۆسکی ژووری ڤالاکرین و خەلکێ وان ڤەگوهاستینە کۆمەلگەهێن سیریێ و شێلادزێ و دێرەلۆکێ ڤێ ڤەگوهاستنێ ژ گوندێ بێبۆ سەنتەرێ ناحیێ ژێ ڤەگرت، ب ڤی رەنگی ناحیە ب سنوورێن خۆیێن جوگرافی و کارگێریا خۆڤە نەمان، ئەو بوو ل دووڤ بریارا وەزارەتا ناڤخۆیی یا عیراقێ هژمار٥٥٥٧ ل سالا (١٩٧٩)ێ ناحیا نێروە رێکان ژ گوندێ (بێبۆ) ب فەرمی هاتە ڤەگوهاستن بۆ گوندێ دێرەلۆکێ و چەند گوند و کەرتێن دیترێن سەر ب سەنتەرێ ناحیا قەزا ئامێدیێ ژێ هاتنەڤەقەتاندن و دانە دگەل ناحیا دیرەلۆکێ[11]، (سەنتەرێ نها یێ ناحیا دێرەلۆکێ) کو د کەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ قەزایێ ب دوراتیا ١٧کم و ٧٥ کیلومەتران ژێ دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ دهۆکێ.

ژ سالا (١٩٨٨)ێڤە بەکەیا کارگێری نامینتە ل دێرەلۆکێ و دگەل سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ دهێتەگرێدان، هەتا ل سالا (١٩٩٦)ێ ب بریارەکا فەرمی جارەکا دیتر رێڤەبەریا ناحیێ ل دێرەلۆکێ دهێتە ڤەکرن[12]، دێرەلۆك کو ژ ناڤێ (دێرئالوقا) هاتییە وەرگرتن کو دێرەکا مەسیحیبانە، هژمارا ئاکنجیێن سنوورێ ناحیا دێرەلۆك تا هەیڤا (١٢) یا سالا ٢٠١٣ دگەهیتە (١٧,٤٧٥) هەڤدە هزار و چوار سەد و حەفتێ و پێنج کەسان ب گشتی و سەنتەرێ ناحیێ پێك دهێت ژ (١٣,٢٨٩) سێزدە هزار و دوو سەدو شێست و نەهـ کەسان و یێن دیتر ل گوندا دژین، ل دووڤ ژێدەرێن رێڤەبەریا ناحیا (٨٤٪)ێ ژ خەلکێ ناحیێ ل مەلبەندێ ناحیێ ئانکو باژێرێ دێرەلۆکێ و (١٦٪)ێ ل گوندێن دەوروبەر دژین، ژ وانا (٩٧٪)ێ کوردن و موسلمانن (٣٪)ێ ئاشوورینە و ب ئایین مەسیحینە[13]، و ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن ئامارا دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ هژمارا خەلکێ ناحیا دێرەلۆکێ (١٨٩٠٤) هەژدە هزار و نەهـ سەد و چوار کەسن، ژ وانان (١٢١٣٥) دووازدە هزار و سەد و سیهـ و پێنج کەس ل باژێرکان دژین و (٦٧٦٩) شەش هزار و حەفت سەد و شێست و نەهـ کەس ل گوندان دژین[14].

دێرەلۆك



هندەك یان ژی هەموو گوند و دەڤەرێن (نێروە، نهێل، بەرێکارەی، زێبار، دەشتازێ، مزووری ژووری، بەرواری ژووریا) دکەڤتنە سنوورێ ناحیا دێرەلۆك، ئەڤە و پشتی کو ل هەیڤا ١٢ یا سالا (٢٠١٣)ێ کۆمەلگەها شێلادزێ بوویە ناحیە و ژ ناحیا دێرەلۆك جودا بووی.

ئەو دەڤەرێن دکەڤنە سنوورێ ناحیا دێرەلۆك ژ (٦٠) گوندان پێکدهێن، بەلێ تنێ (١٠) گوند د ئاڤانە و گوندێن دی نها هەمی کاڤلن و نە هاتینە ئاڤاکرن و خەلکێ وان ل کۆمەلگەهێن (دێرەلۆك، هێتوت، شێلادزێ، سیریێ، باگێرا، قەدش) و گەلەك جهێن دی ئاکنجی بووینە و هەروەسا ل سالا (٢٠٠٠)ێ ژ لایێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ب هەڤکاریا رێکخراوا هابیتات گوندێ شارستانیێ هێتوتێ هاتە ئاڤاکرن کو هەمی پرۆژەیێن خزمەتگـــــــــوزاری تێدا هاتینە بجهـ ئینان[١٥].

خەلکێ ڤێ دەڤەرێ ب بریارێن کۆتەکیێن رژێما عیراقێ د ناڤبەرا ١٩٧٥-١٩٧٩یدا ب مەرەما رێك گرتن ژ دوبارە هەلبوونا چریسکا شۆرشێ و ب مەرەما لاوازکرنا شۆرشێ ژ گوندێن وان هاتینە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهان و گوندێن وان هاتینە سۆتن[١٦]، و ل سالا (١٩٨٨)ێ جارەکا دی ژلایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە ئەڤ ناحیە هاتییە راکرن و بوویە دەڤەرەکا ئیداریا ئێکسەر سەر ب قەزایێ ڤە ژبەر کو ل وی دەمی تنێ هەژمارەکا کێم یا خەلکی مابوونە د ڤێ ناحیێ دا و یێن دن هەمو دەربەدەری ترکیا و ئیرانێ ببوون.

دێرەلۆك ئێك ژ وان دەڤەرێن کوردستانێ یە کو تووشی گەلەك کارەساتان بوویە، ژ وان ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ و د هەوا هەشتێ یا ئەنفالان دا تووشی کارەساتێ بوویە و ل دەڤەرێن وێ ژ بلی دەربەدەریا خەلکی، حکۆمەتا وی دەمی یا عیراقێ کیمیا ل ڤێ دەڤەرێ باراندییە[١٧]، هەروەسا ل هەیڤا ئێك یا سالا (١٩٨٨)ێ دێرەلۆك ل رۆژا ١١ێ کانونا دووێ یا سالا (١٩٨٨)ێ دکەڤیتە د دەستێ پێشمەرگەی دا و بۆ جارا ئێکێ ئەڤ ناحیە ب تمامی دهێتە رزگارکرن[١٨].

## جهێ جوگرافی یێ ناحیا دێرەلۆکێ:

ژ لایێ باکووریڤە دکەڤیتە پال پارێزگەها جولەمێرگێ (هەکاری) یا باکوورێ کوردستانێ، ژلایێ رۆژهەلاتیڤە ژی ناحیا شێلادزێ یە، ژلایێ باشووریڤە ژی ناحیا دینارتێ یە ل قەزا ئاکرێ، ژ لایێ رۆژئاڤا ژی سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ یە ب دووراتییا (١٧)کم[١٩]، نها ناحیە پێکدهێت ژ سەنتەرێ ناحیێ و کۆمەلگەها شارستانی یا هێتوتێ و ٦٠ گوندان[٢٠].

ل سنوورێ ناحیێ گەلەك چیایێن بالکێش هەنە کو بلنداهیا وان دناڤبەرا (١٥٠٠-٣٠٠٠) مەترایە ل سەر ئاستێ دەریا و دابەشی دو زنجیرە چیایان دبن کو ژ وان زنجیرا یا ئێکێ دکەڤیتە رەخێ باکووری و زنجیرا دووێ ژی ل رەخێ باشووری نە و ئەڤە ژی بلنداهیا وان دناڤبەرا (١٠٠٠-٢٠٠٠) مەترانە ل سەر ئاستێ دەریا[٢١]. هەروەسا ژ بلی ڤان چیایا ل دێرەلۆکێ ب تنێ دەشتازێ هەیە کو دەشتەکا زەنگینە ب ئاڤا سەرعەرد و ٢٢ کیلومەترا یا درێژە و ٤ هەتا ٥ کیلومەترا یا فرەهە[٢٢].

## هندەك ژ رێڤەبەرێن ناحیا بێبۆ

- ل سالا ١٩٣١-١٩٣٢ (نەشئەت بەگ ئامێدی) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ بوو[٢٣].
- ل سالا ١٩٣٤-١٩٣٥ (عەبدولحەمید ئەتروشی) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ بوو.
- ل سالا ١٩٤٦ێ (کەمال حەسۆ) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ بوو[٢٤].
- ل سالا ١٩٥١-١٩٥٤ (محەمەد حەسەن بالەتە) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ بوو.
- ل سالا ١٩٥٥-١٩٥٩ (ئەحمەد فەخری) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ بوو.
- ل سالا ١٩٦٠-١٩٦١ (رەشید تالەبانی) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ بوو[٢٥].

- ل سالا ١٩٧٠ (فەرسەت ئەحمەد) دبیتە رێڤەبەرێ ناحیا بێبوو[٢٦].
- ل سالا ١٩٧١-١٩٧٣ (عسمەت عابد مزیری) رێڤەبەرێ ناحیا بێبۆ (نێروە رێكان) بوو[٢٧].

## رێڤەبەرێن ناحیا دێرەلۆك

## پشتی سەرهەلدانێ:

پشتی كو ل سالا (١٩٩٦)ێ دوبارە ناحیە بۆ دێرەلۆكێ هاتییە ڤەگەراندن ڤان بەرێزان بەرپرساتییا ب رێڤەبرنا ناحیێ گرتییە سەر ملان:

- مازن محەمەد سەعید بەلو ژ ١٩٩٧/٤/١١ هەتا ١٩٩٨/١٢/٢ێ.
- دلشێر عەبدولستار محەمەد ژ ١٩٩٨/١٢/٢ هەتا ٢٠٠٠/٨/٢٢ێ.
- ئازەر حەسەن سلێمان ژ ٢٠٠٠/٨/٢٢ هەتا ٢٠٠٢/٤/٦ێ.
- محەمەد حەسەن خەیات ژ ٢٠٠٢/٤/٧ هەتا ٢٠٠٥/٩/١٩ێ.
- هەڤال محەمەد شەریف ژ ٢٠٠٥/٩/١٩ هەتا ٢٠٠٧/٥/٢٨ێ.
- سەردار كاكە ئەمین ژ ٢٠٠٧/٥/٢٨ هەتا ٢٠١١/٢/١٠ێ.
- قادر عەزیز قادر ژ ٢٠١١/٢/١٠ هەتا ٢٠١٢/١٠/١٥ێ.
- بەهمەن ئەحمەد محەمەد ژ ٢٠١٢/١٠/١٥ هەتا ٢٠١٦/١٠/٢٤[٢٨].
- سامی ئوشانا گورگیس ژ ٢٠١٦/١٠/٢٤ هەتا نها.

## بازێرڤانی ل دێرەلۆكێ:

ل سالا (١٩٧٩)ێ بازێرڤانی لە دێرەلۆكێ هاتییەڤەكرن و پشتی نەمانا دەسەلاتا ناحیێ و گرێدانا دێرەلۆكێ ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ ڤە هەر بازێرڤانی ل دێرەلۆكێ هەبوو[٢٩].

پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ و ڤەگەراندنا

دێرەلۆك



ناحیێ بۆ دێرەلۆکێ ل سالا (١٩٩٦)ێ باژێرڤانی ژی ل ڤێ ناحیێ دکەڤیتەڤە کاری و نها رووبەرێ وێ (٢٢٠٠دۆنـەم)ن، و باژێرێ دێرەلۆکێ ژ پێنج تاخان پێکدهێت، ئەو ژی تاخێن (گولان، داستان، شەهیدان، ئازادی، چەلکێ).

باژێرڤانیا دێرەلۆکێ پلە سێیە، لێ ل سنوورێ وێ پتر ژ٢٤٠٠ خانیێن ئاڤاکری و ١٥٧ دوکانێن بازرگانی و گەراجەك و دو پانزیخانە و ٣ کارگەهـ هەنە، دگەل چوار پارێکەهێن وەرزشی یێن بچویك و باخچەك ژی لێ هەیە.(*).

## لایەنێ چاندنێ:

هەلبەت چاندن ئێکە ژ کارێن گرنگێن دەڤەرێ و ب تایبەت ل دەمێن بەرێ کو دەخل و دان و دار و بارێ فێقی دچاندن و تەرش و کەوال ژی ب خوداندکرن.

### رووبەرێ عەردی ل دێرەلۆکێ ب ڤی رەنگی یە:

**أ- عەردێ ب کێر چاندنێ دهێت ب ڤی رەنگی یە:**

رووبەرێ عەردێ دێمی: ٢١٥٦١ دۆنەم.

عەردێ بەرئاڤ: ٦٨٣٥ دۆنەم.

بیستانێن بەرئاڤی: ٩٥٥ دۆنەم.

بیستانێن دێمی (رەز): ٣,٢٥ دۆنەم.

**ب- عەردێ ب کێر چاندنێ نەهێت:**

رووبەرێ دارستانێن سروشتی: ٦٦٤٥ دۆنەم.

دارستانێن چێکری: ٣٥٠ دۆنەم.

چەروانە: ٥٢٨٥ دۆنەم.

عەردێ کەڤرین: ٥٩,٦٦ دۆنەم.

## لایەنێ پەروەردەی ل دێرەلۆکێ:

دگەل دەست ب کاربوونا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ هەتا نها ل دێرەلۆکێ ٢٦ خواندنگەهـ لێ هەنە کو ب هەردو زمانێن کوردی وسریانی خویندکار وانەیان تێدا فێردبن و ١٩ ژ وان یێن بنەرەتینە و ئێك باخچێ زارۆکانە کو ل سالا (٢٠١٤) هاتیەڤەکرن[٣٠] و ئەو خواندنگەهـ ب ڤی رەنگینە:

## خواندنگەهێن دێرەلۆکێ:.

ئامادەیی: (ئامادەیا دێرەلۆك یا تێکەل، ب ئامادەییا دێرەلۆك یا ئێڤاران یا تێکەل، ئامادەییا هەڤرا یا تێکەل، ئامادەییا زەهریرا یا تێکەل یا زمانێ سریانی، ئامادەییا هێتیت یا تێکەل، ئامادەییا نهێل یا تێکەل).

خواندنگەها زەهریرا یا بنەرەتی، خواندنگەها بەرچی یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها بەلاڤە یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها لینك یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها گوهەرز یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها سەردەشتێ یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها بادان یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها گەلەکا یا بنیات، خواندنگەها دێرەلۆك یا بنیات، خواندنگەها زاب یا بنیات یا تێکەل، خواندنگەها جزیری یا بنیات، خواندنگەها هاریکا یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها کەلیا ئێڤاری یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها دەشتازێ یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها مهیدێ یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها زاب یا سریانی یا بنیات، خواندنگەها بادان یا ئێڤاریا، خواندنگەها سەردەشتێ یا ئێڤاری) و شەش خواندنگەهـێت بەرهەڤی ژی ل دێرەلۆکێ هەنە، خواندنگەها ئوناس یا تێکەل.

هەروەسا د سالا (٢٠١٤ز)ێ دا بۆ جارا ئێکێ باخچەکێ زارۆکان ل دێرەلۆکێ دهێتە ڤەکرن ب ناڤێ (باخچێ دێرەلۆك یێ زارۆکان).

## ژ لایێ ساخلەمیێ ڤە:

هەتا نها ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆکێ و دەوروبەر چ نەخۆشخانەیەك بۆ خزمەتا نەخۆشان نەهاتییە ئاڤاکرن لێ ل سنوورێ دێرەلۆکێ سێ بنکەهێن ساخلەمیێ ب ڤی رەنگی هەنە: (بنکەهێ ساخلەمییا دێرەلۆکێ کو ل سالا ١٩٨٧ێ هەبوو، بنکەهێ ساخلەمییا هێتوتێ، بنکەهێ ساخلەمییا بلاڤە)[٣١].

**هەژمارا پەرستگەهان ل سنوورێ ناحیا دێرەلۆك:**

ژ بەر لایەنێ ئۆلداریێ ڤە ل دێرەلۆکێ کو خەلکێ وێ پەیرەوێن هەردو ئایینێن ئیسلامی و مەسیحین ل سنوورێ ڤێ ناحیێ ١٥ جهێن پەرستنێ هەنە کو

١٣ ژ وان مزگەفتن، چوار ژێ مزگەفت ل سەنتەرێ ناحیێ ب خۆنە و ٢ دێر ژی ل دێرەلۆكێ هەنە كو هەردو دكەڤنە سەنتەرێ ناحیێ.

## فەرمانگەهێن سنوورێ ناحیا دێرەلۆكێ:

ئەڤ فەرمانگەهە ل ناڤەندا ناحیێ هەنە:

رێڤەبەریا ناحیێ، دادگەه، داخازكارێ گشتی، دارایی، بنكەهێ پولیسێن دێرەلۆكێ، جێگریا ئاسایشێ، بنكەهێ پێزانینان، نڤیسینگەها دادنڤیسێ، فەرمانگەها كاروبارێن شارستانی، سەرۆكاتیا باژێرڤانیێ، بنكەهێ ساخلەمیێ، نڤیسینگەها پۆستە و گەهاندنێ، بنكەهێ سەخبێریا كارەبێ، هۆبا چاندنێ، هۆبا دارستان و پاوانی، بنكەهێ شیرەتكاریێ، بنكەهێ فیتەرنەریێ، وێستگەها كارەبێ، بنكەهێ ساخلەمیێ. بنكەهێ بەرەڤانیا باژێری.

ل دەرڤەی ناحیێ ژی ئەڤ فەرمانگەهە هەنە:

بنكەهێ ساخلەمیا بلاڤە، بنكەهێ ساخلەمیا هێتوتێ[32].

## لایەنێ رەوشەنبیری:

گەلەك سەنتەر و تیپ و بازنێن رەوشەنبیری و رێكخراوێن جڤاكێ سڤیل ب ڤی رەنگی هەنە: (سەنتەرێ دێرەلۆك یێ رەوشەنبیری، بازنێ رەوشەنبیری یێ هێتوتێ، تیپا دێرەلۆك یا هونەری، تیپا نهێل یا هونەری، پەرتووكخانا گشتی ل هێتوتێ، رێكخراوا زاب بۆ دیموكراسیەت و مافێ مرۆڤی، رێكخراوا نێرگز یا پاراستنا ژینگەهێ ل هێتوتێ، نونەراتیا رێكخراوا دەنگێ پیران).

## بزاڤا رۆژنامەڤانی و راگەهاندنێ ل دێرەلۆكێ:

پشتی هاتنا لقێ ئێكێ پارتی دیموكراتی كوردستان ل سالا (١٩٨٣)ێ بۆ دەڤەرا نێروە، كو دەڤەرەكا رزگاركری بوو و نها د سنوورێ جوگرافیا ناحیا دێرەلۆكێ دایە، گەلەك بەلاڤۆك و كۆڤار ل سنوورێ ناحیا دێرەلۆكێ (یا نها) و دەڤەرێن وی سەردەمی ژێر دەستەلاتێ شۆرشا گولانێ دەركەفتن، ژ وانا ژی (كۆڤارا مەتین، گازیا خوێندكارا، رافد زێوە، الرافد، مناضل الحزب)[33]، لێ پشتی ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ ب سەر دەڤەرێ دا هاتین و هەتا سالا (٢٠٠٩)ێ چ دەزگەه و ناڤەندێن راگەهاندنێ و رۆژنامەڤانیێ ل دێرەلۆكێ نەمان[34]. ل خزیرانا سالا (٢٠٠٩)ێ كۆڤارا لینك وەك كۆڤارەكا ئەهلی ب دو هژمارا دەردكەڤیت و پاشان ژ كار دراوەستیت[35]، هەروەسا ل مەها ٩ یا سالا (٢٠١٣)ێ ژی تاكە دەزگەهێ رادیویێ بۆ دەمێ ٢٠ رۆژا ب ناڤێ (رادیۆیا ١١٠) ل دێرەلۆكێ دكەڤیتە كاری[36].

## لایەنێ گوزاری:

دێرەلۆك ب دیمەنێن خۆ یێن جوان و بالكێش وەك جهەكێ سحراوی دهێتە بەرچاڤ، چونكی ل رەخێ باكووری و دناڤا ئاخا باكوورێ كوردستانێ دا رووبارێ زێ مەزن دگەهیتە دێرەلۆكێ و ڤێ ناحیێ بۆ دو رەخێن رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ كەر دكەت، و ل رەخێ رۆژئاڤا ژی سپنێ بەهدینان دگەهیتە دێرەلۆكێ و ل رەخێ باشووری ژی د كووراتیا گەلیێ شێرانە دا رووبارێ شێرانكی درێژ دبیت و بەرەڤ ژوور دهێت و دگەهیتە دێرەلۆكێ، ژ بلی ڤان دیمەنا ل دێرەلۆكێ جهێن هەرە باش بۆ لایەنێ گوزاری هەنە لێ تا نها یێن هاتینە پشت گوهـ ئێخستن، لێ خەلكی بخۆ دەست دایە چێكرنا سەیرانگەهان و ژ بلی سەیرانگەها بیاوێ كو دكەڤیتە گوندێ بیاوێ، سەیرانگەها ناڤدار و سەیرانگەها چنار ژی ل ڤێ ناحیێ هەنە، ئەو ژی دكەڤنە رەخێ رۆژهەلاتێ رووبارێ شێرانكی[37].

## شوینوارێن دێرەلۆكێ:

ژبەر ئاسێیا دەڤەرا دێرەلۆكێ، گەلەك جهێن وێ یێن گرنگ وەكی دەڤەرا نێروە و نهێلێ و هێتوتێ، هێشتا ب دروستی ڤەكۆلین ل سەر شوینوارێن وێ ب باشی نەهاتینە كرن، لێ ل سنوورێ ڤێ ناحیێ گەلەك جهێن شوینواری هەنە وەكی (پرا كەلیا

کو دکەڤیتە باکووری ناحیێ و ل سالا (١٩٥١)ێ وەك جهەکێ شوینواری هاتیە ناڤکرن[٣٨]. (کەلا نێروە کو کەلایەکا بەرکەفتیە و ژوور و ئۆدێن وێ هندی رۆژێن سالێنە[٣٩]، چواردەرا هێتوتێ کو وەك پەرستگەهەکێ یە ل بنارێ چیایێ لینکی و ل هنداڤی کانیێن میرانە[٤٠]، ناوسکا هاریکا شێخا[٤١]، ناوسکێن گوندێ بیاوێ، ناوسکا کانییا بێدلێ ل هێتوتێ، ناوسکێن گوندێ گەلەکا، ناوسکا گوندێ گوهەرزێ، رێکا دەرەجا هێتوتێ[٤٢]، رێکا شوپێ ل رەشاڤە، رێکا بەری ل گوهەرزێ، و شوینوارێن ڤی گوندی[٤٣] دێرا دێرالوڤا ل سەنتەرێ ناحیێ، هەلامەتێ سینەبەردا ل بەلاڤە). ئەڤە و ژ بلی کۆمەکا گەلەك مەزن ژ وان شوینوارێن کو هەتا نها نەهاتینە راگەهاندن.

# کۆمەلگەهێن سەر ب ناحیا

## دێرەلۆکێ ڤە:

## کۆمەلگەها هێتوتێ:

ئەڤ کۆمەلگەهە ل سالا (٢٠٠١)ێ ل سەر پشکەك ژ ئاخا گوندێ پیران هاتیە ئاڤاکرن[٤٤]، ب سنووری خو یێ کارگێری ڤە سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە.

ل باکووری کۆمەلگەها هێتوتێ گوندێ پیران و بادان هەنە و ل رۆژهەلاتێ ڤێ کۆمەلگەهێ ژی ناحیا شێلادزێ جهـ دگریت و زێ مەزن و دەڤەرا زێباریا ژی دکەڤنە باشووری کۆمەلگەها هێتوتێ و مەلبەندێ ناحیا دێرەلۆکێ ژی ل رۆژئاڤایە.

کۆمەلگەها هێتوتێ ٨ کیلومەتران دکەڤیتە

کومەلگەها هێتوتێ



رۆژهەلاتێ دێرەلۆکێ، تەڤایا خەلکێ وێ کوردن و پتریا وان خەلکێ گوندێ هێتوتێ ب خۆنە، دگەل پشکەکا رێکانی و دۆسکی ژووریان ژی ل ڤێ کۆمەلگەهێ د ئاکنجینە.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٩٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٥] و سالا (٢٠١٤)ێ ٤٩٧ سەرۆك خێزان ل ڤێ کۆمەلگەهێ د ئاکنجینە[٤٦]، هەر هەموو کوردن و پەیرەوێن ئایینێ ئیسلامێنە، ئەڤ کۆمەلگەهە ب بریارەکا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ل سالا (٢٠٠١)ێ ل سەر عەردێ گوندێ پیران (بادومەر) هاتیە ئاڤاکرن، وەك کۆمەلگەهەکا شارستانێ دهێتە ل قەلەمدان.

ل سالا (٢٠٠٢)ێ خواندنگەها سەرەتای ب ناڤێ (خواندنگەها بادان) لێ هاتیە ڤەکرن، پێشتر ئەڤ خواندنگەهە ل گوندێ بیماڤا بوو. ل سالا (٢٠٠٤)ێ ژی خواندنگەها ئامادەی ژی هاتیە ڤەکرن. ب گشتی ل سەنتەرێ ڤێ کۆمەلگەهێ چوار خواندنگەهـ هەنە (ئامادەیا هێتیت یا تێکەل، خواندنگەها بادان یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها ستێر یا بنەرەتی یا تێکەل، خواندنگەها هێتیت یا بنەرەتی یا ئێڤاران). هەروەسا ل ڤێ کۆمەلگەهێ بنگەهێ ساخلەمیا دەستپێکی ژی هەیە، دگەل مزگەفتەکا مەزن.

پتریا خەلکێ کۆمەلگەهێ ژ ئاوارەیێن ژ ئیرانێ و ترکیا ڤەگەریاینە، هندەك ژ وان ل سالا (١٩٩١)ێ و هندەك ژی ل سالا (١٩٩٩)ێ ڤەگەریانە کوردستانێ.

رەوشا ژین و ژیانا خەلکێ ڤێ کۆمەلگەهێ ب پرانی ل سەر مووچەخۆریێ و کاسبیێ دژین و هژمارەکا کێم ژ وان ب کارێ چاندنێ و شڤانداریێ ڤە دمژیلن[٤٧].

ل سنوورێ کۆمەلگەها هێتوتێ ناوسکەکا شوینواری هەیە کو بۆ مەسیحییان ڤەدگەریت[٤٨] و دگەل کەڤنارە گوندەکی کو دکەڤیتە هنداڤی کۆمەلگەهێ، لێ دیرۆکا چێبوونا وان نەهاتیە زانین. ژبلی ڤێ یەکێ خەلکێ ڤێ کۆمەلگەهێ رۆل د هەمور شۆرش و سەرهەلدانێن گەلێ کوردا ل باشوورێ کوردستانێ دا هەبوو [٤٩].

کومەلگەها هێتوتێ



## گوندێن سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ ڤە

### أ - گوندێن سەر ب عەشیرەتا نێروە ڤە:

### گوندێ شیڤیێ:

شیڤیێ کو ب ناڤێ (نێرە ڤێدە)[٥٠] ژی دهاتە ناڤکرن، گوندەکە سەر ب عەشیرەتا نێروەڤەیە، ئەڤ گوندە پێشتر سەر ب ناحیا بێبۆ بوو، شیڤیێ دابەشی شیڤیا ژێری و شیڤیا ژووری دبیت، گوندەکێ ئاسێ یە و گەلەك جهێن ڤەشارتی لێ هەنە.

### سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوندە ژ لایێ باکووری ڤە هەڤسنوورە دگەل گوندێ کەرۆ و ل رۆژهەلاتێ وی ژی بیرۆمان و وێلە هەنە، ل باشوورێ شیڤیێ گوندێ هێتوتێ جهـ دگریت و ل رۆژئاڤا ژی زێ مەزن هەیە.

### پێکهاتا گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥١] و سالا (٢٠١٤)ێ خەلکێ گوندی ب تەنێ ژ ٣٠٠ کەسان پێکدهێت[٥٢]، هەموو ژی ل دەرڤەی گوندی دژین و نها گوند یێ بەردایە.

شیڤی ژ پێنج بنەمالان پێکدهێت، کو ژ لاتێت قاعیدیا (ڤائیدیا) هاتینە، پاشان ل ڤی گوندی ئاکنجی دبن، بنەرەتی ناڤکرنا گوندی ژ شیڤەکا مەزن و درێژ دهێت کو گوند دکەڤیتە دناڤا وێ دا[٥٣].

### جهێ گوندی:

ژ بەر کو هەتا نها جادە و رێیەکا خۆش نەگەهشتییە گوندی، لەورا پتر ژ ٤ دەمژمێران دڤێت دا کو مرۆڤ ژ دێرەلۆکێ بشێت ب پێیان بگەهیتە شیڤیێ چونکی پێدڤییە ل دەرەجا هێتوتێ و چیایێ لینکێ سەربکەڤی، جهەکێ ئاسێ و ڤەشارتییە گەلەك شکەڤت و کانیێن ئاڤێ لێ هەنە وەکی: (شکەفتا حەسارێ، شکەفتا عەبدێ) و کانی ژی ل گەلیێ ساتۆرا و بانیێ و سەرێ وێلێ و شفارە و مێرگا و سیتاس هەنە کو بۆ مەرەما ڤەخوارنێ دهاتنە ب کارئینان و هندەك ژ وان ژی بۆ چەروانی دهاتنە بکارئینان.

ل ڤی گوندی شوینوارێن دێرەکا کەڤنارە هەیە، دکەڤیتە رەخێ گوندی و ئێکا دیتر ژی دکەڤیتە نیڤا گوندی و هەردو ب تمامی کاڤل و خراب بوونە.

برنج و ماش و نیسك و گەنمۆك و فاسۆلی و کونجی و خرۆڤی و تالە و جەهـ و خیار و باجان و کولند ژ وان بەرهەمێن ئاڤی و دێمی بوون کو ل گوندێ شیڤیێ دهاتنە چاندن.

ژ بلی ڤی کاری کو پشکەکا گوندییان پێڤە مژوول بوون، پشکەکا دی مژوولی خودانکرنا تەرش و کەوالی بوون وەکی (پەزێ رەش، پەزێ سپی) و بەرهەمێ وان ژی پێکدهات ژ هریێ و گوشتێ گیانەوەری و شیر و پەنیر و ماست و... ئەو بەرهەم بۆ ژیانا رۆژانە ب کاردهینان.

ئەڤ گوندە یێ دۆرپێچکرییە ب چیایێن (شخارە، سەرێ وێلێ، بانیێ، سەرێ ساڤای، بێگشتە و گێمە) و رووبارێ گەلیێ ئیشو و کانی سارکێ ژی ل نێزیك گوندی را دەرباز دبن.

ل سالا (١٩٥٩)ێ بۆ جارا ئێکێ ئامیرێ رادیۆیێ گەهشتییە گوندی لێ هەتا کو ل سالا (١٩٧٩)ێ گوند ب تمامی هاتییە خرابکرن خواندنگەهـ نەگەهشتبوو ڤی گوندی.

بەری سەرهەلدانێ سێ جاران ئەڤ گوندە هاتییە خرابکرن، لێ خەلکێ وێ جارەکا دی ئاڤاکرینە ڤە و بەردەوامی تێدا داینە ژیانێ، ل سالا (١٩٨٢)ێ دوبارە ڤەستا گوندێ خۆ کرینە وەکی دەڤەرەکا رزگارکری، لێ ئەنفالان ب ئێکجاری و هەتا نها ئەڤ گوندە هێلایە کاڤل و ژ سالا (١٩٨٨)ێ خەلکێ شیڤیێ دەما ل گوندی دەرکەفتی نەشیانە سەرەدانا شیڤیێ بکەنەڤە[٥٤].

### گوندێ سەرنی:

گوندێ میرا، سەرنی ئێك ژ گوندێن سحراویە ب سرۆشتێ خۆ یێ جوان و بالکێش، ئەڤ گوندە دکەڤیتە دلێ دەڤەرا نێروە، بەری سالا (١٩٧٩)ێ ب

سنوورێ کارگێری ڤە سەر ب ناحیا بێبۆ بوو، نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە.

## سنوورێن گوندی:

ژ رەخێ باکووری سەرنی هەڤتوخیبە دگەل گوندێ ساکا، رۆژهەلاتێ ڤی گوندی ژی گوندێ سپێر جهـ دگریت، گوندێن باشێ و کەرۆ دکەڤنە ژێریێ سەرنی و گوندێ بێزنوور ژی ل رەخێ رۆژئاڤایە.

## پێکهاتا گوندی:

سەرنی کو خودانا بەرەبابەکی ژ میرایە ب رەسەناتیا خۆ کوردن، خەلکێ ڤی گوندی دابەشی چەندین بنەمالا دبیت (مالا غازی بەگی، مالا ئەحمەد بەگی، مالا بەکر بەگی، مالا شێخ حەیدەر، مالا عەبو، مالا زەینێ، مالا سەیدا، مالا ئیسف بەگ). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٥].

مەلا خالد بەگێ سەرنی ئێك ژ هەلبەستڤانێن سەردەمێ خۆ بوویە و وی هۆزانێن پارچە پارچەی چێدکرن، هاتییە گۆتن کو ئەڤ هۆزانڤانە ل داویا سالێن میرگەها بەهدینان ژیایە[٥٦]، سەرنی گەلەك جهێن ئاسێ و کەڤنار لێ هەنە لێ ژبەر نەبوونا چ دووڤچوونەکا زانستی نەهاتییە زانین کانێ ئەو تشت بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەرن و ژ بلی ڤێ یەکێ ل رەخ و رویێن ڤی گوندی گەلەك چیایێن بلند بەژنا خۆ یا درێژ کری و ئەڤ گوندە یێ ژ گەلەك ئالیبانڤە پێ هاتییەپاراستن، ژ بلی ڤێ یەکێ خەلکێ ڤی گوندی پتریا وان جۆتیار و شڤان بوون، پەز بخودان دکر و بەرهەمێ وی بۆ خوارنێ و فرۆتنێ دهاتە ب کارئینان، دیسان کارێ چاندنێ ژی ب بەردەوامی دکر و گەنم و جەهـ و گەنمۆك و گارس دچاندن، بۆ خوارنا مرۆڤا و گیانەوەران دهاتە ب کارئینان.

سەرنی گەلەك بەرناسن ب دیلان و شاهیێن کوردی، وان گەلەك جۆرێن داوەتێن وەکی شێخانی و ملانێ و هجرۆکێ و شامیرانێ و سێپێکێ د رۆژێن خۆش دا و ب تایبەتی ل دەما بویك ڤەگوهاستنێ دا دکرن.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧١)ێ خواندنگەهـ گەهشتییە ڤی گوندی، ل سالا (١٩٧٨)ێ ژی سەرنی ب ئێکجاری ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە دهێتە خرابکرن و خەلکێ وێ بۆ دێرەلۆکێ دهێنە ڤەگوهاستن، نها ژی پرانییا سەرنییا ل دێرەلۆکێ و کۆمەلگەها تەناهی و دهۆکێ د ئاکنجینە[٥٧].

## گوندێ باشێ:

باشێ ئێك ژ وان گوندایە کو سەر ب عەشیرا نێروەیە، هەموو ئاکنجیێن وێ مەسیحی و ئاشوورینە[٥٨].

## سنوورێن گوندی:

باشێ یا دۆرپێچکرییە ب گوندێن سەرنی، سپێر، شیڤێ، سینی، بیرۆمان و ئەلهـ هەتا نها سێ جاران هاتییە خراب کرن، جارا ئێکێ سالا (١٩٦١)ێ و جارا دووێ سالا (١٩٧٩)ێ و جارا سێ ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ، گەلەك ژ خەلکێ ڤی گوندی ل سالا (١٩٨٢)ێ سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆکێ ب جهـ هێلان و بەرەڤ وارێ باب و کالان ڤە چوونە ڤە گوندی وەکی دەڤەرەکا رزگارکری و هەتا ئەنفالا لێ ئاکنجی بوونەڤە[٥٩].

خەلکێ ڤی گوندی مەسیحی بوون، لێ دگەل ب رێڤەبرنا ژیانا خۆ، پشکداری د شۆرشێن سەردەمێ خۆ دا کرینە. پشتی کو گوندێ وان بەر هەوێن خرابکرنێ کەفتین، ب کوتەکی وان ژی قەستا کۆمەلگەهێن زورەملی کرینە و پتریا وان ل ناحیا دێرەلۆکێ ئاکنجی دبن.

## پێکهاتا گوندی:

باشێ ژ چوار ئویجاخان پێك دهێت، ئەو ژی (ئورەمار، ساوە) و (تیاری، خابێ) و (زریانش، دخۆ) و (سەپنا، هەسەدو) نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٥٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٦٠] و ل سالا (٢٠١٤)ێ هژمارا خەلکێ وان وان دبوونە ٧٥٣ کەس، گەلەك ژ وان هەر ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆکێ دژین و

چەند مالباتێن وان ل دهۆکێ د ئاکنجینە و هندەکان ژی قەستا دەرڤەی وەلاتی کرینە.

باشێ ب رامانا فەقیری دهێت[11]، ژ بلی گوندێ سەرەکی دو کاڤلە گوند دکەڤنە د سنوورێ باشێ دا، ئەو ژی (گەلی و نك دێرێ) نە. ل ڤی گوندی دو دێرێن کەڤنار هەنە (مار زکا، مار داوود)، دیرۆکا دروستبوونا وان نەهاتییە زانین. نها هەر چەندە گوند هەمووی یێ کاڤلە، لێ شوینوارێن وان کاڤلە دێران هەر ماینە.

خەلکێ ڤی گوندی دگەل گوندێن دیتر یێن مەسیحییانێ ل نێروە دێرەکا مەزن یا چوار گوندا ب ناڤێ (دێرا سەر کەڤری، مار خنانا) هەبوو، وان ئەرکێن خۆ یێن ئایینی ل ڤێ دێرێ ب جهـ دئینان[12].

ژیان ل گوندێ باشێ ل سەر چاندنێ و شڤانداریێ بوو، پتریا خەلکێ ڤی گوندی کارێ جۆتیارێ دکر و ژ وان بەرهەمان ژی کو ب کەدا وان سالانە دهاتنە بەرهەم ئینان (برنج، دەخل، تویتن، زەرزەوات و فێقی و گویز) بوون، دیسان ل ڤی گوندی گەلەك هژیر و مێوێن تری ژی هەنە.

دگەل ڤان بەرهەمان دا خەلکێ گوندێ باشێ بەرهەمێ گیایی یێ بهاری ژی بکاردئینان، ژ وان ژی (کڤارك، کەنگر، لیش، کاری، سوریاز، خەلەندۆر و رێڤاز).

ل دەما شەهیان و داوەتان هەموو سترانێن کو دهاتن گۆتن ب زمانێ کوردی بوون، ژ وان جۆرە دەواتان کو خەلکێ ڤی گوندی دکرن (شێخانی، گولشێنی، ملانێ، بیریکێ، چقجانی و بێلاتی) بوو.

ئاڤا گوندی ژ کانی و جوبێن ناڤا گوندی مفا ژێ دهاتە وەرگرتن، گەلیێ باشێ و چیایێ مەرین ژ جهێن ب ناڤ و دەنگن ل گوندی، پشتی سالا (1979ێ) دەما کو گوند ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن[13] هەتا نها وەك خرابە گوند مایە و نەهاتییە ئاڤاکرن.

## گوندێ بێبۆ:

بێبۆ ژ گوندێن سەر ب عەشیرەتا نێروە یە. ئەڤ گوندە د ناڤبەرا سالا (1932)ێ[14] تا سالا (1978)ێ سەنتەرێ ناحیا نێروەرێکان بوو، ناحیە ژی هەر ب ناڤێ گوندی هاتبوو ناڤکرن و ژمارا ئاکنجیێن وێ وەکی ناحیە ل دووڤ سەرژمێریا سالا (1957)ێ (11076) کەس بوون[15].

### سنوورێن گوندی:

بێبو یێ دۆرپێچ کرییە ب گوندێن زێر و ئەرژ ژ لایێ باکووری ڤە، سینیا و بیرۆمان ژی دکەڤنە باشووری گوندی، ل رۆژهەلاتێ گوندێ رێشمە و ئەرتش هەنە و سپێر و بێتفە ژی دکەڤنە رۆژئاڤا گوندی.

گوندێ بێبۆ کو پێشتر سەنتەرێ ناحیا بێبو بوو لێ د هەوێن خرابکرنا گوندێن کوردستانێ دا ل سالا (1978)ێ ئەڤ گوندە ژی هاتەکاڤلکرن[16] و خەلکێ وێ دهێتە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهێن ب زۆر چێکری.

### پێکهاتا گوندی:

ژبەر کو دکەڤتە سەنتەرێ هەردو عەشیرەتێن نێروە و رێکان لەورا دبیتە مەلبەندێ ناحیێ. بێبو گوندەکێ مەزن بوو و ژمارەکا زۆرا خەلکی د سەردەمێ کەڤندا ل سەر ئاخا وێ ژیان کرییە چونکی ڤی گوندی بەرپێیەکێ خۆش و گەلەك زۆم و هاڤینگەهـ لێ هەبوون.

گەر کو هەموو خەلکێ گوندی ب رەسەناتییا خو ژ ئاکنجیێن وێ دەڤەرێ نینە لێ ئەڤ گوندێ هەنێ ژ ڤان مالباتان پێکدهێن (مالا میزا، مالا نافخۆشیا، مالا مەفانیان). ل سالا 1952 ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[17].

ئەڤ گوندە یێ دۆرپێچکرییە ب چیایێن (چیایێ رەش، پەسار، قلنك، نێرەبۆ، پیرمەلك). ژیان ل ڤی گوندی ژیانەکا خۆشا کوردەواری بوو، خەلکێ وان هەر دکەڤندا جل و بەرگێن کوردی ل خۆ کرینە و خوارنێن وان ژی هەر هەموو کوردەواری بوون، د خۆشی و نەخۆشییان دا وان مل دایە بەر کوردەواریێ[18].

د بهاراندا ل ڤی گوندی ژ بلی خۆشی و کەیف و سەیرانان خەلکێ وان مفا ژ بەرەکەتا عەردی وەرگرتیە و گیایێن بهاری یێن وەکی (سوریاز و سبت،

کڤارك و ...) ب کارئینانینه، ژیانا خەلکێ گوندی ژی ل سەر ملکی و شڤانداریێ بوو و وان ب باشی مفا ژ بەرهەمێن گیانەوەران مینا (شیر و پەنیر و ماست و سەرتیك)ی وەرگرتینه.

ل بێبو د دەما سەیران و خۆشییاندا دا وان شاهی و دەواتێن کوردەواری دکر و ژ وان جۆرە دەواتێن کو گەلەك ل ڤی گوندی دهاتنە کرن (شێخانی، سێپێکێ، ملانێ، قلیچ و نێلاتی) بوو و وان پتریا جاران شەهیان ل دەست پێکا بهارێ یان ژی ل دوماهیکا پاییزێ دکرن، چونکی دەما وەرزێ کاری ب تەنێ وان بۆ ژیانێ کار دکر.

ل ڤی گوندی هژمارەکا گەلەك بەرچاڤ ژ دار کەزانا هەنە، بۆ پەزی ژی مفا ژ دار بەرِوی دهاتە وەرگرتن و مازی ژی وەك کارەکێ بازرگانی د فرۆتن و داهاتەك ژێ دهات.

## گوندێ بێتفە:

بێتفە ئێك ژ گوندێن نێروەیانە، بوو، دیرۆکا ئاڤا بوونا ڤی گوندی نەیا دیارە لێ وەك ژ زار دەڤێ خەلکێ گوندی هاتییە گۆتن ڤەدگەریت بۆ سەردەمێن گەلەك کەڤن ژبەر هەبوونا چەندین جهێن ئۆلی یێن مەسیحییان وەك دێرا، ل ڤی گوندی چەندین جهێن خۆش و دلڤەکەر هەنە.

### سنوورێن گوندی:

بێتفە هەڤسنوورە دگەل گوندێن بێبۆ و سپێر ژ لایێ باشووری، گوندێ زێر ژی دکەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتی، گوندێ ساکا ژی دکەڤیتە رەخێ رۆژئاڤا و ل باکوور ژی گوندێ خەرەگول هەیە، ئەڤ گوندە ژبەر کو جیران و هەڤسنوور بوو دگەل ناحیا بێبو لەورا د رێیا بێبو وان زوی دەست دایە خواندنێ لێ چ جاران خواندنگەهـ نەگەهشتییە بێتفە بخۆ.

خەلکێ گوندێ بێتفە د کۆکا خۆدا کوردن و هەر هەموو ل سەر رێیا ئایینێ ئیسلامێنە، گەلەکێ ژ سەنتەرێ دێرەلۆکێ دوورە و هەتا نها چ رێك و جادەیەك نەگەهشتییە ڤی گوندی.

ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٦٩] و ژمارا خەلکێ رەسەنێ گوندی کو نها ل جهێن جودا جودا دژین ل سالا (٢٠١٤)ێ ٣٥٠ کەس بوون. ژ بلی گوندێ سەرەکی گوندێ رەزۆك کو خرابە گوندە دکەڤیتە د چوارچوڤێ ڤی گوندیدا و درامانا خۆدا بێتفە وەك (بهێتەڤە) هاتییە ل قەلەمدان.

مالێن مەسیحیا و شکەفتا شێخا و دیوارێ دێرێ ژ جهێن شوینوارێن ڤی گوندی نە و د رەسەناتیێ دا خەلکێ بێتفە ژ خەلکێن رەسەنێن نێروەیانە و د سەردەمێن کەڤن دا ل گوندێ هنجنێ وان ژیان دکر.

ل گوندێ بێتفە کانی سارکێ و شکەفتا رەزۆکی هەنە وەکی جهێن ب خودان کرنا تەرش و کەوالی دهاتنە ب کارئینان و زۆمێن ڤی گوندی نە.

سەرۆکانی و کانییا نهیلی و کانی زۆمێ و کانی رەشێ و کانی سارکێ ژ وان کانییانە کو خەلکی بۆ مەرەما ڤەخوارنێ و چاندنێ ب کار ئینانە و چیایێ کوکەرێ و پەسار و دومی و قلینگە و چیایێ رەش و گریێ زیوکێ و چەلێ ژ وان چیایانە کو ل دۆرمان دووری هەنە، هەروەسا مفا ژ ڤان چیا وەردگرتن و وەکی خێر و بەرەکەتەکێ بوو بۆ خەلکێ بێتفە، چونکی د وەرزێ بهارێ دا مەیدانا خرڤەکرنا گیایێن بهارینە وەکی سوریازێ و لیشێ و کڤارکا و گەلەك جۆرێن دیتر و ل وەرزێ هاڤینێ ژی خۆشترین جهن بۆ چەروانێ پەزی.

بێتفە دو جارا د دیرۆکێ دا هاتییە خرابکرن کو ئێك ژ وان ب ئەگەرەکا سرۆشتی بۆ سەدان سالا بەری نها ڤەدگەریت و ب جارا دووێ ل سالا (١٩٧٨)ێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن، نها ژی خەلکێ ڤی گوندی وەکی هەموو خەلکێ دیترێ دەڤەرێ ل دێرەلۆکێ و دهۆکێ و کۆمەلگەها تەناهی ژیانا خو دەرباز دکەن[٧٠].

## گوندێ بیرۆمان:

بیرۆمان هەتا سالا (١٩٧٨)ێ سەر ب ناحیا بێبۆ و نها سەر دێرەلۆکێ یە.

### سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوند ژ لایێ باکووریڤە هەڤسنووره دگەل چیایێ سینیا، رۆژهەلاتی ڤە ژی گوندێ سینیا هەیە، ل باشووری ی گوندی گوندێن کارۆکا و هێتوتێ جهـ دگرن و گوندێ وێله ژی ل رەخێ رۆژئاڤایە.

### پێکهاتا گوندی:

د کۆکا خۆدا دابەشی دوو بنەمالێن سەرەکی دبن (مالا سمۆ، مالا تاهر بەگێ). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٩١ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٧١]. خەلکێ گوندێ بیرۆمان هەر د کەڤن دا دگەل شۆرشێن کوردی دا بوون و وان رۆلەکێ گەلەکێ بەرچاڤ د ناڤا شۆرشا دووێ یا بارزان دا گێرایە و سەرکەفتنێن مەزن توومارکرینە[٧٢].

بیرۆمانی د کەڤندا مژوولی بخودانکرنا تەرش و کەوالی و کارێ چاندنێ بووینە و دەبارا ژیانا خۆ پێ دکرن. ل بیرۆمان گەلەك جۆرێن گیایێن بهاری ژی بۆ خوارنێ وەکی سوریازێ و لیشێ و کڤارکا دهاتنە ب کارئینان.

ل ڤی گوندی گەلەك دارکەزان هەنە، ژ بلی ڤان داران بەرپیێیەکێ مەزن بۆ کەنگرۆکان و شەکرۆکان هەیە. خەلکێ گوندێ بیرۆمان ژی هەر وەکی هەموو خەلکێ نێروه حەز ل سەر جۆرێن دیلان و داوەتان بوو وان شێخانی و سێپێکێ و ملانێ دکرن.

گەر کو ئەڤە کەڤنارە گوندە، لێ د دیرۆکا وی دا چ جارا خواندنگەهـ نەگەهشتییێ و د سەردەمەکێ کەڤندا خەلك ل ڤی گوندی هەبوون.

ل سالا (١٩٧٩)ێ گوندێ بیرۆمان ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە دهێتە خراب کرن و خەلکێ وێ ب زۆری بۆ دێرەلۆکێ دهێنە ڤەگوهاستن و هەتا نها ژی ئەڤ گوندە ب کاڤلی مایە و نەهاتییە ئاڤاکرن[٧٣].

## گوندێ بێزنور:

بێزنور: مینا گوندێن دی سەر ب عەشیرەتا نێروه یە. نەهاتییە زانین کانێ دیرۆکا ئاڤابوونا بێزنور بۆ کەنگی ڤەدگەریت، سەرژمێرا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٨ کەس بوون[٧٤] و ل سالا (٢٠١٤)ێ هژمارا خەلکێ وی خۆ ژ هزار کەسان دەرباز دکر.

### سنوورێن گوندی:

ل باکووری گوندێ سەرنێ، باشووری گوندێ کەروی، رۆژهەلاتی گوندێ سەرێ رەش و ل رۆژئاڤای گوندێ زێوه نە.

بێزنور پتر ژ ١٥ کیلومەتران ژ سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆکێ دووره، چەند خرابە گوند د چوارچوڤێ ڤی گوندی دا هەنە وەك (بەرێ قەسرێ، شەخسکێ، بندولا، بەرۆژی، سەرملێ و شەکروکی)، ژ بلی ڤان خرابە گوندان ل بێزنور کۆمەکا شکەفت و دۆلان هەنە کو د سەردەمێن کەڤن دا بۆ گەلەك لایەنێن ژیانێ خەلکی مفا ژێ وەرگرتییە وەکی (شکەفتا منجولك، شکەفتا جیجکا، دەهـ شکەفت و دولا سیفی و دولا ب گویز).

ژ بلی ڤان دۆلان چیایێن (پشتا رەشەی، چەلێ نێرگزا، پشت چەلێ و خەم بینێ) خۆ ل دەوروبەرێن بێزنور دبینن و بەژنا خو بلند کرییە، ل ڤان چیایا ژ بلی کارێ شڤانداریێ خەلکێ بێزنور و گوندێن دەوروبەر مفا ژ بەرهەمێن وان وەرگرتیە و بۆ خوارنا خۆ یا سالێ بکاردئینان، هەروەسا جهێن ئاسێ ژ بۆ خۆ پاراستنا ژ هەر جۆره هێرش و دەست درێژییەکێ بۆ سەر گوندێ وان هەبوون.

خەلك ب گشتی ل بێزنور د سەردەمێن کەڤن دا مژوولی کارێ جۆتیاری و شڤانیێ بوون، ژ بەرهەمێن وان یێن چاندنێ (گەنم، جەهـ، گەنمۆك، نیسك، ماش و نۆك، باجان، هنار، حلی رەشك، گویز، هژیر، تری و سێڤ) بوون، و وان ب کۆم پەزێ رەش و سپی (بزن و میهـ) هەبوون و بەرهەمێ وان ژی وکی شیر و پەنیر و ماست ب کاردئینا و ژ شیرێ وان رۆین و نیڤشك دروستدکر.

ژ چیایان خەلکێ بێزنور کەزان و بەرۆی و مازی و گوهیشك و کەنگرۆك و سماق دئینان وگەلەك ژ ڤان بەرهەمان د فرۆتن.

هەروەسا ل چیایێن ڤی گوندی گەلەك جۆرە گیانەوەرێن كویڤی هەنە وەكی (كەو، پەزكویڤی، كێڤریشك، رویڤی، هرچ، قوریەشك).

ژیانا خەلكێ بێزنور هەموو ب كوردەواری بوو، د دەمێ داوەت و شەهیانێن وان كوردەواری بوون، هەروەسا خوارنا وان هەموو یێن كوردەواری بوون وەكی (ترشك، ئیپراخ، ماش، كوتل دەوك، ساڤار، دانقوت و گلۆل و كاری) بوو، زارۆكان ژی هەر دەم ب یارییێن وەكی (كێلەبەرانێ و هولانێ و ...) ژیانا خۆ یا زارۆكینیێ دەرباز دكر.

بێزنور بەری كو بهێتە كاڤلكرن ل سالا (۱۹۷۸)ێ ژ لایێ حكۆمەتا عیراقی ڤە ل سالا (۱۹۷۱)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەكرن، نها خەلكێ ڤی گوندی ب پرانی یێن ئاكنجی بازێرێ دهۆكێ نە و چەندین سالە گوندێ مایە چۆل و كاڤل[٧٥].

## گوندێ دزگە:

دزگە ژی گوندێن نێروەیانە، دكەڤیتە جهەكێ ئاسێ و نێزیك كەلا نێروە سەر سنوورێ دناڤبەرا باشوور و باكوورێ كوردستانێ.

### سنوورێن گوندی:

هێشەت دكەڤیتە رەخێ باكووری، گوندێ دووتازا ژی ل رەخێ رۆژئاڤایە، باشووری ژی گوندێ نێروە ژووری هەیە و گوندێ زێوەسەر ژی دكەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتێ ڤی گوندی.

دزگە گوندەكێ بالكێشە، د سالێن سیهاندا ل سەد سالا بیستێ هاتییە ئاڤاكرن و پێشتر پشكەك بوو سەر ب گوندێ نێروە بخوڤە[٧٦]، لێ پشتی كو رێبەریا هۆزا نێروە هاتییە د دەستێ وان دا وەك گوند ژ گوندێ نێروە هاتییە جوداكرن.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ وێ دابەشی سەر سێ بنەمالێن سەرەكی دبیت (مالا شێخا، مالا شابومەرا یان شامبەرا، مالا بالیلا) دبن، خەلكێ ڤی گوندی زێدە نێزیكاتی ب بارزان را هەبوو و پشكداری د شۆرشادا كرینە[٧٧] ژبەر كو رێبەرێن هۆزا نێروە ژی بوون رۆلێ وان گەلەكێ بەرچاڤە.

ژیان ل دزگە ژی ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و چاندنێ بوو، ژ بلی ڤێ ئێكێ پشكەك ژ خەلكێ گوندی كارێ وان بازرگانی بوو، ژنان ژی ژ بلی كارێن خۆ یێن سەرەكی ل وەرزێ بهارێ رادبوون ب كۆمكرنا گیایێن بهاری.

جارا ئێكێ ل سالا (۱۹۵۹)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن، ل سالا (۱۹۷٦)ێ بۆ جارا ئێكێ ئەڤ گوندە ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە دهێتە خرابكرن و كاڤلكرن و خەلكێ وێ بۆ دەڤەرێن بن دەسەلاتا حكۆمەتێ دهێنە ڤەگوهاستن.

نها پتریا خەلكێ ڤی گوندی ل دێرەلۆكێ و دهۆكێ دژین و ژیانا وان ل سەر مووچەخۆریێ و كاسبكاریێ یە[٧٨].

## گوندێ دووتازا:

دووتازا ئێكە ژ گوندێن نێروەیان. دەربارەی ناڤێ گوندی چەند بۆچوون هەنە، ئێك ژ وان دبێژیت: دو كەسێن گەنج و جوان برایێن ئێك ب ناڤێن كەمال و جەمال ل ڤی گوندی دژیان، كەمال ل رۆژئاڤایێ كانییا گوندی و جەمال ل رۆژهەلاتێ د روونشتن، ژبەر جوانی و تازەیا وان دو بران گوند ب دوتازە (دو كورێن تازە) هاتییەناڤكرن. بۆچوونا دی دبێژیت ئەڤ گوندە زۆر یێ تازە یە و دكەڤیتە جهەكێ بلند و كانییەكا زۆر تەزی ل نیڤا گوندی هەیە سنگێ گوندی یێ بەردایە و مرۆڤ چیایێ گارە و مەتینی د گوندیرا دبینیت، لەوما ب دو تازە هاتییە ناڤكرن.[٧٩] بۆچوونەكا دی دبێژیت: دووتازا ب رامانا رەخێ زێ یان تایێ زێ دهێت.

### سنوورێن گوندێ:

دووتازا دكەڤیتە رۆژئاڤایێ دەڤەرا عەشیرەتا نێروە، باكووری وێ عەشیرەتا پنیانشی و تیاری نە ل باكوورێ كوردستانێ، رەخێ باشووری گوندێ نێروا ژێری و كانی ساركی و رۆژهەلاتی ڤە ژی گوندێن نێروە ژووری و

دزگە جهـ دكرن و رۆژئاڤایێ وێ ژی گوندێن بەرواری ژووریا سپیندارێ و بێتكارێ نە.

## پێكهاتا گوندی:

دوتازا كەڤنارە گوندە و دیرۆكا ئاڤابوونا وی نەهاتییە زانین چونكی ژیان د ڤی گوندی دا بۆ گەلەك چەرخان بەری نها ڤەدگەریت، خەلكێ رەسەنێ ڤی گوندێ دابەشی چەندین بنەمالا دبن (مالا زەینی، مالا بەدرێ، مالا كەمالا، مالا ماسیارا).

ئەڤ گوندە دسەردەمێ خۆدا ژ هەموو گوندێن نێروەییان بۆشتر بوو، ل دووا سالێن سەردەمێ مەلكیێ عیراقی ٨٠-٩٠ مال بوو و ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٢ كەس بوون[٨٠] و نها ژ نێزیكی ٦٥٠-٧٠٠ خێزانانە[٨١].

گوندەكێ خودان دیرۆكە چونكە هەلگرا ئێكەم چریسكا دەستپێكرنا شۆرشا ئەیلوولێ یە دەما كو ل ڤی گوندی پێشمەرگەی هێرشی مەفرەزا (قووەت سەیارە) كری و هەموو تێكدای و پیچ كری، پاشان (مەخفەرا) دووتازا ژی ژ لایێ پێشمەرگە ڤە بەری شۆرشا ١١ێ ئیلۆلا سالا (١٩٦١)ێ هاتییە پویچكرن[٨٢]، ژ بلی ڤێ یەكێ خەلكێ گوندێ دووتازا پشكداری د شۆرشا دووێ یا بارزان دا كرینە[٨٣].

د سنوورێ ڤی گوندیدا چەند خرابە گوند هەنە وەك: دوتازاكا خراب، جلێزدی، سەنكی، سەرسانكا، رەزۆكێ، سڤێلا. هەروەسان چەند جهێن ناڤدار ب ناڤێن: چەلێ بیك و زاڤا، گوندێ گەریایی، چەلێ لیسا، بەرشكەفتا عومەرا و ئاقارێ شێخێ بەغدایێ هەنە.

پتر ژ ٦٠ كانیێن ئاڤێ ل ڤی گوندی هەبوون: ژ وانا كانیێن: كانیا گوندی، دوتازاكا خراب، شیڤا هۆلێ، بێسێ، خەنكە، كانیا كرتو، كومپەخرێ، كانیا بلڤا، كانیا خاری، كانی بیكێ و كانیا بەرێ تەزی ...هتد هەمی ژی ل هاڤینێ تەزی و زڤستانێ گەرمن[٨٤].

خەلكێ گوندی ژ بلی كارێ چاندنێ و شڤانیێ گەلەك جاران ژبەر نێزیكاتیا گوندی بۆ باكوورێ كوردستانێ خەلكێ بازرگانی ژی كرییە، خەلكێ دووتازا د رەوشێن خوش یێن ژیانێ دا مل ددا بەر داوەت و دیلانا، وان هجرۆكێ و شێخانی و ملانێ كرن و دیلان گەرم دكر.

ل سالا (١٩٥٦)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن.

ئەڤ گوندە دكەڤیتە ناڤا جهەكێ ئاسێ و ل سالا (١٩٧٦)ێ ژ لایێ عیراقێ ڤە دهێتە خرابكرن و خەلكێ وێ دهێتە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەهێن زۆرە ملی و نها ژی گەلەك ژ مالباتێن دووتازای ل سەرسنكێ و قەدشێ و دهۆكێ د ئاكنجینە[٨٥].

## گوندێ زێر:

زێر ژ گوندێن نێروەیانە، ل سالا (١٩٧٧)ێ ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە هاتییە چۆلكرن.

## سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوندە دۆرپێچكرییە ژ لایێ باكووریڤە ب گوندێ جارمەندا و ژ لایێ باشووریڤە ب گوندێ رێشمە، هوس ژی دكەڤیتە رۆژهەلاتا گوندی و بێتڤە ژی ل رۆژئاڤا گوندییە.

## پێكهاتا گوندی:

زێر دابەشی سەر چوار بنەمالێن سەرەكی دبیت (مالا ئیسلام، مالا ژووری، مالا بەرۆژیا، مالا تۆڤی یا)، ژمارا خەلكێ ڤی گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٤ كەس بوون[٨٦] و سالا (٢٠١٤)ێ ژ ١٧٠ سەرۆك خێزانا پێكدهات.

ژ بلی گوندێ سەرەكی، هەر دو خرابە گوندێن (دێرخەلا و كاڤلا گوندی) ژی دكەڤنە د ناڤا سنوورێ زێر دا. ل زێر سێ كانیێن بەرناس هەنە كو د سەردەمێن كەڤندا بو مەبەستا ڤەخوارنێ هاتینە ب كارئینان، ئەو ژی (كانیا دێرێ، كانیا چەمكی، كانیا بەرۆژی)نە و ژ بلی ڤێ یەكێ ژی كوكە و بیاو و بەرێ ئاڤێ ژی خەلكێ زێر بۆ مەرەما ب خودانكرنا تەرش و كەوالی ب كارئینانە وەك زۆم چونكی جهێن

هەرە باش و ب بەرەکەتن.

زێر یێ دەوردایە ب چیایێن (باسکی، کوگە، نیرەبو، شیواسیڤا) و وان ژ بەرهەمێن چیا مفا وەرگرتینە.

شڤانکاری و جۆتیاری کارێ سەرەکیێ خەلکێ گوندێ زێر بوو، پەز و میهـ خوداندکرن و مفا ژ بەرهەمێن وان وەردگرت، د وەرزێ جۆتیاریێ و چاندنێ دا زەڤیێن خۆ د کێلان و برنج و گەنم و جەهـ د چاندن.

د ناڤا چیایێن گوندی دا هژمارەکا زێدە ژ گیانەوەرێن کویڤی هەنە و گەلەك جاران دهاتنە نێچیرکرن، چونکی د سەردەمێ کەڤندا خەلکێ نەچار بوو کو کارێ نێچیریێ بکەت داکو پێ بژیت.

زێریان ژی مینا خەلکێ دیتر داوەت و شەهیان دکرن و پتریا جاران ل دەستپێکا وەرزێ بهارێ یان ل داویا وەرزێ پاییزێ بوون، چونکی د ناڤا ڤان هەر دو وەرزان دا خەلکێ مژویلی کارێ خو بوو.

زارۆکان ژی د دەما ڤالا دا یاریێن خۆ یێن تایبەت دکرن کو ئەو ژی (گۆکانێ، هولانێ، کێلەبەرانێ و گوستیرکانێ) بوو.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧١)ێ دگەهیتە زێر و بەری هنگی خەلکێ وان یێ نەچار بوو بەرڤ گوندێن دیتر بچن.

پشتی کو ل سالا (١٩٧٧)ێ گوند دهێتە کاڤلکرن و ڤالاکرن، خەلکێ زێر د سالێن هەشتیان دا بەرەڤ دەڤەرێن رزگارکری دچن و دوبارە گوندێ خۆ ئاڤا دکەن، تا سالا (١٩٨٨)ێ ل سەر گوندی د مینن، د ئەنفالاندا دوبارە گوندێ زێر دگەل عەردی راست دبیت و هەتا نها نەهاتیە ئاڤاکرن و هەرێ کاڤلە، خەلکێ گوندی بەلاڤەنە ل سەر کۆمەلگەهـ و باژێرێن مەزن[٨٧].

## گوندێ کەرو:

کەرو یان (قارۆ) ژ گوندێن مەسیحینشینە ل ناڤ عەشیرەتا نێروە.

### سنوورێن گوندی:

باکووری گوندێ سەرنێ، باشووری گوندێ زێوە، رۆژهەلاتی گوندێن ئەلە و شیڤیێ و ل رۆژئاڤای ژی گوندێ بێزنۆرێ نە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ کەرو ئاشورینە و ئایین مەسیحی، دابەشی سەر شەش ئیجاخان دبیت (مالا قەشا، مالا ژێری، مالا سولاقا، مالا خەوشابێ، مالا یەڵد، مالا وخەنا، هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٩ کەس بوون[٨٨] و سالا (٢٠١٤)ێ ژمارا خەلکێ گوندی ژ ٨٥ سەرۆك خێزانان پێکدهات.

دێرا مارخنانا (شانەدێرا سەرکەڤران) ئێکە ژ دێرێن ڤی گوندی ب هەڤبەشی دگەل هەر سێ گوندێن دیتر یێن مەسیحیا ل نێروە و ژ بلی ڤێ دو دێرێن دیتر ل کەرو هەنە (دێرا مارقور یاقوس، دێرا مارگی وەرکس) و نەخشەیێن کۆلای ل سەر دیوارێن ڤان دێران هێشتا د دیارن[٨٩].

چیایێن مەرین و پشتا رەشە ڤی گوندی دووریێج دکەن و کانیا گوندی و کانیا مخەلێ و کانیا نزاری ژێدەرێن ئاڤێنە بۆ خەلکێ گوندی.

ئێرەمیا، یوخەنا، یوسف و شمونی ژوان سترانبێژێن فلکلورینە ل ڤی گوندی، وان ب سترانێن کوردی هەر دەم جڤات گەرمدکرن. ل سالا (١٩٧٦)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ گەهشتیە گوندێ کەرو.

کەرو ل سالا (١٩٧٨)ێ ل سەر دەستێ حکومەتا عیراقی هاتیە خرابکرن و پشتی کو خەلکێ ڤی گوندی هاتیە ڤەگوهاستن بۆ دێرەلۆکێ دوبارە ل سالا (١٩٨٢)ێ هێدی هێدی خەلك قەستا دەڤەرێن رزگارکری دکەن و دوبارە گوندی ئاڤا دکەن، لێ د هەوێن ئەنفالاندا ل سالا (١٩٨٨)ێ کاڤل دبیت و تا نها نەهاتیە ئاڤاکرن[٩٠].

## گوندێ زێوەشکان:

زێوەشکان ئێکە ژ گوندێن نێروەیان دکەڤیتە دەڤەرا نهێلێ ل سەر سێگۆشەیا دەڤەرێن نهێل و نێروە و بەرواری، نها یا گرێدای ناحیا دێرەلۆکێ یە، ل بەری سالا (١٩٧٩)ێ و چێبوونا ناحیا دێرەلۆکێ

سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ ڤە بوو[91]. ناڤێ وی پێكهاتییە ژ دو پەیڤان (زێ + شكان) واتە زێ شكان ب واتایا چەم. بۆ جارا ئێكێ ل سالا (1978)ێ هاتییە خرابكرن. ب دروستی نەهاتییە زانین كانێ دیرۆكا چێبوونا وی بۆ كیژ سەردەمی ڤەدگەریت چونكی هەتا نها ژبەر كاودانێن ئەمنی ل ڤێ دەڤەرێ دووڤچوونا زانستی بۆ نەهاتییەكرن.

## سنوورێن گوندی:

زێوەشكان هەر چوار كنارێن وێ چیانە، رووبارێ زێ مەزن ل لایێ رۆژهەلاتی دبەر گوندی را دەرباز دبیت، ب ڤێ یەكێ گوند دبیتە خودان ئاقارەكێ باش و جهەكێ دلڤەكەر. سنوورێن وی ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە هەردو گوندێن بێزنۆر و گەرویە و ل لایێ باكووری گوندێن بەرواری ژووریا كارە و بالۆكانە، باشوورێ گوندی گوندێن نهێلێ (سێر و كركو و بناڤی) نە، ل لایێ باشووری ژی گوندێن نهێل و نێروەیان (رەشاڤا، زلیێ، هێتۆتێ، سیتاس، شیڤیێ)نە.

## پێكهاتا گوندی:

گوند پێكهاتییە ژحەفت ئیجاخان، ئەو ژی (مالێت عەبدوللا، مالێت مەلا، مالێت موسا، مالا عەلیێ، مالا شێرێ، مالا تاجێ، مالا صوفی ئەحمەد) و هەرسێ بنەمالێن بەرێ كەڤنترین مالباتن ل زێوەشكان[92]. هژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (1957)ێ 208 كەس بوون[93] و ل سالا (2014)ێ ژ 300 سەرۆك خێزانا پێكدهێت[94]. بەری گوند بێتەخرابكرن ژ سێ تاخان (زێوە- شكان- حەلان) پێكهاتیبوو ، هەر هەموو 76 مال بوون[95].

زێوا حەلان ژی ئێكە ژ وان گوندێن دكەڤیتە د چوارچوڤێ ڤی گوندی دا وەك خرابە گوندە سەر ب زێوەشكان ڤە[96] و ژ بلی ڤی گوندێ هەنێ بەریانێ ژی گوندەكێ دیترێ خرابەیە كو ئەو ژی دكەڤیتە د سنوورێ زێوەشكان دا. دیسان سێ كەل ل گوندی هەنە یێ ب كەڤری ڤە، ئەو ژی كەلا مەزن كو د گۆتنێ قەسر، یان كەلا میر بەدرێ، كو ئاڤاهییەكێ مەزنە و جهێن مالان تێدا خویایە و ل ڤێ داوێ ئالف دكرنێ، دبێت دەمەكی دا میر ژی چووینە وێرێ ژبەر كانیێن میر بەدرێ كو دكەڤیتە دناڤبەرا زێوە و گوندێ درگنێ دا، هەروەسان كانییا میرا ژی یا ل وێرێ هەی، لێ نەهاتییە زانین كا مێرێن ئامێدیێ یە یان یێن نێروەیانە؟[97].

ل سالا (1983)ێ بارەگایێ لقێ ئێكێ پارتی دیموكراتی كوردستان ژ دەڤەرا زاخۆ (كۆماتە) دهێتە ڤەگوهاستن بو ڤی گوندی[98] و پشتی هاتنا بارەگایێ لقێ ئێك هەر ل ڤی گوندی چەند گۆڤار د ناڤا بارەگایی دا هاتینە دەرئێخستن و ژ وانا كوڤارا مەتین و گۆڤارا گازیا خویندكار و لاوان[99]، ژ بلی بارەگایێ لقێ ئێك یێ پارتی كەرتێ بەهدینان یێ حزبا شیوعی یا عیراقی ژی ل ڤی گوند بوو و د ناڤا بارەگایێ ڤێ حزبێ دا گەلەك بەلاڤۆك هاتینە دەرئێخستن و ژ وانا (الرافد، رافد زێوە، مناضل)[100]. لێ پشتی هەوێن ئەنفالان سالا (1988)ێ بارەگایێ لقێ ئێكێ پارتی دهێتە چۆلكرن.

ژبەر هەبوونا لقێ ئێكێ پارتی دیموكراتی كوردستان و ناڤەندا حزبا شیوعی یا عیراقی ل ڤی گوندی، گوند ل 5 ێ خزیرانا سالا (1987)ێ ژ لایێ فرۆكەیێن عیراقی ڤە دهێتە كیمیابارانكرن و ترس ل جەم خەلكی پەیدا دبیت[101].

ل سالا (1971)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن.

ل زێوەشكان گەلەك جهێن ئاسێ هەنە، دیسان گەلەك چیایێن وەكی (كەلێ، دەریێ هرچا، رەبەن و گوسكێ) هەنە كو د سەردەمێن كەڤن دا مرۆڤان بۆ ژیانێ ب كاردئینان، هەروەسان چەندین رێك لێ هەنە وەكی (رێكا دەریێ سێری، رێكا گەلیێ زەرە، رێكا گەلیێ بەریانی، رێكا خەولكی، رێكا كاڤێ). ژبلی هەبوونا شكەفتان مینا شكەفتێن (چوچكا، خولی، رەڤەزێ، گەلی شكەفتێ، سەرئاقد، ئاڤی، بەرلاتێ، مالا شیری، دودەر).

كارێ خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، زەڤیێن ئاڤی و دێم هەبوون و بەرهەمەكێ باش ژ هنار و تری و هژیر

و جۆرێن دی یێن فێقی هەبوون، ژ بلی بەرهەمێن چاندنێ وان مفا ژ بەرهەمێن چیا ژی وەردگرتن.

میر بەدر و سەرۆکانی (سەرێ رەزی)، و گەرماڤ و کانییا مەلاتی ژ کانیێن سەرەکینە ل ڤی گوندی، ژبلی گەلەك کانیێن دی مینا (خالەڤەند، کانییا بەر پانێ، کانییا سەر ئاڤدی، کانییا کونمێشێ، کانی کەواسکێ، کانی نیڤشکی و...) خەلکی بۆ ڤەخوارنێ مفا ژێ وەردگرت. کەزان و مازی و کەنکرۆك ژی ژ وان بەرهەمانە کو دهاتنە فرۆتن و ب داهاتێ وان خەلکێ زێوەشکان بەردەوامی ددا ژیانا خۆ.

ل چیایێن ڤی گوندی گەلەك جۆرێن گیانەوەرێن کیڤی و مەترسیدار مینا مار و هرچا و گورگ و پەز کیڤی هەنە، گەلەك جاران د سەردەمێن کەڤن دا پەز کیڤی د بوونە نێچیرا نێچیرڤانان.

نها خەلکێ رەسەنێ گوندی پتریا وان ل دهۆکێ د ئاکنجینە، ژیانا وان ژی ل سەر مووچە و کاسبکاریێ یە، خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٨٢)ێ گوندێ خۆ وەکی دەڤەرەکا رزگارکری ئاڤاکرن، لێ ژ نەچاری ل سالا (١٩٨٨)ێ ل ئەنفالان جارەکادی کاڤلدبیت و خەلکێ وێ قەستا وەلاتێن جیران دکەن و هەتا نها هەر ب کاڤلی مایەڤە و نەهاتییە ئاڤاکرن[١٠٢].

## چیرۆکا میر تەوەکل:

ڤێ چیرۆکا ئەفسانەیی پەیوەندییەکا راستەوخۆ ب ڤی گوندیڤە هەیە، تێدا هاتییە: پیر تەوەکل و میر هەسن و پیر خەجیج دو برا و خویشکەکن، شێخێ تەوەکل ناڤ و دەنگێن خۆ هەبوون، دبێژن میر تەوەکل چوو بەر دلۆڤانیا خودێ، خەلکێ گوندێ زێوە گۆتن ئەم دێ بەین ل زێوە ڤەشێرین، خەلکێ گوندێ مایێ گۆتن ئەم دێ ل مایێ ڤەشێرین و دا نەخۆشی کەڤیتە دناڤبەرا واندا، داویێ چوو خەونا ئێکی گۆت هەڤدژیا ئێك نەکەن، و خۆ بدەنە بن داربەستێ، داربەست بۆ کێ رابوو من ل وێرێ ڤەشێرن و جەڤەنگێ من بلا ل گوندێ دی بیت. دبێژن زێوەیا داربەست راکر، رانەبوو و بۆ گوندێ مایێ رابوو، ژبەر هندێ برنە مایێ ڤەشارتن و هێمایێ وی ل زێوە تەنشتا مزگەفتێ چێکرن[١٠٣].

## گوندێ زێوەسەر:

زێوەسەر دکەڤیتە سەر سنوورێ د ناڤبەرا باشوور و باکوورێ کوردستانێ، ژ گوندێن نێزوەیانە. ژبەر کوئەڤ گوندە دکەڤیتە جهەکێ گەلەکێ بلند لەورا ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤکرن.

## سنوورێن گوندی:

باکووری گوندێ ئەرژێ یێ باکوورێ کوردستانێ، باشووری گوندێ دزگە، رۆژهەلاتی گوندێ بێتفە و رۆژئاڤای ژی گوندێ دوتازا نە.

ژ بلی گوندێ سەرەکی سێ خرابە گوند کو ئەو ژی (گورێ، هنجنێ و دەری دێرکێ) دکەڤنە د چوارچوڤێ سنوورێ گوندێ زێوەسەرێ دا.

چیایێ کوکە و دوشکێ پیرێ و چیایێ مەمکی بەژنا خو ل هەمبەری ڤی گوندی بلند کرینە و رەوش و خۆشی و ژیان داینە زێوەسەر.

## پێکهاتا گوندی:

زێوەسەر دابەشی دو ئیجاخان دبیت (بنەمالا بەدێ، بنەمالا شێخەزینا)[١٠٤]، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٠٥] و سالا (٢٠١٤)ێ هژمارا خەلکێ وی نێزیکی ٦٥٠ کەسان بوون[١٠٦]، ژین و ژیانا وان د کەڤندا ل سەر شڤانداریێ و چاندنێ بوو.

خەلکێ ڤی گوندی بۆ مەرەما ڤەخوارنێ و چاندنێ ئاڤا کانییان ب کار دئینان و مفا ژێ وەردگرتن. ل چیایێن زێوەسەرێ پەزکیڤی و هرچ و گورگ دگەل گەلەك جۆرێن تەیر و کەوالێن کویڤی هەنە.

گوندێ زێوەسەرێ ل بەری سەرهەلدانێ سێ جاران هاتییە خرابکرن، دگەل کو هێشتا ب دروستی نەهاتییە زانین کانێ دیرۆکا دروست بوونا وی بو کیژ سەردەمی ڤەدگەریت، جارا ئێکی ل دووڤ ڤەگێرانا خەلکێ گوندی ددەمێن بەرێدا و ژ ئەنجامێ روودانێن خۆجهی هاتییەخرابکرن، بەلێ د بیرهاتنا خەلکێ گوندیدا ئێکەم جار ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٧٦)ێ ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە هاتییە کاڤلکرن، پشتی

كو خەلكێ دەڤەرێ د سالێن (١٩٨١)ێ بۆ (١٩٨٢)ێ قەستا دەڤەرێن رزگاركری دكەن، دوبارە زێوەسەرێ ژی دهێتە ئاڤاكرن لێ ژیان تێدا گەلەك یا بەردەوام نابیت و ئەنفال ب سەر دا دهێن و ل سالا (١٩٨٨)ێ بۆ جارەكا دیتر خرابدبیت و نها خرابە گوندە و خەلكێ وی ل دێرەلۆكێ و تەناهی و دهۆكێ د ئاكنجینە.

بەری سەرهەلدانێ چ جاران خواندنگەهـ نەگەهشتییە گوندێ زێوەسەرێ و خویندكارێن ڤی گوندی نەچار بوون ژ بۆ خواندنێ قەستا گوندێن دەوروبەر بكەن و ئەڤە ژی دبوو ئەگەرێ دەست بەردانێ ژ خواندنێ.

## گوندێ ساكا:

ساكا ژ گوندێن نێروەیانە، كەڤنارە گوندە و نەهاتییە زانین كانێ دیرۆكا ئاڤابوونا وی بۆ كیژ سەردەمی ڤەدگەریت.

### سنوورێن گوندی:

گوند هەڤسنوورە ژ لایێ باكووریڤە دگەل گوندێ زێوەسەرێ، ل باشووری گوندێ سەرنی، ل رۆژهەلاتێ ساكا گوندێ بێتفە جهـ دگریت و گوندێ نێروە ژێری ل رەخێ رۆژئاڤا گوندییە.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە دابەشی چوار مالباتا دبیت (مالا سەیدو، مالا عەمەر، مالا خانۆ و مالا سەلیم)، هژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٢ كەس بوون[١٠٧].

ل ساكا ژی مینا هەر گوندەكێ دیتر ژیان ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و چاندنێ بوو، پەز و میە خودانكرن و بەرهەمێ وان ژی بو مەرما خوارنێ و فرۆتنێ ب كاردئینان چونكی ژ سنوورێ دگەل باكوورێ كوردستانێ گەلەك نێزیك بوون.

خەلكێ ڤی گوندی هریا پەزی دفرۆتن و هندەك جاران ژی بۆ رایێخان ب كارئینایە، و شیر و پەنیر و ماست ژی وەك خوارنا سەرەكی یا رۆژانە ب كار دئینان.

ل ساكا مل ب ملێ گەنم و جەهی خەلكی برنج و گەنمە شامی ژی كرییە، وان ژ بەرهەمێن چیایی ژی مفا وەرگرتیە مینا لیش و سوریاز و كەنگر و كڤاركان.

ل ساكا ژیان تەڤ ب كوردەواری بوو، ژنان ژ بلی كارێ مالدارێ و بێریڤانیێ د دەما خۆشییاندا ب كراس و فیستانێن رەنگا و رەنگ و زەلامان ژی ب شال و شەپكان دیلان ب درێژاهییا رۆژان كرینە و وان د دەما شاهی و داوەتا دا سێ شەڤ و رۆژان ل سەر ئێك دیلان گرێدانە.

ساكا هەتا وێ رۆژا كو هاتییەخرابكرن ل سالا (١٩٧٨)ێ چ جاران خواندنگەهـ نەگەهشتییێ و خویندكارێن وان نەچار بوون كو بۆ خاندنێ قەستا گوندێن دەوروبەری خۆ بكەن.

د هەوا خرابكرنا گونداندا ل سالا (١٩٧٨)ێ گوندێ ساكا ژی ب دەستێ حكۆمەتا عیراقی دگەل عەردی تەخت دبیت و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ گوندی ژی نها ل دێرەلۆكێ و دهۆكێ بەردەوامیێ ددەنە ژیانا خۆ[١٠٨].

## گوندێ سپێر:

سپێر ژ گوندێن نێروەیانە، پێشتر سەر ب ناحیا بێبۆ و نها سەر ب دێرەلۆكێ یە، سالا (١٩٧٩)ێ د هەوا خرابكرنا گونداندا سپێر ژی هاتییەهەرفاندن و خەلكێ وێ هاتینە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەها دێرەلۆكێ.

### سنوورێن گوندی:

ژ لایێ باكووریڤە یێ هەڤسنوورە دگەل گوندێ بێتفە، ژ لایێ باشووریڤە ژی گوندێ باشێ هەیە، ل رۆژهەلاتێ سپێر گوندێ بێبو یە كو پێشتر سەنتەرێ ناحیێ بوو و گوندێ سەرنی ژی دكەڤیتە رۆژئاڤا سپێر.

سپێر ل سالا (١٨٣٠)ێ هەتا (١٨٤٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن و میرێ نێروە ئەڤ گوندە وەك دیاری دابوو سێڤدین و تاژدین چونكی خۆشمێر بوون و ل هەمبەری میرێ رەواندزێ بەرەڤانی ژ كەلا نێروە كربوو[١٠٩]، رامانا

وێ واتە (سپاردن)[١١٠] ددەت. ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١١١] و سالا (٢٠١٤)ێ هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ژ ٢٥٠ سەرۆك خێزانا پێکدهێت.

سپێرکا خراب و سنگورا دو خرابە گوندن دکەڤنە د چوارچوڤێ ڤی گوندیدا، ژ بلی ڤێ یەکێ چیایێ مەزن و چیایێ دەمی و چیایێ رەزکا ل دەوروبەرێن گوندی هەنە و د گەلەك قوناغان دا سپێری ژ هەر جۆرە هێرش و تالانکرنەکێ پاراستینە، ل سالا (١٩٣٠)ێ ژبەر پەیدابوونا نەخۆشییا سۆرکا ل ڤی گوندی ژمارەکا زێدە ژ خەلکی کۆچبار دبیت و ب تەنێ ٥٠ کەس ل وێ نەخۆشیێ قورتال دبن[١١٢].

## پێکهاتا گوندی:

سپێری د کۆکا خۆدا ژ مزووری ژووری یا نە و ل گوندێ ئەرگۆشێ هاتینە ناڤ نێروەیا[١١٣]، ژ دو بنەمالا پێکدهێن ئەو ژی (مالا سێڤ دین و مالا تاژدین). ل ڤی گوندی سێ جهێن گەلەك بەرناس هەنە کو جهێ پویتەپێدانا گوندیا بوون وەك شکەفتا قەشەی، کانیا فەلەی و مزگەفتا گوندی، ژبەر دەست کورتیێ جل و بەرگێن وان د بێ سەروبەر بوون[١١٤].

کێریێ ژووری جهەکێ ب بەرەکەت بوو و خەلکێ گوندی مینا زۆما پەزی بکارئینایە چونکی د سەردەمێ کەڤندا کارێ وان پەزداری و کەدکاری بوو، ژیانا وان سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

ل سپێر، کانیا میرا و کانیا سار و کانیا ئاڤ گلالا و سەرۆکانی ژ وان کانییانە کو بۆ مەبەستا ڤەخوارنێ د سەردەمێن بووری دا ژ لایێ خەلکێ گوندی ڤە هاتینە ب کارئینان. خەلکێ ڤی گوندی ژی کارێ وان یێ سەرەکی ژ لایێ چاندنێ ڤە گەنم و جەهـ و برنج و پتات و ماش و کونجی و گەنمۆك ب بەردەوامی چاندینە و ژ بەرهەمێ وان بو دەبارا ژیانێ مفا وەرگرتیە.

هەروەسا وان کەزان و مازی و بەڕوی ژی د گەلەك لایەنێن ژیانێ دا بکارئینانە و ل چیایێن دەوروبەرێن گوندی گەلەك بەرهەمێن گیایی یێن بهاری ژی هەبوون وەك سوریاز و لیش و کڤارك.

چۆخۆ، ملانێ، سێپێکێ، قلیچ و شامیرانێ ژ دیلان و شاهیێن هەرە بەرنیاسن ل سپێر و زەلاما ب شال و شەپکا و ژنان ژی ب کراس و فیستانێن کوردی ئەڤ جۆرە دیلانە دکرن.

ژ خوارنێن خەلکێ ڤی گوندی ژی: ئیبراخ و کوتلەدوك و ترشك و دانقوت و دەوین گەلەك ب کارئینانە و زارۆکێن وان ژی چیڤ کێشانێ و کێلەبەرانێ و پاستەنگانێ د رۆژێن خۆ دا دکرن. خواندنگەهـ ژی چ جاران نەگەهشتبوو گوندی. ل سپێر کەو ژی ب هژمارەکا زێدە هەبوون و گیانەوەرێن دیتر نە زێدە دیار بوون.

سالا (١٩٧٨)ێ بۆ جارا ئێکێ ئەڤ گوندە ژ لایێ دەستەلاتداریا عیراقێ ڤە دهێتەکاڤلکرن و خەلکێ وێ ب زۆری دهێنە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەهان، لێ د سالا (١٩٨١)ێ دا دوبارە خەلکێ سپێر قەستا دەڤەرێن رزگار کری دکەن و گوندێ خۆ سەر ژ نوو ئاڤا دکەن، لێ ڤێ ئاڤابوونێ زێدە نەڤەکێشا و ئەنفالان ل سالا (١٩٨٨)ێ ب سەرداگرت و سپێر دوبارە کاڤلدبیت و تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن[١١٥].

## گوندێ سینیا:

سینیا: ژ گوندێن نێروەیانە، ل دووڤ گۆتنەکێ ناڤێ گوندی ژ ناڤێ خوداوەندێ هەیڤێ (سین) هاتییە کو ل سەردەمێ ساسانییان دگۆتنە خوداوەندێ هەیڤێ (سین)، ئەڤ بۆچوونە ژی ژ وێ چەندێ هاتییە کو گوندەکێ زۆر کەڤنە و چەندین کاڤلە گوندێن کەڤن لێ هەنە وەك: کاڤلەگوندێن سینەڤن، بێتوتێ، ئاڤاری، بانیێ، گرێ کناڤێ، شەخصکێ، نخاڤا گرێ ملا زادە[١١٦].

## سنوورێن گوندی:

باکووری گوندێ بێبۆ، باشووری گوندێ کاروکێ، رۆژهەلاتی گوندێ بێزەلێ (یێ عەشیرەتا رێکانییان) و رۆژئاڤای گوندێ بیرۆمان.

### پێکهاتا گوندی:

ژ سێ ئیجاخان پێکدهێت: ئیجاخا مزووریان و ئیجاخا ساما کو هەردو ژ گوندێ مێرووزێ یێ مزووری ژووریی هاتینە ڤی گوندی و ئیجاخا بەگا ئەڤە ژی ژ گوندێ سەرنێ هاتییە ڤی گوندی، هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٤ کەس بوون[١١٧] و بەری ڤەگوهاستنا گوندی ل سالا (١٩٨٧)ێ ژ ٤٥ خێزانان پێکدهات، هندەك ژی ل سالا (١٩٧٥)ێ مشەختبوونە ئێرانێ و پێن مایی د دەمێ ڤەگوهاستنا گوندی حکومەتێ ل کۆمەلگەهێ باگێرا ئاکنجیکرن، ل سالا (٢٠١٤)ێ هژمارا خەلکی گوندی ژ هزار کەسان دەربازبوویە.

ژ دەسپێکا سەدسالییا بیستێڤە خەلکێ سینیا پشکداری د شۆرشێن کوردستانێدا کرییە، د شۆرشا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی تەتەر بەگێ سینی دگەل شێخ عەبدولسەلامی ل مووسلێ هاتییەسێدارەدان[١١٨]. هەروەسان خەلکێ گوندی پشکداری د شۆرشا بارزان -١٩٤٣ ١٩٤٥یدا کرییە، لەوما ژی چەند جاران هاتییەسۆتن و کاڤلکرن و خەلکێ وی مشەختبووینە، سالا (١٩٤٥)ێ ل سەر دەمێ شۆرشا بارزان، ل سالا (١٩٧٨)ێ و دوا جار ل سالا (١٩٨٨)ێ د سەر دەمێ ئەنفالاندا[١١٩].

چیایێ مەزن یان ژی چیایێ سینیا خۆ ل هنداڤی ڤی گوندی یێ بلند کری، هەروەسا ل سینیا کەلایەکا بلند ب ناڤێ کەلا دەشتکێ هەیە کو جهەکێ ئاسێ و بلندە و د سەردەمێن کەلەك کەڤندا هاتییە ئاڤاکرن، ژ بلی ڤێ کەلێ شکەفتا ناڤ قەشا کو نها ب شکەفتا برینداراا یا بەرنیاسە ل ڤی گوندی هەیە، ئەو ژی بۆ گەلەك مەرەما هاتییە ب کارئینان.

گەهشتن بۆ گوندێ سینیا گەلەکا ب زەحمەتە چونکی هەتا نها چ چادە و رێکێن خۆش بەرەڤ ڤی گوندی نەهاتینە راکێشان لێ ب پێیان ئەڤ گوندە ١٣ کیلومەتران یێ ژ سەنتەرێ دێرەلۆکێ دوورە. ل ڤی گوندی گەلەك جهێن باش هەنە کو د سەردەمێن کەڤن دا بۆ مەرەما زۆمێن پەزی هاتینە ب کارئینان وەکی (رەڤەلێ، کانی هەڤرس، پاشەگیری، ئوشکومەتا، نخاڤا، رەسکی، بێتوتێ، کانییا عاقد، سیارکێ و ئاقارێ کێختێ)نە، ئەڤ زۆمە بۆ خودانکرنا تەرش و کەوالی دهاتنە بکارئینان چونکی ژیانا سینیا ل سەر پەزی و چاندنێ بوو، و ژ وان بەرهەمێن کو د چاندنێ دا ب دەستڤە دهاتن (گەنم، جەهـ نۆك، نیسك، برنج، گەنمۆك، ماش، کونجی)نە. هەروەسا خەلکێ ڤی گوندی بەرهەمێ چیایی ژی بۆ مەرەما خوارنێ و فروتنێ ب کاردئینا وەکی کەزان و مازی یا.

### شوینوار و جهێن کەڤنێن گوندی:

کەلا دەشتکێ، هەروەسان شکەفتا ناڤ قەشا کو نها ب شکەفتا بریندارا دهێتەناڤکرن شکەفتەکا گەلەك مەزنە و دەرگەهێن وێ ل هەردو ئالیێن چیای هەنە جهێ نێزیکی (٣٠٠٠) سێ هزار کەسان تێدا هەیە، ژ زۆمێن گوندی (زۆما کانییا میران) ل سەر چیایێ لینکی یا ناڤدارە.

### ژ کانیێن گوندی یێن ناڤدار:

رەڤەلێ، کانی هەڤرس، ئوشکومەتا، نخاڤا، رەسکێ، بێتوتێ، چەما، چەما... و یێن دی[١٢٠].

سینیا د ناڤا گوندێن دەڤەرێدا گوندێ خۆشییا و شاهییا یێ بەرنیاس بوو، د دەما داوەت و شەهیانا دا خەلکێ وێ ب جل و بەرگێن کوردی دیلان دکرن و ب خوارنێن کوردەواری پێشوازی ل مێهڤانان دکرن.

ل سالا (١٩٦٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن و سالا (١٩٦٥)ێ یەکەمین ئامێرێ رادیویێ گەهشتییە ڤی گوندی.

پشتی سالا (١٩٨٨)ێ سینیا نەهاتییەئاڤاکرن و جهەکێ بەردایە و خەلکێ وێ د ناڤ کۆمەلگەهـ و باژێران دا ژیانێ دکەن[١٢١].

## گوندێ کارۆکا:

کارۆکا یان (کارۆکێ): ژ گوندێن نێروەیانە، پێشتر سەر ب ناحیا بێبۆ بوو، نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە.

## سنوورێن گوندی:

كارۆكا یێ هەڤسنووره دگەل گوندێ سینیا ژ لایێ باكووری ڤە، ل باشووری ژی چیایێ لینكی و گوندێ پیرانه، ل رۆهەلاتێ ڤی گوندی ژی كوكەرێ و هێتوتێ ژی دكەڤیته رۆژئاڤا كارۆكا. ب سێ دەمژمێرێن پیان مرۆڤ دشێت ژ دێرەلۆكێ بگەهیتە ڤی گوندی چونكی هەتا نها چ رێك و جاده ژ لایێ حكۆمەتێ ڤە نەگەهشتینێ. بنەرەتی ناڤێ گوندێ كارۆكا ژی ژ (تێراتی واته تێربونێ)[122] یێ هاتی.

## پێكهاتا گوندی:

كارۆكی ژ نەهـ ئیجاخ و مالباتێن مەزن پێكدهێن و ب ڤی رەنگی هاتینە دابەش كرن، (مالا عومەر، مالا حامد، مالا هێمو، مالا مەحمود، مالا عەلی یوسف، مالا عەلی فەتاح، مالا ئیبراهیم حەجی، مالا رەشید ئەسعەد و مالا كەریم خاجه)نه. هەروەسا دو مالێن وان د رەسەنایەتییا خۆدا نە كارۆكی و نێروەینە، ئەو ژی مالا عەلی یوسفە كو ژ مێردینێ یێ هاتی و مالا كەریم خاجه[123] ژی ژ گوندێ بێزەلێ هاتییە، كارۆكی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٨ كەس بوون[124] و سالا (٢٠١٤)ێ ب گشتی دبنه ١٥٠ سەرۆك خێزان.

خەلكێ گوندێ كارۆكا ژی وەك گەلەك گوندێن دیتر یێن دەڤەرێ و نێروەیان پشكدارییەكا بەرچاڤ د شۆرشان دا هەبوو و ب تایبەتی شۆرشا دووێ یا بارزان[125] و شۆرشا ئەیلوولێ دا.

ل ڤی گوندی چەندین شكەفت و كانی هەنە وەكی (شكەفتا داوودێ دین، شكەفتا كافر، شكەفتا مام سێتكی و شكەفتا مەندا)، كانی ژی ئەڤەنە: (كانییا سەر سویلێ، كانییا سار، كانی سێڤكێ، كانی بوركێ، كانییا مەزن، كانییا شلێ، بەركانیكێ، كانییا ئاقاری) و گەلەكێن دیتر كو خەلكێ ڤی گوندی ئاڤا هندەك ژ ڤان كانییا بۆ مەرەما ڤەخوارنێ یا هندەكان بۆ چاندنێ دهاتە ب كارئینان.

گەنم و برنج و گەنمۆك و كونجی و گارس و نیسك و نۆك ژ وان بەرهەمانە یێن كو خەلكێ گوندی د چاندن، چ بۆ خوارنێ و چ ژی بۆ فرۆتنێ.

هەروەسا گوندێ كارۆكا یێ بەرنیاسە ب خوێ و گێچێ، ل ڤی گوندی چالەكا مەزن یا خوێ هەیە كو دو كانییێن ئاڤێ دچنە سەر و ئێك ژ وان یا شرینە، لێ ئەڤ خوێیە یا گەلەك گوندا بوو چونكی دهاتە كرین و فروتن[126]، هندەكان مەنجەلەك هەبوو و هندەكا دو و سێ و ژبلی كارۆكیا گوندێن سینیا و بیرۆمان و هندەك گوندێن رێكانییان ژی ئەڤ خوێیە بۆ خۆ ب مەنجەلا كرییبوو، ژ بلی ڤێ یەكێ ل ڤی گوندی گرێن گێچێ هەنە و د سەردەمێ كەڤن دا خەلكێ وان دەڤەرا هەر هەموویا بۆ خۆ بكار ئینایە چ وەك كرین یان ژی وەكی مرۆڤكانی.

ل كارۆكێ گویز و كەزان و مازی گرسك و گوهیشك ب ژمارەكا زێدە مەزن هەنە، ژانا گەلەك ژ خەلكێ ڤی گوندی ل سەر وان بەرهەمان بوو، گەر كو پشكەكا زۆرا گوندییان د سەردەمێ كەڤن كارێ وان یێ سەرەكی دا بوو و هندەك ژی ب كارێ جوتیارێ ڤە د مژیل بوون.

كارۆكی ژی مینا هەر گوندەكێ دیتر د ناڤا خۆشی و نەخۆشیێن سەردەمێ خۆدا دەرباز بوونە و وان ژی گەلەك گرنگی دایە هەموو رەوشت و تیتالێن كوردەواری بگرە ژ جل و بەرگا و خوارن و سترانێن فلكلۆری و وان د رۆژێن خۆش یێن ژیانێ دا و د دەما دەوات و شەهیانان دا سێپێكێ و ملانێ و شێخانی و گولشێنی دكر و ب كەیف دكرن.

كارۆكێ گەركو نەهاتییە زانین كانێ دیرۆكا ئاڤابوونا وێ بۆ كیژ سەردەمی ڤەدگەریت لێ بەری سەرهەلدانێ دو جاران هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٧٨)ێ بوو و خەلكێ وێ ڤەگوهاستنە كۆمەلگەهێن زۆرە ملی، پاشان بۆ جارەكا دیتر ل سالا (١٩٨٢)ێ خەلكێ ڤی گوندی دچنە گوندێ خۆ وەكی دەڤەرەكا رزگاركری، لێ دوباره ل سالا (١٩٨٨)ێ بۆ جارەكا دیتر گوندێ وان خراب دكەن و تا نها نەهاتییە ئاڤاكرن ڤە. خەلكێ ڤی گوندی پشتی ئاوارەبوون و دەردەسەریێ نها ل باژێرێ دهۆكێ و كۆمەلگەها تەناهی ژیانێ دكەن.

## گوندێ كانی سارکێ:

كانی سارکێ: ژ گوندێن نێروەیانە، پێشتر سەر ب ناحیا بێبۆ و نها سەر ب دێرەلۆكێ یە.

### پێكهاتا گوندی:

گوندەكێ كەڤنارە و خەلكێ رەسەنێ وێ دابەشی سەر دو بنەمالا دبن (مالا ژێری، مالا ژووری). سەرژمێریا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٢ كەس بوون[١٢٧].

كانی سارکی د ناڤا هۆزا خۆدا خودان پێكەهـ بوون، د كەڤندا كارێ چاندنێ و شڤانیێ دكر، گەنم و جەهـ و ماش و نیسك و گەنمۆك د چاندن، ژ بلی كو وان بەرهەمێن گیایی یێن چیایی ژی ب كارئینانە.

كانی سارکێ یا دۆرپێچكریە ب چەندین گوندێن نێروەییان و خەلكێ ڤی گوندی ب بەردەوامی د ناڤا خۆشیێن گەلێ خۆدا بوون و وان دیلانێن كوردی د رۆژێن خۆش دا دكرن و د رۆژێن نەخۆش دا ژی مینا خەلكێ دەڤەرێ مل دایە بەر رێبازێن كوردەواری.

ل كانی سارکێ خواندنگەهـ نەبوو و خویندكارێن ڤی گوندی نەچاربوون كو قەستا خواندنگەها گوندێ بێزنوور بكەن، بۆ جارا ئێكێ ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٧٨)ێ د هەوێن خرابكرنا گوندێن دەڤەرێن سنووریدا هاتییەخرابكرن و خەلكێ وێ ب زۆری رەوانــەی كۆمەلگەهێن زۆرەملی هاتینەكرن. ل سالێن (-١٩٨١ ١٩٨٢)ێ گەلەك ژ خەلكێ گوندی دوبارە قەستا دەڤەرێن رزگاركری دكەن و گوندێ خۆ ئاڤادكەن لێ ل سالا (١٩٨٨)ێ و د هەوا ئەنفالان دا ئەڤ گوندە دهێتە خرابكرن و تا نها وەك كاڤلە گوند مایە و كەس لێ ناژیت[١٢٨].

## گوندێ نێروە:

### سنوورێن گوندی:

نێروە گوندەكێ سنوورییە دگــەل باكوورێ كوردستانێ، ل رۆژهەلاتێ ڤی گوندی گوندێ دزگە هەیە، ل رەخێ رۆژئاڤا ژی گوندێ دوتازا، ل باشـووری ژی گوندێ نێروە ژێری هەنە، ئەڤ گوندە هندەك جاران ب هێنشـمت یان ژی نێروە ژووری) دهێتە ناڤ كرن.

ئەڤ گوندە یێ دوورپێچكرییە ب چیایێن خمبینی و باسكی ژ رەخێ باشووری ڤە و كێرێ نێروە و چیایێ كوكە ژ رەخێ رۆژهەلاتی ڤە و گرێ داهولێ گەوری ل رەخێ باكووری و ل رۆژئاڤا ژی سەرسامكا هەیە.

نێروە گوندەكێ گەلەكێ سەرنج راكێش و سحراویە، دیمەنێن وێ گەلەك د قەشەنگ و جوانن. سەدان سالانە ل سەر گوندێ خۆ ژیانێ دكەن، لێ ب دروستی ناهێتە زانین كانێ ئاڤا بوونا وی گوندی بۆ كیژ سەردەمی ڤەدگەریت.

گوندێ نێروە رۆلەكێ دیار د ناڤا شۆرشا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی دا گێرایە، ئێكەم شەهیدێ دگەل شێخێ (محەمەد ئاغایێ هێشەتی)[١٢٩] بوو كو خەلكێ گوندێ نێروەیە و ئاغایێ عەشیرێ ژی بوو، ژ بلی ڤێ یەكێ گوندێ نێروە د ناڤا (شۆرشا دووێ یا بارزان)[١٣٠] دا ژی خودان رۆل و پێكەهـ بوو دناڤ شۆرشێ دا.

خەلكێ گوندێ نێروە ل سالا (٢٠١٤)ێ ژ ٢٨٠ سەرۆك خێزانان بوون، ژ بلی سەنتەرێ گوندی بخۆ چەند كاڤلە گوند و خرابە گوند ژی د چوارچوڤێ ڤی گوندی دا هەنە وەك (سەرسامكا، هێشەتێ، دەری دیركێ، ناڤ گوندكا).

نێروە هەروەك هندەك ژ خەلكێ گوندی دبێژن: ب رامانا (میرات)[١٣١] دهێت، ل ڤی گوندی كەلا نێروە جهەكێ بەرنیاسە و سەرێ خو بو هەیاما سەدان سالایە بلند راگرتییە، ئەڤ كەلایە كو خودان چەندین ناڤانە وەك (كەلا برادەران، كەلا میر قەشەی، كەلا جەوانان، كەلا بنیانش)[١٣٢]، رەزێ میران ژی جهەكێ بەرنیاسێ ل ڤی گوندی دگەل گۆرستانا زەرەدەشتیا ل باكوورێ گوندی و گۆرستانا جوهییان ل رۆژهەلاتێ گوندێ نێروە، ژ بلی گۆرستانا جوهییان ل گوندێ نێروە كنیشتە و مەدرەسەكا جوهیان ژی د سەردەمێن كەڤن دا هەبوو[١٣٣]، هەروەسا ل ڤی گوندی ناووسك و چوار ئاقد و پێنج سێریج ژی وەك جهێن شوینواری هەنە. هەروەسا خواندنگەهەكا ئایینی یا كەڤنارە هەبوو كو بۆ سەدان سالا ڤەدگەریت، د هەمان دەم

دا قورئانەكا دەست نڤیسی یا بابێزدینی ھەبوو[١٣٤]، باب ئێزدین كەساتییەكێ ئولدار گوندێ نێروە بوو و ئەڤ قورئانە كو نھا یا پاراستییە ژی ب دەستێ ژنەكێ بۆ باب ئێزدینی ھاتییە نڤیسین.

بالیل و سابو و ھێشەتی ژ مالباتێن سەرەكی یێن گوندێ نێروەنە كو ژ خرواتە ھاتینە[١٣٥]، خرواتە دەڤەرەكە دكەڤیتە رۆژھەلاتێ دەڤەرا ھەكاریا ل باكوورێ كوردستانێ و ل سەر ئەرد و ئاخا گوندێ نێروە ئاكنجی بوونە.

ل ڤی گوندی ٧٢ كانیێن ئاڤێ لێ ھەنە دگەل كۆمەكا زۆمێن پەزی وەك (كانییا بەرێ ئاشا، كاڤلێت توخیبا، بیالی، گوھوری، خەرەگول)، و خەلكێ گوندی مفای ژێ وەردگرن.

دگەل كو بەروی ل ڤی گوندی د كێمن لێ ھژمارەكا بەرچاڤ ژ دار كەزانان ل نێروە ھەنە، كارێ سەرەكی یێ خەلكێ گوندی خودانكرنا تەرش و كەوالی و چاندن بوو، وان پەز و میھ ب ھژمارەكا مەزن ب خودانكرینە و بەرھەمێن وان بۆ خوارنێ و فروتنێ ب كارئینانە، ھەروەسا وان گەنم و جەھـ و نۆك و گەنمۆك د چاندن و مفا ژێ وەردگرتن.

ل سالا (١٩٥٨)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەھـ گەھشتییە ڤی گوندی و مامۆستا ئیبراھیم ئامێدی ژ مامۆستایێن پێشەنگ بوو ل گوندی، ئەڤ گوندە ھەر چەند د گەلەك سەردەمان دا خودان دەسەلات و فەرمان رەوایی بوو، لێ بەری سەرھەلدانێ دو جاران ھاتییەخرابكرن، بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٧٧)ێ و بۆ جارا دووێ ل سالا (١٩٨٨)ێ.

نھا پتریا خەلكێ گوندێ نێروە ل دھۆك و دێرەلۆك و تەناھی د ئاكنجینە و ژیانا وان ل سەر مووچە و كاسبكاریێ یە[١٣٦].

## گوندێ نێروە ژێری:

نێروە ژێری: ئێكە ژ گوندێن خۆش و بالكێشێن سەر ب عەشیرەتا نێروەڤە، نێروە ژێری (نیروە خەتێسا)، ل سالا (١٩٧٦)ێ ب دەستێن حكومەتا عیراقێ ھاتییە خرابكرن، ھەموو خەلكێ وێ سەر ب ئایینێ مەسیحی نە و ب ئاشووری دھێنە ل قەلەم دان.

### سنوورێن گوندی:

باكوورێ گوندی ھەر ئێك ژ گوندێن دوتازا، نێروە ژووری و دزگە ھەنە، ل باشووری ھەردو گوندێن كەرو و بێزنورن، گوندێن سپیندار و بێتكار ژی ل رەخێ رۆژئاڤایی نە و گوندێن سەرنی و ساكا دكەڤنە رۆژھەلاتێ ڤی گوندی.

### پێكھاتا گوندی:

گوندەكێ مەسیحینشینێ نیروەییانە، ژ دو ئویجاخان (بنەمالا قەشە مەكۆ و بنەمالا دەمۆ) پێكدھێت، سالا (١٩٥٧) ١٤٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣٧] و ل داوییا (٢٠١٣)ێ سەرژمارا خەلكێ ڤی گوندی دبوو ٣٥٢ كەس، گەلەك ژ وان نھا ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆكێنە و ھندەك ژی ل دھۆكێ ئاكنجینە، گەلەك مالباتێن دی نھا ل دەرڤەی وەلاتی دژین.

دیرۆكا دروستبوونا ڤی گوندی ناھێتە زانین، لێ ل ڤی گوندی دو دێرێن شوینواری ھەنە، ئەو ژی ھەردو دێرێن (مار خنانا و مارساوا)نە، ئەڤ گوندە د ھەوا ڤەگوھاستن و خرابكرنا گوندان‌دا ل سالا (١٩٧٦)ێ ھاتییە خرابكرن.

ئەڤ گوندە ب سرۆشتێ خو گەلەكێ جوانە و ژ بلی رێژەكا باشا ئاڤێ ل ڤی گوندی ھەردو چیایێن خمبێنێ و چیایێ كێری ژی دكەڤنە ھنداڤی نێروە ژێری و رووبارێ گەلالە ژی د ناڤا گوندێ وان را دەرباز دبیت.

ھەتا نێروە ژێری ھاتییە خرابكرن خواندنگەھـ نەگەھشتبوو گوندی، زارۆكێن وان ب نەچار و قەستا گوندێن دەوروبەر دكرن. ژیان ل نك نێروە ژێریان ھەر وەك ژیانا كوردەواریێ بوو، كارێ جۆتیاریێ و شڤانیێ دكر و مفا ژ بەرھەمی دیت دگەل گیایێن بھاری و ب ڤێ چەندێ خۆ ب خودانكر.

ژ بەر كو ئەو دو چیایێن دكەڤنە ب رەخ گوندێ

وانڤە د ئاسێنە و خۆش جهن بۆ خۆ حساردان و ڤەشارتنا گیانەوەران هژمارەکا بەرچاڤ ژ گیانەوەرێن کیڤی لێ هەنە، ژ وان ژی (هرچ، پەزکیڤی، گورگ، کێڤریشك و رویڤی). ژ تەیر و کەوالێن بەرناس ژی ل گوندی ب تنێ کەوە، کەو پشکەکا گرنگە ژ ئارەزوویا نێروە ژێریان.

ل نێروە ژێری ژی د دەما دەوات و خۆشیێا دا خەلك گەلەکێ ب کەیف بوو و ب سترانێن فلکلۆری یێن کوردی دیلان دکرن و سێ شەڤ و سێ رۆژان کارێ وان دەوات بوون. هەر ژ سالا (١٩٧٦)ێ هەتا نها ئەڤ گوندە ب کاڤلی یێ مای و ژیان تێدا یا راوەستیای[١٣٨].

## گوندێ وێلە:

ئێکە ژ گوندێن مەسیحییان، خەلکێ ڤی گوندی سەر ب نەتەوا ئاشوورینە و ئەڤ گوندە ژ گوندێن کەڤنارێن کوردستانێ یە و دیرۆکا ئاڤابوونا وی نەهاتییە زانین.

وێلە گوندەکێ بالکێش و خودان دیمەنەکێ گەلەکێ جوانە، ژ گوندێن مەسیحییێن عەشیرەتا نێروەیانە، پێشتر سەر ب ناحیا بێبۆ بوو، نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە. وێلە ب زمانێ مەسیحییێن دەڤەرێ ب رامانا خو واتە (چێبووی).

### سنوورێن گوندی:

ل باکووری گوندێ کەرۆ، باشووری گوندێن هێتویتێ و کارۆکی، ل رۆژهەلاتی گوندێ بیرۆمان و ل رۆژئاڤای گوندێ شیڤیێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی مەسیحینە و ب نەتەوە خۆ ب ئاشووری ددەنە نیاسین، دابەشی سەر دو بنەمالێن سەرەکی دبن (مالا ئەورایێ، مالا یاوانیس)، و هەردو دێرێن مەریەم و شمونیە پەرەستگەهێن وان بوون و هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٩ کەس بوون[١٣٩].

وێلە بۆ چاندنێ خودان جهەکێ گەلەکێ بەرەکەتە و گەلەك زەڤی یێن ئاڤی ل ڤی گوندی هەنە، خەلکێ وێ زێدەتر کارێ چاندنێ دکر و پەزێ رەش و سپی بخودان دکر.

وێلەی د کەڤندا دگەل شۆرشا کوردی دا بوون لەورا گەلەك جاران ئەڤ گوندە تووشی دەست درێژیێ بوویە، جارا داویێ ل سالا (١٩٧٧)ێ گوندێ وێلە ژ لایێ دەولەتا عیراقێ ڤە دهێتە چۆلکرن ژ خەلکێ وێ بەرەڤ دێرەلۆکێ و کانێ دهێنە هنارتن. دەما کو ئەڤ گوندە هاتییە خرابکرن هەتا نها نەهاتییەڤە ئاڤاکرن و خەلکێ وان ل دێرەلۆکێ و کوانێ و دهۆکێ دژین و ژیانا وان ل سەر کاسبکاریێ یە[١٤٠].

## گوندێ ئەلهـ:

ئەلهـ ژ گوندێن نێروەیانە و کەڤنارە گوندە، نەهاتییە زانین کانێ مێژوویا دروستبوونا ڤی گوندی بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەریت.

### سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوندە یێ هەڤسنوورە دگەل گوندێن کەرۆ و شیڤیێ و باشێ و بێزنور.

### پێکهاتا گوندی:

د سەردەمێ کەڤندا ژ ٢٠ مالا پێکدهات و ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٨ کەس بوون[١٤١]، لێ نها و ل سالا (٢٠١٤)ێ ژ ١٦٠ سەرۆك خێزانا پێکدهێت و دابەشی دو بنەمالان دبن (مالا شالی بەگ و مالا پیرۆز بەگ)، ئەڤ هەردو کەسە برایێن ئێکن و وەك هاتییە گۆتن رونشتڤانێن رەسەنێن گوندی نە.

د بنیات دا ئەڤ گوندە یێ مەسیحییانە لێ وەکی دیار ژبەر چەند ئەگەرەکان هاتییە چۆلکرن و پاشان ئەڤ مالباتە ل ئەلهـ ئاکنجی بووینە، چونکی ناڤێ گوندی ب خو ناڤەکێ مەسیحییانە.

نها خەلکێ ئەلهـ د بنیاتدا کوردن و سەر ب ئایینێ ئیسلامێنە، گوندێ وان ژی مینا هەر گوندەکێ دیتر یێ دەڤەرێ ل سالا (١٩٧٨)ێ هاتییە خرابکرن و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن.

ژ بەر كو ژمارا گوندی ل وی سەردەمی یا كێم بوو خواندنگەهـ نەگەهشتییە گوندی، خویندكارێن وان ناچار د بوون بچنە گوندێن جیران بۆ خواندنێ.

چەلێ قەسرێ و گرێ قولنتەی جهێن بەرنیاس و شوینوارینە ل ڤی گوندی، لێ ژبەر كاودانان هەتا نها نەهاتییە زانین كانێ دیرۆكا هەبوونا ڤان دوو جهان بۆ كیژ سەردەمی ڤەدگەرن، ئەلهـ ب چیاێن مینا مەرین و شخارێ و رۆمە یێ هاتییە دۆرپێچدان كو خەلكێ ڤی گوندێ هەنێ مفا ژ بەرهەمێن چیای بۆ خوارنێ و ژیانێ وەرگرتییە، ئەلهـ هەر چەندە گوندەكێ كێم مرۆڤ بوویە لێ د سەردەمێن كەڤن دا پشكداری د شۆرشا بارزان یا دووێ دا كرییە[١٤٢].

ژێدەرێ ئاڤا گوندی كانی بووینە، كارێ وان یێ سەرەكی جۆتیاری بوو، شیر و پەنیر و ماست ژێ هەبوو و بۆ وەرزێن دیتر ژێ نیڤشك و روینێ پەزێ عومباردكرن. ئەڤ هەمەوو كارە ژنێ ب كەدا خۆ دكر، زەلاما ژێ كارێ چاندنێ و شڤانیێ دكر، د ڤی سەردەمی دا ب مووچە و كاسبیێ ژیانێ دكەن.

هژیر و تری و گویز ژ فێقیێن بەرنیاس و پر زێدەنە ل ڤی گوندی و گەنم و برنج و نیسك ژێ ژ وان بەرهەمانە كو خەلكێ ئەلهـ د چاندن، دگەل هەبوونا گیایێن بهاری وەكی لیش و سوریاز و كاری و ... ب كار دئینان بو بەردەوامی دانا ژیانێ.

ئەلهـ ژێ مینا هەر گوندەكێ دیتر یێ نێروەیان ژیان ب كوردەواری بوو و وان وەك گوندێن دەردۆرا خۆ شاهی و داوەت دكرن[١٤٣].

## گوندێ ئوسمانكا:

ئوسمانكا ژ گوندێن نێروەیانە. سالا (١٩٧٦)ێ حكۆمەتا عیراقێ ئەڤ گوندە خرابكرییە و خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێن زۆرەملی هاتینە ئاكنجیكرن..

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ چوار بنەمالا پێكدهێت (مالا تاتێ، مالا ژێری، مالا عەمەری، مالا شێخی). ئوسمانكی ب ژین و ژیارا خۆڤە وەك گوندێن دەوروبەرێن خۆ بوون، كارێ چاندنێ و شڤانیێ كرییە و دەبارا ژیانا خو یێ پەیدا دكر. وان بەرهەمێ وەك شیر و پەنیر و ماست ب بەردەوامی هەبوو، هەروەسا ژ لایێ چاندنێ ڤە بەرهەمێ وەكی گەنم و جەهی و گەنمۆك و گارس ب بەردەوامی دچاندن.

خەلكێ ڤی گوندی مفا ژ بەرهەمێن بهاری ژێ وەردگرتن، ب تایبەت ئەڤ كارە یێ ژنان بوو و گیایێن بهاری یێن وەك سوریازێ و كڤاركان دكرن و گەلەك بكاردئینان.

دەما كو ئوسمانكا هاتییە خرابكرن هەتا كو ئاوارەبوونا خەلكێ ڤی گوندی بۆ وەلاتێ ئیرانێ ل سالا (١٩٨٨)ێ و ڤەگەرا وان بۆ كوردستانێ ل سالا (١٩٩٩)ێ نها پرانییا وان ل كۆمەلگەها تەناهی و دهۆكێ دژین و ژیانا وان ل سەر مووچەخۆریێ و كاسبیێ یە[١٤٤].

# گوندێن سەر ب هۆزا مزووری ژووریا ڤە

## گوندێ هێتوتێ:

هێتوت ئێك ژ گوندێن سحراوی و سەرنج راكێشە، دكەڤیتە بنارێ چیایێ لینكی و سەر ب عەشیرەتا مزووری ژووریا ڤەیە[١٤٥]، ب سنوورێ خو یێ كارگێری هێتوتێ یێ گرێداییە ب ناحیا دێرەلۆكێ.

### سنوورێن گوندی:

هەردو گوندێن شیڤیێ و ویلە دكەڤنە باكوورێ گوندێ هێتوتێ، گوندێ كاروكێ ژێ ل رەخێ رۆژهەلاتێ گوندییە، ل باشووری چیایێ لینكی و گوندێ پیران جهـ دكرن، ل رەخێ رۆئاڤا ژێ گوندێن بێزنوور و رەشاڤە و زێ مەزن هەنە. هێتوت بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناحیا بێبۆ بوو[١٤٦].

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە وەك دهێتەڤەگێران د بنیات دا یێ (پیرێ شەمۆ)ی بوو، لێ پشتی ئاوارەبوونا چوار برایان ژ ناڤ بەنانیا ل مزووری ژووریا، ل ڤی گوندی ئاكنجیبوونە و گوند ئاڤاكرینە، بەنانی وەك خۆش مێر و دەست

هەلێن مزووری ژووریان دهێنە نیاسین[147]، هێتوتی دابەشی سەر شەش بنەمالێن مەزن دبیت (مالا مەفا، مالا رەشا، مالا حەسەن، مالا باپیرا، مالا مەروش و مالا جندی)، هەر پێنج بنەمالێن (حەسەن، باپیرا، مەروش ، جندی، و پشکەك ژ مالا رەشا) ژ ناڤ مزووری ژووریان هاتینە[148] و مالا مەفا ژی ل ناڤ قاعیدا (قائیدیا) ل شاریا هاتیە ڤی گوندی[149] و پشکا دیتر یا مالا رەشا ل ناڤ ئەرتووشییا و هندەك ژی ژ پنیانش هاتینە.

هێتوت د زمانێ سانسکریتی دا ب رامانا (گەلێن نەمر) دهێت[150]، هەروەسا دبیت کو رامانا ناڤێ هێتوتێ ڤەرێژەك بیت ژ ناڤێ ئیمپراتوریەتا هێتیتێ یا کەڤنار[151]، هێتوت کەڤنارە گوندە و خەلکێ[152] وان رۆل ل دەڤەرێ هەبوو، هێتوت گوندەکێ گەلەکێ مەزن و پانە و ب سنوورێ خوڤە ملکێ ئێك عەشیر عەرد هەیە، گوند ب خۆ وەك کەلایەکا گەلەکا ئاسێ یە، چونکی ژ هەموو لایان ڤە ب چیایێن گەلەك ئاسێ دۆرپێچکریە[153]، ل باشوورێ گوندی چیایێ لینکی و رۆژهەلاتێ ژی کێربێ سیارێ و ناڤ سەرا هێتوتێ ژی دکەڤیتە باکووری و چیایێ رەزا ژی دگەل زێ مەزن ل رۆژئاڤا گوندینە.

ئاکنجیێن گوندی هەموو موسلمانن، لێ بەری سالا (١٩٥١)ێ جوی ژی هەبوون و وان ژیان ل ڤی گوندی کریە و مژوولی کارێن دەستی بوون، گۆڕستانا جخینا سەرسێڤێ ژی یا جوهیانە کو گۆڕستانەکا مەزن و بەرفرەهە[154].

گوندێن (چەمکی، بەرگوندێ، زەڤیا چیلکا، کوراتلخا، بێم پیرێ، پێشکێ، بێسنوور، ملێ گوهیشکا، گول هەیدەرکێ، پیران، بادان، بیماڤا، کانیا بێدلێ، هاجیمەندا، بادومەر) دکەڤنە د ناڤا سنوورێ گوندێ هێتوتێ دا و نها چەمکی وەك گوند یێ کاڤلە بەس پێشتر و بەری ئەنفالا هێتوتی لێ دژیان و گوندێن زەڤیا چیلکا و کوراتلخا و بێم پیرێ و پێشکێ و ملێ گوهیشکا ژی کاڤلە گوندن و پیران و بادان و کانیا بێدلێ و هاجیمەندا ژی بەری ئەنفالا خەلکێ هێتوتێ دابەشی سەر ڤان گوندا ببوون و لێ دژیان و پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ ژی پیران و بادان و کانیا بێدلێ و بیماڤا یێن هاتینە ئاڤاکرن و خەلکێ لێ ژیای هەتا خرابوونا کاودانێن ناڤخویی ل باشوورێ کوردستانێ و شەرێ ناڤخۆ، هەروەسا بەرگوندێ و بادومەر کەڤنارە گوندن و نەهاتیە زانین کانێ کەنگی خەلك ل ڤان گوندا بوویە، لێ نها بەرمایکێن گەلەك باش ژ شوینوارێن ڤان گوندان مانە، هێتوتێ وەك گوند یا دێمە، لێ ل ڤی گوندی گەلەك کانیێن ئاڤێ ل دەوروبەران هەنە (کانیا مالا، کانیا حەجی، کانیا سەر رەزا، کانی گیسکێ، کانیا بەر بەرایێ، کانیا کارە رکێ، کانیا بیبکا، سەرگەرا، بەرشیڤێ، کانیا بەر ملێ کوری، کانی بوتکێ، کانی شرینێ، کانیا ناڤ خارێ، گلە زەرکێ) دگەل بیرا ناڤ بیرێ کو دکەڤیتە نیڤا چیایێ لینکی و کانی گیسکێ و ل پیران و بادان ژی گەلەك کانی هەنە، هەروەسا ئەڤ گوندە ب هەموو سنوورێ خۆڤە ل هەردو لایێن رۆژئاڤا و باشوورێ ڤە یێ دۆرپێچکریە ب زێ مەزن.

ل هێتوتێ زێدەباری جهێ ئاسێ دەشت ژی هەنە لێ د کێمن، وەك دەشتا چەمکانێ و دەشتا سەلینە، و ل ڤی گوندی هژمارەکا گەلەك زۆر ژ شکەفتان لێ هەنە وەکی (شکەفتا سیلێ، شکەفتا سورێ، شکەفتە گا، شکەفتە کەرێ، شکەفتا مناسبی، شکەفتا بنیێ بەری، شکەفتە گولکێ، شکەفتا سمبلێ، شکەفتا رەڤەزێ و شکەفتا ڤەوالکێ).

ل هێتوتێ ژ بلی ڤان شکەفت و خرابە گوندان گەلەك جهێن شوینواری لێ هەنە وەکی رێکا دەرەجێ کو کەڤنارە رێکا ستراتیژیە کو دەڤەرا نێروەرێکان و ئامێدیێ پێکڤە گرێدەت[155]، شکەفتا چواردەرێ کو وەك پەرستگەهەکێ هاتیە بکارئینان و د ناڤا تەحتەکێ مەزن دا هاتیە کولان[156]، ناوسکا هێتوتێ کو دیرۆکا وێ بو سەردەمێ ئولدارێن مەسیحی ل دەڤەرێ ڤەدگەریت،[157] ناڤسەرا هێتوتێ جهەکێ دەشت و بەرفرەهە و کەڤر ل ڤی جهی وەك پەیکەران خویا دبن، لێ هەتا نها هێشتا ب دروستی دووڤچوونا شوینوارێن ڤی گوندی نەهاتینە کرن، ژ

بلی ڤێ یەکێ دەما کو بەحسا هێتوتێ دهێتەکرن ئێکسەر ئاماژە ب چیایێ لینکی دهێتەکرن و ئەڤ (چیایە ٢٥٠٠ مەتران)[١٥٨] ل سەر ئاستێ دەریا یێ بلندە.

هێتوت جهەکێ ئاسێیە، کارێ سەرەکیێ خەلکێ گوندی خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنێ بوو، وان هژمارەکا زێدە ژ پەزی خودانکر و مفا ژ بەرهەمێن وان وەردگرت، د هەمان دەم دا چاندنی ژی دکر و زێدە گرنگی ددا چاندنا (گەنم، جەه، گەنمۆك و خرۆڤی و ... هتد)، ل سنوورێ ڤی گوندی هژمارەکا زێدە یا دار کەزانا هەنە و د هەمان دەم دا وان بەرێ و مازی ژی ب کارئینانە.

ژ بلی بەرهەمێ چاندنێ وەکی دهێتە گۆتن گۆگرد و ئەلماس و زێر و قیر ل هێتوتێ یێن هەین. گەر کو تانها سەرەدانا ڤی گوندی ژ لایێ شارەزایان ڤە نەهاتیە کرن.

هێتوتێ رۆل د شۆرشا دا هەبوو و دەروێشێ هێتوتی ژی باشترین نمونەیە بو ڤێ راستیێ و وان پشکداری د شۆرشا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی[١٥٩] و هەردو شۆرشێن ئێکێ و دووێ یێت بارزان[١٦٠] و شۆرشا ئەیلوولێ ل سالا (١٩٦١)ێ و شۆرشا گولانێ ل سالا (١٩٧٦)ێ دا کرینە[١٦١]، خەلکێ گوندی هەردەم ل سەر ژیانا کوردەواری بەردەوامی دایە ژینا خۆ و وان گەلەك گرنگی دایە فلکلۆرێ کوردی و گەلەك جۆرێن شاهی و دیلانان وان د دەما داوەتان دا دکر.

د سەردەمێ کەڤندا ل هێتوتێ بەهی و تازی نەدهاتنە دانان و دەما کو کەسەك دچوو رەحمەتێ ب تنێ ل سەر گۆرستانێ خەلکێ گوندی دوعا بۆ دکرن و پاشان هەر کەسەك دچوو سەر کارێ خۆ.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ گەهشتییە ڤی گوندی و پاشان ل سالا (١٩٧١)ێ ئاڤاهی بۆ خواندنگەها هێتوتێ هاتیە دانان.

د سالێن دەستپێکی یێن سەد سالا نوزدێ دا بۆ جارا ئێکێ هێتوتێ دهێتە سۆتن و خرابکرن ژبەر نێزیکاتییا وان بۆ شێخ عەبدولسەلام بارزانی و پاشان ل سالا (١٩٤٥)ێ دا ل سەر دەمێ شۆرشا بارزان هێتوتێ خراب بوویە و پشتی کو دهێتە ئاڤاکرن ل سالا (١٩٤٧)ێ دوبارە ژ لایێ عەشیرەتانڤە دهێتە

شکەفتا چاردەری ل دەڤەرا هێتوتێ



خرابکرن، ل سالا (١٩٦٨)ێ بۆ جارەکا دیتر ئەڤ گوندە خراب دبیت، ل سالا (١٩٧٥)ێ بۆ جارا چوارێ هێتوتێ خراب بوویە و پشتی دهێتە ئاڤاکرن ل سالا (١٩٧٩)ێ ژ لایێ حکومەتێ ڤە د هەوا چۆلکرنا گوندان دگەل ئەردی تەخت دبیت، خەلکێ وێ دهێتە ڤەگوهاستن بۆ دێرەلۆکێ، ل سالا (١٩٨١)ێ بۆ جارەکا دیتر گوندییان قەستا دەڤەرێن رزگار کری کرینە و گوند ئاڤاکرینە، لێ ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالاندا هێتوتێ خراب و کاڤل دبیت[١٦٢].

خەلکێ ڤی گوندی د سالێن (١٩٧٥، ١٩٨٦، ١٩٨٨)ێ قەستا وەلاتێن ئیرانێ و ترکیا دکەن و پرانییا وان ل ئیرانێ ئاکنجی دبن، پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ گەلەك ژ هێتوتیا ڤەدگەرنە کوردستانێ و ل سالا (١٩٩٨، ١٩٩٩، ٢٠٠١)ێ هێتوتی ب تمامی ڤەدگەرنە کوردستانێ و سەرژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٩٤ کەس بوون[١٦٣] و سالا (٢٠١٤)ێ بووینە زێدەتر ژ ٤٠٠٠ چوار هزار کەسانە.

هێتوت کەڤنارە گوندە و دیرۆکا وێ بۆ سەدان سالا بەری نها ڤەدگەریت لێ نها ئەڤ گوندە یێ هاتییە کاڤلکرن و خرابکرن و خەلکێ وێ ل کۆمەلگەها هێتوتێ و ناحیا دێرەلۆکێ و ناحیا شێلادزێ و دهۆکێ دژین[١٦٤].

## گوندێ چەلکی:

چەلکی ژ گوندێن بەرنیاسە ل دەڤەرێ، ئەڤ گوندە دکەڤیتە دەڤەرا دەشتازێ و خەلکێ وێ یێ رەسەن ژ ناڤ مزووری ژووریا هاتییە، ب سنوورێ خو یێ کارگێری ڤە سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ نە و نها وەك تاخەکێ باژێرڤانییا دێرەلۆکێ لێهاتییە لێ بەری کو ببیتە بەشەك ژ ناحیا دێرەلۆکێ و هەتا سالا (١٩٧٩)ێ چەلکی ب سنوورێ خو یێ کارگێری ڤە سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوندە هەڤ توخیبە دگەل گوندێ مێرگێ و چیایێ لینکی ژ لایێ باکووریڤە، ل باشووری ژی گوندێن هاریکا شێخا و هاریکا ئاغا و زێ مەزن هەنە، ل رۆژهەلاتی گوندێ باوان و دێرەلۆك ژی دکەڤیتە رۆژئاڤای.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ رەسەنێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری ژووریيانە، و دابەشی سەر بنەمالێن (تەمەر و مالا حامد) دبن، ئەڤ گوندە ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٣ کەس بوون[١٦٥] و سالا (٢٠١٤)ێ ژ ٥٤٤ کەسان پێکدهێت.

کەلا و برجا چەلکی ژ شوینوارێن کەڤنارن، ئەڤ شوینوارە ژی کەڤناریيا ڤی گوندی دەنە دیارکرن کو دیرۆکا ئاڤابوونا وان بو سەردەمێ میرگەها بەهدینان ڤەدگەرن، سالا (١٨٣٢)ێ بۆ جارا ئێکێ کەلا چەلکی ژ لایێ میرێ رەواندوزێ ڤە دهێتە ستاندن[١٦٦] دەما کو میری هێرش کرییە سەر میرگەها بەهدینان، ژ بلی ڤێ یەکێ ل چەلکی مزگەفتەکا کەڤنار ژی هەیە لێ ژبەر نەمانا بەرمایکێن وێ و نەبوونا چ ڤەکۆلینێن شوینواری ل سەر هەتا نها ب دروستی نەهاتییە زانین کانێ دیرۆکا ئاڤابوونا وێ بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەریت، لێ پتریا بۆچوونا بۆ هندێ دچن کو ئاڤابوونا وێ بۆ سەردەمێ میرێن ئامێدیێ ڤەدگەریت.

بێزنوور و کەلیانکێ دو ژ وان خرابە گوندانە کو نها دکەڤنە د ناڤا توخیبێ چەلکی دا و ل باکوورێ گوندی چیایێ لینکی و ل باشوور ژی زێ مەزن هەیە، ئەڤ هەردوکە ژی دو فاکتەرێن ب هێزن ژ بۆ گرنگیيا گوندێ.

گوندێ چەلکی خودان جهـ و پاوانەکێ گەلەکێ زەنگینە بۆ بخودانکرنا تەرش و کەوالی، لەورا هەر د کەڤندا کارێ خەلکێ ڤی گوندی شڤانکاری بوو، بەردەوام پەزێ رەش و پەزێ سپی خوداندکرن و بەرهەمێن وان وەکی شیر و ماست و پەنیر و نیڤشك دفرۆتن و هری و گوشتێ وان د ناڤا بازارێن دەڤەرێ دا دکرنە پارە.

ل چەلکی خەلك ب تنێ مژویلی شڤانیێ نەبوو، بەلکو وان کارێ چاندنێ ژی دکر و زێدە زەڤی و بیستان

هەبوون، ژ بلی ڤێ یەکێ وان بەرهەمێ چیایی ژی مینا هەر گوندەکێ دیتر ل وەرزێ بهارێ دئینا و بو وەرزێن دیتر هشك دکر.

ژیانا خەلکێ چەلکێ ژیانەکا کوردەواری بوو ژ لایێ داب و نەریت و شاهی و دیلان و سترانێن کوردی ڤە و زێدە گرنگی دایە ڤان تیتالان. ل سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەئاڤاکرن.

هەتا نها ئەڤ گوندە چەند جاران یێ هاتییە خرابکرن، هندەك جاران ژبەر پەڤچوونێن جڤاکی بوون، بۆ جارا داویێ د ئەنفالاندا ل سالا (١٩٨٨)ێ خراب بوویە، لێ هەر پشتی سەرهەلدانێ ل سالا (١٩٩١)ێ خەلکێ چەلکی دوبارە گوند ئاڤاکرییە و نها ژی گەلەك ژ بنەمالا ل ڤی گوندی ژیانێ دکەن[١٦٧].

## گوندێ مێرگێ:

مێرگێ ژ مێرگا خۆشییان یان ژی ژ دیمەن و جهێ ب بەرەکەت هاتییە، ئەڤ گوندە دکەڤیتە دەڤەرا دەشتازێ، خەلکێ وێ سەر ب عەشیرەتا مزووری ژوورییانە. مێرگێ سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە و دکەڤیتە دووراتییا یەك کیلومەتری ژ رۆژئاڤا سەنتەرێ ناحیێ، مێرگێ بەری سالا (١٩٧٩)ێ ئێك ژ وان گوندان بوو کو ب سنوورێ کارگێری ڤە گرێدای سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ژ لایێ باکووری ڤە چیایێ لینکی و گوندێ هێتوتێ، ل رۆژهەلاتێ گوندی ژی گوندێ باوان جهـ دگریت، مێرگێ ژ لایێ باشووری ڤە یا هەڤسنوورە دگەل زێ مەزن و ئەڤ رووبارە دەشتازێ و دەڤەرا زێباری ژ هەڤ جودا دکەت و رۆژهەلاتێ ڤی گوندی ژی گوندێ چەلکی و ناحیا دێرەلۆکێ هەنە.

ل سالا (٢٠١٤)ێ مێرگی ژ ١٢٧ سەرۆك خێزانا پێکدهێن و هەر هەمور مرۆڤێن ئێکێن نێزیکن، ب تنێ بنەمالا ساما ل ڤی گوندی هەیە، ل باکوورێ گوندی چیایێ لینکی ب بەژنا خۆ جوانیێ ددەتە گوندێ ناڤبری لێ مێرگا ئاڤێ و کەسکاتی و کانییا گوندی زێدە باندۆر ل سەر جوانییا ڤی گوندی هەیە.

کاڤلانکێ ئێك ژ خرابە گوندایە کو دکەڤیتە د توخیبێ مێرگێ دا و ل ڤی گوندی هەر جهـ مێرگە و زۆمە و کارێ وان یێ سەرەکی و چاندن بوو، وان پەز خودانکرییە و بەرهەمێ وان بۆ دەبارا ژیانێ ب کار ئینایە، ئەو کارێ چاندنێ ژی کو دکر زێدەتر برنج و دەخل و جەهـ و نیسك و نۆك بوون. میرگێ کەڤنارە گوندە و نەهاتییە زانین ئاڤابوونا وێ بو کیژ سەردەمی ڤەدگەریت، لێ د هەموو قۆناغێن بووری دا وان ژیان ب کورداتیێ دەرباز کرییە و شەیدای خوارن و جل و بەرگ و شاهیێن کوردەواریێ بوون.

ل سالا (١٩٩٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، و ژبەر کاودانێن ناڤخۆیی، گوند ل وی سەردەمی دا هاتییەچۆلکرن، ب گشتی هەتا نها مێرگێ دو جاران هاتییە خرابکرن، بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوێن ئەنفالان دا و پشتی ڤەگەرا خەلکی و سەرهەلدانێ ل سالا (١٩٩١)ێ گوندێ مێرگێ دهێتە ئاڤاکرن، لێ د کاودانێن نەخۆشێن ناڤخۆیی دا گوند ل سالا (١٩٩٦)ێ خراب دبیتەڤە، پاشان د دەمەکێ کێم دا دهێتە ئاڤاکرن و نها ژی ئێکە ژ گوندێن ئاڤاکری ل سنوورێ ناحیا دێرەلۆکێ[١٦٨].

## گوندێ پیران:

ئێکە ژ گوندێن بەرنیاس و خودان ناڤ و دەنگ ل دەڤەرا دەشتازێ، دکەڤیتە دووراتییا ٧ کیلومەتران رۆژهەلاتێ دێرەلۆکێ و نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە و بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ل باکوورێ گوندێ پیران و گەلی سیرکی و چیایێ لینکی، ل باشوور ژی زێ مەزن و دەڤەرا زێبارییا، رۆژهەلاتێ ڤی گوندی ژی گوندێ کولان هەیە و کانییا بێدلێ ژی دکەڤیتە رۆژئاڤا گوندی.

ئاکنجیێن رەسەن یێن ڤی گوندی هێتوتی نە کو سەر ب عەشیرەتا مزووری ژوریاڤەنە[169]، ب دروستی نەهاتییە زانین کانێ مێژوویا دروستبوونا ڤی گوندی بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەریت، هەتا بەری سەرهەلدانێ چەندین جاران ژ لایێ حکومەتێ و عەشیرەتان ڤە هاتییە سۆتن و دوا جار ل سالا (١٩٨٨)ێ ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە دهێتەخرابکرن، خەلکێ وێ ژی قەستا سنوورێ دەولەتێن جیران دکەن و پشتی سەرهەلدانا (١٩٩١)ێ پشکەك ژ وان دگەل هێتوتی یێن دیتر ڤەدگەرنە کوردستانێ و ل گوندێ کانیا بێدلی و بیماڤا ئاکنجی دبن، پشتی ئەڤ هەردو گوندە ژی دهێنە خرابکرن و چۆلکرن، نها خەلکێ کەڤنارێ گوندێ پیران ل کۆمەلگەها هێتوتێ د ئاکنجینە.

هەتا بەری سەرهلدانێ تنێ مزگەفتەك ل گوندی هەبوو، خواندنگەهـ ژی ل سالا (١٩٨٢)ێ گەهشتییە پیران، هەتا نها ژبەر ئەنجام نەدانا دووڤچوونەکا زانستی نەهاتییە زانین شوینوارێن ڤێ دەڤەرێ بۆ چ سەردەمەکی ڤەدگەرن، ژبەر کو گرێ پیران وەك هاتییە گۆتن گوندەکێ کەڤنارە، لێ ل بیرا کەسێ نینە کانێ کیژ سالێ هاتییە ئاڤاکرن[170].

ژ بلی گوندێ پیران بخو کو هێتوتی لێ د ئاکنجی بوون سێ خرابە گوند ژی دکەڤنە د سنوورێ پیران دا ئەو ژی (گول هەیدەرکێ، ملا، بادمەر یان بادومەر) و کاڤلە گوندێ گول هەیدەرکێ دکەڤیتە دەڤێ گەلی سیرکی دا و ملا ژی دکەڤیتە د نیڤا ملێ پیران دا و بادومەر ژی ئەو جهە یێ کو نها کۆمەلگەها هێتوتێ ل سەر هاتییە ئاڤاکرن[171].

خەلکی گوندێ پیران هەر چەندە نێزیکی زێ مەزن بوون بۆ ڤەخوارنێ مفا ژ ئاڤا کانییان وەردگرت و گەلەك کانیێن ئاڤێ لێ هەنە، ژ وان ژی کانی گورکێ بەرناسترینا وانە دگەل کانیا پیران.

ژیان ل پیران هەر وەك ژیانا هەموو هێتوتییا بوو، کارێ وان یێ سەرەکی خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، دیسان هژمارەك ژ خەلکێ ڤی گوندی ژی ب کارێ جۆتیارێ رادبوون و پەز و میهـ ژ سەرەکیترین وان گیانەوەران بوون کو دهاتن خودانکرن. خەلکێ پیران گرنگیا دایە گەنم و جەهی و برنجی و وان زێدە ئەڤ هەر سێ بەرهەمە د چاندن، دگەل چاندنا گەنمەشامی و گول بەرۆژێ و شتی و گوندور و باجان سۆرکا ژی. خەلکی گوندی ژ بەرهەمێ پەزی ماست و پەنیر و نیڤشك و رۆینێ خوارنێ دروست دکر و هری و مویێ وان ژی دفرۆت.

خەلکێ گوندی تایبەت ژنا پیرانی رۆلەکێ بەرچاڤ د رێڤەبرنا ژینا وی سەردمی دا هەبوو، ژ بلی کار و ئەرکێن مالێ ل وەرزێ بهارێ کارێ رێلداری (چوونە چیا دکر و گیایێن بهاری کۆمدکرن) و هشکدکرن دا ل زڤستانێ بشێن بکار بینن و بخوون و ژ وان گیایان ژی: سوریاز و لیش وکەنگر و کڤارك بوون.

بەری سەرهەلدانێ پیران سەرەکیترین جهێ ئاکنجیبوونا هێتوتییان ل دەشتازێ دهاتە زانین، جهێ خۆشی و نەخۆشیێن وان بوو، ل پیران شەهیانێن مەزن برێڤەچوونە و سترانبێژ و دەنگبێژێن مەزن ل ڤی گوندی ژیانە.

ل دۆر ژیانا زارۆکان ژی وان یاریێن وەکی کێلەبەرانێ و گۆکانێ و تیسانێ د کرن، ب شەڤ ژی وان گوستیرکانێ دکر.

## گوندێ باوان:

باوان دکەڤیتە د ناڤا دو گران دا و ئەڤ گوندە سەر ب دەڤەرا دەشتازێیە، د کۆکا خۆدا خەلکێ ڤی گوندی مزووری ژوورینە[172]، سنوورێ کارگێری یێ گوندێ باوان یێ گرێدای دێرەلۆکێ یە، لێ بەری سالا (١٩٧٩)ێ ێ وەکی هەموو گوندێن دیتر یێن دەشتازێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ژ رەخێ باکووریڤە هەڤتوخیبە دگەل گوندێ هەسنبەکرا، ل رۆژهەلاتی ژی کۆمەلگەها هێتوتێ و کانیا بێدلێ هەیە، گوندێ بیاوێ دکەڤیتە ژێریێ باوان و ل رۆژئاڤا ژی گوندێ مێرگێ یە.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند دابەشی چوار بنەمالێن مەزن دبن (مالا حەسەن، مالا شێخێ و براهیم کەنعانی و مالا محەمەدێ مەلا یاسین)، باوانی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٢ کەس بوون[١٧٣] و سالا (٢٠١٣)ێ بووینە ١٠٠ سەرۆك خێزان.

باوان کو ژ پاوانی هاتییە، دکەڤیتە بنارێ چیایێ لینکی ژ لایێ باکووری ڤە، ل ڤی گوندی گرێ باوان هەیە دگەل سێ کانیێن ئاڤێ (کانییا گوندی، کانی سارك، کانییا شیڤێ).

باوان گوندەکێ کەڤنارە، ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان دا خواندنگەهکا ئایینی ل ڤی گوندی هەبوو[١٧٤]، ل سالا (١٩٧٢)ێ ژی بنگەهێ ساخلەمیێ هاتییە گوندی.

هەتا نها سێ جاران ئەڤ گوندە هاتییە خرابکرن، لێ زێدەباری هەموو دەردسەرییان خەلکێ باوان ب کورداتییا خو ژیان کرییە و کارێ وان یێ سەرەکی چاندن بوو.

د روودانێن سالێن چلاندا گوند هاتییەخرابکرن و بەردان، بەلێ پاشتر سەر ژ نوو هاتییەڤەئاڤاکرن، جارەکا دی ل سالا (١٩٨٧)ێ ئەڤ گوندە ژ لایێ حکومەتێ ڤە دهێتە خرابکرن و خەلکێ وێ ب زۆری ل گوندی دهێنە دەرئێخستن، پشتی ئەنفالان و کۆچا ملیوونی خەلکێ باوانی ل سالا (١٩٩١)ێ دوبارە گوندێ خۆ ئاڤادکەن، لێ ئەڤە ژی زێدە ناڤەکێشیت و نەئارامیا ناڤخۆیی ل سالا (١٩٩٦)ێ خەلکی نەچار دکەت دوبارە گوندی ڤالا بکەن و قەستا کۆمەلگەهان بکەن[١٧٥].

## گوندێ بادان:

بادان ئێك ژ وان گوندایە کو دکەڤیتە هنداڤی دەشتەکا بەرفرەهـ ل سنوورێ دێرەلۆکێ و ٨ کیلومەتران ل رۆژهەلاتێ ناحیا دێرەلۆکێ یا دوورە.

مێژوویا دروستبوونا ڤی گوندی نەهاتییەزانین و ب سەدان سالە خەلك ل سەر ئاخا وی دژین، ئاکنجیێن ڤی گوندێ هەموو سەر ب هێتوتێ نە و گرێدای عەشیرەتا مزووری ژووری نە، ئەڤ گوندە دکەڤیتە دەڤەرا دەشتازێ و نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە، بەری پێشتر گرێدای سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

**سنوورێن گوندی:**

ل باکوورێ ڤی گوندی چیایێ لینکی هەیە و هاجیمەندا و رەشانکێ ژی دو گوندن، دکەڤنە باکوورێ رۆژهەلاتی و رۆژهەلاتێ بادان و ل باشوور و رۆژئاڤا گوندی ژی گوندێ پیران هەیە[١٧٦].

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالان دا هاتییە خرابکرن و خەلکێ وی قەستا وەلاتێ ترکیا و ئیرانێ کرییە، پشتی کو ڤەگەریانە کوردستانێ ل سالا (١٩٩١)ێ ل گوندێ کانییا بێدلێ و بیماڤا ئاکنجی دبن و ئێدی بادان نەهاتە ئاڤاکرن[١٧٧].

هەتا کو گوندێ بادان هاتییە خرابکرن خەلکێ ڤی گوندی شڤانتی و جۆتیاری دکر، پەز و میهـ ژ تەرش و کەوالێن سەرەکی بوون کو وان ب خودان دکر، وان زێدە گرنگی دایە چاندنا گەنم و جەهی ژبەر کو مفا بۆ خۆ و گیانەوەرێن خۆ ژێ وەردگرت.

چەندین مالبات ل بادان هەبوون، لێ ژبەر کو د کۆکا خۆدا هێتوتی نە هەتا نها ژی وەك ئویجاخێن هێتوتێ دهێنە ل قەلەمدان و چ جوداهی د ناڤبەرا وان و هێتوتیەکێ کو ل گوندێ سەرەکی دژیا نینە.

خەلکێ ڤی گوندی مفا ژ کانییا گوندی بۆ ڤەخوارنێ و ئاڤدانا گیانەوەران وەردگرتن، بۆت (جهەکێ تایبەتە بۆ ڤەخوارنا ئاڤا گیانەوەران) دهاتنە دانان. ژ وان بەرهەمێن کو د ئەنجاما خودانکرنا ڤان مەرومالاتان ب دەست دکەفت پەنیر و ماست و پەرۆك دروستدکرن و ل ڤان سالێن داویێ ل بازاری بۆ خۆ دکرە پارە و هریا میهان ژی هەر سال دفرۆتنە کەسێن تایبەت و ژ پارێن کو دەست وان دکەفت کارێن خو پێن رۆژانە پێ دکرن.

ل بادان خەلکی گرنگی دایە گیایێن کوردی وەکی سوریازێ و لیش و سترك و کاری و کەنگران و گەلەك ب کار ئینانە، ژ بلی ڤێ یەکێ خەلکێ ڤی گوندی خوارنێن کوردەواری ژی وەکی ترشك و ماش و دەوینك

و گەلەكێن دیتر چێدكرن.

داوەت و شەهیان ل بادان هەبوون و گەلەك جاران هەموو خەلكێن هێتوتێ هەر ژ گوندێ سەرەكی هەتا گوندێن دیتر ژی ل بادان كومڤە د بوون و دەوات و شاهی بۆ دەمێ سێ رۆژان بەردەوامی كریبە و سترانێن فلكلوری د ناڤا وان شاهییان دا دهاتنە گۆتن و گەلەك جۆرێن دەواتێ ژی ل بەر دهاتن كرن وەكی (شامیرانێ، ملانێ، هجروكێ، سێ پێكێ، بابلەكان و...).

ژ لایەنێ یارییێن فلكلۆری ڤە و ب تایبەتی ئەوێن كو زارۆكان د ژیانا خو یا كەڤنا گونداتیێ دا دكرن، وەك كێلەبەرانێ، شتانێ، كوكانێ، تیسانێ و گوستیركانێ دكرن، هندەك جاران ل شەڤێن زڤستانان مەزنێن گوندی یاریا گوستیركانێ ژی دكرن[١٧٨].

ژ بەركو چ ڤەكۆلینەكا زانستی ل گوندی نەهاتییەكرن و ژبەر نەبوونا گرنگیدانێ ب گوندێن دەوروبەران نەهاتییە زانین كانێ چ جهەكێ شوینواری یێ ڤەشارتی ل بادان هەیە.

## گوندێ بێسنوور:

بێسنوور ژ وان گوندانە كو دكەڤیتە د ناڤا گەلیێ رەشاڤە دا، گرێدای هێتوتێ یە و سەر ب عەشیرەتا مزووری ژووریێ ڤەیە، نها سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە و بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناحیا بێبۆ بوو.

### سنوورێن گوندی:

باكوورێ بێسنوور چەمكی هەیە، گوندێ هێتوتێ ژی دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ڤی گوندی، رەشاڤە ژی ل رۆژئاڤا هەیە و گوندێ چەلكێ ژی دكەڤیتە باشووری.

بێسنووری دكەڤندا هاتینە ناڤ هێتوتێ و نها وەك مالباتەكا هێتوتی یانە، ئەڤ گوندە ل رەخێ رۆژهەلاتی ڤە دكەڤیتە سەر زێ مەزن. ل ناڤا بێسنوور گەلەك شكەفت و گەلی و رەز و بیستان هەنە كو هەر ئێك ژ وان د سەردەمێ خۆدا بۆ كارەكی مفا ژێ دهاتە وەرگرتن.

بێسنوور كەڤنارە گوندە و بەری سەرهەلدانێ ژ لایێ حكومەتا عیراقی ڤە هاتییەخرابكرن، هەتا وی سەردەمی چەندین مالباتێن هێتوتی یان ل ڤی گوندی ژیاندكر، ب تایبەتی ل وەرزێ هاڤینێ، چونكی چەروانەكێ گەلەكێ باشە[١٧٩].

## گوندێ بێخیرێ:

گوندێ بێخیرێ دكەڤیتە سەر دەشتەكا پان ل بنارێ چیایێ لینكی، ئەڤ گوندە دو كیلومەترا ل رۆژهەلاتێ دێرەلۆكێ دوورە، ب سنوورێ خو سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە، بەری سالا (١٩٧٩)ێ گرێدای سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

رەخێ رۆژهەلاتێ بێخیرێ گوندێ باوان، مێرگێ ژی دكەڤیتە رۆژئاڤای، چیایێ لینكی ل هنداڤی گوندی ل رەخێ باكووریڤە خۆ دبینیت و زێ مەزن ژی بێخیرێ ژ دەڤەرا زێباریا ل رەخێ باشووریڤە لێك جوداكەتن. ئەڤ گوندە دكەڤیتە ناڤا دەڤەرا دەشتازێ، سەر ب عەشیرەتا مزووری ژووریێ ڤەیە.

بێخیر وەكی گوند بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن، تنێ ژ ئێك مالبات پێكدهێت، ئەو ژی مالا (خەلیل ئیبراهیم)ـە، بەری كو گوندێ بێخیرێ بهێتە ئاڤاكرن خەلكێ ڤی گوندی ل هەسنبەكرا دژیان.

ل سالا (١٩٨٧)ێ ئەڤ گوندە هاتییە خرابكرن و خەلكێ وی ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆكێ دهێنەخرڤەكرن، ژبەر كو گوندێ بێخێرێ خرابە گوندە. هندەك ژ خەلكێ رەسەنێ وێ ل دهۆكێ ژیانێ دكەن.

ل بێخیرێ ب تنێ زۆمەكا پەزی هەیە، ئەو ژی زۆما (هەجرا كێتكایە)، ژیانا خەلكێ ڤی گوندی ل سەر تەرش و كەوالی بوو، هندەكان كارێ چاندنێ ژی وەكی دەخل و جەهـ دكرن.

هژمارا خەلكێ ڤی گوندی یا كێمە، لێ هەكە لێ نێرینەكێ مرۆڤ ل جهـ و بەریێ وان بكەین دێ بینین

كو ب راستی جهەكێ ب بەرەكەتە لەورا خەلكێ وان كارێ خو یێ سەرەكی د سەردەمێن كەڤن دا كربوو خودان كرنا تەرش و كەوالی.

ژ بلی ڤێ یەكێ خەلكێ ڤی گوندی ل وەرزێ بهارێ مینا هەر گوندەكێ دیتر قەستا چیا دكرن و گیایێن بهاری بۆ وەرزێن دیتر خرڤەدكرن و دئینانە مال، وەكی (سترك، كەنگر، شیر كێتك)[180].

## گوندێ بیماڤا:

بیماڤا دكەڤیتە دەڤەرا دەشتازێ ب دووراتییا ٨ كیلومەتران ل رۆژهەلاتێ دێرەلۆكێ و نها سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە، بەری (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو[181].

ئاكنجیێن ڤی گوندی هێتوتی نە (هێتوتی خودان جهەكێ گەلەكێ بەرفرەهن و دابەشی سەر چەندین گوندان دبن و ل سالا (٢٠١٤)ێ سەرژمارا خەلكێ هێتوتێ زێدەتر ژ ٤٠٠٠ چوار هزار كەسانە، هەر چەندە هێتوتێ هەر گوندە ژی) كو ب رەسەنایەتییا خۆ سەر ب عەشیرەتا مزووری ژوورییانە.

### سنوورێن گوندی:

باكووری گوندێ پیرانە، باشووری رووبارێ زێیێ مەزن هەیە، رۆژهەلاتێ دەشتا سەلینەیە و رۆژئاڤا ژی دبیتە كۆمەلگەها هێتوتێ.

وەكی دهێتە گۆتن بیماڤا سەدان سالە هاتییە ئاڤاكرن (ژ بەر كو چەندین كاڤلە خانی و تەنورێن كەڤن ل بن ئاخا ڤی گوندی هاتینە دیتن)، لێ هەموو دەما ژمارا ئاكنجیێن وێ یا كێم بوو و ژ چەند مالەكان نەدبووری ژبەر كو خەلكێ ئاكنجی ل ڤی گوندی هەر هەموو هێتوتی بوون و گەلەك جاران وەك زۆم ئەڤ گوندە ژ لایێ وان ڤە هاتییە بكارئینان.

ئەڤ گوندە گەلەك جاران ل سەر شۆرشێن كوردی ژ لایێ حكۆمەتێ و عەشیرەتانڤە هاتییەسۆتن و جارا داوییێ سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابكرن و كاڤلكرن، خەلكێ وێ ژی قەستا ئیران و تركیا كرینە و بۆ جارا ئێكێ و پشتی سەرهەلدانێ دەما كو هندەك ژ هێتوتیا ڤەدگەرنە كوردستانێ ل سالا (١٩٩١)ێ بیماڤا دوبارە دهێتە ئاڤاكرن و ل وی دەمی ٢٠ مال لێ ئاكنجی دبن[182].

پشتی كو ل سالا (٢٠٠١)ێ كۆمەلگەها شارستانی یا هێتوتێ دهێتە ئاڤاكرن گوندێ بیماڤا ژی ئێدی وەك جهێ ژیانا خەلكی نامینیت و ئاكنجیێن ڤی گوندی ل كۆمەلگەها هێتوتێ خۆ بنەجهـ دكەن و هەتا نها ب تنێ مالەك ل سنوورێ ڤی گوندی مایە.

بۆ جارا ئێكێ ل سالا (٢٠٠٠)ێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ خواندنگەهەكێ ب ناڤێ بادان ل ڤی گوندی ئاڤادكەت و ل سنوورێ ڤی گوندی تا نها نەهاتییە زانین كانێ چ جهـ و تشتەكێ شوینواری هەیە ژبەر كو ڤەكۆلین نەهاتینە كرن.

د سەردەمێن كەڤن دا ژیان ب پلە ئێك ل بیماڤا هەموو ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو چونكی جهەكێ گونجاییە بۆ ڤی كاری و هندەك ژ ئاكنجیێن ڤی گوندی ژی ب كارێ جۆتیاریێ ڤە دمژیل بوون.

بۆ ئاڤا ڤەخوارنێ خەلكێ گوندی مفا ژ كانییا نیڤا گوند وەردگرتن و ل ڤان سالێن بووری ژی هندەكان بیرێن ئاڤێ لێدابوون.

برنج و گەنم و جەهـ ژ بەرهەمێن سەرەكینە كو خەلكێ ڤی گوندی د چاندن و وەك هەموو گوندێن دیتر خەلكێ بیماڤا ژی هەر دەم سفرا وان یا خەملاندی بوو ب خوارنێن كوردی.

## گوندێ كانییا بێدلێ:

كانییا بێدلێ جهەكێ سحراوی و دلڤەكەرە سەر ب دەڤەرا دەشتازێ ڤەیە، ژ لایێ كارگێریڤە دكەڤیتە سەر سنوورێ ناحیا دێرەلۆكێ ب دووراتییا ٧ كیلومەتران، بۆ جارا ئێكێ پشتی سەرهەلدانێ ل سالا (١٩٩١)ێ ژ لایێ هێتوتییان ڤە هاتییە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ دێرەلۆكێ و ل هنداڤی ڤی گوندی چیایێ لینكی ب بەژنا خۆڤە دیار

دبیت و ل رۆژهەلاتێ كانیبا بێدلێ گوندێ پیران هەیە و ل رۆژئاڤا ژی گوندێ باوان هەیە و ل باشووورێ ڤی گوندی رووبارێ زێ مەزن (زێ بەهدینان) جهـ دگریت.

ب رەسەنایەتییا خۆ ئاكنجیێن ڤی گوندی هێتوتێ نە ژ عەشیرەتا مزووری ژووریانن، پشتی هەوا ئەنفالان ل سالا (١٩٨٨)ێ و خرابكرن و كاڤلكرنا گوندان هێتوتی ئاوارەی وەلاتێن جیران دبن و دەما كو سەرهەلدان ل سالا (١٩٩١)ێ ل كوردستانێ چێدبیت، خەلكێ رەسەنێ هێتوتێ ژی ب هژمارەكا هەرە بەرچاڤ قەستا كوردستانێ دكەن و پشكەك ژ هێتوتیا كانیبا بێدلێ ئاڤا دكەن و دكەنە جهێ ئاكنجی بوونا خۆ.

بنەرەتی ناڤكرنا ڤی گوندی ژ ناڤێ كانییەكێ هاتییە كو چەند مترەكان دكەڤیتە ژێرێ گوندی، ئەڤ كانیبا هەنێ بۆ ڤەخوارنێ دهاتە بكارئینان.

پێشتر و ل بەری سەرهەلدانێ ژی ل سالێن شێستان و حەفتیان ئەڤ گوندە یێ ئاڤا بوو، لێ ب تنێ چەند مالەكێن كێم ل سەر دژیان، كو ئەو ژی بۆ چەروانیێ دهاتنە وێرێ و ل زڤستانا ڤەدگەریانە گوندێ پیران و بادان[١٨٣].

دگەل كو چەند سالەكێن كێم ژیان ل ڤی گوندی بەردەوام دبیت و ژبەر شەرێن ناڤخۆیی ل سالا (١٩٩٥)ێ كانیبابێدلێ دهێتە چۆلكرن و خەلكێ وی ل هەردو كۆمەلگەهێن دێرەلۆك و شێلادزێ ئاكنجی دبن، نها ژی پتریبا وان ل كۆمەلگەها هێتوتێ د ئاكنجینە، ل سالا (١٩٩١)ێ و گەلەك ژ وان كارێ جۆتیاریێ دكر و هندەك ژ وان ژی ب خودانكرنا تەرش و كەوالی ڤە د مژوول بوون، لێ ژیانا پتریبا وان ڤی سەردەمی ل سەر مووچەی بوو.

ل سالا (١٩٩١)ێ پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن خواندنگەهـ دگەهیتە ڤی گوندی و د هەمان سالدا مزگەفتەك ژی ل گوندی دهێتە ئاڤاكرن و حكومەتا هەرێما كوردستانێ گەلەك مامۆستایان دهنێریتە كانیبا بێدلێ.

ل گوندێ كانیبابێدلێ ناوسكەكا گەلەك كەڤنار هەیە كو ب دەستی هاتییە كۆلان و مێژوویا دروستكرنا وێ بو سەدان سالا بەری نها ڤەدگەریت.

خەلكێ كانیبا بێدلێ گەلەك جۆرێن بەرهەمی دچاندن وەكی گەنم و جەهـ و گەنمەشامی و گولبەرۆژ، و گەلەك ژ مالباتان ژی كارێ وان بخودانكرنا پەزی و میهان بوو، دگەل ڤێ چەندێ كارێ رەزداریێ ژی هەر هەبوو و نها ژی ژمارەكا باشا رەزان ل كانیبا بێدلێ هەنە[١٨٤].

## گوندێ هەسنبەكرا:

هەسنبەكرا ئێك ژ گوندێن دەڤەرا دەشتازێ یە، سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە ب دووراتییا ٧ كیلومەتران دكەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ، بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو، خەلكێ ڤی گوندی د سەردەمەكێ كەڤن دا ژ ناڤ مزووری ژووریان هاتینە ڤی گوندی.

هەسنبەكرا هەڤسنوورە دگەل گوندێ هێتوتێ و چیایێ لینكی ژ لایێ باكووریڤە، ل رۆژهەلاتێ گوندی ژی گوندێن پیران و كانیبا بێدلێ هەنە، ل باشووری بادان و گوندێ مێرگێ ژی دكەڤیتە رۆژئاڤا هەسنبەركرا.

خەلكێ گوندی د كۆكا خۆدا دابەشی چوار بنەمالێن سەرەكی دبیت (مالا حامد، مالا روستەما، مالا میسێ، مالا مەلكی)، ژمارا ئاكنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٧ كەسبوون[١٨٥]، ژێدەرێ ژیانا وان هەر د كەڤن دا ل سەر شڤانداریێ و چاندنێ بوو.

خەلكێ هەسنبەكرا هەر زویكا پشكداری یا د شۆرشێن بارزان دا كری[١٨٦]، هندەك ژ وان وەك پێشمەرگە بەشداربیا د ئاڤاكرنا كۆمارا مهابادێ ژی دا كری[١٨٧] و د چوونا بارزانیان بۆ ئێكەتیا سوڤیتی ل سالا (١٩٤٧)ێ هەڤالێن بارزانی بوون[١٨٨].

ل ڤی گوندی كانیبا گوندی تاكە ژێدەر بوو ژ بۆ ڤەخوارنێ و وان گەلەك گرنگی دایە لایەنێ چاندنا دێمی وەكی گەنم و جەهی و ل سنوورێن ڤی گوندی گەلەك دارێن كەزانان ژی هەنە.

ل هەسنبەكرا ژیان ب كوردەواری بوو و وان گرنگی

دایە دیلان و شاهیێن كوردی، دناڤا سێ شەڤ و رۆژا دا وان دیلان دگەل سترانێن فلكلوری د گۆتن، هەروەسا كەسێن وەك سالحێ بەخشی كو هۆزانڤانەكێ ڤی گوندی و دەڤەرا دەشتازێ بوو یێ شیای خزمەتا پەیڤا كوردی بكەت[189].

چ جاران خواندنگەهـ نەگەهشتییە ڤی گوندی، ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند ژ لایێ رژێما عیراقێ ڤە هاتییەخرابكرن و هەتا نها نەهاتییەئاڤاكرن، و خەلكێ وان نها ل دێرەلۆكێ و دهۆكێ ئاكنجینە و مووچەخۆر و كاسبكارن[190].

## گوندێ هاجیمەندا:

هاجیمەندا، ژ گوندێن سەر ب دەڤەرا دەشتازێیە، ب دووراتییا ١٠ كیلومەتران دكەڤیتە رۆژهەلاتێ دێرەلۆكێ، ژ ئالیێ كارگێریڤە سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە و بەری سالا (١٩٧٩)ێ گرێدای ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

ئاكنجیێن رەسەنێن ڤی گوندێ هێتوتی نە كو ب رەسەنایەتییا خۆ سەر ب عەشیرەتا مزووری ژووریانە، ب سەدان سالایە ل سەر گوندێن دیتر یێن گرێدای هێتوتێ ژیانێ دكەن و ئەڤ گوندە پێشتر وان وەك چەروانی دهاتە بكارئینان.

### سنوورێن گوندی:

باكوورێ هاجیمەندا چیایێ لینكێ جهـ دگریت، ل باشوورێ ژی گوندێ رەشانكێ، ل رۆژهەلاتی ژی گوندێ ئاوكا و باشوورێ رۆژهەلاتی ژی گوندێ كولانە، هەروەسا ل رۆژئاڤا ژی گوندێ بادانە.

بۆ جارا ئێكێ وەكی گوند ل سالا (١٩٦٨)ێ دهێتە ئاڤاكرن و هەتا نها ژی كاڤلە گوندێن وان د ئاشكرانە، ل وی سەردەمی چەند مالباتەك ل ڤی گوندی ژیانە كو پێشتر هاجیمەندا وەك زۆم و جهەكێ باشێ چەروانیێ ژ لایێ هێتوتی یانڤە دهاتە بكارئینان.

هاجیمەندا ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییەخرابكرن، خەلكێ ڤی گوندی ب كارێ شڤانیێ ڤە مژیلبوون چونكی جهەكێ هەرە باشە بۆ تەرش و كەوالی، ژ بلی ڤی كاری خەلكی گرنگی دایە گیاییێن بهاری و بەرهەمێ دارێن وەكی كەزانێ و مازیێ و بۆ دەربازكرنا ژیانا خۆ بەرهەمێ ڤان داران د بازارێن وی سەردەمی دا دفرۆشت و كەلوپەلێن پێدڤی بۆ خۆ پێ دكڕین.

ل هاجیمەندا كانییەكا ئاڤێ هەیە ب كانییا هاجیمەندا بەرنیاسە، خەلكێ ڤی گوندی ژبەر كو ب رەسەن هێتوتی نە، هەموو كار و كریارێن وان هەر وەكی هێتوتییان بوو و پتریا جاران دەوات و شاهیێن خو ل هێتوتێ دكرن[191].

## گوندێن سەر ب دەڤەرا نهێلێ ڤە گوندێ گوهەرزێ

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا چوار كیلومەتران ل رەخێ رۆژئاڤا دێرەلۆكێ ل ناڤا دەشتەكا پان ل بناریێ زنجیرە چیایێ مەتینا، و سەر ب دەڤەرا نهێلێ یە و ب سنوورێ خویێ كارگێریڤە سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە، پێشتر و سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو[192].

### سنوورێن گوندی:

گوهەرز ژ لایێ باكووریڤە خۆ ل هەمبەری چیایێ گوهەرزێ دبینیت و هەردو گوندێن رەشاڤە و بەرچی دكەڤنە باكوورێ گوندی، ل باشووری ژی رووبارێ سپنە و گوندێ گرگاش و مەهیدێ هەنە، رۆژئاڤای ژی گوندێ بەلاڤەیە، ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە ئەڤ گوندە دگەهیتە ناحیا دێرەلۆكێ.

### پێكهاتا گوندی:

هژمارا خەلكێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٤٤ كەس بوون[193] و سالا (٢٠١٤)ێ ژ هزار كەسان دەرباز دبیت، گوند ژ یازدە بنەمالا پێكدهێت كو ئەو ژی ئەڤەنە (مالا چەلیا، مالا وادێ، مالا شێخوكێ، مالا ژێری، مالا ئێزدینا، مالا باپیرا، مالا نارێ، مالا جبرائیل، مالا حەجیا، مالا سیارا، مالا عەمەركێ).

ب دروستی نەهاتییە زانین كانێ رامانا دروستا ناڤێ گوهەرزێ چیە، لێ وەك دهێتە گۆتن ئەڤ ناڤە

ژ ناڤا رەزی هاتبیت کو هەردو رەخێن گوندی رەز لێ هەنە، یان ژی دبیت ژ گوهێ زێ هاتبیت، چونکی رووبارێ زێ مەزن ل رەخێ رۆژهەلاتێ ڤی گوندی دەرباز دبیت(١٩٤).

ژ بلی گوندێ نها، سێ کاڤلە گوند یان ژی خرابە گوند دکەڤنە سنوورێ گوهەرزێ، ئەو ژی (کەلیانکێ، کۆخێ، کاڤلێ گوندی)، ژ بلی ڤێ یەکێ دو جهێن شوینواری ل گوهەرزێ هەنە کو ئەو ژی ناوسکا گوهەرزێ یە یا بەرناس ب (بەرێ کولین) و رێکا کەڤنارا گوندێ گوهەرزێ یە کو ب دەستی هاتیە کولان(١٩٥)، هەروەسا ل گوندێ گوهەرزێ خواندنگەهەکا ئایینی هەبوو ژ بوو پەروەردەکرنا خویندکاران د سەردەمێ کەڤندا و مامۆستایێ وان مەلا ئەحمەدێ گوهەرزی بوو(١٩٦)، ژ بلی ڤێ خواندنگەها ئایینی یا ئیسلامی ل ڤی گوندی کنیشتەکا جوییان ژی هەبوو(١٩٧).

ل گوهەرزێ ژیان ل سەر جۆتیارێ و شڤانیێ بوو، خەلکێ ڤی گوندی بەرهەمێن وەکی (دەخل، جەهـ، نیسك، نۆك، کونجی، برنج، گەنمۆك، ماش) دکرن و ئەڤ گوندە ب تری و هژیر و سێڤ و خۆخا ژی یێ بەرنیاسە، هەروەسان هژمارەکا زێدە ژ دارێن کەزانان ژی لێ هەنە.

دگەل ڤێ یەکێ بەروی و مازی و گرسك و گوهیشك ژی ل چیایێن گوندی هەنە.

کارێ سەرەکییێ خەلکێ گوندێ گوهەرزێ خودانکرنا پەزی بوو، ژ بلی ڤێ یەکێ ل چیایێ گوندی چەندین گیانەوەرێن کویڤی ژی وەکی (هرچ، گورك، پەزکویڤی، بەراز، ریڤی، کێرویشك، کەو) هەنە.

ل گوهەرزی کاروبار و جل و خوارنێن وان هەر هەموو یێن کوردەواری بوون، زەلامان شال و شەپك و ژنا ژی کراس و فیستان ب کار دئینا و زارۆکان ژی ب یاریێن کوردەواری دلێ خۆ خۆش دکر. شێخانی، ملانێ، سێپێکێ، سنجانێ و بێریۆکێ ژ وان جۆرە دەواتانە یێن کو ب سەدان سالە ل ڤی گوندی دهێنەکرن.

گوندێ گوهەرزێ ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتیە خرابکرن، پشتی ڤەگەریانا خەلکی ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٩١)ێ ل جهەکێ نێزیکی جادا گشتی هاتییەڤە ئاڤاکرن و هەتا نها ژیان تێدا یا بەردەوامە.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧١)ێ گەهشتییە گوندێ گوهەرزێ یێ کەڤن و نها ژی ل گوندێ خواندنگەها بنەرەتی هەیە(١٩٨).

## گوندێ بەرچی:

بەرچی ئێکە ژ گوندێن دەڤەرا نهێلیا ب دووراتییا پێنج کیلومەتران دکەڤیتە رۆژئاڤا مەلبەندێ ناحیا دێرەلۆکێ، ل هەردو ئالیێن چیایێ مەتینی جهـ دگریت ب سنوورێ کارگێری ڤە سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە و گوندێ ژووری ناڤێ وی یێ دروست بەرچیە و گوندێ ژێری کو نها یێ ئاڤایە ب کۆخێن بەرچیا یێ بەرنیاس بوو. بەری سالا (١٩٧٩)ێ یێ گرێدای سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ ڤە بوو.

ناڤێ گوندی یێ هاتی ئانکو بەرامبەری چیا و بۆ کورتکرنا ناڤی دبێژنێ بەرچی(١٩٩).

### سنوورێن گوندی:

ژ لایێ باکووریڤە هەڤسنووره دگەل گوندێن سێر و درگنێ، ل رۆژهەلاتی ژی گوندێن رەشاڤە و گوهەرزێ و بەلاڤە هەنە، ل باشوورێ بەرچی ژی گوندێن کەڤنە مژێ و مژێ و گێرگاش دیار دبن و گوندێ سەرگەلێ ژی دکەڤیتە رۆژئاڤا ڤی گوندی(٢٠٠).

### پێکهاتا گوندی:

هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٥٤ کەس بوون(٢٠١) و سالا (٢٠١٤)ێ ژ ٤٠٠ مالباتان پێکدهێن و دابەشی سەر چەند ئیجاخان دبن (مالا مالخێ، مالا عەبێ، مالا عەلێ، مالا خەیری، مالا حەسەن، مالا مەما، مالا مشکێ، مالا خانزادێ، مالا حەمەرەڤا و مالا چاڤشین) و هندەك ژ ڤان مالباتان ل هندەلان و هورك و بێدا و شینێ و بناڤیێ قەستا گوندێ بەرچی کرینە کو ئەڤە ژی دابەشی سەر دەڤەرا بارزان ب گشتی و هندەك گوندێن نهێلێ دبن و لێ ئاکنجیبووینە و ب درێژاهیا دیرۆکێ بوونە بەرچی.

بەرچی كەڤنارە گوندە و گەلەك ژ مێژە یێ هاتیە ئاڤاكرن و (كاڤلێ فەرەنگی، كەڤرێ كونیشكا، گاڤا جنێ و شكەفتا شێخێ) ژ وان جهێن هەرە كەڤنارن ل بەرچی.

ژیان ل بەرچی ل سەر تەرش و كەوالی و چاندنێ بوو، ئاڤارەكێ گەلەكێ مەزن هەبوو، هەموو جۆرێن فێقی تێدا دهاتنە بەرهەمی، چیا ژی باندۆرا خو ل سەر رەوشا خۆشگوزەرانییا خەلكی هەبوو، بەرهەمێن چیا وەكی گیایێن بهاری و كەزان و تفسك دكرن و هندەك ژ وان دفرۆتن و هندەك ژی ب كار دئینان.

بەرچی ب حەیرانۆك و ستران و گۆتنێن كوردی گەلەك د بەرنیاسن، هەر شەڤ ل ڤی گوندی دیوان یا پری حەیران و تام بوو، وان شاهی ب سترانێن كوردی جۆش ددا و ب شەڤ و رۆژا بێ راوەستان وان ستران ل سەر سەرێ بویك و زاڤای دگۆتن، هەلال بەرچی (سالا ١٩٣٠ ژ دایك بویە)[٢٠٢] ناڤەكێ گەلەكێ دیارە د ناڤا جڤاكێ دەڤەرێ دا وێ ب سترانێن خۆ گەرماتیا دایە ژیانا رۆژانە یا خەلكێ گوندی.

ژ بلی هەلال بەرچی و زەهرا سەعدولا و محەمەد تاهر بەرچی و جەمیل مەجید بەرچی و شەعبان ئاغا بەرچی[٢٠٣]، ل ڤی گوندی مەلا محەمەد ئەمین بەرچی (ل نیڤا دووێ یا سەدسالییا ١٩ هەتا نیڤا ئێكێ ژ سەد سالا بیستێ ژیایە) هەنە كو خزمەتا چاند و كولتوور و تۆرەیا كوردی كرینە[٢٠٤].

پێشمەرگەی ل ئادارا (١٩٨٨)ێ هێرش ئینایە سەر فەوجا لەشكەرێ عیراقی ل بەرچی شیان داستانەكا قارەمانانە تووماربكەن[٢٠٥]، پشتی راوەستانا شۆرشا ئەیلوولێ سالا (١٩٧٥)ێ گوندێ بەرچی ل ژووریێ چیایێ مەتینا دهێتەخرابكرن، خەلكێ وێ قەستا كۆخێن بەرچیا دكەتن و ڤی گوندی ئاڤادكەن، د ئەنفالادا سالا (١٩٨٨)ێ دوبارە بەرچی خرابدبیت، پشتی سەرهەلدانا (١٩٩١)ێ جارەكا دیتر گوند دهێتە ئاڤاكرن و نها دو خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هەنە كو هەموو قۆناغێن خواندنێ تێدا دهێنە پەروەردە كرن[٢٠٦].

گوندێ بەرچی



## گوندێ بەلاڤە:

بەلاڤە: ژ گوندێن دەڤەرا نهێلێ یە، ب دووراتییا چوار کیلومەتر و نیڤان دکەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا دێرەلۆکێ و نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێیە و پێشتر سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو. ناڤێ گوندی دبێژن یێ ژ (ژێك بژالە، بەلاڤە)، واتە هەر مالەك ل جهەکی هاتی کو مالێن وان ل نێزیکی ئێك نەبوون[٢٠٧]. ڕیهسپیێن گوندی دبێژن سالا (١٩٥١)ێ ئەڤ گوندە یێ هاتییە ئاڤاکرن[٢٠٨].

## سنوورێن گوندی:

بەلاڤە ژلایێ باکوورێڤە هەڤسنوورە دگەل زنجیرە چیایێ مەتینا و گوندێ بەرچی یا کەڤنار، ل رۆژهەلاتێ وێ گوندێ گوهەرزێ، ل باشوور ژی گوندێ گێرگاش و کوخێت بەرچیان ژی دکەڤنە رۆژئاڤا گوندی.

## پێکهاتا گوندی:

گوندی دابەشی سەر چوار بنەمالا دبن (مالا عەبێ، مالا خالد، مالا ئەحمەد و مالا حەمو)، پتریا ڤان بنەمالا خەلکێن رەسەنن، ب تنێ ئێك بنەمال ل ناڤ ئەرتووشییا هاتینە ڤی گوندی، هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٤٩ کەس بوون[٢٠٩] و ل سالا (٢٠١٣)ێ خەلکێ گوندی ژ ٨٩ سەرۆك خێزانا پێکدهات.

ژ بلی گوندێ سەرەکی کو دکەڤیتە ب گرەکی ڤە، کاڤلکا و خارەبەنێ و باژێرێ ئینێ وەك کاڤلە گوند دکەڤنە د سنوورێ بەلاڤە دا، و دیوارێ کافرا، کەندالێت عەلیا، گەلیێ دێرێ و گەلیێ جوهیا و گرێ قەسرێ ژ جهێن بەرنیاس و شوینوارێنە ل ڤی گوندی. د ڤێ یەکێ دا دیار دبیت کو بەلاڤە کەڤنارە گوندە لێ هەتا نها نەهاتییە زانین کانێ دیرۆکا ئاڤابوونا وێ بو کیژ سەردەمی ڤەدگەریتن.

گوندێ بەلاڤە



ل ڤی گوندی چەندین کانیێن ئاڤا ڤەخوارنێ هەنە (کانیا ئینێ، کانیا خارەبەنێ، کانیا مەلا هەیدەر، کانیا کێتکێ، کانیا شڤانا و برکا ئاغا).

ل بەلاڤە ژیان ل سەر چاندنێ بوو، وان گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنج و خرۆڤی و گارس و کونجی دچاندن، وان یان ئەو دفرۆتن یان ژی بۆ پەزی ب کاردئینان، ژ بلی چاندنێ خەلکێ ڤی گوندی کارێ شڤانیێ ژی گەلەك کرییە.

گورگ و هرچ و پەزکویڤی و ژیژی و مار و دوپیشك و کێڤریشك ژ وان گیانەوەرێن کویڤی نە کو ل چیایێن گوندی دگەل چەندین جۆرێن تەیر و تەوالان هەین.

هەروەسا خەلکێ ڤی گوندی گەلەك جۆرێن گیایێن چیایی ب کار ئینانە وەکی (کەنگر، لیش، سوریاز، سترك، قەلەندەر، تال و شرین، ترشۆك، کاری و کەنگر) و د هەمان دەم دا وان هژمارەکا زێدە ژ دار کەزانان ژی د سنوورێ گوندێ خودا هەنە.

ژیان ل ڤی گوندێ نهێلێ ب تمامی ژیانەکا پری کەیف و خۆشییا کوردەواری بوو، وان گەلەك جۆرێن داوەت و دیلانا د دەما شاهی و خۆشییان دا کرینە (چۆخ جان، جەرەجەرە، ملانێ و شێخانی و شامیرانی) و باشترین نموونە ژی ئەو بو دەما کو ب رەنگەکێ خوبەخش گەنجێن ڤی گوندی تیپا بەلاڤە یا هونەری ئاڤاکری دا کو کولتوورێ خۆ پێ بپارێزن[٢١٠].

بەری سەرهەلدانێ ئەڤ گوندە دو جاران هاتییە خرابکرن، جارا ئێکێ د ناڤا شۆرشا ئەیلوولێ دا بۆ داوی جار ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالاندا، پشتی سەرهەلدانێ و ل سالا (١٩٩١)ێ گوندێ بەلاڤە دهێتە ئاڤاکرن و ل سالا (٢٠٠٤)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ و بنکەهەکێ ساخلەمیێ لێ هاتینەڤەکرن.

نها گوندێ بەلاڤە یێ ئاڤاکرییە و ٣٥ سەرۆك خێزان لێ دژین و ژیانا وان ل سەر چاندنێ و مووچە خوریێ یە[٢١١].

## گوندێ سەرگەلێ:

سەرگەلێ: ژ گوندێن دەڤەرا نهێلییانە، گوندەکێ گەلەکێ سەرنجراکێش و جوانە، ب دووراتییا ٧ کیلومەتران دکەڤیتە رۆژئاڤایێ دێرەلۆکێ، بەری سالا (١٩٧٩)ێ گرێدای سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

## سنوورێن گوندی:

ل رەخێ باکووریڤە یا گرێدای زنجیرە چیایێ مەتینایە و ل رەخێ باشووریڤە ژی رووبارێ سپنێ بەهدینان هەیە و گوندێ بەرچی ژی دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ڤی گوندی و سگێرێ ژی ل رەخێ رۆژئاڤایێ سەرگەلێیە.

سەرگەلێ ئێکە ژ گوندێن دیرۆکا ئاڤابوونا وی نەهاتییە زانین، ئەڤ گوندە ب گەلیێ خو یێ بەرنیاسە کو د کەڤندا جهەکێ ستراتیژی بوو بۆ مەرەما بازرگانی دهاتە ب کار ئینان[٢١٢].

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ ڤی گوندی دابەشی پێنج بنەمالا دبن (مالا ئێزدینا، مالا عەلی خان، مالا سەینا، مالا میرئالی، مالا قورتاس). هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٤٥ کەس بوون[٢١٣].

سەرگەلی ب هونەرێ خو یێ کـــوردەواری د بەرنیاسن و گەلەك جۆرێن سترانێن کوردەواری یێن کەڤن د ناڤا سینگێ خەلکێ ڤی گوندی دا هاتینە پاراستن و ژ بلی کو گەلەك جۆرێن دیلان و داوەتێن کوردەواری ژی دزانن[٢١٤].

ژیان د کەڤن دا ل سەرگەلێ ل سەر جۆتیارییێ و شڤانیێ و بازرگانیێ بوو، لێ نهو ل سەر مووچەخۆرییێ و کاسبکارییێ یە و پشکەکا گەلەکا کێم ژێ مژوولی کارێ چاندنێ نە.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٨٨)ێ و د ئەنفالاندا ئەڤ گوندە هاتییە خرابکرن، خەلکێ گوندی بەرەڤ وەلاتێن ترکیا و ئیرانێ ئاوارە بوویە، پشتی سەرهەلدانێ سالا (١٩٩١)ێ دهێتەڤە ئاڤاکرن و هەتا نها ژیان تێدا یا

بەردەوامە، ل ڤی گوندی مزگەفت و خواندنگەهـ هەنە و حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ رێ و جادەیێن ڤی گوندی ژی دروست کرینە.

## گوندێ بناڤیا:

بناڤیا ئێکە ژ گوندێن دۆلا نهێلێ، سەر ب دەڤەرا نهێلێ و ناحیا دێرەلۆکێ یە و پێشتر سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ئەڤ گوندە ژ لایێ باکووری ڤە دکەڤیتە بنارێ چیایێ زەرك و گوندێ بالۆکا ژی دکەڤیتە باکوورێ بناڤیا، ل باشوورێ گوندی ژی کورکو هەیە، سێر ژی ل رەخێ رۆژهەلاتی یە و سنوورێ قەزا ئامێدیێ ژی ل رەخێ رۆژئاڤا گوندینە.

### پێکهاتا گوندی:

بناڤی دابەشی سەر پێنج بنەمالێن سەرەکی دبن `مالا شەریفا، مالا زەینێ، مالا رەشێ، مالا مەحمەدێ ئامێ، مالا عەبدولا)، هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٦ کەس بـوون[٢١٥]. شڤانکاری کارێ سەرەکیێ هندەك ژ وان بوو و هندەکێن دیتر ژی کارێ وان چاندن بوو. ئەڤە ژبلی کو هندەك ژ خەلکێ ڤی گوندی د کەڤندا کارێ وان کرین و فرۆتنا کەلوپەلێن دەستپێکی یێن ژیانێ بوون.

هەتا نها جادا قیری نەگەهشتییە ڤی گوندی، و چ جاران خواندنگەهـ ژی نەگەهشتییێ.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧٧)ێ ئەڤ گوندە ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە دهێتە خرابکرن و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ وێ پتری ل ئامێدیێ و دێرەلۆکێ و دهۆکێ دژین و فەرمانبەر و کاسبکارن[٢١٦].

## گوندێ درگنی:

درگنی ئێك ژ گوندێن مەسیحیێن دەڤەرا نهێلێ و سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە.

گوندێ سەرگەلی



### سنوورێن گوندی:

گوند دۆرپێچكریە ب گوندێن رەشاڤە و سێری و بەرچی و كوركو، و خەلكێ وێ وەك نەتەوە ل سەر ئاشووریان دهێنە حسابكرن، هەر ئێك ژ چیایێن چۆلێ رەش و سەریا و بەنا ل ڤی گوندی دخورستینە. درگنێ ژی وەكی هەر گوندەكێ نهێلیان بەری كو بكەڤیتە سەر سنوورێ ناحیا دێرەلۆكێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### پێكهاتا گوندی:

درگنێ ژ پێنج بنەمالا پێكدهێت، ئەو ژی (بوشێلا، بۆكەو، بۆشاخرتا، بۆئیشۆ و مالا بۆبۆبو)نە، ژ بلی گوندێ سەرەكی كاڤلە گوندێ قەسرا ژی دكەڤیتە د ناڤا سنوورێ درگنێ دا. هژمارا خەلكێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (۱۹۵۷)ێ ۱۳۰ كەس بوون[۲۱۷].

ل درگنێ سێ كاڤلە دێر هەنە، دیرۆكا دو ژ وان بۆ چەندین سالان بەری نها ڤەدگەریت و ئەو دێر ژی ئەڤەنە: (دێرا مەس مەریەم، دێرا مەرگنینێ و دێرا مەرگی ڤەگیس).

درگنێ وەك ئێك ژ كەڤنترین گوند ل دەڤەرا نهێلێ ب تایبەتی و ل دەڤەرا ئامێدیێ ب گشتی دهێتە ل قەلەمدان، دیرۆكا ئاڤاكرنا وێ زێدە یا كەڤنارە، چەندین زانایێن ئۆلا مەسیحی ل ڤی گوندی رابووینە و ل سەرتاسەری كوردستانێ بەلاڤ بووینە.

ل سەردەمێ گەلەك كەڤنارە خواندنگەها ئۆلی یا مەسیحی ل ڤی گوندی هەبوو، د سالێن سیهان دا ل چەرخێ بیستێ و ل سەردەمێ مەلكێ عیراقێ خواندنگەهـ هاتیە ڤی گوندی.

ژ بلی كارێ دەست رەنگینێ وان و چێكرنا گۆسك و كەفچك و ئامانێن گلینەی ل وی سەردەمی، خەلكێ ڤی گوندی كارێ جۆتیارێ ژی دكر، دەخل و جەهـ دچاندن، دیسان برنج ژی ئێك ژ وان بەرهەمان بوو كو خەلكێ ڤی گوندی دچاند و د هەمان دەم دا ل ڤی گوندی ئاشێن ئاڤێ ژی بۆ هێرانێ هەبوون.

ل گوندێ درگنێ گیانەوەرێن كیڤی مینا: (گورگ و روبڤی و بەراز)، د هەمان دەمدا تەیر و تەوالێن كویڤی ژی ل چیایێن گوندی هەنە.

ژ بەر نەبوونا چ دووڤچوونكەكا زانستی نەهاتیە زانین كانێ شوینوارێن درگنێ بۆ بەری چەند سالا ڤەدگەرن كو ژ وان شوینوار (دێرا مەرگی ڤەرگیس)ە.

خەلكێ درگنێ ژی هەر وەك دەورووبەرێن خۆ د ژیانا كوردایێ دا بوو و هەموو رەوشت و تیتالێن وان وەك یێن گوندێن نێزیكی وان بوو، بگرە ژ داوەت و شەهیانا هەتا تازی و بەهیداریا ژی.

ل ڤی گوندی د دەما داوەت و شەهیانان دا (ماخوبو، ئەودیشو) دو ناڤێن گەشبوون د گۆتنا سترانێن فلكلۆری دا و ب سترانێن كوردی سێ شەڤ و رۆژان دەوات یا بەردەوام بوو.

گوندێ درگنێ ل سالا (۱۹۸۸)ێ بۆ داوی جار ب تەمامی كاڤل دبیت و نها ژی خەلكێ رەسەنێ گوندی ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆكێ و دهۆكێ د ئاكنجینە[۲۱۸].

## گوندێ رەشاڤە:

رەشاڤە ژ گوندێن دەڤەرا نهێلێ یە و ب دووراتیا چوار كیلومەتران ل ژووریا دێرەلۆكێ یە، سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە و پێشتر سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

رەشاڤە جهەكێ جوان و خودانا دیمەنێن گەلەك بالكێشە، ئەڤ گوندە ژ لایێ باكووریڤە هەڤتوخیبە دگەل سێر، ل رۆژهەلاتێ رەشاڤە ژی گوندێ هێتوتێ هەیە، بەرچی دكەڤیتە رۆژئاڤا گوندی، ل باشوور گوندێ گوهەرزێ و دێرەلۆكێ نە[۲۱۹].

دكەڤندا گەلەك زانایێن ئایینی ژ رەشاڤا رابووینە، ئەڤ گوندە ل دووڤ سەرژمێریا سالا (۱۹۵۷)ێ ۳۹۳ كەس بوون[۲۲۰] و سالا (۲۰۱٤)ێ ژ ۲۳٤۳ كەسان پێكدهێت و دابەشی سەر نەهـ مالباتا دبن وەكی (مالا حەسەن بادین، مالا مەسیحا، مالا ژێری، مالا مەلا، مالا كویشا، مالا گیادینا، مالا ئێزدین، مالا

گویزیا و مالا زلیا)[٢٢١].

رەشاڤە ژ رەخێ نزاری ڤە دکەڤیتە بنارا زنجیرە چیایێ مەتینی و زێ مەزن ل تەنشتی ڤی گوندی ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە دەرباز دبیت، د سەردەمێن کەڤندا رەشاڤە رێکەکا ستراتیژی بوو ژ بۆ دەربازبوونا خەلکێ دەڤەرا نێروەرێکان و دۆسکیا و نهێلێ و هێتوتێ بۆ میرگەها ئامێدیێ، چونکی ژ بلی رێکا دەرەجا هێتوتێ ل نێزیکی ڤی گوندی پرا کەلیا ژ بۆ دەربازبوونێ هەبوو.

شوپێ، سەرێ کێشی، سەرێ کێری، رێکا تاتکا، رێکا بن دێری، رێکا ڤائیدا و رێکا دەشتازێ ژ وان جهێن گەلەك بەرنیاسن ل رەشاڤە، ژ بلی ڤێ یەکێ خەلکێ گوندی ب دەنگبێژیێ ناڤێ ناڤدارن ل دەڤەرێ و هژمارکا زێدە ژ دەنگبێژێن دەڤەرێ د سەردەمێن کەڤندا رەشاڤەی بوون[٢٢٢].

کانیێن گیرا، سەرۆکانیێ، کانیا سێڤێ، کانیا عەبدلاکێ، کانیا بنێفیێ، کانیا کانیکا و کانیا ماماجوی ژ وان کانیایە کو خەلکی بۆ مەرەما ڤەخوارنێ ب کارئینانە، و د هەمان دەم دا وەك جهێن زۆمینێ پەزی ژی هاتینە ب کارئینان[٢٢٣].

رەشاڤە کو ژ رۆژئاڤابوونێ هاتیە[٢٢٤] کەڤنارە گوندە، دیرۆکا ئاڤابوونا وی نەهاتیە زانین، د سەردەمێن کەڤندا ژیان ل رەشاڤە ل سەر شڤانیێ و چاندنێ بوو، ل گوندی هژمارەکا زێدە ژ پەزێ رەش و سپی هەبوو، بەرهەمێ وان بۆ دەبارا رۆژانە دهاتە ب کارئینان، رەشاڤە ب چاندنا برنج و دەخل و دانی بەرنیاسە و ئاڤارێن وان ژی پێن تژی بوون ژ تری و سماقێ و گویزا.

زلیێ و گویزێ و ڤایدا و کەلیا ژ وان خرابە گوندانە یێن کو دکەڤنە د چوارچوڤێ گوندێ رەشاڤە دا و وەك خرابە گوندانە، ژ لایێ ژیانا کوردەواری ڤە خەلکێ رەشاڤە ژ لایێ شاهی و داوەتان ڤە د ناڤدارن و وان د دەما هەر شاهیەکێ دا ب شەڤ و رۆژان دیلان گرێدان و ب دەنگێ کوردی سترانێن فلکلۆری دیلان

گەلیێ رەشاڤە



گەرم دکرن.

ل دەستپێکا شۆرشا ئەیلوولێ خەلکێ گوندی پشکداری د شۆرشێدا کرییە کەسێن زیرەك ل ناڤ دیاربووینە[225]، ژ بلی ڤێ یەکێ ل ڤی گوندی مەدەرسەکا کەڤنارا ئایینی هەبوو کو فەقی و خویندکاران دەرسێن ئایینی تێدا دخواندن[226].

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧٠)ێ گەهشتییە گوندێ رەشاڤە، ئامیرێ رادیۆیێ ژی بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٥٤)ێ گەهشتییە ڤی گوندی.

رەشاڤە نها کافلە گوندە و ل سالا (١٩٧٩)ێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ هاتییەخرابکرن و خەلکێ وێ ئاوارەی کۆمەلگەهان بوویە، نها ژی خەلکێ رەسەنێ رەشاڤە ل دێرەلۆکێ و دهۆکێ دژین.

## گوندێ سگێرێ:

ژ گوندێن دەڤەرا نهێلێ یە، دکەڤیتە جهەکێ بلند و کەڤنارە گوندە، ب دووراتییا ٩ نەهـ کیلومەتران ژ رۆژئاڤایێ دێرەلۆکێ و سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە، بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو، دیرۆکا ئاڤابوونا ڤی گوندی نەهاتییە زانین.

### سنوورێن گوندی:

سگێرێ ژ لایێ باکووریڤە هەڤتوخیبە دگەل زنجیرە چیایێ مەتین و ل رۆژهەلاتی ژی گوندێن بلاڤە و بەرچی هەنە، ل رەخێ رۆژئاڤا ژی گوندێ دێرێ جهـ دگریت و باشوورێ سگێرێ ژی گوندێن مژێ و کەڤنە مژێ و سپنێ بەهدینان هەیە.

### پێکهاتا گوندی:

سگێری ژ پێنج بنەمالان پێکدهێن (مالا گەردی، مالا قادرکێ، مالا پشێ، مالا عەمەرێ شڤانکێ، مالا قەدا)، هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٩ کەس بوون[227]. ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوێت ئەنفالان دا هاتییە خرابکرن، پشتی ئازادیا کوردستانێ ل سالا (١٩٩١)ێ دوبارە خەلکێ سگێرێ قەستا جهێ باب و باپیرا دکەن و دوبارە ژیانێ ددەنە گوندی و ئاڤا دبیت و هەر د سالێن دەستپێکێ دا خواندنگەهـ و مزگەفت دگەهنە سگێرێ، لێ ژبەر کاودانێن ناڤخۆیی و خراب بوونا رەوشێ ل سالا (١٩٩٧)ێ گوند خراب دبیت و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن.

ژیانا پرانییا خەلکێ گوندی د سەردەمێن کەڤندا هەر ل سەر چاندنێ و شڤانیێ بوو، نها ژی ژیانا وان ل سەر مووچە و کارێن بازرگانیە[228].

## گوندێ سێری:

گوندێ سێری ئێکە ژ گوندێن سەر ب دەڤەرا نهێلێ، ئەڤ گوندە گرێدای ناحیا دێرەلۆکێ یە، دکەڤیتە دووراتییا ٢٠کم رۆژهەلاتێ باکوورێ ئامێدیێ و ١٥کم باکوورێ ناحیا دێرەلۆکێ، بەری کو ل سالا (١٩٧٨)ێ بهێتە سۆتن و ڤەگوهاستن ژ ٣٥ خێزانان پێکدهات و ئەڤ خێزانە هاتنە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەها دێرەلۆکێ، ب تنێ چەند خێزانەك نەبن ئەو ژی مانە ل چیایی و خۆ رادەستی حکۆمەتا عیراقێ نەکرن، پاشان ب ئێك جاری ل سالا (١٩٧٨)ێ گوند هاتە سۆتن و وێرانکرن، لێ بەری کو دێرەلۆك وەك ناڤەندا ناحیێ بهێتە دیار کرن ل سالا (١٩٧٩)ێ گوندێ سێری سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ل باکووری گوندێ زێوە و رووبارێ زێ هەیە، ل باشووری گوندێن رەشاڤە و بەرچی هەنە ژبلی گوندێن گویزێ و زلیێ کو دکەڤندا خراباتان، ژلایێ رۆژهەلاتیڤە سنوورێ وێ دکەڤیتە سەر رووبارێ زێ و گوندێ هێتوتێ و چەمکی و ژلایێ رۆژئاڤا ژی ڤە گوندێن درگنی و بێزنێ هەنە.

پێکهاتەیا نەتەویی یا گوندی هەموو کوردن و موسلمانن، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (٢٠١٤)ێ دۆرێن ٥٠٠ کەسانە کو ژ ١٠٠ خێزانان پێکدهێت، لێ ژبەر کو نها گوند یێ چۆلە، پرانییا خەلکێ گوندی ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆکێ ئاکنجی نە و یێن دن ژی پشتی ل ئیرانێ ڤەگەریان ل کۆمەلگەها تەناهی و

سەنتەرێ پارێزگەها دهۆكێ ئاكنجی بووین و هند خێزان ژی نها ل دەرڤەی وەلاتی نە.

سێر كو یێ دۆرپێچكرییە ب ڤان چیایان ( سەرێ بانێ، سەرێ سورێ و زنار، پاناڤا، تاتێ)، هەژمارەكا گوندێن خراب دەردورێن گوندی هەنە كو دكەڤنە سنوورێ گوندێ سێری وەك (سێری مەیدانكی، و داپیێری و زلیێ و نها ژی شوینوارێن وان كاڤلە گوندا مانە. خەلكێ وان ژی یێن تێكەلی گوندێن دی بووین وەك رەشاڤە و تروانش و خەلكێ گوندی داپیێرێ ژی تا نها نەهاتییە زانین كو ل كیڤە بەرزە بووینە). دوو بۆچوون بۆ رامانا ناڤێ گوندی هەنە، یا ئێكێ دبێژنێ (سەری) ئانكو دكەڤیتە جهەكی بلند و سەرێ چیایی و یا دووێ ژی دبێژن (سێ رێ)، ئانكو بتنێ سێ رێ یێن سەرەكی دچنە گوندی و ئەڤ هەر دوو بۆچوونە دروستن.

گوندێ سێری پێكدهێت ژ سێ بنەمالا و ب رەنگەكێ زانستی ناهێتە زانین كو ئەڤ بنەمالە ل كیڤە هاتینە، لێ دهێتە گۆتن كو بنەمالا توكلا ژ بنەمالا خانێ موكری نە و ژ موكریان (رۆژهەلاتێ كوردستانێ) هاتینە و بنەمالا زێنا ژی دبێژن ئەسلێ خوە جهی بووینە و بنەمالا شێرا ژی ئەسلێ خوە ئەرتووشی یا ل باكوورێ كوردستانێ هاتینە.

گەلەك جهێن شوینواری ل گوندێ سێری هەبوونە لێ پشتی گوند هاتییە سۆتن هەموو وێران بوون و ژ ناڤ چوون، نها ژی هەژمارەكا شوینوارا مانە وەك بیرا و مزگەفتا، هەروەسا كەلایەك ژی ل سەرێ بانێ هەیە دبێژنێ كەلا سەرێ بانێ كو دكەڤیتە هنداڤا گوندێ سێری. دیسان هەژمارەكا جهێن بەرنیاس ل سنوورێ گوندی هەنە، وەك كەزانا مخەلی كو چیرۆكەكا سەیر پێ دهێتە گۆتن، هەروەسا كانییا ژێرێ و كەزانا توكل كو كەزانەكا ڤەبارێ كەتێن وێ د مەزنن و دیسان بێژنێ هەیە و شكەفتا سۆتی و گەلەك جهێن دیتر ژی وەك ناڤ زقل و دەرێ هرچا و دەرێ زلیی و ناڤ زەرە و شكەفتا بریندارا و رووبارێ زێ. ل ناڤ گوندی ژێدەرەكی سەرەكی یێ ئاڤا ڤەخوارنێ بتنێ كانی بووینە، ئەو ژی ل ناڤ گوندی بتنێ ئێك كانی هەبوویە، ئاڤا وێ یا كێمە و كانییەكا دی ژی هەبوویە كو دبێژنێ كانیێ ژێری و هەروسا كانیكا باپیر و كانییا بیركێ و ئەڤە ژی گەلەك ژ خەلكێ ب هیڤیا ئاڤا بیرا، هەرچەند رووبارێ زێ دكەڤیتە سنوورێ گوندی ب دوولایانڤە لێ وەك پێدڤی بۆ ڤەخوارنێ و چاندنێ مفا ژ ئاڤا رووبارێ زێ نەهاتییە وەرگرتن، ژبەر كو گەلەك دویر و كویرتر بوویە ژ ئاستێ گوندی، خەلكێ گوندی بتنێ بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی مفا ژێ وەگرتینە.

بۆ ئێكەم جار ل سالا (١٩٧٨)ێ گوند هاتییەسۆتن و خەلكێ وی بۆ كۆمەلگەها دێرەلۆكێ هاتنە ڤەگوهاستن، هەروەسا د سالێن هەشتیان دا چەند خانی یێن دیتر ل گوندی هاتنە ئاڤاكرن لێ ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتنە سۆتن و ٩٥٪ ێ خەلكێ گوندی جارەكا دی دەربەدەری تركیا و ئیرانێ بوون و تا گوند هاتییە بەردان ژی چ جارا خواندنگەهـ نەگەهشتییێ. پشتی سەرهەلدانێ ل سالا (١٩٩٢)ێ خەلكێ وێ ڤەگەریانە كوردستانێ و ل كۆمەلگەهان و باژێران ئاكنجیبوون و تا نها ژی گوند یێ وێران و سۆتییە و نەهاتییە ئاڤاكرن و ب چ رەنگەكی دەستێ خەلكێ گوندی ناگەهیتە درامەتێ وان ژبەر كاودانێن سەر سنووری[٢٢٩].

## گوندێ كوركو:

كوركو ئێك ژ گوندێن دەڤەرا نهێلێ یە، ب دووراتییا ٢٥ كیلومەتران دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ دێرەلۆكێ، سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە، بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

كوركو یێ دۆرپێچ كرییە ب گوندێن زێوەشكان و بالۆكا ژ لایێ باكووری، ژ لایێ باشووری گوندێن سەرگەلێ و تلخان، هەروەسا درگنێ دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و رۆژئاڤا ژی بناڤیێ هەیە.

### پێكهاتا گوندی:

كوركوی دابەشی سەر شەش بنەمالێن سەرەكی دبن (بنەمالا عەمەرا، بنەمالا عەلی، بنەمالا حەسەنا، بنەمالا مەرجێ، بنەمالا گویزیا، بنەمالا خالدێ سێری)،

هەر سێ مالێن سەری دانەرێن گوندێ كوركونە و هەرسێ یێن دیتر پاشان ئاوارەی ڤی گوندی بووینە و لێ ئاكنجی بووینە، هژمارا خەلكێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٢ كەس بوون[٢٣٠] و نها نێزیكی ٤٠٠ كەسانە.

ل ڤی گوندی هندەك شوینوارێن كەڤنار هەنە وەكی (خزینكا سەرێ دێرێ، گیژكا خاجێ) و وەسان دیار دبیت كو پێشتر ئاكنجیێن گوندی مەسیحی بوون، لێ ب دروستی نەهاتییە زانین كانێ كیژ سەردەمی وان كوركو چۆل كرییە لەورا ئەڤ گوندە كەڤنارە گوندە، هەروەسا ل ڤی گوندی خاچ یا ل سەر بەری هاتییە نەخشاندن.

ل گوندێ كوركو گەلەك جهێن بەرنیاس و خۆش هەنە د سەردەمێن كەڤن دا وەك جهـ و رێ و رێباری ژ لایێ گوندییان ڤە هاتینە ب كارئینان وەكی (جوخینێن سەر رەزا، بەرێ خانیكا، كانیكا دینا، پەسارێ خریا، دوولا كنابەری، دولا تەووك، مەیدانكا خراب، سەرێ جوخینكێ، بەرچەلا، ناڤا نهێلێ)نە، زێدەباری زۆمێن پەزی (سەرۆكانیێ، نهالا بوتكێ و كانی زەركی)، چونكی د سەردەمێن كەڤن دا كارێ خەلكێ كوركو خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو و وان پێدڤی جهێن ب ئاڤ هەبوو.

سەرۆكانییا گوندی، كانییا گولا ب تنێ دو ژێدەرێن ئاڤێنە ل ڤی گوندی كو بۆ ڤەخوارنێ هاتینە ب كارئینان، ژبلی ڤێ چەندێ خەلكێ كوركو مژوولی كارێ چاندنێ بوون، وان برنجێ سێ مەهی و گەنمۆك و ماش و كونجی و نیسك و نۆك و گەنم و جەهـ و خرۆڤی و گارس دچاندن و دەما بەرهەم دگرت خەلكی بۆ مەرەما خوارنێ و هندەك جاران ژی بو فرۆتنێ ب كارئینایە.

چەلێ نێریا و چیایێ كورێ مالا و ملێ شینیا و كەڤرێ مێشی و كەڤرێ رەزێ شاپێ ژ وان گر و چیایانە كو دكەڤنە دەوروبەرێن گوندێ كوركو، ب ڤێ یەكێ ئەڤ گوندێ هەنێ ب گیانەوەرێن كویڤی مینا (گورگ، هرچ، پەزكویڤی، رویڤی و حەفتیارێ چیایی و...) یێ دەولەمەندە.

كوركوی ژی مینا هەر گوندەكێ دیتر ل دەڤەرا نهێلێ ب كار و جلوبەرگ و رەوشت و تیتالێن كوردەواری بەرنیاسن و دەست هەیە د كانییا فلكلۆرێ كوردی دا.

كوركو كو ژ ناڤێ كورێ سێ مالا هاتییە، ل سالا (١٩٧٦)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ گەهشتییە ڤی گوندی و دەستپێكێ خویندكاران ل سەر تەنەكان دخواند.

كوركو ل سالا (١٩٨٨)ێ ل سەر دەستێ حكومەتا عیراقێ دهێتەخرابكرن و كاڤلكرن و پشتی سەرهەلدانێ و ل سالا (١٩٩٤)ێ دوبارە ژ لایێ خەلكێ گوندووڤە دهێتەئاڤاكرن، لێ هێشتا سالەك ل سەر ژییێ ئاڤاكرنێ دا نەبووری ژبەر كاودانێن نەخۆشێن ناڤخۆیی دوبارە گوند خراب دبیت و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ ڤی گوندی ل دێرەلۆكێ و دهۆكێ ژیانێ دبەنە سەری[٢٣١].

## گوندێن دەڤەرا بەرێ گارێ:

## گوندێ مەهیدێ:

مەهیدێ گوندەكێ ئاڤایە، دكەڤیتە د ناڤا زنجیرا گوندێن دەڤەرا بەرێ گارەی دا و سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە، ب دووراتییا سێ كیلومەتران دكەڤیتە ژێرێ دێرەلۆكێ و بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

ل باشووری چیایێ زەنگل هەیە، ل رۆژهەلاتی گوندێ كەلەكا جهـ دگریت، و گوندێ كێرگاش ژی دكەڤیتە رۆژئاڤا ڤی گوندی.

### پێكهاتەیا جڤاكی:

مەهیدی دابەشی سەر دو بنەمالێن سەرەكی (مالا زاهر، مالا مەنكۆ) دبن. هژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٥٥ كەس بوون[٢٣٢].

مەهیدێ ژی مینا گەلەك گوندێن ڤێ دەڤەرێ د هەوا ئەنفالاندا ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن، پشتی سەرهەلدانێ و ل سالا (١٩٩١)ێ دوبارە گوند ژ لایێ خەلکێ ڤە دهێتە ئاڤاکرن و نها ١٧ سەرۆك خێزان ل ڤی گوندی هەنە.

بەری سەرهەلدانا (١٩٩١)ێ خواندنگەهـ نەگەهشتبوو ڤی گوندی و پشتی سەرهەلدانێ ژنوو د گەهیتێ و نها مزگەفتەك ژی هەیە و خەلك یێ مژوولی کارێن چاندنێ و شڤانیێ نە و هندەك ژ مەهیدیان ژی مژویلی کارێن بازرگانی نە[٢٣٣].

## گوندێ مژێ:

مژێ ژ گوندێن دەڤەرا بەرێ گارەیە، سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ ڤەیە. و بەری کو دێرەلۆك ببیتە سەنتەرێ ناحیێ گرێدای ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

باکوورێ گوندێ کەڤنە مژێ (کونە مژێ) هەیە، سپیندارا خەلفو دکەڤیتە باشووری، ل رۆژهەلات ژی گوندێ گێرگاشێ یە و گوندێ دێرەشێ دکەڤیتە رۆژئاڤا گوندی.

ژبەر هەبوونا هندە ناڤێن مەسیحییان ل سەر جهـ و وارێن ڤی گوندی ب باوەرا خەلکێ گوندی دبیت د کەڤندا ئەڤ گوندە یێ مەسیحییان بوویە، لێ هەتا نها ناهێتە زانین کانێ کەنگی مەسیحی ل ڤی گوندی نەماینە وەکی رەزێ قەشەی و هندەك ناڤێن دیتر. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٥ کەس بوون[٢٣٤] و سالا (٢٠١٤)ێ ١٢٢ خێزان سەر ب ڤی گوندی ڤەبوون.

مژێ یا ل بەر بلنداهیا چیایێ زەنگل و چیایێ دێرەشێ، کۆمەکا کانیێن ئاڤێ ل ڤی گوندی هەنە (کانی شەماشی، مێرگێ رەشاوە، کانیا بن بەرێ، کانیا دەحل و کانیا مەزن)، خەلکێ ڤی گوندی د کەڤندا ب کارێ جۆتیاری و شڤانیێ رابووونە. لەورا زۆما کێریێ شەهاڤا و گەلیکێ تاتێ و بەرکەڤرا زەرێ ژ بەرنیاسترین وان جهانە یێن کو بو ب خودانکرنا

گوندێ مەهیدێ



تەرش و کەوالی دهاتنە بکارئینان.

خەلکێ ڤی گوندی ژی حەیرانێن داوەت و شەهیانێن کوردی بوون و د دەمێن خۆشییان دا ب جلێن کوردی و خوارنێن کوردی رۆژێن پری خۆشی دەرباز کرینە.

سالا (١٩٩٢)ێ خواندنگەهـ ل مژێ هاتییەڤەکرن و ئاڤاکرن، و بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧٥)ێ ئامیرێ رادیۆیێ دگەهیتە ڤی گوندی.

دگەل کو مژێ کەڤنارە گوندە لێ بەری سەرهەلدانێ جارەکێ هاتییەخرابکرن کو ل سالا (١٩٨٨)ێ بوو د دەما ئەنفالاندا، پشتی ئاوارەبوونێ خەلکێ ڤی گوندی ل سالا (١٩٩١)ێ قەستا کوردستانێ دکەن و دوبارە سەر ژ نوو گوندێ خو ئاڤادکەن، لێ ژبەر کاودانێن ناڤخۆیی ل سالا (١٩٩٥)ێ دوبارە خراب دبیت و ل سالا (٢٠٠٦)ێ جارەکا دیتر ب روحەکا نوو خەلکێ ڤی گوندی مژێ ئاڤا دکەن و نها ٢٤ سەرۆك خێزان ل مژێ دژین و یێن دیتر ژی ل دهۆکێ و دێرەلۆکێ دژین[٢٣٥].

## گوندێ کەڤنە مژێ:

کەڤنە مژێ: ئێکە ژ گوندێن دەڤەرا بەرێ گارەی، پێشتر پشکەك بوو ژ گوندێ سپیندارا خەلفۆ، لێ پشتی کو بەشەکێ مالا هەمزۆی قەستا ڤی گوندی کری و هاتییەئاڤاکرن بوویە گوند و دیرۆکا ئاڤابوونا وێ نە زێدە یا کەڤنارە.

### سنوورێن گوندی:

گوند سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە، ب ١٥ کیلومەتران دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ دێرەلۆکێ، بەری سالا (١٩٧٩)ێ گرێدای سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو. بنەکۆکا کەڤنە مژی هەر هەموو بۆ مالا هەمزۆ ڤەدگەرن.

ئەڤ گوندە سالا (١٩٨٨)ێ و د هەوێن ئەنفالاندا هاتییە خرابکرن، بۆ جارا ئێکێ و پشتی سەرهەلدانا (١٩٩١)ێ دوبارە دهێتەئاڤاکرن و ژیان تێدا دوبارە دبیت، لێ ژبەر خراببوونا کاودانێن ناڤخۆیی دوبارە ل سالا (١٩٩٧)ێ خراب دبیت و خەلکێ وێ قەستا دهۆکێ و دێرەلۆکێ و ئامێدیێ دکەن. پشتی ئازادیا عیراقێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ بۆ جارەکا دیتر ئەڤ گوندە ژ لایێ خەلکی ڤە دهێتە ئاڤاکرن و نها چەندین مالبات ژیانێ لێ دکەن و پرانی کارێ چاندنێ و شڤانیێ دکەن.

بۆجارا ئێکێ ل سالا (١٩٨١)ێ خواندنگەهـ کەهشتییە ڤی گوندی، ژیانا گوندییان د سەردەمێن کەڤندا ل سەر بخودانکرنا پەزی و چاندنێ بوو، بەرهەمێ وان د وەرزێن زڤستان و پایزان دا دهاتە بکارئینان.

کەڤنە مژی ل سەر ژین و ژیانا کوردەواری مەزن بووینە و ل سەر رەوشت و تیتالێن کوردەواری بەردەوامی دایە ڤێ ژیانێ، وان گەلەك جۆرێن داوەت و شەهیانا و ب تایبەتی د شاهییادا دکرن و دگەل ڤێ یەکێ خەلکێ ڤی گوندی حەز ل سەر سترانێن فلکلۆری ژی هەبوو.

کەڤنە مژێ هەر چەندە نها یا ئاڤایە لێ پرانیا خەلکێ ڤی گوندی ل سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ دژین و زێدە قەستا گوندێ خۆ ناکەن[٢٣٦].

## گوندێ سپیندارا خەلفۆ:

سپیندارا خەلفۆ ژ گوندێن دەڤەرا بەرێ گارەیە، دکەڤیتە جهەکێ بلند، گرێدای ناحیا دێرەلۆکێ یە، بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو[٢٣٧].

### سنوورێن گوندی:

ل رەخێ باکوورێ سپیندارا خەلفۆ گوندێ مژێ هەیە، ل رۆژهەلاتی ژی گوندێ گرگاشێ جهـ دگریت، ل رەخێ رۆژئاڤا ژی گوندێ رەزیکێ و ل ژێرێ گوندی گوندێ ردێنیا نە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ سپیندارا خەلفۆ دابەشی سێ بنەمالێن سەرەکی (مالا حەمە گورگا، مالا هەمزێ، مالا سێڤێ)دبن، هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ

سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٦٥ کەس بوون[٢٣٨].
دیرۆکا ئاڤابوونا وی نەهاتییە زانین ژبەر کو گوندەکێ کەڤنارە و گەلەک ژ مێژە مرۆڤان ل ڤی گوندی ژیان کرییە.

سالا (١٩٥٨)ێ بۆ یەکەمین جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، ڤی گوندی رۆلەکێ بەرچاڤ د لڤین و باردوخێن سەدسالییا بیستێدا هەبوو. ژیانا خەلکێ سپیندارا خەلفۆ د کەڤندا ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنێ بوو.

ئەڤ گوندە د هەوێن ئەنفالاندا سالا (١٩٨٨)ێ بۆ جارا ئێکێ دهێتە خرابکرن و خەلکێ وێ بەرەڤ وەلاتێن ئیرانێ و ترکیا درەڤن و پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ دوبارە ژیان ل سپیندارا خەلفۆ دەست پێدکەت و خەلك ڤەدگەرنە سەر جهێ باب و باپیرا، لێ ئەو رەوشە زێدە ناڤەکێشیت و کاودانێن نەخۆشێن شەرێ ناڤخۆیی ب سەردادهێن و سالا (١٩٩٦)ێ دوبارە دهێتە کاڤلکرن.

پشتی ئازادییا عیراقێ سالا (٢٠٠٣)ێ بۆ جارەکا دیتر خەلکێ ڤی گوندی قەستا وارێ خو دکەن و نها ژی سپیندارا خەلفۆ ئێکە ژ گوندێن ئاڤا[٢٣٩].

## گوندێ شێرانە:

شێرانە ژ گوندێن دەڤەرا بەرێ گارە یە، دکەڤیتە باشوورێ سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆکێ، بەری سالا (١٩٧٩)ێ شێرانە ب سنوورێ خو یێ کارگێری ڤە سەر ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو، شێرانە دو دەمژمێران ب پێیان ژ دێرەلۆکێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

ل باکوورێ شێرانە چیایێ زەنگل و گەلیێ شێرانە هەنە، ل رۆژئاڤا گوندێ ردێنێ جهـ دگریت، زێوکا شێخان و مەزرێ دکەڤنە رۆژهەلاتێ ڤی گوندی و ل باشووری ژی چیایێ گارە هەیە.

### پێکهاتا گوندی:

ژ پێنج بنەمالێن سەرەکی (مالا محەمد عەلی، مالا حەجی ئوسمان، مالا حەجی محەمەدێ مێرەمی، مالا مەلا ئیبراهیم، مالا تاهر) پێکدهێت، ژمارا خەلکێ شێرانە ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤١ کەس بوون-[٢٤٠] و سالا (٢٠١٤)ێ پتر بوون ژ ٦٠٠ کەسان.

بلوفا، سارکە خرابێ، سویریا و کوڤلینکێ ژ وان خرابە گوندانن کو دکەڤنە د چوارچوڤێ توخیبێن گوندێ شێرانەدا، ئەڤ گوندە کەڤنارە گوندە و نەهاتییە زانین کانێ دیرۆکا ئاڤابوون و ئاکنجیبونا خەلکی ل ڤی گوندی بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەریت، لێ د سەردەمێ میرگەها بەهدینان دا ل ڤی گوندی مەدرەسەك هەبوو وانەیێن ئایینی فێری شاگردان دکر[٢٤١].

ل شێرانە کانییا بزۆنا و کانییا کترکی ژ وان کانییانە کو بۆ ڤەخوارنێ هاتینە ب کارئینان و ژ بلی ڤێ یەکێ رووبارێ شێرانکی ژی کو ژ ئەنجامێ هەر سێ ئاڤێن (رووبارێ گرکا و رووبارێ بزۆنا و رووبارێ سارکە خرابێ) پێکدهێت ل نك بورکێ دگەهیتە شێرانە و د ناڤا گەلیێ شێرانە دا بەرەڤ لایێ ژووری ڤە خۆ هەلدکێشیت و دچیتە ناڤا زێ مەزن، ڤی رووباری رۆل هەیە د چاندنێ دا ل گوندی.

هەروەسا هندەك گەرێن ئاڤێ ژی ل ناڤ شێرانە هەنە، بۆ مەرەما ڤەخوارنا تەرش و کەوالی هاتینە ب کار ئینان، وەکی (گەرا گولە سپی، گەرا تەنیرا، گەرا کویرکی، گەرا حەلانکا و گەرا دهۆکێ) کو هندەك ژ وان سروشتی و هندەك ژی خەلکێ گوندی بۆ مەرەما ئاڤداریا پەزی چێکرینە.

تویتن، برنج، گەنمۆك، ماش، کونجی، گارس، ئەرزن و نیسك ژ بەرهەمێن سەرەکینە کو شێرانەیا د دەمێن کەڤن دا چاندینە و مفا ژێ وەرگرتینە. ژ بلی ڤێ یەکێ هژمارەکا بەرچاڤ ژ دارێن گویزا و سپیندار و حلیك و هژیر و توی و مێو و سێڤ و خۆخ و سماق ل ڤی گوندی هەنە.

ژیان ل ڤی گوندی وەك تەڤایا گوندێن دیتر بوو، وان جلێن کوردی ل خۆ کرینە و ب کوردی ئاخفتینە و ب کوردی ستران گوتینە وخوارنێن کوردی ب کارئینان، خەلکێ شێرانە د رۆژێن شاهی و داوەتان

دا ب سێپێكێ و قلیچێ و ملانێ و شێخانیێ دیلان دكرن.

بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ گەهشتیە ڤی گوندی.

شێرانە بەری سەرهەلدانێ د هەوا ئەنفالان ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتیە خرابكرن، پشتی ڤەگەریانا خەلكێ ڤی گوندی بۆ سەر وارێ خۆ ل سالا (١٩٩١)ێ دهێتە ئاڤاكرن ڤە، لێ ژ ئەنجامێ ئالوزیێن ناڤخۆیی ل سالا (١٩٩٧)ێ بۆ جارا دووێ خراب دبیت و دهێتە چۆلكرن و هەتا نها كاڤلە گوندە[٢٤٢].

## گوندێ زێوكا شێخان:

زێوكا شێخان: ئێك ژ گوندێن دەڤەرا بەرێ گارەیە، سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە و چوار دەمژمێران ب پێیان ژ ژێرێ ناحیا دێرەلۆكێ دوورە، هەتا سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو[٢٤٣].

### سنوورێن گوندی:

زێوكا شێخان یا هەڤسنوورە دگەل گوندێ هاریكا ئاغا و چیایێ گرێ ژ ئالیێ باكووری، ل باشووری گوندێ ئێكمالا بەرێ گارەی هەیە، ل رۆژهەلاتی ژی بابولا و كافیا ل دەڤەرا زێباریان هەنە و ل رۆژئاڤا گوندێن شێرانە و ردێنێ هەنە.

خەلكێ ڤی گوندی د كۆكا خۆدا كوردن و سەر ب ئۆلا ئیسلامێنە ژ تەریقەتا قادری[٢٤٤]، ل ڤی گوندی دارا بنەمالا شێخێن زێوكیا یا هەی و هەتا نها ژی یا هاتیە پاراستن.

ل سالا (٢٠١٤)ێ ژ ١٨٠ سەرۆك خێزانا پێكدهێت، ژ بلی گوندێ سەرەكی زێوكا ژێری ژی دكەڤیتە سەر ڤی گوندی دگەل كەرتێ چاندنێ یێ ئالیا.

### پێكهاتا گوندی:

زێوكا شێخان ژ حەفت مالباتان پێكدهێن، پێنج ژێ ژ مالێن شێخانە، ئەو ژی (مالا شێخ محیەددین، مالا شێخ زادە، مالا شێخ حەجیا، مالا شێخ ئادو، مالا شێخۆ) و دو مالباتێن دیتر ب ناڤێ مالا زەمەنیا و مالا جاسم) د بەرنیاسن.

خەلكێ ڤی گوندی گرێدایینە ب ئۆلداریێ ڤە و د سەردەمێن كەڤندا تەكیا ل گوندێ زێوكا شێخان ب ناڤێ تەكیا زێوكا هەبوو، گەلەك ژ فەقی و مەلا ل ڤێ تەكیایێ خواندینە دەستووریا مەلاتییێ لێ وەرگرتینە، ژ بلی تەكیایێ پەرتووكخانەكا گەلەك مەزن یا پەرتوكێن كوردی و فارسی و عەرەبی و توركی هەبوو كو یا شێخ محیەدین بوو، ئەو ژی ژ بابكالكێن شێخی مابوون، لێ بەری سەرهەلدانێ هەموو پەرتووك ل سەر دەستێ چەتەیێن رژێمێ هاتنە سۆتن و ژناڤبرن[٢٤٥]، ژ سەدسالیا یازدێ مشەختی/هەڤدێ زایینی ڤە بزاڤا زانستی ل ڤی گوندی چالاكبوویە، چەندین دەستنڤیس ل خواندنگەها ئایینیا ڤی گوندی هاتینەنڤیسین كو دزڤرنەڤە سالێن ١١٠٨مش/١٦٨٦ز و ١٢٣١مش/١٨١٥ز و ١٢٦١مــــش/١٨٤٥ز و ١٢٩٥مــــش/١٨٤٩ز و ئەڤ دەستڤیسە نها ل خانەیا دەستنڤیسان ل بەغدا هاتینەپاراستن[٢٤٦].

ل سەر دەمێ میرگەها بەهدینان ل گوندێ زێوكا شێخان مەدرەسەكا ئۆلی لێ هەبوو و تێدا فێری خواندنا وانەیێن ئۆلی دبوون[٢٤٧].

زێوكا شێخان یا دۆرپێچداییە ب چیایێ گارە و چیایێ زەنگل و گرێ و وان چیایان جوانی دایە ڤی گوندی و گەلەك جۆرێن گیانەوەرێن كویڤی وەكی پلنگ و هرچ و گورگ و حەفتیار لێ هەنە.

ل زێوكا شێخان ژیان ل سەر چاندنێ و شڤانیێ بوو، ب شەڤ و رۆژ كاردكر دا دەبارا رۆژا وان پێ دەركەڤیت، چ بۆ خوارنێ و چ ژی بۆ فرۆتنێ، ژ بلی وێ چەندێ مینا هەر گوندەكێ دیتر ل سەر كەزان و بەرۆی و مازییا ژی ژیان دكر.

گوندی گەلەك كانیێن ئاڤێ هەنە، هندەك ژ وان بۆ ڤەخوارنێ و هندەك ژی بۆ ڤەخوارنا گیانەوەران و چاندنێ ب كار دهینان وەكی: (كانییا گوندی، كانییا گوڤێ، كانییا كیفتێ و كانی ساركێ)، هەروەسا ل تەنشتا ڤی گوندی رووبارێ شێرانكی دەرباز دبیت و ئەڤە ژی دبیتە پالدەرەك بۆ كارێ چاندنێ ل گوندێ ناڤهاتی.

شێخێن زێوکێیا خودان ڕۆل و پێگەهەکا باشا جەماوەری بوون، وان ڕۆل د پێشڤەبرنا ئاستێ زانست و زانینێ د وی سەردەمی دا هەبوو.

زێوکا شێخان کەڤناره گوندە، لێ دیرۆکا ئاڤابوونا وی نەهاتیە زانین، تا ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن ژی هەتا وی سەردەمی هەرێ ئاڤا بوو و وەك جهەکێ پیرۆز ژ لایێ خەلکی ڤە دهاتە ل قەلەمدان، بەلێ نها گوندەکێ بەردای و ڤالایە ژ خەلکێ وی.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧١)ێ گەهشتییە ڤی گوندی، پێشتر خەلکێ گوندی د ناڤا حوجرە و تەکیایێ دا دخواند. نها پتریا خەلکێ ڤی گوندی ل دێرەلۆکێ و دهۆکێ ژیانا خو دەرباز دکەن و مژوولی کار و ئەرکێن خو یێن رۆژانەنە[٢٤٨].

## گوندێ گێرگاش:

گوندەکێ بلندە سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ، دکەڤیتە دەڤەرا بەرێ گارەیی ب دووراتییا هەشت کیلومەتران ل ژێریێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ و بەری کو بکەڤیتە د سنوورێ دێرەلۆکێ دا هەتا سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

یێ دۆرپێچکرییە ب گوندێن گوهەرز و بەرچی ژ لایێ باکووری، شێرانە و ردێنیا ژ لایێ باشووری، گوندێ مەهیدێ ژی دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گێرگاشی و هەر سێ گوندێن مژێ و کەڤنە مژێ و سپیندارا خەلفو ژی ل رەخێ رۆژئاڤا گوندینە[٢٤٩].

### پێکهاتا گوندی:

د کەڤن دا مرۆڤێن زانا ل ڤی گوندی رابووینە، وەکی مەلا مەنسورێ گێرگاشی (ل سەدسالیا شازدێ زایینی ژیایە)[٢٥٠] گێرگاشی هۆزانڤانەکێ کلاسیکێ کوردییە و هۆزانێن بەرکەفتی نڤیسینە لێ نەهاتییە زانین کانێ بابێ وی کییە[٢٥١]، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٢٥٢] و سالا (٢٠١٤)ێ ئەڤ گوندە ژ ٣٥٠ کەسان پێکدهێت و دابەشی سەر سێ بنەمالێن سەرەکی بین، ئەو ژی 'مالا مەلا عەلی، مالا شێخێ و مالا فارس.. دگەل کو نها تەڤ پێکهاتەیا گوندی موسلمانن لێ د کەڤندا جوهی ژی ل گوندێ گێرگاشی د ئاکنجی بوون و وان ژی ژیانا خۆ یا نورمال ل ڤی گوندی دبووراند.

چیایێ زەنگل و گارە نێزیکی ڤی گوندینە و خەلکی مفا بۆ گەلەك مەرەمان ژ ڤان چیایان وەرگرتینە، وەکی جهەکێ خۆ پاراستنێ و جهەك بوو بۆ پەیداکرنا پێدڤیێن خوارنێ ب تایبەت د وەرزێ بهارێ دا و د هەمان دەم دا بۆ چەروانێ پەزی ژی هاتییە ب کارئینان.

تەختێ رەش و بەرێ خزینێ و تریێ جوهیان ژ جهێن بەرنیاسن ل ڤی گوندی، دگەل ڤێ یەکێ کۆمەکا کانیێن ئاڤێ ژی ل گێرگاشی هەنە، وەکی کانییا گوندی و کانییا خەلفۆ و کانییا دەلاڤە و کانییا بن برکێ و ئەڤ کانیە بۆ مەرەما ڤەخوارنێ و چاندنێ ژی هاتینە ب کارئینان.

خەلفۆ و نەوێ و دەلاڤـە و کولێ شێخی و دەحلێ کولکی ژ وان خرابە گوندانە کو دکەڤنە د چوارچوڤێ ڤی گوندی دا، د هەمان دەم دا وارێ ب کولیلك و خەلفۆ خەلکێ گێرگاش وەك زۆمێن پەزی د سەردەمێن کەڤن دا ب کارئینانە.

گەنم و جەهـ و برنج ژ بەرهەمێن سەرەکی بوون کو ل ڤی گوندی دهاتنە چاندن و کەزان و مازی و سماق ژی جهەکێ تایبەت د ژیانا وان دا گێرایە.

خواندنگەهـ تا نها ژی نەگەهشتییە ڤی گوندێ، لێ ل سەردەمێ مەلا مەنسورێ گێرگاشی دا خواندنگەهەك یان ژی حوجرەکا خواندنا ئایینی لێ هەبوو، تێدا فێری وانەیێن ئایینێ ئیسلامێ دبوون.

گوندێ ناڤبری ژبەر هندە ئەگەران ل سالا (١٩٧٥)ێ دهێتە چۆلکرن، ل سالێن هەشتیان دوبارە هندەك ژ خەلکێ گوندی قەستا وی دکەنە ڤە، لێ ل سالا (١٩٨٨)ێ دکەڤیتە بەر هەوا ئەنفالان و کاڤل دبیت.

پشتی سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ ئەڤ گوندە سەر ژ نوو دهێتە ئاڤاکرن و ژیان دەست پێدکەت،

لێ ل سالا (١٩٩٧)ێ ب ئەگەرێ نەئارامیا ناڤخۆیی دهێتە چۆلکرن و هەتا نها نە هاتییەئاڤاکرن[٢٥٣].

## گوندێ ئێکماله:

ب ئێکمالا بەرێ گارەی بەرنیاسە، دکەڤیتە د چوارچوڤێ گوندێن بنارێ چیایێ گارەی و سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە، بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ بوو.

### سنوورێن گوندی:

رۆهەلاتی دەڤەرا زێبارێ و گوندێ کایایە، رۆژئاڤای دەڤەرا بەرێ گارەی و کێرێ یە، ل باکوور ژی زێوکا شێخانە و گارە ژی دکەڤیتە باشوورێ گوندی. گوندێ فەقۆ، سەرۆکانی و سەرێ سیارێ ژ وان سێ خرابە گوندانە کو دکەڤنە د چوارچوڤێ توخیبێن ڤی گوندی دا.

### پێکهاتا گوندی:

ئێکمالەیی ژ دوو بنەمالێن سەرەکی (مالا حسین بەگ و مالا سوفی ئەحمەدێ مال ژێری) پێکدهێن، هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٩١ کەس بوون[٢٥٤] و سالا (٢٠١٤)ێ ١٨٠ خێزان بوون.

چیایێ گارە و بەرۆژی بەژنا خۆ ل هنداڤی ئێکمالێ بلند کرییە، ئاکنجیێن ڤی گوندی د گەلەك قۆناغان دا پاراستینە و د هەمان دەم دا ل سنوورێ ئێکمالێ کانییا سار و کانییا گوندی هەنە کو ئەڤ هەردو کانییە بۆ ڤەخوارنێ هاتینە بکارئینان.

ل سنوورێ ئێکمالێ ناوسکەکا کەڤنارا شوینواری هەیە، لێ دیرۆکا وێ مینا دیرۆکا ئاڤاکرنا گوندی نەیا دیارە، خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧١)ێ گەهشتییە ڤی گوندی و محسن ئالەکی ئێکەم مامۆستا بوو ل ڤی گوندی.

بۆ جارا ئێکێ ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالان دا دهێتە خرابکرن، ل سالا (١٩٩١)ێ دوبارە دهێتە ئاڤاکرن، لێ کاودانێن ناڤخۆیی نەهێلا هەتا نها گوندێ ئێکمالێ یێ ئاڤاکری بمینیت و ل سالا (١٩٩٦)ێ گوند دهێتە چۆلکرن و هەتا نها وەك کاڤلە گوندەکی یە[٢٥٥].

# گوندێن سەر ب عەشیرەتا زێبارێ

## گوندێ هاریکا شێخا:

هاریکا شێخا ئێك ژ گوندێن نزارێ زێبارێ یە، سەر ب عەشیرەتا زێبارییا ڤەیە و هەڤسنوورە دگەل دەڤەرا دەشتازێ. ب دووراتییا سێ کیلۆمەترا دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ دێرەلۆکێ، بەری سالا (١٩٧٩)ێ هاریکا شێخا سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو[٢٥٦].

### سنوورێن گوندی:

ژ لایێ باکووری هەڤسنوورە دگەل زێ مەزن و گوندێ چەلکی، ل باشووری ژی زێوکا شێخان جهـ دگریت، گوندێ بیاوێ ژی دکەڤیتە رۆژهەلاتێ هاریکا شێخا و ل رۆژئاڤا ژی هاریکا ئاغایە.

### پێکهاتا گوندی:

هژمار خەلکێ گوندی نەگەلەکە و ژ سێ بنەمالێن سەرەکی پێکدهێت، ئەو ژی (مال ژێری و مال ژووری و مالا باپیرانە). هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٥ کەس بوون[٢٥٧].

بەری سەرهەلدانا سالا (١٩٩١)ێ ئەڤ گوندە دو جاران هاتییە سۆتن، جارەکێ د سالێن شێستان دا کو ب تمامی هاتبوو سۆتن و جارا دووێ ل سالا (١٩٨٨)ێ، ل سالا (١٩٩١)ێ بۆ (١٩٩٢)ێ دوبارە دهێتە ئاڤاکرن ڤە[٢٥٨].

ئەڤ گوندە کەڤنارە گوندە، لێ نەهاتییە زانین کانێ دیرۆکا ئاڤابوونا وی بۆ کیژ سەردەمی ڤەدگەریت، ل سالا (١٩٧١)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، ل وی دەمی خویندکارێن وان ل

سەر تەنەکان دخواند و ئەحمەد کیتو ئامێدی ئێکەم مامۆستا بوو وانە لێ گۆتین[٢٥٩].

ژ بلی گوندێ سەرەکی نها دو کاڤلە گوند خۆ د سنوورێ هاریکا شێخا دا دبینن (کاڤلێ زەرۆ و کاڤلێ فرەنگی)، ژ بلی ڤێ یەکێ ناوسکەکا کۆلایی د کەڤری دا ل سنوورێ گوندێ ناڤبری هەیە کو ب ناوسکا هاریکێ بەرنیاسە[٢٦٠].

ژیان ل هاریکا شێخا ل سەر تەرش و کەوالی بوو و د هەمان دەمدا هژمارەکا بەرچاڤا خەلکێ گوندی ب کارێ چاندنێ رادبوون، چونکی خودان ملکەکێ بەرفرەهـ و بەرکەتی بوون، وان کونجی و برنج و ماش دکرن و دگەل ڤێ یەکێ ل هاریکێ سماق ژی هەیە.

خەلکێ هاریکا شێخا ل وەرزێ بهارێ گیایێن بهاری (سوریاز، کاری، سترك، هندرش، لیش، رێڤاز) ب کار ئینانە، دیسان کەزان و بەرِوی و مازی و گورسك ژی ئینان و نعرعن و ژیانا وان ل سەر ڤی کارێ هەنێ بوو.

ل چیایێن گوندی هرچ و بەراز و گورگ و حەفتیار و رویڤی و کیژگ ب هژمارەکا زێدە هەنە، ژ بلی سڤۆرە و قوربەشك و کەو ژی کو ل چیایێن هاریکێ هەنە...

## گوندێ هاریکا ئاغا:

هاریکا ئاغا گوندەکێ جوانە سەر ب عەشیرەتا زێباری یە، دکەڤیتە نزارێ زێبارێ و دوماهیك گوندێ زێبارییانە و یێ نێزیکە ژ دەڤەرا دەشتازێ، سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە ب دووراتییا ئێك کیلومەتر ل باشوورێ سەنتەرێ دێرەلۆکێ. ئەڤ گوندە بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو. هاریك ب رامانا هاریکاری دهێت.

گوندێ هاریکا شێخا



### سنوورێن گوندی:

ل باكوورێ گوندی سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆكێ و گوندێ چەلكی هەنە، ل باشووری ژی گوندێ زێوكا شێخان، گەلەكا دكەڤیتە رۆژئاڤا گوندی و هاریكا شێخا ژی ل رۆژهەلاتی یە.

### پێكهاتا گوندی:

هاریكا ئاغا ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٥ كەس بوون[٢٦٢] و سالا (٢٠١٤)ێ ژ ٨٣ سەرۆك خێزانا پێكدهێت و دابەشی سەر دو مالباتان دبیت (مالا شەمدین ئاغا، مالا زیباب ئاغا).

د سەردەمەكیدا جوهی ژی ل ڤی گوندی د ئاكنجیبوون، ژ بلی گوندێ سەرەكی (كاڤلێت عەبدولرەحمان، كاڤلێ زێرۆ، شیڤە كیرێ، بانیا رەزكێ و گركێ جوهیا) وەك كاڤلە گوند دكەڤنە د سنوورێ هاریكا ئاغا دا.

هاریكا ئاغا ب ئاڤا سەرعەرد یا دەولەمەندە، هەردو رووبارێن زێ مەزن ل باكوورێ گوندی و رووبارێ شێرانكی ل رۆژئاڤا گوندی را دەرباز دبن و چیایێ گریێ (حەفت تەبەق) ژی بەژنا خو ل باشوورێ ڤی گوندی بلند كرییە.

د دەڤێ گەلیێ شێرانكی دا و ل سەر عەردێ هاریكا ئاغا ناوسكەكا كەڤنار هەبوو لێ د سەردەمێ حكۆمەتا عیراقی دا ئەو ناوسك ب بەهانا برنا جادەیێ بۆ گەلی هاتییە تێك دان و خرابكرن.

مامەرا، سەرێ گریێ، شكەفتا گەلیكی و كانیێن گیرا ژ زۆمێن هەرە بەرنیاسن ل هاریكا ئاغا، بۆ مەرەما خودانكرنا تەرش و كەوالی هاتینە ب كارئینان.

ئاڤارێ ڤی گوندی ل سەر ئاستێ دەڤەرێ گەلەكێ بەرنیاسە و باشترین جهە بۆ چاندنا برنجی، ژ بلی ڤێ یەكێ هژمارەكا هەرە زێدە یا بەرهەما ل ڤی ئاڤاری بۆ فرۆتنێ دهێنە كرن.

ل هاریكا ئاغا گویز و هنار و زەیتۆن و خۆخ و گەنمە شامی و نیسك و نۆك زێدە هەنە و ژ بەرهەمێن سەرەكینە. خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧١)ێ گەهشتییە ڤی گوندی و ئێكەم مامۆستا ژی ل وی سەردەمی (ئەحمەد كتو) بوو.

هاریكا ئاغا كەڤنارە گوندە و دیرۆكا ئاڤا بوونا وی نەهاتییە زانین، هەتا نها پێنج جاران هاتییە خراب كرن، جارا ئێكێ ڤەدگەریت بۆ سەردەمێ فەلە رەشكا كو گوند ب ئێكجاری كاڤل بوویە، ل سالا (١٩٦١)ێ دگەل دەستپێكا شۆرشا ئەیلوولێ دوبارە هاریكێ خراب دبیت، پشتی دهێتە ئاڤاكرن ڤە ل سالا (١٩٨٦)ێ د هەوا خراب كرنا گوندان دا حكۆمەتا عیراقی هاریكێ ژی كاڤل دكەت.

ل سالا (١٩٩٢)ێ دوبارە پشتی سەرهەلدانا پیرۆز خەلكێ ڤی گوندی هاریكێ ئاڤا دكەن، لێ د سالا (١٩٩٨)ێ دا هاریكا جارەكا دیتر خراب دبیت و هەتا نها یا كاڤلە و كەس لێ ناژیت[٢٦٣].

## گوندێ بیاوێ:

بیاوێ گوندەكێ جوان و بالكێشە ل نزارێ زێباری، نێزیكی دەشتازێ و سەر ب عەشیرەتا زێبار و ناحیا دێرەلۆكێ یە، هەشت كیلومەتران ژ باشوورێ رۆژهەلاتێ دێرەلۆكێ دوورە، پێشتر سەر ب ناحیا دینارتێ بوو ل قەزا ئاكرێ.

### سنوورێن گوندی:

گوند یێ دۆرپێچكرییە ب زێ مەزن و باوان ژ لایێ باكووری، چیایێ گریێ ژی دكەڤیتە باشوورێ، سەرۆكانی ژی ل رۆژهەلاتێ گوندی و ل رۆژئاڤا ژی گوندێ هاریكا شێخا هەیە.

بیاوێ ب رامانا (دارا بیا) دهێت[٢٦٤]، هژمار خەلكێ وێ گەلەكێ كێمە. ل ڤی گوندی چەندین بەرە بابان ژیان كرییە و نەهاتییە زانین كانێ دەسپێكا ژیانێ ل بیاوێ بو كەنگی ڤەدگەریت، بۆ جارا ئێكێ ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٦١)ێ دهێتە خرابكرن و بۆ جارا دووێ ل سالا (١٩٨٧)ێ و هەتا نها كاڤلە گوندە، خەلكێ ڤی گوندی ل سەنتەرێ ناحیا دێرەلۆكێ و

دهۆكێ دئاكنجینە.

گوندێ بیاوێ خودان شیڤەكا تژی دارێن بیانە و نها ئێكە ژ خۆشترین هاڤینگەهێن دەڤەرا دێرەلۆكێ[٢٦٥]، ژ دو بنەمالێن سەرەكی پێكدهێت، ئەو ژی (مالا مستو و مالا عەبێ)نە، دگەل سرۆشتێ خویێ جوان ب تایبەت ل وەرزێ هاڤینێ كانیا بیاوێ ژی جهێ خو د ناڤا دلێن خەلكی دا دكەت.

د سەردەمێن كەڤن دا ژیان ل بیاوێ ب كورداتیێ دەست پێكرییە و وەسا بەردەوامی دایە ژیانێ هەم ژ ئالیێ جل و بەرگان و هەم ژی داوەت و شەهیانا و خوارنێن كوردەواری ڤە. نها ژی ب ئاوازێن كوردی ل بنارا چیایێ گرێ ژیانا خو دەرباز دكەن و رەز و بیستان و ئاقارێن خۆ ئاڤەدان دكەن.

ژیان ل ڤی گوندی ل سەر جۆتیاری و شڤانیێ بوو، برنج و دەخل و جەهـ ژ بەرهەمێن سەرەكینە كو خەلكێ بیاوێ مل دایە بەر، ژ بلی ڤێ یەكێ وان نیسك و باقل و كونجی ژی د چاندن.

پەزكویڤی و سیخور و هرچ و پلنگ ژی ل چیایێن ڤی گوندی هاتینە دیتن، نها ژی گورك و حەفتیار دگەل ژمارەكا زێدە یا تەیر و تەوالێت كویڤی لێ هەنە.

ل بیاوێ دو ناوسكێن كۆلایی د كەڤری دا هەنە كو چوونە ناڤ وان پیچەكا ب زەحمەتە، ئەڤە ژی رامانەكا دیتر یا كەڤناریێ ددەتە ڤی گوندی[٢٦٦].

## گوندێ گەلەكا:

ئێكە ژ وان گوندێن ناحیا دێرەلۆكێ، ب دووراتییا كیلومەترەكی ژ ژێریێ سەنتەرێ ناحیێ، سەر ب عەشیرەتا زێبارییانە، ب تنێ سێ مال نەبن كو ئێكمالا بەرێ گارێنە، گەلەكا وەك گوند دكەڤیتە ناڤا دەڤەرا بەرێ گارەیی.

بەری سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناڤەندا قەزا ئامێدیێ بوو. جارا ئێكێ ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە ئاڤاكرن كو پێشتر چ گوندەك ب ڤی ناڤی نەبوون.

### سنوورێن گوندی:

باكووری ناحیا دێرەلۆكێ، رۆژهەلاتی ی رووبارێ شێرانە و هاریكا ئاغا جهـ دگرن، گوندێ مەهیدێ ژی دكەڤیتە رۆژئاڤا گوندی و ل باشووری ژی چیایێ زمنگل و گوندێ شێرانە هەنە.

هژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٥١ كەس بوون[٢٦٧] و هەتا داویا سالا (٢٠١٣)ێ سەرژمێرا گوندی دبوو ٢٥٤ كەس، نها ژ بلی وان كەسێن مووچەخۆر ژیانا پتریا گوندی ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالییە و بەرهەمێ وان دفروشن وەك شیری و پەنیری و سەرتیكی و نیڤشكی، و هندەك ژێ كارێ چاندنێ دكەن.

برنج و كونجی و ماش ژ بەرهەمێن سەرەكینە ل ڤی گوندێ و ل وەرزێ دەخل و دانی ژی خەلكێ ڤی گوندی گەنم و جەهی دچینن و ژ ئاڤا رووبارێ شێرانەی د كەرتێ چاندنێ دا مفا وەردگرن و بۆ ئاڤا ڤەخوارنێ ژی مفا ژ كانییێن گیرا وەردگرن ئەوێن كو دكەڤنە ژێریێ گوندی.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٩٨)ێ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن، نها خویندكارێن وان قۆناغا دەستپێكی ل گەلەكا دخوینن و بۆ یا ئامادەیی (بەرهەڤیێ) دچنە دێرەلۆكێ.

ل وەرزێ بهارێ ئاكنجیێن گەلەكا مفا ژ گیایێن بهاری ژی وەردگرن وەكی سوریازێ، لویشێ، سترك و كاری كەلێ.

بۆ دەم بووراندنێ ژی زارۆكێن ڤی گوندی گەلەك یارێن كوردەواری دكرن و نها ژی هەر دكەن وەكی: دارحەجانێ و كۆكانێ و كێلەبەرانێ و ئەگەر باس ل سەر لایەنێ داوەتا و شاهیا بكەین ل گەلەكا دێ بۆ دیار بیت كو ئەڤ خەلكە گەلەك حەز ژ داوەتان دكەن و پتریا وان داوەتێن كو دكەن ئەڤەنە: شێخانی، ملانێ، سێ پێكی، بابلەكانێ و شامیرانێ.

ژ بلی گوندێ ناوسكا یان هەر چوار ناوسكێن كو ل ژێریێ گەلەكا هەین كو دكەڤنە جهەكێ ئاسێ

د ناڤا تەحتەكی دا چ شوینوارەكێ دیتر ل گەلەكا نینن[268]، د هەمان دەم دا چ گیانەوەرەكێ كیڤی ژی ل ڤی گوندی نینە چونكی چیایێ وێ نە یێ بلندە[269].

# گوندێن سەر ب هۆزا بەرواری ژووریان:

## گوندێ بێتكارێ:

بێتكار ئێكە ژ گوندێن بەرواری ژووریان، د كەڤیتە ناڤا دەڤەرا نێروەرێكان، لێ ژبەر كو دكەڤیتە رۆژهەلاتێ رووبارێ زێی هەتا سالا (١٩٧٩)ێ سەر ب ناحیا بێبۆ بوو، نها ژی سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە. ل دووڤ ڤەگێرانا خەلكێ گوندی هەبوونا ڤی گوندی بۆ بەری نێزیكی ٨٠٠ سالان ڤەدگەریت، گوایە د ڤی دەمیدا كەسەك ب ناڤێ ئەیوب ژ بنەمالەكا ناڤدار ب (بنەمەلا میرەكا) ژ گوندێ سەرانكیرێ دەڤەرا گەڤەرێ قەستا ڤی جهی كریە، د وی دەمیدا ئاڤدەل بلوكی دەستەلاتدارێ ڤی جهی بوو، ئەیوبی كەلایەك بۆ خۆ چێكر ل سەر بانێ شكەفتەكێ كو هەتا نها ب شكەفتا ئیبیا ئانكو شكەفتا ئەیوب بێتكاری ناڤدارە، پشتی دەمەكی ژڤەمانا وی ل گوندی هەڤركی د ناڤبەرا وی و ئاڤدەل بالوكی دا چێبوو و د ئەنجامدا ئاڤدەل ژ ناڤچوو و دەستەلاتێ دەڤەرێ هەتا جهـ و كەلا ناڤدار ب (صارا شەكرێ) كەتە دەست ئەیوب بێتكاری و هەتا بەری سەد سالەكان ئەڤێ دەڤەرێ خویكا خۆ ددا خەلكێ بێتكارێ. هەروەسان ل دووڤ ڤەگێرانا خەلكێ دەڤەرێ پەیڤا بێتكار ژ دو پەیڤێن (بیت)ا عەرەبی و (كار)ا كوردی ئانكو مالا كاری یان جهێ كاری پێكهاتییە، هەرچەند ئەڤ بۆچوونە نە گەلەك جهێ باوەریێ یە.

### سنوورێن گوندی:

باكوورێ گوندی سنوورێ باكوورێ كوردستانێ قەزا چەلێ یە، ژ لایێ باشووریڤە گوندێ مەلختە وكری، رۆژهەلاتی سنوورێ گوندێن نیروە و رۆژئاڤای گوندێن سەرزێری و هەلوەنە.

### پێكهاتا گوندی:

هەتا سالا (١٩٧٦)ێ كو گوند هاتییەڤالا كرن خەلكێ گوندی ژ بنەمالێن (بنەمالا شێخی، بەگێ، بەیرەما، ملحەم، جەمێ، سەینا، خدرێ، ئینس و لاوكی) پێكدهات هندەك بنەمالێن دیتر بەری هنگی ژ گوندی باركرینە مە ئاماژە پێ نەكرییە، بنەمالێن ئاماژە پێكری هەتا سالا (٢٠١٤)ێ پتر ژ ٦٠٠ خێزانان بوون، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٧٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[270].

زۆمێن بێتكارێ بۆ ب خودانكرنا پەزی د ناڤدارن، ژ بلی ڤێ یەكێ كادڤین و سەرۆكانی و شكێرێ سپی و سەرچیایی و بەرێ پیرێ و كەندال سۆر و ناڤ مەیدان و ناڤ كاڤلا و كاڤلێت خەلێ و كانیا سنجی و گەلیێ فەقیر ژ جهێن گەلەك بەرنیاسن و ب ژین و ژیانا گوندییان ڤە د گرێداینە.

چەند شكەفت و جهێن شوینواری و بەرچاڤ ل گوندی هەنە وەك: شكەفتا ئیبیان پرا بلبل، گركێ دیۆن خانێ، سەرێ كەلێ، سەرێ گێژنێ، كانیانێ، سەرێ گرێ، شكەفتا سەر چیایی، كنابئاڤ، و گەلەك جهێن دی هەنە ناهێن هژمارتن.

كارێ سەرەكی یێ خەلكێ ڤی گوندی چاندن بوو، هژمارەكا زێدەیا پەزی هەبوو و ل سەر بەرهەمێن وان بەردەوامی ب ژیانا خۆ ددا، هەروەسان كارێ چاندنێ و بازرگانیێ ژی دكر، ژ بەركو دەڤەرەكا سنووری بوو كاریگەری د رەوشا ژیانا وان دا هەبوو.

بێتكار ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە خرابكرن و هەتا خرابووی ژی خواندنگەهـ ل گوندی نەبوو.

خەلكێ ڤی گوندی نها ل سەنتەرێ بازێرێ دهۆكێ و هندەك بازێركێن دەوروبەرێن پارێزگەهێ د ئاكنجینە و ژیانا وان ل سەر مووچەخوریێ و كاسبیێ یە[271].

## گوندێ کارە:

ژ گوندێن بەرواری ژووریانە، هەتا سالا (۱۹۷۹)ێ سەر ب ناحیا بێبۆ و نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە، کارە خرابە گوندە و ژ سالا (۱۹۷٦)ێ وەرە هەتا نها کەس ل ڤی گوندی نەژیایە.

### سنوورێن گوندی:

ژ لایێ باکووری هەڤسنوورە دگەل گوندێ سپینداریێ، ژ لایێ باشووری گوندێ زێوە هەیە، ل رەخێ ڤی گوندی و ژ ئالیێ رۆژئاڤا ژی رووبارێ زێی مەزن و گوندێن هۆزا نێروە ژی دکەڤنە رەخێ رۆژهەلاتێ کارە.

### پێکهاتا گوندی:

کارەی ژ سێ بنەمالان پێکدهێن: (مالا خارانی، مالا ئالە سڤنی، مالا پیرخدری)، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (۱۹۵۷)ێ ۱۸۰ کەس ل ڤی گوندی دژیان[۲۷۲]، خەلکێ ڤی گوندی کوردن و پەیرەوێن ئایینێ ئیسلامێنە.

ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا برنج و دەخلی و جەهـ و گەنمۆکا بوو، ژ بلی کو کارێ بخودانکرنا پەزی ژی دکر و بەرهەمێ وان د فرۆتن یان ژی بۆ وەرزێن زڤستانێ د هەلگرتن.

هەر وەسان خەلکێ ڤی گوندی کارێ بازرگانی و کاروان ژی دناڤبەرا گوند و دەڤەران دا دکرن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (۱۹۷۱)ێ گەهشتییە ڤی گوندی و بەری هینگێ خواندن لێ نەبوو.

پشتی سالا (۱۹۷٦)ێ تا نهو ئەڤ گوندە نەهاتییە ئاڤاکرن و خەلکێ کارە یێ بەلاڤە ل سەر دەڤەر و باژێر و باژێرکێن دهۆکێ و نها ژیانا وان ل سەر مووچەیە و پشکەکا کێم ژ وان کارێ بازرگانیێ دکەن[۲۷۳].

## گوندێ سپینداریێ:

ئێکە ژ گوندێن بەرواری ژووریان، هەتا سالا ۱۹۷۹)ێ سەر ب ناحیا بێبۆ و نها سەر ب ناحیا دێرەلۆکێ یە.

### سنوورێن گوندی:

سپینداریێ کەڤنارە گوندە، سنوورێن وی ژ لایێ باکووری ڤە یێ هەڤسنوورە دگەل گوندێ بێتکاریێ و گەلەکێ نێزیکە ژ باکوورێ کوردستانێ، ژ لایێ باشووری ژی گوندێ کارە هەیە و ل رۆژهەلاتی ژی گوندێن گرێدای هۆزا نێروە جهـ دگرن و رۆژهەلاتێ ڤی گوندی ژی گوندێن بەرواری ژووریانە.

### پێکهاتا گوندی:

سپینداری دابەشی سەر چوار بنەمالا دبن (بنەمالا بادینا، بنەمالا عەمەرا، بنەمالا هاجیا و بنەمالا هەمەدا)، هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (۱۹۵۷)ێ ۱۸۷ کەس بوون[۲۷٤] و ژیانا وان د سەردەمێن کەڤن دا ل سەر کارێ جۆتیاریێ و شڤانداریێ بوو، دیسان مفا ژ گیا و بەرهەمێن چیای ژی وەردگرتن.

ژیان ل سپینداریێ تەڤ ب کوردی بوو، وان گەلەك حەزا دیلانا هەبوو، شەڤبێریێن کوردەواری جهێ گرنگیدانا خەلکی بوون، سپیندارییا گەنم و جەهـ و برنج و کونجی دچاندن و ل وەرزێ چاندنێ بەرهەمێ وان ل دەمێن پێدڤی بکاردهینان یان ژی د فرۆتن.

بۆ جارا ئێکێ و داویێ ئەڤ گوندە ل سالا (۱۹۷٦)ێ ل سەر دەستێ حکۆمەتا عیراقێ دهێتە خرابکرن، خەلکێ وێ ژی بۆ کۆمەلگەهێن زۆرە ملی دهێنە ڤەگوهاستن و ژ وێ سالێ وەرە هەتا نها سپینداریێ خرابە گوندە و ژیان تێدا نەهاتییە کرن، پتریا خەلکێ وێ ژی نها ل دهۆکێ دئاکنجینە[۲۷۵].

# ناحیا بامەڕنێ

**کارزان محەمەد حسێن بامەڕنی**

ناحیا بامەڕنێ سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەیە، بامرنێ (٦٠کم) ژ سەنتەرێ پارێزگەهێ و (٤٠ کم) ژ سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ دووره، ژوورێ بامەڕنێ دبیتە سنسلا چیایێ مەتینی، رەخێ ژێری دەشتەکا بەرفرەهـ ب خۆڤە دگریتن هەتا دگەهیتە تخۆبێن هەردو گوندێن شێخ مەما و کانیکا، رۆژئاڤایێ بامەڕنێ دبیتە گوندێ زێوا شێخ پیرامووسی، ژلایێ رۆژهەلاتیڤە گوندێ ئەرەدنایە.

بامەڕنێ ژ ناحیێن نوییە، کو حکومەتا هەرێما کوردستانێ ل دووڤ بریارا کارگێری یا هژمار (١١٩٧) ل رێکەڤتی (٢٠٠٠/٢/١٦)ێ کریە ناحییە[1].

گەلەك بۆچوونێن ژێك جودا ل سەر بنیاتێ ناڤکرنا بامەڕنێ هەنە، هندەك شوینوارناس ودیرۆکنڤیس وەك (سەدیق دەملوجی و گورگیس عەواد و بەشیر فرنسیس و جەمال بابان) دبێژن: پەیڤا بامەڕنێ ژ (بیث مورنێ) یان (بیث هاردنی) هاتییە کو پەیڤەکا ئارامی یە و رامانا وێ (مالا موکوم وئاسێ)یە. بەلێ (ئەنوەر مائی) ل سەر ڤی بابەتی دبێژیت: ((هندەك نڤیسەر ب ئالوزی هندەك گوندان دکەنە ئارامی وەك شرۆڤەکرنا بامەڕنێ و دکەنە (بیث ماردنێ) یان (بیث هاردنێ) ئەڤە ژی گەلەك ژ عەقلی دووره)).

(یاقوت الحموی) د کتێبا (معجم البلدان)دا دبێژیت:

((بامەردنێ گوندەکە سەرب نەینەوا ڤە و دکەڤیتە ژوورێ رۆژهەلاتی و خودێ دزانیت. دیسا ناڤێ زانا (بابێ یەحیای ئەحمەد کورێ محەمەد کورێ عەبدولموجیبێ بامەردنی) دئینیت کو خەلکێ ڤی گوندی یە)).

ل داویا سەروەختێ عەباسیا ئاڤڕی ب بامەڕنێ دهێنە دان، کو چالاکیێن رۆشەنبیری یێن بەرچاڤ لێ دهاتنە کرن، بەحسێ (مەلا ئەحمەدێ بامەڕنی) دهێنە کرن، کو بابێ وی قازیێ ئامێدیێ بوو[2].

نڤێسەرێن دی وەك (عبدالماجود ئەحمەد ئەلسەلمان و جەلالئەدین عەبدولرەحمان ئەلسیوتی و ئەحمەد ئەلصافی) ئاڤڕیێ ب گوندێ بامەڕنێ کریە، ئەحمەد ئەلصافی دبێژیت: ناڤێ بامەردەنێ یێ هاتییە وەرگێران و بوویە (دوبەردان).

ئەلئەزدی ل سەر بوویەرێن سالا (٢٠٧مـش) دپەیڤیت و دبێژیت: بامەردەن، ئاشەك لێ هەبوو ل سەر ئاڤا ژ کانیێن گوندی دەردکەڤیت کار دکر، پێڤە دچیت و دبێژیت سالا هەنێ گەلەك ئەرزانی بوو، زەلامەك ژ گوندێن (مەرجێ) هاتە بامەردەنێ دا هەڤرانێ خۆ ل ئاشی بکەت، لێ هندی بۆشاتی بوو ل سەر ئاشی زڤری مالا خوە.

هێژا حوسەین بامەڕنی د چاڤپێکەڤتنەکێ دا ل هژمارا (٨) یا گوڤارا دهۆك دبێژیت:

((ب هزرا من دكەڤن دا كوردێن (فەلە) ل بامەڕنێ هەبوون، ناڤێ وێ ژ (بیث مەردن) ئانكو مالا مەردان هاتییە)).

هەروەسا هاتییە گۆتن كو ناڤێ (بامەڕنێ) دبیت ژ بابێ مرنێ هاتبیت و پتر رای تێ دچیت ئەڤ بابە نە با و باروڤە بیت، بەلكی وەبایەك یان نەساخییەك بیت، چونكە ئەڤ رەنگە نەساخیێن گران گەلەك جاران ب سەر دەڤەرێ دا هاتینە و گوند وباژێر قركرینە. گرۆڤێ مە ژی بۆ ڤێ گوتنێ (گوندكێ سمایلی و گوندكێ زیارەتا)یە، ئەوێن دكەڤنە ژێریا بامەڕنێ، ئەڤ هەردو گوندە ب وەبایەكێ وێران ببوون. خەلكێ چ ژ ڤان نەساخیا نەدزانی و چ دەرمان د دەستدا نەبوون كو بەرەڤانیی ژ خۆە بكەن، مینا وەبا سالێن (١٦٢٥، ١٦٤٣، ١٦٥٠، ١٦٧٣، ١٧٠٢ ز) ب سەر دەڤەرێ دا گرتی و بوویە مێهڤانەكێ هەستی گران. دیسان ل سالێن (١٦٧٣، ١٦٧٦، ١٦٨٨ز) كولی ژی ب سەر دەڤەرێدا گرت، تەر و هشك داعیران، ئەڤە ژی ببوو ئەگەرا مرنەكا مەزن[٣].

## پێكهاتا بنەمالێن بامەڕنێ:

خەلكێ جهوارێن سەنتەرێ ناحیا بامەڕنێ هەمی ل سەر دینێ ئیسلامێ نە و پرانییا وان ژ بنەمالێن ژێری پێكدهێن:

١- مالا محێ: كەڤنترین بنەمالە ل بامەڕنێ جهواربووین.

٢- مالێن مەلا ژ كێستە هاتینە بامەڕنێ.

٣- مالا جونەیدی: ژ گوندێ شێخ هەسنا هاتە گوندێ زێوا شێخ پیراموسی پاشی هاتنە بامەڕنێ.

٤- مالا مەلا حسێن: دگەهنە بنەمالا زانایێ دینی (مەلا یەحیا مزوری) ژ ئامێدیێ هاتنە بامەڕنێ.

بامەڕنێ



٥- مالا ئەیوبی: ژ گوندێ شێخ هەسنا ژ هوزا مزووریا هاتنە گوندێ زێوا شێخ پیرامووسی پاشی هاتنە بامەڕنێ.

٦- مالا زالێ: ژ (مێرۆزێ) هاتە (ئەرەدنا ژووری) پشتی چەند سالا هاتنە (بامەڕنێ)، عبدولئەزیز ژ (ئەرەدنا) چوو گوندێ (كانیكا) و ژوێرێ هاتە (بامەڕنێ) لەوا دبێژنێ (عەزو كانیكی).

٧- مالا سەفاری: ژ (مێرۆزێ) هاتە ئامێدیێ پشتی چەند سالا (حەسەن) ژ ڤێ بنەمالێ ژ ئامێدیێ هاتە بامەڕنێ.

٨- كوڕانی: ژ (كوڕانێ) هاتینە (بامەڕنێ)، لەوا دبێژنێ (كوڕانی) دەڤەرا كانی گیسكێ ئاڤاكر بوو، پاشی هاتنە بامەڕنێ تاخێ گوندی.

٩- بەنانی: ژ گوندێ (بەنانێ) هاتینە (بامەڕنێ).

١٠- مالێن جانا.

١١- تاجرێ شەمامێ: ژ گوندێ (كركەرێ) سەر ب هوزا ڕێكانییاڤە هاتە بامەڕنێ.

١٢- مالێن توڤیا: ئەڤ بنەمالە دگەهتە هوزا (ئالان) ژ گوندێ (توڤێ) هاتە بامەڕنێ.

١٣- مالا رەجوی: ژ گوندێ (سرورێ) مشەخت بووینە گوندێ (ئۆرە) پشتی دەمەكی هاتینە بامەڕنێ.

زندەباری گەلەك بنەمالێن دی ل بامەڕنێ هەنە، بەلێ ژبەر كورتیا بابەتی نەشێین هەمی بنەمالان بنڤێسین، چونكە بابەت داخوازا هندەك تەوەرێن دی دكەت ل سەر پێزانینێن بامەڕنێ دبیاڤێن جودا جودا دا[٤].

بەری خواندنگەهێن میری ل بامەڕنێ بێنە ڤەكرن، دو خواندنگەهێن ئایینی لێ هەبوون، ئێك ژ وانا (محەمەد سەعیدێ بامەرنی) ئەوێ ل سالا (١٣٣٦مش/١٩١٧ز)ێ مری، گەلەك خویندكار ل سەر دەستێ وی دەركەڤتینە، ژ زانایێن وێ (حوسنی كورێ مەلا ئەحمەدێ بامەرنی ١٢٨٤-١٣٥٦مش/

دیمەنەك ژ گوندێ بامەڕنێ ١٩٥٥



١٨٦٨-١٩٤٠ز)ێ، کو شاعرەکێ ناڤدار بوو. (مەلا عەبدورەحمان کورێ مەلا ئەحمەدێ بابکێ بامەرنی) ئەوێ ل سالا (١٣٤٨مش/١٩٣٢ز)ێ مری، کو ئەدیب و شاعرەکێ ژێهاتی بوو، ب زمانێ عەرەبی و فارسی شعر د نڤیسین، (مەلا نەجمەدین کورێ ئەحمەدی) ئەوێ ل سالا (١٣٦٩مش/ ١٩٤٩ز)ێ مری، کو دەرس ل تەکیا نەقشبەندی دگۆتن، خەلکی گەلەك قەستا وی دکر. مەلا محەمەد شەریف بەگێ بامەرنی کو ژ مالباتا دەستەلاتدارا میرێن ئامێدیێ بوو، زانایەکێ مەزن بوو، شەهرەزاییەکا باش د فقە و زانینێن عەرەبی دا هەبوو، دیسان (مەلا عبدالله ئەتریشی ١٣٣٨مـــش/١٩١٩ز مریە) کو دبیتە نەڤیێ (مەلا یەحیایێ مزیری) ل بامەرنێ خواندبیە[٥].

خواندنگەها نوو ئانکو یا حکومەتێ ب رەنگەکێ فەرمی ل سالا (١٩٢٢)ێ ل بامەرنێ هاتەڤەکرن. بەلێ ڤێ سالێ حکومەتێ مامۆستا بەرهەڤ نەکرن. لەوا شێخ غیاسەدینێ نەقشەبەندی دو مامۆستا تەکلیفکرن کارێ فێرکرنێ ل خواندنگەهێ ل دووڤ پەیرەو و پرۆگرامێ پەروەردێ ب رێڤەببەن، هەمی پێدڤیێن کارێ وان دابینکرن، مووچێ سەیدای یێ هەیڤانە ژ دەڤ خۆ دمەزاخت. سەیدا حاج (محمد سەعید مەلا یاسین) دانا وەك رێڤەبەرێ خواندنگەهێ و سەیدا (عەبدولسەمەد حسێن) دگەل دا بوو. ژبەر هندێ دگوتە سەیدایێ حاجی محمد سەعید ((فێرکەرێ ئێکێ)).

سەخمەراتی هندێ کو خەلکێ بامەرنێ بەرێ زارۆکێن خۆ بدەنە خواندنگەهێ، چەند جارا شێخ غیاسەدینی خەلك کۆمدکرن، بهایێ فێربوونێ بۆ خۆیا دکر، هەمی ئاگەهدارکرن کو ئەو کەسێ کورێ خۆ رەوانەی خواندنگەهێ نەکەت دێ (٣٠ هەتا ٤٠) روپیا سزاکەم. ئەڤە ژی خالەکا گرنگ بوو نە وەك ترس بەلکو پالدانەك، خەمخۆرییەك ژ بۆ پتر پویتە پێکرنێ. ئاڤاهیێ خواندنگەهێ ژ کەپرەکێ پێکدهات، ژ دار و تەختێن چولی ل (پشتا سەروکانیێ) چێکر. ل بن سیبەرا وێ کەپرێ دەست ب خواندنێ هاتەکرن، هەتا وەرزێ پایزێ گەهشتی و بارانا دەست پێکری، وی دەمی خۆێندکار بۆ جهەکێ دی دبێژنێ (قەسرا عوبەیدولا) هاتنە ڤەگۆهاستن.

## فێرگەهێن دینی ل بامەرنێ:

تەکیا بامەرنێ: پشتی شێخ تاهرێ نەقشەبەندی ل سالا (١٢٥٨مـــش/١٨٤٢ز) ل مووسلێ چوویە بەر دلوڤانییا خۆدێ، کورێ وێ (شێخ محەمەدێ نەقشەبەندی) و برایێ وی (مەلا حەیدەر) و زانا (مەلا ئەحمەدێ مەلا ئوسمانی) و کەس و کارێن وان پێکڤە ب ئێکجاری ژ ئامێدیێ هاتنە بامەرنێ، لێ جهواربوون، ل (مزگەفتا مومنا) نیشادانا رێبازا نەقشەبەندی کر و دەمێ چەند سالان دا ئاستێ خواندنێن ئاینی ل مزگەفتا ناڤبری بلندبوو و گەهشتە گوبیتکێ[٦].

ل سالا (١٢٦٣مش/١٨٤٦ز)ێ شێخ محەمەد تاهری ب هاریکاریا خەلکێ بامەرنێ تەکیا نەقشەبەندی ئاڤاکر، ل دو تەوەرا دەست ب کارێ فێرکرنێ کر. یا ئێکێ تەوەرێ خواندنێن دینی ل دووڤ پەیرەو و پروگرامێن خواندنێن ئیسلامی یێن وی دەمی. تەوەرێ دوێ، نیشادانا رێبازا نەقشەبەندی بوو. ل دەستپێکا سەدسالیا بیستێ و هێرڤە بامەرنێ ببوو مەلبەندێ دینی و رەوشەنبیری و سیاسی ل دەڤەرا بەهدینان، (شێخ بهائەدینێ نەقشەبەندی و کورێ وی شێخ غیاسەدینی) رۆلەکێ گرنگ دبیاڤێ هەنێ دا گێرایە[٧].

## تاخێن بامەرنێ:

بامەرنێ ژ ڤان تاخان پێکدهێنن: گوندی، گەلی، بازاری، شیڤا هرچا، نەڤروز، ئازادی، مەتین، هەرچوارێن بەرێ تاخێن کەڤنێن گوندینە و سێ یێن داویێ ژی پشتی (١٩٧٠)ێ ئاڤابووینە.

## شوینوارێن بامەرنێ:

### ١- ناوسك:

ئەڤ ناوسکە دکەڤیتە رۆژئاڤایێ بامەرنێ، ئەو ب خۆ بەرەکێ مەزنە ب دەست هاتییە کۆلان و نکراندن، دیسا جهێ پێنج تەختا دناڤ دا هاتییەکۆلان و

ئامادەكرن زێدەباری جهێ سەری ئانكو بالیفك، دیسا جهێ روینشتنا دو زێرەڤانا ل دەرێ ناوسكێ و هەر ل سەر بەرێ ناوسكێ یێ كۆلای و ئامادەكریە[٨].

**٢- شكەفتا جەمالا:**

شكەفتەكا مەزنە دكەڤیتە ژووریێ بامەرنێ ل بەتەنا چیایێ مەتینا ل هنداڤی تاخێ گەلی، دیارە ئەڤ شكەفتە ژی جهێ ژیانا كەسان بوو ل سەردەمێ چەرخێن كەڤن، یێ مرۆڤ جهێ ئاسێ و تێر ئاڤ و داروبار ڤە دژیا[٩].

**٣- قەسرا كافری:**

دكەڤیتە ژووریێ بامەرنێ ل بەتەنا چیایێ مەتینا ل هنداڤی تاخێ گەلی، ئەڤ شوینوارە ل دەزگەهێ شوینوارا ل نەینەوا یێ توومار كریە، بەلێ چ ڤەكۆلین ل سەر نەهاتینە كرن.

هەژی گوتنێ یە كو ل سالا (١٩٧١)ێ ئەندازیار (ئوسمان ئیبراهیم خالد بامەرنی) وەغەرەك برە ئەمریكا، ویرتەكا گێجێ ژ دیوارێ قەسرا هەنێ ل گەل خو بر، ل روژا (١٩٧١/٧/٢)ێ گەهاندە پروفیسور (روبرت فولك) ل زانكویا تكساسێ، پشتی زانای ئەو پرتا گێجێ بشافتی (تحلیل) گۆت: ((ژیێ ڤێ گێچێ شەش هزار سالن و ئەڤە ژ چێكرنا خۆرستی و مرۆڤایە)).

**٤- دێرا چفێ:**

ئەڤ دێرە دكەڤیتە ژووریێ بامەرنێ ل تەنشتا چیایێ مەتینا ل هنداڤی تاخێ (شیڤا هرچا) كانیەكا ئاڤێ ل ڤێ دەڤەرێ هەیە دبێژنێ (گەرا چغێ).

هەژیە بێژین ل سالا (١٩٣٠)ێ چەند كەسا ژ خەلكێ بامەرنێ (پەیكەرەك) ژ زیندانێ كو دكەڤیتە سنوورێ دێرێ، ئینا دەرێ و ب وەریسا كێشایە گوندی و ل پشتا تەكیایێ شكاند و هەر پرتەك هاڤێتنە لایەكی، چونكە بهایێ دیرۆكی یێ ڤێ پەیكەری نەدزانی.

بامەرنێ



**٥- جوخوینکێ:**

ئەڤە زەڤینە دکەڤنە رۆژئاڤایێ بامەرنێ ل دوماهییا کولانا تەوکا، سالا (١٩٨٦)ێ ئەڤ جهە ئامادە کریوو دابییتە (پشکێن ناڤخۆ) بۆ خۆیندکارێن ئامادەیا بامەرنێ. دەمێ شەفەرێ دەڤێ خۆ ل ئەردی دای چەند ئینتیکە بەرچاڤ بوون، وەك: جەرکێن ئاڤێ.

**٦- شکەفتا عەیش و ناڤا:**

دکەڤیتە رۆژئاڤایێ بامەرنێ نێزیکی گەرا هەسن. ل دووڤ ئاخڤتنێن خەلکی هندەك کەسان ئەڤ شکەفتە کۆلایە، کلۆخێ سەرێ مرۆڤەکی و هندەك هەستی و زنجیرەك ئینانەدەر[١٠].

**٧- کورێن خانیا:**

کورێن خانیا جهەکێ شوینواری یە دکەڤیتە سەرێ چیایێ مەتینی تایبەتی هنداڤی سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، ژ هژمارەکا مەزن ژ بەرمایك و شوینوارێن خانیێن کەڤن پێکدهێن. دبیتە بەلگەکا دیرۆکی کو دسەردەمەکی دا ژیانا مرۆڤان ل ڤی جهی هەبوویە ئەوا دبێژنێ کورێن خانیا[١١]. دیەرتووکا (دهوك بعد ١١ من آذار ١٩٧٠) ئاڤری ب کورێن خانیا کریە، ئەو ژی وەکی هاڤینگەهەك بۆ میرێن میرگەها بەهدینان دهاتە بکارئینان.

## گوندێن سەر ب ناحیا بامەرنێ:

### گوندێ ئەرەدنا فەلا:

گوندێ ئەرەدنا ب دووراتییا (٥کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ بامەرنێ، ژووریێ گوندی دبیتە گوندێ ئەرەدنا موسلمانا، رۆژهەلاتی ڤە ئینشکێ یە، ژێریڤە دبیتە سەنتەرێ ناحیا سەرسنگێ. ل سەر رامانا ناڤێ گوندێ ئەرەدنا: بتنێ ئێك بۆچوون هەیە ئەو ژی هاتییە ژ بچویکرنا ناڤێ (ئەردێ ئەدەن) رامانا وێ ئەردێ بهەشتێ. بێ گومان ژبەر جوانییا خۆرستێ گوندی لەورا بڤی ناڤی هاتییەناڤکرن[١٢].

د کتێبا (المعجم التاریخی لامارة بهدینان) هوسا سالۆخا ئەرەدنا دکەت: ئەرەدنا گوندەکێ کەڤنە دکەڤیتە سەر چیایێ مەتینی، ل هنداڤی دەشت و مێرگێن سپنەی، ل سەر رێکا سەرێشك دناڤبەرا ئامێدیێ و زاخۆ دا، دارێن گویز و هژیر و خۆخ ل رەخۆدۆرێن وێ هەنە[١٣]، سولتان حسێنێ وەلی (٩٤٠-٩٨١مش/ ١٥٣٣-١٥٧٣ز) خانەك بۆ بازرگانا لێ ئاڤاکر، بەلێ ئەو خانە ژ کەڤن وەرە نەمایە[١٤]. حەفت قرویش و چارێکەك ل سەر وی گوندی هاتبوونە سەپاندن، دا ببنە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان، دو کەنیسێن دیرۆکی لێ هەنە، گەلەك قەشە و رەملدار و رەبەن ژێ دەرکەڤتینە، ئەرەدنا دناڤبەرا سالێن (١٩١٠-١٩٤٧ز)ێ وەکی ناڤەندا ئەبرەشیا ئامێدیێ هاتبوو هەلبژارتن، خەلکێ وێ نێزیکی (٦٥٠) کەسا بوون، دو پەرستڤان (کاهن) هەبوون. گەرۆکێ فرەنسی (بندیە) ل سالا (١٨٨٥ز)ێ سەرەدانا ڤی گوندی کریە، سالۆخا وێ دکەت و دبێژیت: گوندەکێ بچویکە، نێزیکی سیهـ مالا لێ هەنە، ژنکێن وان د دەستودانەکێ باش دانە، زەلامێن وان دباشن، دچنە سەر شۆلی، کێم جارا ژ گوندی دچن، هەتا نها گەلەك ژ وانا ئامێدیێ نەدیتیە[١٥].

ل سالا خواندنێ (١٩٤٥-١٩٤٦)ێ بۆ یەکەمین جار خواندنگەها سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، موسلمانان و مەسیحیان مفا ژ ڤێ خواندنگەهێ وەرگرتیە، ب ڤێ چەندێ ژی خواندنگەها ئەرەدنا یەك ژ خواندنگەهێن هەرە کەڤنێن سنوورێ قەزا ئامێدیێ یە، پشتی دەسپێکرنا شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ ب دەمەکی ئەڤ خواندنگەهە هاتییەگرتن، بەلێ پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ب فەرمانەکا رێڤەبەرییا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ هژمار ٦٨٠٤/٥٠ ل رۆژا ١٩٧٠/١٠/١١ ئەڤ خواندنگەهە سەر ژ نوو هاتییەڤەکرن[١٦].

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ جهوارێن گوندی ئەرەدنا خارێ هەمی فەلەنە، هژمارا وان دگەهنە دەوروبەرێن (٥٤) مالباتان، نێزیکی (٢٠٠ هەتا ٢٥٠) کەسان لێ دژین. گوند ژ

ڤان ئویجاخان پێكدهێن.

١- تیاری: دكەڤن دا ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە.

٢- بازێ: دكەڤن دا ژ بازێ ل باكوورێ كوردستانێ هاتینە.

٣- شواد: دكەڤن دا ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە.

موختارێن گوندی: هەر ژ سالێن سیهاندا و هەتا نها ئەڤان كەسان ئێك لدویف یێ دی موختاری ل گوندێ ئەرەدنا فەلا كریە: جەجو هرمز یوخنا سالێن سیهان، پشتی وی رەئیس هرمز گورگیس، رەئیس پەتو ئیشو، شەمعون، دنخا، توما هرمز یوسف، ئەڤێ داویێ هەتا نها ل سەر كارێ خۆیێ موختاریێ یێ بەردەوامە.

### شوینوارێن گوندی:

١ - دو دێرێن كەڤن ل گوندی هەنە ئەو ژی دێرا سولتان ماهدوخت سالا (٣١٩)ز)ی هاتییەئاڤاكرن دكەڤیتە رەخێ ژێریێ گوندی، دێرا مار شەمعونی ژیێ وێ دگەهیتە (١٧٥٠) سالان، دكەڤیتە ژووریێ گوندی[١٧].

٢ -خانەك ل رۆژئاڤایێ گوندی هەیە كو سولتان حسێنێ وەلی ئاڤاكر بوو.

٣ - گرەك هەیە ل رۆژئاڤایێ گوندی دهێنە نیاسین ب (گرێ مەقدو) ژ بچویكرنا ناڤێ ئسكەندەرێ مەقدۆنی هاتییە. دبیتن ئەسكەندەر مەقدۆنی یان لەشكەرێ وی ل سەر وی گری راوەستیا بن[١٨].

٤ - شیڤا رومانی: دكەڤیتە ژێریا گوندی، دیسان شوینوارێن پێنج ئاشێن ئاڤێ ل ناڤەند و دەوروبەرێن گوندی ماینە.

٥- ژ شوینوارێن دی یێن گرنگ ل ڤی گوندی، (بورجا بەیرەمێ) كو خالەكا وەرگرتنا خویك و خەراجا بوو ل ئەرەدنا[١٩].

دەرامەتێن چاندنێ: ئەوا گرێدای دەرامەتێن چاندنێ ل گوندی وەك تری و هژیر و هنار و سێڤ هەنە، ل سەر كانیێن گوندی دهێنە ئاڤدان: وەك كانیا بێ شولا، كانیا خواری، كانیا دەحلێ، كانیا شتلا[٢٠].

## گوندێ ئەرەدنا موسلمانا:

گوندێ ئەرەدنا موسلمانا ب دووراتییا دەوروبەرێن (٦كم) دكەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، خەلكێ گوندی هەمی موسلمانن ژ دو عەشیرەتێن سەریشك (مزووری وبەرواری) پێكدهێن، مزووری ژ چوار ئویجاخا پێكدهێن، هەر چار ئویجاخ ژ ئێك رڤشتنە و ئێك بابكن و ژ دویندەها (خەتابی) نە. وەكی هاتییە زانین كو خەتاب ژ ناڤ مزووری ژووریا گوندێ مێرۆزێ هاتییە. خەتابی چوار كور هەبوون، نها چوار ئویجاخێن مزووریا ل ئەرەدنا هەنە، هەر ئویجاخەك دویندەها كورەكێ خەتابی نە، ئەو ژی: (ئویجاخا مەلاكی، ئویجاخا سلێمانی، ئویجاخا زالێ، ئویجاخا ئەحمەدێ رەحیمایێ).

تایێ دووێ، ئویجاخێن بەرواریا: ژ ناڤ بەرواری ژووری هاتینە ئەرەدنا، دبێژن ئەو بێتكاری نە، ئویجاخێن بەرواریا ناگەهنە ئێك بابك و نە ئێك رڤێشتن. بەلێ دو ئویجاخێن بەرواریا دگەهنە ئێك، ئەو ژی ئویجاخا (بیبوی-حەجی). بەرواری ژ پێنج ئویجاخا پێك دهێن.

١- ئویجاخا بارانی: ژ بێتكارێ مشەختبووینە دەشتا گرێ سور ل رۆژهەلاتێ كەلا قومریێ و پاشی هاتینە ئەرەدنا.

٢- ئویجاخا سەینێ، مام سەینێ: ژ بێتكارێ هاتینە، ل ئەرەدنا جهواربووینە. پشتی خرابكرنا ئەرەدنا، ل سەرسنكێ و قەدشێ و دهۆكێ جهوار بووینە.

٣- ئویجاخا بیبێ: ژ بێتكارێ هاتینە ل ئەرەدنا جهواربووینە، پشكەك ژ وان ل (كانیكا هاجەرێ) ژیاینە و پشتی هەردو گوند خرابكرین، ل قەدشێ و سەرسنكێ و دهۆكێ جهواربووینە.

٤- ئویجاخا حەجی (قەپلانا) ئویجاخا حەجی و بیبێ دگەهنە ئێك و ژ گوندێ بێتكارێ هاتینە.

٥- ئویجاخا مەحمەد صالحی: ژ گوندێ بێتكار هاتینە ل ئەرەدنا جهواربووینە.

٦- مالا دەرویش: ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە ل ئەرەدنا جهوار بووینە.

٧- ئویجاخا باپیرێ: ژ گوندێ پرێسە ل ناڤ زێباریا هاتینە ل ئەرەدنا جهواربووینە[٢١].

**رامانا ناڤێ ئەرەدنا:**

گومان تێدا نینە کو ناڤێ هەردو ئەرەدنا ئێکن، وەکی هاتیە زانین ب زمانێ ئارامی رامانا ناڤێ ئەرەدنا (جنە عدن)ە.

**سنوورێن جوگرافیێن ئەرەدنا:**

گوندێ ئەرەدنا موسلمانا هەتا سالا (٢٠٠٠)ێ سەرب ناحیا سەرسنکێ ڤەبوو، پشتی سالا ناڤبری ژلایێ کارکێریڤە ئەرەدنا بوویە ئێك ژ گوندێن سەرب ناحیا بامەرنێ ڤە، نێزیکی (٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیا ناڤهاتی یا دوورە[٢٢].

**سنوورێن گوندی:**

ژووریێ گوندی دبیتە زنجیرا چیایێ مەتینی، ژلایێ ژێری ئەرەدنا فەلایە، ژلایێ رۆژئاڤای تخوبێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ یە، ژلایێ رۆژهەلاتی هاڤینگەها ئینشکێ یە بۆ کەڤرێ بەرەبەنێ و شکەفتا کوترا.

**شوینوارێن گوندی:**

سنوورێن ڤی گوندی ب شوینوار و بەرماییێن شوینواری زەنگینە، ژوانا:

١- ناوسکا عەرەبی: ژ گوندی پێدا ل ژێریێ و دبەرەکێ مەزن دا هاتیە کۆلان و پتر (٢م) یا ژ ئەردی بلندە، دەرێ وێ دکەڤیتە رۆژئاڤای، بەرامبەر ناوسکا عەرەبی شەش ناوسکێن دی هەنە دئێك بەردا هاتیە کۆلان.

٢- شکەفتا قەلایێ: ئانکو شکەفتا کەلا ب دووراتییا ١٥٠م د کەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی[٢٣].

٣- دەوروبەرێن گوندی هندەك شوینوارێن دی هەنە، وەك: برکا پاشای و چەپەرێ پاشای، شوینوارێن گاڤلە خانی.

٤- دێرە سورێ: سێ کیلومەترا ژ رۆژهەلاتێ ئەرەدنا دوورە، دبیت جهێ دێر لێ هاتییە ئاڤاکرن رەنگێ سۆر بوویە. ئانکو ژبەرکو دیوارێن دێرێ ژدەرڤە و ژناڤ دا ب ئاخا سور هاتییە هنین، ژبەر ڤێ چەندێ ب دێرا سور هاتییە ناڤکرن[٢٤].

## گوندێ بابیرێ:

ئەوا گرێدای رامان وشرۆڤەکرنا ناڤێ گوندێ بابیرێ ئەو ژی هاتییە ژ سڤککرنا پەیڤا (بەربایە) ژبەرکو جهێ جوگرافیێ گوندی بایەکێ بهێز و خۆش و هوین لێدەتن، ژبەر ڤێ چەندێ ب بەربایێ هاتییە نیاسین، بەلێ ببۆرینا دەمێن درێژ ناڤ ل سەر ئەزمانێ خەلکێ هاتییە سڤککرن ژ بەربایێ بۆ بابیرێ. ئەڤ بۆچوونە ژلایێ دانعەمر و ریهسپیێن گوندی هاتییەگوتن.

**پێکهاتا گوندی:**

جهوارێن گوندی ژ سیهـ مالان پێکدهێنن، دەوروبەرێن (٦٠ هەتا ٧٠) کەسانە، ل سەر چەندین بنەمالان دهێن پشککرن، ئەو ژی:

١- بنەمالا حوسەینی: بۆچوونێن ژێك جودا هەنە ل سەر بنیاتێ ڤێ بنەمالێ هەنە، ئەو ژی هندەك دبێژن ژ گوندێ (کاتولی) ل باکوورێ کوردستانێ هاتینە، یان ژی ژ بەروشکێ یان ل نزاری هاتینە گوندێ بابیرێ.

٢- بنەمالا شینو: بنیاتێ ڤێ بنەمالێ ژ گوندێ (چەمیکێ) یان ژ جەزیرا (بۆتان) هاتینە بابیرێ.

٣- بنەمالا کەلەشی: ژ سێ بابکان پێکدهێن، بنیاتێ بابکێ ئێکێ ژ (چەلێ) هاتینە گوندێ بابیرێ، بەلێ هەردو بابکێن دی بنیاتێ وان نەهاتینە دیارکرن، کا ژ کیڤە و کەنگی قەستا گوندێ بابیرێ کریە.

**مزگەفت:** مام جەباری گوتی (هندی بیرا من دهێنن مزگەفت ل گوندی هەبوویە) هەر مام جەبار

دبێژیت: ل دووڤ بیرهاتن و پێزانینێن من ڤان كەسلن ئێك ل دووڤ یێ دی: حەجی رەجەب، حەجی عبدالله كەلەش، مەسیحیا، سەدیق زبیر موختاری كریە. بەلێ نها گوند یێ بێ موختارە.

**خواندنگەهـ** پشتی بەیانا (١١ ئادارا ١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتە ئاڤاكرن.

## چاندنا گوندی:

گوندێ بابیرێ ئاقارەكێ بەرفرەهـ یێ هەی، ب گەلەك رەنگێن دەرامەتا بەرنیاسە نەخاسمە سێڤا، چەندین كانی ل ناڤەندا گوندی دا هەنە مینا: كانیێن سەرگویزا، كانییا زەلاما و كانییا ژنكا، كانییا تیرەژكێ، كانییا سنجێ، باهرا قاسما، كانییا سپی[٢٥].

## گوندێ پاصێ:

گوندێ پاصێ ب دووراتییا دەوروبەرێن (٢٥كم) دكەڤیتە رەخێ ژێریێ رۆژئاڤایێ بامەرنێ، سنوورێن جوگرافیێن گوندی: ژلایێ ژووری دبیتە گوندێ وەرمیلێ، ژێری گوندێ تەحلاڤایە، رۆژهەلاتێ گوندێ دیهێیە، رۆژئاڤای دبیتە هەردو گوندێن بارهۆلێ و غولدیا.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی موسلمانن، دگەهنە نێزیكی سیهـ مالباتان. ژ ڤان بنەمالان پێكدهێن:

١- مالا ئەحمەدی: ژدەڤەرا دۆسكی ژووری گوندێ شەتینس هاتینە.

٢- مالا ڤاچی (خازێ): ژ دەڤەرا دۆسكی ژووری ل گوندێ شەتینس هاتینە.

٣- مالا مەلا: ژدەڤەرا دۆسكی ژووری ل گوندێ شەتینس هاتینە.

٤- مالا هاجیا: ژدەڤەرا دۆسكی ژووری ل گوندێ شەتینس هاتینە.

**خواندنگەهـ** ل سالا (١٩٨٢)ێ ل گوندێ پاصێ هاتیەڤەكرن.

**مزگەفت** ل دووڤ گوتنا (سالح سلێمان زاهر) دبێژیت مزگەفتا گوندێ پاصێ دسالێن بیستاندا یان سیهان دا ژ سەدسالییا بیستێ زایینی هاتیە ئاڤاكرن.

## شوینوارێن گوندی:

گوندێ پاصێ ژی وەكی هەر گوندەكێ كوردستانێ خودان شوینوارێن كەڤنە. وەكی جهەك هەیە دبێژنێ (دەرازینكا شامێ)، هەروەسا جهەكێ دی هەیە بناڤێ (شەخكێن كنجرا) كو بەرمایكێن خانیێن كەڤن لێ دیارن.

## چاندنا گوندی:

جهێ جوگرافیێ گوندێ پاصێ دكەڤیتە ل سەر رووبارێ خابیری، دیسان كانیێن ئاڤێ ژی لێ هەنە، وەك: كانییا گەربەراسكێ و كانییا كاروانا و كانییا ئاقد و كانییا شاهی و كانییا عمر. ئەڤجا گومان تێدا نینە دێ گوندەكێ پری چاندن بیت ژ دەرامەتێن جودا جودا لێ هەبن، وەكی خوخ و مشمش و سێڤ و حلیك و هژیر و تری و سپیندار[٢٦].

## گوندێ بانكا:

بانكا سەرب ناحیا بامەرنێ ڤەیە ژ لایێ ژووریێ رۆژئاڤایڤە، خەلكێ گوندی هەمی موسلمانن، ل سالا (١٩٨٨)ێ ژلالیێ رژێما عێراقیڤە هاتییە تۆپبارنكرن و گوند هاتبوو بەردان، پشتی سەرهلدان ١٩٩١ێ سەرژنوو هاتییە ئاڤاكرن.

**جۆگرافیا گوندی**، گوندێ بانكا ل جهەكێ بلند و پان هاتییەئاڤاكرن، رووبەرەكێ ئەردیێ بەرفرەهـ بخوڤە دگریتن، سنوورێن گوندی: گوندێ زێوا شێخ پیراموسی دكەڤیتە رۆژهەلاتێ، هەردو گوندێن ئەرزێ و بابكۆریا دكەڤنە ژێری، گوندێ بێلیزانێ دكەڤیتە ژووری، لایێ رۆژئاڤای ژی گوندێ وەرمیلێ یە[٢٧].

## رامانا ناڤێ بانكا:

تنێ ئێك بۆچوون سەر رامانا ناڤێ گوندێ بانكا

هەیە، ئەو ژی بەروبیاڤێ گوندی ژ گەلەك بانیا پێك دهێتن، ئانكو جهێن بەرفرەهـ و پەحن، بۆ نموونە بانیا دوێ و بانیا سەریانكێ، ژبەر ڤێ چەندێ ب ناڤێ بانكا هاتییە ناڤكرن ئانكو گەلەك بانی لێ هەنە.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ جهوارێن گوندێ بانكا ژ ڤان بنەمالان پێكدهێن: بنەمالا حەمێ و بنەمالا داودی و بنەمالا پیرێ. ئەڤ هەرسێ بنەمالە برایێن ئێك بوون. هەروەسا بنەمالا عەلی بانكی و بنەمالا سێڤدینی و بنەمالا ئەیوازی و بنەمالا هادی، ئەڤ هەردوكێن دوماهیێ ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە گوندێ بانكا.

**خواندنگەها گوندی:** ل دەستپێكا سالێن حەفتیان دا ب رەنگەكێ فەرمی ل ناڤەندا گوندێ بانكا هاتییە ڤەكرن، هەر ژ پولا ئێكێ هەتا پولا شەشێ دەستپێكی هەبوو.

**مزگەفتا گوندی:** مزگەفتەكا مەزن ل سەر روبەرەكێ (٣٠٠ هەتا ٤٠٠ مترا) ل گوندی بانكا هەبوو، دیرۆكەكا كەڤن هەبوو، هەتا نها ژی بەرمایك و شوینوارێن مزگەفتێ ل سەر ئەردی پێش چاڤن.

## شوینوارێن گوندی:

١- ل سەرێ گوندی بانكا بەرمایكێن دوورگەهەكێ دیارن، بەرێن مەزن هاتییەئاڤاكرن، دبیت ئەو دوورگەهە جهێ زێرەڤان و نوبەداران بوویە، چونكە دبن دوورگەهێ دا شوینوارێن ئاڤاهییەكی دیاردكەن، وەك دیوارەكێ درێژ، دوور نینە ئەو ئاڤاهیێ كەسانەكێ دەستەلاتدار بیتن.

٢- قولێن مەدرەسێ، ژ هندەك كوركێن بەرفرەهـ ل سەر ئەردی هاتینەكولان پێكدهێن، ل دووڤ گوتنا سەید بەهجەت بانكی، خەلك ژهەمی دەڤەرێ بۆ خاندنێ دهاتنە بانكا، ئەڤجا وەسا دیارە ئەو كورك جهێ خاندنێ بووینە.

٣- هەروەسا ژ بەرمایكێن كەڤن ل گوندێ بانكا، دڤان سالێن داوییدا ژ نیشكەكێڤە هاتییە دیتن، دەمێ شەفەر مژویلی دروستكرنا رێكێ بوویە زێر كەڤتە بەر دەڤێ شەفەرێ، رەنگێ زێری یێ گروڤر بوو، رەنگێ وان یێ سور بوو، چونكە دبن ئاخێ دابوو ب چەندەها سالان، هەروەسان جەرك و كلوسك هاتنیە دیتن رەژی دناڤ جەركا دا بوو.

هەژیە بێژین هەر ژ سالێن سیهان دا و هەتا نها دانانا موختارێن گوندی ب كومبوون و رازیبوونا جڤاتا گوندی بوو.[28]

## گوندێ تنێ:

تنێ ب دووراتییا دەوروبەرێن (٢كم) دكەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، سنوورێن جوگرافیێن گوندێ تنێ بڤی رەنكینە، ژووری دبیتە گوندێ زێوا شێخ پیراموسی، ژێری گوندێ گولێ، رۆژهەلاتێ گوندێ شێخ مەما، رۆژئاڤای گوندێ شرتێ نە[29].

تنێ گوندەكێ كەڤنە، دگەل دەستپێكا هاتنا ئایینێ مەسیحی بۆ كوردستانێ فەلە لێ جهواربووینە، ل چەرخێ چوارێ مشەختی/دەهێ زایینی ئاڤری پێ هاتییەكرن، خەلكێ وێ نەستوری بوون، سەر ب ئەبرەشیا ئامێدیێ ڤە بوون، ل چەرخێ هەژدێ زایینی بوونە كاسولیك، خەلك ب دووڤ دێرا صیارێ و مارگورگیسی كەڤتن. سولتان حسێنێ وەلی حەفت قرویش و چارێكەك ل سەر سەپاندن، دا ببیتە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان. ل ناڤەراستا چەرخێ نوزدێ زایینی هژمارا كاسولیكا ببوونە (٣٠) مالبات، بی كەنیسە و بێ پەرستڤان (كاهن) بوون، بەلێ ل دەسپێكا چەرخێ بیستێ هژمارا وان بۆ (٣٠٠) كەس، دو رەملدار و دو كەنیسە هەبوون[30].

دو بۆچوون ل سەر ناڤێ (تنێ) هەنە.

١- **تنێ**: ل دووڤ شرۆڤەكرنا ناڤێ سریانی رامانا وێ دویكێلا ئاگرییە.

٢- **تنێ**: ژ پەیڤا (تین) یا عەرەبی هاتییە. چونكە دكەڤندا گەلەك دارێن هژیرا ئانكو (تین) ل گوندی هەبووینە، لەورا ب تین هاتییە نیاسین، ببوورینا دەم و سالێن درێژ ناڤێ تین ل سەر ئەزمانێ خەلكێ هاتییە سڤككرن ژ تین بوویە تن پاشی بوویە تنێ[31].

**پێكهاتا گوندی:**

گوندەكێ مەسیحینشینە، خەلكێ وی دگەهنە دەوروبەرێن سیهـ هەتا سیهـ و پێنج مالباتن، ژ ئەڤان ئویجاخێن: بێن گدو، شەمامێ، قاشا یان قەس، ئیشۆ و بابا گورا.

ژ قەشێن گوندێ تنێ، وەكی: یوحنا بازۆرا، ئسرائیل ئەلراهب، هرمز. ژ شەماسێن كەنیسا گوندێ: یاقو گورگیس، شەماس یەلدا، لویس یاقو، شلیمون، یوسف هاول.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٥٥)ێ بۆ گوندێ تنێ ب تەقنێ هاتبوو ئاڤاكرن، بزمانێ سریانی خواندن لێ دهاتەخواندن، برێڤەبەریا شەماسێ كەنیسێ (ئزریا یاقوی) بوو. ئانكو ئەڤێ داویێ دو شۆل دكرن ئەو ژی شەماسێ كەنیسێ بوو، د وی دەمی دا رێڤەبەریا گوندی ژی دكر.

**كانیێن گوندی:**

چەندین كانی ل گوندێ تنێ هەنە وەك: گرانا، سیلاڤا، عین مشخا، عین فقوانا، عین شاسا.

**شوینوارێن گوندی:**

شوینوارێن ئاڤاهیێ دێرا (رەبان ئسرائیل مار ئەوراها) ل سەر روویێ ئەردی دیار و پێش چاڤن، هەروەسا شوینوارێن كەنیسەكا كەڤن دیارن دكەڤیتە دەرازینكا گوندی، هەتا سالا (١٩٦٠)ێ ئەڤ كەنیسە یائاڤابوو[٣٢]. دسالا ناڤبری دا هاتە خرابكرن. گورێ (مار یوحنا المعمذانی) دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندێ تنێ[٣٣].

## گوندێ تەحلاڤا:

تەحلاڤا ب دووراتیا (٢٥كم) دكەڤیتە ژێریا رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەڕنێ.

**سنوورێن گوندی:**

ل ژووری گوندێ پاصێ، رۆژهەلاتی هەردو گوندێن هەمزا و دیهێ، رۆژئاڤای گوندێ دوكەرێ و ژێری هەردو گوندێن كورێمێ و بەروشكێ نە.

**رامانا ناڤێ تەحلاڤا:**

كانیەك ل گوندی هەیە ئاڤا وێ كانیێ یا تەحلە لەورا دبێژنێ (تەحلەئاڤا)، ل وەرزێ زڤستانێ یا گەرمە وهەلم ژێ دچیتن، ل وەرزێ هاڤینێ ئاڤا كانیێ یا تەزی یە و بۆ ڤەخوارنێ یا نەخۆشە.

**پێكهاتا گوندی:**

دویڤ گۆتنا نەصرەت تەحلاڤی دكەڤندا باپیرێ من دگەل دو برایێن خۆ ژ گوندێ پاصێ هاتنە تەحلاڤا، لێ جهواربوون، هەتا نها كور و نەڤیێن وانا ژیانا خۆ یا خۆرستی ل گوندێ تەحلاڤا دبورینن.

**شوینوارێن گوندی:**

دو گورستانێن كەڤنار ل گوندێ پاصێ هەنە دیرۆكا وان نەهاتیە زانین.

**كانیێن گوندێ پاصێ:**

كانیا باپیری، یا دویێ كانیا ژنكا ئاڤا وێ گەلەكا خۆشە، هەروەسا دو سیلاڤ ل گوندی هەنە، یا ئێكێ دبێژنێ سیلاڤا خەمریێ. یا دویێ سیلاڤا سیتوی[٣٤]. ئەڤە تەحلاڤایە نە پاسێ

## گوندێ داودیێ:

داودیێ ب دووراتیا نێزیكی پێنج كیلومەترا دكەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەڕنێ. لدوور رامانا ناڤێ گوندی دهێنەگۆتن كو: دكەڤندا حەفت برایێن مەسیحی ژ دەڤەرا جەزیرا بۆتان هاتنە باشووری كوردستانێ، ئێك ژ وان حەفت برایان دگۆتنێ (داوود) هاتە ڤی گوندی، لێ جهواربوو، ئەڤ گوندە ب ناڤێ وی هاتە ناڤكرن[٣٥].

**سنوورێن گوندی:**

ژووری گوندێ شرتێ، ژێری گوندێ زڤنكێ،

رۆژهەلاتی هەردو گوندێن تنێ و گولێ و رۆژئاڤای دبیتە گوندێ غلبیشێ نە.

داودیێ گوندەكێ كەڤنە كو بۆ هەیامێ ئاشووریا دزڤریت، دكەڤیتە رۆژئاڤایێ فرۆكەخانا بامەرنێ، دبیتە ئێك ژ ناڤەندێن عەشیرەتا دۆسكییا، سولتان حسێنێ وەلی حەفت قرویش و چارێكەك ل سەر سەپاند بوون، دا ببنە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان، دێرەكا ڤەشارتی لێ هەیە، دبێژنێ (دەق ریشیە)، زێدەباری دێرەكا دی كو دبێژنێ (مار داودو) كو دكەڤیتە دناڤبەرا داودیێ و هەسن پیركا دا، دیارە كو ناڤێ وێ ژ ناڤێ خۆدانێ گوندی هاتییە، كاسولیكیەت ل چەرخێ نوزدێ یێ گەهشتیە ڤی گوندی، ل سالا (١٨٤٢ز)ێ سیهـ مالبات ل سەر وێ رێبازێ بوون، بەلێ چ كەنیسە نەبوون، ل دەستپێكا سەدسالیا بیستێ هژمارا وان نێزیكی (٣٠٠) كەسا بوون، پەرستڤانەك و كەنیسەك هەبوون، ئەڤ گوندە رێكەكا بازرگانییا گرنگ بوو، كاروانێن مەزن پێدا دبۆرین، ژبلی جەلەبێن تەرش و كەوالا و ژبەر ڤێ چەندێ قەنتەرەكا كەڤن لێ هەبوو، هەتا سالا (١٩٠٠)ێ مابوو. والیێ مووسلێ محەمەد پاشا ئینجە بریقداری (١٢٥١-١٢٥٩مـــش/١٨٣٥-١٨٤٣ز)ێ دەستێ خۆ داناسەر[٣٦].

والیێ مووسلێ كەلایەكا بەرفرەهـ لێ ئاڤاكر، یا بەرئاقل ئەوە كو وەختێ وی هێرشێن لەشكەری دبرنە سەر میرگەها بەهدینا ئەوی ئەو كەلایە ئاڤاكر بیت، كو ل داویێ میرگەها بەهدینا ژ ناڤبر و میرێ وان (ئیسماعیل پاشا) هاتەگرتن. پاشی ئەڤ كەلایە ل سەر دەمێ ئۆسمانییا وەك عمبار مفا ژێ هاتە وەرگرتن، پاشی هاتە پشتگوهڤە هاڤێتن، پاشی ل سەر بەرماكێن وێ ڤشلێ خواندنگەها ئێكێ یا داودیێ سەرهەلدا[٣٧].

ل سالا (١٢٦٥مش)ێ داودیێ دبیتە ناڤەندا ناحیێ، ئێكسەر ب قەزا ئامێدیڤە دهێنە گرێدان، وی وەختی ژ (١٦٢) گوندا پێكدهێن[٣٨].

ل سالا (١٩٠٤)ێ ناڤێن چەند كەسەكا گەهشتینە مە كو خویك ژ خەلكی وەردگرت، ئەو ژی (محەمەد ئاغا زادە سەعدوللا ئاغا) كو وی دەمی مەئمۆرێ بەرواری ژێری و داوودیێ بوو، دیسان (سەعدولا ئاغا) كاتبێ مەئموریێ بوو[٣٩]. پاشی ل سالا (١٩٠٥)ێ ئەو كەسە هاتنە گوهرین، (سەلیم بەگ زادە حاجی ئەمین ئەفەندی) بۆ مەئمۆرێ داودیێ، (نعوم مەتی ئەفەندی) بۆ هاریكارێ وی، (صادق ئەفەندی) بۆ كاتبێ مەئموریێ[٤٠].

ل دووڤ سەرهژمێریێن سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ ڤی گوندی (٥٤٢) كەس بوون، ل سالا (١٩٦١)ێ هژمارا خانیێن وان (١٢٠) خانی بوون، هژمارا جهوارا نێزیكی (١٥٠) مالباتا بوون[٤١].

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی مەسیحینە، پێنجی هەتا شێست مالباتن، ژ ئویجاخێن: ئال شەكرێ، ئال ئیسحاق، ئال قاشە سەمو، ئال ئسرائیل، ئال هومێ، ئال قەرنسو پێكدهێن.

ل سالا (١٩٥٣)ێ خواندنگەها سەرتایی ل داودیێ ب رێڤەبەریا حەنا یوسف رەئیس هاتییەڤەكرن، گوندێن نێزیكی داودیێ دیهێ، پاصێ، حەسن پیركا، حەمزە، گولی، بارزانكێ، غلبیشی، شرتێ و تنێ بۆ خواندنێ دهاتنە داودیێ، پشتی دەسپێكرنا شۆرشا كوردستانێ ل ئەیلوولا (١٩٦١)ێ ب دەمەكی ئەڤ خواندنگەهە هاتییەگرتن، بەلێ پشتی پێكهاتنا (١١ ئادارا ١٩٧٠)ێ ب فەرمانەكا رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ هژمار ٦٨٠٤/٥٠ ل رۆژا ١٩٧٠/١٠/١١ ئەڤ خواندنگەهە سەر ژ نوو هاتییەڤەكرن[٤٢]، ل سالێن (١٩٥٩ و ١٩٦٠) خویندكارێن گوندێ داودیێ ل هەمی لیوا مووسلێ سەركەڤتیێن ئێكێ بوون.

## شوینوارێن گوندی

١- بەرمایكێن ئاڤاهیێ دێرەكا كەڤن ل گوندێ داودیێ دیارن، ئاڤاهیێ دێرێ ببەرێن بازێ هاتبوو ئاڤاكرن و ئەو بەر ژ چیایێ مەتینی ئینابوون، ئەو ژی دگۆتنێ بەرێن بازێ، ل سالێن ئەنفالان دێر هاتەخرابكرن.

٢- ل سەردەمێ ئۆسمانییا ڤشلەك دناڤ گوندی

دا هەبوو، بو بێهنڤەدانا كاروانێن بازرگانا دەمێ ژ باكوورێ كوردستانێ دهاتن و بەروڤاژی، دهاتە بكارئینان، ل سەر هەر كوژیەكێ قشلێ بورجەكا كڤانی هاتبوو ئاڤاكرن، وەك جهێ زێرەڤانان بوو. هەروەسا پێنجی هەتا شێست ژۆر دناڤ قشلێ دا هەبوون.

٣- پرا داودیێ: دكەڤیتە ژێریێ گوندی، دیرۆكا پرێ بۆ سەردەمێ ئۆسمانیا دزڤریتن.

٤- شوینوارێن ئاشەكێ ئاڤێ دناڤ گوندی دا دیارن[٤٣].

## گوندێ دوكەرێ:

دوكەرێ ب دووراتییا دەوروبەرێن (٢٧كم) دكەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ.

### سنوورێن گوندی:

ژووریێ گوندی دبیتە گوندێ بەروشكێ، ژێریڤە گوندێ پاصێ یە، رۆژهەلاتی گوندێ تەحلاڤایە، و رۆژئاڤایڤە گوندێ گوفكێیە.

خەلكێ جهواربوویێن گوندی هەمی ل سەر ئولێ موسلمانانە، بەلێ دسالێن چلاندا ژ سەدسالیا بیستێ مالباتا (مەلا تاهای) ژ گوندێ پاصێ هاتە وێرێ، لێ جهواربوون و هەتا نها ژی دویندەها وی لێ دژیتن.

خواندنگەهـ بدروستی نەهاتیە زانین كا كیش سالێ هاتییە ڤەكرن، بەلێ ل دووڤ پێزانینێن موختارێ گوندی (رەئووفی) دبێژیت: دسالێن حەفتیان دا ژ سەدسالیا بیستێ خواندنگەهـ ل گوندێ دوكەرێ هاتە ڤەكرن.

### رامانا ناڤێ دوكەرێ:

ناڤێ ڤی جهی ب(دو كەرێ) هاتییە ناڤكرن، چونكە هەر رەخەكێ گوندی رووبارەك دبەرا دچیتن، ژبەر ڤێ چەندێ ب دوكەرێ هاتییە نیاسین. ئەو ژی رەخەكێ گوندی رووبارێ خابیری یە ورەخێ د یێ گوندی رووبارێ سپنەیە، ژبەر ڤێ چەندێ ب دوكەرێ دهێنە نیاسین.

### كانیێن گوندی:

كانییەك ل گوندی بناڤێ (كانیيا قورکێ) هەیە دكەڤیتە سەرێ گوندی. ژ دەرامەتێن چاندنێ ل گوندی: سپیندار، خوخ، سیڤ، مژمژە[٤٤].

## گوندێ زێوا شێخ پیرامووسی:

زێوا شێخ پیرامووسی ب دووراتییا ٢ (كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ. رامانا ناڤێ گوندی: دبیتن ناڤێ زێوە ژ پەیڤا (زێو یسا) هاتییە، كو پەیڤەكا زمانێ سریانی یە، ئەوژی دو بۆچوون هەنە. یا ئێكێ زێوە ژ(زێ ویسە) هاتییە رامانا وی گوندەكێ (تژی ئاڤ). بۆچوونا دویێ زێوە ژ (پەیڤا زێو یسا) هاتییە، رامانا وێ تشتەك یان جهەكێ مەزن.

### سنوورێن گوندی:

ژلایێ ژووری ڤە هەردو گوندێن بانكا و ئەرزێ، رەخێ ژێری هەردو گوندێن تنێ و شرتێ، رۆژئاڤایڤە گوندێ هەسن پیركایە، رۆژهەلاتی وێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ یە.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی موسلمانن و ژ بنەمالێن: مالا عەزێ- ژ ناڤ مزووریا هاتینە گوندی، مالا عەبدولخالقا- ژ ناڤ رێكانیيا هاتینە گوندی، مالا زەبا- ژ زاخۆ هاتینە گوندی، مالا عەباسی- بنیاتێ وان عەرەبن، مالا ئادیا- ژ ناڤ بەرواریا (گوندێ بێتكارێ) هاتینە، مال مەلا، دیلیویی: ژ ئامێدیێ هاتینە گوندی، گراڤیا- ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە گوندی و كێلی پێكهاتینە.

### شوینوارێن گوندی

١- گۆرێ شێخ پیرامووسی دكەڤیتە سەنتەرێ گوندی، شێخێ ناڤبری دگەل شێخ ئیسلامێ هەكاری یێ هەڤدەم بوو.

٢- گوپیتكێن قەیسەری: دكەڤیتە سەرێ چیایێ مەتینی هنداڤی گوندێ زێوا شێخ پیرامووسی.

٣- گرێ میر: دکەڤیتە سەرێ چیایێ مەتینی هنداڤی گوندێ زێوا پیراموسی، ب دووراتییا ١٠٠م، بەرەکێ مەزن هەیە ب بەرێ خۆلاما دهێنە نیاسین.

٤- کاڤلێن خانیێن پاشای، دبیت بو پاشایێن ئامێدیێ بزڤریت، دکەڤیتە سەرێ چیایێ مەتینی هنداڤێ گوندی.

٥- ل سەر کێلیا گۆرەکی ناڤێ پاشایەکێ ئامێدیێ هاتیە نڤێسین (بەهرەم کورێ عەبدولعەزیز پاشای)، دکەڤیتە نێزیکی گۆرێ شێخ پیراموسی[٤٥]. دیارە کو پێزانینێن باش ل سەر ڤی میری نینن، بەلێ ئەو یێ ل گوندێ زێوا شێخ پیراموسی هاتیە ڤەشارتن، گۆرێ وی یێ دیارە و دیرۆکا مرنا وی ل سەر نڤیسیە، ئەو ژی ل هەیڤا زی قعدە سالا (١٢٢١مش/ ١٨٠٦ز)ێ. ئەڤ گۆرە دکەڤیتە نێزیکی دیوارەکێ کەڤن، کو (١٠م) یێ بلند و درێژە، بەلێ دیرۆکا ڤی دیواری ناهێنە زانین، دیارە بەری ئیسلامێ ئەڤ جهە هەبوو، خەلك سەرەدانا وان جها دکەت[٤٦]. کێلیا وی ژ بەرێ حەلانیە، ب نڤیسینا (ثلث) یا خشکۆك ل سەر نڤیسییە، کو ژ پێنج ڕێزا پێکدهێن، ئەو ژی (هذا قبر المرحوم المغفور لە عبدالعزیز بیك ابن المرحوم بهرم بیك توفی فی شهر ذی القعدة سنة ١٢٢١)[٤٧].

بۆ یەکەمین جار ل سالا (١٩٥٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، ڕێڤەبەرێ وێ کەسەکێ مەسیحیێ خەلکێ بەرتللە ب ناڤێ غانم بوو، ل سالا (١٩٦٣)ێ گوند هاتەچۆلکرن لەورا خواندنگەهـ ژی هاتە راوەستاندن. بەلێ پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ب فەرمانەکا ڕێڤەبەرییا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ هژمار ٦٨٠٤/٥٠ ل رۆژا ١٩٧٠/١٠/١١ ئەڤ خواندنگەهە سەر ژ نوو برێڤەبەریا: محمد حسێن رەشید بامەرنی هاتییەڤەکرن، هەتا سالا (١٩٨٨)ێ یا بەردەوام بوو، دەمێ ئەنفالان خواندنگەها گوندی جارەکا دی هاتە راوەستاندن، گوندی ژی هاتەچۆلکرن و توپبارانکرن ژلایێ رژێما بەعسڤە. پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ جارەکا دی خواندنگەهـ هاتەڤەکرن و هەتا نها یا بەردەوامە.

کەسەکێ خەلکێ ڤی گوندی بناڤێ ئەحمەد سامی خاکی ب زارۆکی دگەل بابێ خۆ چووینە مووسلێ و ب رۆژێ ل بەر خانەکا مەزن کارکریە و ب شەڤێ قورئان ژبەرکریە و فێری زانستان و زمانێن تورکی و فارسی بوییە، پاشتر چوویە بەغدا و گەهشتیە والی مەدحەت پاشایی و دگەل وی چوویە ستەنبۆلێ و هێدی هێدی پلەیێن مەزن وەرگرتینە هەتا بوویە یەك ژ پلەدارێن مەزنێن دەولەتا ئوسمانی.(صدیق الدملوجی، امارة بهدینان الکردیة او امارة العمادیة، اربیل، ١٩٩٩، ص٥٠)

**مزگەفت:** مێژوویا هەبوونا مزگەفتێ ل گوندێ زێوا شێخ پیراموس ب هاتنا شێخ پیراموسیڤە یا گرێدایە.

گوندێ زێوا شێخ پیراموسی وەکی هەر گوندەکێ دی ل دەڤەرا سپنەی ب دەرامەتێن خۆ یێ بەرنیاسە، مینا: تری و هنار و هژیر و سێڤ. ژکانیێن گوندی کو ئەڤ دەرامەتە پێ دهێنە ئاڤدان، کانیا مێرا و کانیا ژنا ل سەر ڤان هەردو کانیا وەك کڤانەك ببەرێن مەزن هاتینە ئاڤاکرن[٤٨].

## گوندێ شرتێ:

شرتێ ب دووراتییا نێزیکی (٦کم) دکەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ. راما ناڤێ گوندی ل دووڤ پێزانینێن موختارێ گوندی عەلی تێلی محەمەد کو وی ژی ژ باب و باپیرێن خۆ وەرگرتینە ناڤێ شرتێ ژ پەیڤا شەر هاتییە، چونکە گەلەك شەر ل جهێ ڤی گوندی ل سەردەمێ هاتنا لەشکەرێن موسلمانان بۆ دەڤەرێ هاتینەکرن، موسلمان شیان بشەری بستینن، هەتا نها ژی گەلەك گۆرستان ل گوندی هەنە بۆ وی سەردەمی دزڤرن[٤٩].

بۆ پتر دوپاتکرنا ئەڤێ بۆچوونێ هەتا نها دو گۆڕ ل ناڤ گۆڕستانا گوندی هەیە دبێژنێ (جوتکێ دو برا)، بۆ وی سەردەمی دزڤرن، هەروەسان دناڤ خەلکێ گوندی دا دیارۆکەك هەیە گرێدای وان دو گۆڕایە یێن

دبێژنێ جوتكێ دو برا، ئەو ژی دەمێ خوین ژ دفنا هەر مرۆڤەكێ بهێن، دێ ئەو مرۆڤ لەڤەنكی ئینیتن و دانتە بەر دفنا خۆ، كو خوین بچیتە ناڤ لەڤەنی دا، پاشی ئەو مرۆڤ دێ رابیت وی لەڤەنی بەتن و دانتە دناڤبەرا قەبرێن جوتكێ دو برا دا، هەر ئێكسەر خوینا وی دێ راوەستیتن ژ دفنا وی ناهێنە خارێ، لەورا دبیتن خۆدانێ ڤان هەردو گۆرا ئەوێن دبێژنێ جوتكێ برا بۆ سەروەختێ هاتنا لەشكەرێ موسلمانانان بۆ دەڤەرێ بزڤرن، هاتیە ڤەگێران خۆدانێن وان هەر دو قەبران دو كەسێن سالح بووینە.

## سنوورێن گوندی:

لایێ ژووری زنجیرا چیایێ مەتینی، ژێری گوندێ داودیێ، رۆژهەلاتی سەنتەرێ ناحیا بامەڕنێ و هەردو گوندێن هەسن پیركا و دیهێ دكەڤنە رۆژئاڤایێ گوندێ شرتێ.

## پێكهاتا گوندی:

ل دیڤ گۆتنا موختارێ گوندی هژمارا جهوارێن گوندێ شرتێ سەد و دەهـ هەتا سەد و دوازدە مالباتا پێكدهێن، هەمی موسلمانن، نێزیكی پێنچ سەد هەتا شەش سەد كەسان. ژ سێ بنەمالان پێكدهێن، ئەو ژی:

١ - بنەمالا تێلی بەگ: ژ جەزیرا بوتان ل كوردستانا ژووری هاتینە گوندێ شرتێ.

٢ - ئەحمەد خانێ: ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە گوندێ شرتێ.

٣ - عەلی بەگ: ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە گوندێ شرتێ.

خەلكێ گوندی و دەڤەرێ سەرهاتیەكێ ڤەدگێرن كو: سەردەمەكی دا سولتانێ ئۆسمانیا ل تركیا كەسەكێ ترك هنارتە ئامێدیێ دا بیتە میرێ ئامێدیێ، ئەوی كەسی بابێ وی مریوو، ئەڤجا دایكا وی چوو دەڤ سولتانێ ئۆسمانی، گۆتێ من ئەڤ كورە بتنێ یێ هەی حەز دكەم تۆ هندەكا دگەل فرێكەی، ئینا سولتانی ئەڤ هەرسێ بنەمالێن ناڤهاتی، دگەل وی كەسی فرێكرن دا ببیتە میرێ كەلا ئامێدیێ. ئەڤجا ئەڤ هەرسێ بنەمالە هاتن و جهێ خۆ دانا گوندێ نها دبێژنێ شرتێ. دا ژ میرێ ئامێدیێ دوورنەكەڤن و بۆ رێڤەبەریا و زێرڤانیا دەڤەرێ هاریكاریا وی بكەن.

غازی بەگ خەلكێ شرتێ بوو، عەلی تێلی دبێژیت: من ژی ژ كەسانێن دانعەمرێن بەری خۆ گوە لێ بوویە، كو دكەڤندا كەسەك هەبوویە بناڤێ (غازی بەگ) دەستێ راستێ یێ میرێ ئامێدیێ بوویە، مالا غازی بەگی ل گوندێ شرتێ بوو، ئەڤجا هەر سال میرێ ئامێدیێ سێ بارێن دەوارا دانە خەلكێ گوندێ شرتێ، ل سالەكێ میرێ ئامێدیێ باهرا خەلكێ گوندێ شرتێ نەدایێ، بێ گومان ئەڤ چەندە بو جهێ نەرازیبوونا خەلكێ شرتێ و غازی بەگێ، لەورا ئەڤێ داویێ بریاردا خەلكێ گوندی شرتێ كو دەمێ كاروانێن بازركانان ژ تركیا دهێن و دچنە دەڤ میرێ ئامێدیێ رێكێ لێ بكرن و بارێن دەوارێن وان ژێ وەربگرن. ئەڤجا كاروانەكێ بازرگانان ژ تركیا دا رێ و دەمێ گەهشتیە گوندێ داودیێ كو جهێ بێهنڤەدانا كاروانێن بازرگانان بوو. خانەك لێ هەبوو، هەر ئێكسەر غازی بەگی ل شرتێ گۆتە شەش زەلامان هەرن بارێن كاروانی بینن، هەر ئێكسەر شەش زەلام هنارتنە گوندێ داودیێ، ل كانیا قورێ شیان شەش بارێن دەواران ژ وی كاروانی بازرگانی وەربگرن، غازی بەگی بەرسڤەك دا میرێ ئامێدیێ و گۆتێ ئەڤە من باهرا گوندێ خۆ راكر. شوینا سێ بارا بدەیەمن ئەڤە من شەش بار برن. هندەك ل گوندی ب ناڤێ شوینوارێن غازی بەگێ هەنە:

١- جهەكێ بەرفرە دبێژنێ نزارێ یان زیرێ غازی بەگێ دكەڤیتە ناڤبەرا هەردو گوندێن غلبیشێ و هەمزا دا.

٢- گوڤێن غازی بەگێ: دسەردەمەكی دا خەلكێ گوندێ شرتێ ل هەمی رۆژان چێلێن خۆ ل جهەكێ دوور ژ گوندی دبرنە چەروانێ، دەمێ دبوو ئێڤار دا چێلێن خۆ ئینەڤە گوندی، ل هەمی رۆژان كارێ وان ئەڤە بوو، ئەڤجا ژ بۆ دا خەلكێ گوندی ژ خۆدانكرنا چێلا گەلەك زەحمەتێ نەبەن، غازی بەگێ گۆتە خەلكێ گوندێ شرتێ بۆ خۆ گوڤا

ئاڤاكەن ل وی جهێ هین چێلێن خۆ دچەرینن، خەلكێ گوندێ هندەك گۆڤ ل وی جهی ئاڤاكرن د نهالەكێ دا، هەتا نها ژی ئەو نەهال ب نهالا گۆڤا دهێنە نیاسین. دیسان دوی دەمی دا هەڤدە جۆتێن گای لێ شولدكر.

٣- پەساری یان ئەڤرازێ غازی بەگی، ل سەرێ ئەڤرازی چەپەرەك هەیە ب چەپەرێ غازی بەگی دهێنە نیاسین، هەتا نها ژی بەرێن مەزنێن وی چەپەری ل سەر ئەڤرازی دیار و پێشچاڤن. هەروەسان بەرامبەر چەپەرێ ناڤبری بەرەكێ مەزن هەیە دبێژنێ بەرێ پاشای.

### شوینوارێن گوندی

١- گورانكەهـ[٥٠]: جهێ دانوستاندن و كومبوونێن خەلكێ بوون، هەتا نها ژی شوینوار و بەرمایكێن گورانكەهێ دیارن وەك گەرێن دیوارا و جوهنی.

٢- شوینوارێن دو ئاشێن ئاڤێ ل گوندی دیارن.

### كانیێن گوندی:

كانیا سەروكانی، كانیا زەنكێ دكەڤنە سەرێ گوندی. كانیا قەشا دكەڤیتە بنێ گوندی و بڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن چونكە سەردەمەكی قەشە ل سەر كانیێ درینشتن. گوندێ ناڤبری ب گەلەك رەنگێن دەرامەتان یێ زەنگینە: تری و سێڤ و گەنم[٥١].

## گوندێ شێخ مەما:

شێخ مەما دكەڤیتە ژێریا سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، ئانكو بامەرنێ دكەڤیتە رەخێ ژۆریێ گوندی، دەشتا سەر سپنەی دكەڤیتە ژێریێ گوندی، ژلایێ رۆژهەلاتی دبیتە گوندێ كانیكا، رۆژئاڤایێ شێخ مەما دبیتە گوندێ گولێ. هژمارا خەلكێ گوندێ شێخ مەما دگەهنە دەوروبەرێن سیهـ و پێنج مالباتان، هەمی ل سەر ئایینێ ئیسلامێ نە.

رامانا ناڤێ شێخ مەما: گوندەكێ دی یێ هەی هەر بناڤێ گوندێ شێخ مەما دكەڤیتە سەر سنوورێ عیراقێ و تركیا، ئەڤجا هندەك مالبات ژ وی گوندی هاتنە جهەكی ل ژێریا سەنتەرێ بامەرنێ و لێ جهواربوون، هەر ناڤێ گوندێ خۆیێ كەڤن، ئانكو شێخ مەما دانا ل سەر وی جهێ لێ جهوار بووین، ئەوا نها دبێژنێ شێخ مەما.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ ل گوندێ شێخ مەما هاتییە ڤەكرن.

### كانیێن گوندی:

سێ كانی ل گوندی هەنە ئەو ژی: دكەڤن دا دگۆتنێ كانیا زەلاما، كانیا ژنكا، كانیا چەمێ یا هەردوكا بوو. گوندێ شێخ مەما ب دەرامەتێن چاندنێ یێ زەنگینە، وەك سێڤ، تری، دەخل و دان[٥٢].

## گوندێ كانی بەلاڤێ:

رامانا ناڤێ گوندی كانی بەلاڤێ بێ گومان پەیڤەكا كوردی یا رەسەنە، ژ دو گەها پێكدهێنن ئەو ژی: كانی و بەلاڤ رامانا وێ هەژمارەكا مەزنا كانیێن بەربەلاڤ دناڤ تخوبێ گوندی دا هەنە.

پێكهاتا گوندی: خەلكێ گوندی هەمی ژ ئولێ مەسیحیا پێكدهێن، هەژمارا وان دگەهنە نێزیكی ٥٠ كەسان، هەمی ژ ئێك بنەمالن و بنیاتێ وان ژ گوندێ (ئاشوتێ- ئاشیتێ) یێ باكوورێ كوردستانێ هاتینە گوندێ كانی بەلاڤێ.

دیرۆكا گوندی پاكەڤنە چ بەلگێن مێژوویی و ڤەكۆلینێن شوینواری بەردەست نینن ژ بوو دەستنیشانكرنا دیرۆكا گوندی، بەلێ هەر چاوابیت هژمارەكا مەزنا ژ ناوسكا و دوورگەهان دناڤ تخوبێ گوندی دا هەنە[٥٣].

## گوندێ كانیكا:

كانیكا ب دووراتیا نێزیكی (٣كم)، دكەڤیتە ژێریا سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ ژێریا گوندێ كانیكا دبیتە گوندێ بەریانكێ، رۆژهەلات دبیتە گوندێ سیلەهیارێ، شێخ مەما دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ كانیكا.

**رامانا ناڤێ گوندێ كانیكا:**

دو بۆچوون ل سەر بنیاتێ ناڤكرنا كانیكا هەنە

١- گەلەك كانیێن ئاڤێ لێ هەبوون لەورا دبێژنێ كانیكا، وەك كانیا هێرڤست دكەڤیتە ناڤبەرا بامەرنێ و كانیكا دا، دیسان كانیا گەرێ دكەڤیتە رەخێ رۆژئاڤایێ گوندی. دكەڤندا هندەك كانیێن دی هەبوون نها یێن هشك بووین، وەك كانیا كورا مێوێ و كانیا جوما ئیسڤی، كانیا ركاڤا بن كورا، دارا بلند، كانیا كورا مناسبی.

٢- پەیڤا كانیكا ژ دو گەها پێكدهێن، ئەو ژی (كانی و كا) ئانكو وەك پرسیار دهێنن كانیا ئاڤێ كانێ یە یان جهێ وێ ل كیڤەیە.

**پێكهاتا گوندی:**

گوندێ كانیكا ژ سێ بنەمالان بنەمالا رەشە و بنەمالا شەریفی (عمەرێ شەریفی) و بنەمالا عەبێ (محەمەدێ عەبێ) پێكدهێن، ئەڤ هەر سێ بنەماله دكەڤندا ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە جهێ نهایێ گوندێ كانیكا و لێ جهواربوینە، هەتا نها ژیانا خۆ لێ دبورینن. هژمارا خەلكێ گوندی دگەهنە نێزیكی حەفتێ و پێنج مالباتان.

خواندنگەه: دەستپێكا پێنجییان دا ژ سەدساليیا بیستێ ل گوندێ كانیكا هاتە ڤەكرن[٥٤].

**شكەفتێن گوندی:**

هندەك شكەفت ل گوندێ كانیكا هەنە، وەكی شكەفتا (خەندخەندوكێ و كورا بەر مناسبی) جهوارێن گوندی ژ بەر فرۆكا و چەكدارێن حكومەتێ مفا ژی وەردگرت و خۆ لێ د ڤەشارت[٥٥].

## گوندێ گەرەگوهێ

ل سەر ناڤێ ڤی گوندی دو بۆچوون هەنە:

یا ئێكێ: وەكی دیار گوندێ كەڤن دكەتە د جهەكێ چال و گرۆڤر مینا گەرا دا، لەورا گۆتینێ (گەرە گۆ)، پاشی ب بورینا دەمی بوویە (گەرەگوهێ).

یا دووێ: دبیت ناڤێ گوندی ژ ناڤێ گەرێن ئاڤێ هاتبیت. چونكی دەور و بەرێن گوندی گەلەك گەرێن ئاڤێ لێ هەنە و پری ئاڤ دبوون، ب تایبەت ل وەرزێن پری بەفر و باران. مینا گەرا مێرگا، گەرا كاسكا، گەرا فاتێ، گەرا مێرا و ... هتد.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ رێوانێ (دەڤەرا گولییا).

**باشووری:** هەردو گوندێن وەرمێلێ و كەلا شێخو.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بابیرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كوركا (دەڤەرا گولیيا).

**پێكهاتا جڤاكی:**

خەلكێ ڤی گوندی دبنیاتدا هەمی ئێك نفشن و ئەو ژی ژ چەند بنەمالان پێكدهێت، وەكی: بنەمالا مەلا، بنەمالا گوزەلێ، بنەمالا كەندالی، بنەمالا كوردێ. هەژمارا ئاكنجیێن خەلكێ گوندی دكەهنە دەوروبەرێن ٤٠٠ مروڤان.

**شوینوار و جهێن بەرنیاس ل گوندی:**

چەندین جهێن كەڤنار، ژ دویرگەهـ و گۆڕستان و ناوسك و ... هتد ل ڤی گوندی هەنە، وەكی:

**دویرگەهـ** دویرگەها چەما، دویرگەها بەرتەحتێ، دویرگەها ملێت قەشا، دویرگەها سەرێ خرابا، دویرگەها زەڤی سۆرا.

**گۆڕستان:** گۆڕستانا نزاری، گۆڕستانا كانیێ، گۆڕستانا خراڤێ، گۆڕستانا گوندێریكێ، گۆڕستانا سەرێ خرابا، گۆڕستانا پیر ئاڤدەلی، گۆڕستانا ملا ئاخ زەرێ.

شكەفت: شكەفتێن توبریيا، شكەفتا لاتێن هاجیا.

هەر وەسان ناوسكا كانی زێوكێ و گۆڕستانەكا جوییا ل نێزیكی ڤێ ناوسكێ هەیە. ژبلی مزگەفتەكا كەڤن لێ هەبوو كو دگۆتنێ مزگەفتا سۆر، ل سەر

ناڤێ ڤێ مزگەفتێ ژی دو بۆچوون هەنە:

**یا ئێكێ:** مزگەفت ب بەرەكێ سۆر هاتبوو ئاڤاكرن و دیوارێن وێ سۆر دیار دكرن.

**یا دووێ:** دبێژن ژبلی ئەنفالان، ئەڤ مزگەفتە سێ جاران هاتییە خرابكرن و جارەكێ ژ وان ل سەر دەستێ محەمەد پاشایێ رەواندزی (میرێ سۆرا) هاتییە خرابكرن و ناڤ ژ (سۆرا) وەكی زاراڤ هاتییە و دبێژن سێ شەهید دبندا هاتینە ڤەشارتن.

مزگەفت پشتی ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە وێرانكرن، جارەكادی ل سالا (١٩٩٢)ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

### ژین و ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە مینا پتریا گوندێن دەڤەرێ ب دەرامەتێن چاندنێ یێ بەرنیاسە، بەری هەوێن ئەنفالان پتر دەرامەتێن مینا برنج و كونجی و ماشا و... هتد دچاندن، هەر چەند گوندەكێ كێم ئاڤە، لێ پشتی هینگێ پتر دار و بارێ فێقی هاتە چاندن، وەكی سێڤ و تری خۆخ و هنار و باهیڤ و ... هتد، بۆ ڤێ چەندێ مفا ژ چەند كانییان دهێتە وەرگرتن، وەكی: كانییا بەرێ بێ، كانییا شورکێ، كانییا پیر ئاڤدەلی، كانییا زێوكێ، كانییا مەرجانێ، كانییا سپیێ (گەرماڤێ)، كانییا گرکێ، كانییا كۆركێ، كانییا مێرگا، كانییا هشك.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ سالا (١٩٧٨)ێ هاتییە ڤەكرن كو ل بەری هینگێ زارۆكێن وان بۆ خواندنێ دچوونە گوندێ بابیرێ و گوندییان بخۆ خواندنگەهـ ئاڤاكرن، سالێن نۆتان بۆ جارەكا دووێ پشتی كو ل هەوێن ئەنفالان وێرانكرین هاتە ڤەكرنڤە، سالا (١٩٩٥)ێ خواندنگەهـ ل ناڤا گوندی هاتییە ئاڤاكرن.. بیرەكا ئیرتیوازی ژی ل سالێن نۆتان بۆ گوندی هاتییە كۆلان و ب رێكا بۆریا ئاڤ دگەهیتە هەمی مالان. كارەب ژی سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتییە گوندی[٥٦].

## گوندێ گولێ:

گوندێ گولێ نێزیكی سێ كلیومەتر و نیڤا ژ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ دوورە.

### سنورێن گوندی:

ژلایێ ژووری هەردو گوندێن تنێ وداودیێ، ژێری گوندی زڤنكێ، رۆژهەلاتی گوندێ شێخ مەمایە و رۆژئاڤا گوندێ گەبەراسكێ یە.

ل سەر رامانا ناڤێ گوندێ گولێ دو ڤەگێران هەنە:

١- جهێ گوندی دكەڤندا سەر سپنەی بوو ئانكو ژێرێ گوندێ نها، دوی دەمیدا ئەو چەندین سال بوون باران ل گوندی نەدبارین، ژنكەكا گوندی ناڤێ وێ گولێ بوو دوعا ژ خۆدێ كرن كو باران باریتن، ئەڤجا دوعایا گولێ هاتە قەبیلكرن و باران بارین، كەیفا خەلكێ گوندی گەلەك هات، هەمیا ناڤێ گوندێ خۆ بناڤێ وێ ژنكێ ناڤكرن ئەوا دوعا ژ خۆدێ كرین داباران باریتن ناڤێ وێ ژنكێ ژی وەك مە گوتی گولێ بوو.

٢- د تخوبێ جۆگرافیێ گوندێ گولێ هژمارەكا مەزن ژ رەنگێ گول سەك هەنە، ژبەر ڤێ یەكێ ئەڤ جهە ب ناڤێ (گول سەك) هاتییە نیاسین، بەلێ پشتی بۆرینا دەم و سالا گول هاتییە سڤكرن ل سەر ئەزمانێ خەلكێ ژ گول سەك بوویە گولێ.

ل سالا (١٩٤٥)ێ هندەك مالبات ژ گوندێ شێخ مەما هاتنە ڤی جهی، هەتا نها ژیانا خۆ لێ دبۆرینن، ژهینكێ وەرە هژمارا وان بەرەڤ زێدەبوونێ دچیتن، نها دگەهنە دەوروبەرێن (٣٥) مالباتان. گوندێ گولێ ژ دو بنەمالان: بنەمالا سانێ و بنەمالا شیێ پێكدهێت.

خواندنگەهـ: ل سالا (١٩٧٩)ێ ل گوندی هاتە ڤەكرن.

### كانیێن گوندی:

دو كانی ل گوندی هەنە: یا ئێكێ دبێژنێ كانییا

زەلاما نها یا هشك بووی، یا دویێ دبێژنێ کانییا ژنکا، هەتا نها ژی ئاڤ هەر ژێ د زێتن.

**شوینوارێن گوندی:**

هندەك شوینوار و بەرمایی ل گوندێ گولێ دیار و پێشچاڤن، دیرۆکا وان دزڤریتن بۆ بەری هاتن و خۆجهبوونا خەلکێ ل گوندێ، ئانکو بەر سالا (١٩٤٥)ێ، ب دیرۆکەکا کەڤنار، ئەوژی ئەڤ شوینوارەنە هاتینە دیتن.

١- بەرماییێن ئاڤاهیێ دێرەکێ ل سە رووبارێ سپنەی دیارن دکەڤیتە ژێریا گوندێ گولێ ب دووراتییا دەوروبەرێن سەدو پێنچی متران.

٢- شوینوارێن دو ئاشێن پێکڤە ل سەر سپنەی دیارن، ب ئاشێن جێمك دهێنە نیاسین.

٣- ژ نیشکەکێ ڤە ترارەکێ ئاخێ ژلایێ موختارێ گوندی ڤە هاتبوو دیتن[٥٧].

**گوندێ دیهێ:**

گوندێ دیهێ ب دووراتییا دەوروبەرێن (٥کم) دکەڤیتە رۆژئاڤایێ، هەردو گوندێن ئەرزێ و بانکا دکەڤنە ژۆریێ گوندی، گوندێ هەمزا دکەڤیتە رەخێ ژێریێ دیهێ، هەسن پیرکا دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندێ دیهێ، پاصێ دکەڤیتە رۆژئاڤای[٥٨].

ل سەر رامانا ناڤێ گوندێ دیهێ دو بۆچوون هەنە:

**دیهێ:** ژ بچویکرنا پەیڤا دوهن هاتییە چونکە گەلەك دارێن زەیتونێ هەنە ل گوندی ئانکو ناڤێ دیهێ ژ دوهنێ زەیتونێ هاتییە.

دیهێ ب زمانێ رۆمانی ب رامانا (دەرگەهـ) دهێت چونکە دسەردەمێن کەڤندا لەشکەرێ رۆمانی و یۆنانی دەرگەهەك ل گەلیێ دیهێ دانابوو، ئەو دەرگەهە ل دووڤ پێدڤیێن خۆ جار ڤەدکر و جار ژێ دگرت. ئەڤ بۆچوونە پتر یا نێزیکی راستیێ یە.

دیهێ گوندەکێ نهالا سپنەیە، خەلکێ وێ فەلێن نەستوری بوون، سەر ب ئەبرەشیا ئامێدیێ ڤەبوون، پاشی بوونە کاسولیك، ل سەروەختێ سولتان حسینێ وەلی ئاڤری پێ دهێنەکرن، کو پێنج قرویش و چارێکەك ل سەر هاتبوونە سەپاندن، دا ببنە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان. ل چەرخێ هەژدێ زایینی کاسولیکیەت دناڤ دا بەلاڤبوو، ل سالا (١٨٤٢)ێ چ کەسێن نەستوری دناڤ دا نەمان، ل دووڤ گۆتنا بادجەری تنێ (١٠١) مالبات نەبن، بێ رەملدار(کاهن) و کەنیسە بوون[٥٩].

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ خۆجهێن گوندی دیهێ دگەهنە دەوروبەرێن (٣٠) مالباتان و مەسیحینە. ژ ڤان ئویجاخان پێکدهێن:

١- قەسرا: ژ تیارێ باکوورێ کوردستانێ، نەخاسمە ژ ئاشویتێ هاتینە.

٢- بێموتێ: کەڤنترین ئویجاخە ل گوندێ دیهێ خۆجە بووین.

٣- بیساوا : ژ تیارێ ل باکوورێ کوردستانێ تایبەتی ل ئاشوتێ هاتینە.

٤- بێ زەیا: ژ گومانێ ل باکوورێ کوردستانێ هاتینە.

٥- بێخۆشو: ژ گرەمونێ ل باکوورێ کوردستانێ هاتینە.

**شوینوارێن گوندی:**

١- شوینوارێن دو دێران دناڤ تخوبێ گوندی دا دیارن.

٢- قەسرۆکێ: دکەڤن دا دگۆتی یێ کەسەکێ ئەرمەنی بوو. دکەڤیتە ناڤ تخوبێ گوندی دا.

٣- دێرا مار یاقو: دکەڤیتە سەرێ چیای هنداڤی گوندێ دیهێ.

٤- شوینوارێن دو ئاشێن ئاڤێ دیارن دکەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ گوندی.

٥- شکەفتا ژنکا: دکەڤیتە دگەلیێ دیهێ دا.

٦- دێرەکا کەڤن یاهەی بناڤێ دێرا نەشمونی بۆ شەش سەد سالن بەری نها دزڤریتن[٦٠].

خواندنگەهـ: ئەمریکا د سالێن سیهاندا ژ سەدسالیا بۆری خواندنگەهەك ل گوندێ

دیهێ ب زمانێ سریانی ڤەكرن. سالێن پێنجیاندا خواندنگەهەك بزمانێ ئەرەبی هاتە ڤەكرن. پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ دیسان خواندنگەهەك ل گوندێ دیهێ بهاریكاریا ئەمریكا هاتە ئاڤاكرن[11].

## گوندێ هەسن پیركا:

هەسن پیركا دكەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ. رامانا ناڤێ هەسن پیركا: ل دووڤ پێزانینێن گەهشتینە مە: كو هەسن ژ ناڤێ كەسەكی هاتییە ئەو ژی (حەسەن) و (پیركا) ئانكو پیر و دانعەمر. دكەڤندا كەسەك هەبوو یێ دانعەمر بوو هاتە جهێ نها یێ گوندی و مالاخۆ لێ دانا، ئەڤجا ئەو جهـ ب ناڤێ وی هاتە نیاسین ب حەسەنێ پیر، بەلێ ببۆرینا دەم و سالان ناڤ سەر ئەزمانێ خەلكێ هاتە سڤككرن ژ حەسەنێ پیر بۆ هەسەن پیركا.

### سنوورێن گوندی:

لایێ ژووری گوندێ ئەرزێ، ژێری گوندێ غلبیشێ نە، هەردو گوندێن شرتێ و زێوا شێخ پیراموسی دكەڤنە رۆژهەلاتێ گوندی، گوندێ هەمزا دكەڤیتە رۆژئاڤای.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندێ هەسن پیركا ژچەند ئویجاخێن موسلمانان پێكدهێنن، هژمارا خەلكێ گوندی دگەهنە دەوروبەرێن ٣٥ مالباتان، ئێك ژ ئویجاخێن گوندی دبێژنێ ئویجاخا مالا محەمەدی و ئویجاخا مالا مستەفای.

خواندنگەهـ: سالێن هەشتییاندا خواندنگەها دەستپێكی ل گوندێ هەسن پیركا هاتە ڤەكرن.

ژ دەرامەتێن چاندنێ یێ گوندێ هەسن پیركا، برنج و تویتن و گەنمۆك و كونجی و دەخل و جەهـ و هژیر و سێڤ و تری. ژ كانیێن گوندی كانییا (جنكێ) راماناوێ كانییا ئەجنا، كانییا ناڤهاتی دبن بەرەكی دازێتن.

## گوندێ ئەرزێ:

ناڤێ ئەرزێ: دهێتە ڤەگێران دكەڤندا خەلكێ گوندێ ئەرزێ دەرامەتێ برنجی دكر، ژبەر ئاڤەكا بۆش لێ هەبوویە، ناڤێ برنج بزمانێ عەرەبی دبێژنێ (رز)، ئەڤجا ببۆرینا دەمی ناڤێ (رز) ل سەر ئەزمانێ خەلكێ هاتییە سڤككرن، ژ(رز) بوویە (ئەرز) بەلێ ئەم دبینین ئەڤ بۆچوونە گەلەك یا لاوازە.

### سنوورێن گوندی:

جهێ جۆگرافیا گوندێ ئەرزێ یێ بلندە، تخوبێن گوندێ ئەرزێ بڤی رەنگی نە، لایێ ژووری گوندێ بانكایە و ژێریێ وێ گوندێ دیهێ یە، هەسن پیركا و زێوێ دكەڤیتە رۆژهەلاتی، بابگۆریا دكەڤیتە رۆژئاڤای.

### پێكهاتا گوندی:

تنێ دو بنەمالێن سەرەكی ل گوندی هەنە ئەوژی (بنەمالا سەیدا و بنەمالا بەگا)، بنەمالا بەگا بنیاتێ وانا عەرەبن ژ سامەرا هاتینە ئامێدیێ، پاشی چوونە نێروە، ژوێرێ هاتنە ئەرزێ، هەتا نها هندەك ژوانا ل دەڤەرا نێروە ماینە. بنەمالا سەیدا ژ بەروشكا سەعدینی هاتنە ئەرزێ. دكەڤندا دەوروبەرێن هەڤدە هەتا بیست مالا ل گوندی جهواربوون.

### كانیێن ناڤێ:

ئێك كانییا ئاڤێ ل گوندی هەیە ئەو ژی ب (كانییا ئەرزێ) دهێتە نیاسین، ئەرزێ ب هنارێن ئەرزێ و حلی زەركا و حلی رەشكا ناڤدارە. هەروەسان ترێ میسا بەگی برەنگێ رەش و تلی درێژ یێ بەرنیاسە، بۆچی بڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن، چونكە دەمێ میسا بەگێ سەردەمێ هاتنا لەشكەرێ ئینگلیزی بۆ دەڤەرێ ل داویا (١٩١٨)ێ شەرێ لەشكەرێ ئنكلیزی كری، ئەڤجا میسا بەگ دگەل تاهر هەمزانی و حەجی شەعبان ئامێدی، هەرسێ چوونە دەڤەرا گوییا ل ژوورێ كوردستانێ، پشتی زڤرین و هاتنە ئەرزێ و میسا بەگی ژ وێری تیركەكێ مێوێ دگەل خۆ ئینا

ئەرزێ و چاند، دەمێ هاتییە بەری ب تلینێن رەش و درێژ، ئەڤ تربە بڤی رەنگی ل گوندی بەلاڤەبوو ب ناڤێ تربێ (میسا بەگی) هاتە ناڤکرن.

**مزگەفتا گوندی،** مزگەفت دکەڤیتە نیڤا گوندی، ژبارا مەلایێن گوندی ل سەر خەلکێ گوندی ئەرزێ بوو، ئانکو گوندیا دەخل و دان و زەکات و فترە دانە مەلایا، هەروەسا مەلا ژی ب مالباتڤە ل گوندی دژیان[٦٢].

ئەڤ گوندە د ناڤ ژێدەرێن دیرۆکا ئەدەبیاتا کوردی ب شاعر بەکر بەگێ ئەرزی هاتییەنیاسین: ناڤێ وی بەکر بەگێ کورێ میر بەهدور بەگێ (دوێیە)، کورێ میر شالێ بەگێ کورێ میر ئەحمەد بەگێ کورێ بەهدور بەگێ (ئێکێ یە) کورێ میر محمد بەگێ کورێ سولتان حەسەن بەگێ کورێ میر سەیفەدین بەگێ کورێ میر محمد بەگێ کورێ میر بەهائەدین بەگێ (ئێکێ)یە، یێ دگەهیتە میر موبارزەدین (کەك). ل سالا (١١٧٠- ١٩٧٩مش/١٧٥٦-١٧٦٧ز)ێ ل کەلا ئەرزێ ژ دایك بوویە. ل سالا (١٢٥٠مش/١٨٣٣ز) ێ چوویە بەر دلوڤانییا خوێ[٦٣]. ژبلی کو بەکر بەگ شاعر بوو، رەسامەکێ زیرەك و ژێهاتی بوو[٦٤].

## شوینوارێن گوندی:

١- ژ شوینوارێن ناڤدارێن ڤی گوندی (کەلا ئەرزێ) یە، کو ل سەر گرەکێ مەزن هاتییە ئاڤاکرن، رەخۆدۆرێن وێ (٣٠٠م)، پەسارا ئەردێ وێ بەر ب خارێڤە دهێتن، ل شویرهێن وێ سێ دەرگەهـ یێن هەین، هندەك دیوار ل ڤێ کەلێ ماینە، دیسان ژ دەرڤە ژی هندەك بانی و ئەردێن راست هەنە، دبیت بۆ مەرەمێن لەشکەری هاتبنە ب کارئینان، زێدەباری سریچەکێ کو بۆ عمبارکرنا ئاڤێ دهاتە ب کارئینان، دگەل جۆکەکێ کو ئاڤ دگەهاندێ، دیسان بەحسێ هەبوونا ەکێ تێڤە دهێنە کرن[٦٥].

٢- سەرێ قەسرێ: جهێ میرێ کەلێ یە، ل بلندترین جهـ ل نیڤا کەلێ هاتییە دانان، هەتا نها بنیاتێ دیوارێن وێ یێن ماین.

٣- کوچکا میری: دکەڤیتە رەخ قەسرا میریڤە، هەتا نها دبێژنە جهێ وێ (کوچکا میری).

٤- گرتیخانە: دیوارێن وێ ب ڤێری وبەرا هاتبوونە نژنین، میرێن کەلێ ژ بۆ زیندانکرنا گونەهکارا ئاڤاکربوو، دکەڤیتە رۆژهەلاتێ قەسرا میری.

٥- گورانگەهـ: جهێ کومبوون و نڤێژایە ل رەخێ ژێری یێ جوکا ئەرزێ و ب فەرشا هاتییە چێکرن.

٦- گورێ بەکر بەگێ ئەرزی: دکەڤیتە پشتا گورانگەهێ، دناڤبەرا وی و گورانگەهێ تنێ جوکا ئاڤێ یە، ل دەستپێکێ یێ ب تنێ بوو، پاشی عەلی بەگ ب رەخڤە هاتییە ڤەشارتن[٦٦].

## گوندێ غلبیشێ:

غلبیشێ دکەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ بامەرنێ. ژووریێ گوندێ غلبیشێ دبیتە گوندێ هەسن پیرکا، ژلایێ ژێریڤە دبیتە هەردو گوندێن بەندا و زڤنگێ، ژلایێ رۆژئاڤای دبیتە گوندێ هەمزا.

### رامانا ناڤێ غلبیشێ:

غلبیشێ ژ دو پەیڤێن کوردی هاتییە، ئەو ژی (خر و بیش) رامانا وێ هەمی پیشە، چونکە دکەڤن دا ئەردێ گوندێ هەمی دەحل و پیش بوو. لەورا هاتییە نیاسی ب ناڤێ (خر پیش) پاشی بوویە (غلبیش).

### پێکهاتا گوندی:

چوار بنەمال ل گوندێ غلبیشێ هەنە، هەر ژچار بنەمال ژی دکەڤن دا ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە جهێ گوندێ (غلبیشێ)، هەتا نها ژیانا خۆ لێ دبورینن، ئەو ژی ئەڤ بنەمالەنە:

١ - بنەمالا شەهێ. ٢ - بنەمالا گەروی. ٣ - بنەمالا داوەتیا. ٤ - بنەمالا لاجێ.

**خواندنگەهـ** ل سالێن حەفتییاندا ژ سەدسالیا بیستێ، ئێك ژ خەلکێ گوندێ غلبیشێ رێنڤیسا (لاتینی) نیشا خەلکی ددا. پاشی د سالێن هەشتیاندا خواندنگەهـ ل گوندی هاتە ڤەکرن.

**كانیێن گوندی:**

كانییا كوچەركێ، ل ژووریێ رۆژهەلاتی گوندی. كانییا پیرێ مەهند: ل رۆژئاڤایێ گوندی. كانی كەوكێ، ل رۆژئاڤایێ گوندی. كانییا مێرا، دكەڤیتە ژێریا رۆژهەلاتێ گوندی. كانییا ڤنكا، دكەڤیتە ژێریا رۆژهەلاتێ گوندی.

**چاندن:** ندورێ گوندێ گوندێ غلبیشێ ل دەڤەرێ یێ ناڤدار و بەرنیاسە، هەروەسان دەخل و جەه، هژیر و تری و سێڤ ....هتد ل گوندێ ناڤبری دهێنە چاندن.

**شوینوارێن گوندی:**

١- گاڤلكێن (محتەر پاشای) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ غلبیشێ، شوینوار و بەرمایێن خانیێن كەڤن لێ دیارن.

٢- بەروژێ عبدولرەحمان ئاغای، دكەڤیتە ژووریێ رۆژئاڤایێ گوندێ غلبیشێ[٦٧].

## گوندێ هەمزا:

گوندێ هەمزا دكەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ بامەرنێ.

**سنوورێن گوندی:**

ژووری دبیتە گوندێ دیهێ. ژێر رووبارێ صپنەی، رۆژهەلات گرێ قلوز، رۆژئاڤا دبیتە نەهالا گەلوە.

**رامانا ناڤێ هەمزا:**

بتنێ ئێك بۆچوون ل سەر رامانا ناڤێ هەمزا هەیە. ئەوژی هەمزا ژ بچویكرنا (هەمی زان) هاتییە ئانكو زانا.

**بنەمالێن گوندێ هەمزا:**

بنەمالا تاهر ئاغا هەمزانی دكەڤن دا ژ گوندێ ئەرتیسێ سەر تخویبێ عیراق و تركیا هاتینە گوندێ هەمزا، هەژی بێژین كو سولتانەكێ ئۆسمانی ناسناڤێ: تاهر پاشا كرە ناسناڤێ تاهر ئاغا هەمزانی، هەروەسان هندەك بنەمالێن دی ژی ژ كوردستانا ژووری هاتینە گوندێ هەمزا، هەتا نها ژی ژیانا خۆ لێ دبۆرینن. خەلكێ جهوارێن گوندێ هەمزا نها دگەهنە (١٢) مالباتا. ژ موختارێن گوندێ هەمزا، حسن حبیب، پشتی وی محمد تها بوویە موختار.

**خواندنگەهـ** یەكەمین جار ل سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ ب رێڤەبەریا: حسێن ئەحمەدی ل گوندی هاتییەڤەكرن، دەستبێكێ خانیەك كری بوو، ل سالا (١٩٨٣)ێ ئاڤاهیەك بۆ هاتەئاڤاكرن، د ئەنفالاندا ئەو ئاڤاهی هاتەخرابكرن. ل سالا (٢٠٠٤)ێ هێزێن ئەمریكا ئاڤاهییەك دیتر بۆ گوندێ هەمزا ئاڤاكر ژ دو هولا پێكدهات. سالا (٢٠٠٩)ێ حكومەتا هەرێما كوردستانێ ئاڤاهییەكێ نوی بۆ خواندنگەها گوندی ئاڤاكر.

**چاندن:** گوندێ هەمزا دكەڤن دا ل دەڤەرێ ب چاندنا برنجی یێ بەرنیاس بوو، چونكە ئاڤەكا بۆش لێ هەبوو. هەروەسا سێڤ و تری و هژیر و هنار ..... هتد ل گوندێ هەمزا دهاتەچاندن. ژ كانیێن گوندی: كانییا تەوكێ و كانییا سێڤكێ و كانییا كاسێ.

**شوینوارێن گوندی:**

- گرێ سیكا دكەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ گوندی، هەتا نها ژی دیوارەكێ مەزن یێ كەڤنار دیاردكەت.
- گرێ عەجوی.
- شیفكا خرابا: كاڤلە گوندە شوینوارێن خانیا لێ دیاردكەن.
- بەر گوندێ: كاڤلە گوندە شوینوارێن خانیا لێ دیاردكەن[٦٨].

## گوندێ وەرمێلێ:

گوندێ وەرمێلێ ب دووراتییا دەوروبەرێن (٣٠كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ. رامانا ناڤێ وەرمێلێ: جهێ خۆرستیێ گوندی (ملە) ئانكو بلنداهی یە مینا كەلایەكێ یە، لەوما ناڤێ وێ ژ (وەرە ملێ) هاتییە، بەلێ ببۆرینا دەم و سالان ناڤ ل سەر ئەزمانێ خەلكێ هاتییە گوهرین و سڤككرن ژ

وەرە ملێ بوویە وەرمێلێ.

### سنوورێن گوندی:

لایێ ژووری دبیتە گوندێ گەرەگوهێ، ژێریێ دبیتە هەردو گوندێن بابكۆریا و بانكا، رۆژهەلاتی هەردو گوندێن بابیرێ و بابكۆریا و لایێ رۆژئاڤایڤە دبیتە گوندێ پاصێ.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی دگەهنە دەوروبەرێن ٥٩ مالباتان. ژ گەلەك ئویجاخان پێكدهێن، ئەوژی ئەڤەنە: مالا ئیزدین، مالا مەلای، مالا حامدێ، مالا برەهیمێ، مالا كوركیا، مالا عمر پیرا، مالا كەلەشی، مالا كولاڤی، مالا باگوری، مالا ئەبو زێدێ شەروی، مالا عەلێ.

### شوینوارێن وەرمێلێ:

گوندێ وەرمێلێ وەكی هەر گوندەكێ دی یێ كوردستانێ شوینوار جهێن دیار لێ هەنە، مینا: بەرێ كومتك، بەرێ مهمدا، بەرێ مشختی، بەرێ میروی، بەرێ دیكلا، بەرێ هەسەدو، بەر كێلكێ، بەرێ گوڤێ، بەرێ بیكا، بەرێ شڤانا، بەركێ گوری، بەركێ قرا، بەرێ كەهینێ، بەرێ رەملكێ.

هەروەسان گەلەك شكەفت دناڤ تخوبێ گوندێ وەرمێلێ دا هەنە، مینا شكەفتا: تەوكێ، صادقی، شیر و مەتالا، كالێ، چەمێ رێز، محمدی، عمر پیرا، شكەفتا كەگو، مام هەسنی، ناوسكێ، ناڤبەریا جهی.

### كانیێن گوندی:

گەلەك كانی ل گوندێ هەنە مینا كانیێن: خاتینا، سارکێ، سەیدی، سیركا، دەرویشی، عەلی مەندا، حجی ئبراهیم، تلخا، سێریجكا، نورینكا، هاجی، شەموی، نورینكا.

خواندنگەها وەرمێلێ سالا (١٩٥٨)ێ ل گوندی هاتیە ڤەكرن.

**مزگەفت:** مزگەفت ل گوندێ وەرمێلێ ل سالا ١٨٩٠ێ هەبوویە، ژ مەلایێن گوندێ وەرمێلێ وەكی: حەجی عەمەر و مەلا سلێمان و مەلا محسن.

چیرۆكبێژێن گوندێ: عمەر جانێ، ئەنور مستەفا ئەبو زید، كەریم عمر، قادر شریف، حجی فرحان، یاسین عبدال، كمال شریف.

حەكیم و لوقمانێن گوندی: باغزا سەلیم ئەمین، خەم عیسا، ئامینا شریف، خیال محمد، صونێ[٦٩].

## گوندێ چەم سیسكێ

گوندێ چەم سیسكێ دكەڤیتە ژێریێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ ب دووراتیا دەوروبەرێن (٢٥كم)، تخوبێن گوندی چەم سیسكێ بڤی رەنگینە، ژلایێ ژووری دبیتە گوندێ پاصێ، ژێریێ وێ دبیتە گوندێ بەرۆشكێ، ژلایێ رۆژهەلاتی گوندێ تەحلاڤایە، ژلایێ رۆژئاڤایڤە دبیتە گوندێ كوفكێ.

نها جهێ گوندی یێ كاڤلە، بتنێ شوینوارێن خانیا لێ دیارن ئانكو مرۆڤ لێ ناژین، خەلكێ دوكەرێ ل دەستپێكێ ل ڤی گوندی ژیان بەلێ ژبەر دووراتیا خەلكێ ژ دەرامەتێن ئاڤێ، ئەڤجا خەلك نەچاربوون ژگوندێ چەم سیسكێ باركەن و بەرەڤ جهەكی بچن لێ جهوارن كو نێزیكی ئاڤێ بیتن، ئەڤجا چوونە جهێ نها یێ گوندێ دوكەرێ و هەتا نها ژی ژیاناخۆ لێ د بورینن.

### راماناً ناڤێ چەم سیسكێ:

كانیەكا ئاڤێ ل گوندی هەبوو گەلەك جارا رەنگەكێ چویچكا كو دبێژنێ (چویچكێن سیسك) دادانە سەر وێ كانیێ، چەم و بیستان ژی ل نێزیكێ وێ كانیێ هەنە. ئەڤجا ژبەر ڤێ چەندێ ب كانیا یا چەمێ سیسكێ هاتیە نیاسین. گوند ژی بناڤێ وێ كانیێ ب گوندێ (چەم سیسكێ) هاتیە نیاسین[٧٠].

## گوندێ گەلوە:

گوندێ گەلوە ب دووراتیا نێزیك (١٠كم) دكەڤیتە

ژێریا گوندێ دیهێ، نها کاڤلە گوندە و کەس لێ ناژیتن، دەمێ گوندێ یێ ئاڤا تنێ دو مالبات لێ دژیان، ئەو ژی مەسیحی یێن خەلکێ گوندێ دیهێ بوون. بەلێ دسالێن سیهاندا ژ سەدسالییا بیستێ ئەڤ گوندە هاتە کاڤلکرن[٧١].

## گوندکێ سماییلی:

گوندکێ سماییلی دکەڤیتە هنداڤی شیڤا صۆریا ل ژێریێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، چ ژێدەرێن دیرۆکی بەحسێ وێ نەکریە و نەهاتیە قەیدکرن د پەرتووکێن شوینواری دا، ژبلی پەرتوکا (ئەڤەیە بامەرنێ) کو ئاڤریەکا بچویك دایە ناڤێ وێ. ئەڤ کاڤلە گوندە سەر ئاڤا سپنەی هاتبوو ئاڤاکرن ب مەرەما مفا وەرگرتنێ ژ ئاڤا رووباری و ب کارئینانا ئەردی وێ بو مەرەمێن چاندنێ. عەزیز فەرخۆ خەلکێ بامەرنێ سەرهاتییەکا کوردەواری ل دور ڤێ ئاڤێ ژ کەسانێن دانعەمرێن بەری خۆ گوە لێ بوویە ڤەدگێریت: دبێژیت کو ئاڤا صپنەی ئەوا نێزیکی گوندکێ سماییلی گەلەکا بۆش بوویە، چونکە ژ کەڤندا بزنەك کەتە ئاڤا کانیا مزگەفتا مۆمنا و قەشیلوی ژبەر ئاڤێ بزن دگەل خۆ بر هەتا ل نك رووبارێ صپنەی ل گوندکێ سماییلی راوەستیای، ئەو ژی بزن کەتە دار بیهەکا مەزن ل سەر لێڤا رووبارێ صپنەی ل گوندکێ سماییلی. بڤێ چەندێ بۆ مە دیاربیتن کو ئاڤا صپنەی گەلەکا بوش بوویە ددەمێ هەبوونا ژیانا خەلکی ل گوندکێ سماییلی.

## تخوبێن گوندکێ سماییلی:

ل رۆژهەلاتێ وێ باسکێن بامەرنێ و ئەرەدنایە، رۆژئاڤا گوندێ سولەهیارێ و کانیکا، ل ژێریێ وێ دەڤەرا ڤەکریا صپنەیە.

## شوینوارێن گوندی:

ئەگەر مرۆڤ سەحکەتە پێکهاتا شوینوارێن ڤی جهی کۆمەکا تشتا دکەڤیتە بەرچاڤێن مرۆڤی، ژوان کاڤلێن خانییێن هەرفتە کو بتنێ شەنکستێن وان مانە، هەمی پێکڤە گرێدانە، رەنگێ وان گەلەکێ سادەیە، ژ بەرێن ئاڤێ هاتینە چێکرن زێدەباری ب کارئینانا ئاخێ وەکی مادێ نیسەك، کۆمەکا مەزنا دارێن مازی و بەری دناڤدا شوین بووینە و مرۆڤ دزانیت کو ژمێژە ئەڤ گوندە هاتیە چۆلکرن. رێزێن خانییێن ڤی گوندی هەتا شەش رێزا دیارن و ئێك ل سەر یێ دی هاتییەئاڤاکرن. پتریا خانییێن وان ژ ژۆرەکێ یان دوێن بچویك پێکدهێن.

کۆمەکا دی یا شوینوارا بەرچاڤی مرۆڤی دکەڤن، وەکی جوهنی کو بۆ قوتانا متایێ دەخل و دانی هاتییەچێکرن، دیسان باگوردانەك دناڤ کاڤلی دا یێ دیارە، زێدەباری فەرشێ نڤێژا کو ب رەنگکەکێ ئیسلامی هاتییە دانان.

## راھانا ناڤێ سماییلی:

دیارە کو ناڤێن جها ل کوردستانێ هەر ژ کەڤندا ب مرۆڤانڤە هاتییە گرێدان، نەخاسمە ئەو کەسێ گوند ئاڤا دکر، وەك ئیسفکا، حەسەن ئاڤا، براهیم زلا....هتد، ئەم بدوور نابینین کو ناڤێ ڤی گوندی ڤەگەریتە سەر ناڤێ کەسەکی کو ئەڤ جهە ئاڤاکربیت، وەکی گوندێ (زیارەتا)، ناڤێ وی ژی (ئسماعیل) بوویە، بەلێ دزمانێ کوردیدا دهێنە بچویکرن، ل دوماهیێ بوویە (سمایل)[٧٢].

ل ڤێرێ پرسیارەك سەرهلدەت و دبێژیت ئەرێ کەنگی ئەڤ گوندێ مەزن هاتییە چۆلکرن؟ وئەگەر چ بوونە؟ دێ ڤەگەرینە سەر رویدانێن دیرۆکی ل سەدا شازدێ زاینی کو گەلەك گوندێن دی مینا ڤی گوندی و گوندێ (زیارەتا)، کو دکەڤیتە ژێریێ بامەرنێ ئەو ژی سەر صپنەی هاتبووئاڤاکرن. د دەمێن بەرێدا چەند جاران ئێشێن قوتبر و ئێشێن دژوار و بێ دەرمان ب سەر خەلکێ دا گرتیە، وەکی تاعون و سۆرکا. گوندکێ سماییلی ژی بەهرا خۆ دئەڤان ئێشادا هەبوو، نەخاسمە ئەو وەباێن سالێن (١٦٢٥، ١٦٣٤، ١٦٥٠، ١٦٧٣، ١٧٠٢ز)ێ کو بسەر خەلکێ دەڤەرێدا هاتین. خەلکێ جهـ و وارێن خۆ بەردانە. دیسان ل سالێن (١٦٧٣، ١٦٧٦، ١٦٨٨ز)ێ کولی بسەر دەڤەرێ دا گرتیە و تەر و هشك پێکڤە داعویران. ئەم ب

دوور نابینین کو وی هەیامی ئەڤ جهە هاتبیتە چۆلکرن وئێش و وەباێن کوژەك بسەر ڤی خەلکی دا گرتبیت[٧٣].

## گوندێ تەحلسا:

تەحلسا کاڤلە گوندە دکەڤیتە ژێرێ گوندێ هەسن پیرکا ب دووراتییا دەمژمێرەکێ ب پێیان، نەخاسمە دکەڤیتە سەر رووبارێ سپنەی. هەتا نها شوینوار وبەرمایێن هندەك کاڤلە خانیا لسەر رویێ ئەردی دیارن، هەروەسان قەنتەرەك هەتا نها وەك خۆ مایە[٧٤].

## گوندێ قولە بیهێ:

کاڤلە گوندێ قولە بیهێ نێزیکی نیڤ دەمژمێرێ بپێیان ژ ژێریێ گوندێ هەسن پیرکا دوورە، تا نها شوینوار و بەرمایێن گوندێ قولە بیهێ ل سەر رویێ ئەردی پێشچاڤن[٧٥].

## گوندێ کانی گیسکێ:

کانی گیسکێ دکەڤیتە دناڤ تخوبێ ناحیا بامەڕنێ ژلایێ رۆژهەلاتی ڤە. ل دەوروبەرێن کانی گیسکێ شوینوار و بەرمایکێن ئاڤاهیێن خانیا دیار و پێشچاڤن، ل ژووری گوندێ ناڤبری گرەکێ بلند هەیە ب گرێ (کەلوتکێ قەتێ نەیی) دهێنە نیاسین، ل سەرێ وی گری شوینوارێن ئاڤاهیێ دێرەکی دیار و پێشچاڤن[٧٦].

هەروەسا گۆڕستانەکا کەڤن لێ هەیە. دکەڤیتە ژێریا کانییا گیسکێ، نها جادا هاتن و چوونا ترومبێلا بوویە ناڤبرەك، دناڤبەرا جهێ گوندێ کانی گیسکێ و گوڕستانا گوندێ ناڤبریدا[٧٧].

## گوندێ مەتینی:

کاڤلە گوندێ مەتینی دکەڤیتە سەرێ گوندێ بانکا، شوینوارێن گوندێ مەتینی سەر رویێ ئەردی دیار و پێشچاڤن، ب تایبەت بەرمایکێن ئاڤاهیێ مزگەفتا گوندی، وەسا دیارە کو خەلکێ گوندێ بانکا دکەڤندا لڤی گوندی جهواربووینە، پاشی و بهەر ئەگەرەکا هەبیتن گوندێ مەتینی بجهـ هێلایە و هاتینە خارتر و ل گوندێ بانکا بێ نها خۆجهبووینە.

سەید بەهجەت بانکی سەرهاتییەکا کوردەواری ل دوور ڤێ گوندی ڤەدگێریتن تێدا هاتییە: دکەڤندا خەلکی ل گوندێ مەتینی ژبانا خۆ یا رۆژانە دبرە سەری. رۆژەکێ ژ رۆژێن زڤستانێ، بەفرەکا دژوار لێ کر هەتا وەلێ هاتی خەلکێ هەمی دبن بەفرێ دامرن، تنێ مالەك ما، ئەگەرێن قورتالبونا وێ مالێ ژی ئەڤەبوو، چونکە وێ مالێ گایەکێ مەزن هەبوو ئەڤجا دەمێ رۆژ بوویە ئێڤار عەورا خۆ ل عەسمانی دایە ئێك کو نیشانێن بەفر بارینێ نە، دو برا دوێ مالێ دابوون بناڤێ (حاجی و مەتین) برایەکی گوتە یێ دی وەسا دیارە دێ بەفرەکا دژوار لێ کەتن، ئەڤجا دا خۆ قورتالبکەین رابە ئاگرەکێ خۆش هەلکە دناڤ ژورەکا خانی دا و گایێ مە ڤەکوژە، داکو بشێین هێدی هێدی بەفرێ ل سەر بانی رامالین و بهێینە خارێ گوشتێ گایێ بژارتی بخۆین، دا بۆ مە هێز پەیدابیتن و سەرکەڤینەڤە بەفرێ ژ سەر بانی رادەین، بڤی رەنگی دێ شێین ژ مرنا بن بەفرێ خۆ قورتالکەین. ئەڤجا هەردو برایان پیلانا خۆ بجهئینان و بتنێ ئەو هەردو برا دگەل مالباتێن خۆ قورتالبوون. دەمێ برایەك ل سەر بانێ بەفر رادمالی بابێ وی دخانیڤە بوو و هەر گازی کورێ خۆدکر گۆتێ: کورێ من دلێ من یێ بتەڤە وەرە خارێ، بەلێ کوری گۆتە بابێ خۆ هێشتا بەفرەکا دژوار لێ دکەتن و دا ڕامالم و ژۆردانی ل سەر بینم و ببەم پاشی دێ هێمە خارێ، لێ بابێ کورکی گەلەك دلێ وی ما بکورێ خۆڤە، لەورا باب رادبیتن کورێ کورێ خۆ (نەڤیێ خۆ)، برە سەربانی دناڤ بەفرێ دا، ئینا کوری گۆتە بابێ خۆ باب گونەها ڤی تفالی چی یە، تۆ کورێ من دئینیە ناڤ بەفرێ دا. ئینا بابی گوتە کورێ خۆ ئەرێ کورێ تە جەگەرا تەیە دلێ تە مینتە پێڤە مانە، باشە مانێ تۆ ژی کورێ منی و جەگەرا منی دلێ منژی مینتە بتەڤە، بڤێ گۆتنێ کور ژ بانی هاتە خوارێ.

ئەڤجا بڤی رەنگی ئەو مالبات ژ بن بەفرێ

قورتالبوو، هەمی خەلکێ دیێ گوندێ مەتینی دبن بەفرێ دا مرن، پاشی ئەو هەردو برا دگەل مالباتێن خۆ هاتن جهێ نها دبێژنێ گوندێ بانکا و ژیاناخۆ لێ بوراند و دویندەها وان زێدەبوو.

سەید بەهجەت بانکی دبێژیت: ناڤکرنا چیایێ مەتینی بڤی ناڤی دزڤریتن بۆ وی کەسی ئەوێ ناڤێ وی مەتین برایێ حاجی، هەتا نها ژی گورەك هەیە ل سەرێ گوندێ بانکا دبێژنێ گورێ مەتینی[٧٨]. د راستێدا ئەڤ سەرهاتیە ل گەلەك جهێن دی ب شێوازێن جودا جودا دهێتەڤەگێران و ئەم نە د وێ باوەرێدانە کو پەیوەندیەك ب مەتینی ڤە هەبیت، بەلکی پشکەکە ژ فولکلۆری، هندی ناڤێ مەتینی یە (ناڤێ چیایێ مەتینی بۆ ئمبەرەتوریا میتانی دزڤریت، ئەوا ل ناڤەراستا هزارا دوویێ بەری زایینی دەستەلاتداری ل ڤێ دەڤەرێ کری و ژێدەرێن دیرۆکی ژی پشتەڤانیا ڤێ بۆچوونێ دکەن).

## گوندێ ناڤێلا:

کاڤلە گوندێ ناڤێلا دکەڤیتە سەرێ چیایێ مەتینی ل رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، تایبەت ل رۆژهەلاتێ گوندێ ئەرەدنا موسلمانا و رۆژئاڤایێ گوندێ ئینشکێ.

### شوینوارێن گوندی:

شوینوار و بەرمایکێن گوندەکێ بچویك دیاردکەن. دگەهنە (٢ هەتا ٣) شوینوارێن خانیا لێ دیارن، هەروەسان دیوارێ دێرەکێ لێ مایە، برکەك لێ هەیە دبێژنێ برکا پاشای، دبن برکێ دا دیوارەك دیارە دبیتن ئەو دیوار یێ ژوورا پاشایەکی بیت، هەروەسان چەپەرەك لێ مایە ب چەپەرێ پاشای دهێنە نیاسین، هەروەسان جوەکا ئاڤێ دیاردکەتن دبێژنێ جوا فرەنگێ دەوروبەرێن (٣٠٠ هەتا ٤٠٠) مترا ئەو جووا ئاڤێ دیارە، جووا گەهاندی یە دێرا سور[٧٩]. ژ هەژییە بێژین کو وەختێ تاعونێ ل ئامێدیێ دای، میر بەهرام پاشا ل سالا (١١٥٢مش/ ١٧٣٩ز)ێ بەر ب ڤی جهیڤە چوو بوو[٨٠].

## گوندێ ئینکەوکێ:

گوندێ ئینکەوکێ دکەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ تایبەتی ژووریێ گوندێ کانی گیسکێ تنێ گرەك دبیتە ناڤبر دناڤبەرا گوندێ کانی گیسکێ و گوندێ ئینکەوکێ. شوینوار و بەرمایکێن خانیێن کەڤن لێ دیارن. لەورا دوور نینە ئەڤەژی جهێ گوندەکێ کەڤنار بوویە[٨١].

## گوندێ بابگۆریا:

گوندێ بابگۆریا دکەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، سنوورێن جوگرافیێن بابگۆریا بڤان گوندان هاتییە تخوبیدان. لایێ ژووری دبیتە گوندێ بانکا، ژلایێ ژێری دبیتە گوندێ پاصێ، ژلایێ رۆژهەلاتێ گوندێ ئەرزێیە، گوندێ وەرمێلێ دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندێ بابگۆریا.

### پێکهاتا گوندی:

جهوارێن گوندێ باب گوریا دگەهشتنە (١٢)مالباتان لێ د ژیان هەتا سالا (٢٠١٣)ێ، پشتی سالا ناڤبری خەلکێ ژ گوندی مشەختبوویە. ژ هینگێ وەرە هەتا نها کەس ل گوندی ناژیتن، هەژی یە بێژین کو خەلکێ بابگۆریا هەمی دگەهنە ئێك بابك ناڤێ وی (حاجی)یە.

بنیاتێ ناڤکرنا بابگۆریا: بنیاتێ ناڤێ بابگۆریا ژ ناڤێ (بابکێ گو یا) هاتی یە. دکەڤندا و تایبەتی ل سەردەمێ دەستەلاداریا ئۆسمانیا، کەسەك ژ دەڤەرا (گوی یا) ل باکوورێ کوردستانێ هاتە جهێ ڤی گوندی و ژیانا خۆ لێ بوراند. هەتا سالا (٢٠١٣)ێ نەڤیێن وی (بابکێ گوی یا) ل گوندی ژیان. ئەڤجا بڤێ پێزانینا دیرۆکی بومە دیاربیتن، کو ناڤێ بابگۆریا ژ بجویکرنا ناڤێ (بابکێ گوی یا).

خواندنگەهـل گوندێ بابگۆریا نەبوویە، خویندکارێن گوندی د چوونە خواندنگەها گوندێ دیهێ.

### شوینوارێن گوندێ بابگۆریا:

ژ شوینوار و بەرمایکێن کەڤن ل گوندێ بابگۆریا

هەین، ئەو ژی هندە جهـ هەنە ب ناڤێن کەڤن یان خەلکێ گوندێ ناڤ دانایـنە سـەر، وەك تیێ دیرێ ئانکو کوبێ دێرێ، هەروەسـان بەرێ تەیرا، سـماقا لەعلێ.

**چاندن،** گوندێ بابکۆریا یێ کێم ئاڤ بوویە لەورا خەلکێ گوندی گرنگی ب چاندنا دێم ددا، وەك دەخلی و نۆکی و نیسکی و جەهی. بتنێ کانیەك ل گوندی هەیە دبێژنێ کانییا (ئاڤدێ) و نها ئەو کانی یا هشك بووی[٨٢].

## گوندێ بارزانکا:

دکەڤیتە ژێرێ رۆژئاڤایێ گوندێ زێوا شێخ پیراموسی. ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٦١)ێ هاتییە چۆلکرن، نها یێ خرابەیە و کەس لێ ناژیتن، هەتا نها ژی شوینوار وبەرمایێن خانیا ل سەر رویێ ئەردی دیار و پێشچاڤن. خەلکێ جهوارێن گوندی هەمی مەسیحی بوون کارێ وان یێ سەرەکی چێکرنا کارۆکۆکێ کوردی بوو ئانکو بەرگیز[٨٣].

## گوندێ سیلەهیارێ:

سیلەهیارێ بدووراتیا نێزیکی کیلومەترەکی دکەڤیتە ژێریا سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ، دەربارەی ناڤێ سیلەهیارێ: سیلەهیارێ ناڤێ نەهالەکێ یە دکەڤیتە ژێریا فرۆکخانا بامەرنێ، ل دووڤ بیرهاتنێن دانعەمر و ریهسبیێن بامەرنیان دبێژن، هندی ل بیرامە دهێتن کو دبێژنە ڤێ نهالێ نهالا سیلەهیاری، کەسێن بەری مە بۆ مە چ پێزانین نەداینە خۆیاکرن کا ناڤێ سیلەهیارێ چ رامانا خۆیە.

### سنوورێن گوندی:

لایێ ژووری بامەرنێ، ژێری دەشتا سپنەیە، گوندێ ئەرەدنا و رۆژئاڤا دبیتە هەردو گوندێن کانیکا و شێخ مما.

دسالێن پێنجیان دا ئێك ژ جۆتیارێن بامرنێ بناڤێ (ئاڤدەل) مالا خۆ برە نهالەکێ ل ژێریێ فرۆکخانا بامرنێ دگۆتنێ (سیلەهیارێ) ژبەر کو ئەوی چاندن ل وێرێ دکر، دەخل ودان ل وێرێ دچاند، هندەك رەزێن تری و باخیڤا ل ویرێ هەبوون لەورا مالا خۆ برە وێرێ.

پشتی دەمەکی هەردو کورێن وی بوونە خودان مال و ژ بابێ خو جودابوون و هەر ئێکی بۆ خۆ خانیەك ئاڤاکر. بوونە سێ مال کارێ خۆیێ چاندنێ ل وێرێ دکر و هندەك تەرش و تەوال ل وێرێ بخۆدانکرن.

ل سالا (١٩٦٣)ێ دەمێ بامەرنێ ژ لایێ حکومەتا عیراقێ و چەتاڤە هاتییەسۆتن، خەلکێ بامەرنێ هەمی دەربەدەر بوون، هەر هندەك چوونە دەڤەرەکێ، چەند مالەك هاتنە سیلەهیارێ بوونە نێزیکی(٢٠) مالباتا، لەورا هاتەئاڤاکرن. بەلێ پشتی پیلانا جەزائیر سال (١٩٧٥)ێ رژێما بەعس ناڤێ وێ تەعریبکر و کرە (صلاحیة). چ مزگەفت و خواندنگەهـ لێ نەبوون. کانییەك لێ هەبوو دناڤ ئەردێ ئاڤدەلی و هندەك کانیێن کێم ئاڤێ لێ هەبوون[٨٤].

## گوندێ کەلا شخو:

گوندەکە سەر ب ناحیا بامەرنێ ڤەیە ژلایێ رۆژئاڤایڤە، رامانا ناڤێ گوندی ل دووڤ گۆتنا موختارێ گوندی: کەلا شخو ئانکو کەلا ئاقاری یان کەلا هنداڤی ئاقاری، شخو رامانا وێ ئاقار دهێنن، چونکە کەلە ل هنداڤی ئاقاری هاتییە ئاڤکرن، تخوبێن گوندێ کەلا شخوی بڤی رەنگینە. ژلایێ ژۆریڤە دبیتە گوندێ کانی بەلاڤێ، ژلایێ ژێریڤە دبیتە گوندێ وەرمێلێ، ژلایێ رۆژهەلاتی دبیتە گوندێ بابیرێ، ژلایێ رۆژئاڤای دبیتە گوندێ گەرەگوهێ. ژلایەکێ دیڤە گوندێ گەرەگوهێ نێزیکی ٢٠کم ژ سەنتەرێ ناحیا بامەرنێ دوورە.

### پێکهاتا خەلکێ کەلا شخو:

دکەڤندا خەلکێ گوندی ژ هەردو بوسلمان و جوهیان پێکدهات، هەتا نها ژی شوینوارێن کنیشتەکێ و مەزارگەهەکێ جوهییان ل ناڤەندا گوندی دیارن، ل دووڤ گۆتنا مختاری گوندی کو نیڤەکا ئەردێ گوندێ کەلا شخو، جوهی لێ دژیان و نیڤادی موسلمان لێ دژیان. بەلێ نها تنێ موسلمان لێ دژین، وەسا دیارە ل داوییا سالێن چلاندا

# ناحیا چەمانکێ

## کۆڤان ئیحسان یاسین

دەرازینك: ل دەستپێکا ڤێ ڤەکۆلینێ ئەم دێ ل سەر دو ئیدیەما راوستین، دبیت کو ژ لایێ جوگرافی و پێکهاتا خەلکی هەردو ئیدیەم ئێکبن، بەلێ ل سەر دەستودارەکێ رێڤەبرنێ ژێکڤەدبن، ئەو ژی (ناحیا چەمانکێ) و (دەڤەرا بەرواری ژێری) هەر چەندە دەڤەرا بەرواری ژێری پویچەکێ بەرفرەهترە، بەلێ ببوورینا دەمی ئەڤ ناڤە هاتینەگوهۆرین. چەمانکێ ناڤەندەکا رێڤەبرنێ یە، کو ل سالا (٢٠٠٠)ێ وەکی ناحیە ژ لایێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ هاتیە دامەزراندن، ل دەستپێکێ ژی (١٤١) خانی لێ هاتینە ئاڤاکرن، خەلکێ گوندێن رەخۆدۆرا لێ خرڤەبووینە، نها ژی هێدی هێدی یا وەرارێ دکەت، گەلەکا بەرفرەهـ بووی، زێدەباری کو خزمەتگوزاریێن پێدڤی ژی بۆ وەلاتییان هاتینە بەرهەڤکرن، مینا (خواندنگەهـ خەستە، بنکەهێ چاندنێ، باژێرڤانی، پۆلیس، رێڤەبەریا ناحیێ) دگەل چەند جهێن دی کو گرێدای بوورینا وەختی و وەرزشێ نە. بەلێ ئیدیەمێ (بەرواری ژێری) تنێ وەکی دەڤەرەکا جوگرافی کو گرێدای ئەشیرەتەکا کوردیە، پشکا مەزنا ڤێ ئەشیرەتێ ل رەخێ دی یێ چیایێ مەتینییە، کو دبێژنێ (بەرواری ژووری)، دکەڤن دا ژی ناڤەندا ڤێ دەڤەرێ ب (بەرواری ژێری) دهاتە نیاسین. ئانکو هەروەختێ ئیدیەمێ (بەرواری ژێری) دهات، رامانا وێ ئەو دەڤەرا بەردرهای و بەرفرەهـ بوو، کو رۆژئاڤایێ وێ ژ گوندێ (بەرئاشێ) دەست پێدکەت، داویا وێ ژی گوندێ (خەلیلانێ)یە، کو دکەڤیتە سەر ئاڤا رووبارێ خازری، ل وێرێ ناحیا چەمانکێ ژ دەڤەرا زێبارێ جوٚدا دکەت، ئانکو تخوببێ خۆرستی یێ قەزا ئامێدیێ دگەل قەزا ئاکرێ یە.

ئاریشا ڤەکۆلینێ: بێ خش، هەر کەسێ دەست ب ڤێ رەنگێ ڤەکۆلینێ ل سەر دەڤەرێن کوردستانێ بکەت، ل دەستپێکێ دێ کەڤیتە بەر ئاریشەکا مەزن ئەو ژی نەبوونا ژێدەرێن پێدڤی بۆ ڤان رەنگێن ڤەکۆلینا، بەلێ ئەڤە ئاریشا مە یا سەرێشك نەبوو کو ئەم بشێین ڤێ ڤەکۆلینێ ب رەنگەکێ باش بگەهینە بنەجهەکێ، بەلکی کۆمەکا مەزنا ئاریشان هەبوون، کو رێگر بوون مرۆڤ ڤێ ڤەکۆلینێ پێ بنەجهـ کەت، ئاریشە ژی ئەڤێن ل خوارێنە:

١- نەبوونا ژێدەرێن پێدڤی بۆ ڤەکۆلینێ، هەتا تخوبیەکی کو چ گوندا ژ گوندێن ڤێ ناحیێ (نڤشتۆك، کتێب) ب خۆڤە نەچێکرینە، هەر چەندە هندەك پێنگاڤێن شەرمین ل ڤێرێ و وێراهەنێ هاتینە هاڤێتن، بەلێ باهرا پتر ژ وان پێزانینێن سەرڤە سەرڤەنە کو ب دروستاهی مرۆڤ نەشێت مفای ژێ وەرگریت.

٢- ناحیا چەمانکێ ب خۆ ژی ناحیەکا نوی یە و ل

سالا (٢٠٠٠)ێ هاتییە دامەزراندن، بەری وی وەختی یا چۆلكری بوو، پاشی هندەك وەختا دزڤرینەڤە، مینا قۆناغا پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ، رێك بۆ خەلكی خۆشكر دا ڤەگەرنە سەر ملك و مالێ خۆ، پاشی هەتا سالا (١٩٩١)ێ جارەكا دی چۆلكرەڤە، ژبەر ڤێ چەندێ خەلكی ئەو بێهنە نەهەلكێشایە كو پویتەی ب دیرۆك و ئاڤەدانییا خۆ بدەت.

٣- پتریا گوندێن ڤێ ناحیێ د بەردراینە، بۆ میناك ژ ژمارا (٤٨) گوند و (٢٠) كەرت و ئاقارێن چاندنێ تنێ (١٢) گوند د جهوارن، خەلك لێ دژیت، ئەڤ چەندە ژی رێگرێ ژ هەمییا مەزنتر بوو بۆ هەر ڤەكۆلەرەكی كو بشێت ب سەر دیرۆكا وان گوندا هەلببیت، ژبلی ڤێ چەندێ ژی دەڤەر ب خۆ ژی گەلەكا بەرفرهەیە، و گەلەك ژ وان گوندا هێشتا جادە نەگەهشتیێ، پێدڤی بوو مرۆڤ پتر لێ گەریا با، هەتا كەسەك یان دانعەمرەك ددیت و هندەك پێزانین ژێ وەردگرتن.

## دەڤەرا (بەرواری ژێری) د ژێدەرێن دیرۆكێ دا:

هەر چەندە هەتا نها چ ڤەكۆلینێن ئەكادمی و زانستی ل ڤێ دەڤەرێ نەهاتینە كرن، كو ب رێكا وان ڤەكۆلەر بشێن سەمتا دیرۆكەكا تێرو تژی ل سەر ڤێ دەڤەرێ دارێژن، بەلێ هندەك ئاڤرێ ل ڤێرێ و وێراهەنێ هەنە. بۆ میناك جارەكێ د شەرەفنامێ دا ناڤێ (بەرواریا) ئینایە، شەرەفخان بەحسێ وان ئەشیرەتێن ناڤدارێن كورد دكەت، دبێژیت: كو ئێك ژێ ئەشیرەتا (بەرواری)نە [1]. عەلی سەیدوێ گەورانی ل رۆژا (٦ تەباخا ١٩٣١)ێ گەهشتییە ئامێدیێ، قائمقامێ ئامێدیێ (ماجد بەگێ) چەند پێزانینەك

دیمەنك ژ سروشتێ دەڤەرا جەمانكێ



ل سەر دەڤەرا بەرواری ژێری داینێ، دبێژیت: ل رەخێ ژووری چیایێ گارەیە، ل ژێریێ وێ ژی دەڤەرا مزووریا و چیایێ خێرانە (مەرەم ئەو چیایەیە یێ گەلەك خێر و خێرات تێدا هەین)، زێیێ مەزن و دەڤەرا زێباریا دكەڤنە رەخێ رۆژهەلاتێ وێ، رۆژئاڤایێ وێ ژی دەڤەرا دۆسكییایە. رێلێن (غابات) هەمبز یێ بسەر ڤێ دەڤەرێ دا گرتین، نەخاسمە چیایێ گارەی، ژبەركو ژمارەكا مەزنا دارێن بەڕوی و مازیا لێ هەنە، دارا كازێ ژی ل گوندێ (كانیكا) ل رەخۆدۆرێن ئەتریشێ هەنە، رووبارێ خازری ژی دناڤ دەڤەرێ ڕا دچیت، ئەڤ دەڤەرە ب ناڤێ وێ ئەشیرەتێ هاتیە ناڤكرن، ئەوا لێ دژین، كو مرۆڤێن ئورستوكراتینە، دەستەلاتەكا مەزن یا ل سەر كەسێن ئەشیرەتا خۆ هەی[2].

نڤیسەڤان (عەباس عەزاوی) وەختێ بەحسێ ئەشیرەتێن بەهدینان دكەت، ب ڤی رەنگی ئاڤرێ د دەتە دەڤەرا بەرواری ژێری: نها ناحیەكا مەزنە ژ (٨٠)ێ گوندێن ئاڤەدان پێكدهێت، ل وەختێ دەولەتا ئۆسمانی وان رێڤبەرەكێ فەخری هەبوو، ناڤێ وی (حسێن ئاغا) بوو، كو خەلكێ گوندێ بەرئاشێ بوو. چیایێ گارەی ڤێ ناحیێ ژ ئامێدیێ جۆدا دكەت[3]. پاشی ناڤێ چەند گوندێن وێ دەڤەرێ ئینایە، ئەو ژی (بەرئاشێ، ستوكوركێ[4]، خرابیا، سیارێ[5]، سپینداری، مێزێ، ئاڤۆكێ، چەمانكێ، بارەمینكێ، كارەبا، بێبادێ، كانی مازێ[6]، شكەفتێ، بێركیاتێ، شلیا، ئەشكیرانێ، ملبركێ، گەڤەركێ)[7]. زێدەباری چەند گوندێن دی كو بەحسێ وان نەكرییە، وەكی مەرانێ و مصانێ و سێدەرا و موسەلەكا و ملكێبێ.

عەلی سەیدو دیاردكەت كو (٧٣)ێ گوند سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەنە[8]، دیسان دیاردكەت كو ل وی وەختی (٩٢٠٠) كەس دناڤ ڤێ ناحیێ دا دژین[9]. ڤێ عەشیرەتێ چ گرێدان ب عەشیرەتێن دی ڤە نینە، ل دووڤ گۆتنا (عەزاوی) وی وەختی (میرخان ئاغا كورێ حاجی صادق ئاغای) سەرۆكێ وێ ئەشیرەتێ بوو، بەلێ بەری وی سەرۆكاتییا ئەشیرەتێ دناڤبەرا (حسێن ئاغایێ بەرئاشی) و كورێت وی دا یا پاوانكری بوو[10].

ل سالا (١٣١٤مـش)ێ ئامێدیێ بوو پشكەك ژ ویلایەتا مووسلێ، دەڤەرا بەرواری ژێری ژی ئێكسەر ب ونڤە هاتە گرێدان، وی وەختی ژی ژ (٤٠) گوندا پێكدهات[11].

دیارە كو خواندنگەها ئێكێ ل ڤێ دەڤەرێ هاتییە دانان، (خواندنگەها رەبەتكێ) بوو، كو سولتان (حەسەنێ بەهدینی ٨٧٥-٩٤٠مش/-١٤٧٠ ١٥٣٣ز)ێ ئەڤ خواندنگەهە لێ ئاڤا كربوو[12]. سێ كتێب یێن لێ هاتینە كۆپیكرن ئەو ژی (رسالة فی اداب البحث) كو ب دەستێ (محەمەدێ كورێ عەلیێ بەرواری) ل سالا (١١٥٦مش/١٧٤٣ز)ێ هاتییە كۆپیكرن، یا دووێ (رسالة فی الهیئة یا جەغمینی) كو ب دەستێ (عەلی كورێ ئەحمەدی) ل سالا (١٢٢١مش/ ١٨٠٦ز)ێ هاتییە كۆپیكرن، یا سیێ ژی كو د بیاڤێ فقهێ دا بوون، ل سالا (١٢٨٦مش/ ١٨٦٩ز)ێ ل ڤی گوندی هاتینە كۆپیكرن[13].

وەكی مە ئاڤری پێ دای، كو چ ژێدەرێن سەرێشك نینن كو ئەم دیرۆكا وێ دەڤەرێ ل سەر دارێژین، هەژییە بزانین كو ئیسلامەتی ل سالا (٢٠مـش/٦٤١ز)ێ گەهشتییە دەڤەرا چیایێ گارەی، ژوان دەڤەرا ژی دەڤەرا بەرواری ژێرییە ئەوا ئەم نها ڤەكۆلینێ ل سەر دكەین، كو ل سەر دەستێ سەركردێ لەشكەری موسلمانا (عەتبەیێ كورێ فرقدێ سلمی) ئەڤ دەڤەرە هاتینە گرتن، هەر چەندە ل دووڤ ژێدەران دەڤەرا چیایێ گارەی پشكەكە ژ هەرێما داسنی[14].

بەری سالا (١٠٠٠مش/١٥٩٢ز)ێ ئاغایێن گوندێ (بارەمینكێ) ژ دەڤەرا پنیانشێ ژ باكوورێ كوردستانێ بەر ب دەڤەرا بەرواری بالاڤە هاتن، ل كەلا قومریێ جهواربوون. پاشی بەر ب دەڤەرا بەرواری ژێریڤە هاتن، دبیت ئەڤ مشەختبوونە ل چەرخێ یازدێ مشەختی بەرامبەری هەڤدێ زایینی بیت. گرانیا وان یا لەشكەری ترس ل دەڤ میرێن بەهدینان چێكر، ژبەر ڤێ چەندێ (ئیسماعیل پاشایێ ئێكێ ١١٨٢-١٢١٣مش/ -١٧٦٨ ١٧٩٨ز)ێ ل داوییا سالا دەستەلاتا خۆ هێرشەك برەسەر، سەركردێ وان (عەبدولرەحیم ئاغا) ئەوێ ل كەلا قومریێ (هرورێ) دووربێچكر، پاشی

چوو دناڤ کەلایێ دا و (عەبدولرەحیم) کوشت. تاگر و ئەشیرەتا وی ئینانە دەڤەرا ئامێدیێ، ل ئامێدیێ و گوندێن رەخۆدۆرا ئاکنجیکرن، دیسان قەسرەك بۆ (عەبدوللا ئاغای) ئاڤاکر، بەلێ دیار بوو (عەبدوللا ئاغای) تۆلا خۆ ژبیر نەکربوو، ڤێ چەندێ (زوبێر پاشا کورێ محەمەد تەیار پاشای ١٢٢٣-١٢٤٠مش/ ١٨٠٨-١٨٢٥ز)ێ پالدا کو وی ژی بکوژیت، پاشی کورێن وی (عەبدولرحمان ئاغایێ دووێ و میرخان ئاغایێ ئێکێ) رازیکرن کو بچنە دەڤەرا بەرواری ژێری. ل وێرێ (عەبدولرحمان ئاغای) مەزناتییا ئەشیرەتێ دکر، هەتا سالا (١٢٤٧مش/ ١٨٣٠ز)ێ. پاشی میرخان ئاغای هەتا سالا (١٢٨٧مش/١٨٧٠ز)ێ دەستهەلاتا ئەشیرەتا خۆ دکر[١٥].

ژبەرکو خەلکێ ڤی دەڤەرێ شەرڤانێن باش بوون، ساخلەمییەکا باش هەبوو، گەلەك درێژ بوون، میرێن ئامێدیێ وەکی زێرەڤانێن خۆ هەلبژارتن، نەخاسمە د وان شەرا دا ئەوێن ب دژی تیاریا دکرن[١٦].

پشتی ب سەرکردایەتییا (ئیسماعیل پاشای) لەشکەرێ میرگەها بەهدینان ل شەرێ شێخکانێ شکەستی، ئیسماعیل پاشا بەر ب ڤێ دەڤەرێڤە رەڤی، ل دووڤ ژێدەرا (ئیسماعیل پاشا) ل سالا (١٨٤٢ز)ێ قەستا گوندێ ئاڤۆکێ ل دەڤەرا بەرواری ژێریێ دکەت[١٧]. دەمێ هێزێن ئنگلیزا ل سالا (١٩١٩ز)ێ دەڤەر گرتی، خەلکێ دەڤەرا بەهدینان ب دژی وان راوەستان، کۆمەکا سەرهەلدان و شەڕا ب دژی ئنگلیزا کرن، خەلکێ دەڤەرا بەرواری ژێری ژی باهرا خۆ د وان کاودانا دا هەبوو، ل شەڕێ سیارەتویکا کو ئەشیرەتێن دەڤەرێ هێرش کر بوو سەر ئنگلیزا، خەلکێ ڤێ دەڤەرێ ژ رەخێ رۆژهەلاتیڤە هێرش کربوو سەر لەشکەرگەها وان ل سیارەتویکا[١٨].

ل داوییا سەردەمێ ئۆسمانییان (١٨٧٦-١٩١٤ز)ێ لیژنەك ل دەڤەرێ هەبوو، کو خویك ژ خەلکی وەردگرت، کو بەرپرس بوون ژ وەرگرتنا خویکا دەڤەرا بەرواری ژێری، ئەو ژی:

١- محەمەد نوری ئەفەندی، خویك دنڤیسی.

٢- محەمەد سالح ئەفەندی، وەرگرێ خویکێ بوو.

٣- سەعید ئەفەندی، وەرگرێ خویکێ بوو.

ئەڤ هەر سێ کەسە وەکی رێڤەبەرێن دارایی ل دەڤەرا بەرواری ژێری دهاتنە ژمارتن[١٩].

ل سالا (١٨٩٢ و ١٨٩٤ز)ێ رێڤەبەرێ ناحیا بەرواری ژێری (حسێن ئاغا) بوو[٢٠]. بەلێ ل سالا (١٩١٢)ێ (سەعید وەهبی ئەفەندی) بۆ رێڤەبەرێ ناحیێ، کاتبێ ناحیێ (ئەحمەد حەمدی ئەفەندی) بوو[٢١].

## جوگرافیا خۆرستیا دەڤەرا بەرواری ژێری

دەڤەرا بەرواری ژێری دکەڤیتە رەخێ ژووریێ رۆژهەلاتێ باژێرێ دهۆکێ، دیسان دکەڤیتە رەخێ ژێریێ چیایێ گارەی، ژێریێ کڤانا پەحن (٣٧ نمرە)، رۆژهەلاتێ هێلا درێژ (٤٣ نمرە)، ئەڤ هێلێن درێژ و کڤانێن پەحن بەرپرسن ژ دیارکرنا سەخلەتێن سەقای بگرە ژ درێژی و کورتییا رۆژ و شەڤا، ژبلی دیارکرنا وێ ل سەر نەخشێن فەلەکی و دیارکرنا وەختی[٢٢].

ئەم دشێین دەڤەرا بەرواری ژێری ژ لایێ جوگرافیڤە پشك بکەینە سەر چەند کەرتێن جودا، ئانکو ژ چوار پشکا پێکدهێت، ئەو ژی:

١- دەڤەرا سیارێ و سپیندارێ، کو دکەڤیتە رەخێ رۆژئاڤایێ جهێ ئەشیرەتێ، ژ گوندێن بەرنیاسێن ڤێ دەڤەرێ (سیارێ و سپیندارێ و بەرئاشێ و غەلبۆکێ و خرابیا و ستوکورکێ و بهێری و رەشانکێ و سپیاڤێ).

٢- دەڤەرا رووباری ئەو دەڤەرەیە ئەوا دکەڤیتە نیڤەکا ئەشیرەتێ، ژ گوندێن ناڤدارێن ڤێ دەڤەرێ (چەلۆکێ و بابباکێ و مێزێ و بارەمینکێ و چەمانکێ و کانی مازێ و دێرکێ و شکەفتێ و مسەلەکا و بلمباسێ و بێبادێ).

٣- دەڤەرا بەرۆژی دکەڤیتە رەخێ ژێری یێ ئەشیرەتێ، ژ گوندێن بەرنیاس ل ڤێ دەڤەرێ (کانیکا و ملبرکێ و شلیا و ئەشکیرانێ و بێرکیاتێ و گەڤەرکێ و رەبەتکێ).

٤- دەڤەرا نەهلێ ئەوا دکەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتێ ژ چوارچۆڤێ ئەشیرەتێ، ژ گوندێن ناڤدار (سیانێ و ئەرگنێ و دێویکێ و چەم ربەتێ و بیلمەندێ و هیزانکێ و چەمچالا و چەم شرتێ)[23].

## جهێ جوگرافی

کۆمەکا گوندێن دەڤەرا بەرواری ژێری دکەڤنە سەر تخوبێ قەزا ئامێدیێ، ژ وان ژی گوندێن چەم شرتێ و بلمبێسکێ و هیزانکێ و ژولێ و خەلیلان و بیلمەندێ. بەلێ تخوبێن رەخێ ژێری ژ گوندێ کوراڤا دەست پێدکەن و بەر ب رۆژئاڤایڤە دچن، نەخاسمە بەر ب گوندێ بێریشکێ و چەم رەبەتێ و خالتا و مسەلەکا و سوینێ دچیت. دیسان ناحیا چەمانکێ دبیتە تخوبێ خۆرستێ قەزا ئامێدیێ دگەل قەزا شێخان و ئاکرێ، بەلێ سنوورێن رەخێ ژێرێ رۆژئاڤای گوندێن ملبرکێ و کەڤەرکێ ڤەدگرن، گوندێن سپیاڤا ژووری و بەرئاشێ دبنە تخوبێن وێ دگەل ناحیا سەرسنکێ ژ رەخێ رۆژئاڤایێ قەزا ئامێدیێڤە.

## بەروبیاڤێ دەڤەرا بەرواری ژێری

بەروبیاڤێ ناحیا چەمانکێ (٤٤٢،٤ کم٢) ئانکو رێژا (١٦،٢٥٪) ژ ئەردێ قەزا ئامێدیێ پێکدئینیت، درێژاهییا هەر رەخەکێ ڤێ ناحیێ نێزیکی (٣٥کم) ئەڤە رەخێن ژێری و ژووری، بەلێ رەخێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤای تنێ (١٢کم) د درێژن. ب رەنگەکێ تەڤای رەخێ رۆژهەلاتێ وێ دبیتە ئەشیرەتا زێباریا و رووبارێ خازری، ژ لایێ رۆژئاڤایڤە هەڤسنووره دگەل ئەشیرەتا دۆسکیا، ژلایێ ژووریڤە چیایێ گارەیە، ژلایێ ژێریڤە چیایێ خێرێ و ئەشیرەتا مزووریایە[24].

## ناحیا چەمانکێ

ناحیا چەمانکێ ئێکە ژ ناحیێن قەزا ئامێدیێ و دکەڤیتە ناڤ دەڤەرا بەرواری ژێریا، ب دووراتییا (٥٠) کیلومەترا ژ بازێرێ دهۆکێ و (٦٥-٦٨کم) ژقەزا ئامێدیێ یا دوورە. گوندێن رەخۆدۆرێن سەنتەرێ ناحیێ ژلایێ رۆژهەلاتیڤە گوندێ کانیمازێ و بارەمینکێ نە، ل رۆژئاڤا گوندێ مێزێیە، ل رەخێ ژووری سیارێ و سپیندارێ و ل ژێرێ گوندێ کەڤەرکێ و بارەمینکێ نە. ژلایێ سنوورێن ئیداریڤە رۆژهەلاتا ناحیا چەمانکێ ناحیا دینارتە یا سەر ب قەزا ئاکرێڤە و ل ژوورێ رۆژهەلاتی هەڤتخوبە دگەل ناحیا دێرەلوکێ، ل ژوورێ ناڤەراستا سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ یە، ل ژوورێ رۆژئاڤا هەڤتخوبە دگەل ناحیا سەرسنکێ، ل ژێرێ رۆژهەلاتی سنوورێن وێ دگەل ناحیا قەسروکێ یا سەر بقەزا شێخانڤەنە، ل رەخێ ژێری ناحیا ئەتریشا سەر بقەزا شێخان ڤەیە، ل رەخێ ژێرێ رۆژئاڤا هەڤسنووره دگەل ناحیا زاویتە یا قەزا دهوکێ[25].

ئەڤ ناحیە ژ ناحیێن نوویە، کو ژلایێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێڤە هاتیە دامەزراندن، ل دووڤ فەرمانا کارگێری یا ژمار (١١٨٢) ل (٢٠٠٠/٢/١٩)ێ بۆ جارا ئێکێ وەکی ناحیە دەست بکاربوویە[26].

ژلایێ ئیداریڤە ناحیا چەمانکێ (٤٢) گوند و (٢١) کەرتێن (مقاطعة) چاندنێ ڤەدگریت، (١٠) گوند دئاڤانە وخەلکێ لێ جهوارە، (٣٢) گوندێن دی دبەردانە، ژمارا خانیێن ڤان گوندا دگەل یێن سەنتەرێ ناحیێ (٥١٧) خانینە، بەردەوام ئاڤاهی لێ دهێنە ئاڤاکرن و بەر ب زێدەبوونێ دچن، ژمارا جهوارێن ناحیێ (٤٥٦٧) کەسن، ل سەر (٥١٧) مالباتان پشکدبن، ل سەنتەرێ ناحیا چەمانکێ (٢٤٦) خانی هەنە وژمارا جهوارا (١٢٧٣) کەسن کو ل سەر (٢٢١) مالباتان بەلاڤدبن و ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ ژمارا خەلکێ ناحیێ ٥٨٦٧ کەسن، ژ وانان ٣٢٦٦ کەس ل بازێرکان دژین و ٢٦٠١ ل گوندان دژین.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ ناحیێ جودا جودانە، وەك چاندن و خودانکرنا تەرش و کەوالی و بازرگانی و مۆچە و شۆلێن تایبەت وەك (پالەتی و......هتد).

خواندنگەها چەمانکێ پشتی بەیاننامێ (١١) ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ هاتیە ڤەکرن و نها (٦) خواندنگەهـ ل ناحیا چەمانکێ هەنە[27]، (٤) ژ وان د بنەرەتینە، کو ئێك ژوان ب زمانێ سریانی لێ دهێتە خواندن کو

دکەڤیتە گوندێ هیزانکا خارێ، (٢) خواندنگەهێن دواناڤنجی ل ڤێ ناحیێ هەنە، ئێك دکەڤیتە گوندێ سپینداری، ئەوا دی ژی دکەڤیتە ناڤەندا ناحیێ ب خۆ[٢٨].

چەند سەرژمێریێن ناحیا چەمانکێ دەڤەرا بەرواری ژێری[٢٩] کو ژلایێ رێکخراوا وەرارڤە ل سالا (٢٠١٠) هاتبوونە بەرهەڤکرن: هژمارا گوندا (٤٨) ژ وان تنێ (٩) د ئاڤەدانن و (٣٩) د بەردانە. (٦٠٤) خانی و (٤٩٠) مالبات (٢٤٥٠) کەس لێ دژین (٥) فەرمانگەهێن میری و (٣٠) فەرمانبەر لێ هەنە ژ وان (٢٧) د نێرن و (٣) مێ نە.

چەمانکێ (١٩٣) مالبات و سپینداری (٩٠) مالبات و بەرئاشێ (٤٠) مالبات و چەم رەبەتکێ (١٨) مالبات و مێرۆکێ (١٦) مالبات و بێریشکێ (٣) مالبات و بیلمەندا (٥٧) مالبات هیزانکا ژووری (٢٨) مالبات و خەلیلانێ (٢٥) مالبات و ژۆلێ (٢٠) مالبات لێ دژین.

چەند جهەکێن شوینواری و گەشتوگۆزاری ل ڤێ دەڤەرێ هەنە، مینا: گەلیێ ئاڤوکێ، دوکەرێ، گەلیێ کانی مازێ کو دکەڤنە رەخودۆرێن چەمانکێ. دیساڤە لگوندێ سپینداری هەر ئێك ژ شکەفتا محەمەد نەبی و گرێ شاباتێ و ناعوسك و سەرئاشێ وەکی جهێن گەشتوگۆزاری و شوینواری دهێنە هژمارتن. ل بەرئاشێ ژی گۆرستانا کەڤن و نەعوسك و شیڤا گەرێ هەنە. شکەفتا رەبەنۆك و گەلیێ مێرۆکێ ل گوندێ چەم رەبەتکێ هەنە. شکەفتا مێرکا و رووباری مێرۆکێ ل گوندێ مێرۆکێ هەنە، ل گوندێ بیلمەندا ژی دوکەرا گوندی هەیە کو جهەکێ گەشتوگۆزارییە. ل گوندێ هیزانکا ژووری گەلێ دوپرێ و ل گوندێ خلیلانێ گەلیێ هەرژیلێ هەیە.

ژ هەژیە بێژین کو (٦) پر ل ڤێ دەڤەرێ هەنە، ئێك دکەڤیتە گوندێ سپینداری و ئێك ژی دکەڤیتە گوندێ چەم رەبەتکێ و دو ژی دکەڤنە گوندێ بیلمەندا و ئێك ل گوندێ ژۆلێ و ئێك ژی ل خلیلانێ[٣٠].

دیمەنەکێ ژ سرۆشتێ دەڤەرا چەمانکێ



## گوندێن ناحیا چەمانكێ:

### گوندێ سەڤرا رۆژهەلاتێ:

هەر چەندە مە گەلەك دویڤچوونا ناڤێ ڤی گوندی كر، بەلێ ئەم نەگەهشتینە سەر چ بنەجهێن راست، هندەك وەسا شرۆڤەدكەن كو ناڤێ وێ ژ شۆرش یان ژ پەیڤا (ثورة) یا عەرەبی هاتبیت[31]. بەلێ ئەم دبینین ئەڤە بۆچوونەكا نەبەرئاقلە، هەژیە بێژین كو ناڤەكێ دی ب ڤی رەنگی ل دەڤەرا بارزان هەیە، بەلێ بنیاتێ ڤی ناڤی یێ دیار نینە، هەر چەندە هندەك ناڤێن نێزیكی وێ هەنە، بۆ میناك (سڤێر) كو گیایەكە د ناڤ دەخلودانی دا شوین دبیت، كنجركەكا ب زیانە، تنێ ژ لایێ گۆتنێڤە ئەڤ ناڤە یێ نێزیكی سەڤرێیە.

#### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** هەڤسنوورە دگەل دەڤەرا بەرێكارێ.

**باشووری:** گوندێ مێریكێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دێركێ و ئەرگنێ و سیانێ و چەمچالێ.

**رۆژئاڤایی:** سەڤرا رۆژئاڤا و گوندێ سێدەرا[32].

هەتا نها جادە نەگەهشتییە ڤی گوندی، بەلێ كۆمپانیەكا پترۆلێ رێكەكا چێكری و ل نێزیكی ڤی گوندی دبووریت، ئانكو یا گەهاندییە دەڤەرا (وارێت میرا) كو ل نێزیكی ڤی گوندییە. كۆمەكا ژێدەرێن ئاڤێ ل ئەڤی گوندی هەنە، كانییا سەرپشك ژی (كانییا مەگریكۆ)یە، زێدەباری كانیكا گەراڤێ ل ژوورێ گوندی و كانیكا بەكرانێ ل رەخێ رۆژئاڤایێ گوندی.

كۆمەكا جهێن شوینواری ل ئەڤی گوندی هەنە، هندەك ژ وان گرێدای بیروباوەرانە، هندەك ژی جهێن شوینوارینە، وەكی مشایخێ مەگریكۆی، سەید خدر زیندە، زێدەباری كو چوار ناوسك ل مەگریكۆ هەنە، هەر ناوسكەك ژ ژوورەكێ پێكدهات و دەرگەهێن وان دكەڤنە رەخێ رۆژهەلاتی، زێدەباری دو شكەفتا كو دكەڤنە رەخێ گەلیێ گراڤیێ[33]. مزگەفتا ڤی گوندی كاڤلە، هندەك ژ شوینوارێن وێ ماینە، كو ژ ژوورەكێ پێكدهێنت، دو پەنجەرك لێ هەبوون، ئێك ل رەخێ ژێری، ئەوا دی ل رەخێ رۆژئاڤایی، دەرگەهێ وێ ژی ل رەخێ رۆژهەلاتی بوو.

ل سالا (1961)ێ ژ بەر كاودانێن شۆرشێ گوند هاتییەبەردان، پاشی ل سالا (1970)ێ خەلك ڤەگەریا سەر وارێ خۆ، بەری سالا (1988)ێ نێزیكی (10) مالباتان لێ د جهوار بوون، پاشی جارەكا دی ل وێ سالێ هاتە بەردان، پشتی سەرهلدانا (1991)ێ گوند هاتەڤە ئاڤاكرن، بەلێ ل سالا (1995)ێ گوند هاتە بەردان و نها ژی كەس لێ ناژیت[34].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (9054) دۆنەمێن ئەردینە، (140) دۆنەمێن وان دێمن، (2300) دۆنەم بۆ چەروانا كەوالا دهێنە بكارئینان، (5850) دۆنەم وەكی رێل دهێتە هژمارتن[35].

### گوندێ ئەرگنێ

ئەرگن ناڤێ كەڤنە دێرەكێیە، بەلێ ئەم نزانین ناڤێ وێ ژ چ هاتییە.

#### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** هەڤتخوبە دگەل دەڤەرا بەرگارێ.

**باشووری:** گوندێ دهیكێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سیانێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەڤرێ.

ژێدەرێن ئاڤێ پتر كانینە، وەكی (كانییا شیڤ زەیتینكێ، زەڤیێت ڤەلێ، كانی جۆیا_كو ب جوهیاڤە یا گرێدایە).

چەند جهەكێن بەرچاڤ ل ڤی گوندی هەنە، وەكی شوینوارێن كەلا ئەرگنێ كو هەتا نها ژی شویرهێن وێ دیارن، زێدەباری (مشایخێ شێخ تاهری) كو خەلەكا (كەلەك) بەرا ل رەخۆدۆرێن وییە[36]. زێدەباری شكەفتا كولكێ رابی و شكەفتا گەلی[37].

دكتێبا (المعجم التاریخی لامارة بهدینان) دا هاتییە: ئەرگن گوندەكە دكەڤیتە سەر باسكێن

رووبارێ خازری، دناڤبەرا دەڤەرا بەرواری ژێری و زێبارێ دا، ل رەخێ ژێرینێ رۆژئاڤایێ گوندێ كارایە، فەلە لێ بوون، كەنیسەك ژی هەبوو، ل سالا (١٨٤٢ز)ێ ژمارا وان بوو (١٠) مالبات بوو. سولتان (حسێنێ وەلی) خویك ژێ وەردگرت، ژمارا وان (دەهـ قوریش و پێنج بەغدادی) بوون، ئەڤ خویكە كربوو وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان[٣٨].

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧) (٧٩) كەس ل ڤی گوندی دژیان[٣٩]. ل سالا (١٩٦١ و ١٩٧٥)ێ گوند هاتییە بەردان، بەری سالا (١٩٨٨ز)ێ دناڤبەرا (٦-٧) مالباتان لێ دژیان، بەلێ نها گوند یێ چۆل و بەردایە. مزگەفت و خواندنگەهـ و جادە و چ خزمەتەك هەتا نها نەگەهشتییێ.

ئەردێ ڤی گوندی (٦٠٢٤) دۆنەمن، (٣٩٥٩)دۆنەم وەكی رێل دهێنە ژمارتن، (١٢٠٠) دۆنەم ژی چەروانگەهن، (٩) دۆنەم بستانێن ئاڤینە، (٥٨) دۆنەم بیستانێن دیمن[٤٠].

## گوندێ دێویكێ

چ ژێدەرێن دروست ل بەر دەستێ مە نینن كو ناڤێ ڤی گوندی پێ شرۆڤە بكەین. بەلێ نەدوورە گرێدانەك ب دوورگەهێ ڤە هەبیت، كو وەكی هندەك كەلاپێن بچویك بۆ زێرەڤانییێ دهاتنە ئاڤاكرن، زێدەباری وەرگرتنا خویك و خەراجا ژ خەلكی. كۆمەكا كانییان ئاڤێ بۆ ڤی گوندی بەرهەڤ دكەن، وەكی (كانییا دروە، كانییا پشتا گوندی، كانییا بەرێ گوندی، كانییا ئاڤا تەزی).

دو كەڤنە دێر لێ هەنە، ئێكێ ژ وان دبێژنێ (بیتشمونێ)، ئەم ب دوور نابینین كو ناڤێ ڤێ دێرێ ب چێرۆكا (تشمونێ)ڤە یا گرێدای بیت، كو حەفت عەیالێن وێ ل سەر دەستێ مەجووسا هاتبوونە كوشتن، هەتا نها ژی دێرەك ل نیڤەكا ئەرەدنا فەلا هەیە دبێژنێ (دێرا مارتشمونێ) نە دوورە پێكڤە گرێدانەك هەبیت.

ناڤێ ڤی گوندی د (شەجەرا زێوكی) ئەوا گرێدای مالباتان میرێن ئامێدیێ دا یا هاتی، تێدا دبێژیت: شێخ عەبدورەحمان ئەوێ دبێژنێ مام شێخ و ئەبو بەكر كورێن شێخ عەلی كورێ شێخ یەحیایی كورێ شێخ عەلی كو دویندەها وان نەمایە، شێخ زەینلعابدین و شێخ حەجی و شێخ عەلی كورێن شێخ محەمەدی، زانایێ دیندار و شیرەتڤانێ ب روومەت، ژ كەرەما خۆ وی ل گوندێ خۆ مێڤانداریەك چێكر، ئەم گازی كرینە گوندێ خۆ ئەوێ دبێژنێ دێویكێ، بەراز ژ زەڤی و بیستانێن وان دەركەڤتن و ب هیڤیا خۆدێڤە هاتنە ئاڤدان[٤١].

د دەهەمەنێ بەرپەرێ (٦٧)ێ كتێبا (شەجەرا زێوكی) دیارە (د.عماد عبدالسلام) دروست ب سەر ناڤێ ڤی گوندی هەلنەبوویە، دبێژیت: ئەز نزانم ئەڤ گوندە ل كیڤەیە، بەلێ ناڤێ وێ یێ نێزیكی (دیرویكێ)یە كو گوندەكە دكەڤیتە ناحیا سندیا ل قەزا زاخۆ، بزاڤێ دكەت كو ناڤێ وێ ب پەیڤا (دوورگەهـ)ڤە گرێدەت[٤٢]. هەژییە بێژین كو (دێویكەكا) دی ل ناڤ زێباریا هەیە، دكەڤیتە سەر رووبارێ زێێ مەزن.

ناڤێ ڤی گوندی ب (دێریك) د وەقفێن سولتان حسێنێ وەلی دا هاتییە، كو دكەڤیتە رەخێ ژێرینێ رۆژهەلاتێ باژێرێ ئامێدیێ، دناڤبەینا گوندێن (سیان و ئەرگنا). سولتان حسێنی حەفت قرویش و چوارێكەك وەكی خویك ل سەر وان سەپاندن، دا كو بكەتە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان[٤٣].

ئەڤ گوندە وەكی هەمی گوندا سێ جاران هاتییە بەردان و وێرانكرن، ل سالێن (١٩٦١،١٩٨٨- و ١٩٩٥ز)ێ. بەلێ دەم بۆ دەم دهاتە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٤] و بەری سالا (١٩٨٨ز) پێنج مالبات لێ دژیان، نها گوند یێ بەردایە.

بەروبیاڤێ گوندێ دێویكێ (٢١٨٠)دۆنەمن، (٣٠) دۆنەم بیستانێن ئاڤینە، (٢٩٠) دۆنەم ژی ئەردێ دێمە[٤٥].

## گوندێ سیارێ

سیارێ ل ناڤ عەشیرەتا بەرواری ژێری دكەڤیتە ژێرینێ سەرسنكێ ل لایێ دی یێ چیایێ گارەی و مەزنترین گوندبوو ل ناڤ عەشیرەتا بەرواری ژێری دا.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** چیایێ گارەی و سەرسنکێ.

**باشووری:** گوندێ نسرا و رەبەتکێ نە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چەمانکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سپینداری.

هەژی گۆتنێیە کو باراپتری ژخەلکی گوندی ب سیارێ ناڤ دکەن بەلێ یا دورست ئەوە بێژنێ سوارێ، ناڤێ سوارێ بێ هاتی کو گوندێ کەڤن ل جهەك بلند و سوار هاتبوو دانان لەوا ئەڤ ناڤە هات سەر، ئانکو ناڤێ وێ ژ جوگرافییا جهی هاتییە وەرگرتن.

گوندێ سیارێ ل دەمێ ئوسمانییا بنکەهەکێ ئیداری بوو و دووڤ دا ل دەمێ حوکمەتا عیراقێ ژی ناحیە بوو هەتا سالێن سیهێ و شوینوارێن قشلا سیارێ یان کو بنکێ حوکمەتێ و دوختورخانە هەتا سالێن شیستێ ژی ل گوندی مابوون[٤٦].

عەلی سەیدوێ گەورانی سالۆخا گوندێ سیارێ دکەت، دبێژیت: ئێکە ژ مەزنە گوندێن ناحیا بەرواری ژێری، (٩٨) خانی یێن لێ هەین، زێدەباری مەخفەرەکا پۆلیسا کو حکۆمەتێ ل وێرێ دانایە[٤٧]. خەلکێ ڤێ دەڤەرێ تری و مێویژ و توێتنێ دگەل دەڤەرێن دیتر ب دەخل و برنجا د گوهۆرن[٤٨]. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ژی ٧٧٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٩].

خواندنگەها ئێکێ ل دەڤەرێ ل گوندێ سیارێ هاتبوو دانان و هەتا سالا ١٩٣٥ێ دکارێ خۆ دا یا بەردەوام بوو. بەلێ رێبەرێ خواندنگەهێ ژ بەر شیماتییێن وی ل سەردەستێ مەزنێ گوندی (عەبدلرحمانێ حەجی حسێنی) هاتە قوتان، حکۆمەت نەچار بوو خواندنگەهـ ڤەگوهازتە گوندێ سپینداری و ل سالا ١٩٥٩ێ جارەك دی خواندنگەهـ ل گوندێ سیارێ هاتە ڤەکرن[٥٠] و جارەکا دی پشتی بەیاننامە (١١) ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ هاتییە ڤەکرن ڤە[٥١].

ژ مەلایێن ناڤدار ل گوندی:

١- شێخ عەبدوللا بریفکی.

٢- مەلا سەلمان.

٣- مەلا حەسەنێ بەرگاری.

٤- مەلا حەسەنێ شکەفتی.

٥- مەلا حسێن[٥٢].

خەلکێ گوندی ژ پێنج ئویجاخێن: ناڤکورکێ، مالا مەندێ، ئالەسڤی، رەزۆکی، مالا شەرەف پێکدهاتن، ئەڤ هەر پێنج ئویجاخە بخزماتیێ و خال و خارزایێ دگەهشتن ئێك بەلێ بخوینێ ناگەهن ئێك بەلێ هەر ئویجاخەك یان بنەمالەك ژ هندەك عەشیرەتێن دینە یان ل دەڤەرەکا دی یێن هاتین[٥٣].

هەر ئویجاخەك ل گوندی ژ گەلەك بنەمالا پێکهاتبوون و ژ بنەمالێن مەزن و بناڤ و دەنگ ل گوندی، بنەمالا حەجی حسینێ یی کو بحێشترا چوویە حەجێ و سالەکێ ڤەکێشای، بنەمالا خەلیلێ سولتانی، بنەمالا حەجی سالحێ میرزای، بنەمالا برەهیمێ ئۆسمانی، بنەمالا وەیسوی. زێدەباری ڤێ چەندێ ژی (٣) مالباتێن جوهییان ل سیارێ دژیان.

هەروەسا هندەك گوندێن دی ژی ل نێزیکی سیاری بوون، وەك چەلۆکێ و باکباکێ و ئاڤۆکێ و خەلکێ وان گوندا گوندێن خۆ هێلابوون و هاتبوون ل سیارێ جهواربوون.

هەژی گۆتنێیە دیارکەین کو رادیویا ئێکێ هاتییە هەمی دەڤەری (عەبدلرەحمان سیاری) ل سەرێ سالێن چلێ ئینا بوو، ل کۆچکا خۆ دانا بوو. دیسا هەر برێکا وی (دنگێ) ئێکێ یێ قوتانا ساڤاری ل دەڤەرێ ل گوندێ سیارێ هاتبوو دانان. هەر بنەمالا (حەجی حسێنی) بۆ جارا ئێکێ جەنجەر و شخرەیێن (شخرە: ئامێرەکێ دارییە ل سەر پشتا دەوارا دهێتە ئاسێکرن بۆ ڤەگوهاستنا دەخل و دانی بۆ بێدەرێ) گەنمی ئینا بوونە دەڤەرێ، ل جارا ئێکێ و ل سالا (١٩٧٠)ێ هەر برێکا (عەبدلرحمانێ حەجی حسێنێ) ترومبێل هاتە گوندێ سیارێ دگەل تەرەکتور و ماتۆری هەلکێشانا ئاڤێ ژی ئەو ژی دانا بوو سەر کانییا خەلایێ ل رۆژهەلاتا گوندی.

گوندێ سیارێ ل ئەنفالا هاتە کاڤلکرن، پشتی سالا (١٩٩١)ێ گوندێ نوی ل ژێریێ گوندی هات ئاڤاکرن، بەلێ جارەکا دی ژبەر شەرێن ناڤخۆیی خەلکی هێلا و نها گوندێ کەڤن و نوی کاڤلن.

ژ جهێن شوینواری و کەڤن (ملاقاقانێ) وەسا دیارە کەلایەکا ئاسێ لێ بوو دکەڤتە ژێرێ گوندی، شیفکا جویا، دیسا کەلەك ناوسك و شکەفت ژی ل ئاقارێ گوندی هەنە. ژ شونێن پیرۆز شێخ مەندی، پیرمیس، گولی بەردای، پیر ئوسمان، مەرداود: شکەفتەکا خورستییە بەلێ مرۆڤا بکارئینایە، پاشی ئێك ژ پیرۆزێن فەلا تێڤە هاتییە ڤەشارتن. هەتا نها ژی خەلك بۆ مەرەمێن ساخلەمیێ بکاردئینیت.

وەك هەر گوندەکێ کوردستانێ سیاریا عەدەت و کارێن خۆ هەبوون و ل هەمی دانسالێن سالێ دگەل سترانێن فولکلۆری، دیسا گەلەك سترانبێژ هەبوون دگەل ژنکێن سترانبێژ ئەو بەس بۆ دەوات و دیوانا.

دو کانی بۆ ڤەخوارنا ئاڤێ ل گوندی هەبوون ئەوژی کانیا مالا، کانی چەلکێ، دگەل دو کانیێن دی ئەو ژی برکا دودێ، برکا بەقالا.

ل ئاقارێ گوندی سیارێ و ل رەخێ نزارێ ئاڤۆکێ گەلەك کارەبێن (مقلع) بەرێن ئاشا هەبوون و بۆ ئاشێن هەمی دەڤەرێ بەر بەرهەڤدکرن، بۆ زاخۆ و ئاکرێ و هەتا شەنگال و قامیشلو بەرێن ئاشا و دستارا دهاتن هنارتن، پشتی بەر ل وان کارەیا دهات برین و نکراندن و گۆگراندن و دورستکرن ژلایێ هندەك بسپۆر و شارازا ڤە، کو ب کێر ئاشا دهاتن، ل وی وەختی دراڤەکێ باش ژێ چێدبوو[٥٤]. ل سالا (١٩١٦)ێ (ئینسێ هۆستا) ژ ترکا هاتبوو، کو وی خزمانی دگەل سیاریا هەبوو، پاشی ئەو جهە بۆ دەرێخستنا بەرێن ئاشی هاتە ب کارئینان کو دبێژنێ (کارە)، (محمد حسێن) و (عەلی ئەحمەدێ عەلیان) بەرهۆستا بوون، ل بەر دەستێ ئینسێ هوستا فێری کارێ بەر برینێ بوون، هەتا نها ژی شوینوارێن جهێن وان ماینە[٥٥].

هەژی گۆتنێیە ل هاڤینا سالا ١٩٤٥ێ خودێ ژێ رازی (مەلا مستەفایێ بارزانی) دگەل پتر ژ پێنج سەد لەشکەرێ خۆ هاتن گوندێ سیاری و سێ شەڤا مێڤانداری کۆچکا (عەبدولرحمانێ حەجی حسێنی) بوو[٥٦]. ژ رویدانێن دی کو ل وەختێ شۆرشا ئەیلولێ چێبووین، ژنکەکێ هەردو کورێن خۆ ل ملێن خۆ هەلگرتبوون، وەختێ فرۆکێ ئەو دەڤەرە توپبارانکری، هەردو بچویکێن وێ ل سەر ملێن وێ بەر چەکێ دوژمنی کەڤتن، شەهید بوون بەلێ ژنك ما ساخ[٥٧].

## گوندێ چەلۆکێ

کەلەکا دیرۆکییە، دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژێری، هەر چەندە نها پتر وەکی ئاقارێ هندەك گوندایە، بەلێ د راستیا خۆ دا جهەکێ شوینواری گەلەکێ مەزن و گرنگە. ژمارەکا شوینوارا هەتا ئەڤرۆ ژێ ماینە، نەخاسمە شویرهێن وێ، هەر چەندە هندەك ژ شویرها وێ یا خۆرستییە، بەلێ هندەکا دی ب بەر و کسلا هاتییە ئاڤاکرن، بەلێ کەس نزانیت کا کەنگی ئاڤابوویە و مرۆڤ لێ جهواربووینە، کەلا ژ رۆژهەلاتی بلندبیت، جهێ میری یان سەرکێشێ لەشکەری ل سەرێ کەلاییە، دیسان جهێ قەسرا وی ژی یا دیارە، دبندا و بۆ رەخێ رۆژئاڤای چەندین دیوار ماینە، بەروبیاڤێ ڤێ کەلایێ (٤٠م) یا درێژە، (١٥م) یا فرهەیە، دەرگەهێ کەلایێ دکەڤیتە رەخێ ژێری، ب چەند پەیسکا مرۆڤ دشێت بگەهیتێ، ل هندەك جها ژی ب دەستکەڤر مرۆڤ دشێت بگەهیتێ[٥٨].

دیارە کو ئەڤ کاڤلە گوندە بەری وەختەکێ درێژ نەمایە، بتنێ چەند شوینوارەك ژێ ماینە، وەکی تونێلا نەپەنی و سریچ و برکا بەری و دو بورج، زێدەباری تابلۆیەکێ کو چەند نڤیسین ب زمانێ عەرەبی نینن پێ ل سەر هەین، بەحسێ (عەبدوللا چەلوکی) دکەن کو خزمێ میرێن میرگەهێ بوو، ناڤێ ژنا وی (حەفصەد) بوو. ئەڤێن میرێن شەمدینا هاتینە ڤێ کەلایێ، نەخاسمە پشتی ژ پسمامێن خۆ جۆدا بووین، کو ئەڤێن بهائەددینێ بوون. سولتان حسێنێ وەلی حەفت قوریش و چوارێکەك ل سەر سەپاند بوون، دا کو بکەتە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان[٥٩]. دیارە (د.عماد عبدالسلام) ل ڤێرێ پێ کەتییە شاشیەکێ، دناڤبەرا (کەلا چەلۆکێ) و (کەلا چەلکێ) یا تێکهەل کری.

ژ شوینوارێن ڤێ کەلایێ ئەوە کو تۆنێلەکا نەپەنی

هاتییە كۆلان، ب بەر و كسلا هاتییە ئاڤاكرن، مرۆڤ هەكە خۆ بچەمینیت دێ شێت ژ سەرۆكانییا (موچكێ) گەهیتە سەر كەلایێ، مەرەم ژی ئەوە ل وەختێ تەنگاڤییا بشێن ئاڤێ بینە كەلایێ، درێژاهیا ڤێ تونێلێ (١٠٠م)، ئەڤ تونێلە ل سالا (١٩٨٨)ێ ژ لایێ خەلكێ گوندێ سپیندارێڤە هاتییە دیتن، وی وەختی خەلكێ گوندی تابی بۆ خۆ كۆلان، ژمارەكا مەزنا پرتێن گۆزكا هاتنە دیتن، هەتا ئەڤرۆ ژی ل رەخۆدۆرێن كەلایێ ماینە، دیسان گەلەك جارا پارە و بازنك لێ هاتینە دیتن.

دو كانی ل نێزیكی كەلایێ هەنە، نەدوورە ئاڤ ب رێكا سۆلینا ژ وان كانییا كێشابیتە سریچا كەلایێ، سریچا كەلایێ هەتا ئەڤرۆ یا مای، كویراتییا وێ نێزیكی (٢م)، وەكی ئاقد د بەری را هاتییە كۆلان، ل هندەك جها ژی ب بەر و كسلا هاتییە چارەكرن، دیسان بیرەكا مەزن بۆ كەلایێ د بەری را هاتییە كۆلان، فرەهییا دەرینكێ وێ (٧٥سم) و رەخێن وێ د حولینە و هەمی د بەری را هاتییە كۆلان، نها كویراتییا وێ (٢م) ژێ مانە، بەلێ یا تژی لهمیشت بووی، شوینا گویرها ئاڤێ ژی یا دیارە. پشتی مرۆڤ ژ ڤێ بیرێ دبووریت، نیشانێن كۆلانا بەری بەر چاڤێن مرۆڤی دكەڤن، وەكی جۆكەكا ئاڤێ د بەری را هاتییە كۆلان، زێدەباری شوینوارێن جوهنیا، دیسان وەكی نڤیسینەكێ یا ل سەر نڤیسی، دگەل چەند نەخشەكا كو ژ پێنج خیچكا پێكدهێن، ل هنداڤی گەلیێ كەلەبیرێ ژی دو ناوسك هەنە، یا سەری جهێ چوار تەختایە و یا بنی جهێ دو تەختایە، دەرینكێن وان د تەنگن[٦٠].

دیرۆكا كەلا چەلۆكێ: ل سالا (١٣٣٦ز)ێ میرەكی ب ناڤێ (عەبدوللا كەلكی) دەستهەلاتی ل ڤێ كەلایێ كرییە، وەكی دبێژن مرۆڤەكێ هەبلەتراش و نەساخ بوو، ڤی میری دو ژن هەبوون، ئێك ژ وان ناڤێ وێ (حەفسەد) بوو، خویشكا میرێ ئامێدیێ بوو، سەركێشێ لەشكەرێ وی ناڤێ وی (قەمچە هێر) بوو، ژمارا لەشكەرێ وی (٧٠٠) سوار بوون، لەشكەرەكێ بهێز بوو، ژنا (قەمچە هێری) خویشكا میر عەبدوللای بوو، دەستەلاتا ڤی میری گەهشتبوو دەڤەرا دۆسكیا هەتا ئێكمالا بەر خابیری، دیسان ل رەخێ مزووریا ژی هەتا بوزان و تەفتیان و باعەدرێ دچوو.

ئاشێ گوندێ بلانێ دبن تەسەرفا وی دا بوو، دەستەلاتا وی دگەهشتە هەمی دەڤەرا زێباریا، بەلێ میر عەبدوللا گەلەك ژ تخوبێن خۆ دەردكەڤت، مالێ خەلكی دزی، خەلك تالان دكر، زێدەباری رێگرتن و كوشتنا خەلكی، د دەشتا سلێڤانەیا را د چوونە شامێ، ژ وێری چەك دئینا، ڤی میری گەلەك رەشەكێن بەرنیاس هەبوون، وەكی (سەرهنگ سەنگاوی، رەشویێ عەیشێ، كەلهر، حەسەنێ لەنگ). میرێ ئامێدیێ دو هێرش برنە سەر بەلێ ژبەر ئاسێبوونا وێ نەشیا بستینیت.

ئەڤ كەلایە هەتا سەروەختێ نەڤیێ میر عەبدوللا (هجری) مایە، كو ل سالا (١٥٠١ز)ی ئەڤ نەڤیێ وی خیانەتێ دكەت، دەستەلاتا وی ب دویماهی دهێت، پاشی ئەڤ كەلایە دكەڤیتە دبن دەستەلاتا میرێن ئامێدیێڤە[٦١].

## گوندێ سپینداری

گوندێ سپینداری ئێكە ژ گوندێن ئەشیرەتا بەرواری ژێریێ سەر ب ناحیا چەمانكێڤە، (١٢كم) ژ چەمانكێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** زنجیرا چیایێ گارەیە.

**باشووری:** گوندێ خورپنێیە كو سەر ب ناحیا زاویتە ڤەیە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سیارێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەرئاشێ یێ دەڤەرا بەرواری ژێری[٦٢].

خواندنگەهەكا دیرۆكی ل ئەڤی گوندی هەبوو، سەیدایێ (عەباس عەزاوی) سالۆخا وێ دكەت و دبێژیت: دكەڤیتە گوندێ سپینداری، ل ناحیا بەرواری ژێری، دبێژن نها مەلا ئەحمەد دەرسا لێ دبێژیت[٦٣].

گەلەك زانا ژ ڤێ خواندنگەهێ دەركەڤتینە، خەلكێ گوندی پارە ل وان شاگردا د مەزاخت ئەوێت دهاتن ل خواندنگەها ڤی گوندی دخواند، بۆ میناك (عەبدولعەزیزێ دولانی) كتێبا (سعدالله الصغیر) ل ڤی گوندی كوپی كریە، بەلێ دیرۆكا كوپی كرنێ یا دیار نینە، ژ سەیدایێن وێ یێن نوی سەیدایێ (مەلا ئەحمەد كورێ مەلا عەبدولخالقێ ئاكرەی) كو حەفت سالا دەرس ل ڤێ خواندنگەهێ دگۆتن، ئەڤە ژی ل دووڤ داخوازیا خەلكێ وێ بوو ژبەركو مەلا ئەحمەد ژ (زانایێن ناڤدار بوو)، چونكی شەهرەزایەكا باش دڤان زانینا دا هەبوو: رەهوانبێژی، مەنتق، ستێرنیاسی، ئەندازیاری و بیركاری[١٤]. ل دووڤ گۆتنا (عەلی سەیدوی) كو ل سالا (١٩٣١ز)ێ (١١٠) مالبات ل ڤی گوندی هەبوون، دو خواندنگەهـ ژی لێ هەبوون[١٥]، خواندنگەهێن وێ د حكۆمی نەبوون ل سالا (١٩٣٠)ێ خەلكی ئاڤاكر بوون[١٦]. ل سالا (١٩٤٧)ێ خواندنگەها سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن، بەلێ یا بێ سەروبەر و پشتگوهڤە هاڤێتی بوو، دەواما خویندكاران یا بێ سەروبەر بوو، ل داویا سالێ فەرمانا گرتنا وێ هاتەدان و خواندنگەهـ هاتەگرتن[١٧]. بەلێ جارەكا دی ل ٢١ چریا ئێكێ سالا (١٩٥٣)ێ فەرمانا ڤەكرنا ڤێ خواندنگەهێ هاتییەدان و ل سالا خواندنێ (١٩٥٣-١٩٥٤)ێ دەست ب كارێ فێركرنێ كریە[١٨] و جارەكا دی پشتی بەیاننامە (١١) ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ هاتییە ڤەكرن[١٩].

گوندێ سپیندارێ هەر ژكەڤن دا هەتا نها هەر بڤی ناڤی دهێتە نیاسین و ژدارا سپیندارێ هاتییە ل سەروەختێ باب و باپیران دا، دا ڤی گوندی ئاڤاكەن چوونە دۆلەكێ دا ئەو دول پڕی دارا دینداری (چلێ دینداری) بوو كانییەك لێ هەبوو دارەكا سپیندارێ یا مەزن دناڤ وان دارا را بوو وەختێ مال دانایێ ئینا

**گوندێ سپیندارێ ل سالا ١٩٨٣**



وێنە ب كامێرا : سەیدا خالد صالح

ناڤێ گوندی كره سپینداریێ، هەر كەسێ هاته ڤی گوندی گۆت گوندێ سپینداریێ، هەتا نهو بۆچوونا ڤی ناڤی ئەڤەیە. بۆ هەیامەكێ دوور و درێژ خەلكێ گوندی لێ جهواربوون وەكو یا دیار كو نزیكی (١٢) بابكا لڤی گوندی دژین و ئەڤ گوندە ژێنێچ بنەمالان پێكهاتیە (مالا سفاقا، مالا ئاڤدەلا، مالا ناڤگوندی، مالا هەمەزیتكێ، مالا عەتمانا). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ژی ٧٢٨ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٠]. ئەڤ گوندە چەندین جاران كەفتیە بەر هێرشێن دوژمنی یان هاتییە وێرانكرن و سۆتن، ل سالا (١٩٦٢)ێ جارەكا دی یێ هاتییە سۆتن و كاڤلكرن و هەر د وان سالاندا هاتییەڤەئاڤاكرن، ل سالا (١٩٨٧)ێ دەستەلاتدارێن حكۆمەتا عیراقێ پتر ژ دەهـ كەسان ژ خەلكێ گوندێن سپینداریێ و بەرئاشێ ب خاپاندن برنە سەرسنكێ و ل وێرێ گرتن و پاشتر گوللەبارانكرن[٧١]، ل سالا (١٩٨٨)ێ خەلكێ گوندی تووشی هێرشێ بووینە و هاتینە ئەنفالكرن و خەلكێ ڤی گوندی لڤێ سالێ دا بەرەڤ كەمپا بەحركێ برینە، هەتا بهارا سالا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندی ڤەگەریاینە سەرئاخا خۆ، ل گوندێ خۆ یێ بەرێ جهوار بووینە و خەلكێ ڤی گوندی چەندین خانی بۆ خۆ دگوندی دا ئاڤاكرینە[٧٢].

ژێدەرێن ئاڤا گوندی چەند كانیێن ئاڤێنە، ژ وان: كانیا سپینداریێ، كانیا هوجكێ، كانیا بناڤێ، كانیا گری، كانیا سەرئاشا، كانیا باخراب، كانیا حەودا، كانیا مێرگا داریێ، كانیا سێركا، كانیا بۆكا سەری، كانیا كورا سێریێ، كانیا كوبەكێ.

چیا و عەردێ گوندی و رەخۆدۆرێن وی ئەڤەنە: چیایێ كارەی، سەركێری، سەرێ بەرۆژی، گرێ شیڤشكێ، گرێ تركا، گرێ هرچا، گرێ ئاسێ، شیڤ زراڤكێ، گرێ حەودا، گرێ گولی، سەرێ سەمركێ، گرێ رەش، سەرێ سپیاڤێ، گرێ زێرین، گرێ سەرێ چەلۆكێ، خارێ مێكیكی و گرێ نزارێ گولێ[٧٣].

ملكێ گوندی: سەر ئاشا تا بەرێبیكا، چەلۆكێ هەتا كاڤلا، خریكێ، باخراب، مێرگا داریێ، بەر گوندی، خارا، مشخینە.

د گوندێ سپینداریێ دا چەندین شوینوارێن كەڤن هەنە: كەلا چەلۆكێ، شكەفتا بابێ، شكەفتا محەمەد، شكەفتا كۆلین، شكەفتا محەمەدێ نەجێ، شكەفتا حەودا، كەلی رەبەت، چەند شكەفتێن كەلی وچەندین ناوسك. سێ مناسب لڤی گوندی پێن هەین (مناسبێ گونلدە سەرێ، مناسبێ حەودا، مناسبێ لێ مەیدانێ).

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالییە و ڤێڤی و مۆچەی چ وەكی (فەرمانبەر) یان (پێشمەرگە). دیسان ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێڤە پرۆژەیێ كارەبێ هاتییە دروستكرن. (٨٧)خانی هاتینە ئاڤاكرن، زێدەباری پرۆژێ ئاڤا ڤەخوارنێ و ئاڤاكرنا خواندنگەهەكێ و بنكەهەكێ ساخلەمیێ و مزگەفتەكێ. ژمارا مالباتان لڤی گوندی دگەهنە (١١٨٠) و نها (٨٧)مالبات ل گوندی دا دژین[٧٤].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (١٨٢٣٦) دۆنەمێن ئەردییە، ژ وان (١٢،٩٢) دۆنەم بیستانێن ئاڤینە، (٨٥١) دۆنەم ژی چەروانگەهن[٧٥].

## گوندێ بەرئاشێ

بەرئاشێ ئێكە ژگوندێن دەڤەرا بەرواری ژێریا، سەر ب ناحیا چەمانكێ و قەزا ئامێدیێ ڤەیە، ب دووراتیا (٢٦كم) ژ رۆژئاڤایێ چەمانكێ دوورە. ل دووڤ پێزانینان ناڤێ گوندی ژ بەرێن ئاشی هاتییە و هەر ژ كەڤندا بڤی ناڤی بەرنیاس بوویە، دیرۆكا ڤی گوندی گەلەكا كەڤنە و سەدان سالە ژیان لێ پەیدابوویە، چونكی گەلەك مناسب (مەغبەر- گۆرستان) لێ هەنە و ئەڤە وێ چەندێ دیار دكەت كو ئەڤ گوندە گەلەكێ كەڤنە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ تاژیكا.

**باشووری،** گوندێ بهێرێ.

**رۆژهەلاتی،** هەردو گوندێن سیار و سپینداریێ

**رۆژئاڤایی:** هاڤینكەها سیارەتویكا.

پێكهاتا گوندی: ئەڤ گوندە ژ پێنج بنەمالان: مالا عەبدی، مالا میروی، مالا سلیمانێ یونس بەرواری، مالا رەمەزانێ مرادی، مالا حسێن ئاغای پێكدهێت.

خەلكێ گوندی (٢٠٠) مالباتن و پتر ژ (١١٠٠) كەسان، نها تنێ (٤٤) مالبات ل گوندی دژین[٧٦]. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٠ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٧]، د كتێبا (المراكز الثقافیة المغمورة فی كردستان) دا هاتیە: بەرئاش گوندەكە نێزیكی بریفكا، ل ناحیا مزووریا، شێخ نورەددینێ بریفكانی چوویە ڤی گوندی، پشتی ژ ئەتریشێ دەركەتی[٧٨]، كو ل وێرێ سەیدا و شاگر قەستا وی بكەن. ژ شوینوارکێن وان یێن زانینێ دەستڤیسا (كشف الغوامض فی علم الفرائض) كو ژلایێ (محمد عەبدوللا عەباسی) ل سالا (١٢٧٥مـ ش/١٨٥٨ز) هاتیە نڤیسین[٧٩]. د وەقفەكا سولتان حسێنێ وەلی ئاڤرێ ب ڤی گوندی هاتیە كرن، كو (١٠) قرویش ل سەر ڤی گوندی هاتینە سەپاندن، دا ببنە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل ئامێدیێ[٨٠]. ل دووڤ گۆتنا (عەلی سەیدوی) ل سالا (١٩٣١ز)ێ پێنجی مالبات ل ڤی گوندی دژیان[٨١].

### ئاڤاریێ گوندی:

رۆژهەلاتا گوندی (سەرۆكانیێ هەتا كەزانا بێریا)، ژێریێ گوندی (مرابان گێڤێ هەتا بهێرێ)، رۆژئاڤایا گوندی (بەر گر تەعرا هەتا شێخ هەسن)ێ، ژووریێ گوندی (كەلوتكێ هەتا گۆزكێ)، ملكێ گوندێ بەرئاشێ ب بەرهەمێن چاندنێ گەلەكێ دەولەمەندە.

گوندێ بەرئاشێ



**ژێدەرێن ئاڤێ:**

(٣٢) كانێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، لەوما رێژەكا باش یا ئاڤێ ل ناڤ ملكێ گوندی هەیە، هەر ژكەڤن دا ژیارا گوندی یا ل سەر بیستان و مازیا و كومرێ (چێكرنا رەژیێ) بوو، نها ئەڤ گوندە ب رەز و كەزان و مازیا و سێڤ و خوخ و هەمی رەنگێن دی یێن فێقی یێ ئاڤدارە، جووت وكێل یێ لێ مشەیە.

**شینوارێن كەڤن:**

نەهـ گۆرستانێن كەڤن كو ل دەڤەرێ ب مناسب (موغبەر) دهێنەناڤكرن ل گوندی هەنە. گۆرخانە (جهێن كویر) ل ڤی گوندی هەنە، ئەڤ گۆرخانە گەلەكا كویرە دەرێ ڤێ گۆرخانێ نێزیكی مەترەكێ یێ فرەهەیە، كو گۆرێن زەرەدەشتیانە. چوار ناوسك ل ڤی گوندی یێن هەین و دو ژ ڤان ناوسكا یان (جووتە شكەفت) دبێژنێ جهێ مەلكی و وەك ژوورەكێ هاتیە چێكرن وسێ جهێن نڤستنێ یێن لێ هەین.

گوندێ بەرئاشێ ژ لایێ هزرا مللەتینیڤە: هەر ژدەسپێكا شۆرشێ دەهان كەس بووینە پێشمەرگە وچەندێن شەهید دشورشا ئیلۆلێ وگولانێ و ئەنفالێن رەشدا كرینە قوربانی ڤی وەلاتی. گەلەك جارا كەڤتیە بەر هێرشێن رژێمێ، چەندین جارا هاتیە كاڤلكرن وسۆتن، سالا (١٩٦٣)ێ گوند ژ ئالیێ لەشكەرێ عیراقێڤە هاتیەسۆتن، پشتی بەیاننامە (١١) ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ خەلكێ گوندی گوندێ خۆ ئاڤاكرەڤە و خواندنگەهـ ژی لێ هاتە ڤەكرن[٨٢]، بەلێ سالا (١٩٨٨)ێ یێ هاتیە ئەنفالكرن هەر ژلایێ وێ رژێمێڤە و خەلكێ گوندی بەر ب بەحركێ برینە[٨٣].

پشتی سەرهلدانا بهارا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندی ڤەگەریایە سەرئاخا باب و باپیران، ل (١٩٩١ - ١٩٩٢)ێ گوندێ بەرئاشێ هاتیەئاڤاكرن، بەلێ سەر جادێ زبەركو ژین و ژیارا گوندی ل ڤی جهی ساناهیترە ژجهێ كەڤن.

ل سەردەمێ حكومەتا هەرێما كوردستانێ چەندین پرۆژە بۆ ڤی گوندی هاتینە بجهئینان وەك: ئاڤاكرنا (٤٤) خانییان ژلایێ رێكخراوا (شێلتر) و دگەل پارێزگەها دهۆكێ، كۆلانا بیرەكا ئیرتیوازی یا ئاڤێ، نویژەنكرنا خواندنگەها بەرئاشێ، چێكرنا مزگەفتا بەرئاشێ، گەهاندنا هێلا كارەبێ.

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (١٤٠٠) دۆنەمێن ئەردینە، ژ وان (٧٣،٢٤) دۆنەم د دێمن، (٤٤،٢١) دۆنەم د ئاڤینە، (٢٩٧٠) دۆنەم ژی چەروانگەهن[٨٤].

ژێلی بوسلمانا ئەڤ گوندە ب هەبوونا جوهیا یێ ناڤدار بوو، هەتا نها ژی جوهیێن بەرئاشێ ل ئسرائیلێ د ناڤدارن، ژ وان ژی (حاخام زەكەریایێ بەرئاشی، تسماح بەرئاشی، دانیال بەرئاشی...هتد)[٨٥]. دیسان دیارە كو كنیشتەكا جوهیان ل ڤی گوندی هەبوو، ئێك ژی ل گوندێ مێزێ هەبوو[٨٦].

## گوندێ مێرۆكێ

مێرۆكێ ئێكە ژگوندێن دەڤەرا بەرواری ژێریێ سەر ب ناحیا چەمانكێ، ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ بەرواری ژێریێ و نێزیكی (٢٣كم) ژسەنتەرێ ناحیێ دوورە. رامانا ناڤێ ڤی گوندی (جهەكێ كویرە) ئەڤە ژی ل دووڤ شرۆڤەكرنا ناڤی ب زمانێ سریانی[٨٧]. هندەك ژی وەسا ددەنە شرۆڤەكرن كو قەسرا میر یان والیەكێ ئۆسمانییا ل ویرێ هەبوو[٨٨]، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ مێرۆكێ. ژبەر كاودانێن پشتی شەرێ جیهانی یێ ئێكێ، ل سالا (١٩٢٥ز)ێ بیست و پێنج مالباتێن مەسیحی كو ژ تیارێ قەستا ڤی گوندی كریە، هەر چەندە بەری وی وەختی گوند یێ ئاڤەدان بوو، بەلێ ب دروستاهی ئەم نزانین كا د چ وەخت دا هاتیە ئاڤاكرن، ل دووڤ گۆتنێن هندەك ژخەلكێ گوندی ئەڤە شەش بابكە ل ڤی گوندی دژین.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ (ئەلولا).

**باشووری،** گوندێ (پیربوكێ)

**رۆژهەلاتی،** گوندێ (بیلمەندێ).

**رۆژئاڤایی،** گوندێ (بەركەڤری) نە[٨٩].

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی مەسیحینە، ل دووڤ گۆتنا ئەڤە شەش بابكە ل گوندی دژین: ژ سێ بنەمالا: بێكەنا، بێمامۆ و بێشیمۆ پێكدهێن، نها (١١) مالبات دڤی گوندی دا دژین، كو ژمارا وان (٤٨) كەسن[٩٠] و دناڤبەرا (٩٠ هەتا ١٠٠) مالباتێن دی ل دەرڤەی گوندی نە.

پتریا ژینا خەلكێ ڤی گوندی ل سەر بەرهەمێن چاندنێ بوویە، دو كەرتێن سەرێشك یێن چاندنێ بخۆڤە دگریت: كەرتێ چنارا كو دكەڤیتە رۆژهەلاتی گوندی و كەرتێ خۆشكە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی.

ژ شوینوارێن كەڤنارێن گوندێ مێرۆكێ: عاقە (بنقەسر)، شكەفتا (مێسكێ) كو دكەڤیتە ژوورێ گوندی، (دێرا مارشمعون) كو دێرەكا گەلەك كەڤنە، قەشە (ئیشای) ئەو دێرە ب رێڤەدبر. حەڤت ئاشێن بەری یێن گەلەك كەڤن[٩١].

كانییا زەرئێكە ژناڤ و دەنگترین كانیێن ڤی گوندی و ئاڤا ڤێ كانی یا زەرە و گەلەكا بۆشە، گەلەك جارا ئەڤ ئاڤا هەنێ ژلایێ گەلەك رێكخراوێن بیانیڤە یا هاتیە شرۆڤەكرن. ژ چیایێن گوندێ: (چیایێ نزاری) ل رۆژئاڤا گوندی، (چیایێ گومن) دكەڤیتە رۆژهەلاتی، (چیایێ قەریشە) دكەڤیتە ژوورێ گوندی.

دیارە ل سەروەختێ دەولەتا ئۆسمانی، ئەڤ گوندە رێكەكا بازرگانی بوو، پرەك ل ڤێرێ هەبوو، كو دگۆتێ (پرا مێرۆكێ) بۆ گرێدانا دەڤەرا بەرواری ژێری و ئامێدیێ ب دەڤەرا نەهلێ و ئاكرێ ڤە[٩٢].

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ (٦٩) كەسا لێ دژیان[٩٣]، بەلێ پشتی گوند ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتیە چۆلكرن تنێ (١٥) مالبات لێ مابوون[٩٤]. ل سالا (١٩٧١)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیەڤەكرن.

مێرۆكێ گەلەك جاران ژلایێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتیەكاڤلكرن و سوتن و كەڤتیە بەرهێرشێن لەشكەری، سالا (١٩٦١ و ١٩٦٢)ێ دگەل هەلبوونا چریسكا شۆرشا كوردستانێ، ئەڤ گوندە كەڤتە بەر هێرشێن دوژمنی و هاتیە كاڤلكرن، سالا (١٩٧٧)ێ دیسان خەلكێ ڤی گوندی رەڤینە و گوند هێلایە. ژبلی چەندین جارێن دی خەلكێ گوندی خۆ ل ئاقارێ گوندی ڤەشارتیە، ل سالا (١٩٨٨)ێ ل ئەنفالا دیسان هاتیە كاڤلكرن، ل بهارا سالا (١٩٩١)ێ و پشتی ڤەگەریانێ ژ مشەختا ملیونی خەلكێ گوندی ڤەگەڕیانە سە رگوندێ خۆ[٩٥].

نها (١١) مالبات لێ دژین، ژ (٤٨) كەسا پێكدهێن، جادە و كارەب ژی ل گوندی هەنە[٩٦].

## گوندێ چەم رەبەتكێ

ژ گوندێن دەڤەرا بەرواری ژێریبانە، ب دووراتییا (٢٢كم) دكەڤیتە رۆژهەلاتا ناحیا چەمانكێ. ژ زاردەڤێ باب و باپیران ناڤێ ڤی گوندی ژچەمان هاتیە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ (میروكێ).

**باشووری:** چیایێ (خیرێ).

**رۆژهەلاتی:** گوندێ (بیلمەندێ).

**رۆژئاڤایی:** گوندێ (بەركەڤرێ).

**پێكهاتا گوندی:**

ئێكە ژ گوندێن (مەسیحییان)، خەلكێ ڤی گوندی وەكو هاتیە زانین (١٢) بابكن ل سەر ژیانە، ژ سێ بنەمالان: بنەمالا بێبادور، بنەمالا ئەنوەر و بنەمالا مستەفای پێكدهێن، هەر چەند پشكەكا ڤان مالباتان ل سالا (١٩٢٥)ێ ژبەر كاودانێن وێ دەڤەرێ قەستا ڤێ دەڤەرێ كریە. ئاڤا ڤی گوندی ژ گوندێ (میروكێ) دهێت و وەكو یا دیار كانی ل ڤی گوندی نینن[٩٧].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٥٥٥٠) دۆنەمێن ئەردینە، ژ وان (١٨.٧) دۆنەمێن ئاڤینە، (٢٢.٥٣) دۆنەمێن ئەردی وەكی چەروانكەهـ دهێنە هژمارتن، (٣٠٢٢) دۆنەم وەكی رێل دهێنە هژمارتن[٩٨].

سالا (١٩٦١ز)ێ نێزیكی (٣٠) مالباتان لێ دژیان. هەتا سالا (١٩٨٧)ێ وی وەختی خەلكی گوند بەردا، بەر ب كۆمەلگەها ڤە چوون، نەخاسمە ل رەخۆدورنێ ئاكرێ، وان ب خۆ بۆ خۆ خانی ئاڤاكرن[٩٩].

پتریا ژیارا خەلكێ ڤی گوندی ل سەر خودانكرنا تەرشی و كەوالی و فێقی و جۆت و كێلا و مۆچەیانە... هتد. ئەڤ گوندە چەندین جاران ژ ئالیێ لەشكەرێ عیراقێ ڤە هاتییە وێرانكرن و سۆتن. ل سالا (١٩٦١ و ١٩٦٢)ێ یێ هاتییە كاڤلكرن و سۆتن. زێدەباری چەندین جارێن دی ل سالێن شێستان و حەفتییان دا، هەروەسا سالا (١٩٨٨)ێ وەكی هەمی گوندێن دی یێن كوردستانێ كەتییە بەر هێرشێن رژێمێ و هاتینە ئەنفالكرن. پشتی سەرهەلدانێ سالا(١٩٩١) و (١٩٩٢)ێ خەلكێ ڤی گوندی ڤەگەریانە سەر ئاخا باب و باپیرێن خۆ.

### چیایێن گوندی:

چیایێ (خیرێ) ل ژێرێ گوندی. چیایێ (كیرا رەبەتێ) دكەڤیتە ژوورێ گوندی. چیایێ (بێكەسەر) دكەڤیتە روژهەلاتا گوندی. گەلی (رەبەتێ) دكەڤیتە رۆژئاڤایا گوندی[١٠٠].

شوینوارین كەڤن ل ڤی گوندی (ناوسكەكا) هەی، سێ جهێن نڤستنێ یێن مەزنان و دو جهێن دی یێن نڤستنێ یێن بچویكان دناڤ دا د دیارن.

ل سالا (١٩٧٩)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ گەهشتییە گوندی. نها هەتا پۆلا شەشێ بنەرەتی خواندنگەهـ یا ل گوندی هەی، (٣٤) خویندكار لێ د خوینن.

گوند یێ ئاڤەدانە و (١٨) مالبات نها لێ دژین، ژ (٧٥) كەسا پێكدهێن[١٠١].

ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێڤە گەلەك پرۆژەیێن خزمەتگوزاری بۆ ڤی گوندی هاتینە بجهئینان: دانانا مەولیدكا كارەبێ. ئاڤاكرنا خواندنگەكا دەستپێكی. ئاڤاكرنا (٢٣) خانییا ب رەنگەكێ هەڤدەم. تێكەلكرنا (٢٥كم) جادێ بۆ وان گوندێن مەسیحییان ل تخوبێ ناحیا چەمانكێ. گرێدانا تۆرا ئاڤا گوندی[١٠٢].

## گوندێ ملبركێ

ملبركێ ئێكە ژگوندێن دەڤەرا بەرواری ژێریێ سەر ب ناحیا چەمانكێ ڤەیە، دكەڤیتە ژێریێ دەڤەرا بەرواری ژێری. گوندەكێ گەلەكێ كەڤنارە و نێزیكی ١٢١، بابانە خەلكێ گوندی لێ دژین. گوند (٣٥كم) ژ ناحیا چەمانكێ دوورە.

ئەوا ب ناڤێ گوندیڤە گرێدای وەك ژ باب و باپیرێن وان هاتییە ڤەگوهاستن ناڤێ (ملبركێ) ژ بركێن ئاڤێ هاتییە و ژ كەڤن وەرە هەتا نها ب ڤی ناڤی دهێتە نیاسین.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ئەتریش.

**باكوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێن كانیكا و گەڤەركێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن شكێران وشلیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رەبەتكێ یێ ئەشیرەتا مزووریان[١٠٣].

ئەڤ گوندە چەندین جاران كەتییە بەر هێرشێن رژێمێ و هاتییەكاڤلكرن و سۆتن: سالا (١٩٦١)ێ دەستپێكا شۆرشێ گوند ب دەستێن لەشكەرێ عیراقێ هاتییەخرابكرن، پاشی خەلكێ گوندێ ل سالا (١٩٧٠)ێ هاتییە سەر گوندێ خۆ، بەلێ جارەكا دی ل سالا(١٩٧٤) و (١٩٨٧)ێ گوند هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٨٨)ێ ئەڤ گوندە وەكی هەمی گوندێن دی یێن كوردستانێ هاتییە ئەنفالكرن و خەلكێ وی بەرەڤ كەمپا بەحركێ برینە، هەتا بهارا سالا (١٩٩١)ێ خەلكێ ڤی گوندی ڤەگەریاین[١٠٤].

### پێكهاتا گوندی:

ژ سێ ئویجاخان: مالا كوكو، مالا میرزا و مالا مەرعانی پێكدهێت.

زێدەرێن ئاڤا گوندی پتر كانیكن، ژ كانییێن گوندی: ( كانییا بهارێ، كانییا ژێریێ گوندی).

### چیا وگرێن گوندی:

(كەڤرێ قەلا، كەڤرێ كێری، ژلایێ رۆژهەلاتێڤە

گرێ جانێیە توخیبێ گوندێ شكێران و شلیا)یە.

ملبركێ بڤان رەنگێن فێقیا (هژیر، تری زەرك) یێ ناڤدارە. بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٢٢٦٤) دۆنەمێن ئەردینە، ژ وان (٣٣) دۆنەم ئەردێ ئاڤینە، (٧٠) دۆنەم ژی دێمن، (١٥٦٠) دۆنەم ژی رێلن[١٠٥].

چەندین شوینوارێن كەڤن ل ڤی گوندی هەنە: (مناسبێ پیر مریەم، مناسبێ پیر سەوەر، ژێریا گوندی مناسبێ مامانجا، كاڤلە گوندێ مامانجا، بەرێ كوك ئاغا، شكەفتا عەلی ئاغا)، شكەفتا (عەلی ئاغا) ئێكە ژتشتێن ئنتیكە ل بیاڤێ گوندێ ملبركێ كو دكەڤیتە چیایێ بەرامبەری گوندی، ئەڤ شكەفتە گەلەكا جوان و ئاسێیە و بەرەكێ مەزن دەرگەهێ ڤێ شكەفتێ دكەتە دو دەر، چیرۆكا ڤێ شكەفتێ دزڤریتەڤە بۆ چیڤانۆكا عەلی ئاغای و شەرێ وی و بەرەڤانیا وی دڤێ شكەفتێ دا، ژبەر وێ چەندێ بشكەفتا عەلی ئاغا ناڤكرییە[١٠٦]. زێدەباری ناوسكا (سەرێ دارێ) كو دكەڤیتە دناڤبەینا گوندێن ملبركێ و ئەشكیرانێ[١٠٧].

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٠٨]، نها خەلكێ گوندی ژ (٤٢٠) كەسان و (١٠٠) مالباتانن پێكدهێن[١٠٩]. بەلێ پا گوند یێ بەردایە.

## گوندێ شكەفتێ

ناڤێ گوندی ژ شكەفت هاتییە و ژ كەڤن دا هەتا نها هەر ب ڤی ناڤێ هاتییە نیاسین.

شكەفتێ ئێكە ژ گوندێن ئەشیرەتا بەرواری ژێریا و سەر بناحیا چەمانكێ و قەزا ئامێدیێ ڤەیە، (٧ - ٨ كم) ژسەنتەرێ ناحیێ یێ دوورە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**، گوندێ (سێدەرا).

**باشووری**، گوندێ (دێركێ).

**رۆژهەلاتی**، گوندێ (بلمباسا).

**رۆژئاڤایی**، گوندێ (بێباد ئیسلامە).

### چیا و گرێن گوندی:

(چیایێ هێلینا قەلێ، چیایێ حسارێ، گرێ بەلیێ).

د سالێن بەرێدا ژیارا ڤی گوندی ل سەردەرامەتی بوو وەك (دەخل و گەنمۆك و برنج..... هتد)، بەلێ نها ژین و ژیارا پتریا خەلكێ گوندی ل سەر مۆچەیە. ژێدەرێ ئاڤا گوندی یان دەرامەتێ گوندی سەر رووبارییە و چ كانی لێ نینن.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە گەلەكێ كەڤنە و دەمەكێ درێژە كو دگەهیتە نێزیكی (١٢) بابكا خەلكێ وی لێ دژین، ژ دو بنەمالان: بنەمالا عەبدی، بنەمالا سیسوی پێكهاتیە[١١٠]. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١١١].

گوندێ شكەفتێ ل سالێن شێستان چەندین جاران ژبەر نەهامەتی و زولما رژێمێ هاتیبەردان، هەروەسا د نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتێیان ژی چەند جارەكان خەلكێ گوندی جهێ خو هێلایە ژبەر هەمان ئەگەر، سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتیە ئەنفالكرن و خەلكێ وی بەر ب كەمپا بەحركێ برینە، پشتی سەرهەلدانا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە و لێ جهوار بووینە، بەلێ ل سالا (١٩٩٧)ێ وان ب خۆ گوندێ خۆ هێلایە و هەتا نها ژی گوندیێ كاڤلە.

بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی (٣٠) مالباتان ل گوندی دژیان، ل سالا (١٩٧٤)ێ خواندنگەهـ بۆ جارا ئێكێ گەهشتیە گوندی، نێزیكی (٥٨) خویندكاران تێڤە دخواند.

مزگەفتەكا مەزن ل ڤی گوندی هەبوو، نها ژی مزگەفتەك ل سەر جادا وێ هاتییە چێكرن، ژ مەلایێن ناڤدار (مەلا سالح، شێخ عبید، مەلا ئەحمەد، مەلا حسێن)، زێدەباری كو مەلا ئەحمەدی و مەلا سەلیمی د سالێن پێنجییان دا دەرس ل مزگەفتا وێ دگۆتن[١١٢].

**شكەفتا گوندێ شكەفتێ**، ئەڤ شكەفتە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ژووریێ ناحیا چەمانكێ ل دەڤەرا بەرواری ژێریێ و رۆژهەلاتێ شكەفتێ دبیتە چیایێ

گارە و رۆژئاڤایێ وی دبیتە چەمانکێ ب دووراتییا (٧-٨ کم)، ئەو رێکێن دچنە ناڤ شکەفتێ دا ژلایێ رۆژهەلاتی دو رێکێن مەزن و ئێکا بچویکە، لایێ ژووری ژی دەرگەهەکێ بچویك دچیتێ و لایێ رۆژئاڤای ژی دیسان دەرگەهەکێ بچویك هەیە، هەمی دەرگەهێن دچنە شکەفتێ دبنە پێنج دەرگەهـ لایێ بنێ شکەفتێ دبیتە رووبارێ (بەدرەدین)ی ئەوێ بەرەف ناحیا چەمانکێ دهێت و ئەگەر مرۆڤ بژوور کەڤت دێ تشتەکێ ئێنتیکە بینیت، چونکی ل ناڤشکەفتێ دا گەلەك شکەفتۆك یان بێژین (عولینك) یان ژوورێن جودا جودا هەنە، هندەکا دەرگەهێن وانا ژووردا دچن و هندەکێن دی ژی دەرگەهێن وانا بۆ سەری دچن و هندەکا ژی دەرگەهێ وانا بەرامبەر مرۆڤییە ئانکو راست و راستن، ئەگەر مرۆڤ چوو دناڤ شکەفتێدا دێ بیاڤەکێ باش بینیت و بلنداهییەکا بلند هەیە، بلنداهیا ژوورا یا جودایە هندەك دنزمن و هندەك بلندن و هندەك بەروارکی دچن و هندەك بۆخارێ دچن. هندەك نڤیسینا کەڤن هاتییە نڤیسین و هەتا ئەڤرۆ ژی ئەڤ رەنگێ نڤیسینە دیار نەبووینە کا ب چ ئەزمانن، دیوارێن ژناڤدا یێن شکەفتێ گەلەك دجوانن و ئەگەر روناهی کەفتێ دبرسقن، دو کانیێن ئاڤێ ژی دناڤ شکەفتێ دا هەنە و ئاڤا وانا ناهێنە ڤەخوارن چونکی ئاڤەکا کیمایێ (کبریتییە) یا بهێن گەنییە[١١٣].

ل بەری مرۆڤ بچیتە سەر دەرگەهێ شکەفتێ، مناسبەك ل وێرێ هەیە، دبێژنێ (شێخ شەمسەددین)، چەند مغارە ئانکو تونێلێن خۆرستی ژ رەخەکی بۆ ئێکێ دی دچن دناڤ شکەفتێ دا هەنە، زێدەباری کو بەرێ شکەفتێ یێ ل رەخێ ژووریێ رۆژهەلاتی، ژبەر جهێ وێ ئەم ب دوور نابینین کو ژمێژە وەرە مرۆڤ دناڤ ڤێ شکەفتێ دا ژیابیت، بەلێ هەتا ئەڤرۆ چ ڤەکۆلینێن شوینواری ل سەر نەهاتینە کرن[١١٤].

دیمەنەکێ ژ سرۆشتێ دەڤەرا چەمانکێ



ل دووڤ گۆتنێن (جەرجیس حسێن جەرجیس) كو دانعەمرەكێ وی گوندییە، پشتی سالا (١٩٧٠)ێ ئەو جهە وەكی جەبلخانە هاتبوو بكارئینان، زێدەباری كو خەستەخانە بوو، بەلێ دەمێ شۆرش ل سالا (١٩٧٥)ێ شكەستی، چەكەكێ مەزن د وێرێ ڤەبوو، ئێنا بریار هاتە دان كو ئەو جبلخانە بهێنە ژناڤبرن، هەر ئێك ژ (جەرجیس حسێن و مستەفا زێباری و نعمان باكرمانی) ئەو جهە دەلەمێت كر و پەقاند[115].

ل سالا (١٩٦٥)ێ ئەڤ جهە وەكی خەستەخانە لێ هات، پێشمەرگەیێن بریندار ل ڤێرێ چارەدكرن، خەستەخانا شكەفتێ بۆ پێشمەرگەی هاتە دامەزراندن، زێدەباری كو خەستەخانەكا دی ل گوندێ دێركێ ل دەڤەرا بەرواری ژێرێ هاتبوو دامەزراندن، هەر ژ سالا (١٩٦٥)ێ هەتا سالا (١٩٧١)ێ ڤان كەسێن ل خوارێ وەكی نۆشدار ل وێرێ شۆل دكر:

عەبدلجەبار مالوێ فەلە، یەلدە پولس شەمكانی كو برینپێچ بوو، مام ئیشو سەڤرەی، جەمیل عبدولرەحمان مێرسیدی كو برینپێچ بوو، جەرجیس حەسو ئەتریشێ كو برینپێچ بوو، سەلیم ئەحمو ژێركی كو ئەو ژی برینپێچ بوو. بەلێ پشتی شەرێ (١٩٧٤-١٩٧٥)ێ ئەڤ خەستە بۆ گوندێ (بێركیاتێ) ل دەڤەرا بەرواری ژێری هاتە ڤەگۆهاستن، د.حەسەن حسێن نەجار كۆخی ل وێ خەستێ شۆل دكر[116].

ژبلی ڤێ شكەفتێ چەند شكەفتەكێن دی ژی هەنە، وەكی (شكەفتا مێو، شكەفتێن كون حەفتیاركێ، شكەفتا گۆرستانا زركێ)[117].

## گوندێ ئاڤۆكێ

ناڤێ وێ ژ ئاڤێ هاتییە، دیارە كو گەلەكا ب ئاڤە، نها پتر وەكی ئاقار دهێتە نیاسین و یا بەردایە. گوندەكێ كەڤنە دكەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژێری، د وەقفێن سولتان (حسێنێ وەلی) دا بەحسێ وێ هاتییە كرن، كو حەفت قرویش و چارێكەك ل سەر هاتینە سەپاندن، دا ببنە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان. ژبلی ڤێ چەندێ ژی وەختێ (ئیسماعیل پاشا) میرێ ئامێدیێ و لەشكەرێ وی ل سالا (١٨٤٢ز)ێ ل شەرێ (شێخكانێ) شكەستین، بەر ب ڤی گوندیڤە پاشڤە هاتبوون[118].

نها وەكی جهەكێ گەشت و گۆزاری دهێتە بكارئینان، رێژەكا مەزنا سەیرانیبان قەستا وی دكەن، ژبەر هەبوونا ئاڤەكا تەزی و دیمەنێن بالكێش و تژی دار و سیبەر[119].

## گوندێ بیلمەندێ

دبێژن كو ناڤێ ڤی گوندی ژ (بیلمەندێ_دینو) هاتییە، دیارە كو مەزارێ چاكەكی ب ناڤێ (خەلیفە حەسەن) ل وێرێ یە، خەلكێ دینێن خۆ ب مەرەما چێبوونەڤێ دئینانە سەر ڤی مەزاری دا چێبن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** كانیا سپییە.

**باشووری،** رووبارێ خازرییە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هیزانكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ چنارۆكێ نە[120].

ناڤێ ڤی گوندی د (شەجەرا زێوكی) دا هاتییە[121]. دیسان ل وەختێ سولتان حسێنێ وەلی بەحسێ ڤی گوندی دهێتە كرن[122]. شەجەرا زێوكی ل سەروەختێ میر (ئیسماعیل خانێ كورێ بەهرام خانی) هاتییە نڤیسین، ئەوێ دناڤبەرا سالێن (١١٨٢-١٢١٣مش/ ١٧٦٨_١٧٩٧ز) دەستهەلات كری[123].

پشتی شەرێ تیارێ، نێزیكی (٣٥) مالباتان قەستا ڤی گوندی كر، ئەو گوندێن وێ دەڤەرێ كو گرێدای فەلا بوون، هەمی ب سەركێشیا (مەلك خۆشابای) بوون، هەر چەندە ئەو ب خۆ ل مووسلێ بوو، هەر ل سالێن بیستا دا (مستر پورتوریكای) كو كەسەكێ ئنگلیز بوو، بزاڤكر فەلا ل ڤێ دەڤەرێ جهواركەت، ژێ داخواز كر بهێنە ڤێ دەڤەرێ، هەكە د هەیامێ سێ سالا دا كەسێ بەحسێ خویكێ نەكر یان ژێ نە دەرێخستن، ئەو دێ ل وێرێ مینن. پاشی كەسێ

ئەو سحبەتە نەكر و ئەو فەلە ل وێرێ مان. بەلێ پا خویك ددا حكۆمەتێ.

خواندنگەهـ ل ڤی گوندی نەبوو، ل سالا (٢٠٠٦)ێ جادە ژ نوی یا گەهشتییە گوندی، بنكەكێ ساخلەمیێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ ل وێرێ هاتییە دانان. نها (٣٣) مالبات لێ دژین، ژ (١٦٨) كەسا پێكدهێن[١٢٤].

ل دووڤ سەرژمێرێن سالا (١٩٥٧) (٩١) كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٢٥]. هەژی گۆتنێیە كو ل سالا (١٩٨٣)ێ وەختێ حكۆمەتا ئێراق جارجار ئەڤ دەڤەرە تۆپباران دكر، جحێلەكێ گوندی كەتە بەر تۆپەكا وان و هاتە شەهیدكرن[١٢٦].

بەروبیاڤێ گوندی (٢٤٧٣) دۆنەمێن ئەردییە، (٢١.٢٠) دۆنەمێن ئەردی د ئاڤینە، (١٧٨٨) دۆنەم وەكی رێل دهێنە هژمارتن، (٣٩٠) دۆنەم ژی چەروانگەهێن گوندینە[١٢٧].

## گوندێ هیزانكا ژێری

ئەڤ ناڤە ل دووڤ شرۆڤەكرنا فەلا یا ب مشەختبوویاڤە گرێدایە، بەلێ هندەك دبینن كو ناڤێ وێ ژ (لیزانكێ) هاتییە كو ئەو فەلێن تیارێ ئەوێن مشەختبووین ژ وی گوندی هاتبوون[١٢٨].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** رووبارێ خازری.

**باشووری،** گوندێ هیزانكا سەری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خەلیلانێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بیلمەندا دینۆیە.

ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی جۆكێن رووبارینە.

نڤیسەرێ مووسلی (یاسین ئەلعومەری) ئاڤریەكێ ب گوندێن هیزانكێ ددەت و دبێژیت: خەلكێ ڤی گوندی تویتنێ دچینن كو یا نەرمە بۆ كێشانێ[١٢٩].

ل سالا (١٩٢٥)ێ نێزیكی (٤٠) مالباتان قەستا ڤی گوندی كرییە، پاشی ئێكسەر كەنیسەك ب ناڤێ (مار گورگیس) ئاڤاكریە، مەتران (سەركیسی) ل سالێن پێنجییان دا ئەڤ كەنیسە ب رێڤەدبر، پاشی ل سالێن حەفتییان دا (مەتران تومای) برێڤەدبر[١٣٠].

ل دووڤ سەرژمێرێن سالا (١٩٥٧)ێ ٢١٠ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣١]، د دەمێ بەرهەڤكرنا ڤێ نڤیسینێدا (٣٥) مالبات لێ دژین، كو دبنە (١٣١) كەس. ل سالێن (١٩٦٤) و (١٩٦٩) و (١٩٨٨)ێ ئەڤ گوندە هاتییە سۆتن و بەردان.

ل سالێن شێستان خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هەبوو، ل سالا (١٩٧٢)ێ ژمارا خویندكاران (١٥٠) كەس بوون، هەتا پۆلا شەشێ سەرەتایی هەبوو[١٣٢].

ژ جهێن بەرنیاس و شوینواری ل ڤی گوندی، شكەفتا هیزانكێ و كاڤلێن گۆمێ و هیزانكا كەڤن[١٣٣].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٤٧٧٠) دۆنەمێن ئەردینە، ژ وان (٣٦٧) دۆنەم د دێمن، (٣٥) دۆنەم ژی د ئاڤینە[١٣٤].

## گوندێ سپیاڤێ

دبیت ناڤێ گوندی ژ رەنگێ سپی هاتبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن سپیندارێ و بەرئاشێ.

**باشووری،** گوندێ مێرگەهەلێ.

**رۆژهەلاتی،** چەلۆكێ و گوندێ سیارێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن غەلبۆكێ و خرابیا.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣٥].

ل ڤی گوندی ئێك ژ شەرێن میرگەها بەهدینان رویدایە، نەخاسمە ل سەروەختێ میر (بەهرام پاشایێ مەزن)[١٣٦] و میر مەلكی سەركێشێ لەشكەرێ سەیدی خان بەگێ ل سالا (١١٣٣مـش/١٧٢٠ز)ێ. بەلێ هەتا نها ناسناما ڤی سەیدی خانی نەهاتییە زانین، دیسان ئەگەرێ هنارتنا لەشكەری بۆ ڤی شەری دیار نینە، نڤیسەڤانەكێ هەڤدەم ئاڤرییەك ب ڤێ چەندێ كرییە، نەخاسمە وەختێ نێرینێن

خۆ ل سەر دەستنڤیسا ژمار (١٦٩٢٢) ل ناڤەندا نشتمانی یا دەستنڤیسا ل بەغدا كری[١٣٧].

## گوندێ بێركیاتێ

بۆچوونەك هەیە كو ناڤێ ڤی گوندی ژ (بێتكار) هاتبیت، ژبەركو ئەو خەلكێ قەستا ڤی گوندی كری ژ بێتكارێ هاتبوون[١٣٨]. بەلێ ئەڤ بۆچوونە یا لاوازە، ژبەركو ئەڤ ناڤە ژ وێ چەندێ كەڤنترە، ئەم ب دوور نابینین كو بنیاتێ ڤی ناڤی ئارامی بیت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** چیایی كۆكەلییە و گوندێ بێبادا ئیسلامە.

**باشووری،** چیایێ خێرێ.

**رۆژهەلاتی،** كەڤرێ ساركا بێركیاتێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ شكیرانێ.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی پتر كانیكن، ژ وان (كانییا شكێنمێ، كانیكا سۆرێ، كانیكا ریسی، كانییا مەزن، كانی سارکێ، ئاڤ گویزكێ)[١٣٩].

كۆمەكا جهێن بەرنیاس و شوینواری و پیرۆز ل ڤی گوندی هەنە، ژ وان (گۆڕستانا ملكا رەشوێلا، گۆڕستانا شێخ خدری، گۆڕستانا ملكا مەوتێ، مشایخێ پیری، زێدەباری كو كانییا مەزنا گوندی كڤانەك ل سەر هەبوو). سێ كاڤلێن مزگەفتا لێ هەنە، ژ وان مزگەفتا سەر كەڤری و مزگەفتا ناڤگوندی. دو شكەفت ژی ل ڤی گوندی هەنە (شكەفتا مەلا تەیب و شكەفتا كەرا).

هندەك پێزانین ل سەر چالاكیێن رەوشەنبیری ل ڤی گوندی گەهشتینەمە، ژ وان ناما (اداب البحث) یا (ئیسماعیلێ ئەلكلنبوی) كو ل سالا (١٣٦٤مش/ ١٩٤٤ز)ێ نڤیسییە[١٤٠]. دناڤبەینا سالێن (١٩٦١- ١٩٦٥)ێ شێخ عوبەیدێ نسری مەلایێ ڤی گوندی بوو[١٤١].

### پێكهاتا گوندی:

چوار ئویجاخ ل ڤی گوندی دژین، ئەو ژی (مال مەلا، مالا عەلوی، مالا هێلێ، مالا فەتەحی). ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٩٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤٢]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی (٥٠) مالبات لێ هەبوون، ل سالا (١٩٧٩)ێ جادە گەهشتیێ، بەلێ هەتا نها سالا ٢٠١٥ كارەب نەگەهشتیێ.

هەژی گۆتنێیە كو ل سالا (١٩٧٤-١٩٧٥)ز)ێ خەستەخانا شۆڕشێ ئەوا ل گوندێ شكەفتێ بۆ گوندێ بێركیاتێ هاتییە ڤەگوهاستن[١٤٣].

خواندنگەها فەرمی گەهشتبوو گوندی، بەلێ چ ئاڤاهی نەبوون، د سالێن هەشتییان دا د مالەكێ ڤە بوو، دناڤبەینا (٢٥-٣٠) خویندكاران لێ دخواند. نها خەلكێ گوندی نێزیكی (٥٠٠) مالباتانە، بەلێ گوند یێ بەردایە[١٤٤].

## گوندێ هیزانكا سەری

دیارە كو ناڤێ وێ ژ گوندێ (لیزانێ) هاتییە، كو ئەو گوندە یێ دكەڤیتە دەڤەرا تیارییا و فەلێن ڤی گوندی ژ وێرێ مشەختبووینە[١٤٥].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بلمباسا.

**باشووری،** گوندێ ژۆلێ.

**رۆژهەلاتێ،** گوندێ خەلیلانێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ هیزانكا ژێری.

وەكی وان گوندێن دی یێن فەلا، ل سالا (١٩٢٥)ێ نێزیكی (٢٣) مالباتان قەستا ڤی گوندی كربوو، بۆ مەرەمێن دینی قەستا كەنیسا (مارگورگیس) ل هیزانكا خارێ دكر، دیسان بۆ خواندنێ ژی هەر قەستا خواندنگەها هیزانكا خارێ (ژێری) دكر. نها گوند یێ ئاڤایە، (١٠) مالبات لێ دژین، ژ (٤٢) كەسا پێكدهێن[١٤٦].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٦٦٠) دۆنەمێن ئەردینە، ژوان (٢٠) دۆنەم ئەردێ دێمن، (٢٥) دۆنەم ژی چەروانگەهن. (٣٦٥) دۆنەم ژی وەکی رێل دهێنە هژمارتن[147].

## گوندێ خەلیلانێ

دیارە کو جهێ وێ دکەڤیتە سەر ئەردەکێ حەلان ئانکو بەرێ حەلانی ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ (خەلیلانێ)، ئانکو جهێ گوندی دکەڤیتە سەر حەلان خیزەکی، هوسا ناڤێ گوندی ژ جهێ وی یێ جوگرافی هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ژۆلێ.

**باشووری:** رووبارێ خازری.

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ خازری.

**رۆژئاڤایی:** هیزانکا ژێری و گوندێ ژۆلێ[148].

**ژێدەرێن ئاڤێ** بەری نها جۆك بوون کو ژ رووباری دهاتنە کێشان، بەلێ نها حکۆمەتێ پرۆژەیەك بۆ گوندی ئینایە. هەر چەندە کانییەکا کەڤن ل ڤی گوندی هەیە دبێژنێ (کانییا رەشید ئاغای).

بۆ خواندنێ و پێرابوونێن دینی خەلکێ ڤی گوندی قەستا هێزانکا خارێ دکەن[149].

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ ڤی گوندی هەمی مەسیحینە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ (٨٢) کەس ل ڤێرێ دژیان، بەلێ ئەڤ گوندە گەلەك جاران هاتییە وێرانکرن، ل سالا (١٩٨٧)ێ گوند هاتییە بەردان[150]. نها گوند یێ ئاڤایە و (١٩) مالبات لێ دژین، ژ (٦٣) کەسان پێکدهێن[151].

ل سالا (١٩٦٩)ێ و ل دەمێ شۆرشا ئیلۆلێ، شەرەکێ مەزن ل ڤێ دەڤەرێ دناڤبەرا پێشمەرگەی و سوپایێ حکۆمەتا ئێراقێ رویدا بوو، کو ب داستانا (گەلیێ دوبرێ) دهێتە نیاسین، ل وێرێ (٨) پێشمەرگەیێن ڤەلا هاتبوونە شەهید کرن، ئەو ژی ئەڤەنە:

١- تەلیا شینو، سەرقول بوو خەلکێ کۆرێت گاڤانا بوو.

٢- یوخەنا، جێگرێ وێ بوو خەلکێ گوندێ دیهێ بوو.

٣- یەلدا ئیشو.

٤- دانیال توما.

٥- مۆشێ زەیا.

٦- شلێمون ئیشو.

٧- نویا توما.

٨- ئیشو، خەلکێ بێبادێ بوو[152].

## گوندێ ژۆلێ

ناڤێ ڤی گوندی نەیێ دیارە کا ژ چ هاتییە، بەلێ نەدوورە ب ناڤێ وی گوندی بیت ئەوێت فەلە ژ تیارێ ژێ هاتین.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ بلمباسێ.

**باشووری:** گوندێ خەلیلانێ.

**رۆژهەلاتی:** رووبارە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هیزانکا ژووری.

ژێدەرێ ئاڤا وان جۆکن، ژێدەبارێ کو ڤێ داوییێ حکۆمەتێ پرۆژەیەك ل وێرێ ئاڤاکرییە.

### پێکهاتا گوندی:

ل سالا (١٩٢٥)ێ نێزیکی (٢٠) مالباتان قەستا ڤی گوندی کربوو، بۆ خواند و پێرابۆنێن دینی قەستا گوندێ هیزانکێ دکر. ل دووڤ سەرژمێرێن سالا (١٩٥٧) (٨٨) کەس ل ڤی گوندی دژیان[153]، لێ پشتی کاودانێن شۆرشێ ئەو خەلك دەربەدەر بوو، ل سالا (١٩٨٧)ێ (٣٤) مالبات لێ هەبوون، بەلێ گوند هاتەبەردان[154]. نها (٢١) مالبات لێ دژین کو دبنە دو بنەمال: (بنەمالا بەنی وانیس و بنەمالا بەنی بەنسەح) و هەمی تێکدا دبنە ژ (٧٩) کەس.

ژ تشتێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەبوونا ئاشێ ئاڤێ بوو، كو برنج و ئار لێ دهاتنە هێران، هەتا سالا (١٩٧٧)ێ ژی ئەڤ ئاشە مابوو[١٥٥].

## گوندێ بەركەڤری

ژ ناڤێ وی یێ دیارە كو دكەڤیتە بەر كەڤرەكی، ژبەر ڤێ چەندێ ناڤ ژ وەزیفا وی هاتییە وەرگرتن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ ئەلیلێ.

**باشووری:** رووبارێ خازری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چەم رەبەتكێی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گری یە.

ژێدەرێ ئاڤێ كانییا گوندییە.

بەری سالا (١٩٩١)ێ ئەڤ جهە وەكی ئاڤار دهاتە هژمارتن و كەس لێ نەدژیا، بەلێ ل سالا (١٩٩١)ێ دو مالبات هاتینە د ڤی گوندی دا، لێ ژبەر كاودانا ل سالا (١٩٩٧)ێ جارەكا دی گوند هاتییە بەردان، هەتا سالا (٢٠٠٧)ێ جارەكا دی خەلك ڤەگەریایە سەر گوندێ خۆ، نها (١٢) مالبات لێ دژین، ژ (٦٦) كەسا پێكدهێن. هەتا ئامادەكرنا ڤی بابەتی (ل سالا ٢٠١٥ێ) خواندنگەهـ و مزگەفت و كارەب نەگەهشتینە گوندی[١٥٦].

ژ جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی، شكەفتا گەلی بانێ و شكەفتا باسكێ بەرمێشێ[١٥٧].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٤١٢٥) دۆنەمێن ئەردییە، ژ وان (٢٨) دۆنەم ئەردێ دێمە، (٣٠٠) دۆنەم وەكی چەروانگەهـ دهێنە هژمارتن، (٣٣١٣) دۆنەم وەكی رێل دهێنە هژمارتن[١٥٨].

## گوندێ گری:

دكەڤیتە سەر گرەكێ بلند، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ گوندێ گری.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ خالەتا.

**باشووری:** چیایێ خێرێیە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەركەڤری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مسەلەكایە.

كانییا گوندی ژێدەرێ ئاڤێ یێ سەرپشكە، ژبلی نها جۆكەكا كونكرێتكری هاتییە چێكرن و خەلك مفای ژێ وەردگریت.

گەلەك جهێن بەرنیاس و شوینواری لێ هەنە، وەكی ژمارەكا گۆڕستانا، خلوا (خەلا شێخ عیسای) كو د كەڤری را هاتییە كۆلان. خەلكێ ڤی گوندی شێخن و سەر ب تەریقەتا عەباسیا ڤەنە.

گەلەك جارا ئەڤ گوندە هاتییە خرابكرن، ل سالێن (١٩٧٦- ١٩٨٨- ١٩٩٧)ێ گوند هاتییە چۆلكرن و بەردان، بەری سالا (١٩٨٨)ێ (٥) مالبات ل گوندی دژیان، نها (٨) مالبات لێ دژین و نێزیكی (٨٠)ێ كەسانە. جادە ل سالا (١٩٧٨)ێ گەهشتییە گوندی. نها گوند یێ ئاڤایە، بەلێ كارەب و خواندنگەهـ و بنكەهێ ساخلەمیێ و مزگەفت لێ نینن[١٥٩].

## گوندێ مسەلەكا:

بنیاتێ ناڤێ ڤی گوندی یێ دیار نینە، بەلێ ئەم ب دوور نابینین كو ژ (مسلك یان رێك) هاتبیت، ژبەركو دو رێكێن سەرپشك ژ ئامێدیێ د ڤێ دەڤەرێ را دبوورین.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ كابێ.

**باشووری:** گوندێ رەمێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سوینێ.

بەری سالێن حەفتییان دا ئەڤ جهە وەكی ئاڤار دهاتە هژمارتن، بەلێ د سالێن حەفتیان دا خەلكی قەستا ڤی گوندی كرییە، نێزیكی (٥٠) مالبات لێ هەبوون، بۆ مەرەمێن چاندنێ قەستا ڤی جهی كربوو، ئاڤەكا بۆش لێ هەبوو، كو ئاشێ ئاڤێ ل بەر شۆل دكر، تەحین و ئار و ساڤار دهێران.

پشتی سالا (١٩٩١)ێ مزگەفت ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاكرن، دیسان ل سالا (١٩٩٢)ێ خواندنگەها فەرمی لێ هاتییەئاڤاكرن، هەر چەندە بەری سالا (١٩٨٨)ێ خواندنگەهـ لێ هەبوو، نێزیكی (٨٥) خویندكارا لێ دخواند.

ل سالا ١٩٨٨ێ د هەوا ئەنفالاندا گوند هاتییە خرابكرن و بـەردان، پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە سـەر گوندێ خۆ و ئاڤاكرەڤە، بەلێ جارەكا دی ژبەر كاودانێن شەڕێن ناڤخۆ ل سالا (١٩٩٨)ێ گوند بەرداڤە و نها ژی یێ بەردایە.

ژ جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی، ناوسكا گەلیێ شیڤ ماسیكێ، كو ژ سێ دەرگەها پێكدهێت، وەكی ژوورەكا چوار كوژییە و درێژاهییا هەر رەخەكێ وێ (٤م) و ل هەر رەخەكی تەختەك هاتییە نكراندن[١٦٠].

ئەردێ ڤی گوندی (٣٣٣٩) دۆنەمێن ئەردییە، (٨٩٤) دۆنەم وەكی چەروانگەهـ دهێنە هژمارتن، (٢١٨٥) دۆنەم وەكی رێل دهێنە هژمارتن[١٦١].

## گوندێ رەمێ:

دو بۆچوون ل سەر شرۆڤەكرنا ڤی ناڤی هەنە، ئێك ئەوە دبیت ناڤێ گوندی ژ ناڤێ (رەمەزانەكی) هاتبیت، ئەڤە ژی تشتەكێ بەرئاقلە كو هەر مرۆڤەكێ جهەكی ئاڤاكەت ب ناڤێ وی دهێتە ناڤكرن. یا دووێ كریارەكا خۆرستییە، ئەو كەتنا رەنیێن بەفرێیە، كو ل وی گوندی گەلەك جارا رەنیێن بەفرێ دهێنە خارێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ مسەلەكا.

**باشووری:** چیایێ خێرێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن سوینێ و بێركیاتێ.

د سالێن شێستان دا خەلكی بۆ جارا ئێكێ قەستا ڤی گوندی كرییە، هەكە بەری هینگێ وەكی زۆم و چەم دهاتە نیاسین. ژێدەرێ ئاڤێ ژی رووبارێ بەدرەدینی یە.

بەری ئەنفالێن (١٩٨٨)ێ (٣٠) مالبات لێ دژیان، ل سالا (١٩٩٥)ێ خەلكێ گوندی جادە گەهاندێ، بۆ خواندنێ ژی دچوونە گوندێ مسەلەكا، ئەوان ب خۆ ژی كارەب چێكر، ل سالا (١٩٩٧)ێ و ژبەر كاودانێن شەڕێ ناڤخۆ گوند ب ئێكجاری هاتە بەردان. هەتا نها ژی یێ بەردایە[١٦٢].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٣٠٠٠) دۆنەمێن ئەردییە، (١٨) دۆنەم دێمن[١٦٣].

## گوندێ سوینێ:

بنیاتێ ڤی ناڤی یێ دیار نینە، هەر چەندە هندەك وەسا شرۆڤەدكەن كو ناڤێ وێ ژ ناڤێ (كەلا سوینێ یا كەڤن) هاتییە[١٦٤].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** رووبارە.

**باشووری:** چیایێ خێرێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مسەلەكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێركێ.

كانییا گوندی و رووبارێ بەدرەدینی ژێدەرێن ئاڤا گوندینە.

هەتا ئەنفالێن (١٩٩٨)ێ حەفت مالبات لێ دژیان، پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ جارەكا دی خەلك زڤری سەر جهێن خۆ، نێزیكی (١٥) مالباتان لێ هەبوون، بەلێ ل سالا (١٩٩٧)ێ گوند ب ئێكجاری هاتە بەردان و هەتا نها ژی یێ چۆلە. بۆ خواندنێ خەلكێ وێ دچوونە مسەلەكا، كارەب گەهشتییێ و جادە ژی پشتی سالێن نۆتان گەهشتییێ[١٦٥].

بەروبیاڤێن ڤی گوندی (٢١٠٠) دۆنەمێن ئەردینە، ژوان (٥١،٣١) دۆنەم دێمن، (١٥٠) دۆنەم وەكی چەروانگەهـ دهێنە هژمارتن، (١٧٦٥) دۆنەم ژی وەكی رێل دهێنە هژمارتن[١٦٦].

## گوندێ باخێرێ:

ئەم ب دوور نابینین كو ناڤێ ڤی گوندی ب چیایێ خێرێڤە گرێدای بیت، یان رامانا ناڤێ وێ (دەرگەهێ خێرێ بیت).

### سنوورێن گوندی:

**بـاكــووری،** دبیتە جهێ باسكە پیشی كو چەروانكەهێن گوندیانە.

**باشووری،** گوندێ مسەلەكایە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خالەتایە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كایێ.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی كانینە، ژ وان (كانییا گوندی، كانییا قەلاڤا، كانییا سەرییشكا).

دو گۆرستان ل گوندی هەنە، زێدەباری شكەفتا (بەراكێت گۆڤەیا)، دیسان جهەكێ لێ هەی دبێژنێ (مزگەفت) كو نها كاڤلێ وێ مایە.

خەلكێ گوندی بۆ خواندنێ دچوونە گوندێ مسەلەكا، جادەكا ئاخێ دگەهیتە گوندی. ل سالا (١٩٧٧)ێ حكۆمەتا ئیراقێ ب سەر گوندی دا گرتییە و كەسەك شەهید كرییە[١٦٧]. بەری سالا (١٩٨٨)ێ (٦) مالبات لێ دژیان بەلێ د وێ سالێ دا هاتییە بەردان، پشتی سەرهلدانێ سەرژنوو گوند هاتییەڤەئاڤاكرن، ل سالا (١٩٩٧)ێ گوند هاتییە بەردان و هەتا نها ژی یێ بەردایە و بتنێ خەلك بۆ مەرەمێن چاندنێ قەستا وی دكەن[١٦٨].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٢٨٠٤) دۆنەمێن ئەردییە، (٥٤) دۆنەم دێمن، (٢٤٦٢) دۆنەم وەكی رێل دهێنە هژمارتن، (٧٥) دۆنەم ژی وەكی چەروانكەهـ دهێنە هژمارتن[١٦٩].

## گوندێ بلمباسا:

بنیاتێ ڤی ناڤی یێ دیار نینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** چیایێ خێرێ.

**باشووری،** گوندێ دێركێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كایێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ شكەفتێیە.

ژێدەرێن ئاڤێ كانینە، ژوان (بركا ژێری و بركا ژووری و ئاڤدك).

چوار مەزار ب ناڤێ مشایخ ل گوندی هەنە، ئەو ژی (مشایخێ سەرملی، مشایخێ حەجیلكێ، مشایخێ خەندەكۆكێ، مشایخێ پشت بركا ژووری). زێدەباری كو بەرێ دێرێ ژی ل گوندی هەیە، كو كاڤلێن دێرەكا كەڤن لێ هەیە، سێ ناوسك ل ڤی گوندی هەنە، ئێك دكەڤیتە دناڤ گوندی ب خۆ دا، یا دی ل رەخێ رۆژهەلاتێ گوندی، یا دی ژی ل رەخێ ژێری. خەندەكۆك ژی بەرەك بوو خەلك د بنرا دچوو، ل دووڤ باوەریێ كو دا ئەو ئێش ژێ چیت.

مزگەفتەكا گەلەك كەڤن لێ هەبوو، دكەڤتە دنیڤەكا گوندی دا، ژوورەكا چوار كوژی بوو، دەرگەهێ وێ دكەڤتە رەخێ ژووری، بەلێ پشتی گوند هاتییە بەردان، مزگەفت ژی خراب بوو، ل دووڤ گۆتنا كو پارێن سەروەختێ (هارۆن رەشیدی) لێ هاتبوونە دیتن. گوند ژ دو بنەمالا پێكدهێتن: مالا جەهوەری و مالا نەبی.

پشتی كو ل سالا (١٩٩١)ێ گوند هاتییەڤە ئاڤاكرن خواندنگەهـ وەكی مەزەلەكێ هاتە ئاڤاكرن، بانێ وێ ژی تۆتیا بوو، دووڤ دا ئاڤاهی بۆ خواندنگەها حكۆمی هاتە ئاڤاكرن، نێزیكی (٥٠) خویندكارا لێ دخواند، هەتا پۆلا شەشێ دەستپێكی هەبوو.

ل سالا (١٩٧٣)ێ جادە گەهشتییە گوندی، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧٠]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی (٤٠) مالباتان لێ دژیان، نها خەلكێ گوندی گەهشتینە (٦٠) مالباتان، بەلێ گوند ژ سالا (١٩٩٨)ێ وەرە یێ بەردایە و كەس لێ نائژیتن، قەستا چەمانكێ و دهۆكێ كریە[١٧١].

## گوندێ بارەمینكێ:

ل دووڤ هندەك ژێدەرا ئەڤ پەیڤە دبنیات دا پەیڤەكا ئارامییە و رامانا وێ (گوندێ پیرۆزە)[١٧٢].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**، گوندێ چەمانكێ.

**باشووری**، گوندێ گەڤەركێ.

**رۆژهەلاتی**، كانی مەزنێ.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ مێزێیە.

كۆمەكا ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی هەنە، ژ وان (كانیكا خدر عەباسا، كانیكا گەلیێ گەڤەركێ. زێدەباری ئاڤا رووباری و بیرێن ئیرتوازی بۆ هاتینە كۆلان).

بارەمینكێ وەكی مالباتەك دهێتە نیاسین كو سەركێشیا بەرواری ژێریێ كریە، بنیاتێ وێ ژ ئەشیرەتا پنیانشیانە، كو ژ گوندێ چەلێ ل رەخۆدۆرێن جولەمێرگێ هاتینە، ل دەستپێكێ ل قومریێ جهوار بوون، پاشی بەر ب بەرواری ژێریڤە هاتن، ئەڤە ژی ل رەخۆدۆرێن سالێن (١٢٢٥مـــش/١٨١٠ز)ێ. چەند سەركێشەكا ئەڤ مالباتە یا برێڤەبری، ئەو ژی:

١- عبدولرەحمان ئاغا ١١٤٣-١١٨٤مـــش/١٧٣٠-١٧٧٠زێ.

٢- عەبدورەحیم ئاغا ١١٨٤-١٢١٣مـــش/ ١٧٧٠-١٧٩٨زێ.

٣- عەبدوللا ئاغا ١٢١٣-١٢٤٦مش/ ١٧٩٨-١٨٣٠زێ.

٤- مێرخان ئاغایێ ئێكێ ١٢٤٦-١٢٨٧مش/ ١٨٣٠-١٨٧٠زێ[١٧٣].

چەند جهەكێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەنە، ژ وان بەرێ شبلێ، دو گۆرستان و دو خەرینك هەنە، هسلا دۆشاڤێ و بەرێ جۆنێ ل وێرێ هەنە.

د سالێن پێنجیبان دا (مەخفەرا پۆلیسا) ل وێرێ هەبوو، زێدەباری بنكەهەكێ نۆشداریێ، ڤان نۆشدارا لێ شۆلدكر.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٤ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧٤]. ل سالا (١٩٧٤)ێ بۆ جارا ئێكێ جادە گەهشتیە ڤی گوندی، بەلێ ل ڤان سالێن دویماهیێ هاتیە ڤێركرن. ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٦١، ١٩٨٨ و ١٩٩٧)ێ هاتیە بەردان و جارەكا دی ئاڤاكرن، هەتا جارا داویێ ل (١٩٧٧)ێ هاتیەبەردان، هەر چەندە نها خەلكی هندەك خانی بۆ مەرەمێن گەشت و گوزاری لێ ئاڤاكرینە.

ل سالا (١٩٩٤)ێ خواندنگەهـ گەهشتیە ڤی گوندی. ل دەستپێكێ د خانیەكی ڤە بوو، هەتا پۆلا شەشێ دەسپێكی هەبوو، (١٢) خویندكاران لێ دخواند[١٧٥]. هەژیە بێژین كو ل سالا (١٩٤١)ێ مەلا تهایێ ردینی مەلایێ ڤی گوندی بوو[١٧٦].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (١٢١٥) دۆنەمێن ئەردینە، (١٠.١٨٦) دونەم ددێمن، (٤٠) دۆنەم چەروانكەهن، (٩٦٤) دونەم ژی وەكی رێل دهێنە هژمارتن، (٣٠) دونەم وەكی كەڤر دهێنە هژمارتن[١٧٧].

## گوندێ كانی مازێ:

ژبەر هەبوونا رێژەكا مەزنا كانی و دارێن مازیا دبێژنێ كانی مازێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**، گوندێن سێ دەرا و ئاتۆشێ.

**باشووری**، گوندێ بێبادێ.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ شكەفتێ.

**رۆژئاڤایی**، ناڤەندا چەمانكێ.

كۆمەكا كانیێن ئاڤێ لێ هەنە، كو دبنە ژێدەرێن سەرێشك بۆ ئاڤا گوندی، ژ وان (كانی زەركێ، كانی جەماعەتێ، كانییا ئاقد، كانی گەرمكێ، كانی قەرەچكێ، كانیكا بەرێ شین، كانی شنكا، كانییا حەجی، كانیكا مام عەمەری، زێدەباری رووبارێ بەدرەددینی).

كۆمەكا جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەنە، ژ وان زینا زەركێ، گەلیێ كانی مازێ، دەڤ تەحتا.

ئەڤ جهە وەكی جهێن گەشت و گوزاری دهێنە ژمارتن. زێدەباری چەند جهێن پیرۆز و شوینواری وەكی: جماتێ و پیر مەحموود و پیرێ حەلان و خلوا پیر حەلانی، دو مەزار ژی هەبوون، كو گۆمبەت ل سەر هاتبوونە ئاڤاكرن بەلێ د سالێن حەفتییاندا خراب بووینە. شوینوارێن دێرەكێ ل وێرێ هەنە دبێژنێ

(دێرا کانیا نیسکا)، دیسان شویرهێن کەلایەکێ ل جهەکی هەنە دبێژنێ (سەملکێ). گۆڕێ (قوتاس ئاغای) ل ڤی گوندییە، رۆژا مرنا وی ل سەر نڤیسیە، ئەو ژی (١٢/ربیع الاول/١٢٢٥مـــش)ێ. زێدەباری کو (دەرینکێ ئیمام عەلی و کەزانا ئیمام عەلی) ژی ل ڤی گوندی ناڤدارن، ژبلی بەرێ خزینێ کو خەلکی ڤەکۆلایە و چەند پرتێن گۆزکا ژێ ئینایەنەدەر، دیسان بەرێ بویك و خەسیا ژی ل ڤی گوندی هەیە.

دو مزگەفت ل ڤی گوندی هەبوون، ژ بەرێ بازی هاتبوونە ئاڤاکرن، بانێ وان ژی ب کاریتا هاتبوو چارەکرن، ژ مەلایێن ناڤدار ل ڤی گوندی (مەلا ئۆسمانێ کەڤن، مەلا سالح و مەلا عەلی). بەلێ ل سالا (١٩٩٥)ێ مزگەفتەکا نوی ل وێرێ هاتییە ئاڤاکرن.

ل سالێن هەشتییان خواندنگەهـ ل گوندی هەبوو، (١٠-١٢) خویندکارێن کور و کچ لێ دخواند. پشتی سالا (١٩٩١)ێ نێزیکی (١٣٥) خویندکارا لێ دخواند.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٧٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧٨] و بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی (٥٠) مالباتان ل گوندی هەبوون، بەلێ ئەڤ گوندە کەڤتە بەر هەوا ئەنفالان و (٣٩) کەس ژ خەلکێ گوندی هاتنە ئەنفالکرن و هەتا نها ژی دبەرزەنە[١٧٩].

سالا (١٩٩١)ێ جارەکا دی خەلکێ گوندی ڤەگەریانە سەر گوندێ خۆ، بەلێ ژبەر کاودانێن شەڕێ ناڤخۆ، ل سالا (١٩٩٧)ێ گوند هاتە بەردان و خەلکێ وێ قەستا کەمپا ئەتریشێ کر، نها ژی گوند یێ بەردایە. کارەب لێ نینە و جادە هەر ژ سالێن هەشتییان دا گەهشتییێ. نها خەلکێ گوندی (٤٥٠) مالباتن.

هەژییە بێژین کو کارگەهەکا ئاڤێ ل ڤی گوندی هەیە، دبێژنێ (کارگەها دلۆپاندنا ئاڤا شرین)[١٨٠].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٢٥٤٢) دۆنەمێن ئەردینە،

دیمەنەك ژ گوندێ کانی مازێ



(٦٥٠) دۆنەم ژ وان دیٚمن، (١٣٢،٥) بستانێن ئاڤینە، (٤٨٣) دۆنەم وەکی چەروانگەهـ دهێنە هژمارتن، (١٢٠٠) دۆنەم وەکی رێل دهێنە هژمارتن[١٨١].

## گوندێ دێرکێ:

ناڤێ وێ ژ ناڤێ کەڤنە دێرەکێ کو دکەڤیتە د ناڤ وی گوندی دا هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بلمباسایە.

**باشووری،** حەسارە کەڤرە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سوینێیە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ شکەفتێیە.

ژێدەرێن ئاڤێ رووبارێ بەدرەدینییە کو دو جۆك بۆ گوندی ژێ دهێن، زێدەباری چەند کانییان، ژوان: کانییا کەندالی، کانییا بلێ، کانییا نزیرکێ، کانییا گوندی.

دیارە کو خەلکێ ڤی گوندی هەشت بابە ل ڤێرێ دژین، بابێ ژ هەمیا کەڤنتر (ئیبراهیمە) کو ژ ئێزدیێن بێرکیاتێ بوو. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٨٢].

ژ جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی: مەزارێ پیربەکری کو خەلکی قەست دکرێ، موغبەرا مەیدانا، موغبەرا خارێ ماشا، موغبەرا دێما، دو ناوسك ژی ل ڤی گوندی هەنە، ئێك جهێ دو مرۆڤایە و ئێك ژی جهێ سێ مرۆڤایە و دبێژنێ (ناوسکا دیمایە).

بەری سالا (١٩٨٨)ێ پێنج مالبات لێ دژیان، خواندنگەهـ نەگەهشتییە گوندی، جادە ل سالێن حەفتێ گەهشتییێ. وەختێ ئەنفالا دو کەس ژ گوندیا هاتنە ئەنفالکرن. نها ژی گوند بێ چۆل و بەردایە[١٨٣].

بەروبیاڤێ ڤی گوندی (٢٤٠٢) دۆنەمێن ئەردینە، ژ وان (١٠٠) دۆنەم دیٚمن، (٣٥٤) دۆنەم وەکی چەروانگەهـ دهێنە هژمارتن، (١٧٥٠) دۆنەم وەکی رێل دهێنە هژمارتن[١٨٤].

## گوندێ سیانێ

ل دووڤ شرۆڤەکرنا فەلا بۆ ڤی ناڤی، رامانا وێ جهێ شۆلییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندی دەڤەرا بەرگارەیە.

**باشووری،** گوندێ مێرینکێ.

**رۆژهەلاتی،** چەمچالێیە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئەرگنێ.

چەند جهەکێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەنە، ژ وانا دو دێرن کو ئێك دکەڤیتە سەراڤا گوندی ئەوا دی ل ناڤ گوندییە، دیسان گۆرستانا جوییا و گۆرستانا فەلا لێ هەنە، تربێ شێخ زندی، شکەفتا شێخ حەلانی.

د کتێبا (المعجم التاریخی لامارة بهدینان) دا هاتییە: ئەڤ گوندە دکەڤیتە رەخێ ژێرێ رۆژئاڤایێ ئامێدیێ، نێزیکی گوندێ ئەرگنێ، د وەقفێن سولتان حسێنێ وەلی دا ئاڤرێ پێ هاتییە کرن، کو حەفت قرویش و پێنج بەغدادی ل سەر هاتینە سەپاندن، دا کو ببیتە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان[١٨٥].

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٤٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٨٦].

ل سالێن پێنجیان دا خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هەبوو، هەتا نها کاڤلێن خواندنگەهێ مانە، بەلێ هەر دوان سالان دا هاتە گرتن، ل سالا (١٩٧٨)ێ جارەکا دی هاتە ڤەکرن، بەلێ پشتی سالەکێ ئانکو ل سالا (١٩٧٩)ێ هاتە گرتن، نێزیکی (٢٠) خویندکارا لێ دخواند. هەتا نها جادە نەگەهشتییێ و چ خلمەت ژی نەگەهشتینێ[١٨٧].

## گوندێ ئاتۆشێ

ئەڤ رەنگێن ناڤا پتر ناڤێن ئۆرارتینە، ژبەرکو پتریا ئەو ناڤێن ب گەها (ئش، ئوش) ب داوی دهێن بنیاتێ وان ئۆرارتیە، وەکی پنیانش، تروانش، متلاوش.

ئەڤ گوندە دکەڤیتە ژێرێ ئامێدیێ، ل ژوورێ

گوندێ شکەفتێ و بلمباسێ، فەلە لێ بوون، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٨٨].

د وەقفێن سولتان حسێنێ وەلی دا ئاڤری پێ هاتییە کرن، کو حەفت قرویش ل سەر هاتینە سەپاندن، دا کو ببنە وەقف بۆ خواندنگەهـا قوبەهان. کاسولیکیەت دناڤ دا بەلاڤ ببوو، ل سالا (١٨٤٢ز)ێ دویڤکەتیێن کاسولکیەتێ ببوونە (١١) مالبات، دو کەنیسە ژی هەبوون[١٨٩].

## گوندێ چەمچالێ

دبیت ناڤێ وێ ژ چەمەکێ چال یان بێ کویر هاتبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** بەرێکارەی و ئێکمالەنە.

**باشووری:** گوندێن دەڤەرا نەهلێنە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چەم شرتێیە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سیانێ.

ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی ئەڤەنە: گەلیێ سیانێ و ئاڤا برکێ، کانیکا خەندە سۆرکێ و گریشی. دو ئاشا ل بەر ئاڤا سیانێ شۆل دکر.

چەند جهێن بەرنیاس ل ڤی گوندی هەنە، وەکی: ناوسکا چەمچالێ کو دبەرەکی را ل نیڤەکا زەڤیەکێ هاتییە کۆلان، زێدەباری مناسبێ شێخ (ئەولامی) ل نیڤا گوندی هەیە.

بەری سالا (١٩٨٨ز) پێنج مالبات ل گوندی هەبوون، نها کەس لێ ناژین، نە جادە نە چ خلمەتێن دی نەگەهشتینێ[١٩٠].

## ڤەرێژ

پشتی ڤێ دویڤچوونا رەنگین، ئەم گەهشتینە گەلەك خالێن گرنگ، کو دڤێت جهێن شۆلەژێ ئاڤریەکێ پێ بدەن، وان خالا ژی وەکی ڤەرێژا ڤێ ڤەکۆلینێ دێ بەرچاڤ کەین:

١- پێدڤییە پیڤانەکا شوینواری ل سەر وێ دەڤەرێ بهێتە کرن، ژبەرکو کۆمەکا مەزنا شوینواران ل وان دەڤەرا هەنە، هەتا نها د کتێب و ئەتلەسێن جهێن شوینواری دا نەهاتینە تۆمارکرن، زێدەباری کو پشکەکا مەزنن ژ دیرۆکا دەڤەرێ.

٢- ئەڤ دەڤەرە دەرێنکێ ڤەکرنا میرگەها بەهدینان بوو ل سەر دەڤەرێن دی، ئانکو رێکەکا بازرگانی بوو کو د دەڤەرێ را دبووری، ژبەر ڤێ چەندێ شوین تبلێن میرگەها بەهدینان گەلەك ل ڤێ دەڤەرێ هەنە، بەلێ هەتا نها وەکی پێدڤی ڤەکۆلین ل سەر نەهاتییەکرن، بۆ وێ چەندێ سەمتا دیرۆکی و لەشکەری ل ڤێ دەڤەرێ بهێتە دیارکرن.

٣- بەردانا وێ ژمارا مەزنا گوندا، کو ژلایەکیڤە دێ کێنجا خۆ ل سەر توپوگرافیا (پێکهاتا خەلکی) کەتن، ژ (٤٨) گوندا تنێ (١٢) گوند د جهوارن، هەر چەندە ژمارە هێشتا کێمترە، تنێ (١٠) گوند د ئاڤانە ئەوێت دی وەکی زۆم و چەروانەگەهـ خەلکی قەستکریێ.

٤- ئەڤ دەڤەرە جهەکێ گەشت و گۆزاریێ گەلەك مەزن و ژێهاتییە، پێدڤیە جهێن شۆلەژی ب دروستی ل سەر براوستن، ژبەر هەبوونا ئالاڤێن گەشت وگۆزاریێ وەکی ئاڤ، دار و بار، جهێن شوینواری، سەقایەکێ هوین، زێدەباری دیمەنێن رەنگینێن چیا و دۆلێن دەڤەرێ.

# بازێرێ سێمێلێ

شەوكەت تاها شاهین
وەرگێران: خالد سالح

قەزایەكا سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤەیە، یەكەمین قەزایە پشتی پێكئینانا پارێزگەها دهۆكێ، ژ قەزایێن دهۆك، زاخۆ و ئامێدیێ ل سالا ١٩٦٩ێ ل ڤان سێ قەزایان هاتییەزێدەكرن و پارێزگەهـ پێ بوویە چوار قەزا، دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (١٦كم) ژ ناڤەندا بازێرێ دهۆكێ، بلنداهییا وێ ل ئاستێ دەریایێ نێزیكی (٥٠٠م)[1]، ناڤێ وێ یێ د ژێدەرێن سریانی دا ب (شمعالا، یان شمالا) هاتی، و پشتی هاتنا ئیسلامێ، ڤی ناڤی پێشڤەچوون یا بخۆڤە دیتی و بوویە (سمیل)[2] و وەسان دهێتە پێشبینی كرن كو یا ژ پەیڤا (سمالا) یا سریانی هاتی ب واتایا (شمال). هندەك ژی هەنە دبێژن بنیاتێ پەیڤێ یا ژ (شمع ایل) ب واتایا (من كوهـ لێ یە خودا- اسمع یارب)[3] یا هاتی. د بەرگێ سێیێ ژ (معجم البلدان) ژی دا، ب (سەمویل) هاتییە، و (ئەبو مەنسۆر) ی گۆتییە كو (سەموێل) ناڤێ فرندەكی یە[4]، و دبێژن بنیاتێ سێمێلێ یێ ژ (سێ مێل) هاتی كو (مێل) ب واتایا مل، یان (گر)، واتە ناڤێ سێمێلێ یێ ژ (سێ ملان، سێ گران) هاتی[5]، ئەو سێ گر (مل) ژی هندەك ب هەر سێ ملێن: ملا مالا، ملا زیارەتا، ملا بێدەرا دەست نیشان دكەن[6]. هندەك ژی دبێژن ناڤێ سێمێلێ یێ ژ (سێ مال) هاتی[7]، كو سێ مالێن (دنان) یێن ئێزدی لێ بوون و ڤان سێ بنەمالان ناڤ و دەنگییا خۆ ب زیرەكیێ هەبوو[8]. هەژییە بێژین هەردو بۆچوونێن داویێ پتر جهێ باوەریێ نە و چەندین جهێن دی ل كوردستانێ ب ڤان رەنگە ناڤان هەنە وەك بسملێ ل نێزیكێ ئامەدێ و سێ مالكا ل زاخۆ و چەندین گوند ب ناڤێ ئێك مالێ.

دناڤ رۆژنامەگەریێ ژی دا یەكەم جار ناڤێ سێمێلێ ل ٧ كانوونا دووێ سالا (١٩٠٩)ێ یێ د كۆڤارا (كورد تعاون و ترقی غزتسی) دا هاتی، ئەڤ كۆڤارە زمانحالێ كۆمەلا تەعاون و تەرەقیا كورد بوو ل ستەنبۆلێ[9].

## جهێ جوگرافی:

ژ لایێ جوگرافی ڤە سێمێلێ دكەڤیتە دناڤبەرا هەدو بازنەیێن پانییێ (٥٢-٣٦) باكوور و هێلا درێژاهییێ (٥١-٤٢) رۆژهەلاتی[10]، سەرجەمێ رووبەرێ قەزا سێمێلێ ل سالا (١٩٨٢)ێ (١١١٧كم) یێن چوارگۆشە بوون، ل سالا (١٩٨٥)ێ ب هەرسێ ناحییێن خۆڤە- ناڤەند و فەیدیێ و باتیلێ (١٣٩٨كم) چوارگۆشەنە[11]، كو رووبەرێ هەر ناحیەكێ ب ڤی شێوەیی یە:

- ناحیا سێمێلێ: (٣٠٦كم)یێن چوارگۆشە، ب رێژەیا ٢٢٪ ژ سەرجەم رووبەرێ قەزا سێمێلێ.

- ناحیا فەیدیێ: (٢٨١کم)ێن چوارگۆشە، ب رێژەیا ٢٠٪ ژ سەرجەم رووبەرێ قەزا سێمێلێ.
- ناحیا باتێلێ: (٨١١کم)ێن چوارگۆشە، ب رێژەیا ٥٨٪ [١٢] ژ سەرجەم رووبەرێ قەزا سێمێلێ.

## سنوورێن قەزایێ:

**باکووری:** زنجیرا چیایێ بێخێری و چیایێ سپی.

**باشووری:** پارێزگەها نەینەوا.

**رۆژهەلاتی:** ناڤەندا قەزا دهۆك و چیایێ دهۆکێ.

**رۆژئاڤا و باشوورێ رۆژئاڤایی:** ئاڤا مەزن (رووبارێ دیجلە) و سکرێ مووسل و (٢کم) دکەڤیتە سەر سنوورێ سوریا.

**باشوورێ رۆژهەلاتی:** چیایێ دهکان[١٣].

## سنوورێن ناحیا سێمێلێ:

**باکووری:** گوندێن شێزێ و قەشەفرا رۆژئاڤا و کانی سپیێ.

**باشووری:** کۆمەلگەها خانکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن سەرتەنگ و حەوشکێ.

**رۆژئاڤایی:** کۆمەلگەها موسێریکێ.

ژمارا ئاکنجیێن گوندێ سێمێلێ ل سالا (١٩٤٧) ێ (٦٢٣) کەس بوون، ل سالێن (١٩٥٧، ١٩٦٥، ١٩٧٠، ١٩٧٧، ١٩٨٦)، ژمارا ئاکنجیێن ناحیا سێمێلێ بوونە (١٧٣٥٩، ١٢٦٢٤، ١٨٩٣١، ١٨١٣٤، ٥٠٨١٨) کەس ل دووڤ ئێك و ل سالا (١٩٨٦)ێ ژمارا ئاکنجییان ل قەزا سێمێلێ بوونە (٥٠٨١٨)[١٤] کەس و نها و د دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێدا ژمارا ئاکنجیێن وێ نێزیکی (١٦٧٣٠٣) هزار کەسانە، ژ وانان (٩٦٢٦٩)

قەزا سێمێلێ



كەس ل ناڤەندا قەزایێ و (٢٦٨٢١) كەس ل ناحیا باتێلێ و (٤٤٢١٣) كەس ل ناحیا فەیدیێ[١٥]، چریبا ئاكنجیبان ژی ل قەزایێ (٧٢) كەسن بۆ هەر كیلومەترەكا چوارگۆشە[١٦]. رێژەیا زێدەبوونا مرۆڤان ژی دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧-٢٠٠٦) ل قەزا سێمێلێ ب ڤی شێوەی یە:

| ١٩٤٧ - ١٩٥٧ | پێزانین نینن |
| --- | --- |
| ١٩٥٧ - ١٩٧٧ | ١٣,٩ |
| ١٩٧٧ - ١٩٨٧ | ٧,٢ |
| ١٩٨٧ - ١٩٩٦ | ٢,٣ |
| ١٩٩٦ - ٢٠٠٦ | ١,٩ |
| ١٩٤٧ - ٢٠٠٦ | ٧,٧ |

ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینكریا رێڤەبەریا ئامارا پاریزگەها دهۆكێ بۆ سالا ٢٠١٦ هژمارا خەلكێ سەرانسەری قەزا سێمێلێ ١٩٦٤٥٥ كەسن، ژ وانا ١٥٢٤٣١ كەس باژێری و ٤٤٠٢٤ گوندنشینن.(*)

## تۆپوگرافیا عەردی:

عەردێ دەڤەرێ ب شێوەیەكێ گشتی عەردەكێ دەشتی یە و ژ سێ ئالیانڤە دۆرپێچدایە ب دەڤەرێن چیایی و لایێ چوارێ ژی رووبارێ دیجلەیە، بلندترین پلێن ڤەرێژیا عەردی ل دەڤەرێن چیایی ل وان خالانە یێن چیا دگەهنە دەشتێ و بلنداهیا وێ دناڤبەرا (٢٠٠٠-٦٠٠٠) پییانە و چەند بەرەڤ باشوور بچین، ئەو ژی بەرەڤ نزمیێ ڤە دچیت تا بلنداهیا وان دگەهیتە دناڤبەرا (١٠٠٠-٢٠٠٠)پییان[١٧]، و تێكرایا بلنداهیا عەردی ژ ئاستێ دەریایێ نێزیكی (٤٧٠م) انە[١٨].

## پێكهاتا جیولوجی یا قەزا سێمێلێ:

پێكهاتەیا جیۆلۆجیا قەزا سێمێلێ پێكهاتەیێن كەڤرینن، ڤەدگەرێنەڤە بۆ چوار چاخێن جیۆلۆژی، ئەو ژی كەڤرێن ئایوسینی، كەڤرێن میوسینی یێن بلند (پێكهاتەیێن فارس یێن بلند Mc٣)، كەڤرێن میوسینی یێن نزم (پێكهاتەیێن فارس یێن نزم Mc٢)، كەڤرێن بلایوسینی (Pi) (پێكهاتەیێن بەختیاری یێن بلند و نزم).

سەبارەت پێكهاتەیێن ئایوسینی كو گەلەك ژ وان ب شێوەیێ كەڤرێن ڤەگوهێزن (صخور متحولە)، پتر ل دەڤەرێن باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتی ژ قەزایێ ل (ناحیا باتێلێ) و هەر وەسان ل (ناحیا فەیدیێ) دبەربەلاڤن، ل وێ دەڤەرا دكەڤیتە دناڤبەرا چیایێ دهكان و دهۆكێ و ئەو ژی پێكهاتەیێن ئایوسینی و كلسی نە، پێكهاتەیێن فارس یێن بلند ژی (Mc٣)، كو ئەو ژی كەڤرێن خیزی و كلسی نە، ل پتریا جهێن قەزایێ دبەربەلاڤن. پێكهاتەیێن فارس یێن نزم ژی(Mc٢) كو كەڤرێن گێچ و ئاخێ و نیشتەیی ل دەڤەرێن دبەر رووبارێ دیجلە دا و دەڤەرێن دكەڤنە دناڤبەرا چیایێن دهكان و دهۆكێ دا. پێكهاتەیێن بەختیاری یێن بلند و نزم ژی ( Pi) كو پێك دهێن ژ كەڤرێن كلسی و خیزی و نیشتەیی و ئاخێ و حەسو دەڤەرێن ناڤەراست ل قەزایێ ڤەدگرن و هەمی دكەڤنە هەردو ناحیێن سێمێل و باتێلێ و ئەڤ تەخە ل پتریا جها ب پێكهاتەیێن فارس یێن بلند یا داپۆشییە[١٩].

## ئاخ:

ئاخا دەڤەرێ یا كویرە و رەنگەكێ تاری یێ هەی و كەرەستەیێن ئەندامەتی كێمترن ژ ٢٪، ئاخا وێ خوێ دناڤدا نینە و پەقین پان دناڤدا هەنە كو دگەهنە پتر ژ ٢سم و ڤەدگەرێتەڤە بۆ زالبوونا (سیادە) كانزایێ مونتمویلونایت، ئەڤ ئاخە ب رەنگەكێ گشتی یا تەڤنی یە (طینیە) بۆ تێكهەلیبا تەڤنی[٢٠].

## زێدەرێن ئاڤێ:

أ- باران: بارانێن ل دەڤەرێ كو دناڤبەرا هەیڤا چریا ئێكێ و هەیڤا گولانێ دا دبارن (پاییز - زڤستان

- بهار) دهێنە هەژمارتن ژێدەرێن سەرەکی یێن ئاڤێ، و دەڤەر دکەڤیتە دناڤبەرا هەردو هێلێن بارانێ (٥٠٠-٧٠٠)، ئەڤ رێژا بارینێ بوویە هۆکار کو چاندنا دێمی کو پشت بەستنێ ل سەر بارانان دکەت بەربەلاڤ ببیت، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهان کو دو بەرووبۆمێن سەرەکی یێن زڤستانی نە، هەر وەسان هندە بەرووبۆمێن دی تر ژی مینا نۆك و باقلك دهێنە چاندن[٢١].

**ب- ئاڤێن سەر عەرد (رووبار)،** رووبارێ دیجلە ژێدەرێ سەرەکی یێ ئاڤا سەر عەردە ل دەڤەرێ و ئەو رووبار دبیتە سنوورێ دەڤەرێ ژ لایێ باشووری و باشووری رۆژئاڤایی، ئاڤا ڤی رووباری دهێتە بکارهینان بۆ ئاڤدانا بەرووبۆمێن هاڤینی و ئاڤدانا ب هاریکاری (الری بالواسطة)، ژ رێکێن بەربەلاڤە بۆ ئاڤدانێ.

**ج- ئاڤێن ژێر عەرد،** ئاڤێن ژێر عەرد ل دەڤەرێ کو بۆ کاروبارێن چاندنێ دهێنە بکارهینان سێ جۆرن: بیرێن سەرعەرد، بیرێن کوور (ئیرتیوازی)، کانی[٢٢].

## سەقا[٢٣]:

تێکراییێ هەیڤانە و وەرزانە و سالانە یێ باران بارینێ/ملم ل سێمێلێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠١-٢٠١١)ێ.

| هەیڤ | بارین ب ملیمان |
|---|---|
| ئەیلۆل | چنە |
| چریا ئێکێ | ١١,١ |
| چریا دووێ | ٤٧,٢ |
| تێکرایا وەرزێ پاییزێ | ٥٨,٣ |
| کانوونا ئێکێ | ٦٥,٤ |
| کانوونا دووێ | ٨٧,١ |
| شوات | ٨٥,٢ |
| تێکرایا وەرزێ زڤستانێ | ٢٣٧,٧ |
| ئادار | ٦٧,٧ |
| نیسان | ٦١,٨ |
| گولان | ٢٩,٩ |
| تێکرایا وەرزێ بهارێ | ١٥٩,٤ |
| خزیران | ١,٨ |
| تیرمەه | چنە |
| تەباخ | چنە |
| تێکرایا وەرزێ هاڤینێ | چنە |
| تێکرایا سالانە | ٤٠٩,٣ |

تێکرایا هەیڤانە و سالانە وەرزانە یا رێژا شەهێ ل سێمێلێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠١-٢٠١١)ێ.

| هەیڤ | رێژا شەهێ |
|---|---|
| کانوونا دووێ | ٦١,٨ |
| شوات | ٦٢,١ |
| ئادار | ٥١,٦ |
| نیسان | ٥٢,١ |
| گولان | ٣٧,٠ |
| خزیران | ٢٦,٠ |
| تیرمەه | ٢٣,٥ |
| تەباخ | ٢٥,٧ |
| ئەیلۆل | ٢٨,٢ |
| چریا ئێکێ | ٣٥,١ |
| چریا دووێ | ٤٩,٨ |
| کانوونا ئێکێ | ٥٦,٩ |
| تێکرایا سالانە | ٤٢,٤ |

تێکراییێ هەیڤانە و سالانە یێ بلندترین و نزمترین پلێن هەیڤانە یێن گەرمایێ و سەرمایێ ل سێمێلێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠١-٢٠١١)ێ.

| | سێمێل |
|---|---|
| تێکرایا گەرمترین هەیڤ (تیرمەه) | ٣١,٥ |
| تێکرایا سارترین هەیڤ (کانوونا دووێ) | ٦,٩ |
| تێکرایا سالانە یا گەرمێ | ٢٤,٦ |

تێکرایا وەرزی یا پلێن گەرمایێ ل سێمێلێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠١-٢٠١١)ێ.

| | سێمێل |
|---|---|
| تێکرایا وەرزێ زڤستانێ | ٨,٠٣ |
| تێکرایا وەرزێ بهارێ | ١٧ |
| تێکرایا وەرزێ هاڤینێ | ٣٠,٣٦ |
| تێکرایا وەرزێ پاییزێ | ٢٠,٤٦ |

تێکرایێ وەرزی یا لەزاتییا بای م/چرکە ل سێمێلێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠١-٢٠١١)ێ.

| | | |
|---|---|---|
| زڤستان | کانوونا ئێکێ | ٠,٩٧ |
| | کانوونا دووێ | ١,٠٧ |
| | شوات | ١,٢١ |
| تێکرا | | ١,٠٨ |
| بهار | ئادار | ١,٢٩ |
| | نیسان | ١,٢٥ |
| | گولان | ١,٢٦ |
| تێکرا | | ١,٢٦ |
| هاڤین | خزیران | ١,٣٨ |
| | تیرمەهـ | ١,١٥ |
| | تەباخ | ١,٠٤ |
| تێکرا | | ١,١٩ |
| پاییز | ئەیلۆل | ١,١٣ |
| | چریا ئێکێ | ١,٢٢ |
| | چریا دووێ | ١,٠ |
| تێکرا | | ١,١١ |

تێکرایا هەیڤانە و سالانە یا هەلمبوونێ (ملم) ل سێمێلێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠١-٢٠١١)ێ.

| هەیڤ | هەلمبوون |
|---|---|
| کانوونا دووێ | ٣٢,٠٢ |
| شوات | ٤٠,٤٤ |
| ئادار | ٩٠,١٧ |
| نیسان | ١٢١,٨٦ |
| گولان | ٢٤١,٢ |
| خزیران | ٣٥٢,٨٢ |
| تیرمەهـ | ٣٨١,٣٢ |
| تەباخ | ٣٥٩,٢٥ |
| ئەیلۆل | ٢٤٦,٠٢ |
| چریا ئێکێ | ١٦٠,٨٧ |
| چریا دووێ | ٦٢,٥٦ |
| کانوونا ئێکێ | ٣٦,٠١ |
| تێکرایا سالانە | ٢١٢٤,٥ |

## پێکهاتا جڤاکی:

قەزا سێمێلێ پێکهاتییە ژ چەند عەشیرەتان و بەری هەمییان عەشیرەتا کۆچەر، ژ تیرەیێن (شەرەفا و مەهمەدا و هاجا و ئەرتووشییان)، هەروەسان عەشیرەتێن سلێڤانەیی و دۆسکی و بەرواری و ژلی کێمەکا مەسیحی و عەرەبان، رێژەیا موسلمانان ل قەزایێ دگەهیتە ٪٧٣ێ ژ خەلکێ قەزایێ و یا ئێزدییان ب هەمی عەشیرەتێن خۆڤە دگەهیتە ٪٢٦ێ و یا کلدان و ئاشوور و ئەرمەنان ژی ٪٢ یە[٢٤].

## مێژوویا سێمێلێ:

ب دروستی نەهاتییە زانین کا سێمێلێ کەنگی هاتییە ئاڤاکرن، لێ دکەڤن دا ئەو ژی دکەتە ناڤ دەڤەرا (بانوهەدرا) دا، ئەڤە ژی وێ چەندێ دگەهینت کو ژ جهێن کەڤنە مەسیحیەت ب کێماسی ل سەدسالیا چوارێ زایینێ گەهشتییێ و خەلکێ وێ ددابەشکری بوون ل سەر (نستۆری و یەعقۆبییان)[٢٥] . گەرۆکێ دانیمارکی (کارستن نیبور) دگەریانا خۆدا ئەوا ل سالا (١٧٦٦ز)ێ هاتییە ئەنجامدان ئاماژە کرییە دەڤەرێ و دبێژیت: (زاخۆ: گوندەکێ بچویکە دکەڤیتە سەر رێکا مووسل-

جزیرە، و هندە گوندێن دی هەنە وەكی نافكور، شێخان، دهۆك، زێبار، سێمێل، و یا داوێ (واتە سێمێلێ) دكەڤیتە سەر رووبارێ دیجلە، ل سەر رێكا ئێزدییان ژ شنگار بۆ مەزارێ شێخادی) و وەرگێرێ ڤێ گەریانێ د پەراوێزێ دا ئاماژە كرییە وێ چەندێ كو (سێمێلێ ناكەڤیتە سەر رووبارێ دیجلە[٢٦]؛ و دكەڤیتە سەر رێكا دهۆك- زاخۆ، ژبلی ئەگەر د وی سەردەمی دا گوندەك ب وی ناڤی ل سەر رووبارێ دیجلە هەبیت)، یان دبیت ل وی سەردەمی رووبار نێزیكی سێمێلێ بیت. د هەمان ژێدەر و بڕگە دا د وەرگێرانا (مؤسسة الانتشار العربی) دا، ناڤێ (ئیسماعیل)[٢٧] شوونا (سێمێل)[٢٨] گرتییە.

سالا (١٨٠٠)ێ ئێزدییان دەستێ خۆ داناینە سەر سێمێلێ و مەسیحی ژ گوندی كرنەدەر. سالا (١٨٣٢)ێ میرێ سۆران (محەمەد پاشایێ رەواندزی) [٢٩] ئێزدی كرینەدەر، پشتی هینگێ زەلامەك ب ناڤێ (شابۆ) ژ عەشیرەتا (دۆسكییان) پەیدابوو و خویكا سێمێلێ ددا دەولەتا ئۆسمانی، پشتی مرنا وی بنەمالا (سالح سەرحان)[٣٠] كو دبنیات دا عەرەب بوو هات داخوازییەك ژ میرێ ئامێدیێ كر كو ل وێرێ ئاكنجی ببیت و میر ل سەر داخوازیا وی رازی بوو و كاودان ما وەسان هەتا هاتنا ئنگلیزی[٣١] پشتی جەنگێ جیهانییێ ئێكێ (ئاشووری) هاتنە سێمێلێ و ل وێرێ ئاكنجی بوون، هەتا روودانێن خویناوی ل سالا (١٩٣٣)ێ چێبووین و پشتی ڤێ روودانێ كورد و عەرەب هاتن و ل سێمێلێ ئاكنجی بوون، دیسان كلدانی ژی ژ گوندێن (شیوز و مار یاقو) هاتن و ئەو ژی لێ ئاكنجیبوون[٣٢].

| فایل | ناڤێ جهی | گوند | ژمارا رۆژنامێ | مێژوویا وێ | چاخێ مێژوویی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٨٨٩ | گرێ سۆركە | سۆركە | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ٩٠٥ | گرێ كەبەرتۆ | كەبەرتۆ | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ٨٨٤ | گرێ كەمۆنە | كەمۆنە | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ٨٩٧ | گرێ گربالیۆز | تەنجە (تەنگا) دلب (سەرتەنگ) | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ٨٨٨ | سەیزارا ژێری | سەیزاری | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو و چاخێن ئیسلامی |
| ٨٩٢ | تەلزەید | زەید | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ٨٩٤ | گرێ چەم جهان | چەم جهان | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ٨٨٦ | گرێ سێ قوبە | سێ قوبە | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو + بەری ئیسلامێ+ ئیسلامی |
| ٨٩٢ | گرێ گرفیلی | گرفیل | ٢٩١٩ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |

گرنگترین جهێن د. نائیل حەنون[٣٥] گۆتین ژبلی یێن رێڤەبەریا شوینواران باس كرین ئەڤە نە:

| زنجیرە | فایل | ناڤێ جهی | پیڤانا شوینواری | چاخێ مێژوویی |
|---|---|---|---|---|
| ١٣٦ | ٨٨٥ | خربە باشایا | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ١٣٧ | ٨٨٧ | گرێ بەدەلییا | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |
| ١٥٠ | ٨٨١ | گرێ سێمێلێ | ١٩٥٠ | چاخێ ئاشووری یێ نوو |

## شوینوارێن سێمێلێ:

فەرمانگەها شوینوارێن دهۆكێ(٣٤) جهێن شوینواری ل سێمێلێ توومارکرینە، ژ گرنگترین وان شوینواران گرێ سێمێلێ و بوسریا و قەشەفرێ و مام شڤان[٣٣].

ژ گرنگترین جهێن شوینواری کو رێڤەبەریا شوینوارێن عیراقێ ل قەزا سێمێلێ دیارکرین ئەڤەنە[٣٤]

## پێشڤەچوونا کارگێری:

هەر چەند سێمێلێ دبەرێ دا گوندەکێ بچویك بوو، لێ جهێ خۆ یێ ستراتیژی یێ گرنگ هەبوو، ژ بەر کو لەشکەر د وێرێ را دەرباز دبوونە گەلیێ (قەشەفرێ) و ئەو رێك دەرباز دبوو (دەرگەلا شێخا) و ژ وێرێ بۆ دەولەتا ئۆرارتۆ[٣٦] و رێکا (ملۆکی یا کەڤن) دوێرێ را دەرباز دبوو ئاسیهێ و نسیبینێ و بۆ وەلاتێ (خلدیا) و ئەرمەنستانێ[٣٧] و جاندرمان مەخفەرەك ل سەر گرێ شوینواری ل باژێری هەبوو دا چاڤدێریا رێکێ بکەت، و دکەڤن دا خانەك ل گوندی هەبوو، خزمەتگوزاری پێشکێشی هات و چوویان دکر[٣٨] و پشکەکا وێ خانێ هەتا سالێن حەفتییان ژ سەدسالیا بووری مابوون[٣٩].

ئاستێ کارگێری یێ سێمێلێ پێشڤەچوون بخۆڤە دیتن و ل سالا (١٩٥٤)ێ بۆ ناحیە و (ئەحمەد مفتی) یەکەم رێڤەبەرێ ناحیێ بوو. سالا (١٩٧٨)ێ بۆ قەزا و پێکدهات ژ هەرسێ ناحیێن ناڤەندا قەزایێ و ناحیا سلێڤانی کو ژ قەزا زاخۆ ڤەکرین و ب سێمێلێ ڤە گرێداین و ناحیا فەیدیێ کو د وێ سالێ دا بوویە ناحیە کو هەتا هینگێ گوند بوو سەر ب سێمێلێ ڤە[٤٠].

## ناڤێ قایمقامێن سێمێلێ[٤١] :

١- رەحمان تەعبان هەلیل ١٩٧٨ - ١٩٧٩
٢- جەلال عەبدوللا سالح ١٩٧٩ - ١٩٨٠
٣- حکمەت حاجی سەلیم ١٩٨٠ - ١٩٨١
٤- یاسین عەبدولوەهاب یاسین ١٩٨١ - ١٩٨٢
٥- عەبدولمەجید سمین عەلی ١٩٨٢ - ١٩٨٣
٦- حکمەت زەنون عەزیز ١٩٨٣ - ١٩٨٤
٧- مەهدی عەباس عەبد عون ١٩٨٤ - ١٩٨٨
٨- شەفیق محەمەد سادق ١٩٨٨ - ١٩٨٩
٩- عائید عەبدولئەمیر سالح ١٩٨٩ - ١٩٩١
١٠- ئیبراهیم عەلی کرو ١٩٩١ - ١٩٩٣
١١- سەلاح محەمەد حەسەن ١٩٩٣ - ١٩٩٤
١٢- بژار عوبەید ١٩٩٤ - ١٩٩٥
١٣- ماجد سەید سالح ١٩٩٥ - ٢٠٠٥
١٤- محەمەد حەسەن حامد ٢٠٠٥ - ٢٠٠٧
١٥- ئیسماعیل مستەفا رەشید ٢٠٠٧ - ٢٠١٢
١٦- مازن محەمەد سەعید ٢٠١٢ - ٢٠١٦/٢/١٥
١٧- حسێن خالد سەعید(حسێن چەلکی) ٢٠١٦/٢/١٥

## باژێرڤانیا سێمێلێ:

باژێرڤانیا سێمێلێ ل سالا (١٩٥٤)ێ پشتی بوویە ناحیە هاتییە دامەزراندن، و رێڤەبەرێ ناحیێ وەکی سەرۆکێ جڤاتا باژێرڤانیێ کاروبارێن وێ ب رێڤەدبرن و ل وی سەردەمی کاروبارێن باژێرڤانیێ پێکدهات ژ پاقژکرنا جەهدان و هلکرنا فانۆسان دناڤ کۆلانێن باژێری دا، و ژ بەر کو توومارێن ڤێ فەرمانگەهێ ل سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ ژناڤچوون، دەستنیشانکرنا ناڤێن وان کەسێن ل دەسپێکێ ب کارێ ڤێ رێڤەبەریێ ب رێڤەدبرن ل بەردەست نینن[٤٢]، ئەڤە ژی ناڤێ هندەك ژ وان رێڤەبەرانە و مێژوویا دەست ب کاری کرین و دەست ژ کاری بەردراین[٤٣]:

١- رێڤەبەرێ ناحیێ ١٩٥٨/٤/١٠ - ١٩٧٠/٦/٢
٢- محەمەد عەبدولرەحیم سالح ١٩٧٠/٦/٢ - ١٩٩١/٣/١٣
٣- حازم جاسم بەشیر ١٩٩١/٣/١٣ - ١٩٩٣/٧/١٩
٤- دیوالی حەمێ بریندار ١٩٩٣/٧/١٩ - ٢٠٠١/٥/٣١

٥- ئیسماعیل مستەفا رەشید ٢٠٠١/٦/٩ - ٢٠٠٧/٢/١

٦- ئەکرەم یەحیا ئەحمەد ٢٠٠٧/٦/١٧- .........

## بزاڤێن ئابووری:

سەقایێ دەڤەرێ ل قەزا سێمێلێ کارتێکرنەکا مەزن کریە سەر وێ چەندێ کو بزاڤێن چاندنێ زال ببن ل سەر هەمی بزاڤێن دی، لێ پشتی سالا (١٩٩٦)ێ کاودان هاتە گوهارتن و بریارا نەفت بەرامبەر خوارن کارتێکرنەکا مەزن کریە کو گوند بێنە ڤالاکرن، ژ بەر کو چاندن وەکی پیشە و ژێدەرێ ژیانا وان گرنگیا خۆ نەما و بەرووبوومێن بیانی ل بازارێن ناڤخۆ زالبوون و خەلکێ گوندان و جوتیاران بەرێ خۆ دانە هندە کار و پیشەیێن دی دبوارێن بازرگانی و پیشەسازی و خزمەتگوزاری دا و ئەڤ رەنگە کارە هەلبەت پتر یێن ل ناڤەندا باژێران هەین.

پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ و هاتنا هێزێن ئەمریکی بۆ عیراقێ، ئابوورێ عیراقێ ب رەنگەکێ بەرفرەهتر بەرامبەر جیهانا ژدەرڤە ڤەبوو، هەر چەندە شەری گەلەك کارتێکرن لێ کربوون و کاودانێ تەناهیێ تێکدابوو، لێ دەڤەر د کاودانەکێ تەنا و ئەرێنی دا دژیا و ئەڤە ژی هۆکارەك بوو بۆ دەسپێکرنا قۆناغەکا نوو و وەرارا ژیانا باژێرڤانی[٤٤].

گومان تێدا نینە کو جهێ دەڤەرێ (واتە هەرێما کوردستانێ) و نێزیکبوونا وێ ژ وەلاتێ ترکیا کاریگەریەکا مەزن هەبوو کو بزاڤا بازرگانی پێشکەڤیت، سەرەرای دیارکرنا بەردەواما نەفتێ. ئەڤە هەمی کاریگەرێن مەزن بوون کو ئابووری دەڤەرێ ژ هەردەمەکێ دی پتر پێشڤەبچیت.

## خزمەتگوزاری ل سێمێلێ:

ئەگەر ئەم بنێرینە خزمەتگوزاریێن ل سێمێلێ دێ بینین هندەك ژ مێژە لێ هەین و هندەك نوو هاتینە

پارکا فەراشین ل سێمێل



دامەزراندن، بۆ نموونە یەکەم مزگەفت دناڤبەرا سالێن (١٩٤٥ - ١٩٤٦)ێ ل تاخێ عەرەبا ژ لایێ کورد و عەرەبێن وانڤە هاتییە ئاڤاکرن و ب پشکداریا (مەحمود ئەلنائیب)[٤٥]، پاشی (جامعا کەڤنا مەزن) کو دکەڤیتە سەر رێکا گشتی ل سالا (١٩٦٠) ێ ل سەر کیستێ (مەحمود ئەلنائیب) هاتییە ئاڤاکرن.

سەبارەت خواندنگەهان ژی یەکەم خواندنگەهـ ل سالا (١٩٢٨)ێ هاتییە ڤەکرن[٤٦] و (عەلی سیدو گەورانی) دگەریانا خۆدا ئاماژە پێ کرییە و گۆتییە کو پێکدهات ژ دو پۆلان [٤٧] و مامۆستا (محەمەد بەدەل) وێ چەندێ دووپات دکەت و دبێژیت: ل بیرا منە ئەڤێن ژمە مەزنتر دگۆتن خواندنگەها سادە یا ب لبنە و ئاخێ ئاڤاکری هەبوو، لێ دەمەکی خواندن لێ هاتە راوەستن تا کو ل سالا (١٩٥٠ - ١٩٥١) ێ خواندنگەهەك بۆ سێمێلێ کو هینگێ ل تاخێ عەرەبا بوو هاتبوو ئاڤاکرن[٤٨]، لێ نها خواندنگەهـ و ب هەمان ناڤ دکەڤیتە تاخێ (دۆبان) و ل سەر نڤیسییە کو (سالا ١٩٥٠ێ هاتییە دامەزراندن).

پەروەردا سێمێلێ ژی ل (١٩٩٣/١٠/١)ێ هاتییە دامەزراندن، ل دەسپێکێ دناڤ ئاڤاهیێ خواندنگەها (خەدیجە ئەلکوبرا) دابوو، لێ پشتی هینگێ ئاڤاهییەکێ نوو ل سالا (٢٠١٣)ێ ل سەر جەهدا دچیتە کۆمەلگەها خانکێ بۆ هاتە ئاڤاکرن و نها سەرجەمێ خواندنگەهێن سەر ب پەروەردا سێمێلێ ب ڤی رەنگی نە:

١- (١٣٢) خواندنگەهێن بنەرەت.
٢- (٧) باغچەیێن ساڤایان.
٣- (٥) خواندنگەهێن فێرکرنا ب لەز.
٤- (٣٠) قۆناغا ئامادەیی[٤٩].

یەکەم بیرا ئیرتیوازی ژی ل سێمێلێ ل سالا (١٩٥٦)ێ هاتییە کۆلان و کومپانییا (هارولیتی) پێ رابوویە و تانکەکا مەزنا ئاڤێ ل نێزیکی بیرێ بۆ ڤەخوارنێ هاتبوو دانان کو هەتا هینگێ خەلکێ وێ بۆ ڤەخوارنێ و کاروبارێن خۆ پشت بەستن ل سەر کانییان دکرن، ل سالێن حەفتییان ژی ژ سەدسالیا بووری تۆرا ئاڤێ گەهشتە بازێرێ، و ل سالا (١٩٧٨) ێ فەرمانگەها ئاڤ و سۆلینان ل سێمێلێ هاتە دامەزراندن.

کارەب ژی بۆ یەکەم جار ل سالا (١٩٦٧)ێ گەهشتییە سێمێلێ و پەخشێ تەلەفزیونی ژی ل سالا (١٩٧٠)ێ.

سالا (١٩٥٤)ێ یەکەم بنکەهێ ساخلەمیێ (مستوصف) ل سەر کیستێ (مەحمود ئەلنائیب) ب ئاخ و لبنان هاتییە ئاڤاکرن، پاشی نەخۆشخانەکا نوو ل بەرامبەر (جامعا کەڤن) هاتییە ئاڤاکرن. سالا (١٩٧٠)ێ بنکەهەکێ ساخلەمیێ یێ سەرەکی هاتە ئاڤاکرن و گەلەك کەل و پەلێن پزیشکی یێن نوو هەبوون[٥٠] (نها چۆلکرییە). سالا (٢٠٠١)

گرێ سێمێلێ سالا ١٩٣٣



ێ ژی نەخۆشخانا (دۆبـان) دئاڤاهیێ بارەگایێ بەعسییانڤە، پشتی هاتییە نووژەنكرن هاتییە ڤەكرن. سالا (٢٠٠٥)ێ ژی نەخۆشخانا (گولان) ل سەر رێكا دچیتە كۆمەلگەها خانكێ هاتییە ئاڤاكرن[٥١].

دیسان چەند فەرمانگەهێن دی ژی ل سێمێلێ هاتینە ڤەكرن، ب تایبەت پشتی بوویە قەزا، وەكی:

- فەرمانگەها چاندنێ ل سالا (١٩٧٠)ێ[٥٢].
- بانك ل سێمێلێ د ئاڤاهییەكی ڤە ل نێزیكی فەرمانگەها چاندنێ ل ٢٠٠٥/١٠/١٧ێ هاتییە ڤەكرن و پاشی ئاڤاهییەك ب تەنشت نەخۆشخانا (دۆبـان) ل ٢٠٠٦/١٠/٢٢ بۆ ئاڤاكرن[٥٣].
- یانەیا سێمێل یا وەرزشی ل سالا (١٩٩١)ێ هاتییە ئامەزراندن، و یاریگەها وێ ل سالا (١٩٩٧)ێ[٥٤].
- فەرمانگەها عەقاری (تاپۆ) ل سالا (٢٠٠٤)ێ هاتییە دامەزراندن[٥٥].

ژ خزمەتگوزاریێن بەرچاڤ و كەڤن و گرنگ كو ل سێمێلێ هاتییە دانان وەكی د كۆڤارا (كورد تعاون و ترقی غزتسی) دا هاتی تلگرافە، د ژمارا (٧) یا ڤێ كۆڤارێ دا، كو ل ١٦ كانوونا دووێ (١٩٠٩)ێ دەركەتی دا نامەیەكا تلگرافی بەلاڤببوو، ئەڤ نامەیە ژ لایێ تایێ كۆمەلا تەعاون و تەرەقی ل مووسل درێكا تلگرافا سێمێلێ هاتبوو هنارتن، ناڤ و نیشانێن تلگرافێ ژی (بۆ كۆمەلا تەعاون و تەرەقیا كوردی ل پایتەختی) بوو. ناڤەرۆكا تلگرافێ ل سەر كوشتنا شێخ سەعید و كورێ وی بوو پشتی كۆدتایا ئۆسمانی ل تیرمەها سالا (١٩٠٨)ێ و تێدا هاتبوو كو پشتی شەرەك دناڤبەرا كۆمەكا خەلكی و مەفرەزەكا حوكمەتێ كو ژ كەركوكێ دهاتن و پێكدهاتن ژ (١٦) سەربازان، شێخ سەعید و كورێ وی هاتینە كوشتن و گەلەك مالێ وی هاتییە تالانكرن، و دڤێ رویدانێ دا (٤٠) ژ هەوادارێن شێخ سەعیدی بوونە قوربانی[٥٦].

## كۆمەلگەهـ و گوندێن سێمێلێ:

بەری هەوا تەعریبێ ل دەڤەرا سێمێلێ، قەزا ژ (١٦٥) گوندان پێكدهات، لێ پشتی ڤێ هەوێ ژمارا وان بوونە (١٥) كۆمەلگەهـ و كۆمەكا گوندێن كاڤل:

## كۆمەلگەها مەرینا:

ئەڤ كۆمەلگەهە دكەڤیتە دووراتییا (٤كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ل سەر ئاڤارێ گوندێ دارێ ب مەرەما ب عەرەبكرنا (تعریب)ا دەڤەرێ بۆ عەرەبان ب ناڤێ (مجمع الجبور) هاتبوو ئاڤاكرن.

### سنوورێن كۆمەلگەهێ:

**باشووری،** گوندێ خراب كۆلك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كانی سپیێ.

پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ كورد ژ عەشیرەتێن كۆچەر (زێدك، هاجان، مەهمەدان) و مزووری (كۆخی) و دۆسكی (ژ هەردو گوندێن ئێكماله و بێسكێ) لێ ئاكنجی بوون.

ڤێ كۆمەلگەهێ دو خواندنگەهێن بنەرەت و ئێك یا ئامادەیی لێ هەنە، سەرەرای هەبوونا بنكەهەكێ ساخلەمیێ[٥٧].

## كۆمەلگەها موعەسكەرێ (سەربازگەها) موقبلێ:

ئەڤ كۆمەلگەهە د بنەرەت دا وەكی سەربازگەهـ هاتبوو ئاڤاكرن، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ خەلكێ عەشیرەتا دۆسكی ژووری لێ ئاكنجی بوون، پشتی كاودانێ سیاسی ل سالا (١٩٩٧)ێ تێكچووی خەلكێ بەرواری ژووری ژی لێ هاتنە ئاكنجیكرن، سالا (٢٠١٤)ێ دەست ب ئاڤاكرنا فرۆكخانەیا دهۆكێ ل سەر عەردێ وێ هاتییە كرن و ٩٠٪ ێ ژ خەلكێ وی ل حەوشكێ هاتنە ئاكنجیكرن[٥٨].

## كۆمەلگەها موقبلێ:

ئەڤە ژی ئێكە ژ كۆمەلگەهێن تەعریبێ ب ناڤێ (مجمع الجهاد)، دكەڤیتە دووراتییا (٦كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ و ل سەر عەردێ گوندێ سەروكانی هاتبوو ئاڤاكرن، پشتی سالا (١٩٩١)ێ خەلكێ گوندێ كلێبنێ (كولێمنێ) ژ كۆچەران و خەلكێ گوندێ موقبلێ ژ سلێڤانەیان و خەلكێ سەروكانی لێ ئاكنجیبوون. هەژی ئاماژێ پە كو ناڤێ سەروكانی ژ (سەرەكانی) هاتیپە، چونكی رووبارەكێ بچویك ژ وێرێ بەرەڤ موقبلا گوند و پاشی بۆ گوندێ كولێمنێ كو نها چۆلە دچیت و ژوێرێ ژی بەرەڤ گوندێ كەردیس كو ئەو ژی چۆلە دچیت.

### پێكهاتا خەلكێ كۆمەلگەهێ:

خەلكێ وێ پێكهاتینە ژ عەشیرەتا سلێڤانەیان و كۆچەرێن هاجا و عەشیرەتا مزووریان.

ل ڤان داوییان رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆكێ ب هاریكاریا شوینوارناسێن ئەلمانی دەست ب لێگەریانێن شوینواری ل دو گرێن نێزیكی ڤێ كۆمەلگەهێ كرینە و ئەنجامێن وان دكۆنگرەكێ رۆژنامەڤانی دا هاتنە راگەهاندن.

ڤێ كۆمەلگەهێ خواندنگەهەكا بنەرەت و ئامادەییەك و بنكەهەكێ ساخلەمیێ لێ هەنە، هەر وەسان تۆرا ئاڤێ و كارەب ژی لێ هەیە[٥٩].

## كۆمەلگەها گرێ گەورێ:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (٨كم) ژ سەنتەرێ سێمێلێ. ناڤێ گوندی پێ ژ (گرێ+ گەور) هاتی، چونكی گرەك لێ هەیە و رەنگێ وی یێ گەورە.

### سنوورێن كۆمەلگەهێ:

**باكووری،** هەردو گوندێن ماڤان و كولێمنێ.

**باشووری،** پرۆژەیێ بەدەلییا یێ پەلەوەران.

**رۆژهەلاتی،** كۆمەلگەها موسێریكێ (گوندێ سەیزاری).

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كەردیسی و گوندێ كێلك.

### پێكهاتا خەلكێ كۆمەلگەهێ:

خەلكێ گوندی پێكهاتینە ژ عەشیرەتا كۆچەران، تیرەیا هاجا ژ ئالانی و بەدرانییان. سالا (١٩٩٨)ێ كوردێن باكوورێ كوردستانێ ژی ژ كۆمەلگەها ئەترووش ژ عەشیرەتێن گۆیان و كۆچەران ژ ئەرتۆشییان ڤەگوهاستنە ڤێ كۆمەلگەهێ و ژمارا ئاكنجیێن كۆمەلگەهێ نێزیكی (٢٦٠٠) كەسانە.

ئەڤ كۆمەلگەهە د سێ قۆناغاندا هاتییە ئاڤاكرن:

قۆناغا ئێكێ: هەوێن راگوهاستنێ دناڤبەرا سالێن (١٩٧٧-١٩٧٨)ێ و د ڤێ قۆناغێ دا خەلكێ هندە گوندان ل گوندێ گرێ گەورێ ئاكنجیكرن.

قۆناغا دووێ: پشتی سكرێ مووسل ل سالا (١٩٨٣)ێ هاتییە ئاڤاكرن، (١٦) گوندێن سەر ب قەزا سێمێلێ ڤە كەتنە بەر ئاڤێ و هندەك ژ خەلكێ وان ل گرێ گەورێ ئاكنجیكرن.

قۆناغا سیێ: ئەو ژی پشتی كریارێن بەرفرەهێن راگوهاستنێ كو ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتینە ئەنجامدان و ژمارەكا خەلكێ گوندێن راگوهاستی ل ڤێ كۆمەلگەهێ ئاكنجیكرن كو كۆمەلگەهـ بۆ ڤێ مەبەستێ هاتبوو ئاڤاكرن.

ڤێ كۆمەلگەهێ نها دو خواندنگەهێن بنەرەت و نەخۆشخانەك لێ هەیە[٦٠].

## كۆمەلگەها موسێریكێ:

ئەڤ كۆمەلگەهە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (٣كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ. ناڤێ وی یێ ژ ناڤێ وی كەسی هاتی كو گوند ئاڤاكری (مەنسۆر). لێ دبیت بۆچوونا دروست ئەو بیت كو ناڤێ گوندی یێ ژ مسووریك بوویە موسیریك كو ئەو ژی گوندەكە ل دەڤەرا جزیرا بۆتان[٦١].

### سنوورێن كۆمەلگەهێ:

**باكووری،** هەردو گوندێن كانی سپیێ و دارێ.

**باشووری،** كۆمەلگەها خانكێ.

**رۆژهەلاتی،** ناڤەندا قەزا سێمێلێ یە.

**رۆژئاڤایی،** كۆمەلگەها گرێ گەورێ یە.

**پێكهاتا خەلكێ كۆمەلگەهێ:**

چەندین عەشیرەت دناڤ ڤێ كۆمەلگەهێ دا هەنە و كۆچەر (هاجا، گەودا، ئەرتووشی، بەدران) ل پلا ئێكێ دهێن، هەر وەسان سلێڤانەیی و هەسنی و میرا و مەسیحی ژی لێ هەنە. سالا (۱۹۹۷)ێ كەمپەك بۆ ئاوارەیێن باكوورێ كوردستانێ ژ هەردو عەشیرەتێن گۆیا و كۆچەرێن ئەرتووشی كو ل كۆمەلگەها ئەترووش بوون دناڤ كۆمەلگەهێ دا ئاڤاكرن، ژمارا ئاكنجیێن ڤێ كۆمەلگەهێ دگەهنە نێزیكی (۲۰٤۰۰) كەسان.

ئەڤ كۆمەلگەهە ژی د سێ قۆناغاندا هاتییە ئاڤاكرن:

قۆناغا ئێكێ: هەوێن راگوهاستنا گوندێن دەشتا سلێڤانەیان دناڤبەرا سالێن (۱۹۷۷ - ۱۹۷۸)ێ و د ڤێ قۆناغێ دا خەلكێ هندەك گوندان ل (موسێریكێ و خراب كۆلكی و سەیزاری) ئاكنجیكرن.

قۆناغا دووێ: پشتی سكرێ مووسل ل سالا (۱۹۸۳)ێ هاتییە ئاڤاكرن، هندەك ژ خەلكێ ئەڤ گوندێن دكەتنە سەر پەراڤێن دیجلەی ل موسیرێكێ ئاكنجیكرن و پشتی هینگێ بۆ كۆمەلگەها موسێریكێ (مجمع المنصوریە). د هەمان سال دا پرۆژەیێ پەلەوەرێن بەدەلییا ژی هاتە ئاڤاكرن و خەلكێ هەردو گوندێن (بەدەلیا و چالوان) ژی هاتنە راگوهاستن و ئەو ژی ل ڤێ دەڤەرێ ئاكنجیكرن.

قۆناغا سیێ: ئەو ژی پشتی كریارێن بەرفرەهێن راگوهاستنێ بوون كو ل سالا (۱۹۸۷)ێ هاتینە ئەنجامدان و ژمارەكا خەلكێ گوندێن راگوهاستی ل ڤێ كۆمەلگەهێ ئاكنجیكرن.

ڤێ كۆمەلگەهێ نها چەندین خزمەتگوزاری لێ هەنە، وەكی جڤاتا باژێرڤانیێ و بنكەهەكێ پۆلیسان و (۱۰) خواندنگەهێن بنەرەت و (۲) ئامادەیی[۱۲].

## كۆمەلگەها خانكێ:

كۆمەلگەهەكا ئێزدینشینە، دكەڤیتە دووراتییا (۱۰كم) ژ سەنتەرێ قەزا سێمێلێ، ناڤێ گوندی یێ ژ خانی هاتی، و خانك، بچویككرنا پەیڤا خانی یە. یان دبیت ژ (خان) هاتبیت.

**سنوورێن كۆمەلگەهێ:**

**باكووری،** كۆمەلگەها موسێریكێ.

**باكوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ سەید زاری.

**باكوورێ رۆژهەلاتی،** ناڤەندا قەزا سێمێلێ.

**باشووری،** دگەهیتە ناحیا فەیدێ و سكرێ مووسل.

**رۆژهەلاتی،** سۆركا (صۆركا).

**پێكهاتا خەلكێ كۆمەلگەهێ:**

خەلكێ گوندی ئێزدی نە ژ عەشیرەتێن (دنانی، خالتی، مۆسانی، هەوێری، ماسەكی، رەشكی) و ژمارا ئاكنجیێن كۆمەلگەهێ نێزیكی (۱٦۷۰۰) كەسانە.

خەلكێ ڤێ كۆمەلگەهێ ب دو قۆناغان ل ڤی جهی ئاكنجیكرینە:

قۆناغا ئێكێ: پشتی سكرێ مووسل ل سالا (۱۹۸۳)ێ هاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ گوندێن (خانك، كەمونە ژووری، كەمونە ژێری، خێراڤا، قەپەغ، چەم بەرەكات) هاتنە راگوهاستن و ل (زینیات) ئاكنجیكرن كو نەهاتبوو راگوهاستن.

قۆناغا دووێ: ئەو ژی پشتی كریارێن راگوهاستنێ بوون كو ل سالا (۱۹۸۷)ێ هاتینە ئەنجامدان و تێدا خەلكێن گوندێن (مەم شڤان، گوتبەی، صۆركا، قەسر یەزدین، ریێبە) ل ڤێ كۆمەلگەهێ ئاكنجیكرن.

ژ خزمەتگوزاریێن ل ڤێ كۆمەلگەهێ هەین، جڤاتا باژێرڤانیی، بنكەهێ پۆلیسان، باخچێ زارۆكان، (۱۱) خواندنگەهێن بنەرەت و (۲) ئامادەیی، سەرەرای كو ل بەرێ پرۆژەیێ ئاڤا (چەم بەرەكات)ی لێ بوو، كو نها ژكاركەتییە و پرۆژەیێ خراب دێم ل جهێ وی هاتییە دروست كرن كو ئاڤێ بۆ باژێرێ دهۆكێ و دەوروبەران دابین دكەت[۱۳].

## كۆمەلگەها تەناهی:

ئەڤ كۆمەلگەهە دكەڤیتە دووراتییا (٤كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ و ل سالا (۱۹۹۸)ێ ل سەر عەردێ گوندێ (دولبا ژووری) هاتییە ئاڤاكرن، خەلكێ كۆمەلگەهێ ژ وان كوردانە یێن ژ ئێرانێ ژ

ئاوارەیێ ڤەگەریاینەڤە، ئەڤ کۆمەلگە ب تەناهی هاتییەناڤکرن، ب واتایا ئارامی هاتییە.

هزرا ئاڤاکرنا ڤی کۆمەلگەهی هزرا عەبدولعەزیز تەیب پارێزگارێ دهۆکێ یێ وی سەردەمی بوو، د وی دەمیدا سالێن نۆتان ئاریشەیا ئاکنجیکرنا خەلکێ ب تایبەت ئەو ئاوارەیێن ژ ئیرانێ زڤرینەڤە و خەلکەکێ دی یێ ژ سەر گوند و وارێن خۆ دوورکەتین و ژ ناچاری خانیێن زێدەگاڤی ل جهێن جوداێن دهۆکێ ئاڤاکرین یان ل ئاڤاهیێن سازیێن حکومەتێ ئاکنجی بووین بەرسنگێ کارگێریا پارێزگەهێ گرتبوو، لەوما پشتی چەندین کۆمبوون و ڤەکۆلینان ل سالا ١٩٩٨ێ هزر ل ئاڤاکرنا ڤی کۆمەلگەهی ب رەنگەکێ هەڤچەرخ هاتییەئاڤاکرن و ئەڤ هزرە هاتە پەسەندکرن، ل قۆناغا بەراهیێ هزار پارچێن عەردی بۆ ئاڤاکرنێ دگەل خزمەتگوزاریێن پێدڤی هاتنەبەرهەڤکرن، بۆ ڤێ مەرەمێ داخوازا هاریکاریێ ژ چەندین رێکخراوێن خێرخواز یێن وی دەمی ل کوردستانێ چالاکبوون هاتەکرن و وان ژی بەرهەڤییا خۆ بۆ هاریکاریێ د ئاڤاکرنا کۆمەلگەهیدا دیار کر، ژ وان رێکخراوان، هابیتات، قەندیل، K.R.O، S.G.I و ل بەراهیێ بریار ل سەر ئاڤاکرنا ٧٠٠ ئاڤاهیان هاتەدان، بەری هەموو رێکخراوان رێکخراوا هابیتات دەست ب ئاڤاکرنا ٥٠ خانیێن پێکهاتی ژ دو ژوور و گەرماڤ و تەوالێت و پەرژان کر و رێڤەبەریا بازێرڤانیێن پارێزگەها دهۆکێ دیزاینێن پێدڤی بۆ کۆمەلگەهی دانان، ل یەکەمین پوستێ خانیێن کۆمەلگەهی ل سەر خەلکەکێ ئاوارە هاتەلێکڤەکرن[١٤].

### سنوورێن کۆمەلگەهێ:

**باکووری:** گوندێ حەوشکێ.

**باشووری:** گوندێ دولبێ.

**رۆژهەلاتی:** بازێرێ دهۆکێ (زانکۆیا دهۆکێ).

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەرتەنکێ.

### پێکهاتا خەلکێ کۆمەلگەهێ:

خەلکێ کۆمەلگەهێ پێکهاتینە ژ عەشیرەتێن (نێروەیی، دۆسکی ژووی، بەرواری ژووری)، و ژمارا ئاکنجیێن وێ ل دووڤ ژمارا پسۆلێن ئاهێن خوارنێ نێزیکی (١١٥٠٠) کەسانە.

ژ وان خزمەتگوزاریێن ل ڤێ کۆمەلگەهێ هەین، زانکۆیا نەورۆز، (٩) خواندنگەهێن بنەرەت، (٣) خواندنگەهێن ئامادەیی، ئێك یا کچان و ئێك یا کوران و ئێك یا ئێڤاران یا تێکهەل، ئێستگەهەکێ کارەبێ، بنکەهەکێ پۆلیسان، بنکەهەکێ ساخلەمیێ، ژبلی نەخۆشخانا هەوارهاتنی کو نێزیکە دێ ب داوی هێت[**].

## گوندێ قەشەفرێ:

گوندەکێ مەسیحیێن کلدانی یە، مەسیحی دبێژنێ مار یاقو، دێرا مار یاقو و گوندێ (قەشەفرێ) دکەڤیتە زنجیرا چیایێ سپی، ب دووراتیا (١٢کم) باکوورێ ناڤەندا سێمێلێ و (٤کم) ژ گوندێ شێزێ، د ناڤ سرۆشتەکێ جواندا کو زنجیرە چیایێ سپی وی ژ لایێن باکوور و رۆژهەلات و باشووری ڤە ب بلنداهیا نێزیکی (٩٣٠م) ل ئاستێ دەریایێ هەمبێز دکەت، ژ لایێ رۆژئاڤایی ژی ڤە دکەڤیتە هنداڤی دەشتا دۆبانا بەرفرەهـ مرۆڤ ب تنێ ب پییان و دەواران دشێت د رێکا (ممر قەشەفر) یێ ستراتیجی دا بگەهیتە وێرێ، کو د بەرێدا لەشکەرێن ئاشووری د وێ رێکێ را دگەهشتنە سەرێن چیایان و رێك ژ شێزێ تا گوندێ قەشەفرێ رێکەکا نەخۆشە. رووبەرێ قەشەفرا رۆژهەلاتی (٣٣٥٩کم) دۆنەمن، (٣٠٤٠) دۆنەم ژێ ب کێری چاندنێ دهێن و (٣١٩) دۆنەم ژی کەڤرینە. رووبەرێ قەشەفرا رۆژئاڤایی ژی (٢٥٠) دۆنەمن و هەمی ب کێری چاندنێ دهێت.

### ناڤێ گوندی:

ناڤێ گوندی ل سەر ناڤێ قەشە (مار یەعقوب ئەلرائی)یە، کو دێرێ ل سەردەمێ وی پێشڤەچوون بخۆڤە دیتی یێ هاتی.

گوند ب ناڤێ قەشەفر ژی ناڤدارە، کو ئەو ژی پەیڤەکا کوردی یە و سێ بۆچوون ل سەر ڤی ناڤی هەنە:

**ئێك:** ب واتایا گەلەك قەشە و ئەڤ چەندە راست نینە، چونکی کورد پەیڤا (بر) بۆ گەلەکێ بکار ناهینن.

**دو:** چیڤانۆکەك ژ لایێ خەلکێ گوندی ڤە دهێتە ڤەگێران کو قەشەیەك ل ڤی گوندی هەبوو، ڤی قەشەی هەڤالەکێ کورد (مەلا) هەبوو، د رۆژەکێ دا مەلا هات سەرەدانا هەڤالێ خۆ یێ قەشە کر و دان و ستاندنەك دناڤبەرا وان دا چێبوو و کەس نەشیا یێ دی رازی کەت و نەگەهشتنە چ ئەنجامان، ئینا قەشەی داخواز ژێ کر کو خۆ ژ جهێ گوندی کو دکەڤیتە هنداڤی دۆلەکا کوور ب هاڤێژن و ب فرن، هەچیێ ب سلامەتی گەهشتە بنێ دۆلێ بۆچوونا وی یا دروستە، مەلا رازی بوو ب مەرجەکی کو قەشە ل بەراهیێ خۆ ب هاڤێژیت و قەشەی خۆ هاڤێت و بەریکێن وی مینا پەرەشۆتان پری با بوون و ب سلامەتی گەهشتە بنێ دۆلێ، لێ پشتی مەلای ژی خۆ هاڤێتی و ژ بەر کو شەروال دبەربوو گرێل بوو بنێ دۆلێ و هەرشی و های ژ خۆ نەما، قەشە ب لەز بەزیێ و راکر هینا مالا خۆ و چاڤێ خۆ دایێ، و ژ بەر هندێ ناڤێ گوندی هاتییە کو (قەشە فری).

هندەك ژی دبێژن کو (قەشەفڕ) دهێت ب واتایا چوون، یان بەرزەبوون.

رامانا دروستا (قەشەفڕ) ژی دبێژن کو قەشەکی ب ناڤێ فەرەنسیس خزمەت ل ڤی گوندی دکر و بۆ ب ساناهی کرنا گۆتنێ کرینە (قاشافڕو)، و گوند ب ناڤێ وی یێ ب ناڤ و دەنگ بوو، ب تایبەت دناڤ کوردانداا.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** هەردو گوندێن زێوە و خازیاڤا.

**باشووری:** گوندێ شێزێ.

وێنەیێ دێرا گوندێ قەشەفرێ بەری سالێن ۱۹٦۰



**رۆژهەلاتی:** گوندێ کێڤلا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هژیرکێ.

### مێژوویا گوندی:

مێژوویا دامەزراندنا دێرێ ل گوندی ڤەدگەریتەڤە سالا (٤٨٥ز) و ل سالا (١٧٤٣ز)ێ ژ لایێ (نادر شاهی) ڤە هاتیە وێرانکرن دەمێ هێنگێ هێرش هینایە سەر چەند دێرێن مایی ل دەڤەرێ، و ل ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ ئەوا مایی ژی ژ دێر و گوندی هاتە پەڤاندن و نها ب تنێ کۆمێن بەرا ل جهێ وانە.

سالا (١٩٦١)ێ و دەمێ دەسپێکرنا شۆرشا کوردستانێ خەلکێ گوندی گوند چۆلکریە و ل سالا (١٩٦٢)ێ ڤەگەریانەڤە گوندی. سالا (١٩٦٣)ێ گوند ب تەمامی هاتیە سۆتن و هەتا نها چۆلە.

ڤی گوندی گەلەك شکەفت لێ هەنە، هندەك ژێ سرۆشتی نە و هندەك ژی قەشان وەکی ناوسك کۆلاینە.

گوندێ قەشەفرێ خواندنگەهەك لێ هەبوو کو بەری سالا (١٩٠٠)ێ هاتبوو ئاڤاکرن و خویندکارێن مەسیحی ژ جهێن جودا یێن دەڤەرا دهۆکێ ژ (ئەرەدنا و مانگێشکێ و بێرسڤێ و بێشابیرێ و دێرەبونێ بێدارێ) دهاتنێ و مەزاختنێن وێ ژی هەمی ل سەر فەرەنسا بوون، ڤێ خواندنگەهێ مامۆستایێن باش و پزیشك و دەرمان ژی لێ هەبوون و خەلکێ دەڤەرێ بۆ چارەسەرکرنا ئێشان قەست دکرنێ و چارەسەرکرن یا ب هەروە بوو. ڤێ خواندنگەهێ پەرتووکخانەك ژی هەبوو کو کۆمەکا پەرتووك و دەستنڤیسێن جۆرا و جۆر ل سەر دیرۆك و سیاسەت و جوگرافیا و ئایینی تێدا هەبوون، نها ل (دیر الأباء) ل مووسل دپاراستینە[٦٥].

گوندێ کەڤن دناڤ چیایێ بێخێری (چیایێ سپی) دا، نە یێ ئاڤایە و خەلکێ گوندی نها ل تاخەکێ گوندێ (شێزێ) هەر ل سەر ئاڤارێ گوندێ قەشەفرێ دژین، چونکی ئاڤارێ ڤان هەردو گوندان ب سەرێکڤەیە[٦٦].

ژ رویدانێن سەیر ل ڤی گوندی ئەوە کو خەلکێ دەڤەرێ هەتا سالا (١٩٠٠)ێ هێژ نەدزانین باجانسۆرك چیە و نە دخوارن، لێ تۆڤێ وان ب رێیا پەتریارکێن فەرەنسی گەهشتیە ڤی گوندی و پشتی پەتریارکی محەمەد یاسین بابێ شەفیق ئاغایێ زێوەیی مێهڤانکریە قەشەفرێ و پێکڤە باجانسۆرکێن کەلاندی خوارین، ئێدی ژ نوی تۆڤێ وان ل دەڤەرێ

**کواشێ ٢٠١٤ دیارە ئاڤارێ گوندی بوویە دەڤەرك پیشەسازی**



بەلاڤبوو[١٧].

## گوندێ کواشێ:

یەکە ژ گوندێن هەری کەڤن و دیرۆکییە ل دەڤەرێ، ناڤێ کواشێ دگەلەك بابەتێن دیرۆکی دا هاتییە، دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (١٠کم) ژ سەنتەرێ سێمێلێ و (١٢کم) باکوورێ رۆژهەلاتێ باتێلێ ل بنارێ چیای. ناڤێ گوندێ کواشێ دبێژن ژ ناڤێ مللەتەکی هاتییە کو د کەڤن دا ل ڤێ گوندێ دژیان و د گۆتنێ (ئارکاشی) و نها ژی گرەکێ مەزن ل نیڤا گوندی هەیە و دو ناڤ هەنە کو ئێك ژ وان (گرێ ئارکاشە). رووبەرێ وی یێ گشتی (٥٦٤٢) دۆنەمن، (٣٥٩٢) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٢٠٥٠) دۆنەم ژی کەڤرینە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایێ بێخێری.

**باشووری:** باترشێ (باگرشێ).

**رۆژهەلاتی:** گوندێن جومجەهان و گرفیلی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مال هەسن.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوند پێکدهات ژ نێزیکێ (٣٠-٤٠) مالان و چەندین بنەمال و بابکێن سلێڤانەێ تێدا دژیان مینا: زهێدی کو ل کواشێ و گرەشی دژین، بنەمالا عەلی رەشێ مەزن، بنەمالا عەلی رەشێ بچویك ل کواشێ و بالقۆسێ و قەسرا مەلە تەیبی و ئەرمشتێ و سەیزاری دژین، حەملاوی ل کواشێ دژین، بنەمالا صالح مێرەما ل کواشێ، دارزانێ ل کواشێ و شکەفتێ دژین، سەید ئینس ل کواشێ و باڤیا دژیان، میر شام ل کواشێ، حەسۆ مەلەکا ل کواشێ، کەنعانی ل کواشێ و قەسرا مەلە تەیبی و کێزینا. ژبلی نێزیکی (٣-٤) خێزانێن کۆچەر ژ تیرەیا گەودا لێ هەنە و ژمارا خێزانێن گوندی دگەهنە (٥٠-٦٠) خێزانان.

(گرێ ئارکاش) یێ کو دکەڤیتە نیڤا گوندی کواشێ



### ژیدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر تۆڤچینێ و خودانکرنا پەز و بزن و مێشێن هنگڤینی بوو، تۆڤچینی مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و ب ئالاڤێن کەڤن دهاتنەکرن، ژ بەر هەبوونا گەلەك ئاستەنگان کێلانا هەموو ئاخێ نە دهاتەکرن. ل هاڤینان کۆز و پاوانێ گوندی دهاتە سپاردن بۆ عەشیرەتێن جحێش و متێوت یێن عەرەب و پەزێ خۆ هەتا داویا هاڤینێ لێ دچەراندن.

هەر وەسان ل وی دەمی ل سەر کەرستەیێ خورستی ژی بوو، ژێلی گوشتێ سۆر و ریچال و هێك و گوشتێ پەلەوەران و هەموو جۆرێن فێقی ژ هژیر و کەزوان و تەفسك و ...هتد.

### سیمایێ گوندی:

سرۆشتێ گوندی پێکهاتییە ژ چیا و گەلەك کومتە و گەلی و لات و شکەفت و نهال و زەڤی و کانی و گرك و جهێن کەڤن لێ هەنە، ل سەر سنوورێ گوندێ مالهەسنێ کومتێ دێرینەی هەیە کو دکەڤیتە سەرێ چیای و ل باکوورێ رۆژاڤایێ گوندی و دبندا گەلیێ خەزالا هەیە (دکەڤندا خەزال لێ هەبوون) و د دووڤدا گەلیێ پانکا هەر ل رۆژاڤایی و گەلی دوبانکێ یێ کو دبیتە رێك بۆ برینا چیای بۆ گوندێ دوبانکێ ل وی ئالیێ چیای، دیسان ل سەرێ چیای بەرێ سپێ هەیە، فرەهییا وی دگەهیتە نێزیکی (١٠٠م)٢، دیسان گەلی سەقەر کو هێلینا وی جۆرە بالندەی لێ بوو، و گەلی قاسۆ، کەسەکێ خەلکێ گوندی بوو لێ نها چ ناڤێ وی نینە، بازا پلنگی سەرێ چیای (دبێژن ل بەرێ پلنگ لێ هاتییە دیتن). و فەقفال گرەکێ مەزنە ل هنداڤی گوندی. دیسان زەیتوون بەرخوەهرەکە و رێبارە ل هنداڤی وارەکێ دبێژنێ زهێدێ و دکەڤیتە رۆوێ نزاری و ئەو وار دزڤریت بۆ بنەمالا زهێدی یا، گەلیێ گۆلکا کو دو شکەفت لێ هەنە و د شۆرشێ دا جهێ پەنایا گوندیان بوو، دیسان گەلیێ کواشێ ل هنداڤی گوندی ل ئالیێ باکووری و گەلییەکێ مەزنە.

ژ کانییێن گوندی ژی: کانی زەیتوون ل نزارێ چیای دناڤ وارێ زهێدیاندا، کانێ تەحلێ دناڤ زکێ گەلیێ گوندی، کانی بهار، و ئاڤا بووکا [٦٨]، و کانییا پتر دهاتە ب کارئینان بۆ خوارن و ڤەخوارنان کانییا قولەتەینێ بوو.

ڤی گوندی چەند گرەکێن مەزن ل دەردوور هەنە، مینا گرێ گوندی ل رۆژهەلاتێ گوندی و گرکێ سێ تلا ل باکوورێ گوندی و حەلانێت مریا ل باکووری و زەڤیا پیر ئاڤدەلا و کۆزا لەعلێ و کۆزارا ئاغاتیێ ل باکوورێ گوندی، و هەفشی رەش یێ کو دکەڤیتە رۆژاڤایی دناڤبەرا گوندی و گوندێ مالهەسنێ و گرێ سۆر ل رۆژاڤای و و گرێ خازیالێ (ئارکاش) ل مەلبەندێ گوندی.

ژ نهالێن گوندی ژی: نهالا دەرگەهێ دناڤبەرا گوندی و گوندێ گرەشی کو ب ناڤێ دەرگەهـ هاتییە نیاسین کو دەرگەهێ گوندی بوو دگەل گوندێن دەشتێ، و نهالا حەم دەرویشا ل رۆژاڤایێ گوندی.

### جهێن دیرۆکێ و کەڤن:

- زیارەتێ مەلا ئەحمەدێ ل باشوورێ گرێ گوندی و گۆرستانەك لێ هەیە.
- کچکا سەر رەش کو گۆرەکێ ب تەنێ یە ل سەرێ گرێ گوندی.
- زیارەتێ گرێ سێ تلا، ئەو ژی گۆرستانە ل باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی.
- زیارەتێ سەید بەتال، دکەڤیتە باکوورێ گرێ خازیالێ و شوورهەکریە.
- زیارەتێ نەصرەلدینی، دکەڤیتە باشوورێ گرێ خازیالێ.
- زیارەتێن گوندێ، زۆر کەڤنن دکەڤنە رۆژهەلاتێ گرێ خازیالێ و تا نها کواشیی مرێن خۆ لێ ڤەدشێرن.
- ڤی گوندی کەلایەکا مێژوویی ب ناڤێ (کەلا کواشێ) لێ هەبوو و هەتا سالا (١٩٦٤)ێ یا دیار بوو، لێ نها بوویە کۆمەکا بەران [١٩].

**حەز و نارەزوو:**

خەلكێ گوندی بۆ یاریا و سوحبەتێ ناڤدارن، هەردەم ئاخفتنێن كواشێ یا حازرن، حەزل مێڤانداریێ و لێك كومبوونێ دكرن، جارنا دبێژن گەلەك جاران جوهی ب ڕێباری دبوورین و پەرووكێن خۆ دفرۆتن، لێ ژ بەر چیرۆك زانیبا وان نەدهێلان بچن و هەموو وێ شەڤێ لێ كۆم دبوون و شەڤا خۆ دگەل دبووراندن. دیسان نێچیرڤانی یەك ژ ئارەزوویێن چەند گەنجێن گوندی بوون ژ بەر هەبوونا پەزێ كووڤی و گیانەوەرێن دی ب ئاسانی دهاتنە دیتن و دبێژن كووڤی و خەزال ب ڕەڤدا ددیتن وهرچ و شبل و كتكێن كووڤێ كو دو جۆر هەبوون یێ چیایی و یێ دەشتێ كو دگۆتێ گوڤرِ هاتینە دیتن.

ئەڤ گوندە ژی مینا پتریا دەڤەرێ ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە ڕاگوهاستن و كەتییە بەر هەوا (تەعریبێ)، و پشتی سەرهلدانێ هاتییەڤە ئاڤاكرن، نها ب شێوەیەكێ سەردەمیانە ئاڤایە و دەڤەرەكا پیشەسازی لێ هاتییە دروستكرن و نێزیكی (٢٠٠) كارخانان لێ هەنە، مینا پارزینگەهێن نەفتێ و كارخانێن ئاری و بلۆكا و بۆریێن پلاستیكی و... هتد.

ڤی گوندی نها نێزیكی ٣٠ مالێن كەڤن لێ دژین و ئاخا خۆ شێندكەنە ڤە، لێ پتریا كواشیا ل سێمێلێ دژین[٧٠].

ڤی گوندی خواندنگەهەكا بنەرەت و تۆرا ئاڤێ و كارەب و ڕێكەكا چێكری لێ هەنە[٧١].

## گوندێ جۆمجەهان (یان دبێژنێ بۆسریان):

ناڤێ گوندی یێ هاتی ب واتایا دۆلێن چاندنا جەهی، و پەیڤا جۆم ب واتایا دۆلا بچویك دهێت، ڕووبەرێ وی یێ گشتی (٢٤٨٢) دۆنەمن، (١٥٠٠) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٩٨٢) دۆنەم ژی كەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** چیایێ سپی.

**باشووری:** گوندێ گرفیلی.

**ڕۆژهەلاتی:** گوندێ هاجسنە.

**ڕۆژئاڤایی:** گوندێ كواشێ.

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٧)ێ كەتییە بەر هەوا ڕاگوهاستنێ و ل ڤان داوییان هاتییە ئاڤاكرن ڤە و نێزیكی (٨- ١٠) خێزانان ژ عەشیرەتا كۆچەران (شەرەفانی) لێ دئاكنجینە.

ژ خزمەتگوزاریێن ل گوندی هەین تۆرا كارەبێ یە كو ل سالا (٢٠١٣)ێ گەهشتییە گوندی و ڕێكەكا ڤێركری، سەرەرای بیرەكا ئیرتیوازی[٧٢].

## گوندێ گرفیل:

ناڤێ گوندی یێ هاتی ژ بەر كو گرەكێ مەزن ب مەزنیا فیلی لێ هەیە (گر+ فیل)، ڕووبەرێ وی یێ گشتی (٢٥٥١) دۆنەمن، (٢٤٣١) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (١٢٠) دۆنەم ژی كەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ جومجەهان.

**باشووری:** گوندێن سەرشۆر و دارێ.

**ڕۆژهەلاتی:** گوندێ هاجسنە.

**ڕۆژئاڤایی:** گوندێ كواشێ.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٤٧ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٣] ، ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٧)ێ كەتییە بەر هەوا ڕاگوهاستنێ و نها گوند چۆلە[٧٤].

## گوندێ ماڤان:

گوندەكێ نیمچە ئاڤایە و هندە ئاوارە دناڤ هندە خانیێن بێ سەروبەردا دژین، دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (١٠كم) ژ سەنتەرێ قەزا سێمێلێ، ناڤێ گوندی دبنیات دا (ماوانە)، ئەو ژی پەیڤەكا سریانی یە ب واتایا (جهێ ڤەحەواندێ، یان جهێ ڤەحەواندنا پەزی)، و ل ئیرانێ ژی گوندەك ب هەمان ناڤی هەیە و ئەڤ گوندە ب ناڤێ وی گوندی هاتییە ب ناڤكرن، ڕووبەرێ وی یێ گشتی (١٧٤٧) دۆنەمن، (١٦٥٧) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٩٠) دۆنەم ژی كەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ تەل زید.

**باشوور و باشووری رۆژئاڤایی:** گوندێ گرێ گەورێ.

**باشووری رۆژهەلاتی:** گوندێ سەیدزاری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کلێبنی (کولێمنی).

ئەڤ گوندە سێ جاران کەتییە بەر هەوێن راگوهاستنێ و داوی جار ژی ل سالا (١٩٧٥)ێ بوو.

ژ خزمەتگوزاریێن ل گوندی هەین تۆرا ئاڤێ و کارەب و رێکەکا چێکری لێ هەنە[٧٥].

## گوندێ شێزێ (سێجێ):

گوندەکێ کلدانیانە، ب دووراتییا (٧کم) دکەڤیتە باکووری قەزا سێمێلێ ل بنارا زێری ژ زنجیرا چیایێ سپی، (٦٢٠م) ژ ئاستێ دەریایێ بلندە و ژ هەرسێ لایێن رۆژهەلاتی و باشووری و رۆژئاڤایی دکەڤیتە هنداڤی دەشتەکا بەرفرەهـ سێج دهێت ب واتایا مێویژ و رەنج و زەحمەت،[٧٦] رووبەرێ وی یێ گشتی (١٣٩٨) دۆنەمن، (١١٣٢) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٢٦٦) دۆنەم ژی کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** قەشەفرا رۆژهەلاتی.

**باشووری:** ناڤەندا سێمێلێ یە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کێڤلایە.

**رۆژئاڤایی:** قەشەفرا رۆژئاڤایی.

ئەڤ گوندە گوندەکێ کەڤنە، دکەڤندا و هەر ژ سەدساليا چوارێ زایینی قەشێن دێر مار فنحاس لێ دژیان، ئەڤ جهە جهێ بێهنڤەدانا قەشێن دێر مار یاقو بوو، وان خانییەك و کوچکدانەك (لێنانکەهەك) لێ هەبوو و خوارن بۆ قەشێن ل سەر عەردێن چاندنێ کاردکرن دروست دکرن، یەکەم جار ناڤێ ڤی گوندی (بیث شیزی) یێ د پەرتووکا (الهاوي المجهول) دا هاتی، واتایا ناڤێ گوندێ (شێزێ) یێ ژ دارێ رەشێ موکم هاتی، ئەو دار ژی (ئنبۆسە) و (قوسعة) ژێ دهاتنە دروستکرن، دبێژن فلان کەس (شیزی پر دکەت)، واتە (قوسعا ژ شیزی) هاتییە دروستکرن، و (مالا شیزی) دهێت ب واتایا (مالا قوسعێ یان مالا خوارنێ).

یەکەم دێر ل ڤی گوندی ل سالا (١٨٥٧)ێ ب لبن و ئاخێ هاتییە دروستکرن و چەند جاران پشتی هینگێ هاتییە نووژەنکرن ڤە.

ئەڤ گوندە چەندین جاران یێ تووشی تالانکرنێ بووی، یەکەم جار هەوا (نادر شاهی) بوو ل سالا (١٧٩٤)ێ و پشتی هینگێ هەوا (میرێ رەواندزێ) ل سالا (١٨٣١)ێ و (رەسوڵ بەگێ) ل سالا (١٨٣٤)ێ.

د مێژوویا هەڤچەرخ ژی دا ل سالا (١٩٦١)ێ ل دەسپێکا شۆرشا کوردستانێ خەلکێ وی گوند چۆلکرن و سالا (١٩٦٢)ێ ڤەگەریانەڤە گوندی، جارەکادی ل سالا (١٩٦٦)ێ گوند هاتەچۆلکرن و ب تەمامی هاتەسۆتن، تا سالا (١٩٧١)ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن، سالا (١٩٧٤)ێ دیسان چۆلکرەڤە و سالا (١٩٧٥)ێ ڤەگەریانەڤە هەتا سالا (١٩٨٧)ێ کو گوند هاتییەراگوهاستن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەها موسێریکێ ئاکنجیکرین. پشتی سالا (١٩٩١)ێ رێکخراوەکا مرۆڤایەتی کو ل کوردستانێ کار دکر (٦٠) خانی لێ ئاڤاکرن و پشتی هینگێ حوکمەتا هەرێما کوردستانێ ژی ل سالا (١٩٩٧)ێ (٢٠) خانی لێ ئاڤاکرن، سالا (٢٠٠٥)ێ پتر ژ (١٥٠) خانیێن نوو لێ هاتبوونە ئاڤاکرن و پشتی کاودان ل بەغدا و مووسل تێکچووین، نها پتر خانی لێ دهێنە ئاڤاکرن.

یەکەم جار خواندنگەهـ ل سالا (١٩٥٨)ێ ل ڤی گوندی ژ لبن و ئاخێ ل باشووری گوندی هاتبوو ئاڤاکرن و یا پێکهاتیبوو ژ (٦) پۆلان. سالا (١٩٧٧)ێ ئاڤاهییەکێ نوو بۆخواندنگەهێ ل گوندی هاتە دروستکرن، لێ ل سالا (١٩٨٧)ێ دگەل گوندی هاتە وێرانکرن. سالا (١٩٩٧)ێ حوکمەتا هەرێما کوردستانێ خواندنگەهەکا نوو لێ دروستکرنەڤە.

ژ خزمەتگوزاریێن دی ل گوندی بیرەك ل سالا (١٩٧٣)ێ ل گوندی بۆ ڤەخوارنێ و تۆرا ئاڤێ هاتبوو کۆلان و پشتی هینگێ بیرەکا دی بۆ جهێن نوو هاتینە ئاڤاکرن هاتە کۆلان، دیسان تۆرا ئاڤێ و کارەب ژی ل گوندی هەیە[٧٧].

## گوندێ دولبێ (دولبا ژووری و دولبا ژێری):

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (٤كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ، مولكدارییا وی یا (مەحمود ئەلنائیبە كو خەلكێ مووسلێ یە)، ناڤێ گوندی وەكی ژ زاردەڤێ خەلكێ وی دهێتە ڤەگوهاستن دبێژن ناڤ یێ ژ كێمییا خەلكێ گوندی هاتی، چونكی ئێشان د سالێن سیهاندا ژ سەدسالییا بیستێ گەلەك زارۆك دكوشتن، لێ (الاب الدومنیكی جان فییە) دبێژیت ناڤێ وی دكەڤن دا (كانییا دولبێ) بوو، ب واتایا كانییا دارا كاژێ[٧٨]. رووبەرێ وی یێ گشتی (٢٩١٨) دۆنەمن، (١٢٩٠) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (١٦٢٨) دۆنەم ژی كەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ حەوشكێ.

**باشووری،** گوندێ بازەلانێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مالتا ژێری.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گوندێ سەرتەنكێ.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

وەكی دیار دولبێ پێكهاتییە ژ دولبا ژووری و دولبا ژێری، دولبا ژووری ئاكنجیێن وی كۆچەرن ژ تیرەیا مەهمەدان و نێزیكی (٧٠) خێزانانە، دولبا ژێری ژی خەلكێ وی ژ عەشیرەتێن بەرواری ژووری و كۆچەرێن زێدك و دۆسكی و كێمەكا مزوورییانە و نێزیكی (٢٠٠) خێزانانە.

ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە راگوهاستن و داوی جار ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ بوو، پشتی سەرهلدانێ ل دەوروبەرێن سالا (١٩٩٣)ێ جارەكادی هاتە ئاڤاكرن ڤە و ژیانا وان یا ئابووری پتر ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

ڤی گوندی نها خواندنگەهەك لێ هەیە، ژبلی خزمەتێن ئاڤ و كارەب و رێكەكا ڤێركری[٧٩].

## گوندێ مەروینا:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا (٥كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ، رووبەرێ وی یێ گشتی (٢٣٩٥) دۆنەمن، (٢٢٥٥) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (١٤٠) دۆنەم ژی كەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری و باكوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێن سەرشۆرێ و باترشە.

**باشووری،** گوندێ تەلزێد.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن سەرۆكانی و موقبلێ.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

پتریا خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا كۆچەرانە ژ تیرەیا (هاجا)، ژبلی سلێڤانەیان ژی، نێزیكی (٧٠) سەرخێزانان ل ڤی گوندی دژین.

ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتبوو وێرانكرن و جارەكادی ل سالا (٢٠٠١)ێ هاتەڤە ئاڤاكرن.

نها خواندنگەهەك و تۆرا ئاڤێ و كارەب و رێكەكا ڤێركری لێ هەنە[٨٠].

## گوندێ سەرشۆرێ:

ئەڤ گەندە دكەڤیتە دووراتییا (٤كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ، ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ دو بڕگان (سەر+ شۆر)، چونكی ل گوندێ كەڤن شوركێت ئاڤێ لێ هەبوون، رووبەرێ وی یێ گشتی (١٧٢٨) دۆنەمن، (١٢٧٨) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٤٤٨) دۆنەم ژی كەڤرینە.

### سنوورێن گوندێ كەڤن:

**باكووری،** گوندێ گرفیلی.

**باشووری،** گوندێ مەروینا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دارێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ باترشە (ناحیا باتیلێ).

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

پتریا خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەرانە ژ (هاجا و ئۆما)، ژبلی (٤) خێزانێن سلێڤانەیان. و نێزیکی (٥٠) سەرخێزانان ل ڤی گوندی دژین.

ئەڤ گوندە داوی جار و بۆ جارا چواری ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتبوو وێرانکرن و جارەکادی ل سالا (١٩٩٦)ێ هاتەڤەئاڤاکرن، لێ نە ل جهێ کەڤن، بەلکی ل بەرامبەر جهێ گوندێ کەڤن و ب دووراتییا (١کم) ژ رێکا دەولی یا کو دچیتە زاخۆ.

نها خزمەتێن ئاڤ و کارەبێ ل ڤی گوندی هەنە[٨١].

## گوندێ هژیرکێ:

دگۆتنە گوندی هێژیرکا مەندان، ناڤێ ڤی گوندی یێ ژ دارا هژیرێ هاتی، یان ژی دبیت گوند ل نێزیکی دارەکا هژیرێ هاتبیتە ئاڤاکرن، رووبەرێ وی یێ گشتی (٢٨٠٥) دۆنەمن، (١٩٥٤) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٨٥١) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** چیایێ سپی.

**باکوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێ شێزێ.

**باشوور و باشوورێ رۆژهەتی،** قەشەڤرا رۆژئاڤایی.

**باشوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ کانی سپی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گەرماڤا محەمەد ئاغای.

ئەڤ گوندە پشتی سالا (١٩٨٧)ێ هاتییە وێرانکرن نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە و رێکا وێ ژی یا نیڤ ڤێرکرییە[٨٢].

## گوندێ هاجسنە:

گوندەکێ کەڤنارە و گۆرستانەکا مێژوویی لێ هەیە، جهێ ڤی گوندی جهەکێ تەنگە و دکەڤیتە دناڤبەرا دو گراندا، و دبیت ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتبیت، یان دبیت ژ (هاجی هەسنێ) هاتبیت[٨٣]، رووبەرێ وی یێ گشتی (٣٢٤٨) دۆنەمن، (٢٣٧١) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٨٧٧) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** چیایێ سپی.

**باشووری،** گوندێ دارێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گەرماڤا محەمەد ئاغای.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ جومجەهان (بۆسریان).

ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ تووشی راگوهاستنێ بوویە وپێکهاتا وی نها ژ (٥ - ٦) خێزانانە ژ عەشیرەتا کۆچەرێن ئەرتووشی.

ژ خزمەتگوزارییێن ل ڤی گوندی هەین دو بیرێن ئیرتیوازی دگەل کارەبێ و رێکا وێ ژی بەری سالەکێ هاتییە ڤێرکرن[٨٤].

## گوندێ گەرماڤا محەمەد ئاغای:

گوندەکێ دی یێ سەر ب سێمێلێ ڤەیە، ناڤێ وی پێکهاتییە ژ هەردو برگەیێن (گەرم+ ئاڤ)[٨٥]، ژ بەر کو کانیێن ئاڤا گەرم لێ هەنە، رووبەرێ وی یێ گشتی (٥٣٦٨) دۆنەمن، (٣٦٥٦) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٧١٢) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** چیایێ سپی.

**باشووری،** گوندێن کانی سپی و دارێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هژیرکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ هاجسنە.

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە وێرانکرن و ل ڤان داوییان هاتییەڤە ئاڤاکرن، نها نێزیکی (١٠) خێزانان ژ عەشیرەتا کۆچەرێن شەرەڤا لێ دژین و بیرەکا ئیرتیوازی دگەل کارەبێ کو بەری دو سالان گەهشتییێ و رێکەکا ڤێرکری لێ هەنە[٨٦].

## گوندێ دارێ:

گوندەکێ دی یێ سەر ب سێمێلێ ڤەیە، ناڤێ گوندی دبیت ژ دار، یان دارا هاتبیت، رووبەرێ وی یێ گشتی (٣١٨٣) دۆنەمن، (٣٠٣١) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٥٢) دۆنەم ژی کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** هەردو گوندێن هاجسنە و گەرماڤا محەمەد ئاغای.

**باشووری:** گوندێ خراب کۆلکی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی سپییا ژووری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەرشۆر.

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتییە وێرانکرن و نها نێزیکی (١٠ - ١٥) خێزانان ژ عەشیرەتا کۆچەرێن شەرەفا لێ دژین و تۆرا کارەبێ ل سالا (٢٠١٣) گەهشتییە گوندی و رێکا وێ ژی یا ڤێرکری یە[٨٧].

## گوندێ کێڤلا:

ئەڤ گوندە نها بوویە پارچەك ژ باژێرڤانییا تەناهی، ناڤێ وی دبیت ژ پەیڤا ( (cave ب واتایا شکەفت هاتبیت، گەلەك شکەفتێن سرۆشتی و دەستکرد لێ هەنە هاتبیت، دیسان کێڤلا ناڤێ گیانەوەرەکی یە[٨٨]، رووبەرێ وی یێ گشتی (١٧٣٣) دۆنەمن، (١٦٣٣) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٠٠) دۆنەم ژی کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** چیایێ سپی.

**باشووری:** گوندێ حەوشکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زرکا کو نها بوویە تاخەکێ باژێرێ دهۆکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شێزێ.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

دکەڤندا گوند ژ عەشیرەتێن کۆچەرا، تیرەیا مەهمەدان و ژ عەشیرەتا دۆسکییا بوون، و چونکی عەرد ل وێرێ هاتە دابەشکرن، گوند بوو پارچەك ژ باژێرڤانییا تەناهی و نها عەشیرەتێن دی تر ژی دناڤدا دژین، وەکی مزووری و نێروەیی و بەرواری.

ئەڤ گوندە چوار جاران، دو جاران د سالێن شێستان دا و ل سالا (١٩٧٥)ێ و (١٩٨٦)ێ ژ سەدسالییا بووری تووشی راگوهاستنێ بووینە و ل سالا (٢٠٠٠)ێ جارەکادی هاتییە ئاڤەدانکرن ڤە و نها دو خواندنگەهـ لێ هەنە، یا نوو ل سالا (٢٠٠٠)ێ هاتییە دامەزراندن و خزمەتێن ئاڤ و کارەبێ لێ هەنە و رێکا ڤێرکری دگەهیتە گوندی[٨٩].

## گوندێ قۆتێ:

جهێ گوندێ مینا قۆدیکێ (خۆدیکێ) یێ بلندە و گوند یێ نیڤ چۆلە، رووبەرێ وی یێ گشتی (٦٠٣٦) دۆنەمن، (٣٢١٧) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٢٨١٩) دۆنەم ژی کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن بامێر و فەقسین کو سەر ب باتێلێ ڤەنە.

**باشووری:** گوندێ ئاڤتەحلێ کو کەتییە دبن سکرێ مووسل ڤە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سەرشۆرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کاڤل درێژ کو سەر ب باتێلێ ڤەیە.

گوند ل سالا (١٩٧٥)ێ تووشی راگوهاستنێ بوویە و نها بتنێ (٣ - ٤) خێزانان ژ عەشیرەتا کۆچەران، تیرەیا هاجا لێ دژین و پتریا خەلکی وی نها ل موسێریکێ نە.

نها تنێ کارەب لێ هەیە و رێکا وی یا ڤێرکری نینە.

## گوندێ کەردیز:

ناڤێ ڤی گوندی دبیت ژ (کەر+ دیز) هاتبیت، واتە دبیت پرتێن دیزێن (قازانێن) گلینەیی (فخاری) ل جهێ گوندی هاتبنە دیتن، رووبەرێ وی یێ گشتی (٢٨٤٦) دۆنەمن، (٢٣٧٤) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٤٧٢) دۆنەم ژی کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کلیبنێ (کولێمنێ).

**باشووری:** گوندێن کەمونە ژووری و چەم پاشایی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن گرێ گەورێ و بەدەلییا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەرشۆر.

ئەڤ گوندە پشتی ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتییە خرابکرن، هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە و خەلکێ وی کو کۆچەرێن هاجا بوون نها ل موسێریکێ دژین.

## گوندێ سەیزاری (ژێری و ژووری):

گوندەکێ کەڤنە و دیرۆکا ئاڤاکرنا وی ڤەدگەرێتەڤە بۆ بەری (٢٠٠) سالان، هەتا سالا (١٩٤٥)ێ و ب تایبەت یا ژێری، عەرەب ژ عەشیرەتا شەرابی پێکهاتا سەرەکی یا گوندی بوون و پشتی هینگێ کورد ژ عەشیرەتا کۆچەران (هاجا و مالا جندۆی) لێ ئاکنجی بوون، ناڤێ گوندی ژی یێ ژ ناڤێ (سەید) دگەل پەیڤا (زاری) واتە (ظاهر) کو ناڤێ مرۆڤانە یێ هاتی و (ڤاهر و یەحیا) برایێن ئێك بوون، سەید یەحیا یێ ل گوندێ سەیزارا ژووری کو نها تاخەکە ژ کۆمەلگەها موسێریکێ هاتییە ڤەشارتن و سەید (ڤاهر) یێ ل سەیزارا ژێری کو نها کاڤلە هاتییە ڤەشارتن. رووبەرێ وی یێ گشتی (٤٥٥٨) دۆنەمن، (٤٤٢٨) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٣٠) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن تل زێد و ماڤان.

**باشووری:** هەردو گوندێن کوتبە و چالوان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن لەزەکا قەسر یەزدین.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن گرێ گەورێ و بەدەلییا.

گوند ل سالا (١٩٦٤)ێ ژ لایێ چەتەیێن رژێما عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و وێرانکرن و ل سالا (١٩٦٦)ێ جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

ل کۆمەلگەها موسێریکێ خواندنگەها (سەیزاری) کەڤنترین خواندنگەهە و ل سالا (١٩٥٨) ێ هاتییە دامەزراندن[٩٠].

## گوندێ زەینیات:

ل سەر ناڤێ ڤی گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێکێ دبێژیت یێ ژ ناڤێ ژنەکێ ب ناڤێ (زینو) هاتی کو دەسەلاتەك ددەستی دا بوویە، یا دووێ ژی دبێژیت یێ ژ ناڤێ مەزارێ (قوبە)، کو ناڤێ وی (شێخ زەری) هاتی و یێ بوویە زەینیات. رووبەرێ وی یێ گشتی (١٧٨٣) دۆنەمن، (٣٢١) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٤٦٢) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ مام شڤان.

**باشووری:** سکرێ مووسل.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رێبیێ.

**رۆژئاڤایی:** سکرێ مووسل.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

بەری ئاڤاکرنا کۆمەلگەها خانکێ گوند ئێزدی بوون ژ عەشیرەتێن (رەشکی و مۆسانی)، لێ پشتی ئاڤاکرنا کۆمەلگەهێ ئەو دیموگرافییە هاتە گوهارتن و چەند گوند ل دۆرمانا ل سەر دو قۆناغان خرڤەکرن، قۆناغا ئێکێ پشتی ئاڤاکرنا سکرێ مووسل ل سالا (١٩٨٣)ێ و قۆناغا دووێ پشتی راگوهاستنا بەرفرەها سالا (١٩٨٧)ێ[٩١].

## گوندێ کلیبنێ (کولێمنێ):

گوندەکێ چۆلە، رووبەرێ وی یێ گشتی (٣٠٣٧) دۆنەمن، (٢٧٩٤) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٢٤٣) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ موقبلێ.

**باشووری:** گوندێن کردیز (کەردیز) و گرێ گەورێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن تل زید و ماڤان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هەورێسکێ.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

خەلکێ وی د بنیاتدا ژ هەردو عەشیرەتێن سلێڤانەیی و کۆچەرێن هاجا و مەهمەدا بوون، پشتی راگوهاستنێ کو ل زڤستانا دناڤبەرا سالێن (١٩٧٥ - ١٩٧٦) هاتییە ئەنجامدان ٪٩٠ێ ژ خەلکێ وی ل (خراب کۆلك) ئاکنجی بوون کو نها بوویە پشکەك ژ موسێریکێ و سەیزاری[٩٢].

## گوندێ ربێبی:

گوندەکێ نیڤ چۆلە و ب تنێ (٥) خێزانێن دنانی لێ دژین، ناڤێ گوندی ناڤەکێ سریانی یە ب واتایا (خانما بیژن)، رووبەرێ وی یێ گشتی (٣٢١١) دۆنەمن، (١٧٧٠) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٤٤١) دۆنەم ژی کەڤرنە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن صۆرکا و قەسر یەزدین.

**باکوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ گوتبە.

**باشووری،** گوندێن رەحمانییێ و خێراڤا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مام شڤان.

پشتی هەوا راگوهستنا سالا (١٩٨٧)ێ خەلکێ گوندی ل کۆمەلگەها خانکێ دژین[٩٣].

## گوندێ لەزاکا:

ناڤێ گوندی ل بەرێ (چەم گەورك) بوو، ناڤێ گوندێ لەزاکا یێ ژ ئاخا وی یا چڤر و نیسەك هاتی.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ موسێریکێ.

**باشووری،** گوندێ قەسر یەزدین.

**رۆژهەلاتی،** ناڤەندا سێمێلێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ سەیزاری ژووری.

خەلکێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا بەروارییانە و گوند پشتی شکەستنا شۆرشا کوردی دناڤبەرا سالێن (١٩٧٥ - ١٩٧٦)ێ هاتییە راگوهاستن و خەلکێ وی نها ل موسێریکێ دژین، لێ بۆ کاروبارێن چاندنێ و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی نێزیکی (١٠ - ١٥) خێزان ل هاڤینان دچنە گوندی و نێزیکی (٧ - ٨) کانیێن ئاڤێ لێ هەنە، ژ بەر نەبوونا خزمەتگوزارییێن پێدڤی ل زڤستانان ڤەدگەرینەڤە کۆمەلگەهێ[٩٤].

گوندێ ربێبی



## گوندێ صۆركا:

گوندەكێ ئاڤەدانێ كەڤنە و گرەكێ[٩٥] شوینواری لێ هەیە، رووبەرێ وی یێ گشتی (٢٥٢١) دۆنەمن، (٢٢٣٦) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٢٨٥) دۆنەم ژی كەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ناڤەندا سێمێلێ.

**باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێ رێبیێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باختمێ (سەر ب فەیدیێ ڤەیە).

**رۆژئاڤایی:** گوندێ قەسر یەزدین.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ وی پێكهاتییە ژ ئێزدیێن (سیدكا) و مەسیحییێن (بازی) و نها (٨٠) خێزان لێ دژین و لیژنا بلندا كاروبارێن مەسیحیان (٥٥) خانی و دێرەك ل گوندی ئاڤاكربوون.

ئەڤ گوندە سێ جاران ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٣، ١٩٧٥) تووشی وێرانكرنێ بوویە و داوی جار ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ بوو كو خەلكێ وی ل كۆمەلگەها خانكێ ئاكنجیكرین.

ڤی گوندی خزمەتێن ئاڤ و كارەب و سكرەكێ بچویك بۆ كاروبارێن چاندنێ لێ هەیە[٩٦].

## گوندێ قەسر یەزدین:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا (٥كم) ژ ناڤەندا سێمێلێ، رووبەرێ وی یێ گشتی (٢١٤٩) دۆنەمن، (١٨٦٨) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٢٨١) دۆنەم ژی كەڤرینە، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ مرۆڤەكی هاتی، ب واتایا (قەسرا یەزدینی).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ موسێریكێ.

**باشووری:** گوندێ گوتبە.

**رۆژهەلاتی:** ناڤەندا سێمێلێ و گوندێ صۆركا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەیزاری ژێری.

پێكهاتا جڤاكی یا خەلكێ ڤی گوندی ئێزدینە ژ عەشیرەتێن (دنانی و خالتی و هەویری) یان و نێزیكی (٥٠) مالان ل گوندی دژین.

ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ پشتی ئاڤاكرنا كۆمەلگەها خانكێ هاتبوو وێرانكرن، لێ نها یا ئاڤەدانە و خزمەتگوزاریێن ئاڤ و كارەبا و خواندنگەهەكا بنەرەت لێ هەنە و رێكا خانكێ ل نك را دەرباز دبیت[٩٧].

## گوندێ مام شڤان:

رووبەرێ گشتی یێ ڤی گوندی (٤٠٨٩) دۆنەمن، (٣٥٨٢) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٥٠٧) دۆنەم ژی كەڤرینە، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ مەزارەكی ب ناڤێ (مەم شڤان) هاتی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن گوتبە و جالوان.

**باشووری:** گوندێ زەینیات.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رێبیێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كەموونە ژێری.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

پێكهاتا جڤاكی یا خەلكێ ڤی گوندی ئێزدینە ژ عەشیرەتێن (دنانی و ماسەكی و هەویری) و نێزیكی (١٥٠) مالان ل گوندی دژین.

ئەڤ گوندە ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ پشتی ئاڤاكرنا كۆمەلگەها خانكێ هاتبوو وێرانكرن، لێ ل سالا (١٩٩٣)ێ هاتییەڤە ئاڤەدانكرن و خزمەتگوزاریێن ئاڤ و كارەبا و خواندنگەهەكا بنەرەت و سكرەكێ بچویك لێ هەنە و جادا وێ ژی یا ڤیركری یە[٩٨].

## گوندێ جالوان (چالوان):

رووبەرێ گشتی یێ ڤی گوندی (٩٩١) دۆنەمن، (٩٠٠) دۆنەم ب كێری چاندنێ دهێن و (٩١) دۆنەم ژی كەڤرینە، ناڤێ گوندی یێ ژ (چال+ وان) هاتی، ب واتایا چالێن وی مینا چالێن بازێرێ وانێ نە ل باكوورێ

کوردستانێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سەیزارا ژێری.

**باکوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ بەدەلیبیا.

**باشوور و باشوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێ مام شڤان.

**باشوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ کەمموونە.

پرۆژەیەکێ پەلەوەران ل سالا (۱۹۸۳)ێ ل سەر عەردێ ڤی گوندی هاتبوو ئاڤاکرن خەلکێ وی ل گوندێ سەیزاری ئاکنجیکرن.

## گوندێ بەدەلیبیا:

گوندەکێ کەڤنە و گرەکێ شوینواری[99] لێ هەیە. رووبەرێ گشتی یێ ڤی گوندی (۲٤٥٦) دۆنەمن، (۲۲۸۹) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (۱۹٦) دۆنەم ژی کەڤرینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ گرێ گەورێ.

**باکوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ کەردیز.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سەیزاری.

**باشوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێ جالوان.

**باشوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ کەمموونە.

**باشووری،** گوندێ زەینیات.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کەمموونە ژێری.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

پتریا خەلکێ وی مەسیحی بوون ژ عەشیرەتا (بازی) و کێمەکا کۆچەرێن هاجا، پشتی گوند ل سالا (۱۹۸۳)ێ ب بەهانەیا چێکرنا پرۆژەیێ پەلەوەران ل سەر ئاخا ڤی گوندی هاتییە راگوهاستن، موسلمانێن وی ل سەیزاری (موسێریکێ) و مەسیحیێن وی ل ناڤەندا سێمێلێ ئاکنجیکرن.

## گوندێ تل زید:

گوندەکێ کەڤنارە و گرەکێ شوینواری[100] لێ هەیە و هەتا نها چۆلە، رووبەرێ گشتی یێ ڤی گوندی (۲۱۳٦) دۆنەمن، (۲۰٥۳) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (۸۳) دۆنەم ژی کەڤرینە. ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ مرڤەکی هاتی ب واتایا (گر+ زید)، واتە گرێ زیدی.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ مەروینا.

**باشووری،** هەردو گوندێن ماڤان و سەیزاری ژووری

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خراب کۆلك.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کولێمنێ.

خەلکێ ڤی گوندی ژی ل سالا (۱۹۷٥)ێ هاتینە راگوهاستن، کو پێکدهاتن ژ عەشیرەتا کۆچەران، ژ تیرەیێن (شەرەفا و هاجا و رەشا).

## گوندێ کانی سپی:

گوندەکێ چۆلە، رووبەرێ گشتی یێ ڤی گوندی (۱۸۳۷) دۆنەمن، (۱۷۷۹) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٦۸) دۆنەم ژی کەڤرینە. ناڤێ گوندی یێ ژ (کانی+ سپی) هاتی، چونکی ئاخا وی یاگێچینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** هەردو گوندێن هژیرکێ و گەرماڤا.

**باشووری،** ناڤەندا سێمێلێ و گوندێ خراب کۆلکی

**رۆژهەلاتی،** گوندێ قەشەفرا رۆژئاڤا

**رۆژئاڤایی،** گوندێ دارێ.

خەلکێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەرێن شەرەفانە و گوند ل سالا (۱۹۸۷)ێ هاتینە راگوهاستن.

## گوندێ حەوشکێ:

ئەڤ گوندە نها سەر ب بازێرڤانییا تەناهی ڤەیە و عەردی ڤی گوندی وەکی قەرەبوو ل سەر کەسێن عەردێن وان کەتینە بەر فرۆکخانا دهۆکێ ل سەربازگەها موقبلێ هاتییە بەلاڤکرن، ناڤێ گوندی

یێ هاتی کو رووبەرێ عەردێ وی گەلەکێ تەنگە، رووبەرێ وی گشتی دبیتە (٢٢٣) دۆنەم، ١٨٠ دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٤٣) دۆنەم ژێ کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کێڤلا.

**باشووری:** گوندێ سەرتەنگێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دولبێ

**رۆژئاڤایی:** ناڤەندا سێمێلێ و گوندێ سێجێ.

خەلکێ ڤی گوندی ل سالا (١٩٧٥)ێ راگوهاستنە گوندێ سەرتەنگێ کو ئەو ژی ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتیە وێرانکرن.

ڤی گوندی گرەکێ شوینواری[١٠١] ژی لێ هەیە و نها خزمەتێن ئاڤ و کارەب و خواندگەهەکا بنەرەت لێ هەیە.

## گوندێ سەرتەنگێ (تەنجە دولب، تەنگا دولبێ):

ئەڤ گوندە ل بەرێ دکەتە (تەنگەکێ) ل باشوورێ گوندێ کەڤن (نها ل پشت کارفور و پیچەك بەرەڤ رۆژئاڤاڤە)، ناڤێ گوندی یێ ژ وێ تەنگێ هاتی و ل بەرێ کانیا سەرەکیا گوندی ل وێرێ بوو. سالا (١٩٥٣)ێ گوند جارەکادی و ب هەمان ناڤ ل وی جهی هاتە ئاڤاکرن کو نها شوینوارێن وێرانکرنا سالا (١٩٨٧)ێ لێ هەین. و رێکا ناڤدەولەتی دنیڤا گوندی را دەرباز دبیت و گوندی دکەتە دو پارچێن هندی ئێك، رووبەرێ گشتیێ گوندی ژی دبیتە (١٤٧٠) دۆنەم، (١٠٧٤) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٣٩٦) دۆنەم ژێ کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ حەوشکێ.

**باشووری:** هەردو گوندێن بازەلانێ و گرێ شکەستی کو سەر ب فەیدیێ ڤەنە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دولبێ.

**رۆژئاڤایی:** ناڤەندا سێمێلێ.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

ل بەری هەوێن راگوهاستنا سالا (١٩٨٧)ێ[١٠٢] و هەتا سالا (١٩٧٥)ێ تنێ (٣٥) مال ل ڤی گوندی هەبوون، پێکهاتا پتریا خەلکێ وی ژی ژ عەشیرەتا کۆچەران بوون، ژ تیرەیێن گەودا (مالا حەجی جانگیری) و و شەرەفانی (مالا حەجی عەبدی) و زێدکان (مالا حەجی خالدی)، لێ پشتی راگوهاستنێن سالا (١٩٧٦)ێ ئێدی گەلەك خەلکێ عەشیرەتێن دی لێ هاتنە ئاکنجیکرن، مینا بەرواری ژووریان ژ گوندێن هەلوە و هرۆر و تروانش و سلێڤانەیی ژ گوندێن گررەش و گرشین و باتێلێ، هەر وەسان دۆسکی و کۆچەر ژ تیرەیێن مەهمەدان و صەیدا و هاجا و ئەرتووشییان ژ گوندێن داریێ و هاجسنێ و گرفیل و جۆمجاهان و حەوشکێ و کێڤلان و ئاڤە تەحلێ و گەرماڤا. سەرەرای (١٥) مالان ژ عەشیرەتا مزووریان ژ گوندێ ئەترووش کو پشتی ژ ئیرانێ ڤەگەریاین بربوونە باشوورێ عیراقێ و ژ وێرێ ل سالا (١٩٧٨)ێ ل ڤی گوندی ئاکنجیکرن، ب کورتی ژمارا سەرخێزانێن ڤی گوندی ل سالا (١٩٨٧)ێ کو هاتیە وێرانکرن دگەهشتنە (١٠٠٠) سەرخێزانان[١٠٣].

پشتی راگوهاستنێ خەلکێ وی ل سەر باژێرێن سێمێل و دهۆك و کۆمەلگەها موسێریکێ بەلاڤەبوون.

ژ شوینوارێن گرنگ یێن ڤی گوندی گرێ بالیۆزە[١٠٤] کو گوندەکێ ئێزدیان لێ بوو و هەتا داویا سالێن حەفتییان ژ سەدسالیا بووری شوینوارێن خانیێن وی مابوون[١٠٥].

ژ پرۆژەیێن گرنگ کو ل ئاقارێ ڤی گوندی هەتا بەری دەهـ سالان مابوو پرۆژەیێ سەربرگەها سێمێلێ بوو، ئەڤ پرۆژە ل سالا (١٩٨١)ێ دەست ب چێکرنا وی هاتبوو کرن و ل سالا (١٩٨٤)ێ ب داوی هاتبوو و نها بوویە عومبارا هلگرتنا کەل و پەلان[١٠٦].

## گوندێ گوتبە:

ڤی گوندی نها ب تنێ ئێزدی لێ دژین، رووبەرێ

گشتیێ گوندی ژێ دبیتە (١٦٢١) دۆنەم، (١٥١٦) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (١٠٥) دۆنەم ژێ کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێ قەسر یەزدین.

**باکوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ سەیزارا ژێری.

**باشووری،** گوندێن ریێبیێ و مام شڤان.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ چالوان.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

بەری راگوهاستنا سالا (١٩٨٧)ێ خەلکێ گوندی ژ هەردو ئایینێن موسلمان و ئێزدی بوون، موسلمان ژ عەشیرەتا کۆچەران بوون ژ تیرەیا مەهمەدان و ئێزدی ژی ژ عەشیرەتا دنانی بوون کو نها هەشت خێزان ژ ڤێ عەشیرەتێ لێ دئاکنجی نە و موسلمانێن وی نها ل سێمێلێ دژین. ڤی گوندی نها ئاڤ و کارەب لێ هەنە و رێکا خانکێ دبەررا دەرباز دبیت[١٠٧].

**گوندێ سەروکانی:**

ئێك ژوان گوندانە کو کەتییە بەر هەوا تەعریبێ و کۆمەلگەها (موقبلێ) ل سەر عەردێ وی هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ وی ژی ییێ ژ سەرەکانییا ئاڤێ هاتی کو هەتا نها ژی رووبارەك لێ هەیە کو دچیت هەتا ڤەدرێژیتە سەر سکرێ مووسل. رووبەرێ گشتیێ گوندی ژێ دبیتە (٢١٣٢) دۆنەم، (١٨٨٠) دۆنەم ب کێری چاندنێ دهێن و (٢٥٢) دۆنەم ژی کەڤرینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکوور و باکوورێ رۆژئاڤایی،** گوندێ باستکێ کو سەر ب باتێلێ ڤەیە.

**باشووری،** گوندێ موقبلێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مەروینا

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گرفیلی.

گوند ل سالا (١٩٧٥)ێ مینا پتریبا گوندێن

**خواندنگەها هەوریسکێ یا کەڤن کو ل سالا ١٩٥٨ێ هاتییە ئاڤاکرن**



سلێڤانەیان هاتبوو راگوهاستن و هاتبوو تەعریبکرن[١٠٨].

## گوندی هەورێسکێ:

گوند ب دووراتیبا نێزیکێ (٩کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا باتیلێ، نها ١١٥ مال لێ ئاکنجینە، ١٠١ مال ئەرمەنی و ١٤ مال کلدان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ سەروکانی

**باشووری:** گوندێ قۆتێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مەروینێ

**رۆژئاڤای:** گوندێن بامێر و فەق سەینێ

### سیمایێ گوندی:

گوند د سالێن نوتاندا سەر ژ نوو هاتییە ئاڤاکرن، ئاقارێ وی چەند گرك و کانیك هەنە، وەکو نهالا مەزنا هەورێسکێ و (کانانج تەر) ئانکو گرێ کەسك و شکەفتۆکا بنێ گوندی ژ بەر کانیا ئاڤا دناڤ وێ شکەفتێ دا هەمی خەلکێ دەڤەرێ ب ئاڤەکا پیروز دزانن و خەلك گەلەك روو لێ دکەن ب مەرەما نەهێلانا ئێشێن پیستی و ڤەخوارنا وێ بۆ چارەکرنا ئێشێن گولچیسکا و خۆ پێ دشوون و تا رۆژا ئیرۆ ئەو کانی ب بەرەکەتە و ئاڤرێژە، سەبارەت ب ژێدەرێن ئاڤا گوندی (٦-٧) کانی و دو کارێز هەبوون و هەرمالەکێ بیرەکا ئاڤێ یا تایبەت دناڤ حەوشا خۆ دا کۆلابوو لێ نها پرانیا وان هشکن.

ل سالا ١٩٢٢ - ١٩٢٤ێ ئەرمەنێن دگەل سەرکردێ خۆ (لیڤۆن پاشای) ژ باکوورێ کوردستانێ مشەخت بووین ئەڤ گوندە ئاڤاکریە[١٠٩]، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی تنێ ٢٤٣ کەس بوون[١١٠]. گوند ل دەشتەکا بەرین و ئاخەکا ب بەرەکەت هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ گوندی بەرهەمدار و دەست زێرین بوون لەوا شیاینە وێ دەشتێ کو رووبەرێ وێ دگەهیتە نێزیکێ (٨٠٠٠) دۆنەمان ڤەژینن و بەرهەمێ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان سالانە ب دەهان تەننان بەرهەم بینن، و جۆتیاران چاندن ب ئالاڤێن کەڤن دکرن و بەرهەمێ هەری مەزن یێ وان

**کەنیسا ئەرمەنێ ل هەورێسکێ سەردەمێ حکومەتا هەرێما کوردستانێ هاتییە ئاڤاکرن.**



هنكڤین بوو چ بۆ خوارنێ و چ بۆ فرۆشتنێ بەرهەم دهینان، وەك گوندی ڤەدگێرن ل سالێن دەستپێكی هەر مالەكێ نەكێمی (٥٠) مێشێن هنكڤینی كو پتریا وان نفشێ ئەرمەنی بوون هەبوون كو دگەل خۆ ئینابوون. دیسان خودانكرنا پەز و بزنی ئێك بوو ژ رێێن گرنگێن ژیارا خەلكێ گوندی.

پشتی لیڤون پاشای ئاش دانایە ڤی گوندی، گوند پتر بۆ جهێ كوومڤەبوونا خەلكەكی، د سالێن شێستان ب ریا وی ئاشی خەلك شیان گەلەك شەڤان ئازۆقەی بۆ پێشمەرگەی بگەهیننە چیای، و ب هەبوونا چەندین جەڤسیان (جخسیان) ل گوندی مینا (ئارسێن جانیك و هاكوپ موكاسی و چووچان ئاغا مسروب و مسروب جانویان و رۆپێن وارتان) گوند هەمی دەما بوویە جهێ چاككرن و پێشخستنا چەكی، تا نها چەندین جۆرێن خەنجەران و تڤەنگێن مینا (هنری مارتن مودیلێ سالا (١٨٧٠) ێ، تڤەنگێن ئینگلیزی یێن سالێن (١٩٢٢)ێ، و رەشاش توكاریف یا سالێن شەرێ جیهانیێ دووێ) ل نك مراد مارجروس وارتانیان ل گوندی هەورێسكێ پاراستینە و مۆزەخانەكا تایبەت ب ڤان ئالاڤان ڤە دگەل چەندین ئالاڤێن دی یێن جەنگی هەیە. هەر دیسان خەلكێ گوندی شیاینە ل سالا (١٩٣٠)ێ ئێكەم كەنیسا ئەرمەنی و خواندنگەهەكا تایبەت ب زمانێ ئەرمەنی ژ ئاخ و بەران و ل سەر كیستێ خۆ چێكەن، ل دەسپێكێ هەتا سالا ١٩٣٦ێ خواندنگەهەكا ئەهلیا تایبەت بوو ب خواندنا زمانێ ئەرمەنی و ئایینێ مەسیحی، ژ سالا ١٩٣٦- ١٩٣٧ئڤە هێدی هێدی رێڤەبەریا زانیاریا (پەروەردێ) مووسلێ وەك خواندنگەهەكا نیڤرەسمی سەرەدەری دگەلدا كریە و مایێ خۆ د بەرنامە و خواندنا وێ دا كریە و خواندنا عەرەبی ل سەر سەپاندیە، هەتا ل سالا ١٩٤٦- ١٩٤٧خواندنا زمانێ ئەرمەنی نەهێلایە ل خواندنگەهێ و هەموو بەرنامێن وێ كرینە عەرەبی[111].

هەر ل سالێن سیهان ئێكەمین بنگەهێ ساخلەمیێ و ب رازیبوونا حكومەتا عیراقێ ل سەردەستێ دكتۆر داوود و برینپێچ مەتی ل گوندی هاتییەڤەكرن، سالا ١٩٥٨ێ ئێكەم ئاڤاهی بۆ خواندنگەهێ ب كونكریتی هاتییەئاڤاكرن، دگەل ئاڤاهیەكێ تایبەت بۆ مامۆستایان و ئەڤە بۆ پێنگاڤەك كو گوندێن دەوروبەر ژێ بێنە وێرێ بۆ خواندنێ.

هەورێسكێ ژ گوندێن پێشین بوو كو رژێمێ هزر د خرابكرنا وێ دا كری و ل سالا (١٩٧٤)ێ هاتە وێرانكرن، خەلكێ وی ژی دەربەدەری گوند و باژاران بوون و پتریا وان ڤەستا مووسل و بەغدا كرن[112].

ل داویێ پێدڤیە بێژین پشتی چێكرنا سكرێ مووسلێ هندەك ژ گوندێن دەڤەرێن ژێرئاڤ بووینە، ئەڤە ژی ناڤێ وان گوندانە كو كەتینە ژێر ئاڤا سكرێ مووسل:

١- گوندێ چەم پاشایی: گوندەكێ عەرەبنشین بوو ژ عەشیرەتا شەرابیان و پێكدهات ژ (٢٧) مالان.
٢- گوندێ سێ قوبا: گوندەكێ عەرەبنشین بوو پێكدهات ژ (٢٨) مالان.
٣- گوندێ رویتك: گوندەكێ عەرەبنشین بوو پێكدهات ژ (٢٥) مالان.
٤- گوندێ ئاخەبان: گوندەكێ عەرەبنشین بوو ژ عەشیرەتا شەرابیان و پێكدهات ژ (٢٥) مالان.
٥- گوندێ خەندەك: گوندەكێ كۆچەرێن هاجا بوو.
٦- گوندێ كون زی خور: گوندەكێ كۆچەرێن هاجا بوو[113].
٧- گوندێ قەپەغ:
٨- گوندێ خانكێ:
٩- گوندێ كەموونە ژێری:
١٠- گوندێ كەموونە ژووری:
١١- گوندێ خیراوە (خێراڤا):
١٢- گوندێ چەم بەرەكات:
١٣- گوندێ تربە سپی[114] :
١٤- گوندێ كێزینا:
١٥- گوندێ دێركێ:
١٦- گوندێ ئاڤە تەحل[115] :

(قەسرۆکێ) جهەکێ بەرنیاسە ل گوندی ئاسیهێ سەنتەرێ ناحیا سلێڤانەییان هەر ژ سالا (١٩٢٣ - ١٩٧٩)ێ، ئەڤ وێنە مە کرە درووشم بۆ دەڤەرێ ژ بەر کو ئەڤ جهە د کەڤندا سومبولا هەموو جەژن و بیرهاتنێن دەڤەرا سلێڤانەییان بوو، و ل بیرهاتنان ئاگر ل سەر دهاتە خۆشکرن و ل بەر رۆناهیيا وی ئاگری بەرهەڤیێن خۆ دکرن.

# ناحیا باتێلێ(سلێڤانەیی)

ئیدریس حەسەن ئاسهی



ناحیا باتێلێ یان ناحیا (**سلێڤانەیی**) یا، یان دەشتا دۆبانێ، کو ب فەرمی و ل سەر نەخشەیێن جیهانی ب دەشتا سلێڤانەییا دهێتە ناسکرن، دەڤەرەکا گرنگە دکەڤیتە سەر سنوورێن هەردو وەلاتێن سۆریا و ترکیا ل باکوورێ رۆژئاڤایێ عیراقێ، و رۆژئاڤایێ هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ب دووراتییا ٣٠کم، سەنتەرێ ناحیێ کۆمەلگەها (باتێلێ)یە،

ڕووبەرێ وێ یێ گشتێ نێزیكێ (٢٢٩٩٣٤) دۆنەمانە و (٧٢) گوندان بخۆڤە دگریت، سنوورێ وێ ژ ئالیێ ڕۆژهەلاتی قەزا سێمێلێ و باژارێ دهۆكێ یە، و ژ ئالیێ ڕۆژئاڤای ڕووبارێ دیجلە و وەلاتێ سووریێ یە، باكوورێ وێ باژێرێ زاخۆیە و ژ ئالیێ باشووری ڤە سكرێ مووسلێ و پارێزگەها نەینەوایە، دەڤەر ب شێوەیەكێ گشتێ ناڤدارە ب تۆڤ چینییا گەنم و جەهان و پاشی نیسك و نۆكان و ڤەرێژا هەری مەزن و داهاتێ سەرەكێ یێ دەڤەرێ یە، خودانكرنا تەرشی وەكو پەز و بزن یەك بوو ژ ژێدەرێن هەری گرنگێن ژیارا خەلكێ دەڤەرێ. دەشتا سلێڤانەییان دهێتە دابەشكرن سەر چەندین دەڤەرێن جودا، وەكو هشكاتی و ئاڤی و دارستان و چەروانی و چیایی و كەڤرین، وەكو ل خشتێ خوارێ دیار[1].

| ت | دەڤەر | ڕووبەر |
|---|---|---|
| ١ | ڕووبەرێ گشتێ | دۆنەم ٢٢٩٩٣٤ |
| ٢ | ڕووبەرێ ب كێر چاندنێ دهێت | ١٤٧٨٠٩ دۆنەم |
| ٣ | دەڤەرا، كەڤرین و چەروانی و دارستان | ٨٠٢٩٥ دۆنەم |
| ٤ | چاككریێن چاندنێ | ٧٦٥١٩ دۆنەم |
| ٥ | ڕووبەرێ ملكداری | ٧٢٠٢٧دۆنەم |
| ٦ | ڕووبەرێ ملكداری/ ئاڤی | ١١٠ دۆنەم |
| ٧ | ڕووبەرێ چاككریێن چاندنێ/ ئاڤی | ٢٩٠ دۆنەم |
| ٨ | ڕووبەرێ فیقێ یێ دێم (ڕەز) | ١٩٠ دۆنەم |

**ناحیا باتێلێ**



ب دەهـان جۆرێن كەسكاتی و گول و دارێ خورستی ل چیا و دەشتا ڤێ دەڤەرێ هەنە، مینا تەفسك و هەژیر و تاوك و هەلهەلۆك و دوری و كەزوان و بەنۆك و بەروی و مازی و قاچ و خولپ و كارچك و گوهیشك و سماق و باهیڤ و كاری و سێبسك و قوراد و سیرك و نەفەل وسووسن و تۆلك و ب دەهان جۆرێن گیانەوەرین كووڤی ل چیاین وێ هەبوون، مینا پەز كووڤی و گورگ و بەراز و كتكا كووڤی و قوریەشك و سڤۆرە و رووڤی و كێڤریشك و سمسیارك و قورت و ئەلهۆ و باشووك و تەشی ریسك و بوم و قر و كەڤۆك و كەو و سویسك و داركۆكە و كەڤۆشینك و بەلیكوتە و قەشقەلانك و ژیژی و سیخور و و ل دەشتا وێ ل بەرێ ئاسك لێ هەبوون لێ ئیرو ژناڤچووینە، ژبلی تڤیرك و قتك و تیتیك و سڤیانك وچەكچەكوولە و گەلەك فرندەیێن كوچبەر ل بهارێ وەكو حاجی رەشك و شەهلوول و لەگلەگە، دیسان مار و دوویشك و مشك و جورد و خەزال مشك و كولی و گاگێلە و كمكمە و پۆر و تووری و چەندین گیانەوەرێن ئاڤی ل سەر ئاڤ كانییێن دەڤەرێ دژین، مینا كێڤژالە و بەقا پنی پنی و بەقا كەسك (سەیدا) و...هتد.

## ئالیێ جڤاكی:
## پێكهاتا دەڤەرێ:

كورد و ئەرمەن و كلد و ئاشوور ل ڤێ دەڤەرێ دژین ب موسلمان و مەسیحی و ئێزدیان ڤە، عەشیرەتا (سلێڤانەیی) یاكو دكەڤندا دەشتا دۆبانێ ب ناڤێ وان دهێتەناڤكرن، پتریا جوگرافیا ناحیێ ڤەدگرت، ژ چەندین بنەمال و بابكان پێكدهێت، و هەر بابكەك ژی ل گۆر حەزا خۆ جێگیرێ جهەكی یان گوندەكی یان چەند گوندان بووینە و ب ڤێ رنگێ ل خوارێ:

دارا كەزوانێ



دار بەنۆك



**١- بنەمالا شەمدین ئاغای،**

ل زاخۆ و گوندێن کوولێ و قادیا و شکەفتێ و کێلکێ و مەزرێ و ئێمەلکێ و کەشکانێ و گروسمانێ و چەمزراڤێ دژین.

**٢- بنەمالا مەلا تەیبی،**

ل گوندێن قەسرێ و گرەش و مال هەسن و بالقۆس و چۆپانێ و بامێر و فەقسەین و باستکێ و هەردو گرئابوورا و کێزینا و تربەسپیێ و ئەرمشتێ و کواشێ دژین.

**٣- ترکژێ،**

- بنەمالا سلێمان ئاغای ل گوندێن ترکژا و هاجیا و گرشین و هەردو پێچەکا و کومبەلێ.
- مالا داود ئاغای ل ترکژا و ئافخانێ و گرشین و کولێمنێ.
- ئومەرپیرا ل گرشین و کومبەل و ترکژا.
- دێریا ل شکەفتێ و شەکراڤا و چەمزاڤ و دووبەردانێ.
- مەلەکا ل پێچەکا دژین.
- حاجو کولەك ل هەردو پێچەکا دژین.
- عەڤدو فندوا ل گرشین و هەردو پێچەکان دژین.
- مەلا رەسوول ل گرشین و گرۆسمانێ.
- مالا خزێمێ ل پێچەکێ و گرشینێ و چوپانیێ و شکراڤا.
- عەتمانێ ل ترکژا دژین.
- هوستایێ ل زاخۆ دژین.
- مالا یەحیایی ل ئافخانێ دژین.
- محەمەد خانا، ل گرشین و پێچەکا خوارێ دژین.
- مالا حەمایێ ل ترکژا دژین.
- مالا ئانوینێ ل باوەردێ و بامێرێ دژین.

**٤- کوولێ،**

- بلوێدێ ل کولیمنێ و کوولێ دژین.
- عەلا، ل چیمەنیا و کولێ دژین.
- مام ساما، ل کولێ دژین.
- برۆ حسێنا، ل کوولێ و گرۆسمانێ دژین.
- خەلەفا، ل کولێ دژین.
- ئیسف حاجیا، ل کولێ دژین.
- ئاڤدەلا، ل کوولێ دژین.
- محۆ عەلی ئاغا ل کوولێ دژین.
- شلپزێ، ل کوولێ و کانێ کەرکێ دژین.

**٥- کواشێ،**

- زهێدێ، ل کواشێ و گرەشێ دژین.
- عەلی رەشێ مەزن، ل کواشێ دژین.
- عەلێ رەشێ بچویك، ل قەسرێ و بالقۆسێ و ئەرمشتێ و سەیزاری دژین.
- حەملاوی، ل کواشێ دژین.
- صالح مێرەما، ل کواشێ دژین.
- دارزانی، ل کواشێ و شکەفتێ دژین.
- سەید ئینس، ل کواشێ و باڤیا دژین.
- کەنعانی، ل قەسرێ و کێزینا و کواشێ دژین.

**دارا قاچێ**



**٦- پساغا (بنەمالا عەتێ):**

ل گوندێن ئاسیهێ و قەرقوورێ و مووسل و وانێ و ئاكرێ (ئومەر سینا) دژین.

**٧- قەردەشا:**

ل گوندێن ئاسیهێ و باستكێ و بالقووسێ و باترشایێ و سێ قوبا لێ نها ل (قەسر سریج)ێ. دیسان ل بازارێن مووسل و زاخۆ سێمێلێ دژین.

**٨- شەمسا:**

ل گوندێن مێرگەسوورا و پەراڤێ گركەلێ و ئێمەلكێ و هەدو پێچەكا ومشارا و تووسانا و سمایل ئاڤا و پێبزنێ دژین.

**٩- بابلا:**

ل گوندێن پەراڤێ و خەریەنوور و باوەردێ و ئافخانێ دژین.

**١٠- مەرعانی:**

ل باتێل و ئاسیهێ و بالقۆسێ دژین.

**١١- مەندا:**

ل گرەشێ و كواشێ دژین.

**١٢- مەندادی:**

ل گرۆسمانێ و كێزینا و صۆریا دژین.

**١٣- زهێدی:**

ل چەمزراڤێ و موقبلێ و گرۆسمانێ دژین.

بەلێ ب رێكا كۆچ و كۆچبەریێ و دەربەدەریێ و خزمایەتیێ چەندین بابكێن كۆچەران ژی وەكی گەودا و سێڤا و ئالا و بووبا، و هۆزێن بەرواری و دۆسكی و نێروەیی و سندییان ژی لێ ئاكنجیبوون، ژبلی ب دەهان مالێن عەرەبان ژی ڤەحەویاێن دەڤەرێ نە.

## دینداری:

ئایینێ ئیسلامێ پتریا خەلكێ دەڤەرا سلێڤانەییان بخۆڤە دگریت و ئایینێن مەسیحی و ئێزدیاتی ژی بەهرا خۆ ل دەڤەرێ هەنە، و هەر ئایینەك رێ و رەسمێن تایبەتێن بیرهاتنێن خۆ ئازادانە دگێرن.

## ئالیێ سیاسی:

دەڤەرا دەشتا سلێڤانەیا چەندین جاران هاتییە سۆتن و خرابكرن و پاشی (تەعریبكرن)ێ نێزیكی (٢٢٧٦) خێزانێن دەڤەرێ هاتنە دەربەدەركرن و چەندین كۆمەلگەهـ بۆ ب عەرەبكرنێ ل نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتیان ژ سەدسالیا چوویی هاتنە دروستكرن و ناڤێن عەرەبی بۆ هاتنە دانان و ئەڤ هوزێن عەرەبان لێ ئاكنجیكرن:

١- الجبور
٢- الطائی
٣- العبیدی
٤- السنامی
٥- العرعوری
٦- الناصری
٧- الراشدی
٨- اللویزی
٩- الامارة
١٠- الشیبانی
١١- الصامن
١٢- الاحمد
١٣- العجاج
١٤- الحدیدی
١٥- الزركانی
١٦- الصایح
١٧- الراجی
١٨- الغریباوی
١٩- الشویلات
٢٠- الشهوانی
٢١- المصاوص
٢٢- المعرجی
٢٣- المعماری
٢٤- الشرابی
٢٥- الجحیشی

هەتا سالا ١٩٩١ێ نەدبوو مرۆڤێ كورد ل ڤێ دەڤەرێ كارەكی بكەت، پشتی سەرهلدانێ ب دەمەكێ كورت خەلكێ دەڤەرێ زڤرینەڤە، و عەشیرەتێن وەكی نێروەیی و بەرواری و دۆسكی ل كەمپا (سەربازگەها موقبلی) و (كەمپا بالقۆسێ) و گەلەك كۆمەلگەهان ئاكنجیبوون، و خودان كار و بەرهەمدار و پێشمەرگەنە، بەلێ پشتی پێكئینانا

و ل سەر گوندێن دەڤەرێ ل دووف ڤێ خشتەی هاتنە بەلاڤكرن[٢]،

| ز | ناڤێ گوندی ( كۆمەلگەهێ ) | ناڤێ نوو پشتێ (تەعریب)ێ | ناڤێن عەشیرەتێن عەرەب یێن ئاكنجی بووین ل گوندی |
|---|---|---|---|
| ١ | سەرشوور | الجبور | عەشیرەتا جبور |
| ٢ | موقبلێ | المنصور | عەشیرەتێن شەرابی و حەدیدی |
| ٣ | باستكێ | الصدیق | عەشیرەتێن سنانی و گائی و العبیدی |
| ٤ | باتێل | الطائی | عەشیرەتێن الطائی و سنانی و الصامن و الشرابی |
| ٥ | سمایل ئاڤا | الربیع | عەشیرەتێن الشهوانی و اللویزی و العجاج و الشرابی |
| ٦ | خراب دێم | دجلە | عەشیرەتێن الشرابی و المعماری و العویص |
| ٧ | باوەردێ | الفاو | عەشیرەتێن السنانی و العرعوری و الجبوری |
| ٨ | گرشین | الفارس | عەشیرەتێن الجبور و العبیدی و الحدیدی |
| ٩ | كێلك | الفاروق | عەشیرەتێن الجحیشی و الدراجی |
| ١٠ | باجد كندال | الوسگی | عەشیرەتێن الشیبانی و العجاج |
| ١١ | دێرەبوون | دیربون | عەشیرەتێن الراشدی و اللویزی و الشیبانی و الناصری |
| ١٢ | پێشخابوور | فیشخابور | عەشیرەتێن الراشدی و المعرجی و الاماره و الاحمد و الزركانی و الغیباوی |
| ١٣ | قەرەولا | قرولا | كەلایەكا لەشكەری بوو |

یەكەمین كابینەیا حكومەتا هەرێما كوردستانێ ل سالا ١٩٩٢، هەرێم كەتە ژێر دو گڤاشتن و دووڕێچكرنێن ئابووری یەك، یا نێڤدەولەتی ل سەر عیراقی و دو یا حكومەتا بەعس ل سەر هەرێما كوردستانێ. لەوما دیسان دەڤەرا سلێڤانەییا بۆ جهێ ڤەڕێژا ئابووری و دان و دكاكێ و تێركرنا زكێن هەر برسییەكێ وپڕكرنا تووركێ هەر پێدڤییەكی.

ڤێ دەشتێ نها گەلەك پرۆژەیێن مەزن لێ هەنە و لێ دهێنە چێكرن. وەكی فرۆكخانەیا دهۆكێ یا نێڤدەولەتی ل موقبلێ و دەڤەرا پیشەسازی ل ئاقارێ گوندی كواشێ و راكێشانا جاددا هەشت ساید بەر ب زاخۆ و دروستكرنا تونێلا گەلیێ زاخۆ و ڕاكێشانا هێلا گازا هەرێمێ بەر ب وەلاتێ تركیا لەوا وەسا دهێت نیشان دان كو ئەڤ وارە جهەكێ ستراتیژیە و تایبەتە بۆ هەرێما كوردستانێ. نها ب دەهان خێزانێن رۆژئاڤای كوردستانێ وەكی ئاوارە ل كەمپا موقبلێ دئاكنجینە، ژبلی ب هزاران ئەو خەلكێ ژبەر (داعش) ل پارێزگەها مووسل رەڤین و ئەڤرۆ ل ڤێ دەڤەرێ ل كەمپێن باجدا كەندال و گوندی قادیا دئاكنجینە.

## ئالیێ دیرۆكی:

ناڤێ (سلێڤانێ) وەكو ئەنوەرێ مائێ دپەرتووكا خوەدا دبێژت ئەڤ ناڤە سالا (٩٦٠پ.ز)ێ، د پەرتووكا (داسنائی) دا یا خودانێ وێ یوخەننا دا هاتییە، دیسان د. جمال رشید احمد دپەرتووكا خۆدا (دراسات كردیە فی بلاد سوپارتو) دبێژت پەیڤا (سلێڤانی) پەیڤەكا هندو ئەوروپیە و دزڤریتە سەدساڵیا (٣٠٠٠ پ.ز)، و زانایێن دیرۆكناس ڤەدگێرن كو سەركردێ یونانی یان ئەغریقی یێ كەڤن (زەینەفون)، چیایێ سپی بڕییە و ل سالا (٤٠١ پ. ز) پشتی شكەستنا لەشكەرێ وی ل شەرێ (كوناكسا) نێزیكی باژێرێ بابل ب لەشكەرێ خوڤە د ڤێ دەشتێ را دەرباز بوویە، د بیرهاتنێن خۆدا كورد یان (كوردوخوێ) ب شەركەر

و گەرناس دانەناسکرن و نیشادایە کو چ جاران و بۆ چ هێزێن لەشکەرێ دەست نەداهێلاینە. دەڤەر ب کەلایێن خۆڤە مینا (کەلا ئەرمشتێ و کواشێ) و باژێرکێ (زافەرانێ) [٣] یێن کو تارۆژا ئیرو شوینوارێن وان ب شێوەیەك باش دیارن، ل سەر دەمێ عومەرێ کورێ خەتتابێ هاتینەداگیرکرن و خەلکێ دەڤەرێ موسلمان بوویە، ب درێژیا سەردەمێ دەولەتێن ئیسلامی ئەڤ دەڤەرە ب کەلایێن خۆڤە جهێن گرنگ و جهێ پیتەپێدانا دەولەتێن حوکمداربوویە ل دەڤەرێ[٤].

بەرمایکێن کەلا ئەرمشتێ



## ئالیێ روشەنبیرێ

دەڤەرێ تایبەتمەندیێن خۆ ژ ئالیێ رەوشەنبیری ڤە هەنە، ب دەهان نڤیسەر و هونەرمەند و چیرۆکنڤیس و چیرۆك ڤەگێر و رومانڤیس و هەلبەستڤان و سترانبێژ و موزیکژەن هەنە.

## تیتالێن دەڤەرێ:

ئارمانجانێ و بەریکانا سوواریێ و سووار باشی و راڤ و نێچیر یەك بوو ژ یاری و ئارەزوو و تیتالێن گرنگێن دەڤەرێ، ب تایبەت ل ڤەگوهاستنا بووکان و سەرشووشتنا زاڤایان. سلێڤانەییان راپێچەکا تایبەت هەیە وەکو شەل و شەپك و شال و لەوندی و گەلەك بایەخێ ب پاقژیا خۆ و بەژنا خۆ ددەن، و

دەشتا سلێڤانەیا خودان داوەتێن تایبەتە مینا داوەتا دەستەشیر و تووریانێ و چاچانێ وسێ گاڤی و دو گاڤی و میرانی و تالان و شەرێ قولنگا و چەندێن دی و داوەتا کوولیانێ یەکە ژ داوەتێن هەری ب رەوش کو ب ناڤێ گوندی (کوولێ) هاتییە ناڤکرن و هەموو کەس نوزانن ڤێ داوەتێ بکەن ژ بەر کو چەندین لڤینێن تایبەت تێدا هەنە و دبێژن دەمێ ل کوولێ دبوو داوەت پتریا گوندییان کەرێن خۆ دفرۆتن و شەل و شەپك و شال پێ دکرین و تاکو دیلان ب داوی دهات د فرۆتنەڤە و کەرێن خۆ دکرینە ڤە.

## گرێدانا جڤاکی و هاریکاری:

دەڤەرا سلێڤانەییان خزم و خوینی ب کارەکێ پیرۆز دزانن، خزماتی دناڤ هەموو بابکێن سلێڤانەییاندا هەنە لەوا دکەڤندا گرێدانەکا موکوم دناڤ هەموو عەشیرەتێدا هەیە، دیسان خەلکێ دەڤەرێ هاریکاریا هەموو گوندییان بۆ گەلەك کارێن رۆژانە ل بەرچاڤ بوو، مینا رەز کۆلانێ و کێشانا دارا ژ چیای و ئاخ بانێ و هونوینا دیواران و چنینا بەرهەمی و دورینا دەخل و دانی و شخرەکێشان و جەنجەرا و دستارهێرك، کو کچ و خورتان دکرن و ل دەمێ وەستیانێ ژی خودانێ

مالێ مێویژ و کتك و هنار ل سەر وان گەنجان بەلاڤدکرن، دیسان هاریکاری دناڤ شین و شادیاندا، و ل دیلانان هەمبوو گوندییان کارێن خۆ دکرن و مالێن خۆ پاقژ دکرن و بالاڤێن خۆ دکرن و هەر مالەکێ بەهرا خۆ ژ مێهڤانان هەبوو و هەر سێ دانا ئەو مێڤان بوون ل وێ مالێ و سەرسوبەهیکێ هەموو گوند ل مالا زاڤای دبوونە مێڤان و فراڤین ل مالا وی دخوارن و هەریەکی ب دیاریا خۆ مالا نوو ئاڤا دکر. ل شینێ ژی هەمی پشکدار دبوون و ل وان چەند رۆژان کەسەکێ سەرو ریهێن خۆ نە دتراشین و بالاڤا خۆ نە دکرن.

## ئالیێ ئابووری:

وەسا دیارە ئەڤ دەشتە ب ڤەرێژەکا مەزنا دەخل و دانی هاتییە ناسکرن، و تۆڤچینی پێشیا ئابووری دەڤەرێ بوو، ل بەرێ و هەتا سالێن چلان ژ سەدسالیا بووری ب کەر و گا یان هێسترا دهاتە کرن، و یێن کو ب جۆتەکێ هێسترا کارێ خۆ دکرن دگۆتنێ (باش جۆتیار)، ئانکو دشیا گەلەك دەشتێ ڤەژینت و ب ئامیرێن خۆ یێن دەسپێکێ مینا شالۆك و قەیناغ و هەڤجار و شخرە و وەریس و نیرك و بارسوولە و مساسك و جەنجەران و د بەرێ دا کارێ چاندنێ گەلەکێ ب زەحمەت بوو ژبەر گیا کرنەی[٥].

د چاندنا دێمی دا ل دەڤەرێ ئەو وارێ ب کێری چاندنێ دهات نیڤەك دبوو تۆڤ و نیڤادی دما شووف، و ئەگەر دەخل و دان بەری بارانان هاتبا چاندن دگۆتنێ غوباری، و ئەگەر دگەل بارانان هاتبا چاندن دگۆتنێ سەریەلایی و قەرە دماوێ چاردە رۆژێن پشتی چللێ زڤستانێ تۆڤ لێ دهێتە چاندن، ئانکو ل سەرێ زیپا، لێ پشتی هازم بەگێ[٦]. ل سالێن چلاندا ئامیرێن چاندنێ ژ تەراکتوور و دەرِاسا گەهاندینە

شوورهێن باژارێ زافەرانێ، (وەسا دیارە شوورهە ب سەر چیای دکەڤیتە)



دەڤەرێ ئێدی سال ب سال بەرهەم بەر ب زێدەبوون چوون و بۆ جارا ئێکێ ل دەشتێن سلێڤانەیی و سندییان ژی پرۆژەیێن چاندنێ خستنە کاری، و رابوویە ب دامەزراندنا ئێکەمین پرۆژەیێ بەرهەمئینانا چووچەلووکان، و ئینانا جۆرەکێ چێلێن بیانی کو ل زاخۆ ب چێلێن خابووری دهێنە نیاسین و تا ئیرۆ ئەو جۆرە مانیە، دیسان دانانا پرۆژەیێ خودانکرنا پەزی و نێزیکی (٢٠٠٠) سەر ب یەك جاری خودانکرینە، و دابینکرنا تۆڤێ بیانی بۆ بەرهەم ئینانا جۆرێن باش ژ گەنمی، و بۆ ئێکەمین جار پرۆژەیێ چاندنا پەمبوی ئێخستە کاری و پتر خویندکار ب چنینا پەمبوی وەکی داهاتەك بۆ وان رادبوون[٧]. سیستەمێ چاندنێ و تۆڤچینییا گەنم و جەهان ل دەشتا سلێڤانەییان ل دەست پێکێ ئەڤ دەشتە هاتییە ملککرن ژ بال چەند بنەمالەکانڤە و خەلکەکی ب کرمانجی، ئانکو رێنجبەری دشیان ب پەیوەندیێ دگەل مەللاکی بکەن و پارچە زەڤیەکێ ل گۆر شیانێن خۆ وەرگرن و هەر دەمێ مەللاکی حەزکربا ب بریارەکا خۆ دا جۆتیاری بێ بەهر کەت و ئەڤ سیستەمە ما تاکو سالا (١٩٧٥)ێ و بریارا راستڤەکرنا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) ژ بال حکومەتا عیراقێ و د ڤێ بریارێ داماف دا مەللاکی بۆ خۆ تەنێ (٣٠٠دۆنەمان) ژ ئەردێ خۆ هەلبژێرت و هەموو وارێ مایی ل سەر وان جۆتیارێن چەندین سالان ل سەر کاردکرن هاتە پارڤەکرن، لێ هەتا نها گەلەك گوند مانیە و تابۆیێ ددەنە مەللاکی. تۆڤچینی ل ڤێ دەشتێ و ژبەر نەبوونا کەرەستێ کیمیایی و فرکەرێن مێش و مۆران هەر سال دیسان نیڤەك دهێتە چاندن و نیڤادی شووف دمینت.

**چەند ماکینەیێن چاندنێ یێن حازم شەمدین ئاغای دسالێن چلاندا ئینانینە زاخۆ**



# کۆمەلگەها باتێلێ (سەنتەرێ ناحیێ):

| ز | ئاڤا | خرابە |
|---|---|---|
| ١ | کۆمەلگەها باتێلێ | |
| ٢ | کۆمەلگەها باستکێ | |
| ٣ | کۆمەلگەها سمایل ئاڤا | |
| ٤ | کۆمەلگەها خراب دێم | |
| ٥ | کۆمەلگەها گرشین | |
| ٦ | کۆمەلگەها کێلکێ | |
| ٧ | کۆمەلگەها باجد کەندال | |
| ٨ | کۆمەلگەها باوەردێ | |
| ٩ | کۆمەلگەها موقبلێ | |
| ١٠ | گوندی بالقوسا ژووری | |
| ١١ | بالقوسا ژێری | |
| ١٢ | قەرقوور | |
| ١٣ | هاجیا | |
| ١٤ | کوولێ | |
| ١٥ | قادیا | |
| ١٦ | ئاڤزریک شنو | |
| ١٧ | ئاڤزریک میری | |
| ١٨ | گروسمان | |
| ١٩ | بەغلووجێ | |
| ٢٠ | صۆریا | |
| ٢١ | پێ بزنێ | |
| ٢٢ | کانێ عەرەب | |
| ٢٣ | باجد بەراڤ | |
| ٢٤ | باجد میرێ | |
| ٢٥ | قەرووده | |
| ٢٦ | شکەڤدەل | |
| ٢٧ | گرەش | |
| ٢٨ | خانتەوەر | |
| ٢٩ | ئاسیهێ | |
| ٣٠ | کێلا سپێ | |
| ٣١ | باستکا ژووری | |
| ٣٢ | خووکێ | |
| ٣٣ | کواشێ | |
| ٣٤ | هەورێسکێ | |
| ٣٥ | | باڤیا |
| ٣٦ | | مێرگەسوور |
| ٣٧ | | قەسرا مەلە تەیب |
| ٣٨ | | ئێمەلکێ |
| ٣٩ | | ترکژا |
| ٤٠ | | شکەفتێ |
| ٤١ | | ئافخان |
| ٤٢ | | چەمزراڤ |
| ٤٣ | | کانێ کەرکێ |
| ٤٤ | | تووسانا |
| ٤٥ | | مشارا |
| ٤٦ | | پێچەك ژووری |
| ٤٧ | | پیچەك ژێری |
| ٤٨ | | پەراڤ |
| ٤٩ | | پەراڤوك |
| ٥٠ | | خەربەنووری |
| ٥١ | | بامێرێ |
| ٥٢ | | باستکا ژێری |
| ٥٣ | | شکراڤا |
| ٥٤ | | چیمەنیا |
| ٥٥ | | کومبەل |

| ٥٦ | | هەفشێ رەش |
|---|---|---|
| ٥٧ | | هەزازا |
| ٥٨ | | چوپانیا |
| ٥٩ | | سێڤدین جن |
| ٦٠ | | تربەسپی |
| ٦١ | | ئاڤتەحلێ |
| ٦٢ | | کەشکانێ |
| ٦٣ | | کاڤل درێژ |
| ٦٤ | | فەق سەینێ |
| ٦٥ | | گرابوور ژوری/ و ژێری |
| ٦٦ | | مالهەسن |
| ٦٧ | | خرابمالك |
| ٦٨ | | سوولاف |
| ٦٩ | | کێزنا |
| ٧٠ | | ئینجکەصو |
| ٧١ | | گرکەلێ |
| ٧٢ | | کێلکێ |
| ٧٣ | | مەزرێ |
| ٧٤ | | کولێمنێ |
| ٧٥ | | باتێلێ |
| ٧٦ | | موقبلێ |
| ٧٧ | | سمایل ئاڤا |
| ٧٨ | | خراب دێم |
| ٧٩ | | باوەردێ |
| ٨٠ | | گرشینی |
| ٨١ | | باجد کندال |
| ٨٢ | | کەروێنیێ |
| ٨٣ | | باترشایێ |
| ٨٤ | | سەرەکانی |
| ٨٥ | | قوتێ |
| ٨٦ | | قەلەما |

باتێل سەنتەرێ دەشتا سلێڤانەییانە دکەڤیتە سەر جادا سەرەکییا نێڤدەولەتی د ناڤبەرا دهۆك و زاخۆ ب دووراتییا نێزیکێ (٣٠کم) رۆژئاڤایێ بازارێ دهۆکێ و نیف کیلومەترێ ل باشوورێ گوندی باتێلا کەڤن، د سالێن حەفتییاندا سەردەمێ تەعریبێ ب ناڤێ (مجمع الطائی) هاتییە ئاڤاکرن و عەشیرەتێن (الگائی و السنانی و الصامن و الشرابی) لێ هاتینە ئاکنجیکرن و بوویە عەرەبنشین، دناڤبەرا سالا ١٩٨٠و ١٩٨١ێ سەنتەرێ ناحیێ ژ ئاسیهێ هاتە ڤەگوهاستن بۆ باتێلێ، و پشتی سەرهلدانا (١٩٩٢)ێ و زڤرینا خەلکێ بۆ سەر وارێن بابکالان، باتێل ژی وەکی سەنتەرێ ناحیێ کەتە کاری، نها پتریا کۆمەلگەهێ ژ عەشیرەتا (سلێڤانەیی) بابکێ (مەرعانی)یە، پاشی و ژبەر کاودانێن کوردستانێ و هەوێن تەعریبێ گەلەك مالێن (ئاسیهێ/ سلێڤانەێ) و خەلکێ (سوولاف)ێ کو یەکە ژ گوندێن نەهاتییە ئاڤاکرن و ژ کۆچەرێن (سێفا)نن، نها ئاکنجیێن کۆمەلگەهێ نە، هەروەسا چەند مالێن (بەرواری و دۆسکی و میران) ژی لێ ئاکنجینە و نها هژمارا خێزانێن کۆمەلگەهێ نێزیکێ (٢٦٢) خێزانانە کو دبنە نێزیکی (١٥٢٤) کەس، کارێ چاندنێ مشە لێ دهێتە کرن، رووبەرێ ئاخا ب کێر چاندنێ دهێت نێزیکێ (٢٦٣٨)دۆنەمانە، سەبارەت ئاڤا ڤەخوارنێ ژی ل سەر سێ ماتۆرێن ئاڤا ژێر ئەردە کو ئاڤێ ب رێکا بۆریان بۆ هەمی مالان دابین دکەت. ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن رێڤەبەرییا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ سەرجەمێ هژمارا خەلکێ ناحیا باتێلێ ٢٣٨٥٣ کەسن، ژ وانا ٢٢٤٣ کەس بازێری و ٢١٦١٠ کەس گوندنشینن[٨]

**فەرمانگەهێن میرێ ل ناحیا باتێلێ:**

١- رێڤەبەریا ناحیێ.

٢- بنگەهێ ساخلەمیێ باتێلێ.

٣- تایێ چاندنێ ل باتێلێ.

٤- باژێرڤانییا باتێلێ.

٥- ئاسایشا باتێلێ.

٦- تایێ ئاگر ڤەمراندنا باتێلێ.

٧- پولیسێن باتێلێ.

٨- ناسناما باتێلێ.

٩- بكۆرا باتێلێ.

١٠- تایێ ڤیتەرنەریا باتێلێ.

١١- نڤیسینگەها پێنووسێ داد ل باتێلێ.

١٢- تایێ كەهرەبا باتێلێ.

١٣- چاڤدێریا سەقای ل باتێلێ.

١٤- خواندنگەها بنەڕەتا باتێلێ.

١٥- ئامادەیا باتێلێ.

١٦- دەزگەهێ كونترۆلا كەهرەبێ ل باتێلێ.

١٧- تەرازیا باتێلێ/ بۆ چاڤدێرییا سەنگێ ترومبێلێن بار هەلگر.

**رێكخراوێن جڤاكێ سڤیل ل باتێلێ**

١- ناڤەندا لاوێن باتێلێ (پاریگەها شەش پاریزان) سەر ب ناڤەندێ ڤەیە.

٢- ئێكەتیا ژنێن كوردستانێ ل باتێلێ.

## گوندێن ناحیا باتێلێ:

### گوندی باترشایێ:

ناڤێ گوندی هندایە و چو بوچوونێن رەسەن بۆ ناڤێ وی نەهاتنە دیتن تەنێ پیتا (با) نوزانم ب چ زمانە یان دەڤۆك یان ل كیژ سەردەمی هاتییە ب كار ئینان ژبەر كۆ چەندین گوندێن دەڤەرا سلێڤانەیا هەنە كۆ پیتا (با) پێشناڤە وەكۆ (باتێلێ و باڤیا و باترشایێ و باجدێ و بالقۆسێ و باستكێ و باوەردێ و بامێرێ) و بەلكی ل چەندین دەڤەرێن دیژی ئەڤ پیتە پێشناڤە، وەكی (باعەدرێ و باقەسرێ و باجلێ و باخورنیفێ و باگولاتكێ.....) و چەندێن دیژی

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ كواشێ

**باشووری،** گوندێ مەروینێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سەرشووری

**رۆژئاڤای،** گرەشێ و سەروكانی

**باتێلێ**



**پێكهاتا خەلكێ گوندی:**
ئەڤ گوندە ژی ل سالا ١٩٧٥ێ كەتییە بەر هەوا ب عەربكرنێ و خرابكرن و ڤالا كرنا گوندان، بەری بەری ڤێ نێزیكی (١٠) مالان ژ سلیڤانەییان بابكێ قەردەشا و كۆچەرێن هاجا بوون.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**
ژیارا وان ب شێوەیەكێ سەرەكی ل سەر تۆڤچینییا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆكان و پاشی خودانكرنا تەرشی بوو ژ پەز و بزن و چێلان. ژێدەرێ ئاڤا سەرەكییا گوندی بیرا چەمێ گوندی بوو، دبێژن گەلەك جاران ئەو بیر هشك دبوو و ئاڤ ژ گوندێن مەرین و سەرشوورێ دئینان، پشتی سالا ١٩٧١ێ، چەند بیرەك ل نهالا گوندی بۆ هەمی كاران هاتنە كۆلان و كارێن چاندنێ ژی ل بەر دكرن، ب تایبەت شینكاتییێن هاڤینی. ل بهارانژی گەلەك گیاییێن خورستی وەكی تۆلك و گەرەنگ و كاری قوراد و حاجیلوك و گویرسك لێ شین دبوون و ب وان جۆرە گیایان یا دەولەمەند بوو.
باترشایێ دەشتا سلێڤانەیا دگەل سێمێلێ ڤەدبرت ب نهالا (بویكا)و پاشان نهالا (ساوا) ب درێژاهییا خۆ هەر ژ بنارێ چیایێ گوندی كواشێ دەسپێدكەت و تاكو بەراڤێ و نهالا (حەمموش)ێ، نهالەكە و تا نها چەندین بنستر لێ دەركەتینە، وەسان دیارە جهێ ژیارا خەلكەكێ بوویە، و ئەو رێكا سەرەكییا بەر ب كواشێ ڤەدچوو و دەشت و چیا پێكڤە گرێددان هەر دناڤ ئاقارێ گوندی باترشایێ را دەرباز دبوو، و رێ یا دی هەر ژ گرفیلی ئانكو ژ رۆژهەلاتی دهات و تاكو نهالا حوممووشی، هەر دناڤ ئاقارێ گوندی را دەرباز دبوو، دیسان وەكو سیمایێ گوندی باترشایێ نها ئاقارێ وی دكەڤیتە سەر رێكا سەرەكی دناڤبەرا زاخۆ و دهۆكێ دا، ب تەنێ (زیارەتێن غەریبا) وەكو شوینوار ل گوندی هەنە و دكەڤنە دناڤبەرا گوندی كواشێ و باترشایێ و پێكهاتییە ژ نێزیكێ چوار زیارەتان و وەك یێن موسلمانانان بەر ب قیبلەنە، و دانعەمر گەلەك چیڤانوكان ل دور وان زیارەتان ڤەدگێرن. ژبەر نەسەقامكیرییا دەڤەرێ ژ ئالیێ سیاسی ڤە گوند چەند جاران هاتییە سۆتن، ل سالا ١٩٧٥ێ وەك هەمی گوندێن دەڤەرێ كەتە بەر هەوا خرابكرن و ڤەگوهاستنا خەلكێ گوندی، نها گوند خرابەیە لێ هەر سال دهێتە شینكرن[٩].

## گوندێ سەرەكەهنییێ

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (١٥كم) رۆژهەلاتێ سەنتەرێ باتێلێ ناڤێ گوندی ژ كانییا وی هاتییە كو دكەڤیتە دبن گوندی دا لەوا دبێژنێ (سەرەكانی)، و دیرۆكا گوندی دیار نینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ گرەشی
**باشووری،** موقبلێ
**رۆژهەلاتی،** گوندێ باترشایێ
**رۆژئاڤای،** گوندێن هەوریسكێ و باستكا ژێری

**پێكهاتا خەلكێ گوندی:**
تەنێ سلێڤانەیی بوون، وەك ملك یێ بابكێ مەلا تەیبی یە، بەری وێرانكرنا گوندی ل سالا ١٩٧٥ێ پێكدهات ژ نێزیكێ (٢٠) مالان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**
ژیارا خەلكی وی ل سەر چاندنێ بوو و ئاقارێ گوندی هەمی ب جۆتێن هێستران دهاتە راكرن، هندەك دفرۆتن و هندەك عومباردكرن و دكرنە ئار و سافار و دانهێرك و دانقوت و دانێ كوتلكا و بەرهەڤییا زڤستانێ دكرن، ل سالا ١٩٥٤ێ گوندی شیان (٤) تراكتووران بكڕن، سالا ١٩٥٥ێ حەجی عەمەر شیا دەراسەكێ بكڕت.
سەبارەت ب تێكهەلی و پێكڤە ژیانێ هەردەم گوند یێ ڤەكری بوو، بۆ ڤەحەویانا فەقیێن ئایینێ ئیسلامێ كو هندەك خەلكێ دەڤەرێ بوون و هندەك ژ باكوورێ كوردستانێ دهاتن، سالا (١٩٥٣)ێ خواندنگەهە ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

**سیمایێ گوندی:**

سەرەكەهنیێ دو كانی ب ناڤێن (كانییا عەرەبا و كانییا شوێش) لێ هەبوون كو ژێدەرێن ئاڤا گوندی بوون، دیسان دو گر ب ناڤێن گر گۆزەل و گر كاڤر یێن هەین و نهالا گرەشی دبەر گوندی را دەرباز دبیت، گوند نها خرابەیە و تەنێ وەكی شوینوار مایە و ژمارا خەلكێ گوندی دگەهیتە (٢٠٠) سەرۆك خێزانانە و تانها ئاخا گوندی هەر سال شیندكەن[١٠].

## گوندی موقبلێ:

دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (٨كم) رۆژهەلاتی سەنتەرێ ناحیا باتێلێ، ڕامانا ناڤێ وی وەكو گوندی دبێژن ئانكو (بەر قیبلە)یە، پێكهاتا وی هەر دكەڤندا ژ عەشیرەتا سلیڤانەییانن و دیرۆكا گوندی یا دیار نینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ سەرۆكەهنیێ

**باشووری:** گوندی هەوریسكێ

**رۆژهەلاتی:** سەنتەرێ ناحیا باتێلێ

**رۆژئاڤای:** باستكێ

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ وی ل سەر جۆتیاریێ یە و هەموو ئاخا گوندی ب دەستێن (١٤) جۆتیاران ب ئالاڤێن كەڤن دهاتەڕاكرن و دانان، و جەهـ و گەنم و نیسك و نۆك دچاندن، دیسان پەز و بزن و چێل و گۆلك و مێشێن هنگڤینی ژی خوداندكرن، پشتی بۆ جارا ئێكێ ماكینێن دورینا دەخلی ئەوێن ب دووڤ دەوارانڤە دهاتنە بەستن و تەراكتوور گەهشتینە گوندی چاندن ب ساناهیتر لێ هات و كەڤنێن گوندی دبێژن ل دەستپێكا سالێن شێستان حەجی سلێمان یەكەم تەراكتوور ئینا و بهایێ وێ (٤٠) دینار بوون، و ژلی مفایێن چاندنێ دبێژن جارنا بووك ژی پێ دهاتنە ڤەگوهاستن، دیسان ئاڤەكا بۆش د نهالا گوندی دا هەبوو و ئەوژی هاریكارییەك بوو بۆ كەسكاتیێن هاڤینی وبرنج و جنیكێن فێقی و سپیندار ل بەر بهێنە چاندن و ل زڤستانان گەلەك جاران لەهی ل ڤێ نهال ب دژواری ڕادبوو و كەس نەدشیا ب بەزینت.

**سیمایێ موقبلێ:**

ڤی گوندی چەند كانی هەنە، مینا: كانییا شێخا یاكو تا نها ئاڤرێژە، كانییا زەلاما، كانییا مەلای كو هەردو تا نها ئاڤرێژن دگەل ڤەرێژا نهالا گوندی، و ل ئاقارێ گوندی چەند نهال و گرك و زەڤی هەنە مینا گر گۆزەل یێ كو هەموو ئێڤاریان جهێ كومڤەبوونا زەلامێن گوندی بوو، گرێ حەجی نحوی، و زەڤیێن ب ناڤ مینا زەڤیا شیڤ سۆرێ و زەڤیا نهالا ساوا و گوڕا كەڕی و كەندال سۆرك و دیسان چەندین نهال مینا نهالا شێخا و نهالا تەحتووكا و گەڕا گولێ یاكو دكەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی سەرەكانیێ.

ژ تیتالێن گوندی موقبلێ چیرۆك و چیرۆكبێژێن خۆ هەبوون و جڤات و ستران و نێچیر و نێچیرڤانێن خۆ هەبوون و دبێژن دەمێ دیلانەك ل گوندی هاتبا ل دارخستن سێ شەڤ و سێ رۆژان شاهی ل هەموو مالێن گوندی دهاتە گێڕان و پێشوازییا مێهڤانان ئەركەك بوو ل سەر هەموو گوندییان و بۆ دەمێ سێ رۆژان، و ل رۆژێن ئاسایی پترییا خەلكێ گوندی ل سەرێ گرێ گوندی كۆم دبوون و سوحبەت و یاری دهاتنە گێڕان. دیسان دبێژن ل دەمێ بەفر دباری دچوونە نێچیرا پۆڕان كو نەدشیان بفڕن و ب دەست دهاتنەگرتن، چەندین گیانەوەرێن كووڤی وەكو گورگ و حەفتیار و رووڤی و كێڤریشك و ئاسك و... ژبەر هەبوونا ئاڤێ دهاتنە دیتن.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢١ كەس بوو[١١]، د دەسپێكا سالێن حەفتیاندا ژمارا مالێن گوندی دگەهشتنە نێزیكێ ٥٠ مالان و پشتی تەعریبا سالا ١٩٧٥ێ گوند هاتە وێرانكرن و خەلكێ وی دەربەدەری باژێرێن سێمێلێ و دهۆك و زاخۆ بوون، تا سالا ١٩٩١ێ دیسان خودانێن وی لێ زڤڕین، نها خێزانێن وان دگەهنە نێزیكێ (٢٥٠) سەرۆك خێزانان[١٢].

## کۆمەلگەها موتبلێ:

ب مەرەما ب عەرەبکرنا دەڤـەرێ پشتی سالا ١٩٧٥ێ ب ناڤێ (المنصور) هاتبوو ئاڤاکرن عەرەبێن شەرابی و حەدیدی لێ هاتبوونە ئاکنجیکرن، دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (٨کم) رۆژهەلاتێ باتیلێ سەر جاددا سەرەکییا دناڤبەرا دهۆك و زاخۆ دا. پشتی سەرهلدانێ کۆمەلگەهـ بوویە کوردنشین و ژ پتری (١٥٠) ئاڤاهی و (١٨٠) سەرۆك خێزانان پێکدهێت، پتریا ئاکنجیێن وێ سلێڤانەیی نە ژبلی چەند مالێن مزووری و کۆچەر و چەند مالەکێن دی، سەبارەت خزمەتکاریان ژێ نها خواندنگەهەکا بنەرەت لێ هەیە، ژبلی خواندنگەهەکا ئامادەیی بۆ کۆمەلگەهێ و گوندێن دەوروبـەران، و بنکەهەکێ ساخلەمیێ و بیرەکا ئیرتیوازی و و بتەنێ جادەیەکا سەرەکێ هاتییە قیرکرن و نها ئاڤاهیێن سەردەمیانە لێ هاتینە چێکرن.

## گوندی قۆتی:

ب دووراتییا نێزیکێ (١٤کم) دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ باتێلێ، هەڤسنوورە دگەل گوندێن فەق سەینی ژ ئالیێ باکووری و گوندی کاڤل درێژێ ژ ئالیێ رۆژئاڤای و گوندی هەورێسکێ ژ ئالیێ رۆژهەلاتی و گوندی ئاڤ تەحلێ ژ ئالیێ باشووری. ل سەر ناڤێ گوندی وەکو دانعەمرێن وی ڤەدگێرن دو بۆچوون هەنە، یەك ژ قووتی و دکاکی کو وارەکێ ب خێر و بێر بوویە و ب قووتی هاتییە ناڤکرن، یا دووێ دبێژن گوند ژبەر کو کۆچەر لێ بوون و بەری ب تەمامی لێ ئاکنجی ببن ل نهالێ و نێزیك گەرا شەکر بجهـ بوون، لێ پشتی تۆڤچینی بوویە یەکەم کارێ وان جهەکێ بلند هاتە دەسنیشانکرن و مینا قۆتیێ بوو و ئەو جهـ بۆ قوتێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ فەق سەینی

**باشووری،** گوندێ ئاڤ تەحلێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هەورێسکێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ گوندێ کاڤل درێژێ

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ئاکنجیێن وی هەموو کۆچەرێن هاجانە و پتریا وان ژ بنەمالا (جندو)ی بوون و چەند مالەکێن مالا شێرێ وبابکێ گورگا، کو ئێکە ژ گوندێن کەڤنێن سلێڤانەییان لێ بوون، و ئاخا وی وەکو ملك یێ هازم بەگێ بوو، و ئەو بنەمالێن کۆچەران ب جۆتیاریێ ل سەر کاردکرن، لێ پشتێ راستڤەکرنا یاسایا عیراقێ یا چاندنێ یا ژمارە ٩٠ ل ١٩٧٥ێ گوند ل سەر وان جۆتیاران هاتە پارڤەکرن و نها ملك یێ وانە.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٣٢ کەس بوو[١٣]، بەری وێرانکارییا (تەخریب و تەعریب)ا سالا ١٩٧٥ێ، گوند ژ نێزیکێ (٣٠) مالان پێکدهات و ئاڤاهیێن وان ئاخ بوون.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا وان یا سەرەکی ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو ژ پەز و بزن و چوورك و چێلان، و هەر مالێ نێزیکێ ٢٠٠ سەر هەبوون و مەرەزێ سپی و سۆر دفرۆتن و شیرێ پەز و بزن و چێلان ژێ دکرنە پەنیر و بازرگانێن فەللە ژ تلسقوف و باشیکێ دهاتن د گوهارتن ب تەحین و سافار و دانقوت و کەل و پەلێن دی. ژبلی خودانکرنا تەرشی خەلکێ گوندی چاندن ژێ ب ئالاڤێن کەڤن دکرن و ئەو چەند ل رێزا دووێ دهات، پشتی هاتنا تەراکتوورێن ژ جۆرێن (بالتە و زنجیر) یێن هازم بەگێ و پاشی تەراکتوور و دەرراسێن ژ جۆرێن (کێز و کلێرەن) یێن جۆرج عەززوزێ کو فەللەیێ مووسلێ بوو و نێزیکێ ١٠ - ١٢ ماکینا هەبوون چاندن کەتە بەری خودانکرنا تەرش و کەوالی.

## سیمایێ گوندی:

پتریا ئەردێ گوندی راستکەهی بوو و وارەکێ ب کێرهاتی بوو بۆ چاندنێ، و چەندین گر و نهال و شووڤك و کانییان ئەڤ وارە دخەملاند، وەکو گرکێ تەل جەناب دناڤبەرا گوندی و گوندی بامیرێ کو گرەکێ کەڤنە و گەلەك کەل و پەلێن کەڤن وەك قافکێن جەرکان و پرتێن تەنووران و بنستران

لێ دهێنە دیتن، لێ دیرۆکا وی یا دیار نینە، دیسان گرێ شاشك دناڤبەرا گوندی و گوندی خەندەکێ، پاشی نهالا نەحووت ل باکوورێ گوندی و نهالا گەڕا شەکر[١٤] نهالا کویرا[١٥] وپاشی نهالا خرابووبان دناڤبەرا گوندی و گوندی هەورێسکێ دا. دیسان چەند کانی و بیرێن ب دەست کۆلای لێ هەبوون، وەکو کانییا شینوی و کانییا نەحووت وکانییا و گەڕا شەکر و بیرا هەژیروکێ و ژبەر دووراتییا ڤان کانییان ژ گوندی و نێزیك بوونا ئاڤا ژێر ئەرد ب تەنێ ٤-٥ مەتران ئاڤ دبن ڕوویێ ئاخێ ڤەبوو لەوا خەلکێ گوندی بیر بۆ خۆ د کۆلان، وەکو بیرا سموبێ مەلای و بیرا بروبێ سادقی و بیرا حسێنێ عیسوی و چەندێن دی، دیسان ژ سیمایێن دی ل گوندی زیارەتێ سلو قەلەوی یە وەکی شوینوارەك ل باکوورێ گوندی و دبێژن وی ب خۆ خۆ کوشتیە و ناسناما وی یا دیار نینە.

ل سالا ١٩٧٥ێ گوند هاتە وێرانکرن و گوندی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گرێ گەورێ و مەروونێ و کەردیزێ و دوولبا ژووری ودوولبا ژێری و سێمێلێ ، بەلێ پشتی چەند سالەکێن کێم مەروونێ و کەردیزێ و هەردو دوولب ژی هاتنە وێرانکرن و خەلك دەربەدەری باژێران بوون. پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ و ژبەر دووراتییا گوندی ژ جاددا سەرەکی و نەبوونا خزمەتکارییان کە س نە زڤریە گوندی، لێ هەر سال دهێتە شینکرن[١٦].

## گوندی ئاڤتەحلێ:

گوندەکێ کەڤنارە دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (٣٠)کم رۆژهەلاتێ باشوورێ باتێلێ ڕامانا ناڤێ گوندی ئەوە کو تاکە کانییەکا ئاڤا تەحل لێ هەبوو و تا دەمەکێ درێژ ژیارا وان ل سەر وێ ئاڤێ بوو، تاکو (عەبدولعەزیز نجێڤی)[١٧] مووسلی شیای ئاڤێ ژ گوندی ئاخ بانێ بلند بکەت ب ڕیا بەنداڤکرنێ ب کەهینتە ئافتەحلیان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن ڤوتێ و کاڤل درێژێ

**باشووری:** گوندێن کێزینا و تربەسپا

**رۆژهەلاتی:** سنوورێ قەزا سێمێلێ

**رۆژئاڤای:** گوندی چووبانیێ

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوند وەکو ملك یێ هازم بەگێ بوو، پشتی راستڤەکرنا یاسایا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) ل سال ١٩٧٥ێ، ئەو بنەمالا ناڤبری ژڤی گوندی بێ بەهر بوو و ل سەر چەند مالەکێن کۆچەرێن هاجا ژ بابکێ شێرێ و بابکێ ڕەشا و بابکێ بەدرا هاتە مولککرن و ب تەمامی لێ ئاکنجیبوون بوون، و نێزیکی (٩٠) مال بوونە خودانێن ڤێ واری.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

دانعەمرێن گوندی دبێژن ژین وژیارا خەلکێ گوندی ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو و هندەك مالان پتری (١٠٠٠) سەرێن تەرشی هەبوون، و دبێژن هندەك مالا تا (١٢) شڤانان هەبوون و سالانە ب سەدان کیلویێن پەنیری د فروتنە دەڤەرێن تلکێف و تلسقوفێ بەرامبەری نیسك و تەحین و ساڤار و پەرۆك و پێدڤییێن وان. و بۆ بدەستڤە ئینانا پارەی ژی چەند سەرێن پەزی و هری و مەرەز د فرۆتن.

ژبلی ژیارا کۆچەرایەتیێ کو هەتا سالێن پێنجیان کارێ وان یێ سەرەکی بوو، لێ پشتی ئامیرێن نوی یێن چاندنێ هاتین بەرێ وان پتر کەتە چاندنێ و ئێکەم کەس تەراکتوور ئینای سالح یوسف ئیبراهیم بوو کو ژ دایکبوویێ سالا ١٩٣٣ێ یە و تا نها ل سەیزاری دژیت و هێن تەراکتوور هەنە.

### سیمایێ گوندی:

وەکی دیار گوندەکێ دەشتی یە و پتر نێزیکێ ئاڤا ڕووبارێ دیجلەیە، سیمایێ گوندی چەندین گرك لێ هەنە، مینا گرێ عەباس بەگێ، کو ناڤێ کەسەکێ بەرزەیە، و ژ گروڤرپا وی وەسان دیارە بەلکی ب دەست هاتبیتە چێکرن، و گرێ بەرێ پشت ئێشێ، دکەڤیتە دناڤ ئاڤارێ گوندی دا و

بەرەك ل سەر هەیە و وەكو كەلتوورەكێ كەڤن ئەڤ بەرە بۆ پشت ئێشانێ دهاتە بكارهینان.

ژ نهالێن گوندی ژی: نهالا بەرێ پشت ئێشێ و نهالا عەباس بەگێ و نهالا خلخلەی یە.

ژ شكەفتێن ژ هەمیان ب ناڤتر ل گوندی دبێژنێ شكەفتا خلخلەی كو داوییا وی دیار نینە و چەندین رێك لێ هەنە، درێژاهییا هندەك ژوان دگەهیتە نێزیكێ (۲۰۰م). ل باكوورێ گوندی جهێ كو دبێژنێ سەرگەرِ شێوێ گرەكێ یە و پرتێن جەرِكا و بەرمایكێن خۆلیێ لێ دهێنە دیتن.

وەكو گوندی دبێژن ب دەهان جۆرێن گیانەوەرێن كووڤی ل ئاقارێ ڤی گوندی هەبوون، مینا خشووك و چارێ و بالندەیان، ئاسك ب كۆم دهاتنەدیتن و وەكی ئارەزوو خەلكی گەلەك ژێ نێچیر كرن و نها كێم بووینە.

پشتی سەرهلدانێ و ژبەر نەبوونا خزمەتگوزارییان و دووریيا رێكێ ژ جادا سەرەكی گوند نەهاتییە ئاڤاكرن و تا نها خرابەیە، لێ هەرسال دهێتە شینكرن و مفا ژ ئاقارێ وی بۆ چەراندنێ و چاندنا دەخل و دانی دهێتە دیتن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ۱۹۵۷ێ هژمارا خەلكێ گوندی ۲۵۸ كەس بوو[١٨]، نها ژمارا خێزانێن خەلكێ گوندی د گەهنە نێزیكی (۳۰۰) سەرۆك خێزانان و ژوان (۹۰) جۆتیارن[١٩].

## گوندی كێزینا:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (۳٤كم) باشوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ، رامانا ناڤێ گوندی دیار نینە، لێ بۆچوون هەنە كو دبێژن كێزینا ئانكو (كێ- زین[٢٠] ئینا) یان (كێ- زوو ئینا) و بۆچوونەكا دی دبێژیت (كەس نینە)، واتە كەس ل وی جهی نینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ ڤۆتێ

**باشووری:** ئاڤا دیجلەی

**رۆژهەلات:** سنوورێ قەزا سێمێلێ و گوندێ ئاخ بانێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ تربەسپیا

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە وەكو ملك دكەڤندا یێ بنەمالا مەلا تەیبێ سلێڤانەیی بوو (سەیدێ عەبووش)ی، لێ پشتی راستڤەكرنا چاندنێ ل دەڤەرێ نها هەر كەس خودانێ ئاخا خۆیە، چاندن پتر پێشكەفت پشتی (عەلێ عەبدوش)ی بۆ ئێكەم جار سالا ۱۹٥٤ێ تەراكتوورەك ژ جۆرێ فەرگەسوون كو ب گازا سپی كار دكر ب گوژمێ (۷۰۰) دیناران بكریت ئینای و گوندی مفای ژێ وەرگرتن، پشتی سالا ۱۹۷٥ێ تەراكتوورا ژ جۆرێ كێز ل گوندی هاتە ب كارئینان. ژبلی تۆڤچینیێ خەلكێ گوند تەرش ژی بۆ خوارنا رۆژانە ب خودانكرن و نێزیكێ (٤۰۰) سەرێ پەزی ل گوندی هەبوون، دیسان خەلكێ گوندی بۆ ژیارا خۆ مفا ژ ئاڤا دیجلەی ژی بۆ چاندنا پێخوارنێن هاڤینی مینا خیار و باجان و بامێ و لووبی و...هتد ددیتن.

وەكی بەرهەڤی بۆ وەرزێ زڤستانێ خەلكێ گوندی روو ل وی ئالیێ ئاڤێ دكر بۆ دابینكرنا پێخوارنێن وەكو تەحین و دۆشاڤ و خورمە و جل و بەرگێن زڤستانێ و پەیداكرنا تەنەكەیەكا گازا سپی ب تنێ بۆ رۆناهیێ و بۆ گەرمكرنێ قورمێن دارا دبەر ئاڤا مەزن دا دهاتن كۆم دكرن و گەزێن دناڤا حەویكاند شیندبوون دبرین و گەلەك جاران سێرگین دسۆتن.

رووبـــەرێ گوندی یێ ب كێری چاندنێ دهێت دگەهشتە نێزیكێ (۲۱۰۰) دوونەمان، لێ پشتێ ئاڤاكرنا سكرێ مووسل نها تەنێ (۱۳۰۰) دۆنەم ژێ ماینە.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ۱۹٥۷ێ هژمارا خەلكێ گوندی ۸٤ كەس بوو[٢١]، بەری گوند ل سالا ۱۹۷٥ێ بێتە تەعریبكرن و خەلكێ وی بێنەڤەگوهاستن گوند پێكهاتی بوو ژ (۱۱) مالێن سلێڤانەییان. نها خەلكێ گوندی زێدەبووینە و دگەهنە نێزیكێ (۷۰-۸۰) سەرۆك خێزانان، ل مسیریكێ و خراب دێمێ و سێمێلێ و گرەشی دژین. پشتی سەرهلدانا سالا ۱۹۹۱ێ خەلكێ گوندی حەزا ئاڤاكرنا گوندی هەبوو و نێزیكێ (۱۰) ئاڤاهیيان لێ هاتنەئاڤاكرن، لێ ژبەر دووربوونا گوندی و نەبوونا خزمەتگوزاریان هاتە چۆلكرن ڤە.

### سیمایێ گوندی:

ژبەر گوند نێزیکی ئاڤا مەزنە لەوا گوند تێر خال و خەتە و ئاڤا گوندیان تەنێ ئاڤا رووباری بوو کو نێزیکی نیڤ دەمژمێری ڤەدکێشا. ژ گرکێن ڤی گوندی زۆرێ کۆزێ ل باکوورێ رۆژهەلاتی و کورا سەتێ کو وارگەهەکێ کۆچەران بوو ل باکوورێ رۆژاڤایێ گوندی، دیسان ملا کاریتەی ل رۆژاڤای و قووچکا صافێ، دبێژن ئەڤ قووچك ب ناڤێ ژنەکێ یە و ل وێرێ هاتبوو کوشتن. ژ نهالێن گوندی نهالا کفرا دناڤبەرا گوندی و گوندی تربە سپیا، نهالا شابکا ل رۆژهەلاتێ گوندی، و چەندین گر و نهالێن دی کو د بێ ناڤن. سەبارەت کەڤناتیا گوندی ژی چەند گورەکێن کەڤن ل رۆژاڤایێ گوندی هەنە و دبێژن یێن عەرەبانن لێ دەم دیار نینە، هەژی ئاماژێ یە خەلکێ ڤی گوندی مریێن خۆ ل ئاخا وارێ تربەسپیا ڤەدشارتن و هەردو گوند یێن بنەمالا مەلا تەیبێ نە.

## گوندی تربە سپیا:

گوند دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (١٨کم) باشوورێ باتێلێ، پتریا ئاقارێ وی دکەڤیتە سەر رووبارێ دیجلەی، ناڤێ گوندی یێ ژ (گۆرێن سپی) هاتی، ئانکو دەڤەرەکا سپی یە (گۆرێن سپی).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن ئاڤتەحلێ و چوپانیێ

**باشووری:** رووبارێ دیجلە

**رۆژهەلات:** گوندێ کێزنا

**رۆژئاڤای:**

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٨٤ کەس بوو[٢٢]، گوند بەری وێرانکرنا دەڤەرا سلێڤانەیا نێزیکی (١٠) مالان بوون و پێکهاتا گوندی هەموو سلێڤانەیی بوون، و وەکو ملك یێ بنەمالا مەلا تەیبی بوو، نها خەلکێ گوندی ل کۆمەلگەها خراب دێمێ و سێمێلێ و زاخۆ دژین و ژمارا خێزانێن خەلکێ گوندی د گەهنە نێزیکی (٥٠) مالان.

### سیمایێ گوندی:

ل گوندی شکەفتەکا مەزن د ناڤا نهالێ دا ل باکوورێ گوندی هەیە، نهالا بانی خورێ و نهالا کانیکێ کو کانییەك دناڤ دا هەبوو، و ملا کاریتەی، ملەکا درێژ بوو دناڤبەرا گوندی تربەسپیا و کێزینا راکێشای بوو بەلێ نها چو سیمایێن وێ ملێ دیار نینن، دیسان زۆرکەك ب ناڤێ زۆرکێ گورێ یێ هەی و سیمایێ وێ ژ ناڤێ وێ دیارە ، کو چ تشت لێ شین نە دبوون و تێر کەند و کوور بوو، و بەر ب باشوورێ گوندی خرابەیەك هەبوو هەر دگۆتنێ خرابە و ژ کۆمەکا بەرێن هەرفی و ب رێز دیار دبوون و مینا شوینوارێن کەڤن دیار دکرن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دو کانی ل گوندی هەبوون، کانییا نهالا کویر و کانییا نهالا خورێ کو یا مەزن بوو و پەزێ گوندی ل سەر دهاتە ئاڤدان و هەمی سالان بیستانەك ل بەر ئاڤا وێ دهاتە شینکرن، و گەرا بەسنایێ، دکەتە رۆژاڤایێ گوندی، ئەوژی گەرەکا کوور بوو و نوزانن چ دەمی هاتبوو کۆلان، لێ ژێدەرێ هەری مەزن بۆ ئاڤا گوندی رووبارێ دیجلە بوو، سەبارەت ڤەگوهاستنا ئاڤێ ژی هەمی ب دەواران دهاتە کێشان و بۆ عومبارکرنێ دکرنە د کەدینك و جەراندا، یان ژی دناڤ (دەن)ان دا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

سەبارەت ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر تۆڤچینیا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆکان بوو ب ئالاڤێن کەڤن، و ژبەر نێزیکبوونا گوندی ژ رووباری چەند دۆنەمەك ژێ دکرنە دەرامەتێ ئاڤی، چ بۆ خوارنێ و چ بۆ فرۆتنێ مینا باجان و خیار و بامی و باجانرەشك و لوبیك و.... هتد. و ژبەر ژاریێ و نەزانینێ

باراپتر وەرازێن عەرەبێن مووسل بوون، دیسان خەلکێ گوندی ماسی گری ژی دکرن و بەشەك بوو ژ ژیارا خەلکێ گوندی.

بەری خرابکرن و ڤەگوهاستنا گوندی ل سەر رووبارێ دیجلەی بەلەمەك ژی هەبوو خەلك دەربازی گوندێن ئالیێ دی یێ ئاڤێ یان مووسلێ دکرن و دبێژن، هەر کەسەك ب (٢٥-٥٠) فلسان دەرباز دکر.

سەبارەت ب خوارنا گوندیان ژی ل گور هەبوون و نەبوونا خوراکێ وی سەر دەمی بوو، سەرەرای هەبوونا ساڤار و دانهێرك و دانقوت و هویرکێ کوتلکان، لێ وەرزان ژی حوکمێ خۆ هەبوو، بۆ نموونە ل زڤستانان خوارنا هەری سەرەکێ نیسك بوو، لێ ل هاڤینان دەوین بوو. شێوێن هلگرتنا گوشتی بۆ زڤستانێ ب رێکا جەرکان بوو، ئەو ژی کەلاندن و قەلاندنا گوشتی و عومبارا وی وەکو قەلی، یان تیڤالکرنا گۆشتی و پاشێ خوێکرن و هشککرنا وی بوو. نها گوند خرابەیە، لێ هەر سال دهێتە تۆڤکرن و هلاندن و دابەشکرن ل سەر هەمێ گوندیان.

## گوندی چووبانیێ:

چووبانیێ ب دووراتیا نێزیکێ (١٩کم) دکەڤیتە باشوورێ باتێلێ. گوند بەری تەعریبا سالا ١٩٧٥ێ پێکدهات ژ (١٣) مالێن بنەمالا مەلا تەیبی و مالەکا کۆچەران و مالەکا بنیات عەرەب (شمیسات). ناڤێ گوندی وەکی گوندی ڤەدگێرن پێکهاتییە ژ دو پەیڤان (چوو- بانیێ)، و جهێ گوندی بلند و بانیە، دکەڤیتە هنداڤی ئاڤا رووبارێ دیجلەی، دەستپێکا ئاڤاکرنا گوندی ل سەر ئاڤێ بوو، لێ پاش بۆ بلنداهیێ (بانیێ) هاتییە ڤەگوهاستن، لەوا دگۆتن (چووبانیێ).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ کاڤل درێژێ

**باشووری:** گوندێ تربە سپیێ و رووبارێ دیجلەی

**رۆژهەلات:** گوندێ ئاڤتەحلێ

**رۆژئاڤای:** گوندێن قەسرێ و خراب مالکێ

### سیمایێ گوندی:

گوند دەڤەرەکا راست گەهی یە، لەوا بتنێ دو نهال ل گوندی هەنە، نهالا ئێکێ دناڤبەرا گوندی و گوندی ئاڤتەحلێ دایە و یادی دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندێ خراب مالکێ. دیسان گرەك ژی ب ناڤێ (گرکێ چووبانیێ) ل رۆژهەلاتێ گوندی هەیە، و شوینوارێن کەڤن ل سەر وی گری هەنە لێ دیرۆکا وی دیار نینە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ل گوندی کانی نەبوون و ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤا وان رووبارێ دیجلەی بوو. وەکی گوندی ڤەدگێرن چو ئالاڤێن دەربازبوونێ ژ ئاڤێ ل ڤی گوندی نەبوون و بۆ دەربازبوونێ و دابینکرنا پێدڤێن خۆ ژ خوراکی و سۆتەمەنیێ ل ئالێ دی یێ رووباری دچوونە گوندی تربەسپا کو ل وێرێ دمشەبوون، لێ ماسی گری ل ڤی گوندی وەکی دەرگەهەکێ ژیانێ هەبوو، ژبلی تۆڤچینیا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان، چ بۆ فرۆتنێ و چ بۆ پرکرنا ستێرکێ ناڤ مالێ ژ بەرهەمێن گەنمی ژ ساڤار و دانهێرك و دانقوت و نیسك و نۆك و...هتد.

دیسا گوند نە یێ بێ بەهر بوو ژ خودانکرنا پەز و بزن و چێلان، ل دەشتا گوندی گەلەك گیانەوەرێن کووڤی مینا گورگ و رووڤی و کێڤریشك و مار و دووپشك و پۆر و قتك و سویسك و قورت و... هەبوون لێ خەزال ل نیڤا سەدساڵیا بیستێ ژ ئەگەرێ نێچیرێ نەماینە. گوند نها خرابەیە، لێ سالانە دهێتە شینکرن. و ژمارا سەرخێزانێن وان دگەهنە نێزیکێ (٦٠) سەرۆك خێزانان.

## گوندی خراب مالکێ:

گوندەکێ کەڤنارە دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (١٨کم) باشوورێ سەنتەرێ باتێلێ. رامانا ناڤێ گوندی وەکی گوندی دبێژن ژبەر کو گوند گەلەك جاران و ژبەر چەندین ئەگەران هاتییە ئاڤاکرن و خرابکرن لەوا بوویە خراب مالك، و سێ جهێن دیار هەنە کو گوند ل سەر هاتییە ئاڤاکرن، وارێ ئێکێ د

ناڤ ئاڤارێ قەسرێ دابوو و دیرۆکا وی یا دیار نینە، لێ وەکو شوینوار بنسترێن وی دیارن و ژ بەر و کلسی ئاڤاکربوون و بەلکی نێزیکێ (٢٥) مالان لێ دژیان، وارێ دووێ ل ناڤ ئاڤارێ گوندی دا ل سالا (١٩٥١)ێ ل سەر دەستێ بنەمالا حەمو مشدینا یێ بەر نیاس ب (حەمو گرکەلێ) و چەند کورێن وی و برازایەکێ وی هاتییە ئاڤاکرن، ل سالا (١٩٥٥)ێ چەند مالەکێن کۆچەران هاتنە گوندی خراب مالکێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** سەنتەرێ باتێلێ

**باشووری،** گوندێ گرابوورێ

**رۆژهەلات،** گوندێ چوپانیێ

**رۆژئاڤای،** قەسرا مەلا تەیبی

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

نها پێکهاتا گوندی سلێڤانەیی و کۆچەرن، و خەلکێ گوندی ل سەر ڤێ شێوەی تا سالا (١٩٧٥)ێ مان، و (ترحیل و تەعریب)ێ گوند ڤەگرت خەلکێ وی دەربەدەری باژێران وەك دهۆك و سێمێل و زاخۆ و مالتایێ بوون. پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ گوند بۆ جارا سیێ و ل جهەکێ نوو ل سالا (١٩٩٤)ێ هاتە ئاڤاکرن و چەند مالەك لێك کۆمبوون. نها ژمارا سەرخێزانێن خەلکێ گوندی دگەهنە (٨٧) سەرۆك خێزانان و گەلەکان نەشیایە ل گوندی ب زڤرن لێ هەرسال شیندکەن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

وارێ ڤێ گوندی یێ کو ب کێری چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیکێ (١٦٠٠) دۆنەمان تۆڤچینییا وان ل سەر سیستەمێ میری بوو، واتە کرێیا ئەردی تا شۆرشا ١٩٥٨ێ ددانە وەزارەتا دارایی، لێ ل ژێر بریارا راستڤەکرنا چاندنێ هەر جۆتیارەك بۆ خودانێ خۆ و ئەردێ خۆ. ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکی سەرەکی ل سەر تۆڤچینییا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان بوو، ژبلی خودانکرنا تەرشی ژ پەز و چێل و بزنا و ب تایبەت خودانکرنا چویرکان[٢٣] بۆ فرۆتنا مەرەزی.

## سیمایێ گوندی:

ئاخا گوندی یا رەشە و ئاڤا وی یا تەحلە، لەوما ب کێر ڤەخوارنێ نەدهات و ب تنێ گیانەوەران ڤەدخار، بۆ کاروبارێن رۆژانە ئاڤ ژ رووبارێ دیجلەی ب دەواران دناڤ ئاڤارێ گوندی چووپانیێ را دهینا، گوندی تەنێ نهالەکا دیار و درێژ ب ناڤێ (نهالا سۆر) دناڤ ئاڤارێ گوندی دا هەیە. نها گوند ئاڤایە و بتەنێ چوار مال لێ هەنە، کارەبا یا گەهشتیە گوندی و حەفتیێ جارەکێ ئاڤ ب تانکەران ژ رێڤەبەریا ناحیێ دگەهیتە گوندی. دیسان گرەك ژی ل رۆژاڤایێ گوندی ب ناڤێ (گرێ ب ئاخ) لێ هەیە. دیسان حەزەك[٢٤] هەیە دبێژنێ حەزا رێکا پێچەکێ، کووراتییا وێ دیار نینە و ب سروشتێ خۆ هەموو ل وارەکێ کلسی دیاردبن.

سەبارەت گیانەوەرێن کووڤی وەکو هەمی دەشتێ گورگ و کێڤریشك و رووڤی و مار و دووپشك و بەت و قورت و سووسك و پۆر و قتك لێ هەبوون و گەلەك دهاتنە نێچیرکرن. نها گوندی هەرسال ئاخا خۆ شیندکەن[٢٥].

# گوندی گرئابووری:

گوند دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (١٨ - ٢٠)کم باشوورێ سەنتەرێ باتێلێ، گوند یێ ل سەر دەستێ (حەبەشێ عەبدی خەزالا) ژ بنەمالا (مەلا تەیبێ) سلێڤانەیی ل سالا ١٩٢٠ێ هاتییە ئاڤاکرن. رامانا ناڤێ گوندی وەکی خەلکێ گوندی ڤەدگێرن یێ ژ هەردو گرێن مەزنێن دکەڤنە باکوورێ گوندی هاتی، و ژبەر گوند دکەڤیتە سەر رووبارێ دیجلەی کو سنوور بوو دگەل گوندێن عەرەبان و ب قایکان ژ ئاڤێ دەربازدبوونە ئالیێ دی، لەوما دشێن بێژین ناڤێ گوندی پێکهاتییە ژ دو پەیڤان: (گر+ ئابوور) یان گرێ بۆرێ، واتە ئاڤا مەیی و بێ لڤلڤین کو ب ساناهیترە بۆ دەربازبوونێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خراب مالکێ

**باشووری:** رووبارێ دیجلەی

**رۆژهەلات:** گوندێ چوپانیێ

**رۆژئاڤای:** قەسرا مەلا تەیبی

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

هەر ل دەسپێکا ئاکنجی بوونا وان ژ (٦ - ٨ )مالان پێکدهات، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ل عیراقێ خەلکێ گوندی ١٠٠ کەس بوون[٢٦] هەمی هەر ژ ئێك بنەمالبوون بوون.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا وان ل سەر تۆڤچینی یا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان بوو، دیسان بیستان ل بەر ئاڤا مەزن ب رێکا ماتۆرێن ئاڤێ دهاتنەکرن و تەرش و کەوال ژی دهاتە ب خودانکرن. بۆ هێرانا دەخل و دکاکی ئاشەکێ ئاگری هەبوو، کو خزمەتکرنا گوندێن دەوروبەر ژی دکر، هەر دیسان ماسی ژی ل سەر رووباری وەکی دەرگەهەکێ ژیانێ دهاتنە گرتن.

### سیمایێن گوندی:

ژ سیمایێن گوندی هەردو گرێن مەزنن (گرێ کۆزێ و گرێ سۆر) کو بلندترین نیشانێن گوندی نە، زێدەباری هەبوونا گەلەك گرك و نهالان، مینا نهالا کانیا (کەکو)ی دناڤبەرا گوندی و گوندی قەسرێ دا کو نهالەکا کویر و تێر شکەفتۆك و بەرەڤەزە و کانییەکا ئاڤا تەحل دزکێ وێ دا هەبوو کو نها هشك بوویە و تەنێ بۆ ئاڤدانا پەزی دهاتە ب کارئینان.

ژێدەرێ ئاڤا گوندی تەنێ ل سەر ئاڤا دجلەی بوو. و ل بەرامبەرێ گوندی و د نیڤا ئاڤێ دا دو (حەویك)[٢٧] هەبوون و دارێن مەزن لێ هەبوون و دارا (گەز)[٢٨] مشە لێ شین دبوو، مفا بۆ سۆتنێ و فرۆتنێ ژێ دهاتنە دیتن و فرەهیا هەر حەویکەکێ نێزیکی (٢٠٠) دۆنەمان بوو.

ئاقارێ گوندی پێکهاتیبوو ژ نێزیکی (٧٠٠) دۆنەمان، لێ ژبەر سکرێ مووسل، نێزیکێ (٦٢٠) دۆنەمان کەتنە دبن ئاڤێ دا و ب تنێ (٨٠) دۆنەم بۆ چاندنێ ماینە، زێدەبارێ کۆزا پەزی کو نێزیکێ (٤٥٠) دۆنەمانە.

ل سالا ١٩٥٤ێ گوند دناڤبەرا (حەبەش)ی خودانێ گوندی یێ کەڤن و برایێ وی (سەهمیێ عەبدی خەزالا) هاتە پارڤەکرن و گوند ژی بۆ دو گوند، گرابوور ژووری ل سەر ناڤێ حەبەشی و گرابوور ژێری ل سەر ناڤێ سەهمی.

سالا ١٩٦٣ێ و ژبەر تێکەلیا خەلکێ گوندی دگەل شۆرشێ گوند ل سەر دەستێ حکومەتا عیراقێ هاتە سۆتن و وێرانکرن، و ل دەستپێکا دانوستاندنێن سەرکردایەتیا کوردی ل سالا ١٩٧٠ێ دگەل رژێما عیراقێ، گەلەك ژ گوندیان زڤرینە ڤە سەر ئاخا خۆ و گوند ئاڤاکرنەڤە.

ژ تیتالێن خەلکێ گوندی دەمێ خواستن و ڤەگوهاستنا بووکان، و ل جەژن پیرۆزکرنان هەسپ و ماهینێن بەرکەتی هەبوون و بەریکانەیەکا دژوار دکرن و فێرس و سووار چاك دیار دبوون، دیسان بەریکانا سوواران و ئارمانجانێ یەك ژ ئارەزوویێن گوندی و گوندێن دەوروبەران بوون لەوا خودانکرنا ماهین و هەسپێن خورت و پەیدا کرنا تڤەنگێن مینا کچك چاپی و ماویزەر و خەنجەرێن دەست ب مۆرێ یەك ژ خەملا لاوێن گوندی بوو. ب هەبوونا ئاسکان و کتکێن کووڤی و گورگ و رووڤی وتووری و حەفتیار و سووسك و قتکان ل وێ دەڤەرێ، نێچیرا ڤان جۆرە گیانەوەران ژێ پەیدابوو کو ئەو ژی ئارەزوویەکا گەنجێن گوندی بوو.

نها گوند خرابەیە و ژمارا خێزانێن گوندی پترن ژ ٥٠ سەرۆك خێزانان، ل دهۆکێ و سێمێلێ و گرەشی دژین، لێ هەمی سالان ئاخا خۆ شیندکەن، و ئاقارێ وی و کۆزا وی وەکو چەروان دهێتە ب کارئینان.

## گوندی قەسرێ (قەسرا مەلا تەیب):

دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (٢٦) کم باشوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ، و د نەخشەی دا ئاقارێ هەردو گوندێن

قەسرێ و خراب دێم دکەڤنە د ئێك بازنەیی دا لەوا سنوورێن گوندی قەسرێ دگەل ڤان چەند گوندان هەڤسنوورە. دیرۆکا ئاڤابوونا گوندی یا دیار نینە، لێ بۆچوون پتر بۆ هندێ دچن کو ل داوییا سەدساڵییا هەڤدێ یان دەستپێکا سەدساڵییا هەژدێ ل سەر دەستێ مەلا تەیبێ مەلا یەحیایێ سلێڤانەیی بۆ ئێکەم جار هاتییە ئاڤاکرن، وەك دهێتە ڤەگێران مەلا تەیب ژ بابێ خۆ ل گوندی ئاسیهێ جودا بوویە و بەر ب وارێ ناڤبری چوویە، دەوروبەرێن وی واری ئێزدیێن مسیسانی بوون و ب هاتنا مەلا تەیبی و ئاڤاکرنا قەسرا وی ل نێزیکی رووبارێ دیجلەی و ب حوکمێ تێکەلییا وی ب ئێزدیین ناڤبری دا دەست ب دەسەلاتا خۆ ل وێ دەڤەرێ کر و شیا رووباری زنجیر بکەت و باج و خووکا ژ هەموو بازرگانێن خودان قایك وەربگریت، ئەڤ جهە باشترین جهـ بوو ل دەڤەرێ بۆ دەربازبوونا قایقان و دبێژن جارنا چوار هێستر ب بارڤە دگەل خودانێن خۆ ب ئێکجاری دەربازدکرن، وی دەمی رێ یا بازرگانی دناڤبەرا زاخۆ و مووسلێ دا ئاڤ بوو، لەوا مەلا تەیبی شیا داهاتێ خۆ زێدەکەت و هەڤالێن خۆ ژی ب هێز بێخیت، پشتی دەمەکی و ب ئەمرێ حاکمێ زاخۆ مەلا تەیب هاتە کوشتن، پشتی زارۆکێن وی مەزن بووین شیان تۆلا خۆ ڤەکەن و هەمان کارێ بابێ خۆ کرنەڤە و شیان دەستێن خۆ داننە سەر گەلەك واران، وەکو قەسرێ و گرابوورێ و کومبەلێ و خراب دێمێ و حەزازا و چووبانیێ و بامێرێ و باستکێ و گرەشی و مالهەسنێ و تربەسپیا و کواشێ و بالقوسێ و ئەرمشتێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن حەزازا و ئافخانێ

**باشووری:** گوندێن خراب مالکێ گرابووری

**رۆژهەلات:** گوندێن کافل درێژ و چووبانی

**رۆژئاڤای:** کومبەل و هەردوو پێچەکا

گوندی قەسرێ چەند جاران کەتیە و هاتییە سۆتن و تالانکرن، یەکەم جار گوند ل ١٩٦٢/١٢/١٥ێ هاتییە سۆتن و تالانکرن و (٥٢) زەلامێن گوندی بەر ب زیندانێن مووسلێ برینە و پتریا وان هاتنە حوکمکرن. بۆ جارا دووێ گوند ل سالا ١٩٦٦ێ هاتییە کاڤلکرن، و داوی جار ل سالا ١٩٧٤ێ بوو ب بریارا حکومەتا بەعسی ل بەغدا قەسرێ هاتە چۆلکرن و وێرانکرن و خەلکێ وی دەربەدەری دەوروبەران بوون.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٣٢٤ کەس بوو، بەری سالا ١٩٧٥ێ ژ نێزیکێ (٧٥) مالان پێکدهات ، ژ سلێڤانەییان بابکێن مەلا تەیبی و مەندا و کەنعانی و سێ مالێن کۆچەران و دو مالێن جەدداعی و سێ مالێن کەمەکییا (دۆسکی) و چەند مالێن هەسنا بابکێ عەمەر گەوریا.

بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل سالا ١٩٥٧ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، و چەند مامۆستایان دەوام لێ دکرن، مینا: حکمەت یونس نەعیمی، حەسەن مەلا تەیب ئامێدی، ئەحمەد مەلا تەیب ئامێدی، ئەدیب مستەفا زاخۆیی، ئارتۆن ئارشاك زاخۆیی، ئەحمەد بێتاسی، مستەفا عەبدولا، ئەحمەد سەدیق ئامێدێ، محەمەد یونس قبلان تلەعفەری، حەمید یونس لشەماع.

## سیمایێ گوندی:

گوندی قەسرێ ل دەستپێکا ئاڤاکرنا وی ل خوارێ و ل سەر رووبارێ هاتبوو ئاڤاکرن و پاشی هاتییە ڤەگوهاستن بۆ سەر زنارەکێ بلند ب ناڤێ زنارێ قەسرێ و روویێ وی دکەڤیتە رۆژاڤای، وارێ ڤی گوندی چەندین گر و نهال و وارگەهـ و نیشانان بخۆڤە دگریت، ژ گر و ملێن ڤی گوندی: گرێ کۆزێ ل باکوورێ رۆژاڤایێ گوندی، گرێن خرابێ جووت و گرێ زیارەتا و گرێ ملا قەسرۆکا ل رۆژئاڤایێ گوندی، گرکێ خرابێ باپیری ل باشوورێ گوندی، ملا سلاڤکەهێ ل باکوورێ رۆژهەلاتێ گوندی، ملا بەرەزیڤێ ل باکووری گوندی، ملا گێچکا ل رۆژهەلاتێ گوندی، ملا دەوقەلینێ ل

رۆژاڤایێ گوندی، ملا ئاخشینێ حسێنێ پیرۆزێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، ملا ئاخشینێ محو سینەما ل رۆژهەلاتێ گوندی و چەندین گرێن دی.

ژ نهالێن گوندی ژی: نهالا ترومبێلا ل باکوورێ گوندی، نهالا توخیبی ل رۆژهەلاتی هەردو گوندێن قەسرێ و گرابووری ژێك جودا دکەت، نهالا قووری کو قەسرێ و کومبەلێ ژێك جودا دکەت.

دیسان چەندین وار و زەڤیێن ب ناڤ ل ڤی جهی هەنە مینا: وارێ حەوروی ل رۆژاڤایێ گوندی، وارێ عوودێ ل باکوورێ گوندی، زەڤیا خرابێ جووت ل رۆژاڤایێ گوندی، زەڤیا چەم قارووڵ هەر ل رۆژاڤایی، زەڤیا چەمێ زرا ل رۆژاڤایی، زەڤیا بیهۆکا هەر ل رۆژاڤایی، چەمکێ سووسێ (ژبەر هەبوونا گیایێ سووسێ) ل رۆژاڤایێ گوندی، زەڤیا وارێ نعوی ل باشووری.

## ژ کانیێن گوندی:

کانیا کەکوی ل رۆژهەلاتێ گوندی و تا ئیرو یا ب ئاڤە، و کانیا زەلاما نها دبن ئاڤێ دامایە.

ژ نیشانێن د ناڤ ئاقارێ گوندی قەسرێ دا زنارێ قەسرێ یە، درێژاهیا وی نێزیکێ (٤٠٠م) و بلنداهیا وی دگەهیتە نێزیکێ(٣٠م). و حەزا کانیا کەکوێ، کووراتیا وێ نێزیکێ (١٠٠م) و دووماهیا وێ دبیتە کانی، دیسان هەردو ناوسکێن خرابێ جووت ژ نیشانێن ڤێ گوندی بوون لێ نها بن ئاڤ بووینە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ ڤی گوندی ل سەر تۆڤچینیا گەنم و جەهان و ب خودانکرنا تەرشی بوو، بۆ ئێکەم جار حەجی سەلمان شیایە تەراکتووری ل سالا ١٩٥٥ێ بینتە گوندی، سالا ١٩٥٦ێ بۆ یەکەم جار حەجی خورشیدی دەراسە هینایە گوندی، و پشتی هینگێ پتر پویتە ب چاندنێ هاتییەدان و وارێ ب کێر چاندنێ دهات دگەهشتە نێزیکێ (٢٤٠٠) دۆنەمان، ژوان (٩٧٠) دۆنەم ماینە دبن ئاڤێ دا. نها ژمارا جۆتیارێن گوندی دگەهنە (١٤٤) جۆتیاران، و ئاخا ڤی گوندی ل سەر وان هاتییە بەلاڤکرن، و نێزیکێ (١٠) مالان ل گوندی دژین و ژیارا وان دیسان ل سەر تۆڤچینیێ و خودانکرنا تەرشی یە و هێلا کارەبێ ل گوندی هەیە، ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا وان ژی ل سەر رووبارێ دیجلەیە.

ژمارا سەرۆك خێزانێن خەلکێ قەسرێ نها دگەهنە نێزیکێ (٢٤٠) سەرۆك خێزانان، ل مسێریکێ و سێمێلێ و زاخۆ و خراب دێمێ دژین[٢٩].

## گوندی کاڤل درێژ:

کاڤل درێژ دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (١٤کم) باشووری رۆژهەلاتێ باتێلێ، رامانا ڤی ناڤی دزڤریت بۆ وارەکێ کەڤن ژ ئاقارێ گوندی کو تێر بنسترە و کەڤنێن گوندی دبێژن دەمێن کەڤندا وان ئەڤ بنسترە وەکو کاڤل دیتن و ب بوورینا دەمی یێن هەرفین و ماینە بنستر و پتریا ڤان کاڤلان دردرێژ بوون، لەوا ئەڤ ناڤ کەتیە سەر ڤێ وارێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن فەقسەینێ و حەزازا

**باشووری:** گوندێ چووبانیێ

**رۆژهەلات:** گوندێن قووتێ و ئاڤتەحلێ

**رۆژئاڤای:** گوندی قەسرا مەلا تەیبی

## سیمایێ گوندی:

گوندەکێ دەشتێ یە و تێر زەڤی و چەند نهال و گرکە، مینا گرکێ خرابەی یێ کو زیارەتێن گوندی ل سەر و کەندال سۆرك یێ کو ل بهاران ئاڤ ژێ درێت، ئەڤ هەردو بلنداهییە دکەڤنە رۆژهەلاتی گوندی و بلنداهیێ سێ کەلووکا ل رۆژئاڤایێ گوندی، و ملا مەزن دناڤبەرا گوندی و گوندی ئاڤتەحلێ و چەندین ژی هەنە، مینا نهالا ئاڤا شرین ل رۆژهەلاتێ گوندی و نهالا ئاڤا تەحل ل رۆژاڤایێ گوندی و نهالا گای ل باشوورێ رۆژهەلاتی، و ل ڤان نهالان چەندین شکەفت و حەز هەنە مینا شکەفتا زەلاما، یاکو ل پتریا رۆژێن هاڤینێ ژبەر فرەهی و هینکاتیا وێ زەلامێن گوندی تێڤە کۆمدبوون، و دکەڤیتە رۆژاڤایێ

گوندی. و حەزا کەرووی ل باکووری رۆژئاڤایێ گوندی و حەزا دەڤ سۆر و کون سیخور ل باشووری رۆژئاڤای و چەندین نیشانێن دی کو د بێ ناڤن.

## زێدەری ئاڤا گوندی:

تەنێ یەك کانی دناڤ گوندیدا ب ناڤێ کانییا عەلی هەبوو و ئاڤا وێ یا تەحل بوو، دیسان گەرِ گامێش ژی هەبوو کو گەرەکا مەزن بوو و ئاڤا وێ ژی یا تەحل بوو، ئەڤ هەردو ژێدەرێن ئاڤێ دهاتنە ڤەخوارن ژی و بیر ژی بۆ هەمان مەبەست دهاتنە کۆلان، یان ژی ژ گوندی فەقسەینێ ب کەر و دەواران ئاڤا شرین دکێشان.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوند وەکو ملك یێ بنەمالا شەمدین ئاغای بوو، و ژبەر چەروانا وێ یا خۆش هەمەوو سالان دبوو جهێ ڤەحەویانا چەندین بنەمالێن کۆچەران، لێ پشتی گرتنا سنووران ئێدی (١٥) مالێن گەودا و (١١) مالێن هاجا ل وی ئاڤاری خۆ جهبوون و دەست دانە کارێ گوندانیێ.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا وان ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو ژ پەز و بزنان و هەر مالێ پتری (٢٠٠) سەرێ پەز و بزنی هەبوو و بەرهەمێ وی ژ هری و پەنیرێ د فرۆتن، ب تایبەت پەنیر کو د فرۆتنە فەللەیێن تلوسقوفێ، پشتی ئاکنجی بووین چاندن ژی بۆ پارچەك ژ ژیانا وان و جەهـ و گەنم و نیسك و نۆك ب ئالاڤێن کەڤن دچاندن، پشتی تەراکتوور هاتینە مەیدانێ ئێدی کارێ چاندنێ کەتە پێشی خودانکرنا پەزی، و پشتی راستڤەکرنا بریارا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) ل سالا ١٩٧٥ێ ئاڤارێ گوندی ل سەر وان جۆتیاران هاتە پارڤەکرن و نها (٣٠١٤) دۆنـەم ددەستێن جۆتیاراندانە.

ژ کار و ئارەزوویێن دی کو ل گوندی د هاتنە ئەنجامدان، نێچیر و کۆمکرنا گیایێن بهاری دناڤ سروشتی دا، مینا کەنگر و گویرسك و کاری و تۆلك و چەندین گیایێن دی.

ژ ئالیێ سیاسی ڤە ئەڤ گوندە ژی کەتیە ژێر گڤاشتنێن سیاسەتا حکومەتێن عیراقی، ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٥ێ هاتیە سۆتن و کاڤلکرن و دیسان هاتیە ئاڤاکرن ڤە، لێ ل سالا ١٩٧٥ێ کەتیە ژێر بریارا (تەخریب وتەعریب)ێ، و هاتیە وێرانکرن و خەلکێ وی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ دەڤەرا سندییان گوندی بەهراڤا، پشتی ماوەیەکی زڤرینە نێزیکی دەڤەرێ و ل گوندێن مەروینێ و تلزێدێ ئاکنجیبوون، پشتی ئەو گوند ژی هاتینە وێرانکرن کۆچەرێن هاجا ل کۆمەلگەها موسێریکێ ئاکنجیبوون، لێ کۆچەرێن گەودا هەر د دەستپێکا سالێن حەفتیاندا ژ گوندی کاڤل درێژێ دوورکەتنە و پتریا وان ل زاخۆ ئاکنجیبووینە و تا نها ل زاخۆ ماینە.

پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ وارێ ڤی گوندی بۆ خەلکێ گوندی زڤریڤە، لێ ژبەر نەبوونا خزمەتگوزاریان گوند نەهاتیە ئاڤاکرن، لێ هەرسال گوند دهێتە شینکرن و نها ژمارا خێزانێن خەلکێ ڤی گوندی دگەهنە نێزیکێ (٢٠٠) سەرۆك خێزانان[٣٠].

## گوندی فەق سەینی:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا نێزیکی (٨کم) باشووری رۆژئاڤایێ باتێلێ. ناڤێ گوندی دبیت ژ ناڤێ مرۆڤی هاتبیت، (فەق- سەین) یان (فەق- حسێن)، سەینی یان حسێن بەلکی گوند ل سەر دەم و جهێن وی ڤیای هاتییە ئاڤاکرن، لێ دیرۆکا ئاڤاکرنا وی دیار نینە. گوند وەکو ملك یێ هازم بەگێ بوو، پێکهاتا گوندی تەنێ (١٢) مالێن کۆچەرێن هاجا- رەشا بوون، و ژبەر گرتنا سنووران نها هەمان بابك ل ئالیێ ترکیا ژی ماینە، لەوا وەکو گوندی دبێژن نها ژی زۆم و زۆزانێن رەشا ل بێرمانێ- شرنەخێ بەرنیاسن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێ بامێرێ

**باشووری**، گوندێن قۆتێ و کاڤل درێژ

**رۆژهەلات**، گوندێ هەورێسکێ

**رۆژئاڤای**، گوندی حەزازا

## زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

گوندی فەقسەینێ تێر نهالە و ئاخا ڤێ گوندی ب سەر سۆری ڤە دچیت ، و چەروانەکا باش لێ هەبوویە لەوا مالێن کۆچەران لێ کومبووینە و هەر مالێ نێزیکێ (٤٠٠) سەرێن پەز و بزنان هەبووینە و خودانکرنا تەرشی ژ پەز و بزن و چێل و چوورکان دەرگەهێ ژیارا وان یا ئێکێ بوو و نها ژی ل ئاقارێ ڤی گوندی ب خوداندکەن، دیسان خەلکێ گوندی ب هەبوونا دەواران ژ ماهین و هێستران ژی یێ بەرنیاس بوو، سەبارەت ب تۆڤچینیێ و جۆت و جۆباران گوندیان ئەڤ کارە ب خەمڤە نەوەرگرتیە، لێ پشتی هاتنا تەراکتووران و ئاسانکرنا چاندنێ بەرێ خەلکی هێدی هێدی کەتە چاندنێ و نها گەلەکان تەراکتوور و ئالاڤێن خوەیێن تایبەت هەنە، پشتی راستڤەکرنا برپارا چاندنێ یا یاسایا ژمارە (٩٠) ل سالا ١٩٧٥ێ مەللاك ژ ڤی گوندی هاتیە بێ بەهرکرن و ئاقارێ گوندی کەتیە ددەستێن (٢٤) جۆتیاران دا و پشتی سالا ١٩٩١ێ هاتیە دابەشکرن ل سەر (٤٤) جۆتیاران.

## سیمایێ گوندی فەقسەینێ:

ژبەر کو ب بنکەتیە و ژ چەندین نهال و گرکان پێکدهێت مینا نهالا شکەفتووکێ کو شکەفتووکەکا بچویك د زکێ وێدایە و دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و هەشارەکا قەجاغچیان بوو، نهالا کۆزێ ل باکوورێ گوندی و نهالا وار کوورکێ ل رۆژهەلاتی و چەندین ێن د بێ ناڤ، دیسان خرابە دبس و گرکێ تەل جەنابێ ل سەر توخیبێ گوندێن بامێرێ و ڤۆتێ و فەقسەینی و دیسان چەندین بلنداهیێن دی کو د بێ ناڤن. هەر وەسان دناڤبەرا گوندی و گوندی کاڤل درێژێ بنسترەك هەیە و وەکو شوینوار مایە، دیسان گۆرستانەك دناڤبەرا گوندی و گوندی بامێرێ دا هەیە و بەر قیبلە هاتینە ڤەشارتن. سەبارەت ژێدەرێن ئاڤا گوندی تەنێ دەراڤێ حەلانی یێ هەی کو نیمچە کانیە و ئاڤەکا باش بۆ ڤەخوارنا گوندیان ژێ دهات، لێ ژبەر ئاڤا ژێر ئەرد گەلەکا نێزیك بوو و ل دو مەتران دەردکەت، لەوا هەر مالەکێ بیرەك بۆ خۆ کۆلابوو و کارێن خۆ پێ دکرن.

نها ژمارا خەلکێ گوندی فەقسەینێ دگەهنە نێزیکی (٧٠) مالان، ل سێمێلێ ومسیریکێ دژین و چەند مال نها ژێ ل گوندینە و پەزی ب خوداندکەن. هەر چەند نها دو سێ مال ل گوندی دژین، لێ کارەب ل گوندی هەیە و هەر سال گوند دهێتە چاندن و هلاندن[٣١].

## گوندی حەزازا:

دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (١٠کم) باشوورێ باتێلێ، رامانا ناڤێ گوندی ژ (حەز) ب واتایا نیمچە شکەفتووك، یان ناوسکێن ژێر ئەرد یان کونێن دناڤ ئاخێ و خورستی هاتییە، (حەزازا) ئانکو کۆما حەزا و وەکو گوندی دبێژن نێزیکی (٣٠) حەز ل هەمی ئالیێن گوندی هەنە وەکوو حەزا سماقێ و حەزا کاڤرا و حەزا کەڤۆکا و حەزا کون حەفتیارێ و حەزا کانیا گوندی، و چەندین حەزێن دی.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ ئاڤزریکا میری

**باشووری،** گوندێن قەسرێ و کاڤل درێژێ

**رۆژهەلات،** گوندێن بامێرێ و فەقسەینێ

**رۆژئاڤای،** ئاڤخانێ

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

تەنێ کانییەکا ئاڤا تەحل بوو و ژ نەچاری ڤەدخوارن و ددانە پەزی ژی، و ئاڤا شرین ژ گوندی فەقسەینێ ب دەوارا دکێشان، لێ نها هێلەکا ئاڤا تایبەت ژ کۆمەلگەها سمایل ئاڤا دگەهیتە گوندی.

### سیمایێ گوندی:

ئاقارێ حەزازا دەڤەرەکا کلسی یە، لێ ئاخا وی یا زەنگینە بۆ تۆڤچینیێ، و چەندین گرك نهال ژی لێ هەنە، مینا گرێ هێلینا ڤرێ ل رۆژهەلاتێ گوندی و ڤووچکا خەج کەرێ ل رۆژئاڤایێ گوندی، ژ بلی چەندێن بێ ناڤ.

ژ نهالێن گوندی ژی نهالا قەرامیشلووكێ، كو مشە قەرام لێ شین دبوو ل باشوورێ گوندی، و وارێ خیزوویی.

بەری (تەخریب و تەعریب)ا سالا ١٩٧٥ێ، گوند تەنێ ژ دو مالێن سلێڤانەییان پێكدهات و ئەو ژی جۆتیاربوون، نها ژی دو مال لێ دئاكنجینە. گوند وەكو ملك یێ بنەمالا مەلا تەیبی بوو، ئەڤرۆ ژمارا خەلكێ گوندی دگەهنە نێزیكێ (٥٠) سەرۆك خێزانان، وەكو ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر تۆڤچینییا گەنم و جەهان و نیسك و نۆكان و كتاف و شەمبەلوول (حلبە) و گولبەرۆژان بوو، ژبلی خودانكرنا تەرشی ژ پەز و بزن و چێل و دەواران، و ژبلی ریچالی مفا ژ سێرگینێن وان ژی دهاتنە وەرگرتن.

ئاقارێ ڤی گوندی چەندین گیانەوەر و بالندە لێ هەبوون، مینا گورگ و رووڤی و كێڤریشك و مار و دووپشك و ئاسك و پۆر و قتك و سویسك و تیتیك و..... هتد.

## گوندی بامێرێ:

ب دووراتییا نێزیكێ (٤كم) دكەڤیتە رۆژهەلاتی باتیلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن باستكا ژێری و سوولاڤێ و شەكراڤا

**باشووری:** گوندێن كاڤل درێژ و قووتی

**رۆژهەلات:** گوندێ هەوریسكێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ حەزازا

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

بەری گوند بكەڤیتە بەر هەوا تەعریبێ ژ ٢٠ مالان پێكدهات، ژ سلێڤانەییان بنەمالا مەلا تەیبی بوو و گوند وەكو ملك یێ بنەمالێ و ژ كۆچەرێن هاجا بابكێ ئالا و بابكێ سێفا پێكدهات.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

رووبەرێ گوندی یێ كو ب كێری چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیكێ (٣٥٣٠) دۆنەمان و ژیارا خەلكێ وێ ب شێوەیەكێ سەرەكی ل سەر تۆڤچینییا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆكان بوو، هەروەسان تەرش و كەوال ژی ب خودانكرن و نیسك خوارنا وان یا سەرەكی بوو ل زڤستانێ و دەوین ل هاڤینێ، دیسان و ژبەر مشەبوونا ئاڤ و دەراڤان چاندنا دەرامەتێن هاڤینی ژی مینا، خیار و باجان و بامی و باجان رەشك و زەبەش و... هتد د هاتنەكرن، ژبلی چەندین جنیكێن هژیر و هنار و جۆرێن تری و هرمیك و خۆخ و دهەمان دەمدا بەرهەمێ برنج و كونجی و ماشان و گوند ب (كولندێ زەر) یێ ناڤدار بوو.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

بامێرێ گەلەك چاڤ كانی لێ هەبوون مینا: كانییا زەلاما و كانییا ژنان و كانییا شكەفتا قرێ و كانییا شێخوی و كانییا شكەفتا قاچاغا و بركا ئەحمەد چەلەبی و كانییا شكەفتا توێ و كانییا شكەفتا عەلو مەزنی.

### سیمایێ گوندی:

بامێرێ گرك و نهالێن خۆ هەنە، مینا (نهالا گوندی، نهالا شووركا كۆزێ، نهالا شوركا كەتیا، نهالا شێخ دەهاری، نهالا شكەفتا قرێ). ژ گركێن گوندی ژی (گرێ سمایل بابانا، دبێژن سمایل كەسەكێ زانابوو ل سەرێ وی گری هەمی زانست نیشا نەڤیێ خۆ دان، و گرێ تەیرا، گرێ خرابێ مەلای و گرێ لەودێ). دیسان چەند شكەفت لێ هەنە، مینا (شكەفتا گوندی، شكەفتا قرێ، وەكی دبێژن ب دەهان سالە قرێ شكەفتێ ناهێلیت، و شكەفتا عەڤدال ئاغای، شكەفتا توێ، شكەفتا دوشكەفت، شكەفتا عەلومەزنی، شكەفتا رەسوولی، شكەفتا قاچاغا).. ڤی گوندی چەندین جۆرێن دارێن خورستێ لێ هەنە، وەكو تاوك و هەلهەلۆك و گوهیشك و

كێرات.

دیسان ژ سیمایێن گوندی چەند خرابە لێ هەنە، مینا خرابێ ئاشكێ و خرابێ تل جنابی و خراب كولكی و دو ئاش ژێ لێ هەبوون و وەكو شوینوار مانە (ئاشێ خرابێ فەقسەینێ و ئاشێ تەعبیری)، هەر ژ شوینوارێن گوندی دو گۆر ژی هەنە (گۆرێ شێخ دەهاری و یێ خویشكا وی) و كەس نەوێریت چاندنا دەوروبەرێن وێ بكەت، و وەكی دبێژن شێخی دوعا كریە دبێژت: هەركەسێ زەڤیا من بكێلت دێ ژنكا وی مرت.

ڤی گوندی چەندین جۆرێن گیانەوەرێن كووڤی لێ هەبوون و ژ زار دەڤێ گوندیان هاتیيە كو خەزال هەتا سالێن پێنجییان ل سەدسالیا بیستێ ل دەشتێ هاتینە دیتن، دیسان گورگ و حەفتیار و تووری و رووڤی و ژیژی و مار و دووپشك و كێز و مێش و مۆر و تەیرو تەوال ژ قتك و سویسك و ددەمەكێ دا كەوژی لێ ڤەحەویاینە، ژبلی تیتیك و چووچك و قر و تەشی رێسك و گەلەك جۆرێن دی. گوند تا نها نە هاتییە ئاڤاكرن[32].

## كۆمەلگەها باستكێ:

كۆمەلگەهەكا ئاڤایە دكەڤیتە دووراتیيا نێزیكی (5كم) رۆژهەلاتی باتێلێ ل سەر ئاڤارێ گوندی گرەشی ل سەر جاددا ناڤدەولەتی یاكو زاخۆ و دهۆكێ پێكڤە گرێددەت، هەڤسنوورە دگەل گوندی گرەشی ژ ئالیێ رۆژ هەلاتی ڤە و ژ ئالیێ رۆژاڤایڤە دگەل سەنتەرێ ناحیێ و ل باكووری گوندی باڤیا و باشووری سەربازگەها موقبلێ یە، كۆمەلگەهـ وەكو ئاڤاهی ل سالێن حەفتیان د چوارچوڤێ پلانا ب عەرەبكرنا دەڤەرێ ب ناڤێ (مجمع الصديق) هاتییە ئاڤاكرن و عەشیرەتێن عەرەبێن (سنانی و الطائی و العبیدی) لێ هاتنە ئاكنجیكرن، پشتی سالا 1991ێ خەلكێ گوندێن باستكا ژێری و ژووری و گرەش و باڤیا و بالقووسێ و بامێرێ لێ دژین، واتە سلێڤانەیی و كۆچەرێن هاجا بابكێن ئالا و رەشا و سێفا و مالائوغزێ وچەند مالێن میسا رەشی و چەند مالێن بەرواری و رێكانی، ژیانا خەلكێ ڤێ كۆمەلگەهێ ل سەر تۆڤچینیێ و خودانكرنا تەرشی یە، دیسان گەلەك ژ خەلكی وی پێشمەرگە و فەرمانبەر و شوفێرێن لورێین مەزنن دناڤبەرا كوردستانێ و ئیران و تركیادا، ژبلی كارێن كاسبكاریێ و گەلەك كارێن دی و ژبەركو جاددا سەرەكییا ناڤ دەولەتی كۆمەلگەهـ بڕ دبیت، و دكەتە دو بەش، و گوند ژێ بوویە دو پشك ب ناڤێن باستكا ژێری و باستكا ژووری و نێزیكێ (250) خیزانان ل ڤێ كۆمەلگەهێ دژین و ئاڤا وێ یا سەرەكی ئاڤا ژێر ئەردە.

## گوندی باستكا ژێری:

گوند دكەڤیتە دووراتیيا نێزیكی (3كم) رۆژهەلاتی باتێلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**: گوندێ باستكا ژووری

**باشووری**: گوندێن بامێرێ و هەورێسكێ

**رۆژهەلات**: گوندێن موقبلێ و سەرووكانی

**رۆژئاڤای**: باتێلێ و سوولاڤێ

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

گوندی باستكێ ژ 33 مالان پێكدهات و نها گوندەكێ خرابەیە، پێكهاتا گوندی ژێ كۆچەرێن هاجا بابكێن- رەشا، سێفا، ئالا، و بنەمالا ئوغس بوون.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا وان ب شێوەیەكێ سەرەكی ل سەر تۆڤچینیێ بوو، ژبەر كو وارەكێ تێر ئاڤ بوو دارێن فێقی ژێ مینا هنار و تری و خۆخ و مشمش و حولیك و هژیر و توی و بیهـ و سپیندار و... لێ دهاتنە چاندن، ژبلی بیستانێن كەسكاتیێ وەكو باجان و خیار و باجان رەشك و بامی و... هتد. و رووبەرێ ئاخا ب كێرێ چاندنێ دهێت نێزیكێ (1938) دۆنەمانە، سەرەرای بەرهەمهینانا روونێ پەزی و ماست و پەنیر و نیڤشك و ژاژی و هێك و چێكرنا سندانێن قەلیێ.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

نهالا گوندی وارەكێ ئاڤی بوو و نێزیكێ ٣٥ تا ٤٠ كانییێن ئاڤێ لێ هەبوون، وەكو (كانییا خشتانا، كانییا مووسای، كانییا شركێ، كانییا رەشیدێ مرادی، كانییا علی شەنگوی، كانییا عەڤدلەی، هەردو كانییێن سامی، كانییا زەلاما، كانییا حەلانی، كانییا جونیكا، كانییا خەلیلی، كانییا سلێمانی، كانییا حەجی محی، كانییا مخەلی، كانییا سمایلێ ئەحمەدی، كانییا كۆزێ، كانییا دركێ، كانییا یونسی) و چەند ژوان تا رۆژا ئیرۆ ئاڤی نە و ل نهالا گوندی سێ ئاش ژی هەبوون، ئاشێ خرابەی و ئاشێ چەمێ ئاڤووی و ئاشێ سكرێ خوارێ.

پشتی سالا ١٩٧٥ێ گوندی باستكێ ژی كەتە بەر هەوا (تەخریب و تەعریب)ێ و خەلكێ وی دەربەدەری باژێرێن سێمێلێ و زاخۆ بوون و نها ژی گەلەك ژوان ئاكنجییێن وان جهانن، ژبلی كۆمەلگەها باستكێ و باتێلێ ، ڤی گوندی نهالێن باش و گرو و زۆرك ژی لێ هەنە، مینا: نهالا عەڤدال ئاغای، نهالا كانی دركێ و وارێت شامیێ و نهالا ژن ومێرا و گرێ دووبەلانا و كووزێ و خرابێ سالحێ ئیسڤی و خرابێ محومرادا و گرێ مخەلی و ملا شیڤە سووری و ملا شكەفتێ.

ژ شكەفتان ژی تەنێ شكەفتا مەزن دناڤبەرا گوندی بامێرێ و باستكێ دا هەیە، فرەهییا وی دگەهیتە نێزیكێ ٢٠٠م٢. ڤی واری گیانەوەرێن كووڤی وەكو ئاسك و قتك و پۆر و سووسك و ژیژێ و لەگلەگە و ئەلهو و مشك و مارو دووپشك ژی هەبوون. ژمارا خەلكێ گوندی نها ژێدەبووینە و ژ ٣٣ مالان بووینە ١٨١ سەروك خێزان[٣٣].

## گوندی باستكا ژووری:

گوند دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (٤كم) رۆژهەلاتێ باتێلێ، ناڤێ گوندی وەكو ڤەدگێرن ژ ناڤێ قرالەكی ب ناڤێ (باستایێ) هاتییە، لێ چ بەلگە بۆ ڤێ چەندێ نینن. لێ ژ بەر دیتنا چەند پارچەیێن شوینوارێن كەڤن مینا پەیكەرێ باستكێ[٣٤] دیرۆكا وی دزڤرینە سەر دەمێ قرالێ ئەكەدی (نرام سین) (-٢٢٩١ ٢٢٥٥ پ. ز)[٣٥].

### سنوورێن گوندێ:

**باكووری،** گوندێ بالقوسێ

گرێ باستكێ یێ شوینواری ژ ئالیێ رۆژاڤای ڤە هاتییە وێنەكرن



**باشووری:** گوندێ باستكا ژێری
**رۆژهەلاتی:** گوندێ گررەش
**رۆژئاڤای:** باتیلێ

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

تا سالێن چلان گوند ژ موسلمان و ئەرمەنان پێكدهات وپشتی باركرنا ئەرمەنان گوند ما موسلماننشین، ژ سلێڤانەییان بابكێ قەردەشا و مالەكا میسا رەشــی و مالەكا شرنەخی.د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧یدا ئاماژە ب باستكا سەری (باستكی علیا) هاتیەكرن د وێ سالێدا هژمارا خەلكێ وێ ١٢٥٥ كەس بوو[٣٦]. د سالێن حەفتیاندا گوند ژ نێزیكێ (٥٠) مالان پێكدهات، ل سەرێ گرێ باستكێ ئاكنجێ بوون و ژیارا وان هەمــوو ل سەر تۆڤچینیێ و خودانكرنا تەرشی بوو و رووبەرێ ئەردێ گوندی نێزیكی (٢٠٢٠)دۆنەمان بوو. باستكێ جهێ رابین و روونشتنا رێڤنك و بازرگانان بوو لەوا تا سالێن حەفتێیان ژی ل دووریانا گوندی خوارنگەهـ و چایخانا لێ هەبوون، دیسان نڤیسینگەهەكا تایبەتا هازم بەگێ ژی ل دووریانێ بۆ جەردكرن و ڤاڤارتنا ترومبێلێن بارهلگرێن دار سپینداران هەبوو.

### سیمایێ گوندی:

چەند نهالەك ئاقاری گوندی دكەلێشن وەك: نهالا عەڤدالا ئاغای و نهالا خشتانا و كووربازیكێ، ژبلی گرێ باستكێ و گركێ باڤیان، دیسان دو گۆرێن كەڤن ژی ب ناڤێن (سەید بەتال) ل رۆژهەلاتێ گوندی ل بەر جادا سەرەكیا زاخۆ و دهۆكێ ب دووراتیا نێزیكێ (٥٠م) و گۆرێ (شێخ بایەزید) ل قونتارا گرێ باستكێ ژ ئالیێ رۆژهەلاتێ ڤە. و ئەڤ هەردو گۆرە دبەر قیبلەنە.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی كانییا ژنان و كانییا زەلامان بوون نها دهشكن.

ئاقارێ ڤی گوندی چەندین جۆرێن گیایێن بهاری لێ هەبوون، مینا كاری و كەنگر و تۆلك و سیرك و گوورسك و قوراد، هەر وەسان چەندین جۆرێن گیانەوەر و بالندەیان، مینا كێڤریشك و رووڤی و گورگ و بەق و كویسەلە و قتك و تیتیك و قر و لەكلەگە و قورت و چەندین گیانەوەرێن دی.

ژبەر نێزیكبوونا گوندێ كەڤن ژ كۆمەلگەها باستكێ لەوا گوندی كەڤن نەهاتییە ئاڤاكرن، تەنێ سەرێ گری ل هاڤینان بۆ كۆمكرنا دەخل و دانی ب كاردهێت، ژمارا خێزانێن خەلكێ گوندی نها نێزیكێ (١٨٠) خێزانان و هەمــوو ئاكنجیێن كۆمەلگەهێن باستكێ و موقبلێ و سێمێلێ و بالڤۆسێ نە، و هەرسال گوندی شیندكەن[٣٧].

### كۆمەلگەها سمایل ئاڤا:

كۆمەلگەهـ دكەڤیتە دووراتیا نێزیكێ ٣كم رۆژاڤایێ باتێلێ و بۆ عەرەبان ژ عەشیرەتێن (العجاج و اللویزی و الشهوانی و الشرابی) ب ناڤێ (الربیع) هاتبوو ئاڤاكرن، خەلكێ وی گوندی ل سالا ١٩٧٥ێ ژبەر هەوا ب عەرەبكرنێ ئاوارەی بازێرێن زاخۆ و سێمێل و چەندین جهێن دی كرن. وەكی گوندی ڤەدگێرن سمایل ئاڤا پاشناڤەكە بۆ (سمایلێ حەكیم)[٣٨] یێ كو گوندی كەڤن ب ناڤێ وێ هاتییە ناڤكرن، نها نێزیكی (١٩٦) ئاڤاهییان بخۆڤە دگریت و (٢٣٥) خێزانن كو دبنە نێزیكی (١٢٥٥) كەس، و پێكهاتا وێ هەمــوو (سلێڤانەیی نە) ژ بابكێ (شەمسا) و خەلكێ كۆمەلكەهێ خەلكێ گوندێن گروسمان و شەكراڤا و سمایلاڤایا كەڤن بخۆڤە دگریت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ كۆمەلگەهێ:

ژین و ژیارا وان ب گشتی ل سەر تۆڤچینیێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی و پەلەوەرانە و رووبەرێ ئاخا ب كێری چاندنێ دهێت نێزیكی (١٤٠٠) دۆنەمانە، دیسان هندەك ژ خەلكێ گوندی فەرمانبەرن و هندەك ژێ مژوولی كارێن تایبەتن وەكو چاندنا كەسكاتییا مینا كرتووپ و خیار و پیڤاز... هتد. كۆمەلگەهێ پرۆژێ خودانكرنا گۆلكان ژی لێ هەیە و ب دەهان گۆلك تێدانە. دیسان كارگەهەكا

بچویك بۆ چێکرنا سیمێ (پەژانان) ژی لێ هەیە، و ب دەهان دارێن سپیندارا لێ دهێنە چاندن.

سیمایێ سمایل ئاڤا پێکدهێت ژ کانی و و گرك و زۆرك و.هتد.

**کانیێن سمایل ئاڤا:**

کانیا (بای) بۆ چارەسەریا نەخۆشیا (بای) دهاتە بکارهینان، کانیا (عەیشێ)، کانیا (شەرەفی)، ئەڤ هەرسێ کانی یە تا نها ژی ئاڤی نە. ژ نهالان ژی (کێشێ) ژبەر کو هەردەم کێشا پەزی بوو بەرەڤ گوندی و نهالا (ئاڤکا زراڤ) و وارێ (کـوورەك) و (زۆرکێ رەزا) یێ نها ل هنداڤی کۆمەلگەها سمایل ئاڤا. ژبەر گوندی سمایل ئاڤا نێزیکی کۆمەلگەهێ یە، تا نها ژی نەهاتیبە ئاڤاکرن[٣٩].

## گوندی سوولاڤێ:

گوندەکێ دەشتی یە دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (٢کم) باشوورێ باتێلێ. سەبارەت ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا سوولاڤەکا ب بلنداهییا نێزیکی (٨ - ١٠)م هاتی کو تا نها یا مای و سەرەکانیا ئاڤا وێ ژ ناڤ ئاقارێ گوندی و باتێلێ دهێت، و دناڤ ئاقارێ سوولاڤێ را دەرباز دبت تاکو دگەهیتە گوندی فەقسەینێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** کۆمەلگەها باتێلێ

**باشووری،** گوندێ فەقسەینێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێن بامێرێ و باستکا ژێری

**رۆژئاڤای،** کۆمەلگەها سمایل ئاڤا و گوندی شەکراڤا

گوندی سوولاڤێ میری بوو، ئانکو ملك یێ دەولەتێ بوو و ئێکەم کەس لێ جهگیر بووی (براهیمێ عەمو) یێ سوولاڤێ بوو ژ عەشیرەتا سلێڤانەییا و ژبەر چەروانی و ئاڤا وێ یا خۆش بۆ چەروانێن کۆچەران و هەمی بهاران رەشمالێن خۆ ل ئاقارێ سوولاڤێ ڤەددان و وەکو گوندی ڤەدگێرن ئەوان (قەمچوور)[٤٠] ددا حکومەتێ تاکو عیراق بوویە سیستەمێ کۆماری، سوولاڤ ژی ل سەر ناڤێ کۆچەرێن هاجا بابکێ سێڤا، کو باپیرێ وان یێ مەزن (سمۆیێ شینۆیێ برۆێ) هاتە توومارکرن، و نێزیکی (٣٥) مالان لێ ئاکنجی بوون، ژیارا وان ل بەری هەر تشتی ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو، هەر ژ پەز و بزن و (چوورکان) کو مەرەزێ وی دفرۆتنە مەسیحییان و مەرەزێ سپی بهاتر بوو ژ یێ سۆر، و هەر مالەکێ نێزیکێ (٧٠٠ - ٨٠٠) سەرێ حەیوانا هەبوو، و هەر سال ب سەدان کیلوێێن شیری و رێچالی بەرهەم دهینان، چ بۆ خارنێ و چ بۆ فرۆتنێ و باراپتر د فرۆتنە خەلکێ تلکێف و تلسقوفێ بەرامبەری سابوون و تایت و قوماش و نیسك و نۆکان.

پشتێ ئاکنجێ بوونێ و تێکەلییا وان دگەل خەلکێ دەڤەرێ، هێدێ هێدێ پووتە ب ئالیێ چاندنێ ژی کرن و یەکەم مال دەست ب تۆڤچینیێ کری بنەمالا (رەشو)ی بوو، و دووڤدا هەمیان دەست پێ کر، و هەڤجار ژ براهیمێ ئاسیهی دکرین و گێسن ژ زاخۆ دهینان، و تۆڤ ژ تلەعفەرێ ب زێر و مەجیدیان د کرین، تاکو شیاین سال ب سال تۆڤێ خۆ راگرن و ئێدی نەکرین، و پاشان هێدێ هێدێ تۆڤچینیێ جهێ خودانکرنا تەرشی گرت.

**ژ تیتالێن خەلکێ گوندی:**

پشتی بوورینا رۆژێن کاری و وەستیانا زەلامان ئێڤاریان برکانێ و بەریکانی دکرن و ل هەموو شەڤان ل مالەکێ کۆم دبوون و گوهداریا چیرۆکێن مام حامو و حەمۆیێ مووسای دکرن، و گەلەك جاران ستران دگۆتن و هەمیان تا درەنگی شەڤێ ل ئێك ڤەدگێران، و داوەتێن وان ژی سێ رۆژ و سێ شەڤان دکرن وگوندییان پشکداری د مێهڤانداریا خەلکی دا دکرن، ژبلی سەر سوبەهیکێ کو ل مالا زاڤای بوو، و هینگێ مەهرا ژنان دگەل زێر و تدارەکان دگەهشتە نێزیکێ (٤٠-٥٠) دیناران، جلکێن زەلامێن وان ژی شەل و شەپك بوون، یان شەل رەنگەك و شەپك رنگەك یان گوملەکەك ل سەر شەلی بوو و کالکێت چەرمی ل پێ خۆ دکرن، دیسان ژنان ژی ب کراس و کورتەك و پووشی و سەردەلنگ و پێلاڤێن لاستیکی خۆ دخەملاندن.

**سیمایێ گوندی:**

سوولاڤێ یا ل سەر گرەكێ بلند ل هنداڤی نهالەكا كوور و یا زالە ل سەر هەمی ئاقارێ خۆ، سوولاڤەكا ئاڤێ ژكەڤندا سینگێ گوندی دخەملینت و تا ئیرو یا بەردەوامە، ژێدەرێن ئاڤا گوندی، كانییا زەلاما بوو نها نەمایە، لێ بەرێ دكەتە سەرێ سوولێ، و كانییا ژنان كو هژیرەكا مەزن ل هنداڤ كانیێ یە و كانی جوونیك و كانیكا حەجی رەشووی ل باكوورێ گوندی و كانیكا شكەفتێ و كانیكا حەمو چەلویا و كانیكا ناسۆی و كانییا عەلو مەزنی. ڤی گوندی زۆرك و گر ژی هەنە، مینا گرێ سوور و گرێ قەواغا یێ كو بەرمایكێن كەڤن ژێ دەردكەڤن و گركێ وارێ رەش و چەندین گر و زۆركێن دی. ژ جهـ و نیشانێن دی ل گوندی بەر حێشترك كو شێوێ حێشترێ ددەت و د هەمبێزا گرێ سوور دایە و بەر كوتلك و وارگەهێ فاتویێ، و شكەفتا حەمو چەلویا دناڤبەرا گوندی و گوندی بامێرێ و شكەفتا كەلەشی و شكەفتا كووركا سماقێ. ئەڤ گوندە پشتی هەوا تەعریبێ نەهاتییە ئاڤاكرن و نها ژمارا خەلكێ گوندی دگەهنە نێزیكێ (١٥٠) خێزانان و ئاكنجییێن زاخۆ و سێمێل و باتێلێ نە. هندەك ژوان خودانكرنا تەرشی دكەن و پتریا وان سالانە وارێ خۆ شین دكەن[٤١].

## گوندی شەكراڤێ:

شەكراڤێ ب دووراتییا نێزیكێ (٧كم) دكەڤیتە باشوورێ سەنتەرێ باتێلێ، نێزیكی ١٥ مالان ژ عەشیرەتا سلێڤانەییان لێ د ئاكنجی بوون، ل سەر ناڤێ گوندی ژی دو بۆچوون هەنە، ئێك كو شەكر ناڤێ وی زەلامی یە كو گوند ئاڤاكری و یا دووێ ژ شریناهیا ئاڤا وێ هاتییە ژبەر كو گەلەك گوندێن دەوروبەر ئاڤا وان یا تەحل بوو.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** باتێلا و سمایبل ئاڤا

**باشووری،** گوندێن حەزازا و بامیرێ

**رۆژهەلاتی،** سولاڤێ

**رۆژئاڤای،** ئاڤزریكا میری

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

كانییا دۆرێ بوو كو ئاڤا وێ یا كێم بوو و دۆر لێ دگرتن، و كانییا مەلای (مەلا براهیم)ی، كانییا كودكێ و كانییا حاجی و كانییا سەری و ئاڤا ڤان هەموو كانییان د چوو نهالا گوندی و جووەكا باش ژبەر دچوو و چەندین جنیكێن فێقی و كەسكاتی ل بەر وێ ئاڤێ دهاتنە شینكرن.

ڤی گوندی نهال و گرك و زۆرك و كانی و شكەفت ژی هەنە، ژ نهالان: نهالا درێژا گوندی كو دكەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی فەقسەینێ دا، كو نهالەكا هشك و بێ ئاڤ بوو و نهالا شەكراڤ كچكێ و دیسان گركێ تەیران ل هنداڤی گوندی كو جهێ لیسێ تەیرێن نێچیرێ بوو و ملا مخەلێ گارانێ و هێلینا تەیرێ و گەلەك گرێن بێ ناڤ، دیسان زیارەتۆك ل سەر رێكا گوندی كاڤل درێژێ هەبوون ژ چەند گۆران پێكدهاتن لێ پشتی تەعریبێ هاتنە ژناڤبرن، و شكەفتا (محەمەد ئوسمانا)[٤٢] خالەكا دێ یە ل گوندی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژێدەرێ سەرەكیێ ژیارا ڤی خەلكی ل سەر تۆڤچینییا جەهـ و گەنمان بوو و ب ئالاڤێن كەڤن و رووبەرێ ئەردێ د دەست حوكمەتێ دا دگەهشتە نێزیكی (٢٥٤٤) دۆنەمان و خەلكێ گوندی دبێژن هەر سال مە شەش دینار ددانە حوكمەتێ، تا عیراق بوویە كۆماری و ئەرد ل سەر ناڤێن حەفت مالان هاتییە تووماركرن و نها ژی یێ وایە.

خودانكرنا تەرشی ژی دەرگەهەكێ دی یێ ژیارا خەلكێ شەكراڤا بوو و هەر مالێ گەلەك پەز خودانكرن و شیر و ریچال بەرهەم دهینان و پەنیر د فرۆتن و روون تێرا خوارنا خۆ هلدگرتن.

**تیتال،** داوەت و دیلان و شەڤبێری و چیرۆك و چیرۆكبێژی و ستران و سترانبێژ و دستارهێرك ئەڤە

هەموو تیتالێن خەلکێ وێ بوون مینا دەڤەرێ، و بۆ هەرکارەکی حازربەکا تایبەت بۆ دهاتە کرن، داوەتەك ل گوندی هەبا هەمیان ب هەمی رەنگان پێشوازیا مێهڤانان دکرن و ئەو ل شاهی هەموو مالان بوو.

گوند پشتی سالا ١٩٧٥ێ کەتە بەر هەوا تەعریبێ و خەلکێ وی دەربەدەری باژێرێن مووسل و زاخۆ و دهۆکێ بوون، نها ژمارا خەلکێ گوندی پترن ژ سەد مالان و پتریا وان ل کۆمەلگەها سمایل ئاڤا دژین، ئاخا شەکراڤا نها ددەست بنەمالێن کەڤن دایە و هەر سال دهێتە شینکرن.

## گوندی باتێلێ:

باتێلێ دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (١کم)ێ باکوورێ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی وەکی مرۆڤێن کەڤن دبێژن ژ بلنداهیا جهێ گوندی هاتیە کو هەمی دەما با کێش بوویە و ل هاڤینان جهەکێ هین بوو. پێکهاتا گوندی ژ (٣٣) مالێن سلێڤانەییان بابکێ مەرعانی[43] پێکدهات.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن ئاسهێ و قەرقورێ و بالقۆسێ

**باشووری،** گوندێن شەکراڤا و سولاڤێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ باستکێ

**رۆژئاڤای،** گوندێن گر ئوسمانا و سمایل ئاڤا

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا وان ب شێوەیەکێ سەرەکی ل سەر تۆڤچینیێ بوو، و رووبەرێ گوندی یێ ب کێری چاندنێ دهێت نێزیکێ (٢٦٣٨) دۆنەمانە، گوندی ڤەدگێرن کو بەری ئالاڤێن پێشکەفتی بکەهنە دەستێ جۆتیاران رووبەرێن مەزن ژ ڤێ دەشتێ ب گیا کرنێ[44] نخافتی بوو و نەدشیان شینبکەن تاکو ماکینێن نوی گەهشتینێ، ئێدی چاندن پێشکەفت و ژبلی چاندنێ خەلکێ گوندی تەرش و کەوال و مێشێن هنگڤینی ژی ب خوداندکرن. نێچیر و سواری ژی ئێك بوو ژ ئارەزووێن خەلکێ گوندی، و سواری و بەریکانا هەسپ و ماهینان هەڤرکێ ل سەر دهاتەکرن، نموونە ل سەر وێ چەندێ ئێك ژ باپیرێن مەرعانیان ب ناڤێ (حەجی عەلی) بوو، کو ل لۆتکا سڤکاتی و لەزگینیا کحێلا وی شەلێ خۆ ل سەر پشتێ دگوهارت و دشیا گومتلێن ئاخێ راکەت و دبن زکێ وێرا بێت و بچیت، و خەلکێ گوندی ماهینێن کحێل و رەسەن پەیدا دکرن و تاژی بۆ نێچیران ب خودان دکرن.

### سیمایێن باتێلێ:

گوند د کەڤیتە سەر بلنداهیا گرەکێ مەزن و یێ زالە ل سەر سەنتەرێ ناحیا باتێلێ، پێکهاتیە ژ و گر و کانی و جنیکێن خۆخ و مشمش و هنار و تری و کەسکاتیا و...هتد.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

**ژ کانییان،** باتێلێ پێکدهات ژ کۆمەکا کانییان، مینا کانیا ژنا و کانیا سەرەگەرێ (بۆ ئاڤدانا دەرامەتی و تەرش و دەواران) و کانیا گەرێ و کانیا زەلاما و کانێ کوتکێ، و ژ ڤەرێژا ئاڤا نهالا گوندی بۆ ئاڤدانا جنیکان، سێ سکرێن ئاڤێ د نهالێ دا هاتبوون چێکرن، وەکوو سکرێ ئەحمەدێ حەجی عەلی و سکرێ حەجی ئەمینی و سکرێ ئەحمەدێ حەجی مصتێ.

**ژ نهالان ژی،** نهالا جنیکا کو یا تێر ئاڤ بوو ل رۆژاڤایێ گوندی و ب کەسکاتی یا نخافتی بوو، و شوورکا عەرەبا ل رۆژهەلاتێ گوندی و ل هاڤینان جهێ ڤەحەواندنا عەرەبان بوو، دیسان شوورکا کانی کوتکێ هەر ل رۆژهەلاتێ گوندی و بەرەڤ باشووری دچوو تاکو شوورکا کەدیا ل هنداڤی گوندی سوولاڤێ، ئەڤ و کانیکە د بەرنیاس بوون ب هەبوونا بالندێ قتکی، و ل داویێ نهالا گەوریا باتێلێ.

ڤی گوندی زۆرك ژی هەنە، مینا زۆرێ گۆلکا و زۆرێ دارێ دناڤبەرا ئاڤارێ گوندی و گوندی ئاسیهێ و

زۆرێ گرۆسمانی و زۆرێ كون مستو یێ كو نها كەلایەكا لەشكەری ل سەرە.

ژ تیتالێن ڤی گوندی خودانكرنا رێنجبەران بوو كو ئێك بوو ژ پێدڤیێن وی سەردەمی ب تایبەت بۆ وان بنەمالێن گەلەك كار هەین ژ كێلان و راكرنا دەخل و دانی و هەبوونا تەرشی و...هتد. و وی رێنجبەری وەكی گرێبەست دگەل خودانێ ملكی بۆ شەش مەهان گرێددان دگۆتنێ (قەول). د وێ چەندێ دا وی ئەرك و مافێن خۆ دگەل خودانێ ملكی هەبوون، ژ ئەركێن وی چوونا دارا ژ چیای و چوونا ئاشی و هێرانا هەڤرانا و ئالفكرنا دەواران و جۆت و جۆبار و دار شكاندن و...هتد. ژ مافێن وی ژی دەستەكێ جلكان بۆ دهاتە كرین، دیسان زەكات و تێرا قوبتێ وی و زارۆكێن وی دەخل و دان ددانێ، ئەگەر یێ هەژیبا، خودانێ ملكی كچەكا خۆ ژی لێ مەهر دكر و ئەڤ چەندە ل هەموو دەشتا سلێڤانەییان هەبوو.

ل سەر داوەتان ژی پتریا داوەتێن وان ل پاییزان دهاتنە كرن، كو وی دەمی كار و كریار و كرین و فرۆتن ب داوی دهاتن و دەم بەر ب زڤستانێ ڤە دچوو، و هەمی حازری ب ساناهی.

ژیارا گوندییان ب ڤی ئاوایی بوو تا هەوا تەعریبێ ل سالا ١٩٧٥ێ و خراب كرنا گوندی، و گوند ل سەر چەند عەشیرەتێن عەربان هاتە پارڤەكرن و خەلكێ گوندی دەربەدەری باژێران بوون، پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ خەلكێ گوندی ب وارێ خۆ شادبوونەڤە و نها ل سەنتەرێ ناحیێ دژین[٤٥].

## گوندێ گرەشی:

گوند دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (٧كم) رۆژهەلاتی سەنتەرێ باتیلێ ل سەر جادا سەرەكییا زاخۆ- دهۆك. ناڤێ گوندی ل دویڤ بۆچوونێن گوندییان واتە گرێ رەش، یان وارێ رەشە. دیرۆكا ئاڤاكرنا وی دیار نینە، لێ گوند وەكو ملك یێ (نەجمێ عەبدی خەزالا)یە هەر ژ بنەمالا (مەلا تەیب)ی یە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن مالهەسن و باڤیا
**باشووری،** گوندێ سەروكانی و سەربازگەها موقبلێ
**رۆژهەلاتی،** گوندێن كواشێ و باترشایێ
**رۆژئاڤای،** بالقوس و كۆمەگەهێ باستكێ

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

هەموو سلێڤانەیی و چەند مالەكێن كۆچەرانە، گوند بەری هەوا تەعریبێ ل سالا ١٩٧٥ێ ژ (٣٠ - ٤٠) مالان پێكدهات ، لێ خەلكێ وی پشتی هەوا ب عەرەبكرنێ دەربەدەری باژێرێن دهۆك و زاخۆ و مووسل بوون، پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ و خەلكێ وی ڤەگەریانە سەر ئاخ و وارێن خۆ و نها گوند ئاڤایە و پتری (٦٠) مالان لێ دژین.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل بەرێ و نها ل سەر تۆڤچینییا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆكانە و ئەگەر ل بەرێ ب ئالاڤێن كەڤن بن، لێ نها ب ئالاڤێن نوی نە و رووبەرێ ئەردێ ب كێر چاندنێ دهێت ل گوندی نێزیكێ (٧٠٠٠) دۆنەمانە، دیسان خودانكرنا پەز و بزنان ژی ئێكە ژ رێكێن ژیارا چەند مالان. نها كارگەها غازێ یا ل ڤی گوندی هەی و چەندین كارگەهـ و عومبارێن كومپانیان ژی لێ هەنە و ئەو ژی دەرگەهەكێ دی یێ ژیانا هندە كەسێن دی یە.

ژێدەرێن ئاڤێ ل بەرێ تەنێ بیرەك هەبوو كو ب دەست هاتبوو كۆلان، و هەموو دەمان ژنكان ئاڤ ب رێكا جەودك و گۆزك و جەران ب ملێن ژنان یان ب رێكا راوی و دەواران دكێشان.

### سیمایێ گوندی:

گوند جهەكێ دەشتە و راستكەهیەكا فرەهە و ئاخەكا باشە بۆ چاندن و چەراندنێ، و تەنێ نهالەك دناڤ ئاقارێ گوندی دا ب ناڤێ (گەركێت گرەشی) هەیە و ئەو ب درێژیا ئاقارێ گوندی دا دچت و نها كۆمەلگەها باستكێ و گوندی ژێك جودا دكەت[٤٦].

## گوندێ كولێمنێ:

ژ گوندێن ئاڤی ل دەڤەرا سلێڤانەییان، دكەڤیتە

دووراتییا نێزیکێ (١٢کم) رۆژهەلاتی باتێلێ، ناڤێ گوندی کولێمنێ (دناڤ نەخشەیان دا)، یان کو هندەك دبێژنێ کولێبنێ دیار نینە کا ژ چ هاتییە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ موقبلێ

**باشووری:** گوندێ کەردیزێ (سەر ب سەنتەرێ سێمێلێ ڤە)

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ماڤانێ (سەر ب سەنتەرێ سێمێلی ڤە)

**رۆژئاڤای:** گوندێ هەوریسکێ

گوند وەك مولك یێ بنەمالا شەمدین ئاغای و خەلکەك ژ سلێڤانەییان بنەمالا ئیبۆی و ترکژیا و باڤیا و کۆچەرێن رەشا و مەهمەدا و فەللەیێن تیاری لێ کومبووینە، و مێژوویا هاتنا وان یا دیار نینە، لێ فەللەیێن تیاری بەری هەمیان پەیوەندی دگەل بنەمالا شەمدین ئاغای کرین و بنەجهـ بووین.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکی گوندی:

بەری هەر تشتی ل سەر چاندنێ بوو، وەکو چاندنا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆکان و دەرامەتێ ئاڤی مینا برنجی و ب دەهان جنیك و بیستانێن کەسکاتی کو ل بەر ئاڤا نهالێ دهاتەکرن، هەر وەسان تەرش و تەوال و مێشێن هنگڤینی دهاتنە ب خودانکرن و رووبەرێ ئەردێ گوندی نێزیکی (٣٢٠٠) دۆنەمانە، ژوان نێزیکی (٣٥٠) دۆنەم کەتیە بەر سەربازگەها لەشکەری (معەسکەرێ موقبلێ)ڤە[٤٧]. پشتی راستڤەکرنا چاندنێ یا یاسایا ژمارە (٩٠) یا سالا ١٩٧٥ێ ئەڤ وارە ل سەر جۆتیاران هاتە پارڤەکرن و نها (٨٠) جۆتیار ل گوندی هەنە و هەر یەکی نێزیکی (٤٠) دۆنەمێن ئەردی دەستاندایە، و مفا ژ ئاڤا نهالا گوندی دبیتن کو ژ بنێ چیای دەست پێ دکەت و ل سەر ئاڤا مەزن ب داوی دهێت، و کەڤنێن گوندی دبێژن ئەگەر مرۆڤی باش کارێ خۆ نەکریا نەدشیا ژ ڤێ نهالێ دەرباز ببیت و برنج و کونجی و ب دەهان بەرهەمێن دی یێن ئاڤی ژ ڤێقی و سپینداران ل بەر دکرن، لێ نها و پشتی کارگەهـ ل ئاڤارێ گوندی کواشێ هاتینە دانان ئەو سەروبەر نەمایە و ژینگەها وێ تەمام پیس بوویە و ئەو پری بەرمایکێن وان کارگەهانە و هەر تشت نها ل رەخ و دۆرێن وێ هشك بووینە.

## سیمایێ گوندی:

ژبەر جهێ گوندی یێ راست و هەبوونا ئاڤێ ل سالێن حەفتیان سەربازگەهەکا مەزن لێ هاتە دروستکرن و نها فرۆکخانەیا نیڤ دەولەتیا دهۆکێ ل سەر دهێتە دروستکرن.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

چەندین کانی هەبوون، مینا کانییا گوندی ل رۆژهەلاتێ گوندی و تانها ب ئاڤە، و کانییا شڤانا (کو پەز ل وێرێ مەخەل دبوو و جهێ بێرێ بوو) ل باکوورێ گوندی و نها یا هشکە و کانییا کومەلێ یاکو دکەڤیتە باشووری دناڤبەرا گوندی و گوندی کەردیزێ و کانییا قەشەی هەر ل باشووری و مەسیحییان ب کانییا پیرۆز ل قەلەمدان و هەموو ئێك شەمبیان سەرەدانا وێ دکرن و ئاڤ ژێ ڤەدخوارن. دیسان ژبەر نێزیکبوونا ئاڤا ژێر ئەرد چەندین بیر ژی وەکی ژێدەرەکێ دی یێ ئاڤا گوندی هاتبوونە کۆلان. مینا بیرێن عەلیێ ئیبوی و محویێ ئیبوی و ئەحمەدێ ئیبوی و چەندین بیرێن دی بۆ بیستانان، مینا بیرا صوفی عەگیدی وهەردو بیرێن عەلیێ ئیبوی و ئەحمەدێ حەجی خەلیلی و بیرا عەمەرێ ئیبوی.

ڤی گوندی چەند بلندی ژی هەنە، مینا خرابێ گوندی کو دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و وەکو دیار جهەکێ کەڤنە ژبەر خۆلی مشە لێ دەردکەڤیت و نها گۆرستانا کولێمنیانە، و خرابێ (ترتالی) هەر ل رۆژهەلاتێ گوندی و بیرا کەڤنێن گوندی دهێت کو دیوارێن وی خرابەی د بلند، لێ نها چ شوینوارێن وی نەمانە. دیسان خرابێ (ساوە)ی و ژ ناڤی ئەو ژی یێ مەسیحییانە و ئەڤ وارە ب ئاخا رەش دهێتە ناسکرن. دیسان ژ بلنداهیێن گوندی ملا رەش، کو دکەڤیتە

ئالیێ رۆژاڤا ئالیێ گوندی هەورێسكێ، و ملا وارێت عەرەبا، ل رۆژهەلاتی و دبێژن عەرەبان دەمێ پەزێ خۆ دهینان كوینێن خۆ ل ڤێ ملێ ڤەددان، و گركێ كومەلێ یێ دكەڤیتە رۆژهەلاتێ، و چەمێ نێرگزا ل رۆژاڤای و تا نها ژی پری نێرگزە. دناڤبەرا گوندی و گوندی مەروینێ دا بەرەكێ مەزن هەیە دبێژنێ بەرێ خزینێ ژبەر ئەو زەڤیا ئەو بەر ل سەر زەڤییەكا ب خێر و بێرە مینا خزینان، لەوما ب خەزینێ هاتییە ب ناڤكرن. ژ نهالێن گوندی نهالا گوندی و شوینوارێن دو ئاشا لێ هەنە كو وەكو دیار ب ئاڤێ كاردكرن، و نهالا ساوا یاكو ژ بنێ چیای دەست پێدكەت و تاكو دگەهتە ئاڤێ، وەك ل رۆژاڤایێ گوندی هەیە و گوندیان ئاڤ ل وێ ئاڤێ كربوو ب ئاڤا كووڤی، و نهالا بەرێ خزینێ ل رۆژهەلاتێ گوندی و ئەوژی ژ كواشێ دەست پێ دكەت و د گوندیرا دەربازدبیت.

گوند چەندین جاران هاتییە وێرانكرن و داوی جار ل (١٩٧٥/١١/١١)ێ بوو ل ژێر بریارا وێرنكرن و ب عەرەبكرنێ خەلكێ گوندی جوونەك بەر ب گوندی سووركا ل باشوورێ سێمێلێ ڤە چوون و جوونەك بۆ گوندی دارێ ل باكوورێ سێمیلێ و جوونەك بۆ گوندی خراب كۆلكێ یێ كو نها پارچەیەك ژ كۆمەلگەها مسیریكێ، پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ ئاخا وان بۆ زڤری ڤە، لێ ژبەر كارگەهێن كواشێ و نەبوونا خزمەتگوزاریان گوند نەهاتییە ئاڤاكرن[٤٨].

## گوندی مالهەسنی:

گوند دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (١٢كم) رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ، ل سەر ناڤێ گوندی وەدیارە ژ(مالا- هەسنی) هاتییە و پتریا بۆچوونان دبێژن ئەڤ هەسن هەسنێ هەوێری یە، و دبیت ئەو مرۆڤ ئێكەم خودانێ ڤێ ئاخێ بوویە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** چیا

**باشووری،** گوندێ گررەشێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كواشێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ باڤیا

دبێژن دەمێ بنەمالا مەلا تەیبی وارێ خۆ ژ قەسرا مەلا تەیبی بەرەڤ باكوورێ رۆژهەلاتێ دەشتا سلیڤانەییان تاكو گوندی كواشێ بەرفرەهتر لێ دكر، نەڤی چركێ مەلا تەیبی (عەبدی خەزالا) چەند سوارێن خۆ بەرەڤ باكووری ڤە هنارتن و هەریەكێ پارچەیەك گوشتێ راسپاردێ و هەریەك هنارت پارچەیەك جودا كو ئەڤ سوار هەموو رۆژا دی پارچا گوشتێ خۆ بینن و بێن ژێو كیش پارچە بێهن خۆشە و دروستە، ئەو سوارێ بەرەڤ وارێ مالهەسنێ چووی پارچا وی ژ یا هەمیان پاقژتر و بێن خۆشتر بوو، لەوا ناڤبری ئەڤ وارە هەلبژارت بۆ وارگەهی وی یێ یێ تایبەت.

دانعەمرێن وان دبێژن ل هاتنا عەبدیێ خەزالا یەكسەر دەست ب ئاڤاكرنا قەسرەكا مەزن كو یا بەرنیاس بوو (قەسرا مالهەسنی) كر. ئەڤ قەسرە یا چوارگۆشەیا دو نهۆم بوو ل سەر رووبەرێ (١٠٠٠٠م٢) و ل سەر بنسترەكێ فرەهییا وی (١٢٠سم) و و بلنداهییا دیواری ل سەر دووازدە رێزان بلندبوو و دو دەر هەبوون، ئێكێ نۆرمال ل رۆژهەلاتی و ئێكێ ب شێوەیێ كڤانی ل رۆژئاڤای و ئەو دهاتە ژمارتن دەرگەهێ قەسرێ یێ سەرەكی و كەس بێ دەستووری دەرباز نەدبوو، ژبەر دووربوون و برینا بەران ب ئێك شێواز ئاڤاكرنا ڤی ئاڤاهی (١٢) سالان ڤەكێشا و ب دەهان پالا ل سەر كار دكر، دبێژن ل دەمێ ئاڤاكرنا ئاڤاهی عەبدی خەزالا ئالاڤەكێ تەنك مینا چەقووكێ ددەستاندەبوو و هەرۆژ ڤالاهییا دناڤبەرا دو بەراندا تاقیدكرن و نەدبوو ئەو چەقوو دەربازی ناڤبەینا دو بەران ببیت. ئاڤاهی ل سەر دەستێ رژێما عیراقێ هاتە پەقاندن و پتریا بەرێن وی خەلكی برن و نها تەنێ شوینوارێن وێ دیارن.

### زێدەرێن زیارا خەكێ گوندی:

ڤی گوندی تەنێ دوورێت (١٠) مالێن سلێڤانەییان لێ ژیانە و چەند شڤانێن خۆ هەبوون ژ كۆچەران ئەڤ وارە گەلەكێ خۆشە بۆ چەروانی، خودانكرنا

تەرش و کەوالی کارێ وان یێ سەرەکی بوو و نها ژی ژبەر کەش و هەوایێ ڤی گوندی شیرێ مالهەسنی یێ ب ناڤ و دەنگە ل دەڤەرێ. هەر وەسان خەلکێ گوندی تۆڤچینی ژی ل ڕێژا دووێ دکرن، لێ پشتی ل سالێن پێنجیان ئالاڤێن پێشکەتی گەهشتین هێدێ هێدێ بوارێ چاندنێ جهێ خۆ گرت و ئەڤ دەشت ب چاندنا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆکان خەملی، دیسان خەلکێ گوندی ڕەز ژی شینکرن و چەندین فێقییێن دێم وەکو زەرك و ڕەشمێو هژیر بەرهەمدهینان و دکرنە مێویژ و کتك، ژبلی باهیڤ و سماقێ.

## سیمایێ گوندێ مالهەسنی:

ئەگەر ژ سەرێ چیای بێتە دەستپێکرن تشتی هەری ب دەنگ ڕیا بنێ دێربوینە و سەرێ گەلیێ خەزالکا و گردە یێ دکەڤیتە ئالێ گوندی باڤیا و وەسا نیشاندت گرەکێ مەزن و تێر بەرە، و پیاکێت رووت یێن کو دکەڤن هنداڤ گوندی و گرێ تێبتا کو خرابەیەکێ کەڤنە و جهێن کەڤن لێ دیارن لێ دیرۆکا وی دیار نینە، و ملا ب سماق ل ڕۆژهەلاتێ گوندی و گرێ حەمو عەرەبی ل باشوورێ گوندی، ڤی گوندی تەنێ گەلیەکێ ب ناڤێ گەلی خەزالکا هەیە، ژبلی چەند گەلۆکێن دی لێ د بێ ناڤن.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

سەبارەت کانی و ژێدەرێن ئاڤا گوندی، کانیا گرێ تێبتا کو نها زۆر کێم بوویە و کانیا پشتا گرێ تێبتا هشك بوویە، دیسان بیرەکا ب شێوێ بازنەیی ل سەر دەمێ عەبدی خەزالا ب کووراتیا (١٨ - ٢٠م) و فرەهیا (٢م) هەبوو، و ب بەرا هاتبوو نژنین. ڤی گوندی نهال ژی هەنە، مینا نهالا حەمو عەرەب کو د نیڤا گوندی را دەرباز دبوو و نهالا ڕەزا یاکو ژ گرێ تێبتا دەست پێدکر تاکو چاددا سەرەکیا دناڤبەرا زاخۆ و دهۆك.

بنەمالێن ناڤبری تا هەوا تەعریبێ مانە ل سەر گوندی خۆ، پشتی هینگێ ل سێمێل و دهۆکێ ئاکنجی بوون و پشتی سەرهلدان سالا ١٩٩١ێ دیسان نەڤیێن عەبدی خەزالا بوونە خودانێن ڤێ ئاخێ و هەر سال ئەڤ وارە دهێتە شینکرن، زێدەباری نها ڤێ بنەمالێ نێزیکێ (٣٠٠٠) سەرێت پەزی هەنە و حەفت مالێن عەرەبان شڤانیا وان دکەن، و سالانە ب سەدان کیلوییێن شیر و ریچالی و هریێ بەرهەم دهینن، هەر چەند هێلا کارەبێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان و بیرەکا ئیرتیوازی بۆ دابینکرنا ئاڤێ بۆ پەزی هاتییە کۆلان، لێ گوند دهێتە هژمارتن ژ گوندێن خرابە.

## گوندی باڤیا:

جوگرافیایەکا ستراتیجی بوو ژ ئالیێن سیاسی و ئابووری ڤە کو دەشت و چیا پێکڤە گرێدان، دکەڤیتە بنارا چیای ب دووراتیا نێزیکێ (١٠کم) باکوورێ ڕۆژهەلاتێ ناحیێ، ژ ئالیێ باشووری هەڤسنوورە دگەل کۆمەلگەها باستکێ، و ژ ئالیێ ڕۆژاڤایڤە و گرەشی و مالهەسنی ژ ئالیێ باشوورێ ڕۆژهەلاتیڤە و کواشێ ژ ئالیێ ڕۆژهەلاتیڤە و ئەرمشتێ و دوولا ژ ئالیێ باکووریڤە.

## سنوورێن گوندێ:

**باکووری،** گوندێن ئەرمشتێ و دوولا

**باشووری،** کۆمەلگەها باستکێ

**باشوورێ ڕۆژهەلاتی،** گوندێن گرەشێ و مال هەسنێ

**ڕۆژهەلاتی،** گوندێ کواشێ

**ڕۆژئاڤای،** بالقووسێ

## سیمایێ گوندی:

جهێ گوندی دکەڤیتە بەر دەرێ گەلیێ گوندی و دووڕێچ کریە ب کومتێن بلندێن چیای و چەند گرك و ڕەزێن گوندیان، و هەر کومتەکێ چیای ناڤەکێ تایبەت هەیە، یێ ژ هەمیا بەرنیاستر کو ژ دوورڤە دیاردکە (کەڤرە سوورا) باڤیا نە، کو زنارەکا بلندە دکەڤیتە باکوورێ ڕۆژاڤایێ گوندی، دیسان

دوورینە کو کومتەکێ بلندە و زالە ل سەر وێ دەڤەرێ، لەوا ب دوورین هاتییە ب ناڤکرن، و دناڤبەرا دوورینەی و کەڤرە سووری درێژاهییەك یا دیارە ب ناڤێ خەنیکە و ژ هەردو کومتێن ناڤبری نزمەترە و دەرگەهێ رێباری یە دناڤ بەرا گوندی و گوندێن ئالیێ دی یێ چیای وەکو ئەرمشت و دوولا، دەمێ مرۆڤ ب سەر خەنیکەی دکەڤیتە کەلا ئەرمشتێ ژ دوورڤە دیاردبت، دیسان کێرۆکا بای نیشانەکا دی یە کو ئاقارێ هەردو گوندێن ئەرمشت و باڤیا ژێك جودا دکەت، هەر وەسان کێرا ڤورتا ژی هەیە، و ل نزماتییەکێ نێزیکی کوبیتکا دوورینەی نیشانەك د کەڤری کولایە و شێوێ صوما دەوارەکی ددەت و ب صوما دندلێ دهێتە ب ناڤکرن.

هەر ژ سیمایێن گوندی گەلووك و شکەفتێن ئەرژیا[٤٨] و شکەفتا بن ئەدر یان شکەفتا شەیتانی، کو دکەڤیتە دبن گوندی دا ل باشووری و ژبەر کو شکەفتەکا نەدیارە و ئێکێ شارەزا نەبیت ل سەر هلنابت لەوما ئەو ناڤ لێ هاتییەکرن، بەرێ کەلشی ژی یەکە ژ سیمایێن گوندی و دکەڤیتە رۆژاڤای، ئەو ژی بەرەکێ مەزنە و وەکی گوندی دبێژن دبیت برووسی یان دربەکێ مەزن ڤێکەتبت و ئەو بەر کریتە دو شەق. و ل بەرامبەر و ل ئالیێ رۆژهەلاتێ گوندی ڤە گرێ مام بزا[٥٠] هەیە، و وەکو نهێنیێن گوندی خرابۆك ژی یێ ل باشوورێ گوندی ب دووراتییا نێزیکێ (١کم) هەی و ژ بنستران دیارە کو جهێ گوندەکێ کەڤنارە، دیسان (زیارەتێ شەقسکێ) یەکە ژ شوینوارێن کەڤنە ل رۆژئاڤایێ گوندی و دناڤ ئاقارێ گوندی دا ب دووراتییا کێمتر ژ کیلومەترەکێ گۆرستانەکا مەزنا ب دارو بارێن مەزن نخامتی هەیە و دیرۆکا وێ دیار نینە.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژبەر کو باڤیا ژ ئالیەکێ دەشتە و ئێك چیایە، لەوما دەرامەتێن چاندنێ ژی وەکی ئێك نەبوون، ئانکو رەز و رەزگەری ل ئالێ چیای و بەلکی هەر مالەکێ رەزێ خۆ هەبوو و تۆڤچینییا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆکان ل ئالیێ دەشتێ و ئەڤە ژێدەرەکێ ژیانا وان بوو. وەکی گوندی ڤەدگێرن ل نیڤا سەدساليیا بیستێ، رەزێن سەرێ چیای و ژبەر زۆربیا ئاڤێ سپیندار ژێ لێ دهاتنە چاندن ب تایبەت دناڤ دۆلان دا، ل ناڤ رەزێن بناری یان دەردوورێن گوندی هەر زەرك و رەشمێو و هژیر و باهیڤ هەبوون، و ل ناڤ هەر رەزەکی (ماسر) دهاتنە چێکرن.[٥١]

دیسان خودانکرنا پەز و بزنی ئێك بوو ژ دەرگەهێن ژیانا خەلکێ گوندی، خودانکرنا مێشێن هنگڤینی ژی ئێك بوو ژ کارێن چەند بنەمالەکان، هەر بۆ خوارنێ و هەر بۆ فرۆتنێ ژی.

## ئالیێ سیاسی:

باڤیا جهەکێ گرنگ بوو بۆ هاتن و چوون و گەهاندن و کارێن لوجستیکی یێن پێشمەرگەی ل دەمێ شورشا ئەیلوولێ، دناڤبەرا بارەگایێ هێزا زاخۆ ل گەلیێ ئەرمشتێ و گوندێن بنارێ چیایێ ب تایبەت ئاسیهێ، و وەکو دهێتە گۆتن باڤیا داوی گوند بوو بەرەڤ رۆژاڤای کو مەلا مستەفایێ بارزانی لێ بوویە مێڤان.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٣٤٩ کەس بوو[٥٢]، خەلکێ باڤیا تەنێ ژ عەشیرەتا سلێڤانەیا ژ بابکێن ئالالێ و عەڤدی بەگا و مالا کولەی و بابانێ و ئەرزانا و عەلی جانگیرا و چەندێن دی پێکدهێت. بەری هەوا تەعریبێ نێزیکێ (٦٠) مالان بوون و نها نێزیکێ (٢٠٠) مالانە و بەلاڤن ل کۆمەلگەها باستکێ و گرەشی و سێمێلێ و مالتایێ و دهۆکێ. گوند نەهاتییە ئاڤاکرن لێ هەرسال دهێتە شینکرن و گەلەك ژ رەزێن وان د ئاڤانە و ب شێوەیەك وەرزی کارێن خۆ تێدا دکەن[٥٣].

## گوندێ بالقۆسا ژووری:

گوندەکێ کەڤنە، هەم دەشتە و هەم چیایە، دکەڤیتە بنارا چیایێ سپی ب دووراتییا نێزیکێ ١٠ کم باکوورێ رۆژهەلاتێ باتێلێ، پتریا پێکهاتێ گوندی سلیڤانەیی ژ بابکێ (قەردەشا) و بابکێ (مەندادی) یا نە، وماڵا مەلا تەیبی، و سندییا/ بەنستانی بابکێ (سمایل عەلو خەمووا). بەری خرابکرنا گوندی ل سالا ١٩٧٥ێ گوند ژ نێزیکێ (٣٠) مالان پێکدهات، و ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر تۆڤچینیێ بوو و رووبەرێ ئاڤارێ هەردو بالقۆسان کو ب کێری چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیکێ (٤٠٠٣) دۆنەمان، دیسان خەلکێ گوندی تەرش و تەوال و مێشێن هنگڤینی ویەلەوەر ژی ب خودان دکرن، و مفا ژ سروشتی ژی مینا کاری و کەنگر و تۆلك و سیرك و قوراد و گویرسك و... وەردگرتن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ تنێ ئاماژە ب یەك بالقوس هاتییە کرن هژمارا خەلکێ و گوندی ٢٨٧ کەس بوو[٥٤].

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ گوند بۆ دو پشك ب ناڤێن بالقۆسا ژووری ل جهێ کەڤنێ گوندی و نها ئاڤایە و (٧٣) خێزانان بخۆڤە دگریت و بالقۆسا ژێری.

### سیمایێ گوندی:

تشتێ ناڤدار ل گوندی گۆڕا (شێخ سەعد) یە، ئاڤاهیەك ل سەرە ب درێژاهییا نێزیکی (٦م) و فرەهییا (٤م)، گۆڕەکێ گەلەکێ درێژە نێزیکێ (٥م) و ئەو ژوور ب کومباران ڕاخستی یە و ب پاتەیەکێ کەسك نخافتی یە، خەلك بەردەوام سەرەدانا وی دکەن و ل دەرکەتنێ ژ گۆڕی دڤێت ب شێوەیەکێ چەماندی و پشت و پشت ژێ دەرکەڤن و ئەڤە بوویە تیتالەك ل وێ دەرێ.

گۆڕێ شێخ (سەعد)ێ ژ ناڤ ئاڤاهیێ وی وەسا دیارە خەلك سەرەدانا وێ دکن و قورئانێ ل سەر دخوونن و یێ دێ گورێ (محەمەد زهاوێ)یە. هەردو دکەڤنە تەنشتا گوندی ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە ل

گۆڕێ شێخ (سەعد )ی ل گوندێ بالقۆسا ژوورێ



بەسارەکێ و دارەك ل هنداڤ وانە دبێژنێ (دارا دەڤێ)، و هەر ل تەنشتا گوندی ئالیێ رۆژهەلاتی بەرێ خەندخەندۆکێ هەیە، خەلکی زاروێن خۆ دو سێ جاران د بن وی بەری را دەربازدکرن دا ژ ڤێ ئێشێ ساخ ببن.

بەرێ خەندخەندووکێ ل گوندی بالقوسا ژووری

سەری چیای چەند جهەکێن دێرین هەنە وەك: (گرکێ ئاخینی) وەسا دیارە گرەکە کو ژکۆمکرنا ئاخێ ل سەرێ چیای دروستبوویە، دیسان سێریج (صهریج) ل سەرێ چیایە و دکەڤری ب شێوێ کوفکێ و سەرنشیڤ کۆلایە، ئانکو بنێ وێ فرەهترە ژ دەرگەهێ وی و ب کووراتییا نێزیکی ٣م دکەڤری را کۆلایە. دیسان ژ سیمایێن گوندی وەکو چیا، (دەرگەهـ) دناڤبەرا گوندی و گوندی بێزیهێ و (خوار سیسنکێ)، و دارێن خورستی ب مشەیی ل چیای هەنە وەکی بەڕوی و مازی و گوهیشك و کارچك و تەفسکێن رەش و زەر، و بالندەیێن ل چیای مینا ئەلهو و سمسیارك و قر و سووسك و کەو و کەڤووك و دیسان گیانەوەرێن کووڤێ...هتد.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

برکا مەزن و برکا بچویك و دو کانییێن ژنا و بیرا حەجی رەمەزانی و برکا راڤژنوویێ (راڤژنوو دبنیاتێ خۆ دا گوندەکێ ئاڤا بوو لێ نها تەنێ شوینوارێن کانییا وی ماینە) و بیرا فستوولی بیرا ڤەخوارنێ و کانێ کەوکێ.

### ژ گەلییێن گوندی:

گەلیێ حەجی رەمەزانی و گەلیێ عەبوی و گەلیێ مەلا بابل (یێ خەلوا خۆ لێ کری)، وگەلیێ حەجی سالحی و گەلووکێ مێشێ و گەلیێ خامێ[٥٥].

## گوندی بالقۆسا ژێرێ:

گوند بەشەکە ژ بالقۆسا ژووری، ل سالا ١٩٩٣ێ ب مەرەما نێزیکبوون ژ جادا گشتی کو زاخۆ و دهۆکێ پێکڤە گرێددت ل سەر دەستێ مووسایێ رەمەزانێ سلێڤانەیی بابکێ قەردەشا و عەلیێ رەجەبێ سالحێ سلێڤانەیی کواشی هاتییە ئاڤاکرن، ل دەستپێکێ ژ پێنج سەرۆك خێزانان پێکدهات و ژیارا وان ل سەر تۆڤچینیێ و هندەك کارێن دی بوو، وەکو شوفێرێ و فیتەرێ، گوند ل جهێ فرۆکخانەیا (مزرعە الانتصار) یاکو ل سالێن حەفتیان و دەستپێکا هەشتیان بۆ خزمەتێن چاندنێ دهاتە بکارهینان و چەند ئاڤاهیێن مەزن بۆ عمبارکرنا بەرهەمێ چاندنێ دناڤدابوون هاتییەئاڤاکرن. کو پشتی سەرهلدانێ بووینە کەمپێن پەنابەران بۆ خێزانێن عەرەب و کوردێن دۆسکێ و نێروەیی و میسا رەشی وبەرواری هاتنە بکارئینان و نها نێزیکی (٤٠٠) مال ژوان ماینە و ژیارا خۆ دناڤ وان ئاڤاهییانڤە دبەنە سەری، گوندی بالقوسا ژێری نها ژ نێزیکی (٣٨) خێزانان و (٢٠٨) کەسان پێکدهێت، نها چەندەك ژوان سەروك خێزانان فەرمانبەرن و چەند ژوان هەمان پیشە دکەن[٥٦].

## گوندی قەرقووری:

گوند ب دووراتییا نیزیکێ (١٠کم) دکەڤیتە بنارا چیایێ بێخێری باکوورێ باتیلێ، ل سەر ناڤێ وی چەند بۆچوون هەنە، هندەك دبێژن ژ ناڤێ (قایك) هاتییە کو جهەکێ کوورە و دناڤبەرا سێ گراندایە بەلکی مینا شکلێ قایکێ ددەت، و بۆچوونا دی دبێژن ژ ناڤێ (قەرەقوول) ب واتایا کەلات، یان مەخفەر ب ترکی هاتییە، و بۆچوونا سیێ دبێژیت قەرقوور یا ژ (قەر- قیر) هاتییە، ئانکو قیرێ رەش، و (قەر ب زمانێ تورکێ واتە رەش). و هەرسێ بۆچوون جهێ گومانێ نە. پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی کەس بوو[٥٧]، خەلکێ گوندی سلێڤانەیی بوون ژ بابکێ بساغا بنەمالا (سعدو)ی و چەند مالەکێن میسا رەشی و کۆچەر و سندیان دگەلدا بوون و نهاژی هەمان بنەمال ل گوندی دژین.

گوند دکەڤیتە دناڤبەرا سێ گراندا، گرێ زیارەتا و گرکێ غەربیا و گرکێ گوندی. ئاڤاری گوندی

سەرێ وی چیایە، ژ (دەرگەهی) کو جهەکە و شێوێ دەرگەهی یە، تاکو (قم الدبابە) کومتەیەکێ بلندە و هنداڤ گوندی یە (ناڤ ژبەر تۆپبارانکرنا دەبابێ هاتییە) و بانیك، جهەك بلندە تەنێ ژ سەرێ چیایێ نزمەترە و ئاخا وی بۆ رەزا یا باشە، و گەلیێ قەرقووری ل باکووری گوندی، کو نهالەکا کوورە و بیستانەك و کانییەکا ئاڤێ د نیڤێ دایە و ل دەرێ گەلی ناوسکەك هەیە و جهێ دو مرۆڤان یان جهێن نڤستنێ تێ کۆلایە، ژبلی هەبوونا سێ شکەفتێن دی دوی گەلی دا هەنە، یەك دکەڤیتە هنداڤ کانیێ، شێخ ئەحمەد[٥٨] لێ دکەتە خەلوێ، و شکەفتا بن ئەرد دکەڤیتە هنداڤی کوندی د گەلووکەك دی دا و دیار ناکەت تا تۆ دگەهیە جهێ وێ شکەفتەك فرەهە لێ دبن ئەردی دایە، و یەك ژ جهێن هەرێ بدەنگ نهالا (حەمە نووری) یە، و زیارەتێن (مەلا محەمەدی) نە.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کارێز کو ئاڤا وێ ژ سەرێ گوندی دهات، تا دەستپێکا سالێن دو هەزارێ گوند ئاڤی دکر، لێ نها هشك بوویە، و کانییا ژووری و کانییا حەمە نووری و کانییا ژنا و کانییا عاقد و کانییا مصتێ، و بیرا گوندی لێ هەموو هشك بووینە و بۆ ئاڤێ نها پشت بەستنێ ل سەر بیرێن ئیرتیوازیا دکەن. گوندی قەرقووری کو ژ نێزیکی (٣٥) مالا پێکدهات چوار جاران هاتییە سۆتن و خرابکرن، و داوی جار ل سالا ١٩٧٥ێ بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ل سەر تۆڤچینیێ بوو ب ئالاڤێن کەڤن، تا سالا ١٩٥٧ێ کو دو تەراکتوور گەهشتینە گوندی و ل سالێن شێستان دەراسەك ژی گەهشت، ئێدی چاندن ب ساناهیتر لێ هات، رووبەرێ ئاڤارێ گوندی (٢٠٢٠) دۆنەمن، نها سیستەمێ چاندنێ ل تەڤایا دەڤەرێ ب شێوەیێ نیڤەك شووڤ و نیڤەك تۆڤە، ئەو جهێ بەیار یان شووڤ هەر سال گوندور لێ دهێنە چاندن. دیسان نێزیکی (٦٠٠) سەرێت پەز و بزنێ ل گوندی دهێنە خودانکرن، نها گوند ئاڤایە و و نێزیکێ ٥٠ مالان لێ دژین، رێکەکا ڤێرکری دگەهیتە گوندی و پشتی ڤەگەریانا وان بۆ سەر گوندی ل پشتی سالا ١٩٩١ێ مزگەفتەك و خواندنگەهەك ژی لێ هاتینە ئاڤاکرن[٥٩].

### گوندی ئاسیهێ:

(ئاسیهێ) گوندەکێ کەڤنە دکەڤیتە دووراتییا (٤کم) باکوورێ باتێلێ، ناڤێ گوندی (ئاسیهێ) وەکی دبێژن ژبەر ئاسێ بوونا جهێ گوندی هاتییە.

### سنوورێن گوندێ:

**باکووری،** شیایە

**باشووری،** گوندێن گروسمانا و باتێلێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ قەرقورێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ هاجیا

ئاسیهێ دکەڤندا بنسترا خواندنێ لێ هاتییە دانان و جهێ کۆمڤەبووتا سوختەیێن ئایینی و فەقیێن ئۆلا ئیسلامێ بوو د سەدسالییا هەژدێ دا، ل سالا ١٩٢٣ێ گوندی ئاسیهێ ب فەرمێ بوویە ئێکەم سەنتەرێ ناحیا سلێڤانەییان و هەتا سالا (١٩٧٩) ێ و هەموو دام و دەزگەهێن میری لێ کەتنە کاری، سنوورێ وێ هاتە نیشانکرن هەر ژ گوندی هاروونا کو دەڤەرێ ژ عەشیرەتا دۆسکیان توخیبدکەت و تاکو رۆگەرمی یێ کو دەڤەرێ و عەشیرەتا سندیان توخیبدکەت و تا بگەهیتە رووبارێ خابووری و زاخۆ دوو بڕ دکەت و پارچا باشووری بخۆڤەدگرت و تاکو دەربازی (ئیبراهیم خلیل) دبت و ل وێرێ هەردو رووبارێن خابوور و هیزل هەڤدو هەمبێز دکەن و وەلاتێ ترکیا توخیب دکەت و پاشان گوندی پێشابوورێ و سێ گۆشەیا سنووری و هەردو رووبارێن ناڤبری رووبارێ دیجلە هەمبێز دکەن و عیراق و ترکیا و سوریێ ژێك جودادکەن، دیسان ئاڤ و ئاڤ بەر ب رۆژهەلاتی ڤە تاکو گوندی کێزینا و تربە سپیێ ودیسان بەر ب

باكووری تاكو گوندی مەرینێ و كواشێ وب برینا چیایی تاكو دیسان دگەهیتە گوندی هاروونا، لێ نها باكوورێ چیایێ سپی هەر ژدەڤەرا لێفێ و دیسان ئاڤ ب ئاڤ تاكو گوندی پێشابوورێ و دێرەبوونێ سەر ب ناحیا (رزگاری)، ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە تاكو گوندی (گرەشی) سەر ب سەنتەرێ سێمێلێ نە.

**چەندین رێڤەبەرێن ناحیێ ب ڤی شێوێ ل خوارێ لێ هاتینە دامەزراندن:**

- سەدیق بەگ هەر ژ دامەزراندنا وێ تا سالا ١٩٢٦ێ.
- محەمەد سادق ئەفندی (١٩٢٦ - ١٩٣٢).
-كامل یەحیا تا سالا ١٩٣٦ێ.
- شەوكەت ئوسمان (١٩٣٨/١٠/٢٠ - ١٩٣٩)ێ.
- ئەحمەد رەشید تا سالا ١٩٤٠ێ.
- ئەكرەم عەبدولحەمید (١٩٤٨)ێ.
- عەبدلمەجید رەشید بەرواری تا سالا (١٩٥١)ێ.
- عەباس ئەحمەد تا سالا (١٩٥٤)ێ.
- كانەبی عەزیز دزەیی تا سالا (١٩٥٦)ێ[٦٠].

و چەندین رێڤەرێن دی تا سالا ١٩٧٩ێ كو ناحیە ژ ئەگەرێن سیاسی ل دەستپێكا سالێن هەشتیان هاتییە ڤەگوهاستن بۆ باتێلێ، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی كەس بوو[٦١]..

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ئاسیهێ نها گوندەكێ ئاڤایە و نێزیكی ٨٠ مال و ٤١١ كەسان لێ دژین، پێكهاتا وان ژی سلێڤانەیی نە ژ بابكێن/ مالا عەتێ (پساغا)، و بابكێ قەردەشا و مالا رێزێ و زهێری و مالا براهیمێ صوفی و مالا حەسەنێ هویرێ ژ بنەمالا عەمەر ئاغایێ گوهـ ریشی[٦٢] ومالا شێخ عەلی[٦٣] و مالا سلو سەمەدا و مالەكا كیكا و مالا ئەمین كۆچەرێ (گەودا)، كو هەموو ل بەری خرابكرنا گوندی ل سالێن هەشتیان لێ دژیان و پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ هەر هەمان بنەمال لێ دژین.

**ڤەسرۆك و بنسترێن ل دوورا ژ ئالیێ باكووری ڤە هاتییە وێنەكرن و لبەر دەشتا بەرینا سلێڤانەیا دیارە**



ئاسیهێ جهێ هلبوونا یەکەم چریسکا شورشا ئەیلوولێ بوو ل سەر قشلا لەشکەرێ عیراقێ ل سەنتەرێ ناحیێ و (ئاسیهێ) رزگاربوو، پاشی گەلەك ژ خەلکێ دەڤەرێ تێکەلی هێزێن پێشمەرگەی بوون و دەڤەر تا دێرەبوونێ ل ژێر دەسەلاتا پێشمەرگەی دا بوو، پشتی سالا ١٩٧٥ێ هەمی دەڤەر کەتە ژێر هەوا خرابکرن و ڤەگوهاستنا گوندان و تەعریبێ، تنێ گوندی ئاسیهێ نەبیت. لێ ل ١٩٨٣/١١/٢٤ێ و دەمێ زڤرینا چەند گەنجێن ئاسیهێ ژ کولیژ و پەیمانگەهێن خۆ ل دۆرێن دکان و قەسرا زەر کۆم دبوون، ل ئێڤارا وێ رۆژێ کو پێنج شەمبی بوو عەسکەرەکی بەرێ کلاشینکوفا خۆ دا خورتێن گوندی، چەند بریندارکرن و دو شەهید کەتن، ئێدی هێدی هێدی خەلك ژ گوندی رەڤین تا بریارا خرابکرنا وێ ل سالا ١٩٨٦ێ ب فەرمی دەرکەتی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ئاسیهێ دکەڤندا ل سەر تۆڤچینییا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆکان بوو، رووبەرێ ئاخا ڤێ گوندی کو ب کێری چاندنێ دهێت نێزیکی (٤٧٦١) دۆنەمانە، دیسان خەلکێ گوندی تەرش و کەوال ژی ب خودان دکرن.

### جهـ و شوینوارێن گرنگێن گوندی:

**قەسروکێ:** ئاڤاهیەکێ بازنەیی یە ل سەر جهەکێ بلند، فرەهییا دیوارێ وێ دگەهیتە ئێك مەتر، بلنداهییا وی ژبەر کو یێ هەرفتی پتری (٣م) ژێ مایە و چەندین بنستر ل دەور و بەران هەنە و ژبەر پرانیا بنستران دیارە جهێ سەرکردەیەکێ یان جهەك زۆر گرنگ بوویە دکەڤیتە سەرێ گرەکێ مەزن هنداڤی گوندی ل باکوورێ رۆژاڤای، دیرۆکا ئاڤاکرنا

دەرگەهێ بێتاسێ



وێ دیار نینە، لێ ژبەر نێزیکبیا وێ ژ باستکێ دبیت پەیوەندی دگەل دیرۆکا وێ هەبیت و تا سەدسالیا نۆزدێ ژی قەسروك بۆ بریاردانا رۆژێن جەژن و رەمەزانان دهاتە ب کار ئینان، ب رێکا هلکرنا ئاگرەکێ مەزن وەکی نیشان.

**کانیا بنکەڤری،** وەسان دیارە کو گەلەکا کەڤنە و ئاڤا وێ ژ چیای دهێت و خورستی یە بەلێ وەکو دیار بەلکی بدەست هاتیە کۆلان ب درێژاهیا نێزیکی ٣م و فرەهیا ٢م و کووراتیا ١,٥م. و ئاڤا ژبەر تێنئاڤدان.

**بەرێ جوهی،** بەرەکێ مەزنە ببلنداهیا نێزیکی ٢م ب شێوێ ستوونی راکریە، دکەڤیتە باکوورێ گوندی ب دووراتیا ٢کم.

**برکا مەمکا،** کانییەکە نها هشك بوویە دکەتە باکوورێ رۆژاڤایێ ئاسیهێ ب دووراتیا نێزیکێ ٣کم، ناڤێ وێ ل سەر ناڤێ بنەمالەکێ یان بابکەکی هاتیە، و ل هنداڤی وێ شکەفتەکە و کانییەك ب ناڤێ (حوجر مەمك) دناڤدا هەیە.

**قەبرکا،** وارەکێ بلندە ل سەرێ چیای باکوورێ رۆژاڤایێ گوندی، و پێکهاتیە ژ کۆمەکا گوڕان و دیرۆکا وان دیار نینە.

## کانیێن گوندی:

هەر ژ کەڤندا کانیێن گوندی د ئاڤانە و هشك نەبووینە، و تا سالێن هەشتیان ژی ژێدەرێن ئاڤدانێ و شووشتنێ و ڤەخوارنا گوندیان بوو، وەك: (کانیا مێرا و کانیا ژنا و کانیا بن کەڤری و کانیا خورشێ و کانیا شێخ عەلی و کانیا ئاغای).

و ژبەر هەبوونا ئاڤا وان کانیا رووبێ ئاسیهێ ژ ئالیێ رۆژاڤای ڤە ب کەسکاتیا دارێن فێقی خەملاندی یە، ل رۆژهەلات و باکوورێ گوندی ژی گەلەك رەزێن دێم هەنە ب دەهان رەزێن کەڤنار ل چیایێن هنداڤی گوندی هەنە، ژبلی هەبوونا دار و گیایێن خورستی وەکو هژیر (تەفسك) هەلهەلۆك و تاوك کەزوان گوهیشك و سیرك و قوراد و کاریا کەلێ و تۆلك و سێبسك و کەنگرو... هتد، هەر وەسا گیانەوەرێن کووڤی ل دەشت و چیایێن وێ هەنە، ژ گیانەوەرێن چیایی وەك: گورك و رووڤێ و سیخور و ژیژوێ و سمسیارك و ئەلهو و باشووك و کەو و سویسك. و یێن دەشتێ مینا مشك و جورد و مار و دووپشك و تیتیك و سڤیانك و پوور و کێڤریشك و ب دەهان گیانەوەرێن دی.

**کومتێن چیای،** ل هنداڤی گوندی گەلەك کومتێن بلند ل ژێر ناڤێن جودا هەنە، و ل سەر ئاقارێ ئاسیهێ دهێنە نیاسین وەکو (دەرگەهێ بێتاسێ و کەلا بوچیك و کەلا مارا و دەبلیو و کەر بەزین و شکەفتا کوردوی و سەرێ کێشێ و بەرخوەهرا و قەبرکا) و هەمی دکەڤنە باکوورێ گوندی، دیسان چەندین گەلی ژی ل هنداڤی گوندی هەنە مینا (گەلوکێ ستیێ و گەلوکێ کاچوی، و سێ گەلوکا و گەل هشك و گەلیێ میها و گەلوکێ ئاغای).
دیسان نهالا رەزا پاکو گوندی و قەرقوورێ ژێك جودا دکەت و نهالا کوتانێ ل رۆژاڤای و گوندی و گوندی هاجیا ژێك جودا دکەت، هەر وەسان چەند گر ژی هەنە مینا گرکێ ئالی ل باشوورێ گوندی و گر بەرزیفك و گر زەرك ل رۆژاڤای.

هەژیە ل ڤێرێ بێژین: یەکەمین خواندنگەها سەرتایی ل ڤێ گوندی کو وی سەردەمی سەنتەرێ ناحیێ بوو ل سالا ١٩٣٢ هاتییەڤەکرن و ئەڤ خواندنگەهە سەرەرای هندێ کو د ناڤبەرا سالێن ١٩٦١ - ١٩٧٥یدا چەند جاران هاتییەگرتن و سەرژ نوو ڤەکرن یا بەردەوام بوویە ل سەر کارێ فێرکرنێ هەتا ل سالا ١٩٨٦ێ ب یەکجاری گوند هاتییەهەرفاندن و خەلکێ وی دەربەدەر بووین[٦٤].

## گوندی گرۆسمانی:

گرۆسمان دبەرێ دا بەشەك بوو ژ ئاقارێ ئاسیهێ، دکەڤیتە دووراتیا نێزیکی (٤کم) رۆژاڤایێ باتیلێ. ناڤێ گوندی پێکهاتییە ژ دو پەیڤان (گر+ ئوسمان)، ب واتایا گرێ ئوسمانی، و ل ژێر دەستێ بنەمالا عەتێ دا بوو، و دو ئوسمان دناڤ ڤێ بنەمالێ دا هەنە یان (ئوسمانێ محەمەدێ خالدێ عەتێ)یە و یان (ئوسمانێ عەسافێ خالدێ عەتێ یە)یە[٦٥]، پاشی

ئەڤ گوند فرۆتینە مالا رەمەزان ئاغای ژ بنەمالا شەمدین ئاغای، و خەلکەك ژ سلێڤانەییان بنەمالێن مەندادێ و بابلا و حەسەن تجارا لێ کومبووینە و کۆچەر ژی دەمەکی دا لێ ئاکنجی بووینە، ژبلی بنەمالا شەمدین ئاغای. ل سەرێ گرێ گوندی یێ ناڤبرێ ئاڤاهیێن مالا عەتێ ل سەر بوون پاشان یێن بنەمالا شەمدین ئاغای و پاشی ئەحمەد فەتاح ئیبراهیم یێ بەرنیاس ب ئەحمو فەتەحا سلێڤانەیی و تا داوییا سالێن هەشتیان بنسترێن وی مابوون.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئاسهێ

**باشووری:** گوندێ سمایل ئاڤا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باتێلێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ گرشینی

## سیمایێ گوندی:

گرۆسمان گوندەکێ تێر ئاڤبوو و رووبێ وی دەشتەکا باشە و دو نهال ئاقارێ گوندی نیشاندکەن، نهالا گربیرکێ کو نهالەکا تێر ئاڤبوو و ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو کو دناڤ گوندی را دەربازدبیت، دەرامەتێ ئاڤی و برنج ل بەر دهاتنە کرن، و نهالا ئاڤزراڤکێ، کو ژ بنێ گوندی هاجیا دەست پێ دکەت وگرۆسمانی و گوندی گرشینی ژ هەڤ توخیب دکەت. دیسان چەند گرك ژی ل گوندی هەنە، وەکو گرێ گوندی و گر بیرك ل باکوورێ گوندی و سەرەکانییا گوندی ل بن ڤی گری بوو و گرێ کۆزێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی کانییا زەلاما و کانییا ژنا بوون کو دکەتنە د نهالا گوندی دا، لێ ئیرو هشك بووینە و ل سالێن تێر باران دەردبنەڤە.

## ژێدەرێن ژیار خەلکێ گوندی:

ل دەستپێکا ئاڤاکرنا گوندی ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو کو دەرگەهێ ئێکێ یێ ژیارا وان بوو، لێ پشتی گەهشتنا ئالاڤێن نوی یێن چاندنێ هێدی هێدی گوندیان دەست دا تۆڤ چینیێ و خودانکرنا تەرشی بەرەڤ کێمی ڤەچوو.

گرۆسمانی چەندین جارا کەتیە ژێر هەوێن هێرشێن لەشکەری یێن حکومەتێن عیراقێ و هاتییە سۆتن و کاڤلکرن و خەلکێ وێ دەربەدەری گوندێن دەردوور بووینە، گرۆسمان ل سالا ١٩٧٤ێ ژ نێزیکێ (١٢) مالان پێکدهات و ل ژێر برپارا تەعریبکرنا دەڤەرێ گوند بۆ داوی جار هاتە وێرانکرن و خەلکێ وی ل گوندێن کێڤلا و بازەلانێ هاتنە ئاکنجیکرن. پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ و ژبەر نێزیکبوونا گوندی ژ کۆمەلگەها سمایل ئاڤا پرانییا خەلکێ گوندی ل کۆمەلگەها ناڤبری ئاکنجی بوون، لێ هەر سال ئاخا خۆ شین دکەن، و تا داوییا سالێن نۆتان گوند خرابە بوو، لێ نها شەش مالێن سلێڤانەییان بابکێ بابلا مالا (محەمەد سمو کوولی) لێ دژین و چەند پرۆژە ل وێرێ هاتینە دروستکرن، مینا پرۆژەیێ خودانکرنا ماسیا و کارگەها بەرهەم ئینانا ئاڤا دلوپکری و پانزینخانە و هۆلا دیلانان و چەندین دوکان و جهێ شووشتنا ترومبێلا و خوارنگەهـ و چاندنا دارێن بەرهەمدار و عومبار بۆ کۆمکرنا کەرەستێن بازرگانی و دروستکرنا رەزێن زەیتوونان و چەند ڤێللە ژی لێ هەنە... ڤی گوندی کەسەك ب ناڤێ محەمەد سموی هەیە گیانەوەرێن کەهی مینا بزنان و وەردەك و قاز و مریشك و دیکل و کۆتران ژ نفشێن رەسەن، و گیانەوەرێن کووڤی ژی مینا شێر ونەعام و خەزال و پەز کووڤی و تاوس و سەیێن سەیر و گورگ و رووڤیان ب خودان دکەت. نها کارەب و دو بیر ئیرتیوازی لێ هەنە، لێ رێکێن ڤێرکری بۆ گوندی نەهاتینە کێشان، ژمارا بنەمالێن ڤی گوندی نها دگەهنە نێزیکی (١٠٠) سەروك خێزانان، ل کۆمەلگەها سمایل ئاڤا و سێمێلێ و موسیریکێ دژین[٦٦].

# گوندی هاجیا

هاجیا ب دووراتییا نێزیکێ (١٤کم) دکەڤیتە باکوورێ باتێلێ. دیرۆکا ئاڤاکرنا گوندی دیار نینە لێ وەکو ملك یێ بنەمالا (عەرەب عەبدولوەهاب سلێمان) ترکزی سلێڤانەیی بوویە، لێ تا تەراکتوو

و دەراسە نە کەتینە کاری نەدشیان هەمی ئەردی شین بکەن، لەوا هەموو ب هیڤییا باش جۆتیاران ڤەبوو، و هەردەم خەلکەکێ بێ کار ل دوورێن ئاغا کۆم دبوون و پارچە زەڤیەك بەرامبەر تابۆیێ ١٠/١ بۆ شین دکرن، و ب ڤی رەنگی چەندین مالێن کۆچەرێن هاجا (ئالا) ل وی گوندی کۆمبوون و کارێ جۆتیاریێ ب گرێبەست دکرن، تا بڕیارا راستڤەکرنا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) یا سالا ١٩٧٥ێ دەرکەتی و هەر جۆتیارەك بۆ خودانێ مولکێ خۆ و ئەو و مەلاك ژێك ڤەقەتیان و هەرکەس وارێ خۆ شین دکەت.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** چیایە

**باشووری،** گوندێ گرشینێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئاسهێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ ترکژا

گوندی هاجیا بەری هەوا تەعریبێ نێزیکی (١٥) مالان ژ کۆچەر و سلێڤانەییان بوون، گوند (٣-٤) جاران ژ ئالیێ حکومەتێن عیراقی ڤە هاتییە سۆتن و تالانکرن، داوی جار ژی ل سالا ١٩٧٥ێ بوو، و خەلکێ گوندی دەربەدەری باژێرێن زاخۆ و سێمێلێ بوون.

## سیمایێ گوندی:

گوندێ هاجیا چەندین کومتە و گەلی و و کانییان بخۆڤە دگریت، مینا کۆخێ حەبەشێ ل هنداڤ گوندی ژ باکووریڤە و بانا نێرگزان، و لیسێ تەیری و گەلیێ تەیری ل باکوورێ گوندی (کو هەموو دەمان هێلینا قورتەکی لێبوو) و گەلیێ تاوکا کو یێ تێر دار تاوکە، و گەلی هشك، ل بن ڤی گەلی و بەرف دەشتێ کەندال سوورك و نهالا کانی کەرکێ هەبوو و نها هشکە، دیسان ل هنداڤ گوندی و ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە گرێ گوندی هەیە، سیبەرا وی یا سپێدەهییا گوندی ڤەدگریت. شکەفتا فندی ژی یەکە ژ سیمایێن بەرنیاس یێن گوندی هاجیا، دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ گوندی. ڤی گوندی تەنێ یەك کانی وەکی ژێدەرێ ئاڤێ ل نیڤا گوندی و ب ناڤێ گوندی هەیە، و تا نها ژی یا ب ڤەرێژە، نها بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە کۆلان. ئەڤ گوند یێ تێر نهالە، لێ د بێ ناڤن، دیسان ل ناڤا گوندی و ب تەمامی ل رۆژاڤایی، گرەکێ فرەهـ هەیە و دەما یەك ژ مالباتێن گوندیا بزاڤا راستکرنا وی بۆ ئاڤاهیەکی کری، چەندین پرتێن جەرك و جوهنییان دەرکەتن لەوا ئەو گر نەهاتە دەستڤەدان و وەك خۆمایە.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی

دکەڤندا تەرش و کەوال ب خودان دکرن، دیسان جۆت و جۆتیاری ژی ب رێژەیەکا کێمەتر و ب ئالاڤێن کەڤن دکرن، تاکو ئامێرێن چاندنێ گەهشتین ئێدی هێدێ هێدێ تۆڤچینی کەتە پلا ئێکێ. دیسان رەز ژی ل ئالیێ چیای دهاتنەکرن ترێ رەش و زەر و هژیر بەرهەم دهینان و خەلکێ گوندی مفا ژ دارێن خوراکێ یێن خورستێ مینا کەزوان و هژیر و سماق و هەلهەلۆك و گوهیشکان وەردگرتن، ژبلی چەندین جۆرێن گیای چ بۆ خوارنێ یان فرۆتنێ.

پشتێ سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ خەلکێ گوندی گوندێ خۆ ئاڤاکرن و نها نێزیکی (٣٠) مالان ل گوندی دژین و خواندنگەهەکا بنەڕەت یا لێ هەی[١٧].

## گوندێ قەلەما:

دکەڤیتە دووراتییا نێزیکی (١٣کم) باکوورێ باتێلێ ل بنارا چیای.

## سنوورێن گوندی:

**باکوور،** چیایە

**باشوور،** گوندێن گرشین و گرۆسمان

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هاجیا

**رۆژئاڤای،** گوندێ ترکژا

بەری بڕیارا راستڤەکرنا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) ل سالا ١٩٧٥ێ گوند ب ئاقارێ خۆڤە پارچەیەك بوو ژ ئاقارێ گرشینی، و ب زەڤیا قەلەما دهاتە نیاسین،

جهەكێ تەنگە و دكەڤیتە دناڤبەرا چەند گر و زۆركان دا. ب هەبوونا تەڕاشەكێ زۆر، یان ژبەر تەنگ بوونا جهێ وی یانژی كو زەڤیەكا تێر كەلەم بوویە، ئانكو زەڤیا كەلەما بۆچوونا هەری نێزیكە بۆ ناڤێ گوندی و هێدێ هێدێ ناڤ بوویە (قەلەما). وەكو ملك یێ بنەمالێن تركژیانە یێ بنەمالا داود ئاغای و هەرسال ئێلێن كۆچەران تەرش و كەوالێ خۆ دئینانێ و داوی جار و ل سالێن شێستاندابوو و پشتی سنوور هاتینە گرتن و دەشت و زۆزانان نەماین، ئێدی مالێن حەجی سەفوی و محویێ سمایلی و سمایلێ حاجی و سەعیدێ چولی كو ژ كۆچەرێن گەودانە ل زەڤیا قەلەما ئاكنجی بوون و بوونە خۆجهێن وێ زەڤیێ و ئاڤاهی لێ دروستكرن و پاشی ب گوندی قەلەما هاتە ناسكرن. پشتی بڕیارا ناڤبری ئەو زەڤی ل سەر ناڤێ وان هاتە توومارکرن، لێ سالانە تابویێ ددەنە خودانێ ملكی.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

هەر ژ سالێن كەڤن ڤە ئەڤ بنەماله ل وی جهی ئاكنجی بووین و تا هەوا تەعریبێ ل سالا ١٩٧٥ێ، گوند ژ نێزیكێ (١٠) مالان پێكدهات، ژیارا وان ل بەری هەر تشتی ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، و هەر مالێ نێزیكێ (١٥٠) سەر هەبوون و داهاتەك بۆ ژێ دهات، ب تایبەت ب فرۆتنا پەنیری كو دبرنە زاخۆ دفرۆتن، دیسان هەر مالێ قەلیا زڤستانێ ژێ بۆ خۆ چێدكرن و بۆ پێدڤیێن دەراڤی ژی چەند كەوالەك ل گۆڕ پێدڤیێ د فرۆتن. دیسان خەلكێ قەلەما جەهـ و گەنم ژی بۆ ژین و ژیارا خۆ دچاندن، گوندی قەلەما ژبەر كو تێر كەند و كۆر و لەوا ڕاكرن و شینكرنا زەڤییان پێدڤی ب ئالاڤێن كەڤن بوو و ئەردێ گوندی گەلەكێ كێمە و نێزیكی (٣٥٠) دۆنەمایە، ئەو بنەمالێن ل گوندی هەر سال تابۆ ددانە مەللاكی ١٠/١ و تا نها ئەڤ سیستەم ل كارە.

### سیمایێ گوندی:

گوندی قەلەما گوندەكێ هەم چیا و هەم دەشتە، ئاقارێ وی دەشت و چیا بخۆڤە دگرت، ئەگەر ژ سەرێ چیای دەست پێ بكەین و خالێن گرنگ ل گوندی كۆخێ حەبەشی یە كو دكەڤیتە سەرێ چیای ل نێزیك ئاقارێ گوندی هاجیا (ڕۆژهەلاتی) و بۆ هەردو گوندان دكەڤیت، كۆخەكێ بلندە و ژ دوورڤە دهێتە دیتن، گوندی دبێژن ب ناڤێ مرۆڤەكی هاتییە ب ناڤكرن، و كۆخێ سووسنا دبندا گەلیێ شكەفتا هەیە ژبەر كو تێر شكەفتە و د بندا چالا ب سماق دهێت و دیسان د بندە چالا كەژوی و پاشان گەلیێ هژیرا (ژبەر هەبوونا هژیرا) و پاشی گەلیێ سمێ و گەلیێ حەجی خەلیلی و گەلیێ كەلوی و كون گورگێ و گەلیێ محویێ سلوی و ملا بەنێ و چیلان چەپك و لیسێ تەیری و گرێ سۆر (كو دو گۆڕ ل سەر هەبوون)، دیسان دناڤبەرا قەلەما و گوندی هاجیا گۆڕستانەكا هەی و دیرۆكا وێ دیار نینە، ڤی گوندی چەندین نهالێن بێ ناڤ ژی هەنە، ژێدەرێن ئاڤا گوندی كانییەك بوو دكەتە باشوورێ گوندی و ئاڤەكا بۆش ژێ دەردكەت كو تێرا هەمی كاروبارێن وان دكر، پشتی دەمەكی بیرەك كو ب ناڤێ بیرا مام سەفۆی یا بەرنیاسە هاتییە كۆلان و دبێژن تاكو ئاڤا بیرێ دەركەتی ب قەلەما هاتییە كۆلان.

دیسان كەڤنێن گوندی دبێژن چونكی جهێ گوندی دكەتە دناڤبەرا گوندێن چیای و دەشتێ، لەوما ڕێبواری ل سەر هەبوو. ئەڤ گوندە و ژبەر نێزیكبوونا وی ژ گەلیێ زاخۆ چەندین جاران هاتییە وێرانكرن و خەلكێ وی دەربەدەربووینە. نها ژمارا سەرۆك خێزانێن وی دگەهنە نێزیكی (٢٠) سەرۆك خێزانان. پشتی سەرهلدانێ گوند نەهاتییە ئاڤاكرن ، لێ هەر سال دهێتە شینكرن[٦٨].

## گوندی تركژا:

گوندەكێ كەڤنێ ب ناڤ و دەنگە ل دەڤەرێ دكەڤیتە دەرێ گەلیێ زاخۆ ژ ئالیێ بەرۆژی ڤە، ب دووراتییا نێزیكێ(١٣كم) باكوورێ ڕۆژاڤایێ باتێلێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** چیایە

**باشووری:** گوندێ گرشینی

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هاجیا

**رۆژئاڤای:** گوندێ قادیا

دانعەمرێن گوندی دبێژن دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ دزڤریتە بەری سەدسالیبا شازدێ، ئانکو ل سەر دەمێ داود ئاغایێ باپیرێ وان ب نێزیکێ (١٦٨٠-١٧٥٠) ز و باپیرێ سلێمان ئاغای ب نێزیکێ (١٧٩٠ - ١٨٥٠) ز ئەو گوند هەبوو. خەلك ل ڤی گوندی ئاکنجیبوون پشتی ڤرکرنا بوولیکەکا تورکان ل دەرێ گەلیێ زاخۆ و سەرکەفتنا باش سوارێن دەڤەرێ، لەوما ناڤ لێ نان (ترك- کوژا) یان ترکژا. دیسان کەڤنێن گوندی دبێژن بۆ هاریکاریا میرنشینا بۆتان ژبال تاژدین ئاغایێ کورێ داود ئاغای ڤە میرێ بۆتان رومەك دیاری دا ناڤبری و تاکو سالا ١٩١٠ێ ئەو روم دناڤ بنەمالێ دا مابوو لێ نها نەمایە، و وەکو شوینوار تاکو سالا ٢٠١٣ێ بنسترێن قەسرا داود ئاغای دیار بوون، لێ ب ئاڤاکرنا تونێلا گەلیێ زاخۆ ژناڤچوون.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی کەس بوو[٦٩]، ژ چەندین بابکان پێکدهێن و بەلاڤن ل گوندێن (ترکژا، هاجیا، گرشین، پێچەکا ژووری، پێچەکا ژێری، کومبەل، کولێمنێ، شکەفتێ، شەکراڤا، چەمزراڤ، دووبەردانێ، گرۆسمانێ، چۆپانیێ، زاخۆ، ئافخانێ، باوەردێ، بامێرێ)، یێن کو بەری هەوا تەعریبێ ل گوندی د ژیان ژمارا مالێن وان دگەهشتنە (٣٠) مالان و یێن تا نها وار ل گوندی هەین: بنەمالا سلێمان ئاغای، بنەمالا داود ئاغای، بنەمالا عەلی مصتو، بنەمالا ئۆمەر پیرا، بنەمالا رەسوولی، بنەمالا حەسەن عەتمانا، بنەمالاسەعیدی، بنەمالا حەمای.

**سیمایێ گوندی:**

گوند دکەڤیتە جهەکێ بلند و ستراتیجی و یێ زاڵ بوویە ل سەر رێکا ئێکانە کو بازێرێ زاخۆ و دەشتا سلێڤانەیا و رێکا دهۆك و مووسل پێکڤە گرێددت، لەوا دهەر شەرەکی هەمی ئالیێن شەرکەر بزاڤ کرینە کومتێن ئاڤارێ ترکژا کونترول بکەن.

گوند ژ گەلەك نهال و لات و کانی و زەڤی و گرکان پێکدهێت، وەکو کۆخێ فەرحانی و کۆخێ حەجی یاسینی و سێ گرگێت خنوی و گەلیێ ئەمینی و گەلیێ عەلی باسا و مل عجاج و خرابە رەزێ ملا بەنێ و چەپەرێ ئیسڤێ بەیبوونێ، و دبێژن ئەو چەپەر بۆ شەرێ مەزنێ ترکژا ب کار هاتبوو ژ بال ناڤبریڤە.

**کانیێن گوندی:**

کانیا خرابەی کو چایخانا محسن سەتا ل سەر هاتبوو چێکرن، کو جهەکێ سروشتیێ دلڤەکەر بوو و یەك بوو ژ سیمایێن گوندی دسالێن چلان و تا سالێن شێستان دا، دیسان کانی گەرمك و کانیا گوندی دو ژێدەرێن ئاڤا ڤەخوارنا گوندیان بوون.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

چاندنا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆکان ب ئالاڤێن کەڤن ل بەرێ ب رێزا ئێکی دهات، پشتی ل سالێن چلان ئالاڤێن نوی یێن چاندنێ هاتین، ئێدی کارێ چاندنێ بەرفرەهـتر لێ هات و بۆ مەزنترین دەرگەهێ ژیارا وان. خەلکێ گوندی ژبلی چاندنێ تەرش و کەوال ژی وەکی ژێدەرێ دووێ یێ ژیارا وی خەلکی بوو، و ل پشکا چیای رەز ژی دکرن، و جۆرێن ترێ دێم و هژیر و سماق بەرهەم دئینان، دیسان دار ژی د برین و ب دەواران دبرنە زاخۆ دفرۆتن. ئاڤارێ گوندی گەلەك جۆرێن گژ و گیایێ خورستی بەرهەم دهینا و خەلکێ وی مفا ژێ دیتن، چ بۆ خارنێ یان فرۆتنێ با، ڤی گوندی راڤ و نێچیرا چیایی ژ پەز کووڤی و کێڤریشك و رووڤی و سیخور و کەو و سووسکان لێ هەبوو، هەر وەسان ل دەشتێ ژی یا کێڤریشك و ئاسك و قتکان و.... هتد. باش سوواری و بەریکانێن سووار باشیێ ژی ئێك بوو ژ ئارەزوویێن خەلکێ گوندی ل دەمێ بێ کارێ.

ترکژا پشتی سالا ١٩٧٤ێ نە هاتییە ئاڤاکرن و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهـ و بازێران د بەلاڤن، ژمارا

خێزانێن خەلکێ وی نها دگەهنە نێزیکی (٢٠٠) سەرۆك خێزانان. نها جووت سایدێ دەولی دبەر سینگێ گوندی ڕا دەرباز دبیت و ئاڤاریێ وێ کریە دوو بڕ. ل دەستپێکا سالا ٢٠١٤ێ خرابێ گوندی کەتیە ژێر پرۆژەیێ تونێلا گەلیێ زاخۆ و چەندەك ژ سیمایێ گوندی گهوریە. ئەڤ گوندە سالانە دهێتە شینکرن و ڤەڕێژەکا مەزنا گەنم و جەهان بەرهەم دهینت[٧٠].

## كۆمەلگەها گرشین:

جهەکێ بلندە دکەڤیتە هنداڤی دو نهالان ل سەر ڕێکا سۆریا ب دووراتیا (١١کم) ڕۆژاڤایێ باتێلێ دناڤ ئاڤاریێ گوندێ ئێمەلکێ دا ل سەر ڕێکا دهۆك – پێشابوور، و چارڕیانا دکەڤیتە دبن گەلیێ زاخۆ دا بەرەڤ باشووری ب دووراتیا نێزیکی (٧کم) کو نها دبێژنێ چارڕیانا گرشینی. کۆمەلگەهـ هەڤسنوورە دگەل کۆمەلگەها باوەردێ ژ ئالیێ ڕۆژهەلاتی و کۆمەلگەها کێلکێ ژ ئالیێ ڕۆژاڤای و گوندی کانێ کەرکێ ژ ئالیێ باکووری و ئاڤاریێ گوندی چیمەنیا ژ باشووری. کۆمەلگەهـ ب مەرەما بعەرەبکرنا دەڤەرێ ب ناڤێ (الفارس) پشتی نسکۆیا ١٩٧٥ێ هاتیەئاڤاکرن و خەلکێ وێ یێ ڕەسەن دەربەدەرکربوون، و عەرەبێن جبۆر و عوبێد و حەدیدی لێ ئاکنجیکربوون و ژ نێزیکی ٢٠٠ خانیا و تابەکێ چاندنێ و خواندنگەهەك لێ هاتبوونە ئاڤاکرن. پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ خەلکێ وان گوندێن نێزیکی ڤێ کۆمەلگەهێ وەکی گرشین و کانی کەرك و ئێمەلك و ترکژێ لێ ئاکنجیبوون، و ژبلی سلێڤانەییان چەندین عەشیرتێن دی وەك میرا و مووسا ڕەشی و بەرواری و دۆسکی و کۆچەران هەمبێزکرینە.

کۆمەلگەهێ نها چەندین خزمەتگوزاری لێ هەنە، وەکی خواندنگەهەکا مەزن و مزگەفتەکا مەزن و گەلەك کۆلانێن وێ هاتینە ڤێرکرن، ژبلی دابینکرنا ئاڤێ ب ڕێکا (٢) بیرێن ئیرتیوازی. ژیارا گەلەك ژ خەلکێ مینا بەرێ تۆڤچینی و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە و هندەك کارێ شوفێریێ دکەن و هندەك ژی پێشمەرگەنە. ژ سیمایێن گوندی دو نهال هەنە، یەك ژ وان ب ناڤێ نهالا کانێ کەرکێ ل ڕۆژاڤایێ کۆمەلگەهێ.

## گوندی گرشینی:

گرشینی ئاڤارەکێ بەرفرەهـە دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (٨کم) ڕۆژاڤایێ باتێلێ. ناڤێ گری ژ (گرێ – شین) هاتییە، و وەسا دیارە ب دەست هاتییە چێکرن مینا گرێ باستکێ و ماڤانێ و مالتایێ...هتد.

### سنوورێن گوندی:

**باکوور،** گوندێن ترکژا و ڤادیا

**باشوور،** گوندێ باوەردێ

**ڕۆژهەلاتی،** گوندێن گرۆسمانا و هاجیا

**ڕۆژئاڤای،** گوندێن کەهنی کەرکێ و ئیمەلکێ

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

پێکهاتا گرشینی وەك ملك یێ بنەمالێن ترکژیانن (بنەمالا عەبدولرەحمانێ مسعوودێ سلێمان ئاغایێ ترکژی)، و دکەڤندا ئەڤ بنەماله و چەند مالێن دی ژ بابکێ بابلا و شەمسا ژ سلێڤانەییان لێ بوون، ژبلی چەند مالێن شرنەخی و کۆچەرێن هاجا و هەموو دبوونە نێزیکی (٤٠-٤٥) مالان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا وان ل سەر خودانکرنا تەرشی ژ پەز و بزن و چێلان بوو و هندەکان مێشێن هنگڤینی خودانکرن و نێزیکی (٢٥) جۆتیاران تۆڤچینیا گەنم و جەهان ب ئالاڤێن کەڤن دکرن و هندە مالا ژیارا وان ل سەر پالەتی و کەتکاریێ بوو، پشتی ماکینێن چاندنێ سالێن چلاندا گەهشتینە دەڤەرێ ئێدی تۆڤچینیێ سەر ژ هەموو کارا ستاند و تانها ژی ژێدەرێ سەرەکی یێ ژیانا پتریا وانە.

گرشینی چەندین جاران کەتیە بەر لەهیێن

بڕیارێن حکومەتێن بەغدا و هاتییە وێرانکرن و چۆلکرن. سالا ١٩٦٣ێ دەمێ دەربازبوونا لەشکەرێ سۆری دناڤ دەڤەرێ دا گوند ب فەرمانا حوکمەتا عیراقێ ب هێجەتا دەڤەر بوویە مەیدانا شەری هاتە چۆلکرن و خەلکێ وی ب زۆری برنە مووسل. پشتی زڤراندنێ جارەکا دی ل داوییا سالێن شێستاندا گوند هاتەڤە وێرانکرن. داوی جار ژی کەتە بەر لەهیا (تەخریب و تەعریبێ)ێ و خەلکێ وی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ چەند جهان.

گرشینی وارەکێ راستکەهیە و ئاخەکا بەرفەرە و ب بەرەکەتە، دکەڤندا ئاکنجیێن ڤی گوندی گوند ل سەر گرەکێ بلند ب ناڤێ گرشینی ئاڤاکرن، مالا عەبدولرەحمانێ مەسعوودی ل سەرێ وی گری بوو و مالێن دی ل دەوروبەرێن گری بوون. ڤی وارێ بەرفرەهـ چەندین گرو و وارێن ب ناڤ هەنە، ژ نهالێن گوندی، نهالا سەرگەرێ ل باشوورێ گوندی و نهالا دەرەجوولێ دناڤبەرا گوندی و گوندێ هاجیا کو نهالەکا درێژە، و نهالا کەڤرۆکا کو ژ گوندی ترکژا دەسپێدکەت و دگەهیتە ئاڤا مەزن، دیسان نهالا خرابووکی ل رۆژهەلاتێ گوندی کو ژ گوندی قەلەما دەسپێدکەت تاکو دگەهیتە ئاڤا مەزن. ژبلی چەندین گرك و بلنداهی، وەکو گرێ کەڤرۆکا ل رۆژئاڤایێ گوندی یێ کو گۆڕستانا گوندی هەمبێزدکەت و گر زەرك ل رۆژهەلاتێ گوندی دناڤبەرا گوندی و گوندی گرۆسمانی و گرێ بەرزیڤکی ل باکووری دناڤبەرا گوندی و گوندی قادیا و خرابووك وارگەهەکێ خرابەیە و کەڤنە دکەڤیتە باکوورێ گوندی و بلنداهییا ملا حەفت ڕیانێ ل ئالیێ رۆژاڤای کو وەکی گوندی دبێژن ژبەر کو ڕێێن چەندین گوندان ل سەرێ ڤێ ملێ یەك دو دابڕدکەن، دناڤ ئاقارێ ڤی گوندی دناڤبەرا گوندی و گوندی ترکژا دا بەرەکێ سەیر ب ناڤێ بەرێ لاوا هەبوو لێ نها نەمایە، شێوێ وی یێ گرۆڤر بوو وەکو هێکێ لێ مەزناهییا وی نەهاتییە زانین و وەکی دگۆتن تەنێ دو کەسان ل گوندی دشیان ڤی بەری ژ ئاخێ بلند بکەن. ژ بلنداهیێن ب ناڤ ل ڤی گوندی (گرێ شین) ب خۆیە کو گوند یێ هاتییە ناڤکرن، ل تەنشتەکا ڤی گری چەند گوڕەك دیار بوون لێ دیرۆکا وی دیار نینە. هەر دناڤ ئاقارێ گوندی دا چەندین زەڤیێن ب ناڤ هەنە، وەکو زەڤیا خوینێ ل باکووری دناڤبەرا گوندی و گوندی قادیا و چەندین چیڤانۆکێن ئاشوویێ ل سەر ڤێ زەڤیێ هەنە، هەڤشێ تەحلا دناڤبەرا گوندی و گوندی قەلەما و تەحلا ئانکو تەحلێ کو ئەوژی گیایەکێ ب ڕینە و بەلگێن وی د فرەهن و جارنا نێزیکێ یەك مەتری بلند دبوو، لێ ئیرو بنبڕ بوویە، و زەڤیا گر زەرکێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، دیسان زەڤیا باستامێ ل باکووری دناڤبەرا گوندی و گوندی قادیادا.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی

وەکی کەڤنێن وان دبێژن تەنێ ل دو مەتران ئاڤ دەردکەت، لەوما گوندی ب ساناهی شیان دو بیران، ئێك ل سەرێ گوندی و یا دی ل ژێریا گوندی ب کۆلن، زێدەبارێ نهالا سەرگەرێ ل باشوورێ گوندی کو ئاڤەکا زراڤ دناڤدا دچوو.

گرشینی پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ و ژبەر کو نێزیکی کۆمەلگەهانە و خزمەتگوزاریێن دروست بۆ نەهاتینە دروستکرن و نەهاتییەئاڤاکرن، هەر چەند هێلا کارەبێ لێ هەیە و بیرەکا ئیرتیوازی بۆ هاتییە کۆلان، لێ هەر سال دهێتە شینکرن و سیستەمێ دابەشکرنا ئاخێ ل ڤی گوندی پشتی سالا ١٩٩١ێ (٢٠٧٥دۆنەم) بۆ مەللاکی و (١٣) دۆنەم بۆ هەر جۆتیارەکی کو ژمارا وان (٩٠) جۆتیارن[٧١].

## گوندی قادیا:

قادیا ب دووراتییا نێزیکێ (١٦کم) دکەڤیتە رۆژاڤایێ گەلیێ زاخۆ بنارێ چیای باکوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکوور:** چیایە

**باشوور:** گوندێ کانی کەرکێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ترکژا

**رۆژئاڤای،** گوندێ کولێ

ئەڤ گوندە پارچەیەك بوو ژ ئاقارێ گوندی کوولێ، کوولێ وەکو ملك یێ بنە مالا شەمدین ئاغای بوو و تا نها (١٧) جۆتیاران ل گوندی پەیوەندیا چاندنێ دگەل مەللاکی ڤە هەیە، گوند ل داوییا سەدسالییا هەژدێ ژ بال بنەمالا ناڤبری هاتیە ئاڤاکرن، هەموو پێکهاتا گوندی سلێڤانەیی بوون، گوند چەند جاران ژ ئالیێ حکومەتێن عیراقێ ڤە هاتیە سۆتن و خەلکێ وی دەربەدەربووینە، و ئێکەم گوند بوو کەتیە بەر هێرشێن فرۆکەیێن عیراقێ د سالێن شێستاندا، و چەند مرۆڤەك ژ گوندی کوشتن، ل سالا ١٩٧٤ێ بۆ داوی جارا کەتە بەر هەوا ب عەرەبکرنێ، کو هینگێ ژ (١٥-٢٠) مالان پێکدهات.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

دکەڤندا ل سەر تۆڤچینیێ بوو و ئەو سالێن ئاڤ هەی گوندیان برنج ل شێلا قادیا دچاندن، هەر دوێ سالێدا زەبەش ژێ ل دێمی دچاندن، و خەلکێ گوندی گەلەکان ل بەشێ چیای رەز هەبوون، هەر وەسان تەرش ژی ژ پەز و بزنان خوداندکرن، گەلەك ژ گوندیان ماهینێن کحێل بۆ سەرەدان و هاتن و چوون و دیلان و نێچیر و سەیرانان خوداندکرن.

ژ سیمایێن گوندی سەرێ کومتێ کەر فرینی، کو ل بلنداهیا گەلیێ زاخۆ ئالیێ رۆژاڤا دیاردکەت و بلنداهیا گەلیێ مێزگەهێ و پارێ، نهالێن قادیا نهالا کوور یاکو نها ب گەلیێ زاخۆ بەرنیاسە و ئەو گەلی نیڤەك ل قادیا و نیڤا دی ل گوندی ترکژا ڤەدگەرت، و نهالا گوندی یاکو دکەڤیتە نیڤا گوندی و پاشان گرێ قەسرووکێ یێ کو گوند بۆ ئێکەم جار ل سەر هاتییەئاڤاکرن و گرێ زیارەتا ل رۆژاڤایێ گوندی و گرێ سۆر ل رۆژهەلاتێ گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

بیرەك بوو ل سەر دەمێ هازم بەگێ ب دەست هاتبوو کۆلان و ب بەرا هاتبوو شوورهەکرن و کانیا عاقدێ کو ئەوژی ب بەرا دیوارکریە ونها هشك بوویە، و کانیا مەگلانی ل باشوورێ گوندی.

دەستپێکا سەرهلدانا ١٩٩١ێ خەلکێ گوندی زڤرینە وارێ خۆ و نێزیکێ (٣٠) ئاڤاهیان لێ دروستکرن لێ ژ بەر نەبوونا خزمەتگوزاریان هاتە چۆلکرن ڤە و نها تەنێ یەك مال پەزی ل وێرێ ب خودان دکەت و دو بیرئیرتیوازی لێ هاتینە کۆلان و کارەب ژی لێ هەیە. نها ل ڤی گوندی چەندین پرۆژەیین کەرتێ تایبەت لێ هەنە، وەکو پرۆژەیێ خودانکرنا پەزی و مریشکان و کارگەهێن ڤافوونی و رساسی و قیرێ و کارگەها تێکەلکەرا چیمەنتویێ. نها ب هەزاران ئاوارەیێن شنگال و زوممار ل کەمپا ئاقارێ ڤێ گوندی هاتینە ب جهکرن[٧٢].

### گوندی کەهنی کەرکێ:

کەهنی کەرکێ دکەڤیتە دووراتیا نێزیکێ (١٥کم) رۆژاڤایێ باتێلێ. ل ڤی گوندی د کەڤندا تەنی بنەمالا (کەرا) لێ ژیاینە، لەوا دبیت ناڤێ گوندی ژ ڤێ چەندێ هاتبیت، لێ هندەك دبێژن هژیرەکا مەزن ل هنداڤی کانیا گوندی هەبوو و هژیرێن وێ نەدگەهشتن و هێژ (کەرك) دوەریان، و هندەك ژی دبێژن ژناڤێ کەسەکی هاتیە کو ل ڤی واری ژیایە و ناڤێ وی کەرەڤان بوو.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ قادیا

**باشووری،** گوندێ ئێمەلکێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گرشینی

**رۆژئاڤای،** گوندێ کەشکانێ

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٦٣ کەس بوو[٧٣]، گوند بەری سالا ١٩٧٥ێ پێکدهات ژ نێزیکێ (٢٥) مالێن سلێڤانەییان (مالا

حەجی عەلی و حەجی پیری و رەمەزانێ محوی) كو هەر ژ سەر دەمێ ئوسمانیان لێ ژیاینە، ژبلی چەند مالەكێن دی مینا مەلا حسینێ دۆسكی ب رێكا مەلاتیێ و مالەكا كۆچەرێن سێفا و مالەكا چەم باهیڤێ و نها خودان ملكن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر توۆڤچینیێ بوو، ژبەر هەبوونا ئاڤێ برنج و كونجی ژی دهاتنە چاندن و جنیكێن فێقی و سپیندار ژی ل سەر نهالا گوندی دهاتنە چێكرن. دیسان خودانكرنا تەرشی ژ پەز و بزنان دەرگەهەكێ دێ یێ ژیارا خەلكی گوندی بوو.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

كانێ كەركێ چەندین كانی لێ هەبوون مینا كانییا گوندی كو دبێژنێ كانێ كەرك و كانییا ژنا و كانییا شركێ (هەرسێ هشك بووینە و دكەتنە رۆژاڤایێ گوندی) و كانی جووتان كو نها ئاڤا وێ یا كێمە، دیسان نهالا پیرە خانێ ل باشووری گوندی و نهالا بەناڤیكێ ئەوژی پری ئاڤ بوو و جنیك و حەودێن سپینداران و برنج و كونجی و...هتد ل بەر دهاتنە كرن. دیسان نیشانێن دو ئاشێن كەڤن ل سەر ڤێ نهالێ هەنە، یێ سەری بێ ناڤە و یێ ژێری دبێژنێ ئاشێ شێخ سەعدی، دیسان نهال دێمك كو ژ دەرێ گەلیێ زاخۆ دەست پێ دكەت و تاكو ژ گوندی دەرباز دبیت هەیە، نهالا ئاڤا تویكێ كو یا ئاڤی بوو و دەرامەت ل بەر دهاتەكرن، پاشان نهالا دێرك كو دو كانی دزكێ وێدا هەبوون، و ئەڤ نهالێن پری ئاڤ ئاش ژی لێ هەبوون، مینا ئاشێ ئەمینی ل سەر گەرا مەزرێ ل رۆژاڤایێ گوندی و ئاشێ حەجی ئیسڤی دناڤ ئاخا ئێمەلكێ دا، گوندێن دەوروبەر هەمووان مفا ژێ دیتن، ڤی گوندی چەندین گرك ژی لێ هەنە، مینا زۆرێ سەعیدی ل باشووری گوندی، گرێ پیڤۆكا ل رۆژهەلاتێ گوندی و گركێ فللەها كو چەند گورەكێن كەڤن ل سەرن و گركێ قووتێ عەلوی كو نیشانێن خرابە گوندەكێ كەڤنن، ل رۆژاڤایێ گوندی ژی نیشانێن دێرەكا كەڤنار یێن هەین و بەرێن بنستری ژێ ماینە، ژبلی هەبوونا رووبەرەكێ مەزن ب نێزیكی (٤٠) دۆنەمان یێن گۆرستانەكا مەزن ل باكووری گوندی ب ناڤێ كوردێ سۆر، و گورێن وێ بەر قیبلەنە، دیسان زەڤیەكا مەزن ب ناڤێ زەڤیا شەولێ هەیە و نیشانێن گوندەكێ مەزن لێ دیارە، هەر وەسان شوینوارێن مزگەفتێ ژی ل هەنە، مێژوویا ئاكنجیكرنێ دیار نینە. ل ڤی گوندی تەنێ شكەفتەك ب ناڤێ شكەفتا ئاڤدەلی دبن گرێ زیارەتانرا ل ئالیێ رۆژهەلاتی هەیە، و خەلكێ گوندی و گوندێن دەوروبەران تا نها ژی گرێ زیارەتا ئاخا وی ب پیروز دزانن و بۆ چارەسەركرنا زەركێ ب كارتینن.

خەلكێ ڤی گوندی ژی كەتیە بەر هێرشێن حكومەتێن عیراقی و سۆری ل سالا ١٩٦٣ێ و ل داوییا سالێن شێستان جارەكادی كەتیە بەر هێرشێن جاش و لەشكەرێ عیراقێ و خەلكێ وی دەبەدەری گوندێن دەوروبەر بوون. داوی جار كەتە بەر برپارا هوڤانەیا (تەخریب و تەعریب)ێ و خەلكێ وی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ باتیفێ، و پشتی دەمەكی هێدی هێدی خەلكی وی خۆ نێزیكێ زاخۆ كرن و پتریا وان لێ ئاكنجیبوون، تا سالا ١٩٩١ێ و سەرهلدانێ خەلكێ گوندی شیان بزڤرنە سەر ملكێ خۆ، لێ ژبەر نێزیكبوونا گوندی ژ كۆمەلگەها گرشینی و هەبوونا خزمەتگوزاریان ل وێرێ گوند نە هاتەئاڤاكرن و تنێ سێ چار ئاڤاهی لێ دروستبوونە وئێك مالا خودان پەز لێ دژیت، نها كارەب لێ هەیە و بیرئیرتیوازیەك ژی بۆ هاتیە كۆلان، خەلكێ گوندی ژ نێزیكی (١٢٠) سەرۆك خێزانان پێكدهێت و (٤٨) ژێ جۆتیاریێ دكەن و ل هەر سال ئەڤ وارە دهێتە شینكرن[٧٤].

## گوندی كوولێ:

گوندەكێ كەڤنە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گەلیێ زاخۆ ل بنارا چیای ب دووراتییا نێزیكێ (١٧كم) باكوورێ رۆژهەلاتێ باتێلێ، ل سەر ناڤێ گوندی دانعەمرێن وان دبێژن ئەڤ ناڤە هینگێ هاتییە سەر دەمێ ل دەستپێكێ گوند ب شێوێ كۆلكا بوو، ئانكو بێ سەرو بەر بوو و دیرۆكا وی دیار نینە.

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی سلێڤانەیی نە و وەكو ملك یێ بنەمالا شەمدین ئاغای بوو، و دگەل ڤێ بنەمالێ چەندین بابكێن دی لێ د ژیان وەكو بنەمالێن: مام ساما و برۆ حسینا و خەلەفا و بلوێدی و عەلا وئیسف حاجی و ئاڤدەلا و محویێ عەلی ئاغای و شلیزی، نها لێ نەماینە. كوولێ ل سەدسالیا بووری گوندەكێ مەزن بوو و نێزیكێ (١٣٠) مال لێ هەبوون.

## زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر چاندنێ بوو و ڕووبەرێ گوندی یێ ب كێرێ چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیكێ (٣٠٢٣) دۆنەمان و پشتێ ڕاستڤەكرنا یاسایا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) ل سالا ١٩٧٥ێ گوند خەملاند ب ڤێ شێوەی، ئەوژی (٧٤٨) دۆنەم بۆ مەلاكی و (٢٢٧٥) دۆنەم ل سەر (١٧٥) جۆتیاران هاتییە پارڤەكرن و ژبەر كو گوند یێ بنەمالا شەمدین ئاغای بوو و هازم بەگێ دەستەكێ باش د پێشخستنا ژیانێ دا هەبوو ب تایبەت چاندنێ لەوا هەر زوی تەراكتوور گەهشتیە گوندی، لێ گەلەك پویتە ب خودانكرنا تەرشی نەهاتییە كرن و ئەگەر هەبیت ژی بۆ پێدڤیێن ڕۆژانەبووینە. دیسان پتریا خەلكێ ڤی گوندی خودان ڕەز بوون و هندەك كەسان بەلكێ سی ڕەز ژی هەبوون و جۆرێن تری بەرهەم دهینان مینا زەرك و تریێ ڕەش و ژبلی هژیر و باهیڤ و....

## كەلتوور جڤاك:

ژ چاڤ فرەهیبا خودانێن گوندی هەركەسی ب پێدڤی خوەجهیێ با دشیا ل كوولێ ئاكنجیببت و نێزیكێ (٣٠) مالێن موتورب و دەروێشان لێ خوجە بون و نانێ خۆ ل گوندی دابیندكرن و تێكەلێ جڤاكێ وان ببوون.

یەك ژ كەڤنێن گوندی دبێژت ژ كەیف خۆشیا گوندیان د ڕۆژەكێ دا و بێی كو داوەتەك هەبیت پێنج كۆمێن گوندیان ژ بچویك و مەزنان مژوولێ داوەتێ بوون، كۆمەك ب دەهۆل و زڕنا و كۆما دی ب دەفێن دەرویشا و یادی ب تەنەكا و یادی ب دەنگی و هەمی ڕۆژان هوسا بوو، ڤی گوندی جۆرە دیلانەك هەیە و تەنێ گرێدای كوولی یە ب ناڤێ (كوولیانی) و داوەتیێن باش هەبوون و گەلەك پووتە ب بەژنا خۆ دان و لڤلڤینێن سەیر دناڤ ڤی جۆرە داوەتی دا هەنە و سەركێشێ داوەتیا دگۆتنێ (برو مرا) ژ بابكێ مام ساما دبێژن گەلەك جاران ئەوی و موتربی ب شفكێ دگەل ئێك دو د ئاخڤین و تێك دگەهشتن و دیسان ب وێ شفكێ یێ داوەت نەزانی با جهێ وی دگهوڕی، وەكو دبێژن ل داوەتان پتریا گوندیا كەرێن خۆ دفرۆتن و ددانە ب شەل و شەپك و دەمێ داوەت ب دووماهێ دهات دیسان جلێن خۆ دفرۆتن و كەر دكڕینە ڤە. و د ناڤ سلێڤانەیا دا، دیلانا (كوولیانێ) ژ هەمیان ب ڕەوشترە. و وەكو هەڤركێ دبێژن دو مرۆڤێن داوەتێ ژ تووریێ هاتبوون كوولێ (بوزو و چاچان) و ب هاتنا وان هەردووان ڕۆژانە یان دەمێ دیلانان هەڤركی یا كوولیانێ توورییانی دهاتە نیشاندان، و وەكوو ڤیستەڤالێ لێ دهات.

## سیمایێ گوندی:

ژبەر كو گوندی كوولێ ل بنارێ چیایە و دەشتا بەرینا سلێڤانەیا دبەردایە سیمایەكێ هەری جوان هەیە ژ كومتە و گەلیێن چیای و گر و نهالێن دەشتێ. ژ كومتێن چیایان: چەپەرێ ئینگلیزی و دبێژن ب ناڤێ ئیگلیزی هاتییە ب ناڤكرن ژبەر كو شەرێ وان گەلەك دوی چەپەری دا هاتییەكرن، دكەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی ڤادیا ژ ڕۆژهەلاتی و پاشان كەلا كوولێ ل هنداڤی گوندی و تەنێ یەك ڕێ یا مرۆڤان دچیتێ و جهەكێ شوینواری یە و دهێتە هەژمارتن پارچەیەك ژ شوینوارێن زەعفەرانێ و تانها تەنوورێن كەڤن لێ هەنە، كۆخێ نێریا كو كومتەكێ بلندە و زالە ل سەر دەشتا كوولێ و كۆخێ شكەفتێن ب ڕێز دناڤبەرا گوندی و گوندی خەربەنووری.

دیسان چەند گەلی دكەڤنە دناڤ كومتێن

ناڤبری دا، وەکو گەلیێ شکەفتك، گەلیێ مەحموودێ، گەلیێ رەزا، گەلیێ شکەفتا سوور، گەلیێ بازێ، گەلیێ خلوێ، گەلیێ عەمەر گێندەلا، گەلیێ گەراڤێ یێ کو چاڤکانییەك د زکێ ویدا هەی و ئاڤا وێ یا تەحلە، گەلیێ وشتوی، گەلیێ گێچێ، گەلیێ نەرمکا شکەفتا سوور. دیسان چەند شکەفت ژی دناڤ روویێ چیای دا هەنە وەکو شکەفتا سالێ دناڤ گەلیێ خلوێ دا، شکەفتا رەش، شکەفتا بنێ کەلهێ شکەفتەکا زۆر مەزنە لێ دەرگەهێ وێ یێ تەنگە و دڤێت خودان ب شەهرەزایی ب گەهیتێ، شکەفتا سوور و یا پەزی، شکەفتا کەڤۆکا ل گەلیێ محوی، شکەفتا پەزی د هەمان گەلی دا، شکەفتا کەڤۆکا و کوورە، شکەفتا نهێلا بلوێدیا دکەڤنە دناڤ گەلیێ رەزاندا، شکەفتا گەلیێ جوهنی، شکەفتا زکێ چالێ، شکەفتێن ب ریز. دیسان چەندین گرك و زۆرك هەنە وەکو زۆرێ مەزرێ و مل هەبانێ یێن کو دکەڤنە دناڤبەرا گوندی و گوندی مەزرێ و گرێ خراپ رەشکێ یێ کو پارچەیەك ژ شوینوارێن زەعفەرانێ و گرێ سوور و گرێ زیارەتا و گرێ ملا عەلوی یێ دکەڤیتە دناڤبەرا کولێ و قادیا و گرێ کەندالێ عەمەری یێ کو دکەڤیتە باشوورێ گوندی. دیسان گوند پڕی نهالە، وەکو نهالا قەسوولێ ئەو دهات ب کار ئینان بۆ ئالفکرنا پەز و بزنی، نهالا گوندی، نهالا کفری[٧٥] ، نهالا کەڤرکا سۆر، نهالا هەفشێ کۆزکێ، نهالا کەندالێ عەمەری، نهالا خانم خرتێ، نهالا کەندالێ ملا حەسەنێ، نهالا خراب رەشکێ.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

چەندین چاڤکانی ل دەردۆرێن گوندی بەلاڤن وەکوو: کانییا گوندی کو نها ئاڤا وێ یا کێمە، کانییا ژنان و ئاڤاوێ هەر ل سەر کانییا گوندی بوو لێ ب شێوێ سۆلین دگەهشتە ژنان، کانییا قەبرا ل نێزیکێ قەبرا، کانییا مێرا نها هشك بوویە، کانییا رەزێ سەید محەمەدی کو تا نها یا ب ئاڤە، کانییا گەرماڤێ ل دەرێ گەلیێ بازێ و تا سالا ٢٠١٣ێ یا ب ئاڤبوو لێ بەر ب هشکبوونێ دچیت.

دەشتا دبەر گوندی دا دچیت چەندین زەڤی و مەیدانێن ب ناڤ لێ هەنە وەکوو: زەڤیێت سڤۆکێ چەند زەڤیەکن دناڤبەرا گوندی و گوندی خەربەنوورێ، زەڤیێت ملهەبانێ، زەڤیا ملا دارکا، زەڤیا سەدقێ، زەڤیا ناڤرێکێ، زەڤیا کولانێ، زەڤیا سمایلێ، زەڤیا ملێ و زەڤیا زراڤکێ. و یەك ژ پارچێن هەری گرنگ ل گوندی کولێ (زەعفەرانێ )[٧٦] یە.

گوندی کوولێ ل سالا ١٩٧٥ێ کەتە ژێر سیاسەتا وێرانکارییا بەعسیان و هاتە وێرانکرن و پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ کوولێ ژێ هاتە رزگارکرن و خودانێن وی زڤرینەڤە و گوند هاتە ئاڤاکرن، نها نێزیکێ (٥٠) ئاڤاهییان لێ هاتینە ئاڤاکرن و ل سالا ٢٠١٤ێ ب دەهان مالێن ئاوارەیێن شنگالێ ل کولێ هاتنە ئاکنجی کرن. نها خەلکێ گوندی مینا بەرێ هەر سال گوندی شیندکەن و ل سەر دەمێ حکومەتا هەرێما کوردستانێ رێك بۆهاتییە ڤەکرن و خزمەتگوزاریێن ئاڤێ و کارەبێ بۆ هاتینە کێشان و خواندگەهەك لێ هاتییە ئاڤاکرن و دو بیرئیرتیوازی بۆ هاتینە کۆلان، لێ دڤان هەموو ئاڤاهییان دا تەنێ دو یان سێ مال لێ ئاکنجینە و خو ب خودانکرنا پەز و بزنانڤە مژوولن[٧٧].

## گوندی خەربەنوورێ:

گوند دکەڤیتە بنارێ چیای ب دووراتییا نێزیکێ (٢٠کم) باکوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ ل رۆژاڤایێ گەلیێ زاخۆ. رامانا ناڤێ خەربەنوور یان (خرابێ نوورێ) وەکی کەڤنێن گوندی دبێژن ل بەراهیێ گوند ل بەر چیای بوو و ژبەر کێم بوونا ئاڤێ گوند هاتە ڤەگوهاستن بۆ باشووری و ژبەر هەبوونا سوولینەکا کەڤن و ئاڤەکا خورت ژێ دزا، گوند ژ (١٣-١٥) مالێن سلێڤانەییان بابکێ بابلا پێکدهات.

## سنوورێن گوندێ:

**باکووری:** توخیبە دگەل چیای

**باشووری:** گوندێ مەزرێ

**رۆژهەلاتی:** گوند كولێ
**رۆژئاڤای:** گوندێ بەراڤێ

**سیمایێ گوندی:**

نەخشێن سیمایێ وێ ژ كومتێن بلندێن چیای دەست پێ دكەت و ل ئاقارێ مەزرێ ب داوی دهێت، ژ كومتێن چیایێ ڤی گوندی كومتێ شكەفتا تەوراتێ كۆخێ شكەفتا بزنێ و بەرێ حەسەنی و كۆخكێ حاجی و كومتێ گەلیێ شەمسا و بەرێ دەولێ. ژ گەلیێن وان گەلیێ قیروی، گەلیێ مالا، گەلیێ شەمسا. و شكەفتێن ب رێز بێن كو دبنە سنوور بۆ گوندی كوولێ و چەند نهال ژێ هەنە مینا ا كوور كەمینێ و نهالا وەیس لقرانی و نهالا خەربەنووری و مێزگەهێ و نهالا توخیبی یاكو دكەڤیتە ئالیێ رۆژاڤای ملێ پەراڤێ و گرێن گوندی گرێ مێزگەهێ و گرێ لەودا و گرێ پشتا مێزگەهێ و گرێ شێخ عبدولجەلیلی یێ كو گۆرستانا گوندی ل سەر و گرێ ئەسحابیەكی دكەڤندا ئەڤ جهـ تشتێن غەریب ژێ دەردكەڤن وەكو قافكا و خوەلیێ و گرێ رۆژاڤایێ مێزگەهێ و زۆرێ برووسكێ و گرێ گەرا مەلای.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ڤێ گوندی چەندین ژێدەرێن ئاڤێ هەبوون مینا كانییا مێزگەهێ یاكو دكەتە باكوورێ گوندی و كانییا خرابەی و كارێز نها خەتمیە و نەمایە و گەرا مەلای كو برنج ل بەر دهاتە كرن و دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و كانییا بچویك و بیرا كەڤن یاكو دكەڤیتە سەرێ گرێ مێزگەهێ. ژڤان كانییان وەسا دیار دبیت كو گوندی كەڤن پری ئاڤ بوو.

ل چیایێ گوندی چەند شكەفت هەنە مینا: شكەفتا تەوراتێ، شكەفتا بزنی كو ل دویڤ گۆتنان نێزیكی (٤٠٠) بزن لێ ڤەدحەویان، شكەفتا گەلیێ قیروی، شكەفتا بەرێ حەسەنی، شكەفتا كۆخێ حاجی، شكەفتا پێش دەرێ دەولێ و ل پشتا خرابێ كەڤن بانێ بورجێ یێ هەی و چار شكەفتێن بێ ناڤ لێ هەنە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

دكەڤندا ل سەر خودانكرنا پەز و بزنی بوو و دبێژن نێزیكێ (٢٠٠٠) سەر لێ هەبوون، دیسان تۆڤچینی ژی دكرن و ئەو چەند ل رێزا دووێ دهات، بۆ جارا ئێكێ د سالێن چلاندا تەراكتوور ژبال عەلیێ محوێ، گەهشتیە گوندی و هێدێ هێدێ وارێ چاندنێ بەرفرەهـ بوو و پتر خەلكی بەرێ خۆ دانە وی كاری و نها رووبەرێ ڤی گوندی نێزیكێ (٢٠٠٠) دۆنەمانە و هین د دەستێن خودانێن خوەیێن كەڤن دایە.

ئەڤ گوندە ژی چەندین جارا هاتییە سۆتن و وێرانكرن و خەلكێ گوندی دەربەردەر بووینە و داوی جار ل سالا ١٩٧٥ێ بوو ل ژێر برپارا ڤەگوهاستن و ب عەرەبكرنا گوندێن دەڤەرێ و گوند هاتە تەعریبكرن، تاكو سالا ١٩٩١ێ و سەرهلدانێ، دیسان هندەك خەلكێ وی زڤرین و نها سێ چار مال لێ دژین و نێزیكێ (٥٠٠) سەرێ پەزێ لێ هەیە، و پرۆژەیێن كارەبێ و بیرەكا ئیرتیوازی ل گوندی هەنە[٧٨].

## گوندی مەزرێ:

گوندەكە نێزیكی چیایە دكەڤیتە دووراتییا (١٧كم) رۆژاڤایێ باتێلێ.

**سنوورێن گوندێ:**

**باكووری:** گوندێن كوولێ و خەربەنووری
**باشووری:** گوندێ كێلكێ
**رۆژهەلاتی:** گوند كەشكانێ
**رۆژئاڤای:** گوندێ پەراڤۆكێ

**سیمایێ گوندی:**

پێكدهێت ژ كانی و و گر و دەشت و.... ژ كانییان: كانییا زەلاما، كانییا ژنكا، كانییا بەرێ سپی ژبەر كو ئاڤزەها وێ ژبن بەرەكێ سپی دەردكەت، و ژبەر هەبوونا گەلەك ئاڤێ برنج ل بەر دهاتنەكرن و گەلەك ژ گوندیان جنیكێن بچویك هەبوون، هەروەسا ئاشەك ب ناڤێ ئاشێ مستێ ل گوندی هەبوو و ب ئاگری كاردكر. مەزرێ تەنێ یەك نهال

هەبوو و هەمی ئەو ئاڤ و دەراڤە ب خۆڤە دگرتن، چاندن وکەسکاتی ل بەر دهاتەکرن، لێ ئەڤرۆ ئەو یا هشکە و تەنێ وەکی شوینوار و بیرهاتنێن وی ماینە.

دیسان گرێ دووشاخێ نیشانەکا سیمایێ گوندی یە و ناڤێ گرکێ ژبەر دو چەقیا وی یە ئانکو دو بەشە، دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی پەراڤووکێ دا .

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ڤی گوندی ب تنێ سلێڤانەیی لێ دژین، گوند وەکو ملك یێ مالا مستێ یە، بەری خرباکرن و ب عەرەبکرنا سالا ۱۹۷۵ێ نێزیکی ۳۵ مال بوون، گوند چەند جاران هاتییە وێرانکرن و سۆتن و ئاڤاکرن و خەلکێ گوندی چوجاران دەڤ ژ گوندی خۆ نەبەردراینە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندێ:

هەموو ل سەر چاندنێ بوو و رووبەرێ ئاخا گوندی کو ب کێرێ چاندنێ دگەهیتە نێزیکێ (۳٤۰۰) دۆنەمان. دیسان مێشێن هنگڤینی ژی ب خواندکرن و خودانکرنا تەرشی وەکی پەز و بزنان ژی ل گوندی دکرن. چاندن ل بەرێ ب ئالاڤێن کەڤن بوو، دەمێ ل سالێن شێستان ژ سەدسالییا چوویی تەراکتوور و دەراسە هاتینە گوندی هێدی هێدی پویتە ب ئالاڤێن کەڤن نەهاتەدان. ل دەستپێکێ مالا مستێ تەراکتوورێن ب ناڤێ (ئەلێ چارمز) یێن کو ل شوونا تایرێن ڤی سەردەمی ئاسن و بالتە پێڤەبوون، و پاشان دەراسێن (کلینار) پەیدابوون و ئەوژی رێکا دو مرۆڤان د عومبارا وێدا هەبوو و دمێ مۆخلا وێ گەنم دهنارت دعومبارێ دا وان هەردوو مرۆڤان دادگرتن و دهاڤێتن ژ دەرڤە.

ژ سالا ۱۹۷۵ێ و تا نها مـەزرێ کاڤل مایە و نەهاتییە ئاڤاکرن لێ هەر سال دهێتە چاندن[۷۹].

# گوندی ئێمەلکێ:

ئێمەلکێ ب دووراتییا نێزیکێ (۱۳کم) دکەڤیتە رۆژاڤایێ باتێلێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ کانی کەرکێ

**باشووری،** گوندێ چیمەنیا

**رۆژهەلاتێ،** گوندێ باوەردێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ کەشکانێ

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوند وەکو ملك ب بنەمالا شەمدین ئاغای ڤە گرێدایە و تەنێ سلێڤانەیی بابکێ شەمسا دکەڤندا لێ دژین، ل سالێن خەلایێ چەند مالەکێن شرنەخیا ئاوارەی گوندی بوون و پشتی راستڤەکرنا یاسایا چاندنێ ئەو بنەمال ژی بوونە جۆتیار و تا نها خودان ئاخن ل گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

د کەڤندا و ب شێوەیەکێ سەرەکی ل سەر تۆڤچینیێ و جۆت و جۆبارا بوو، دیسان خودانکرنا تەرش و کەوال ژی وەکی دەرگەهەکێ ژیانێ ب خودان دکرن، و ژبەر هەبوونا ئاڤەکا ڤەرێژ ل نهالا مەزنا گوندی چەندین جنیکێن فێقی و کەسکاتییێن هاڤینی و حەودێن سپیندارا ل بەر دهاتنەکرن.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

تا رۆژا ئیرو هندەك ژ ڤان ژێدەران ئاڤانە، مینا کانییا پتووکێ و نهالا گوندی و چەند کانیێن دێ هەبوون لێ هشك بووینە، مینا کانییا مێرا و کانییا برو ئیسڤا.

## سیمایێ گوندی:

ئاڤارێ ئێمەلکێ چەندین و گرك هەنە مینا گرێ مالا گرێ[۸۰] و گر ناعێل و زۆرێ گەورا و کۆزا کەڤلا و زۆرێ برقێ دکەڤندا داربەرووبەك ل سەری بوو و نها نەمایە، دبێژن گەلەك جاران برووسیا لێ ددا، و چەمێ بان هەسپانێ و چەمێ برجکێ و چەمکێت ئومەریا[۸۱] و دیسان نهال ژی لێ هەنە، مینا: نهالا ئێمەلکێ یا مەزن یاکو ژ شێلا قادیا دەست پێ دکەت

و د ئاقارێ كانێ كەرکێ ڕا دەربازدبت و ل دەسپێكا ئاقارێ ئێمەلكێ و ل سەر ڤێ نهالێ ئاشێ حەجی ئیسڤێ كانێ كەرکی هەبوو، ئەڤ نهالە درێژ دبت تاكو دگەهیتە سەر ئاڤێ ئانكو یەك ژ نهالێن مەزن و ئاڤی یە، نهالا شرکێ یان شرکا سۆفی سالحی یاكو هەردەم ئاڤ پێدا دهات لێ نها یا هشکە و گەلەك گوندیان ب وارێ ئەجنیا ددان ناسكرن كو دگۆتن ئەو ئەجنینشین بوو، نهالا زەمبووقێ و ل هنداڤ وان نهالا چەمێ عومبارێ هەبوو، زەڤیا نیسكا ژی یەك ژ جهێن بەرنیاسە و دیسان ل سەر نهالا گوندی سێ ئاشێن ئاڤێ ب ناڤێن ئاشێ حسێنێ عەڤدلەی و ئاشێ تەهایێ عەڤدلەی و ئاشێ دووشاخێ هەبوون.

ڤی گوندی چەند شوینوارێن كەڤن هەنە و دیرۆكێن وان دیار نینن، مینا موغبەرا قوببێ و زیارەتێن زاڕوكان[82] و بیرکێ ل نهالا گوندی و تووپا حەجی زەهرایێ كو زۆرا كەڤنە و تا نها یا شینە.

بەرێ هەوا خرابكرن و ڤالاكرنا گوندێن دەڤەرێ یا ل سالا ١٩٧٤-١٩٧٥ێ ئێمەلكێ نێزیكێ ٢٠ مالابوون، نها خەلكێ گوندی نێزیكێ ١٦٠ مالانە، ل زاخۆ و سێمێل و دهۆكێ و كۆمەلگەهێن گرشین باوەردێ دژین و هەمی سالا ئەردێ خۆ شیندكەن.

## گوندێ كەشكانێ:

كەشكانێ گوندەكێ كەڤنارە، دكەڤیتە سەر ڕیا سەرەكییا كو پێشابوورێ و دووڕیانا گرشینی پێكڤە گرێددت، ب دووراتییا نێزیكێ (٢٠كم) ڕۆژئاڤایێ باتێلێ. وەكو ملك یێ بنەمالا شەمدین ئاغای بوو، و ئاقارێ وی كو ب كێرێ چاندنێ دهێت نێزیكێ (١٣٠٠) دۆنەمانە. دكەڤندا جۆتیاران تابۆ ددانە مەللاكی، لێ پشتێ ڕاستڤەكرنا بڕیارا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) سالا ١٩٧٥ێ، گوند ل سەر ٣٩ جۆتیاران هاتە پارڤەكرن و ژ مەلاكی هاتە جوداكرن و تا نها ئەردێ وی دهێتە شینكرن. ناڤێ گوندی یێ ژ كەشكی[83] هاتی، و (كەشك- كانی)، یان (كەشك- ئانی) هێدێ هێدێ سڤك بوو و بوو كەشكانێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ كولێ

**باشووری:** گوندێ كێلكێ

**ڕۆژهەلاتی:** گوندێ ئێمەلكێ

**ڕۆژئاڤای:** گوندێ مەزرێ

دانعەمرێن گوندی دبێژن پتریا ئاكنجیێن گوندی دكەڤندا ژ شرنەخێ ل باكوورێ كوردستانێ هاتینە و ل ڤێ دەڤەرێ ئاكنجێ بووینە، بەری هەوا تەعریبێ گوند نێزیكێ (٣٠) مالا بوون.

### سیمایێ گوندی:

كەشكانێ گوندەكێ تێر نهال و گركە، وارەكێ تێر ئاڤە و چەندین چاڤكانی لێ هەنە وەكوو: كانییا گر شەمبوو ل ڕۆژئاڤایێ گوندی و تا نها ب ئاڤە، كانییا گوندی ل ڕۆژهەلاتی و بركا حاجی كو تا نها ب ئاڤە و بركا مەلای ل باشوورێ گوندی د سالێن نوتاندا سكرەك لێ هاتییە دروستكرن و دشێت (١٢٠٠٠٠٠) م٣ ئاڤێ عومباربكەت و نها مفا ژێ دهێتە دیتن بۆ دروستكرنا بیستانان و بلند كرنا ئاڤێ بۆ جهێن پێویست.

دیسان چەند گرك ل ئاقارێ گوندی هەنە مینا گر شەمبوو كو دەوروبەرێن وی دەشتەكا ڕاستە ل ڕۆژئاڤایێ گوندی و وەسا دیارە كو ب دەست هاتییە دروستكرن، گركێ عەمەرێ عەدلویێ هەر ل ڕۆژئاڤایێ گوندی، گركێ پیڤووكا ل ڕۆژهەلاتی، گركێ ئاڤزەهێ ئەڤ ناڤە هاتییە سەر ژبەر كو گەلەك دەمێن سالێ دەوروبەرێن وی گری شلن و ب ئاڤن، و گركێ ب صەحابی ناڤدكەن كو ل سەرێ وی گری گۆڕەكێ هەی و مێژوویا وی دیار نینە، نێزیكێ (٤٠) پیان یێ درێژە و گر ب وی گۆڕێ هاتییە ناڤكرن، دیسان ژ سیمایێن گوندی نهالن، مینا نهالا كەشكانێ یاكو ژ توخیبێ كوولێ دەسپێدكەت تا دگەهیتە دبن گوندی دا و ئاقارێ كێلكێ دبڕت و شێلا كەشكانێ یاكو پڕی قەڕام و دەحل، دكەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی كوولێ و چەندین نهالێن دی، دیسان ژ سیمایێن گوندی شكەفتا صوفی عەمەری ل ڕۆژئاڤایێ گوندی

و زیارەتێن گوندی ژبلی گۆڕستانەکا مەزن دناڤ ئاقارێ گوندی دا هەیە دبێژنێ زیارەتێن فللەهان، چونکی نەبەرقیبلەنە و مێژوویا وان دیار نینە، دیسان ژ گۆڕێن نەنیاس زیارەتێ شێخ محەمەدی یە کو دکەڤیتە دناڤ ئاقارێ گوندی دا و نەنیاسە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

هەر دکەڤندا ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو ژ پەز و بزن و چێلان، چاندن ب پلا دووێ دهات، ژبەر هەبوونا ئاڤەکا زۆر ل گوندی ب دەهان جنیك و ڕەز هەبوون و گەلەك فێقی مینا هنار و تری زەرك و ڕەش مێو و حولیك و هژیر و حەودێن سپیندارا لێ دهاتنە چاندن و چاندنا وان هەمی ب ئالاڤێن کەڤن بوو تا تەراکتوور و دەڕاسە هاتین ئێدی گوندی شیان خۆ ژ گیا کرنەی خلاس بکەن و پتر بەرێ خۆ بدەنە چاندنا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان و ڤەڕێژا داهاتیێ گوندی سال بۆ سالێ پتر لێ هات.

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ وارێ وان بۆ وان زڤریڤە، لێ هێژ گوندی خرابەیە، مفا ب دروستی ژ بەنداڤا وی ناهێتە دیتن، نها ژمارا سەرۆك خێزانێن وی دگەهنە نێزیکێ (٢٠٠) مالان، و پتریا وان ئاکنجیێن کۆمەلگەهێن گرشین و کێلکێ و زاخۆنە، سالانە خەلکێ گوندی بەهرا خۆ ژ ڤی گوندی شیندکەن و بەرهەمێ چاندنا دەخلێ خۆهلتینن[٨٤].

## گوندی پەراڤووکێ:

بدووراتییا نێزیکێ (١٨)کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ، هەڤسنوورە دگەل گوندێن پەراڤێ ژ ئالیێ باکووری و گرکەلێ ژ ئالیێ رۆژاڤای و مەزرێ ژ ئالیێ رۆژهەلاتی و بەغلووجێ ژ ئالیێ باشووری. رامانا ناڤێ گوندی وەکو کەڤنێن گوندی دبێژن نهالا گوندی یا کوورە و ئاڤەکا بۆش تێرا دەرباز دبوو لەوا ئەڤ ناڤ هاتییە لێکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ پەراڤێ

**باشووری:** گوندێ بەغلوجێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مەزرێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ گرکەلێ

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوندی پەراڤووکێ ژ نێزکێ (١٠) مالێن سلێڤانەییان پێکدهات و ژین و ژیارا ل سەر تۆڤچینیێ بوو و خودانکرنا تەرش و کەوالی و مێشێن هنگڤینی و چاندنا برنجی و کونجیا بوو و رووبەرێ وارێ ڤی گوندی دگەهیتە نێزیکی (٢٥٧٩) دۆنەمان.

پەراڤووکێ چەندین جاران ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٦، ١٩٦٨، ١٩٧٤)ێ ل سەر دەستێ حکومەتێن بەغدا هاتییە سۆتن و تالانکرن و خەلکێ وی دەربەدەری گوندێن دەور و بەر و باژاران بوون.

سیمایێ گوندی پەراڤووکێ پێکدهێت ژ گر و و چەندین نیشانێن دی، لێ تشتێ کو گوند پێ هاتییە ب ناڤکرن نهالا گوندی یە یاکو ژ پەراڤووکێ دەست پێ دکەت تا دگەهیتە ئاڤا مەزن، و ئاڤەکا باش د ڤێ نهالێ دا دچیت و خەلکێ گوندی کەسکاتیێ هاڤینی و برنج و کونجی ل بەر دچاندن، لێ نها یا بێ ئاڤە. دیسان گەلەك جهێن د بێ ناڤ هەن. نها گوند خرابەیە و کەس لێ نازیت، لێ هەر سال دهێتە شینکرن[٨٥].

## گوندی پەراڤێ:

دکەڤیتە بنارێ چیای ب دووراتییا نێزیکێ (٣٠کم) باکوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ. رامانا ناڤێ گوندی وەك گوندی دبێژن پێکهاتییە (پەر+ ئاڤ) یان (پڕ- ئاڤ) ، ئانکو ژ هەبوونا ئاڤەکا پڕ ل وی جهی و دکەڤندا ئەڤ ناڤ هاتییە لێکرن. دیرۆکا ئاڤاکرنا گوندی یا دیار نینە، لێ وەکو ملك یێ بنەمالا شەمدین ئاغای بوو، و دبێژن دەمەکیدا بوویە دیاری بۆ بنەمالا شێخ عەبدولقادری، پاشی ئەوژی کەتیە ژێر یاسایا ژمارە (٩٠) یا ڕاستڤەکرنا چاندنێ ل سالا ١٩٧٥ێ، و

جۆتیارێن گوندی ژێ مفاداربوون.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** چیایە

**باشووری:** گوندێ پەراڤوكێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خەربەنوری

**رۆژئاڤای:** گوندێ قەرووەدەی

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا گوندی ١٩٢ كەس بوو[٨٦]، پەراڤێ تەنێ ژ سلێڤانەییان، هەردو بابكێن شەمسا و بابلا و مالەكا خێركێ پێكدهات، بەری وێرانكرنا گوندی ل هەوا تەعریبێ گوند ژ نێزیكێ (١٥) مالان پێكدهات. ژین و ژیارا وان بەری هەر تشتی ل سەر خودانكرنا پەزو بزن و چووركان بوو، و بنەمالا حاجی محوی پتری (١٠٠٠) سەرێ پەز و بزن و چووركان هەبوو، ژبلی كو هندەكان (٧٠٠) و هندەكان تاكو (٥٠٠)ان هەبوون، و مفا ژ شیری و بەرهەمێن شیری دیتن و ب دەواران رۆژانە ل وەرزێ چێكرنا پەنیری ل سەرێ نیسانێ رەوانەی بازارێ زاخۆ دكرن، دیسان هەر سال هریا پەزی و موویێ چووركان ژێ دفرۆتن و گوندی دبێژن هەرسال جویێن زاخۆ ئەڤ هری و موویە دكرین. ژبلی ڤێ كاری خەلكێ گوندی چاندنا دەخل و دانی ژێ دكر و گوندەكێ ناڤدار بوو ب چاندنا دەخل و دانی، تایبەت پشتی ئالاڤێن نوی یێن چاندنێ هاتین و كارێ چاندنێ پێش خودانكرنا تەرش و كەوالی كەت.

ژبەر كو پەراڤێ نێزیكی چیای بوو و خەلكێ وی دەستكاتی بۆ شۆرشێ دكرن، لەوما گوند چەند جاران ژ ئالیێ حكومەتێن عیراقێ ڤە كەتیە بەر هەوا هێرشێن لەشكەری و دبێژن جارەكێ ل سەر دەمێ شۆرشا ئەیلوولێ گوند هاتە تالانكرن و پەزێ گوندی هاتە دەستەسەركرن و گوندی هاتنە گرتن و شەرەدەڤ دناڤبەرا جاشێن بیانی و یێن دەڤەرێ دا ل سەر پەزی چێبوو، كو یێن دەڤەرێ ئەو چەند ب حەقێ خۆ دزانین.

## سیمایێ گوندی:

ئاڤارێ گوندی پەراڤێ بەشەك ژ چیای بخۆڤە دگرت وەكو بەرێ دەولێ و گەلی حەمە جانێ و گەلیێ شەمسا یێ كو دبت نیڤ نیڤە دناڤبەرا گوندی و گوندی خەربەرنووری و گەلیێ گەرماڤێ یێ كو شكەفتەك دكەفتە دناڤدا و دلۆپەك ئاڤێ بێ راوەستان ژ بانێ وێ دهێت و ل بنێ وێ حەودەك بۆ كومڤەبوونا وان دلۆپان هاتییە دروستكرن و مرۆڤ و گیانەوەر مفای ژێ ببینن و گەلیێ هنارا یێ كو حەودەكا مەزنا هنارا دناڤ ڤی گەلی دا بوو. دڤان گەلی و ل سەرێ ڤان كومتان چەندین رەزێن گوندیان هەبوون، ل بنارا چیای و ل دووماهیا گەلیان دەست پێ دكەن، مینا نهالا چەمی و نهالا قووچكا ژنا و نهالا دارا نەرمێ، دكەڤیتە باشووری گوندی، دیسان دناڤبەرا ڤان نهالاندا چەندین گر هەنە، چەند ژێ د بێ ناڤن و چەند ژێ ب ناڤن وەكو گرێ سۆر كو ئاخا وی یا سۆرە ل باشووری گوندی، زۆرێ برووسكێ یێ د ناڤبەرا گوندی و گوندی خەربەنووری، و گرێ زیارەتا ل رۆژهەلاتێ گوندی كو گرەكێ پڕی داربەڕوویێن مەزن بوون لێ دەمێ گوند هاتییە تەعریبكرن ئەو ژێ هاتینە ژناڤبرن.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی چەند كانی بوون، مینا كانییا ژنا كو ئاڤاهیەك ل سەر هاتبوو ئاڤاكرن ل رۆژهەلاتێ گوندی و تا نها ئاڤایە، و كانییا مێرا هەر دكەڤیتە وی رەخی و كانییا عەمەروكێ هەر ل رۆژهەلاتی و بیرەك ژیال مالا حەجی حاجی ڤە بدەست هاتبوو كۆلان بۆ ئاڤدانا پەزی.

داوی جار گوند ل سالا (١٩٧٥)ێ ب بڕیارا حكومەتێ هاتبوو وێرانكرن و هەر سێ چار مال بۆ گوندەكی برن ژوان: گوندی ئاشانكێ ل دەڤەرا دۆسكیان بوو، و پاشی خەلكێ ڤێ گوندی پشتی ئەنفالان ل سێمێلێ و زاخۆ تا سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ ئاكنجیبوون، نها پەراڤێ ددەستێن پەراڤیاندایە و هەرسال ڤێ ئاخێ ڤەژیندكەن[٨٧].

## گوندی گرکەلێ:

ب دووراتییا نێزیکی (٢٠کم) دکەڤیتەرۆژاڤایێ باتێلێ. ناڤێ گوندی وەکی خەلکێ گوندی ڤەدگێڕن کو یێ ل جهەکێ بلند بوو و جهێ وێ ئاسێ بوو ب شێوێ کەلایێ یە لەوا ناڤێ گرکەلایێ کەتیە سەر، واتە (گرێ- کەلێ).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ ڤەڕوودەی

**باشووری،** گوندێ ئاڤزرویکا شەنو

**رۆژهەلاتێ،** گوندێ مەزرێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ پێبزنێ

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا گوندی ١٩٢ کەس بوو[٨٨]، خەلکێ سلێڤانەیی نە بابکێ شەمسا و چەند مالەکێن دی مینا مالەکا بەرزنجی و دو مال ژ گوندی گتێ ل باکوورێ کوردستانێ و مالەکا شەرابی. ژمارا وان ژ نێزیکێ (١٥) مالان پێکدهات، گوند وەکو ملك یێ بنەمالا عەلیێ محوی بوو لێ پشتێ ڕاستڤەکرنا چاندنێ ئەڤ مالێن ناڤبرێ هەمووبوونە خودان وار ل ڤێ گوندی و ژین و ژیارا وان یا سەرەکی ل سەر تۆڤچینیێ بوو، و نێزیکێ (٢٧) جۆتیاران ل ڤێ گوندی هەبوون، دیسان خەلکێ گوندی تەرش و کەوال ژی خوداندکرن.

### سیمایێ گوندی:

ژی پێکدهێت ژگر و کانی و چەندین وارگەهێن کەڤن مینا:

گرێ گوندی (گوند ل سەر هاتییە ئاڤاکرن)، گرێ پیرومەرا (شوینوارێن گوندەکێ کەڤن ل سەر دیارن)، گر مندیل (ل باکوورێ گوندی و جهێ گوندەکێ کەڤن ل سەر دیارە)، گرێ کێراتێ (ل باشوورێ گوندی و گۆڕستانەك ل سەرە ونێزیکێ (١٠) گۆڕێن بەرەو رۆژهەلات ل ناڤ هەنە).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانییا حەیدوێ کو ل دۆر وێ کانیێ جهێ خرابە گوندەکێ لێ دیارە، کانییا تەموی، کانییا نهالا چناری، برکا عەلیێ محوی. نها سکرەك ژی ل گوندی دهێتەچێکرن.

ڤی واری چەند جهێن کەڤنە گوندان و نیشان هەنە، مینا:

- بەرێ مدارێ، کو دکەڤندا ب هێسترا بۆ قوتانا دان ودکاکێ ب کاردهات، نها ل جهێ گوندی کەڤن یێ مای.
- بەرەکێ مەزن ل جهێ گوندی کەڤن هەیە و نیڤا وێ تێ کۆلایە.
- دار بەڕوویەکا زۆرا کەڤنار لێ هەیە و وگۆڕەك ل بن وێ دارێ هەیە دبێژنێ دارا خەلیفەی.
- (پووزل pozl) وارەکە، پتریبا وی بەرێن برینە و بلنداهییا هەر ئێکێ (١,٥ - ٢م).

گوند چوار جاران ژ ئالیێ حکومەتێن عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن ل سالێن: (١٩٦٣ێ ل سەر دەستێ لەشکەرێ سووریی و حکومەتا بەغدا و ل سالا ١٩٦٤ دیسان ڤەگەریانەڤە، سالا ١٩٦٦ێ هاتەڤەخرابکرن و سالا ١٩٦٨ێ ڤەگەریانەڤە، سالا ١٩٦٩ێ دگەل کۆمکوژیا گوندی صوریا، لێ پشتی پێکهاتنا ١١ئادارا ١٩٧٠ێ ڤەگەریانەڤە، داوی جار ژی ل سالا ١٩٧٥ێ بوو و تا نها گوند مایە خرابە و نەهاتییە ئاڤاکرن، لێ هەرسال ژ ئالیێ خودانانڤە دهێتە شینکرن[٨٩].

## گوندی مێرگەسۆرێ:

گوندەکێ هەم چیایی و هەم دەشتی یە، ب دووراتییا نێزیکێ (٣٠)کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ ، وارێ ب کێر چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیکێ (١٨٠٨) دۆنەمان، ئەڤ گوندە گەلەکێ کەڤنە و ب سەدان گۆڕ ل ئاقارێ ڤێ گوندی هەنە، لێ گۆڕەك بەرچاڤ ب ناڤێ نەبی نوح هەیە. رامانا ناڤێ گوندی ژ بەر دیمەنێ گوندی و هەبوونا ئاڤ و دەراڤان و هەلبەت ئاخا وی یا سۆرە لەوا ئەڤ ناڤ هاتییە سەر و ب مێرگا سۆر دهێتە ناسکرن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایە

**باشووری:** گوندێن پێبزنێ و باجدا

**رۆژهەلات:** گوندێ قەرپوودە

**رۆژئاڤای:** گوندێ کەروینێ

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

بەری وێرانکرن و ڤەگوهاستنا خەلکێ دەڤەرێ گوند ژ (٢٠) مالێن سلێڤانەییان بابکێ شەمسا پێکدهات، تا نها ب شەمسا دهێتەنیاسین، و ژیارا خەلکێ وی پتر ل سەر تۆڤچینێ بوو و ب هەبوونا ئاڤەکا باش برنج و کونجی و گارس و کەسکاتیێن هاڤینێ ژی دهاتنە چاندن، دیسان خەلکێ گوندی تەرش و کەوال ژی ژ پەز و بزنان خوداندکرن، دیسان مێشێن هنگڤینی لێ دهاتنە ب خودانکرن.

ژبەر کو گوند دکەتە بنارا چیای و چالاکیێن پێشمەرگەی ل دەڤەرێ هەبوون، گوند چەندین جاران هاتییە وێرانکرن و گەلەك جاران دهاتە تۆپبارانکرن و خەلکێ وی وارێ خۆ دهێلان و مشەخت دبوون.

## سیمایێ گوندی:

ئەگەر ژ سەرێ چیای دەست پێ بکەین کو گوند دکەڤیتە بنارا وی دێ ژ کومتێ شاشکا قەشەی دەست پێ کەین، لاتەکا بلندە ل هنداڤ گوندی، پاشی دەرووکێ هێسترا، کو هاتن و چوونا هەردو لایێن چیای و گوندی و گوندێن نزاری مینا هیتیان و تیان و شیناڤا پێکڤە گرێددت، دیسان گەلی ژی هەنە مینا گەلییێن: کون مێشێ، مێرگەسۆرێ و کەروێنیێ ژ هەڤ جودا دکەت، گەلی کورتك ل رۆژاڤایێ گوندی، گەلیێ مێرگێ ل ژوورێ گوندی، شکەفتەکا بچویك لێ هەیە، گەلیێ دارا هەسپا ل باکووری، گەلیێ شکەفتا ئاغای، شکەفتەکا مەزن د ڤی گەلی دایە و دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی، گەلیێ کەهنی کەڤۆکا، ژبەر هەبوونا دلۆپەکا ئاڤێ کو کەڤۆك لێ ئاڤێ ڤەدخۆن.

گورێ نەبی نوح ل گوندی مێرگەسۆرێ دەڤەرا سلێڤانەیا درێژاهییا گورێ نێزیکی (٧م) و فرەهی نێزیکی (٢.٥م)



### ژ نهالێن گوندی مێرگەسۆرێ:

نهالا پاشیا دارا، نهالا هژیرکێ، ل رۆژئاڤایێ گوندی، نهالا پشت ملێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، نهالا بنا قۆرێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، نهالا قەرودەی کو گوندی و گوندی قەرودێ ژێك جودا دکەت، نهالا گۆلێ (بیهۆکا) ل باشوورێ گوندی و نهالا گوندی.

### کانی و دەراڤێن گوندی:

کانیا بالاڤیا ل باکوورێ گوندی د بن گەلی مێرگێ دا، ئاڤەکا باش ژێ دەردکەت و نها هشکە، کانیا ژنا کو تەمام کەرا کانیا بالاڤیا یە و دکەڤیتە دبندا، نها ئاڤەکا کێم ژبەر دچیت، کانیا مێرا، دبن هەردو کانیێن ناڤبریدا و نها هشك بوویە. ئاڤا ڤان هەرسێ کانییان ل نهالێ دبوو یەك و برنج و کونجی و کەسکاتیێن هاڤینی ل بەر دکرن، گەرا کەهنی تشتکێ، دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی.

دیسان ژ سیمایێ گوندی چەندین نیشان و وارگەهن مینا:

مێرگا سەرێ گوندی، مێرگا بنێ گوندی، وارێ چەمێ نەمر ل رۆژئاڤایێ گوندی، ملا خەندخەندووکێ، ملا حاجیێ عەلی کو پڕی گۆڕێن کەڤنارە و دیرۆکا وان دیار نینە، گرێ مەتیا ل باشوورێ گوندی، گرێ تەحلوێ هەر ل باشوورێ گوندی، ملا قولنگا دیسان ل باشوورێ گوندی، گۆرێ نەبی نۆحی، ژ بلندترین نیشانێن ب بهایە ل ڤی گوندی و دارستانا نەبی نوحی.

پڕانیا ڤان کانی و نهالان هشك بووینە، ژمارا خەلکێ گوندی دگەهیتە (١٢٠) مالان، لێ گوند خرابەیە و پتریا خەلکێ گوندی نها ل زاخۆ و سێمێلێ و سمایل ئاڤا دژین، لێ هەر سال وارێ خۆ شیندکەن[٩٠].

## گوندی تووسانا:

ب دووراتیا نێزیکی (٣٤کم) دکەڤیتە رۆژئاڤایێ باتیلێ. رامانا ناڤێ گوندی دیار نینە، لێ بۆچوونەك هەیە دبێژیت کو گوند نێزیکی ئاڤا دیجلەیە و بەرێن حولی و تەنك ل بەر لێڤا وێ ئاڤێ هەنە د گۆتنێ (تووس)[٩١].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خانتەورێ

**باشووری:** رووبارێ دیجلە

**رۆهەلاتی:** گوندێ مشارا

**رۆژئاڤای:** گوندێ باجدا بەرئاڤێ

دیرۆکا ئاڤاکرنا گوندی دیار نینە، لێ د نیڤا سەدسالیا بیستێدا ژ نێزیکی (٣٥) مالێن سلیڤانەییان پێکدهات، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٢٣١ کەس ل گوندی ژیان[٩٢].

ملك یێ عەزیزێ ئاقوی بوو و نێزیکی (٣٥) جۆتیاران شیندکر، پشتی ڕاستڤەکرنا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) هەر جۆتیارەك بۆ خودان پشك د گوندیدا، ژیارا وان ل سەر چاندنێ و پاشی خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، دبێژن نێزیکێ (٤٠٠٠) سەرێ کەوالی ل ڤی گوندی هەبوون، دیسان ماسی گری و دەربازبوونا گوندییان بۆ ئالیێ دی یێ ئاڤا دیجلە و کڕین و فروتنا پەروکان و گەلەك پێدڤییان، ژ دەرگەهێن ژیارا ڤی خەلکی بوون.

ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٦، ١٩٦٩، ١٩٧٥) ێ کەتیە ژێر هەوێن وێرانکرن و تالانکرنێ و ل سالا ١٩٦٣ێ چەند بومبێن ناپالم ل دەوروبەرێن گوندی دان و خەلکەك هاتە کوشتن.

### سیمایێ گوندی:

گوند نێزیکی ئاڤا دیجلەیە لەوما تایبەتمەندیا خۆ هەیە و دەشتەکا باش ب خوەڤە دگرت، و چەندین گر و نیشان هەنە، وەك: گرێ کێچ ل باکوورێ گوندی، گرێ گەلێ گوندور ل رۆژهەلاتێ گوندی، گرێ سۆر ل باکوورێ گوندی، گرێ زیارەتا کو دکەڤیتە نیڤا گوندی. و گەلەك گرێن بێ ناڤ ژی هەنە.

### نهالێن گوندی:

نهالا توخیبی دکەڤیتە رۆژئاڤایی و گوندی و گوندی

باجدا بەراڤێ توخیب دكەت، نهالا خانتەوەرێ، كو ئەو گوندی و گوندێ خانتەوەرێ ژێك جودا دكەت، نهالا گر پسووكێ ل رۆژهەلاتێ گوندی و نهالا گەلی گوندوری. ل گوندی تەنێ كانییا زیروی هەبوو، و نها هشك بوویە، و پتریا كارێ وان ل سەر ئاڤا دیجلەی بوو.

نها خەلكێ گوندی پتری (٣٠٠) سەرۆك خێزانن، پتریا وان ل زاخۆ دژین و ب تنێ نێزیكی پێنج مالان ل سەر گوندی دژین و پەزی خوداندكەن، هێلا كارەبێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان و ئاڤا وان هەر ل سەر دیجلەیە[٩٣] .

## گوندی مشارا:

گوندەكێ كەڤنە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (٣٢كم) باشووری رۆژاڤایێ باتیلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ خانتەوەرێ

**باشووری:** رووبارێ دیجلە

**رۆهەلاتی:** گوندێ خوكێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ توسانا

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

بەری وێرانكاریا تەعریبێ گوند نێزیكی (٦٠ - ٦٥) مالان بوو، دكەڤندا سلێڤانەی بابكێ شەمسا و زهێدی لێ ژیاینە و پاشان كچان ژی هاتینە ڤی گوندی، ژیارا خەلكێ وی ل سەر تۆڤچینیێ بوو و رووبەرێ ب كێری چاندنێ دهات دگەهشتە نێزیكێ (٣٦٩١) دۆنەمان و ل سەر (٢٢) جۆتیاران پارڤەكری بوو، دیسان خودانكرنا تەرشی دەرگەهەكێ دی یێ ژیارا خەلكێ ڤێ گوندی بوو، نێزیكی (٨٠٠٠) سەرێت كەوالی هەبوون. ماسیگری و دەریازبوونا ئالیێ دیجلەی دەرگەهەكێ دی یێ ژیارا وان بوو.

گوندی مشارا چوار جاران ب دەستێ حكومەتێن بەغدا هاتییە وێرانكرن و تالانكرن.

### سیمایێ گوندی:

گوندی مشارا چەندین كانی و گر و كەندال و... لێ هەنە: گەلیكێ محێ، یێ كو پڕێ شكەفت و بەرەڤەژ، گەلی گوندور، نهالا كەهنیا كرەش، نهالا كۆزا مشارا، گرێ بەر ئاڤێ ل باشووری گوندی، گرێ گوندی كو گوند ل سەر هاتییە ئاڤاكرن، ژێلی جهێن بێ ناڤ.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

دوو كانی هەبوون، كانییا مشارا ل باشووری گوندی كو ل زڤستانا یا گەرم بوو و هلم ژێ بلند دبوو، نها ژی ئاڤی یە، كانییا كرەش ل رۆژهەلاتێ گوندی و نهاژی ئاڤییە. ژێلی ئاڤا دیجلەی.

پشتی بهارا سالا ١٩٩١ێ وار بۆ خودانان ڤەگەریا و ژمارا خێزانێن خەلكێ گوندی دگەهنە نێزیكێ (٣٠٠) سەرۆك خێزانان و نها (١٠) مال ل گوندی دژین، نها هێلا كارەبێ ل گوندی هەیە.

## گوندی صۆریا:

ئێكە ژ گوندێن نموونا پێكڤە ژیانێ یە، ب دووراتییا نێزیكێ (٢٤كم) دكەڤیتە رۆژاڤایێ باتیلێ. ناڤێ گوندی ژی گرێدای پەیڤا سریانی (سوورایی) ب واتایا فەللە هاتییە، ل بەراهیێ كلدان ئاكنجیێن گوندی بوون و وەكو ملك یێ (عزیز ئاقۆ) بوو، ل راستڤەكرنا یاسایا چاندنێ هەرجۆتیارەك بۆ خودانێ پارچە وارێ خۆ، و هندەك ژ كەڤنێن گوندی دبێژن سالا ١٩٥٧ێ فەللەیێن كلدان ب حوكمێ ملكداریا عەزیز ئاقوی هاتینە گوندی و گەلەك جۆتیارێن موسلمان ژ گوندی هاتنە دوور ئێخستن و (١٢) مالێن فەللە دانانە شوونا وان، نها (١٣) جۆتیارێن موسلمان و (٦) جۆتیارێن فەللە ئاقارێ گوندی ڤەدژینن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ پێبزنێ

**باشووری:** گوندێ خووكێ

**رۆهەلاتی:** گوندێ بەغلوجێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ كانی عەرەب

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

دکەڤندا ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر تۆڤ چینیێ بوو، ب ئالاڤێن کەڤن مینا جەنجەر و شخرە و داس و قەیناغ و دەواران و چەندین کەل و پەلێن دی، دڤێ بواری دا گۆرگیسێ خیوی کو ئێك بوو ژ خەلکێ گوندی هۆستایەکێ باشێ دارتراشیێ چێکرنا ڤان ئامیران بوو، هەڤجار و تەفشی و پێدڤیێن گوندییان دابین دکرن، هەڤالێن وی ئەوراها و عیسا هەردو (حێ کەر)[٩٤] بوون، دەمێ وان چو جاران ڤالا نەدبوو و پەرۆکێ وان هەردەم د بازارێن زاخۆ و دهۆکێ دا فرۆتی بوو، دیسان ژبەر فرەهیا ئاقارێ گوندی و هەبوونا کانیك و رووبار و کەسکاتی گەلەك جۆرێن گیانەوەرێن کووڤێ لێ ڤەدحەویان، لەوما گوند چ جاران ژ نێچیر و نێچیرڤانان ڤالا نەبوویە.

ب حوکمێ نێزیکبوونا گوندی کەڤنێ صۆریا ژ رووبارێ دیجلەی گەلەك مفا بۆ ڤەخوارن و شووشتن و ئاڤدانا تەرشی و چاندنا کەسکاتییا و... ژێ ددیتن. دیسان خودانکرنا پەز و بزنی و چێلان ل رێزا دووێ دهات.

### سیمایێ گوندی:

گوند گەلەك سیمایان بخۆڤە دگریت، ژ نهالێن گوندی: نهالا بۆتێ، نهالا حەجی عەلی، نهالا کر رەشی، نهالا دەحل تووریکێ، نهالا توخیبا دناڤبەرا گوندی و گوندی بەغلووجێ دا، نهالا کرگێچکێ هەم نهالە و هەم رنکە، نهالا بێدەرا، نهالا خربەی. پاشێ گرکێن مینا گرکێ خژبەرا، گرێ کێچ، گرێ کەرا و گرێ زیارەتا یێ گۆرستانا گوندی ل سەر بوو. ژ کانیکان: کانییا رەشۆ قوتکی ل باشوورێ گوندی و نها هشك بوویە، کانییا درهۆکێ ژبەر کو دو رێ ل سەر پربوون ل رۆژاڤایێ گوندی، کانییا جوهنی و ئەو جوهنی ب دەست کۆلایە و نها ئاڤدارە، کانییا نهالا بۆتێ ئەوژی ل رۆژاڤایێ گوندی و نها ئاڤا وی گەلەك کێم بوویە، رووبارکێ نهالا حەجی عەلی یێ ژ کرکەلێ ژووردا دهێت و د گوندی پێبزنێ را دەربازدبیت و چەند ئاشەکان ل سەر ئاڤا وێ کاردکر، مینا ئاشێ عەلی بەگێ و ئاشێ عەلێ محویێ شەمسا (سلێڤانەیی) و ب دەهان بیستانێن سپیندارا ل بەر دهێنە کرن و تا نها ئەو ئاڤ باشە و بەردەوامی دهێت، و شکەفتا محێ سولتانی ل ئاقارێ گوندی هەبوو و دەمێ فرۆکەیێن شەری دهاتن گوندیان خۆ تێدا ڤەدشارت و چەندین خربە[٩٥] و شوینوارێن کەڤن ل ئاقارێ گوندی صۆریا هەنە و کەڤناتیا گوندی نیشانددەت، مینا خربێ چەلەبی، کو دیار جهێ کاڤلە گوندەکی یە و قورمێن کەڤنێن دارێن مەزن لێ دیارن و دیرۆکا وێ دیار نینە، ل نێزیك وی خربەی گەرا جندی ئاغای هەبوو و تا نها پری ئاڤە، دیسان خربێ محەمەد عەلیێ خەلیفەی ل باشوورێ گوندی و ئەوژی وەسا دیار دکەت کو جهێ کاڤلە گوندەکی یە و خەلکەك لێ ژیایە، لێ دیرۆکا وی ژی دیار نینە، و دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی کەڤن، زێدەبارێ رووبارێ دیجلەی.

### کوشتارا گوندی صۆریا:

صۆریا کەڤن دکەتە سەر رووبارێ دیجلەی ژ ئالیێ باشووری و رێکا ئاخێ یا سەرەکییا سەنتەرێ ناحیا ئاسیهێ و گوندی پێشابوورێ پێکڤە گرێددا، گوندی صۆریا یەك ژ وان گوندا بوو کو هاریکاریا شۆرشێ دکر، و چەند خورتێن گوندی پێشمەرگە بوون، سپێدەهیا رۆژا سێ شەمبی (١٩٦٩/٩/١٦)ێ و دەمێ بوورینا چەند ترومبێلێن لەشکەرێ عیراقێ دبەر گوندی صۆریارا بەرەڤ پێشابوورێ دچوون و دەمێ بەرەڤ رۆژاڤایی و نەگەلەك دۆر ژ گوندی ب رێ کەتین، مینەك (وەکو سەرلەشکەرێ وان دگۆت) ب وان ترومبیلانڤە پەقی (ئەو چەند ژی تا نها ژی جهێ گومانێ یە کا مین بوو یان پیلانەکا لەشکەری بوو بۆ کارەکێ درندانە، چونکی هەمی سەرباز ب سلامەت بوون)، دملدەست لەشکەری هێرشی گوندییان کر و هەموو د کۆتانەکا پەزیڤە کۆمکرن وب فەرمانا ئەفسەر (عەبدولکەریم جحێشی) هەموو ب فەللە و موسلمانان ڤە هاتنە گوللەبارانکرن و ئاڤاهیێن گوندی هاتنە سۆتن و قەدەغەکر کو کەس ل وان

گوندێن دەوروبەر خۆ لێ بكەنە خودان یان د هاوارا برینداران بچیت و كەلەخێن كوشتی و برینداران هەر ژ سپێدەهیا (٩/١٦ تاكو سپێدەهیا ١٩٦٩/٩/١٨)مانە بێ خودان، تاكو مەترانییا زاخۆ و بنەمالا شەمدین ئاغای و بنەمالا دینۆێ خۆ لێ كرینە خودان و بزاڤ ل دەڤ كاربدەستێن حوكمەتێ ل دهۆك و مووسلێ كرن و ل سپێدەهیا ١٩٦٩/٩/١٨ێ، خەلك د هاوارێ هاتن و بریندار ڤەگوهاستنە نەخۆشخانا (جمهوری) ل مووسل، و شەهید ژی ل ئێك گۆرستان هاتنە ڤەشارتن.

گوند د هەوا ڤالاكرن و ب عەرەبكرنا گوندێن دەڤەرێ بۆ داوی جار هاتە وێرانكرن و خەلكێ وی دەربەدەری گوند و باژارێن دەڤەرێ بوو. د سالێن نوتاندا، دیسان گوند هاتە ئاڤاكرن و گەلەك خەلك هاتنە سەر گوندی خۆ و گۆرێن شەهیدێن صۆریا هاتنە دەرئێخستن و ل جهەكێ بلند ل ئاقاری گوندی هاتنە ڤەشارتن و هەر سال هەرێما كوردستانێ سالڤەگەرا ڤێ كارەساتێ ڤەژین دكەت[٩٦].

## گوندی چیمەنیا:

ب دووراتییا نێزیكێ (١٢كم) دكەڤیتە رۆژاڤایێ باتێلێ. رامانا ناڤێ گوندی وەكی خەلكێ وی دبێژن بێ هاتی كو گوندەكێ ب نهال و ئاڤ و كەسكاتیە ، جهێ گوندی دۆر ب دۆر نهال و گرك و كانی و مێرگێن كەسكاتیێ نە و جهەكێ باشە بۆ خودانكرنا تەرشی و چاندنێ، ژێدەرێن ئاڤا گوندی: نهالا پڕی ئاڤ یا ژ كانێ كەركێ ژووردا دگوندێ چیمەنیا را دبۆرت، پاشان بیرا گوندی و كانیا گوندی و گەڕا فللەی، لێ ئەڤرۆ پتریا وان هشك بووینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ ئێمەلكێ

**باشووری،** گوندێ هەفشێ رەش

**رۆژهەلاتی،** گوندێن باوەردێ و سێڤدین

**رۆژئاڤای،** گوندێن كێلكێ و بەغلوجێ

### نهالێن گوندی:

نهالا گۆزێ و وار خەجێ و نهالا توخیبی، یاكو چیمەنیا و گوندی ئێمەلكێ ژ هەڤ جودا دكەت و پاشان نهالا گورگا، ژبلی گرك و زۆرك و شكەفتووك و بەرەڤەز و نیشانێن جودا مینا گرێ بەرقێ د ناڤبەرا توخیبێ هەرسێ گوندێن ئێمەلكێ و سێڤدین جنێ و چیمەنیا ، و شكەفتا خوناڤێ یاكو ب ناڤێ ژنەكا گوندی هاتیە ب ناڤكرن و شكەفتا گەڕا فللەی و وارێ گای زێدبوونەكن ل سیمایێ گوندی، و رێ یا سەرەكییا كو د هاتە ناڤ گوندی د گوندی سێڤدین جنێ را دهات.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٤٨ كەس بوو[٩٧]، بەری وێرانكرنا گوندی ل سالا ١٩٧٥ێ ژ نێزیكێ بیست مالان پێكدهات، ئێكە ژ گوندێن سلێڤانەییان و وەكو ملك یێ مالا (مصتێ) یە، و بابكێ بابلا ژبلی چەند مالەكێن كۆچەرێن بووبا. پشتی تەعریبێ گوند تا نها مایە كاڤل و خەلكێ وی ل كۆمەلكەها كێلكێ و سێمێلێ و زاخۆ دژین، لێ هەرسال ئاخا خۆ شێندكەن.

## گوندی سێڤدین جنێ:

گوند دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (١٨) كم رۆژاڤایێ باتێلێ، ناڤێ گوندی وەكو گوندی ڤەدگێڕن ئەوە كو ئەو پڕی جن (ئەجنە) بوو و سێڤدینی ئەڤ ناڤ لێ كریە. دكەڤن دا گوند دەدەستێ بنە مالا شەمدین ئاغای دابوو، و گەلەك ژ خەلكێ ب رێكا كۆچەرایەتیێ و هەژاریێ قەستا دەڤەرێ كرینە و پەزێ خۆ ل ئاقارێ گوندی ب جهـ كرینە و چەند سالان خزمەتا تۆڤچینیا وێ ئاخێ كرینە، پشتی یاسایا راستڤەكرنا چاندنێ ئەو مالێن ب جۆتیارێ رادبوون بوونە خودان مولك ل گوندی.

### سنوورێن گوندێ:

**باكووری،** گوندێ باوەردێ

**باشووری،** گوندی ئاڤخانێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێن شکەفدەلا و سمایل ئاڤا

**رۆژئاڤای،** گوندێن چیمەنیا و هەفشێ رەش

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٦١ کەس ل گوندی ژیان[٩٨]. گوند پێکهاتییە ژ سلێڤانەییان بابکێ بابلا وچەندین مالێن (خێرکێ)[٩٩] و چەند مالێن کەمەکی (دۆسکی)یان. بەری (تەعریبێ) ژمارا خێزانێن وان دبوونە نێزیکێ ٢٠ مالان، لێ نها و پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ ژمارا مالێن گوندیان پتری ٢٠٠ سەروك خێزانن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

هەر سال ڤی واری خۆ شین دکەن و ژیارا خەلکی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو، و هەر مالێ پتری ٥٠٠ سەر هەبوون. دبێژن چو کەسێ ماست نەدفرۆت و هەمیان دکرە پەنیر و د فرۆتنە خەلکێ تلکێف و تلسقوفێ چ ب پارە و چ ژی بەرامبەر کەرەستێن پێویست، بۆ بەرهەڤیا زڤستانێ هەر سال هریا پەزی و چەند سەرێن پەزی ل زاخۆ دفرۆتن داکو ب پارێ وان پێداویستیێن خۆ پێ دابین بکەین. ل سەر تۆڤچینیێ دبێژن ژبەر گیا کرنی مە گەلەك چاڤ ل تۆڤچینیێ نەبوو و یا دهاتە کرن ژی ب ئالاڤێن کەڤن بوو، و خێرکی دبێژن تۆڤچینیێ ئەم ل سێڤدین جنێ ئاکنجی کرین و مە چاڤدا ژیارەکا نوو زێدەبارێ کۆچەرایەتیێ، مەژی چاڤ دا هەڤسوویێن خۆ و مە دەست ب چاندنا نیسك و نۆك و جەهـ و گەنمی کر.

### سیمایێ گوندی:

گوندی سێڤدین جنێ پتریا وی راستکەهی نە و جهێ چاندنەکا باش لێ هەیە، و چەندین نهال لێ هەنە، مینا: نهالا گوندی، نهالا گورگا ژبەر کو ب رەڤدا گورك ل وێ ێ دهاتنە دیتن، نهالا چەم لەڤەنا نهالەکا درێژە و پری قەرەم و لەڤەنە و دەربازی ئاقارێ گوندی ئافخانێ دبیت، نهالا رووڵا یاکو پری ئاڤ بوو، ل ڤان هەمووو نهالا و تا نها شوینوارێن کوونێن کۆچەراتییا کەڤن لێ دیارن، دیسان چەند گرکێن ب ناڤ ژی ل ڤی گوندی هەنە، مینا: گرکێ دای پیرێ د ناڤبەرا گوندی و گوندی هەفشێ رەش و ل سەرێ وی گری و تا نها پری لەڤەنە و هەمووو وەرزێن سالێ ئەو لەڤەن شینن و ب شێوێ بازنێ ل دۆر گۆرەکێ کو کەس نزانیت یێ کێ یە و یێ چ دەمە دزڤرن، گرێ برقێ د ناڤبەرا گوندی و ئاقارێ ئێمەلکێ و گرێ خێربزووکێ یێ دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و ئاقارێ باوەردێ. سەبارەت ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی هەمووو ل سەر کانییەکێ بوو ل نیڤا گوندی ب ناڤێ کانییا گوندی و تا نها ژی یا ب ئاڤە، ل گوندی کونەك (شکەفتۆکەك) ب ناڤێ کونا قاچاغا یان کونا محو ئاما و هەڤالێن وی هەیە یێن هەروەك دهێتەڤەگێران هەردەم ب کارێ دزی و شەلاندنا رێبارا رادبوون.

نها پتریا خەلکێ گوندی ئاکنجیێن زاخۆ و سێمێل و کۆمەلگەها باوەردێ نە و نە ڤەگەریاینە سەر جهێ خۆ[١٠٠].

## گوندی چەمزراف:

گوند ب دووراتییا نێزیکێ (١٥)کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ باتێلێ. رامانا ناڤێ گوندی دبێژن ژ نهالا زراف یان رووبارکێ زراڤ هاتییە.

### سنوورێن گوندێ:

**باکووری،** گوندێ هەفشێ رەش

**باشووری،** گوندی شکەفتێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئاڤخانێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ بەغلوجێ

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوندێ چەم زراڤێ ژ سلێڤانەیا بابکێن شەمدین ئاغا و شەمسا و بابلا و بلکا و ترکزی و کۆچەرێن هاجا بابکێ بووبانە. ئەڤ گوندە چەندین جاران کەتیە ژێر هێرشێن حکومەتێن بەغدا و هەمووو جارانژی هاتییە تالانکرن و خەلکێ وی دەربەدەری باژارێن سێمێلێ و زاخۆ بووینە. بەری تەعریبا دەڤەرێ گوند نێزیکێ (٣٥) مالان بوون و پشتی سالا ١٩٧٥ێ هاتە تەعریبکرن.

**سیمایێ گوندی:**

دەڤەرەکا دەشــت و تیر و پەسار و گرکە وژ سیمایێن گوندی چەمزراڤێ گەلوکێ عەلوی و ئەنیا دنێ و گرکێ خیڤەتێ و چەمکێ عەلی ئاغای و کانی تەحلێ و زنگزنگو.

سەبارەت ژین و ژیار وان ژی ل سەر تۆڤچینیێ و شینکرنا بیستانێن زەرزەواتی بوو ل هاڤینێ، و رووبەرێ ڤێ گوندی کو ب کێر چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیکی (١٧٨٠) دۆنەمان، ژ بلی خودانکرنا پەز و بزنی، دیسان ژبەر نێزیکیا وان بۆ رووبارێ دیجلەی نێچیرا ماسیان و بازرگانی ژی دگەل ئالیێ دی یێ ئاڤێ دکرن. نها گوند خرابەیە، لێ هەرسال تۆڤچینی لێ دهێتەکرن.

## گوندی شکەفتێ:

شکەفتێ دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (١٥کم) رۆژاڤایێ سەنتەرێ باتێلێ. ناڤێ گوندی ژ شکەفتا مەزن هاتییە کو دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی، گەلەکا فرەهە وەکو گوندی دبێژن ل زڤستانان نێزیکێ (١٠٠٠) هزار سەرێن پەزی تێڤە دهاتنە حەواندن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بەغلوجێ

**باشووری:** رووبارێ دیجلە

**رۆژهەلاتی:** گوندێن ئافخانێ و پێچەکا ژووری و چەم زراڤ

**رۆژئاڤای:** رووبارێ دیجلە

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

بەری (تەعریب)ا دەڤەرێ گوند ژ نێزیکێ (٤٦) سەرۆك خێزانان پێکدهات ژ سلێڤانەییان بابکێ شەمدین ئاغای و بابکێ دارزانێ بوون، بنەمالەکا سندیان بابکێ بلکان کو دەمەکیدا ژ دەڤەرا سندیان (گوند کوسەی) هاتینە و ناڤێ کۆسە دزڤرت بۆ باپیرێ وان یێ کەڤن، دیسان بابکێ شرنەخیا و بابکەك ژکۆچەرێن هاجا و مەهمەدا.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

رووبەرێ ئەردێ گوندی پترە ژ (٣٠٠٠) دۆنەمان و یێ ب کێری چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیکێ (١٢٠٠) دۆنەمان، لەوا ژیارا وان ب شێوەیەکێ سەرەکی ل سەر تۆڤچینیێ و دەرامەتێن هاڤینی بوو، ل بەرێ هەمی ب ئالاڤێن کەڤن دهاتنە شینکرن. دیسان خەلکێ گوندی خودانکرنا تەرشی وەکو پەز و بزنان ژی دکر، زێدەباری نێچیرا ماسیان و بازرگانی دگەل ئالیێ دی یێ ئاڤێ.

گوند چوار جاران ژ ئالیێ حکومەتێن عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن و داوی جار ل ١/١١/ ١٩٧٥ێ بوو کو گوند هاتییە چۆلکرن و تا نها خرابەیە، لێ بەردەوام ژ ئالیێ وانڤە دهێتە شینکرن.

سیمایێ گوندی شکەفتێ: شکەفتا مەزن و چەمێ دێر بەعووتێ و دلوپووکێ و نهالا حەمو ئافخانێ و زیارەتێ سەیدی و زیارەتێ رومێ[١٠١] و گرێ خیڤەتێ و دیسان کانیا دلوپووکێ[١٠٢].

## گوندی باوەردێ:

ب دووراتییا نێزیکێ (١١)کم دکەڤیتە رۆژاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ. گوند ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە وێرانکرن و پاشی تەعریبکرن و خەلکێ وێ دەربەدەرێ بازێران بوویە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێن گرشین و کانی کەرکێ

**باشووری،** گوندێ ئاڤخانێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سمایل ئاڤا

**رۆژئاڤای،** گوندێن ئێمەلکێ و چیمەنیا و هەفشێ رەش

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

دانعەمرێن گوندی دبێژن بەری (تەعریب)ێ گوند ژ نێزیکێ (٣٧) مالان پێکدهات و هەمەوو ژعەشیرەتا سلێڤانەیی و بابکێ بابلا نەڤیێن (ئەحمێ ئاغایێ بابلێ) بوون، گوندی وان جهەکێ پاقژ و تێر ئاڤ و

چەروانی بوو و شیان ژین و ژیارا خۆ ل سەر بکەن.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانی بوون مینا: کانییا زەلاما، کانییا ژنان یا کو ب بیهۆکا ڤەشارتی، کانییا دەرهەم، کانییا چیمی یاکو ب قەرام و چیمی نخافتی، کانییا سەرگەرێ، ئەڤ هەمی کانیە ژێدەرێن ئاڤا ڤەخوارن و لێنان و گەرماڤ و بالاڤان بوون ، لێ نها پتریيا وان هشك بووینه.

چەندین گر و زۆرك ل گوندی هەنه، مینا: گرێ حەجی ئەحمەدی، خرابێ سالح ئاغای، گرێ زیارەتووکا یێ ب زیارەتا هاتییە نیشانکرن و کەڤنێن گوندی دبێژن ئەو گۆڕستان ددەمێ ئێشێن مەزن و مرنان و ب تایبەت زارۆکان هاتییە دروستکرن و ئیرۆژی دیارن، گرێ پیر مووسکی، گرێ خێریزووکێ (جهێ خوێدانا پەزی)، دیسان ژی ل گوندە هەنە، مینا شوورکا شاوری و شوورکا ئاڤا زراڤك و شوورکا حاجی ئۆسمانا و شوورکا باوەردێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ ڤی گوندی ل سەر تۆڤچینیێ بوو جەهـ و گەنم و نیسك و نۆك و... دچاندن و رووبەرێ ئەردێ وی دگەهیتە نێزیکێ (٤١١١) دۆنەمان. ژ بلی ڤی کاری خەلکێ گوندی تەرش و کەوال و مێشێن هنگڤینی ژی ب خودانکرن. نها خێزانێن خەلکێ گوندی نێزیکێ ١٥٠ مالانە و ئاکنجیێن زاخۆ و سێمێل و کۆمەلگەها باوەردێ و باتێلێ و سمایل ئاڤانە، سالانە ئاخا گوندی شین دکەن.

چەند کەل و پەل یێن باب و باپیرێن بابکێ بابلا (سلێڤانەی)، ب پیرۆزێ ل دەڤ خۆ هلگرتنە وەك:

- پارزین یەك ژ ئالاڤێن هەری گرنگ یێن ژنان بوون، یێن کو ل پشتێ دهاتە بەستن و ب تایبەت ل بهارا بۆ کۆمکرنا کاری و کەنگران ب کاردهات.

- رەشمە/ ل پشت گوهێن دەوارێ دهات بەستن تاکو سەر دفنا وی، پاشان ب هەفسارێ دهاتە گرێدان[١٠٣].

### کۆمەلگەها باوەردێ:

کۆمەلگەها باوەردێ دکەڤیتە دناڤ ئاقارێ گوندی باوەردێ دا ب دووراتییا نێزیکێ (١٣)کم رۆژاڤایێ باتێلێ و ژ ئالیێ رۆژهەلاتی دگەل کومەلگەها سمایل ئاڤا و ژ ئالیێ رۆژاڤای کۆمەلگەها گرشینی و ژ ئالیێ باکووری گەلیێ زاخۆ و ژ ئالیێ باشووری سکرێ مووسلێ یە. پتریيا خەلکێ کۆمەلگەهێ سلێڤانەی و خێرکی نە، ئەڤ کۆمەلگەهە ل سالا ١٩٧٥ێ بۆ کریارا ب عەرەبکرنا دەڤەرا سلێڤانەیان ب ناڤێ (مجمع الفاو)[١٠٤] هاتبوو ئاڤاکرن و عەرەبێن جبۆر و عەرعوور و سنانی لێ ئاکنجیکرن و خەلکێ وی ئاوارەی باژێرێن دهۆك و سێمێل و زاخۆ بوون تا سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ، دیسان خەلکێ دەڤەرێ ڤەگەریانە سەر جهێ خۆ و نها کۆمەلگەها باوەردێ خەلکێ چەندین گوندێن دەوروبەر هەمبێزکرینە وەکوو باوەردێ و سێڤدین جنێ و هەفشێ رەش، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ چەندین ئاڤاهیێن میری و خزمەتگوزاری لێ هاتینە دروستکرن، مینا بنگەهێ ساخلەمیێ و خواندنگەها بنەرەت و مزگەفتەك و دو بیرێن ژێرئەرد کو نها ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا وانە و چیمەنتوکرنا پتریيا کۆلانێن کۆمەلگەهێ.

ژین و ژیارا خەلکێ ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرشی و شوفێریێ یە و گەلەك ژوان دناڤ رێزێن پێشمەرگەی دانە و خەلکێ کۆمەلگەهێ هێشتا ب رەوشت و تیتالێن گوندینیێ ڤە گرێداینە.

### گوندی ئافخانێ:

ب دووراتییا نێزیکێ (١٠کم) دکەڤیتە باشوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ. ناڤێ گوندی وەکی خەلکێ گوندی دبێژن هاتییە ژبەر گوند خودان چەندین کانیە و جهێ ئاڤ لێ دزێت وەکی گێچ و کلسی یە و دیمەنێ خانان ددەت، لەوا ناڤ لێ هاتییەکرن (ئافخانێ). بەری وێرانکاری و ب عەرەبکرنێ نێزیکێ ٤٠ مالان بوو، لێ نها خەلکێ وی ئاکنجیێن کۆمەلگەهێن خراب دێم و سمایل ئاڤا و باوەردێ و باژارێن سێمێلێ و مووسلێ نە.

### سنوورێن گوندی:

**باکوری:** گوندێ شکەفتدەلێ

**باشووری:** گوندێ ویچەکا ژووری

**رۆژهەلاتی:** گوندێ حەزازا

**رۆژئاڤای:** گوندێ شکەفتێ

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

رووبەرێ گوندی نێزیکێ (٦٧٨٥) دۆنەمانە و نێزیکێ (٢٦٤٦) دۆنەمان ب کێرێ چاندنێ دهێت، ژیارا گوندیان ل سەر تۆڤچینێ و خودانکرنا تەرشی بووو، نها ژی بەردەوامی دایە ڤان کاران.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی ژ سلێڤانەییان (ترکژی و بابلا و شەمسا) و کۆچەرێن هاجا بابکێ بووبا پێکهاتییە.

### سیمایێ گوندی:

ژ چەندین کانی و و گرکان وەك: کانیکا تەحل، کانیکا حەزازکا سەیرانێ، کانیکا کوشتیا، کانییا برووسێ و کانییا دلوپوکێ و گرکێن: گرێ قەرەچوخ و گرماش و گردەوین و زنگ زنگو پێکدهێت و نهان: نهالا دەراڤێ هەویریا، نهالا ئاخ سپیکێ، نهالا کوور و کەلۆکێ بیژنێ.

### شوینوار و جهێن گوندی:

- **قەسرا حەجی حەلیمایێ:** دیارە ئەڤ قەسرە سالا ١٩٢١- ١٩٢٣ێ هاتییە ئاڤاکرن، نها ژی جهێ وێ دیارە، وەك ڤەدگێرن قەسر پشتی خزماتییا دناڤبەرا محەمەدێ حاجیێ شەمدین ئاغای و بنەمالا محەمایێ عەمویێ گرکی/ سلوپێ چێبووی ل سەر داخوازا حەلیمایێ کچا محەمایێ سلوپێ هاتییە ئاڤاکرن.
- **بەرێ خەندخەندوکێ:** چەند بەرەکێن مەزنن ل رۆژهەلاتێ گوندی، ل دووڤ تیتالێن کەڤن خەلکێ گوندی و دەوروبەران زاروکێن خۆ بۆ چارەکرنا کۆخك و خەندخەندۆکان دهینانە سەر.
- **پرا ئاڤخانێ:** د سالێن شێستان ل سەدسالییا بووری دناڤبەرا گوندی ئاڤخانێ و گوندی پێچەکێ دا هاتییە ئاڤاکرن ونها تەنێ جهێ وێ مایە. نها ئاڤخانێ خرابەیە و تەنێ ئاڤارێ وی دهێتە چاندن و هەمان بابك ل وی وارێ خوەدینە[١٠٥].

## گوندی پێچەکا ژێرێ:

ب دووراتییا نێزیکی ١٤کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ ل سەر رووبارێ دیجلەی، ل سەر ناڤێ گوندی ژی تەنێ یەك بۆچوون هەیە ئەو ژی جهێ گوندی ل سەر رووبارێ دیجلەیە و ژ بەر هار بوون و لێك سوار بوونا ئاڤێ ل راستا گوندی و ژبەر بلندبوون و وەرپێچانا پێلا ئەڤ ناڤە ل سەر هاتییە دانان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ پیچەکا ژووری

**باشووری:** گوندێ کۆمبەلێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ قەسرا مەلا تەیبی

**رۆژئاڤای:** رووبارێ دیجلە

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٤٢ کەس ل گوندی ژیان[١٠٦]. گوند هەموو سلێڤانەینە و خودانێ گوندی (ئەحمدێ رەشیدێ) ترکژی بوو، بەری ڤالاکرن و خرابکرنا گوندان ١٩٧٥ێ گوند ژ نێزیکێ ٣٠ مالان پێکدهات.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

وان ل سەر ب تۆڤچینییا گەنم و جەهان و ماسی گری و بازرگانیێ دگەل ئالیێ دی یێ ئاڤێ بوو، ژبلی ئاشەکێ گازێ یان ئاگری لێ هەبوو، ل سالێن پێنجیان بنکەهێ پولیسان لێ هاتبوو ڤەکرن و خواندنگەهەکا سەرەتایی ل سالا ١٩٥٨ێ لێ هاتییە ڤەکرن گەلەك گوندێن دەوروبەران مفا ژ ڤێ خواندنگەهێ وەردگرت.

### سیمایێ گوندی:

دەوروبەرێن گوندی چەند زۆرك دیارن وەكو زۆرێ حەسووی و چەمووكێت بەشیری و وارێ حەجی ئیسڤی و وارێ گەودا و تیرکێت عەرەبا و ئەزمانێ گای و زۆرێ هادێ و بەستا عەشیرەتێ و گەلی بەعوولی و گر كێڤریشكی و بركێ و مێش خوەلینكێ و دو كانیێن ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی هەبوون (كانییا ئەحمەدێ رشیدی و كانییا میسای).

نها گوند كەتیە ژێر ئاڤا سكرێ مووسل، و خەلكێ گوندی پترن ژ ٢٠٠ مالن و ل كۆمەلگەها خرابدێم و سێمێلێ و زاخۆ بەلاڤن.

## گوندی پێچەكا زووری:

ب دووراتییا نێزیكێ ١٢كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ، ل سالێن پێنجیان هاتییە دروستكرن ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٢٣٥ كەس ل گوندی ژیان[١٠٧].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری**، گوندێ ئاڤخانێ

**باشووری**، گوندێ پیچەكا ژێری

**رۆژهەلاتی**، گوندێ قەسرا مەلا تەیبی

**رۆژئاڤای**، گوندێ شكەفتێ

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا وان بەری هەر تشتی ل سەر چاندنی بوو و رووبەرێ ئاخا ب كێرێ چاندنێ دهێت نێزیكێ (٢١٥٢) دۆنەمانە، دیسان ماسی گری و بازرگانی كارێن ژیارا خەلكێ گوندی بوون. سەبارەت ژێدەرێن ئاڤا وان ژی هەموو ل سەر رووبارێ ئاڤا دیجلەی بوو.

### نیشانێن گوندی:

ڤێ گوندی چەندین نیشان و وار و بلنداهی و نزماتی هەنە مینا: گر هەسن، گەلووكێ شكەفتا، گەلی بەعولێ، گەلوكێ گورگا و بانێ ئاقوی كو نها پرۆژێ ئاڤا دهۆكێ ل سەر و پاشان ئەوژی بوویە دو گوند یان دووبەش:

١. **گوندی سەرگەرێ**، پێكهاتا گوندی هەموو سلێڤانەیی بوون ژ بنەمالێن (سلێمان ئاغای، مەلاكی و چەند مالێن دی)، و خودانێ گوندی سلیمانێ محەمەدئاغایی تركژی بوو كو ل سالا ١٩٥٧ێ وەغەر كری، گوند ژ چەند مالەكێن كێم پێكدهات كو ئەو ژی پشتی سالا ١٩٧٥ێ نەمای.

٢. **گوندی سنجەق**، ئەڤە پارچا دووێ یا گوندی پێچەكێ بوو ، وەكو سیما و نیشان ئاشەكێ ئاگری یێ حەجی سمایلێ حەجی عەبوی بوو ل گوندی سنجەقێ هەبوو و براهیمێ فەتەحا ل بەر كاردكر، تەنەكا گەنمی ب نیڤ دەرهەمی یان تەنەكە بەرامبەر قوتییەكا تایبەت هەبوو دگۆتنێ (مدێ ئاشی، واتە مزێ ئاشی) د هێرا و هەمی گوندێن دەوروبەر دهاتن ئاشێ سنجەقێ.

### سیمایێ ڤی گوندی:

ژ چەندین نیشان و بلندی و نزماتییان پێكدهات وەك: بانێ ئاقووی و گر هەسن كو جهێ روونشتن و سوحبەت و یاریێن وی سەردەمی یێن زەلامان بوون و دیسان چەندین نهال هەبوون، مینا نهالا جوهنیكا و نهالا حەموویێ ئافخانی و نهالا شكەفتووكێ (شكەفتەك تێدا بوو گەنجێن گوندی ل وێ شكەفتێ بۆ چێكرنا چایێ و سوحبەتان كۆم دبوون)، و زنارەكا بلند ل رۆژهەلاتا گوندی و ب ناڤێ گوندی دهێتە ناڤكرن هەیە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ سنجەقێ ل سەر تۆڤچینێ و ماسی گرتنێ و بازرگانی دگەل ئالیێ دی یێ ئاڤێ و چاندنا باجان و خیار و هەمی كەسكاتییێن هاڤینی ل بەر رووبارێ دیجلەی بوو.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

سلێڤانەی بوون ژ بنەمالێن سلێمان ئاغایێ تركژی و حاجو كولەكی، و گوند ل سالا ١٩٧٥ێ

كەتە بەر هەوا عەرەبكرنێ و هاتە وێرانكرن و تا نها نەهاتییە ئاڤاكرن، لێ خەلكێ گوندی هەمی سالان ب تۆڤچینیێ رادبن و واری شیندكەن[108].

## كۆمەلگەها خراب دێمێ:

ب دووراتییا نێزیكێ (١٢)كم دكەڤیتە باشووری سەنتەرێ ناحیێ، هەڤسنوورە دگەل گوندێن شكەڤدەلێ و ئاڤزریكا میری ژ ئالیێ باكووری و پێچەكا ژووری ژ ئالیێ رۆژاڤای و هەوریسكێ ژ ئالیێ رۆژهەلاتی و قەسرێ و كومبەلێ ژ ئالیێ باشووری، ئەڤ جهە ژی كەتبوو ژێر هەوا ب عەرەبكرنێ ب ناڤێ (مجمع دجلة) و هۆزێن عەرەب (عويص و معماري و شرابي)[109] لێ هاتنە ئاكنجیكرن تا سەرهلدانا ١٩٩١ێ، و خودانێن وێ یێن رەسەن لێ زڤڕینەڤە سەر جهێن خۆڤە.

رامانا ناڤێ كۆمەلگەهێ ژ ناڤێ گوندی خراب دێمێ كەڤن هاتییە، و بنیاتێ ناڤێ گوندی ژبەر كو پتریا دەمی یێ بێ ئاڤ بوو و هەردەم بەر ب خراببوون و چولكرنێ ڤە دچوو، لەوما ب (خراب دێم) هاتە ب ناڤكرن، گوندێ كەڤن نێزیكێ ٢٠٠-٣٠٠ م، ژ رۆژهەلاتێ كۆمەلگەهێ دوورە.

### پێكهاتا خەلكێ كۆمەلگەهێ:

پێكهاتا كۆمەلگەهێ نها نێزیكێ ٦٥٪ سلێڤانەیی نە كو خەلكێ گوندێن دەوروبەرێ كۆمەلگەهێنە وەكی قەسرێ و كومبەلێ و حزاز و ئاڤخانێ و هەردو پێچەكا و چەمزراڤێ و بنەمالێن داود ئاغای و محەمەد خانا و عەڤدو فندوا مالا مەلا تەیبی و شەمسا و كالداری و نێزیكێ ٢٧٪ كچانن، و هەمان بابكێن گوندی خراب دێما كەڤن لێ دژین و ٨٪ مووسا رەشی نە، ئەو ژ هەمان بابكێن گوندی كەڤنن، زێدەبارێ چەند مالەكێن دی و ژین و ژیارا پتریا وان ل سەرچاندنا نیسك و نۆك و گەنم و جەهـ و گوندورێن دێم و بەرهەمێن ئاڤی وەكو باجان و خیار و بامی و زەبەش و.... هتد. زێدەباری خودانكرنا پەز و بزن و چێل و قازو مریشك و عەلۆكان.

### ژێدەرێن ئاڤا كۆمەلگەهێ:

پرۆژێ ئاڤا دهۆكێ یە و ئاڤا ژێرئەرد كو ژ سمایل ئاڤا دهێت، نهاژی خراب دێم یا ئاڤایە و كۆمەلگەها بۆشە و ل سەر ئاقارێ دو گوندان ئاڤاكریە، نێزیكێ ٧٠٪ ل سەر ئاقارێ پێچەكا ژوورێ و ٣٠٪ ل سەر ئاقارێ خراب دێمێ، ژمارا خێزانێن كۆمەلگەهێ دگەهنە نێزیكێ ٢٩٣ خێزانان كو دبنە نێزیكی ١٨٠٠ كەسان، و گەلەك كارێن خزمەتكاریێ ژی ل كۆمەلگەهێ هەنە وەكی خواندنگەهەكا بنەڕەت و بنگەهەكێ ساخلەمیێ و دو بیرێن ئاڤا ژێر ئەرد و هێلا كارەبێ و جادەیەكا ڤیركری و مزگەفتەك[110].

## گوندی كومبەلێ:

ب دووراتییا نێزیكێ ١٥كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ باتێلێ ل سەر رووبارێ دیجلەی. رامانا ناڤێ گوندی وەكو دبێژن پێكهاتییە ژ دوو پەیڤان (كوم+ بەل) ئانكو كومێ بلند و دیار.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ پیچەكا ژێری

**باشووری،** رووباری دیجلە

**رۆژهەلاتی،** گوندێ قەسرا مەلا تەیبی

**رۆژئاڤای،** رووباری دیجلە

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

گوند ژ (٢١) مالێن سلێڤانەیی بابكێ سلیمان ئاغایێ تركژی و بابكێ كالداریيا و سەیدێن وانكێ و چەند مالەكێن دێ پێكدهێت، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٨٥ كەس ل گوندی ژیان[111].

ژێدەرێن ژیارا ژیارا خەلكێ گوندی: هەر د كەڤندا ل سەر تۆڤچینیێ و دروستكرنا وەرزێن باجان و خیار و زەبەشان و ماسی گری و بازرگانی دگەل وی ئالیێ ئاڤێ بوو. ژێدەرێن ئاڤا گوندی پتر ل سەر دیجلەی بوو ژبلی كانیا كالداری كو بۆ هەمموو كارێن خۆ ب كاردئینان.

### سیمایێ گوندی:

کومبەلێ ژ بەر هەبوونا ئاڤا دیجلەی ل هەردو ئالیێن رۆژئاڤا و باشوور بوویە وارەکێ ب خێر و بێر و وارەکێ بەرهەمدار و چەندین نیشان لێ هەنە، وەکی:

ژ نهالان: نهالا حەماموکا (دناڤبەرا گوندی و قەسرا مەلا تەیبی دا)، نهالا قورێ، نهالا دێم، نهالا کانیێ، نهالا قەنتەرێ، هەر وەسان زۆرێ ئەنیا دنێ کو بانیکەکە دکەڤیتە هنداڤ ئاڤارێ گوندی و وارێ بەرازا (جهەکێ ب ناڤە ل دەڤ هەموو گوندیان)، وارێ دورێ، وارێ سەید قادری، وارێ تەموی، وارێ هۆلێ و چەندین نیشان ژی ل گوندی هەنە مینا: دەرزێ و قووچا قەمبوی و دەوقەلین و زرزمان و تەقشێ و تەحتووکا و دربێ و قەفا کەلەکا و گر خالد و گر مەتبەخ رۆژهەلاتێ گوندی و کانیا کالداری.

کومبەلێ کەتیە بەر لەهیا هێرشێن حکومەتێن بەغدا و چەندین جاران هاتییە وێرانکرن، و داوی جار ل ژێر بریارا تەعریبێ هاتە وێرانکرن، و خەلکێ گوندی ئاوارەی سێمێلێ و زاخۆ بوون تاکو سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ خەلکێ کومبەلێ دیسان ڤەگەریانە سەر وارێ خۆ و بەردەوامی دانە ژیانا خۆ، نها ژمارا خەلکێ ڤی گوندی دگەهیتە نێزیکێ (١٤٠) سەرۆك خێزانان و ژبەر دووراتییا ڤی واری ژ رێێن سەرەکی و بازاران نەهاتییە ئاڤاکرن و نها خەلکێ وی ل خراب دێم و سێمێل و زاخۆ و مووسلێ دژین بەلێ هەموو سالان وارێ خۆ وارێ شێندکەن[١١٢].

## گوندی کێلکێ:

ب دووراتییا نێزیکی (١٥کم) دکەڤیتە رۆژئاڤایێ باتێلێ. ل نێزیکی گوندی خرابەیەکێ کەڤن ل سەر گرەکێ بلند و تیژ هەیە، شێوێ کێلیێ ددەت، وەکی خەلکێ گوندی دبێژیت دبیت ناڤێ گوندی ژ وێ بلنداهیێ هاتبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ مەزرێ

**باشووری:** گوندێ بەغلوجێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چیمەنیا

**رۆژئاڤای:** گوندێ ئاڤزرویکا شەنوی

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

کێلکێ بەری خرابکرن و مشەختکرنێ ژ (١٠ - ١٢) مالێن سلێڤانەییان مالا شەمدین ئاغای و کۆچەرێن هاجا بابکێ بووبا پێکدهات و تا نها هەمان بنەمال هەر خوەدیین ڤی وارینە.

کێلکێ چەندین جاران کەتیە بەر ستەما داگیرکەران، ئێکەم جار سالا ١٩٦٣ێ لەشکەرێ سووری دگەل جاشان هێرشی دەڤەرێ کرن و گوند هاتە وێرانکرن و خەلکێ وی دەربەدەری گوندێن دەوروبەر وەك: شکەڤدەلێ بوون، پشتی دو سالان گوند هاتە ئاڤاکرنڤە، لێ هەمان دەردەسەری ل سالا ١٩٦٦ێ پەیدا بوو و گوند هاتە وێرانکرن و خەلك بەرەڤ گوندی ئاڤخانێ چوون، سالا ١٩٦٩ێ بۆ جارا سیێ گوند هاتە چۆلکرن، و داوی جار سالا ١٩٧٥ێ بوو ل ژێر بریارا ڤالاکرن و خرابکرن و ب عەرەبکرنا گوندان کێلکێ هاتە وێرانکرن و خەلکێ وێ ل سەر چەند گوندەکێن دەڤەرا دۆسکییان وەکو تلاکرۆ و مجلمەختێ و مەمانێ و ئۆزمانا بەلاڤکرن، و پاشی خەلکێ وی هێدێ هێدێ خۆ نێزیکێ بازارێن مینا زاخۆ و سێمێلێ کرن و ل سالا ١٩٩١ێ خەلکێ وی شیان دەستێ خۆ داننە سەر ڤە.

### سیمایێ گوندی:

گوند ژ چەندین گر و کانی و واران پێك دهێت مینا: ژ گر و بلنداهییان: گرێ شەروی و گرێ کەلۆکی ل باشوورێ گوندی، گرێ قەلەوا و گرێ هەوێریا ل رۆژئاڤایێ گوندی و بان هەسپانێ ل رۆژهەلاتێ گوندی. ژ نهالان: نهالا شکەفت کەڤۆکێ ل باشووری، نهالا سڤۆکێ ل رۆژئاڤای، نهالا بەرێ پشت ئێشێ د ناڤبەرا گوندی و گوندی چیمەنیا ل رۆژهەلاتی. ژ ژێدەرێن ئاڤێ ژی کانیا گوندی ل باشووری و کانیا فاتمایێ ل باکووری و ئەڤ هەردو کانیە تانها ئاڤینە و کانیا عەڤدلەی ل رۆژهەلاتێ گوندی و نها یا هشکە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا وان ژی ژبەر كو پتری وان كۆچەر بوون و شەهرەزاییەكا باش د خودانكرنا تەرش و تەوالی دا هەبوو، لەوما دەرگەهێ ژیارا وان یا سەرەكی ئەو بوو، گوندی دبێژن هەر مالەكێ، نێزیكێ (٤٠٠ - ٥٠٠) سەرێن كەوالی هەبوو، ژبلی خودانكرنا مێشێن هنگڤینی هەبوون، هەروەسان تۆڤچینی ژی دكرن، لێ ئەو چەند ل رێژا دووێ دهات، ب هاتنا ماكینە و تەراكتووران ل سالێن چلاندا و راستڤەكرنا برپارا چاندنێ هێدێ هێدێ وانژی پتر خۆ نێزیكێ تۆڤچینیێ كرن و ئەو چەند هاتە رێژا ئێكێ.

نها ئەڤ گوندە و ژبەر دووركەتنا گوندی ژ بازاران و نێزیك بوونا وی ژ كۆمەلگەها كێلكێ خرابەیە و نها پتریا خەلكێ گوندی كەڤن ئاكنجیێن كۆمەلگەها ناڤبرینە، سەرۆكخێزانێن خەلكێ كێلكێ دگەهنە نێزیكێ (١٢٠) سەرۆكخێزانان و هەر سال ئاخا خۆ شیندكەن[١١٣].

### كۆمەلگەها كێلكێ:

ب دووراتییا نێزیكێ (١٢كم) دكەڤیتە رۆژاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ ل سەر جاددا گشتییا چاپانا گرشینی و پێشابوورێ پێكڤە گرێددت. هەڤسنووره دگەل كۆمەلگەها گرشینی ژ ئالیێ رۆژهەلاتی و گوندی پێبزنێ ژ ئالیێ رۆژاڤای و چیا ژ ئالیێ باكووری و سكرێ مووسل ژ ئالیێ باشووری، ئەڤ كۆمەلگەهە ژ بەرمایكێن تەعریبا دەڤەرا سلێڤانەییانە كو ل سالێن حەفتیان ب ناڤێ (مجمع الفاروق) هاتبوو ئاڤاكرن و عەرەبێن جحێشێ و دەراجی لێ ب جهكربوون، تا سالا ١٩٩١ێ و خەلكێ وی یێ رەسەن زڤرینە ڤە سەر ئاخا خۆ.

### پێكهاتا خەلكێ كۆمەلگەهێ:

ژ سلێڤانەییان و كۆچەرێن هاجا بابكێ بووبا و میسارەشی یا پێكدهێت و ئەڤ هەردو عەشیرەتە خۆجهێن كەڤنێن ڤی واری نە، و ژبەر نەئارامییا دەڤەرێن باشوورێ دیجلەی و لێكەریان ل پاریێ نانی میسا رەشی ژی لێ ئاكنجیبوون و ژین و ژیارا وان ل سەر تۆڤچینیێ و خودانكرنا تەرشی و شوفێری و بازرگانی و گەلەك كارێن دی یە.

خزمەتگوزاریێن بۆ ڤێ كۆمەلگەهێ هاتینە كرن، ڤەكرنا خواندنگەهەكا بنەرەت و بنگەهێ ساخلەمیێ و مزگەفت و ڤیركرنا پتریا كولانێن وێ و گەهاندنا هێلا كارەبێ و كۆلانا دو بیرێن ژێر ئەرد.

ژبەر كو كۆمەلگەهە نێزیكی ئاقارێ گەلەك گوندانە، لەوما گەلەك گوند مینا كێلكێ و هەفشێ رەش و مەزرێ و كەشكانێ و چەندێن دی نەهاتنە ئاڤاكرن و خەلكێ وێ ب هەموو پێكهاتێن خۆڤە ب برایینی ب هەڤرا دژین[١١٤].

### گوندی هەفشێ رەش:

دكەڤیتە دووراتییا نێزیكێ (١٥كم) ژ رۆژاڤایێ باتێلێ. ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ (هەفش) ب واتایا مەخەل و بێهنڤەدانا پەزی و ژ ئەگەرێ رەشاتییا چەندەك ژ ئاخا ڤێ گوندی ئەڤ ناڤ هاتییە لێكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ چیمەنیا

**باشووری،** گوندێ چەم زراڤێ

**رۆژهەلاتی،** گوندێن باوەردێ و سێڤدنجنێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ بەغلوجێ

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ئەڤ وار دكەڤندا یێ بنەمالا شەمدین ئاغایی بوو، ژبەر داخستنا سنووران پشتی جەنگا جیهانیا دووێ چەند مالەكێن كۆچەرێن هاجا بابكێ رەشا ل ڤی واری خۆ جهبوون، ئانكو پێكهاتا گوندی بەری سالا ١٩٧٥ێ پێكدهات ژ (١٠) مالێن سلێڤانەیی و كۆچەران و ژین و ژیارا خەلكی وی پتر ل سەر تۆڤچینێ یا جەهـ و گەنم و نیسك و نۆكان بوو، و خەلكێ گوندی ئەڤ دەشتا پرێ گیا كرنێ و سەر ئەڤرازێ و سەر نشیڤێ ڤەژین دكرن تاكو ل داوییا سالێن چلاندا تەراكتوور هاتییە گوندی و بارێ وان

سڤكتر لێ كری، دیسان خەلكێ گوندی خودانكرنا تەرشی ژی دكەت، لێ ئەو چەند ل ل رێزا دووێ دهات و وەكو دانعەمرێن گوندی دبێژن نێزیكێ (٢٠٠) سەرێت كەوالی ژ پەز و بزنان ل گوندی هەبوون.

**سیمایێ گوندی:**

ئاخا هەفشی رەش ژ دەڤەرا رەملی و حەلانان و ئاخا رەش پێكدهێت و یا پڕی نهال و گر و كانیكە، ئەگەر ژ گرێن گوندی دەست پێ بكەین، و ژ رۆژهەلاتێ دەربازی ئاخا ڤی گوندی ببین، گرێ دەی پیرێ دێ كەڤیتە بەراهیا تە و پاشی گرێ زیارەتا، كو زیارەتێن كەڤن و بیانی ل سەر، زێدەباری گۆڕستانا گوندی ل باكوورێ گوندی و دیسان گرێ سۆر ل باشوورێ گوندی. ژ نهالێن گوندی: نهالا گەڕ گامێشێ ل باشووری، نهالا سكری ل رۆژهەلاتی، نهالا قوقو ل رۆژاڤای، نهالا وەرزا ل باشووری. ژ كانیێن گوندی، كانیا بێدەرا یاكو دكەتە رۆژهەلاتێ گوندی، كانیا بنێ گوندی ل باشووری و نها هەردو د هشكن، دیسان تەمامكەرێ سیمایێ گوندی خرابێ عزێر، نیشانا گوندەكێ كەڤنە و بنسترێن وی دیارن و خرابێ بنێ زیارەتا ژی نیشانا گوندەكێ كەڤنە، ژبلی چەندین گر و ێن دێ لێ بێ ناڤن.

گوندی هەفشێ رەش چەندین جاران ل سەر دەستێن حكومەتێن عیراقێ وێران بوویە و خەلكێ وی دەربەدەری گوند و باژاران بووینە، سالا ١٩٦٣ێ ل سەر دەستێ لەشكەرێ سۆری و عیراقی تالان بوویە، جارا دووێ ل سالا ١٩٦٦ێ، و جارا سێێ ل سالا ١٩٦٩ێ ، و جارا داویێ ل سالا ١٩٧٥ێ بوو د چوارچوڤێ پلانا حكومەتا عیراقێ بۆ خرابكرن و ب عەرەبكرنا گوندێن دەڤەرا سلێڤانەییان هەفشێ رەش ژی هاتە وێرانكرن و خەلكێ وی ب زۆرێ هاتنە ڤەگوهاستن بۆ دەڤەرا دوسكییان و ل گوندێن شاوریكێ و بروحەجەرا و دێرگژنیكێ ئاكنجیكرن، و پشتی دەمەكێ كێم خۆ نێزیكێ وارێ خۆ كرن و پتریا وان ل سێمێلێ و زاخۆ ئاكنجی بوون تا سالا سەرهلدانێ دیسان خەلكی گوندی شیان ب زڤڕینە سەر ئاخا خۆ و نها ژمارا خەلكێ ڤێ گوندی نێزیكێ(٥٠) سەرۆك خێزانانە، لێ ژبەر دووریوونا گوندی ژ جاددا سەرەكی و باژاران نها گوند خرابەیە و كەس لێ ناژیت، لێ هەر سال ئاخا خۆ دچینن و چەندین تەنێن جەهـ و گەنمان ل عومبارێن هەرێمێ زێدە دكەن[١١٥].

## ئێزدی و ئێزدیاتی ل دەڤەرا سلێڤانەییا

ل دەڤەرا سلێڤانەیا چەندین گوند و كۆمەلگەهێن ئێزدینشین ل رۆژاڤایێ سەنتەرێ ناحیا باتیلێ هەنە مینا:

(قەرۆدە و كەروێنیێ و ئینجك صو و بێ بزنێ وخووكێ و كانی عەرەبێ و خانتەوەرێ و باجدا میری و باجدا كەندالی و باجدا بەراڤێ و كێلاسپی و دێرەبوونێ و پێشابوورێ و قەرەولا، و پتریا وان ژ بابكێ (هەوێری) نە كو گەلەك نڤیسین ل سەر هاتینە بەلاڤكرن، ژ وان وەكو (باقی الملا) د نامەیا خۆ یا دكتۆرایێ دا دیاركری كو هەوێرێ ناڤێ گەلەكی یە و میتان ناڤێ دەولەتا وانە، ئانكو (دەولەتا میتانی) و ژ گەلێن هند و ئەوروپی دهێنە ل قەلەمدان ب (٣٠٠٠) سالا پ. ز، و ژ دەڤەرا زاگرۆسێ هاتینە كوردستانێ و پاشی ل (وانێ و ئورمیێ) ئاكنجی بووینە و پاشان هاتینە باكوورێ میزوپوتامیا[١١٦]. زێدەباری ئاكنجیبوونا وان ل دەڤەرا سلێڤانەییان و قەزا سێمێلێ ل كۆمەلگەها خانكێ و شاریا و دیسان ل قەزا شێخان ل كۆمەلگەها باعەدرێ ، و ل قەزا شنگالێ ل ناحیا شیمال ل گوندی هەوێریا، و هەوێرێ ژ حەفت بابكان پێكدهێن:

١- بابكێ عیسایا: ژ عیسا هاتییە كو پێشیێ وان بوو و هەسنێ شەرەف(١١٧) (هەێرێ) ژ ڤێ بابكێ بوو هاتییە.

٢- بابكێ تەعلكا: ژ تەعلۆ هاتییە.

٣- بابكێ دارۆغا، یا ن دالوگا: ژ دالۆ هاتییە.

٤- بابكێ شەهاڤكا: ژ شەهۆ هاتییە.

٥- بابكێ بلێسكا: ژ ناڤێ پێشیێ وان بلێ هاتییە.

٦- بابكێ بەیركا ، یان بەیوگا: ژ بەیرەم یان برو هاتییە.

٧- بابكێ ئیسكا: ژ ئیسكو، هاتییە.

و ئەڤ هەموو بابكە برایێن ئێكن و بەلكی هەر چەند بابكەك ژ دایكەكێ بن و ب ڤی ئاوایی:

بلۆ (بلیسكا) و شەهۆ (شەهاڤكا) و ئیسكو (ئیسكا)ژ یەك دایكێ نە، و عیسایی یا و دالوگا ژیەك دایكێ نە، و تەعلكا و بەیرگا ژ یەك دایكێ بوون.

بەرگێن ئێزدیێن كەڤن ل خۆ دكرن شەلوال و قوتك و ئێلەك و كالك و كولاڤێن تەحتی بوون، یێن ژنان ژی پۆشێ و پاشان كراس ژ یەك پارچێ پێكدهات و مێزەر یاكو د سەر ملێن ژنانرە داتپۆشێ و پشتا عەجەم[118] و زێر تەمامكەرێ خەملا ژنا ئێزدێ بوو.

هەوێرێ ب هەر حەفت بابكێن خۆڤە وەكو هەموو ئێزدیان گرێدای ئایینێ خۆبوون و تا نها ب پیرۆزیەكا مەزن ل ڤەلەمددن لەوا چەندین مەراسیمێن ئایینێ ئێزدیاتیێ هەنە، ژوان دوعایێن رۆژانە ئەوژی سێ دوعانە، یەك بەری رۆژ بهەلێت و دوعا دووێ ل نیڤرو و دوعا سێێ ل دەمێ رۆژئاڤا دبت و سەرەدانا مەزارگەهێ (عەڤدێ رەش)[119] و سەرەدانا لالەشێ ل جەژنا جەمایێ و دیسان سەرەدانا لالەشێ ل جەژنا چللێ هاڤینێ و دیسان سەفەرا ماستا[120] و دیسان جەژنا چللێ زڤستانێ.

دیسان ئێزدیان ب گشتێ و هەوێریا ب تایبەت سێ رۆژێن رۆژی گرتنێ هەنە بەری ئێكەم پێنج شەمبیا مەها دو ژ هەر سال ل سەر خاترا خدر الیاس دهێنە گرتن، و ئەڤ هەرسێ رۆژ ب خێر تێن ل ڤەلەمدان و پتر ل سەر وان كەسان فەرزە یێن كو ناڤێن وان خدر یان ئلیاس و دڤان هەرسێ رۆژاندا پێخوونێ[121] ئامادە دكەن و رۆژا پێنج شەمبی ب جەژن دهێت ل ڤەلەمدان و ل ڤان رۆژان ڤەكوشتنا كەوالان و نێچێر ژی ناچێبت چونكە ل گۆر بۆچوونێن وان نێچیر تەنێ یا خدر ئلیاسە.

وەكو هەر مللەتەك رۆژەكێ ژ حەفتیێ ب پیرۆزێ ل ڤەلەمددن و وەكو هەموو ئێزدیان هەوێریانژی پیرۆزیا رۆژا چارشەمبی یاهەی، و چەندین بۆچوون ل سەر ڤێ رۆژێ هەنە، یەك ژوان كو خودای ل رۆژا چارشەمبێ دووماهیك ب ئافراندنا ئەردی ئینایە وكو سەبەڤا دبێژت:

**خوداوەندێ مە ئینێ كر، ئەساسە**
**شەمبووێ برێ كراسە**
**چارشەمبووێ كر خلاسە**

د بۆچوونەكا دی دا دبێژن تاوسێ مەلەك دگەل سێ مەلایكەتان ل رۆژا چارشەمبی هاتینە لالش، و ل دەنگێ شاهی و ستران و خۆشیا وان ئادەم (ص) و حەوا و(شەهید و هوریا)[122] ژ خەو رابوون، ئەڤە بەحس ل چارشەمبیا ئێكێ یە ژ نیسانێ. دیسان بوون و مرنا شێخ فەخرەددین د رۆژا چارشەمبی دایە، دیسان خدر الیاس[123] و خدر نەبی ژ چاكێن ئێزدیان دهێنە ل ڤەلەمدان.

**ژ گوندێن ئێزدینشین ل دەڤەرا سلێڤانەییان:**

## گوندی كێلا سپی:

كێلا سپی ب دووراتیا نێزێكێ (٣٠كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا باتێلێ نێزیك ئاڤا دیجلەی، دكەڤندا گوند مولكێ (عەزیز ئاڤۆ)ی بوو، چەند بنەمالێن ئێزدیێن هەوێرێ تۆڤچینی ل سەر ڤێ ئاخێ دكرن، پشتی راستڤەكرنا چاندنێ یا یاسایا عیراقی هەموو جۆتیار مفا داریوون و بوونە خودان ئاخ و بەهرا وان ژ یا مەلاكێ هاتە جوداكرن و تا نها مەلاكی پارچا خۆ یا ل گوندی كێلا سپی هەی. رامانا ناڤێ گوندی (كێلا سپی) ژبەر گرەك ل نیڤا گوندی هەیە و كێلەك ل سەرە، فرەهیا وێ نێزیكی مەترەكێ یە و بلنداهیا وێژی نێزیكی مەترەكێ یە و خەلكێ گوندی وێ كێلێ ب نیشانەكا پیرۆز ل ڤەلەمددن و گەلەك جاران ئێزدێ بۆ خۆ دوعا ل دەف دكەن و دیرۆكا وێ یا دیار نینە، پیرۆزیا وێ وەكو خەلكێ گوندی ڤەدگێرن راست هێلەكە دگەل چیایێ جۆدی كو چیایەكێ پیرۆزە ل دەڤ هەموو خەلكێ دەڤەرێ

ب هەموو ئاینانڤە ب تایبەت ئاینێ ئیسلامێ، ژبەر کو ناڤێ وێ د قورئانا پیرۆز دا هاتییە لەوا ئێزدیێن هەوێرێ و ب تایبەت یێن ڤێ گوندی دیرۆکا ڤێ کێلێ ب وێ چیاێ ڤە دگرێدن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** کۆمەلگەها باجد کندال

**باشووری:** گوندێ باجد بەراڤ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی عەرەبێ

**رۆژئاڤای:** کۆمەلگەها دێرەببوونێ

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

پتر ل سەر خودانکرنا تەرشی بوو، و هەر مالێ نێزیکێ (٧٠٠ - ١٠٠٠) سەرێت کەوالێ جۆرا و جۆر هەبوون و مفایەکێ باش بۆ دەبارا ژیانا خو ژێ وەردگرتن ب فرۆتنا پەنیری و هریێ و هەمی بەرهەمێن ریچالی، وەکو گوندی دبێژن، د سەدێ بۆریدا بازارێ مە وەکو ئێزدێ خۆشتر بوو لێ نها ژبەر چەند ئەگەران سست بوویە، دیسان تۆڤچینی ژێدەرەك بوو ژ ژێدەرێن دەبارا ژیانا وان و ل رێزا دووێ پشتی خودانکرنا پەزی دهات، لێ پشتی ل داوییا سالێن پێنجیان و دەستپێکا سالێن شێستان و هاتنا ئامیرێن نوی یێن چاندنێ پتر ب ئاخێ و تۆڤچینیێ ڤە هاتنە گرێدان.

## سیمایێ گوندی:

کێلا سپی ژ چەندین گرك و و کانی و زەڤیان پێکدهێت وەکو نهالا گوندی کو ب ناڤێ نهالا (چاکەلەخا) ژی دهێتە نیاسین و گەلەکا کەڤنە، دانعەمر دبێژن شەرێن مەزن لێ هاتینە کرن و گەلەك کەلەخ مانە تێدا لەوا ئەڤ ناڤ کەتیە سەر، پاشی نهالا کانییا کۆچۆ، و نهالا ئاخ سپیکێ د ناڤبەرا گوندی و پێشابوورێدا و چەندین نهالێن دی، ژ گرکان ژی، گر هژیرك کو گرەکێ ب ناڤە ل دەڤ گوندییان، دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی باجد کەندالا، گر دوورمەز ل باشوورێ گوندی و دناڤبەرا گوندی و باجد بەراڤێ دا، گرێ رۆمی یا کو گرەکێ بلندە و وەسا هاتییە ب ناڤکرن کو لەشکەرێ ئوسمانی ئەو گر کربوو جهێ زێرەڤانیێ ل سەر وێ دەڤەرێ، دیسان گرێ ئاخ سپیکێ و گرێ کێلا سپی، یێ کو کێلا سپێ ل سەر و گرێ مەلا ئەسعەدی.

ژ کانیێن گوندی: کانییا مەلە ئەسعەدی، کانییا بەسێ، کانییا محوی یێن کو دکەتنە باکوورێ گوندی و نها هشکن، و کانیێن مالا سەعیدی، کانی تەحتکێ، کانییا نهالا توخیبا و ئاخ سپیکێ و کانییا کوچۆێ تا نها ئەڤ کانیێن هان ئاڤدارن و مفای ژێ دبینن.

گوندی کێلا سپی یێ کو ژ نێزیکێ (٣٥) مالان پێکدهات ئەو ژی کەتبوو بەر هەوا وێرانکارییا ب عەرەبکرنێ، و ئاخا وێ ل سەر عەرەبان هاتبوو پارڤەکرن، خەلکێ گوندی دەربەدەرێ کۆمەلگەهێن شاریا و خانکێ ببوون تا سالا ١٩٩١ێ و سەرهلدانێ ئێدی هەموو خەلکێ گوندی ڤەگەریانە سەر ملکێ خۆ و گوند ل هەمان جهێ کەڤن هاتە ئاڤاکرن و نها نێزیکێ ٤٠ مالان ل گوندی ئاڤانە گەلەك ژوان تانها ب شێوێ بەرێ ب ئاخ و لبنان هاتینە ئاڤکرن. نها نێزیکێ (٩٢) جۆتیارانن و ئاخا خۆ هەر سال ڕادکەن و شێندکەن.

حوکمەتا هەرێمێ رێ بۆ وان گوندان هەمیان ب ڤیرێ کێشاینە و چەندین خزمەتگوزاری وەکی خواندنگەهەکا بنەڕەتی و بیرئیرتیوازیەك و هێلا کارەبێ و و رێك و بان گەهاندینە گوندی.

## گوندی باجد کەندال:

گوند ب دووراتییا نێزیکێ (٢٣کم) دکەڤیتە رۆژاڤایێ سەنتەرێ ناحیا باتێلێ، گوندەکێ ئێزدی نشین بوو و دبێژن ملك یێ (عەزیزێ ئاڤۆ)ی بوو، و ل سەردەمێ بزاڤا شەواڤی ل مووسلێ سالا ١٩٥٩ێ ئێزدی هاتنە باجدێ و ئاخا وێ ب شێوێ گرێبەست دگەل مەللاکی شێندکرن تاکو برپارا ڕاستڤەکرنا چاندنێ دەرکەتی، ئێدی جۆتیار بوونە خودان ئاخا خۆسەر، بەهرا مەللاکی هاتە جوداکرن ، لێ بەری ڤی دەمی کارێ وان کۆچەرایەتی بوو و نها ژی زۆمێن

وەكو باسكێ بەلەك و فەراشینێ و مەیدانا كولیا، وەكو بیرهاتن و شوینوار ماینە ل دەردۆرێن شرنەخێ.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ باجد میری

**باشووری،** گوندێ باجد بەراڤ

**رۆژهەلاتی،** گوندێن كانی عەرەبێ و پێ بزنێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ كێلا سپی

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

وەكو گوندی دبێژن خودانكرنا تەرشی و كۆچەرایەتی كارێ وان یێ سەرەكی بوو لێ ب حوكمێ كاودانێن نە ئارامێن دەولەتا تورك ئەو ژی ل دەڤەرا سلێڤانەییان ئاكنجیبوون. كارێ وان یێ سەرەكی هەر خودانكرنا تەرشی بوو و هێدێ هێدێ توڤچینیا دەخل و دانی كرن، تا سالا ١٩٧٥ێ كو گوند هاتییە وێرانكرن مالێن گوندی دۆرێت (٦٠) مالا بوون.

## سیمایێن گوندی:

باجد كەندال ئێكە ژ گوندێن پڕی نهال و گرك و كانی و شوورکە مینا خربا خەلیفەی كو گۆڕستانەكا گەلەك كەڤن هەیە و دیرۆكا وێ یا دیار نینە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی، دیسان گرێ سن گركێ و گرێ كانێ كالكێ و گرێ هژیرێ گرێ نێرێ قوپ و یێن مینا ا شووركا گر پۆران ل باشوورێ گوندی و شووركا كانی كالكێ، و چەندین كانی ژی هەنە مینا: كانییا كالكێ و كانییا نێرێ قوپ و هەردو تانها ئاڤرێژن و كانییا گوندی كو ئاڤا وێ ژی یا بەردەوامە و كانییا بەرۆژ و چەندین چاڤیكێن دێ لێ بێ ناڤن، دیسان ژ سیمایێن گوندی شكەفتۆكەك یان بەرە ڤەزەك مەزن هەیە دبێژنێ شكەفتا بووك و زاڤا ئەڤ ناڤژی ژ بەر شینبوونا گیا زاڤاكی ل رەخ و دۆرێن شكەفتێ، و ژبەر ڤێ سیمایێ تێر و ئاڤی ب دەهان جۆرێن گیانەوەرێن كووڤێ ل ئاڤارێ گوندی هەبوون مینا گورگ و رووڤی و حەفتیار و ئاسك و بەراز و قتك و سویسك و تیتیك و مار و دووپشك...... هتد. لێ نها گەلەك ژڤان گیانەوەران ل ئاڤارێ ڤێ گوندی نەماینە.

## تیتالێن خەلكێ گوندی:

دكەڤندا و تا نها خەلكێ گوندی ژ هەموو ئالیانڤە گرێدای كەلتۆرێ خۆنە، ئانكو بەرگێن وان كوردینە و دەرسۆكەكا سۆر د سەرێ زەلامێن وانە و ب جلێن كوردێ راپێچاینە و شووتك و تزبیێن وان دیارن و تا نها سمبێلێن وان مەزنن ئەو یەك ژ نیشانێن ئیزدیێن كەڤن بوون، و دیسان ژنێن ئیزدێ ژێ خەملا وان جیاوازە دگەل خەلكێ دەڤەرێ و ژ دۆرڤە دهێنە نیاسین.

گوندی باجد كندال ژی كەتیە ژێر لەهیپا وێرانكاریا سیاسەتا حكومەتێن عیراقێ و گوند ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە وێرانكرن و كۆمەلگەهەك ب ناڤێ (مجمع الوسطی) ل شوونێ هاتییەئاڤاكرن و هۆزێن عەرەبێن (شێبانی و عجاج) لێ هاتنە ئاكنجیكرن و وارێ باجدێ كەتە ژێر دەستێ وان. و خەلكێ گوندی دەربەدەرێ كۆمەلگەهێن خانكێ و شاریا و گەلەك وەلاتێن جیهانێ بوون، تا سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ دیسان خەلكێ باجد كەندال ڤەگەریا سەر ملك و وارێ خۆ و نهاژی باجد كەندالا كەڤن خرابەیە و پتریا خەلكێ گوندی ل كۆمەلگەهێ كو نها ب كۆمەلگەها باجدێ هاتییەناڤكرن دژین، ژمارا سەرۆك خێزانێن وان نها د گەهنە نێزیكێ (٢٠٠) سەرۆك خێزانان لێ د بەلاڤەنە و دووری گوندی نە. ژ خزمەتێن بۆ ڤێ كۆمەلگەهێ هاتینەكرن كۆلانا بیرەكا ئیرتیوازی و گەهاندنا كارەبێ و ڤەكرنا دو خواندنگەهانە.

## كۆمەلگەها باجدێ:

كۆمەلگەهـ دكەڤیتە سەر رێا سەرەكێ دناڤبەرا باتێل- پێشابوورێ ب دووراتییا نێزیكێ(٢٣كم) رۆژاڤایێ سەنتەرێ باتێلێ، پشتی سالا ١٩٧٥ێ وەكی بەشەك ژ تەعریبێ ل دەشتا سلێڤانەیا هاتییە ئاڤاكرن، و ب ناڤێ (الوسطی)، و عەرەبێن (العجاج

و الشیبانی) دناڤبەرا ١٩٧٧ێ هەتا سالا ١٩٩١ێ لێ ئاكنجی كربوون و خەلكێ وی پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ ڤەگەریانەڤە سەر وارێ خۆ ڤە. باجد ژ نێزیكێ (١١٥) مالان پێكدهێت و هەموو كوردێن ئێزدینە و خەلكێ گوندێن باجد كەندال باجد میرێ نە، ژ بەر نێزیكبوونا كۆمەلگەهێ ژ باجد كندال گوندیا بزاڤا ئاڤاكرنا گوندی كەڤن نەكرینە.

نها دو خواندنگەهـ لێ هەنە و ژێدەرێ ئاڤا وان ئاڤا ژێر ئەردە و خەلكێ كۆمەلگەهێ هەموو خزم و خوینێن ئێكن[١٢٤].

## گوندی باجد بەراڤێ:

گوند ب دووراتییا نێزیكێ (٣٢كم) دكەڤیتە رۆژاڤایێ سەنتەرێ باتێلێ ل سەر رووبارێ دیجلەی، بۆ ئێكەم جار سالا ١٩٢٧ێ هاتییە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن كێلا سپی و باجد كەندال

**باشووری،** رووبارێ دیجلە

**رۆژهەلاتی،** گوندێن تووسانا و خان تەوەرێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ پێشخابوورێ

گوند وەكو ملك یێ (عەزیز ئاڤۆ)ی بوو، لێ پشتێ راستڤەكرنا قانوونا چارەسەركرنا چاندنێ (قانون الاصلاح الزراعی) پشكا مەلاكێ هاتییە جوداكرن و نها هەر كەسێ پارچا خۆ یا عەردێ هەیە.

دانعەمرێن گوندی دبێژن پێنج جاران گوند ب دەستێن حكومەتێن بەغدا هاتییەسوتن، ل سالێن ١٩٦٣ێ، ١٩٦٦ێ، ١٩٦٩ێ (كو خەلكێ وێ دەربەدەرێ بەغدا و شنگال و زاخۆ بووین)، ١٩٧٤ێ (خەلكێ گوندی دەربازێ سووریا بووین و ل گوندی خانكێ ئاكنجێ بوون و پشتێ شەش مەهان رادەستێ رژێما بەغدا ل باژێركێ رەبیعە كرن و دیسان زڤرینە گوندی) و داوێ جار ل سالا ١٩٧٥ێ بوو ل ژێر بریارا عەرەبكرنێ و گوند هاتە وێرانكرن.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

باجد بەراڤێ ژ (٣٢) مالان، (١٢) مال فەللەیێن كلدانی و (٢٠) مالێن ئێزدیێن هەوێرێ پێكدهات، خەلكێ گوندی هەمێ ب هەڤرا ب خۆشی دژیان، لێ حكومەتێن بەغدا گوند ل وان خرابكرن و خەلكی وێ دەربەدەرێ گوند و باژارێن عیراقێ بووینە، و ئاخ و ئاڤێن وان ل عەرەبان بەلاڤكرن.

ژبەر كو ئێزدیێن هەوێرێ ئاوارە و كوچبەربوون و كارێ وانێ سەرەكی خودانكرنا تەرشی بوو، لێ پشتێ هینگێ مینا مەسیحییان وان ژی تۆڤچینی كرن و تێدا شەهرەزابوون و بۆ ئێك ژ ژێدەرێن گرنگێن ژیانا وان.

### سیما: گوندی:

باجد بەراڤ ژئاڤێ وێ دیارە كو نێزیكێ ئاڤێ یە و خومخوم و لەهێێن وێ رووبارێ بەشەكە ژ سیمایێ گوندی، خەلكێ گوندی گەلەك مفا ژ رووبارێ ناڤبری بۆ ماسیگرتنێ و چاندنێ و...هتد وەرگرتینە.

ل ئاقارێ ڤی گوندی چەندین نهال و گر و كانێ هەنە:

**ژ گركان،** گرێ كوچۆ، گرێ قەمچوور[١٢٥] یان گرێ رۆمیا و گرێ تەحت هەرسێ دكەڤنە باكوورێ گوندی و گرێ داوەتێ رۆژهەلاتێ گوندی.

دیسان ل رەخ و دۆرێن ڤان گران چەندین نهال هەنە مینا:

- **نهالا گرپۆران** باكو ژ باجد كندال دهێت و دگەهیتە باجد بەراڤێ و سەر رووبارێ دیجلە و نهالا دەڤێ (حێشترێ)، كو ل وێ دەمێ حێشتر بۆ هاتن و چوونێ و بازرگانیێ د هاتنە ب كار ئینان و ئەو جهێ بێهن ڤەدانا وان بوو.
- **نهالا كانێ تەحتكێ و نهالا گرپسۆكێ،** كو دنیڤا گوندی كەڤنرا دەرباز دبیت و ل بەرێ یا تێر بیە و سپیندارببوو.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

چەند كانییەك بوون، ژوانـان: كانێ تەزیك بۆ ئاڤدانا پەزی و شووشتن و بالاڤ و لێنانا خوارنێ و

کانییا هاشمی و ئاڤا رووبارێ دیجلە.

پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ گوند ژ بال خودانان هاتە ئاڤاکرن، سالا ٢٠٠٦ێ جهەکێ جودا ل رۆژئاڤایێ گوندی کەڤن ب دووراتییا نێزیکێ کیلومەترەکێ بۆ گوندیێن مەسیحی هاتە ئاڤاکرن و پێکدهێت ژ (٢٠) ئاڤاهییان و دێرەکێ و هێلا کارەبێ و جادەیەکا قیرکری و هۆلەکا تایبەت، دیسان خودانێن ڤێ گوندی ب سەدان دارێن فێقێ ژ خوخ و حولیك و مشمش و هژیر و تەراقێ ل وی واری چاندینە. نها ئەڤ گوندە بوویە دو گوند و هەردو ئاقارێ وی گوندی شیندکەن و شریکین وێ ئاخێنە، نها نێزیکێ (٢٠٠) ئاڤاهییان ل هەردو گوندان هەنە و (٦٣) جۆتیار تێدا کاردکەن ژیارەکا خۆش بهەڤرا دەرباز دکن[١٢٦].

## گوندێ خووکێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا نێزیکێ (٢٨کم) رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا باتێلێ ل سەر رووبارێ دیجلە. سەبارەت ناڤێ گوندی، خویکێ (خووك)[١٢٧] بەرێ گوند بکەڤت وی جهی و بێتە ئاڤاکرن و ژبەر جهێ وی نێزیکێ ئاڤێ و رێبارا چەندین گوندان هەردەم جهێ رێگری و ژێ ستاندنا خویکێ بوو، تاکو ب خووکێ هاتییەناڤکرن. بۆچوونا دووێ خووك ئانکو جهێ ئاڤ لێ د پەنگێێت و مفا بۆ ئاڤدانێ یان شووشتنێ ژێ بێتەوەرگرتن[١٢٨].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ صۆریا

**باشووری،** رووبارێ دیجلە

**رۆژهەلاتی،** رووبارێ دیجلە

**رۆژئاڤای،** گوندێ مشارا

دیرۆکا ئاڤاکرنا گوندی دیار نینە، وەك ملك یێ عەزیز ئاقوێ بوو و ئاکنجیێن گوندی هەموو ئێزدیێن هەوێرێ بوون، پشتی راستڤەکرنا قانوونا چاندنێ ل گۆر یاسایا عیراقێ عەردێ گوندی ل سەر هەموو جوتیاران و مەللاکێ هاتە پارڤەکرن و و تا نها بەردەوامن سەر چاندنا ئاخا ڤی گوندی.

### سیمایێ گوندی:

چونکی عەردێ ڤی گوندی دەشتە و وارێ گوندی راستکەهی یە و ساناهی یە بۆ چاندنێ، لەوا تۆڤچینیا جههـ و گەنمان ئێك بوو ژ ژێدەرێن سەرەکی یێن گوندییان، ل ئاقارێ ڤی گوندی چەند بلنداهی و لات هەنە مینا لاتا سەگۆ و گەلیێ لاتێ و چەندین گرك و نهال، لێ چو ناڤێن دەستنیشانکری نینن، هەلبەت دوورپێچکرنا ئاڤا دیجلە ژ دو ئالییانڤە رەونەقەکا دی دایە گوندی و دەرگەهەکێ باش بوو بۆ ژیارا خەلکێ گوندی ژ نێچیرا ماسیا و کۆمکرنا قورمێن دارا بۆ سۆتنێ و بالاڤا و گەرمکرنێ، دیسان دیجلە ژێدەرێ ئاڤێ یە بۆ خەلکێ گوندی، دڤان سالاندا ل کنارێن رووباری چەندین خانیێن بلاستیکی بۆ چاندنا دەرامەتێن هاڤینی ژ باجان و خیار و لوبێ و....هتد هاتینە دروستکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی دکەڤندا هەتانیڤا ئێکێ ژ سەدسالییا چوویی پتر لسەر خودانکرنا تەرشی بوو، تۆڤچینی ژ بەر ئالاڤێن کەڤن ل رێزا دووێ دهات، پشتی هاتنا ئامیرێن چاندنێ د سالێن پێنجییان ژ سەدسالییا چوویی سەروبەرێ چاندنێ باشتر لێ هات و پتر تێدا شەهرەزابوون.

بەری هەوا تەعریبێ ل ١٩٧٥ێ گوند نێزیکێ (٢٤) مالان بوو، لێ هاتە وێرانکرن و خەلکێ وی دەربەدەری گوند و کۆمەلگەهان بوون و پتریا وان ل خانکێ ئاکنجێ بوون، تا سالا ١٩٩١ێ دیسان خەلکێ گوندی ڤەگەرەیانەڤە، نها گوند نیمچە ئاڤایە و ب تنێ سێ مال ل گوندی هەنە و ئەو ژی مژوولی خودانکرنا پەزی نە و بەلکی هەریەکێ دناڤبەرا (٧٠٠ -٨٠٠) سەرێن پەزی، نە ئاڤاکرنا گوندی ژبەر دووراتیا وی ژ رێکا سەرەکی و بازێران، لێ خەلکێ گوندی هەر سال وارێ خۆ شیندکەن.

## گوندێ قەرۆدە:

گوندەکێ کەڤنە، دکەڤیتە بنارا چیایێ بێخێری ب دووراتییا نێزیکێ (٣٠کم) رۆژئاڤایێ باتێلێ، وەکو

گوندی ڤەدگێڕن رامانا ناڤێ گوندی قەرۆدەی نیشانا لاوازبوون و مرنێ ددەت.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایە

**باشووری:** گوندێن پێ بزن و گرکەلێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پەراڤێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ مێرەسورا

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ئێزدیێن هەوێری نە و ئەو دبێژن گوند نێزیکێ (١١٢٠) دۆنەمێن عەردی نە و یێ بنەمالا شەمدین ئاغای بوو، لێ پشتی راستڤەکرنا قانوونا چاندنێ ئەم هەموو بوونە خودان پشك تێدا و گوند کو پێکدهات ژ نێزیکێ (٢٨) مالان چەندین جاران کەتیە بەر هێرشێن حکومەتێن بەغدا و هاتییە وێرانکرن، داوی جار ڕادەستێ عەرەبان کرین، و خەلکێ گوندی ئاوارەی کۆمەلگەهێن شاریا و خانکێ بوون.

## سیمایێ گوندی:

گوند دکەڤیتە بنارا چیای، هەلبەت ژ چەندین نهال و گرك و انی و نیشانێن جودا پێکدهێت، مینا گر باوەشین ل باشوورێ گوندی جهێ روونشتن و کەیف و سوحبەتێن گەنجێن گوندی بوو، نها جهێ گۆرستانا زارۆکانە و تەنێ ئەو گۆرستان ل گوندی هەیە و دەمێ ئێك وەغەرا داوی دکەت پتریا وان ل دێرەبوونێ دهێنە ڤەشارتن، و گرێ پیڤۆکا یێ کو گیایێ پیڤۆکێ ب زحفی لێ شیندبت و گرێ کەمبەرێ[١٢٩] یێ پڕی ئەو گیا و هەردەم چەروانا وی خۆشە. دیسان ژی سیمایێ گوندی ب ڕەوش دئێخن و چەندین نهال هەنە مینا: نهالا وەی لێ لێ (ل رۆژئاڤایێ گوندی و ئەڤ ناڤ کەتیە سەر و ژ خۆشیا وی کو پڕی ئاڤ بوو و جهێ وی هەموو دەما دەنگێ حەیرانۆك و ستران لێ بلند بوو)، و پاشان نهالا ئەردێ چوکو (ل رۆژهەلاتێ گوندی) و نهالا حەسەن پسۆ (باشوورێ گوندی) وا شکەفتا تیپۆێ[١٣٠] و نهالا جوهنیکا (کوەکا تێر حەلانە و جوهنی لێ هاتنە چێکرن و هەردەم پڕی ئاڤ بوون) و پاشان نهالا روولێ یاکو پڕی ئاڤ و تێر دارێن روولێ. دیسان چەندین شکەفت ل چیایێ گوندی هەنە و بووینە جهێ مفا وەرگرتنێ بۆ هەموو گوندییان، وەکی ئیسف ئاغای کو شکەفتەکا فرەهە و ل زڤستانان جهێ نێزیکێ (٢٠٠) سەرێ پەزی هەبوو، و شکەفتا دلۆپکا (ل رۆژاڤای و تێرا (١٠) مرۆڤان دکەت و شکەفتا گەلیێ قورێ (ل رۆژهەلاتێ گوندی و ئەوژێ تێرا (١٠) مرۆڤان دکەت و حەزا گەلێ (ل رۆژاڤای) و ئەڤ هەموو شکەفتە دکەڤنە نیڤا چیای دا ل ئاقارێ گوندی. سەبارەت ژێدەرێن ئاڤێ چەندین کانی ل ئاقارێ گوندی هەبوون، مینا کانییا جوهنیکا و کانی روولك یاکو ئاڤەکا پڕ لێ بوو و پەزێ گوندی ل سەر دهاتە ئاڤدان و کانییا بیرکا یاکو ل بنیا چیای و کانییا بلق بلق و کانییا نهالا وەی لێ لێ و ئەڤ کانی هەموو هشك بووینە و نها گوند ل سەر ئاڤا ژێر ئەردە (بیرئیرتیوازی).

ب هەبوونا چیایێ ل هنداڤ گوندی خەلکی گەلەك مفا بۆ خوارن و کەسکاتی و ڤیڤیێ خورستی و ئاڤەکا سار و زەلال و چاڤ کانیێن خورستی یێن چیای دیتینە، و چیا بوویە جهێ گەشتێن وەرزی یێن گوندیان بۆ کومڤەکرنا هەموو بەرهەمێ وی مینا گوهیشك و کارچك و کەزوان و هژیر و تەفسك و تاوك و هەلهەلۆك و کارێ و سیرك و....هتد.

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ گوندی زڤڕینە جهێ خۆ و نها نێزیکێ (٢٠) مالان لێ هەنە، وەك دبێژن ژمارا خێزانێن وان نها دگەهنە نێزیکێ ١٣٠ سەرۆك خێزانان ل خانکێ و سێمێلێ و گەلەك ولاتان بەلاڤن.

## گوندی بێ بزنێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە سەر جادا سەرەکی یا پێشابوورێ سنوورێ دەولەتا سوری دگەل دوریانا گرشینی و ریا سەرەکێ زاخۆ و دهۆکێ پێکڤە گرێددت، دیسان ب دووراتییا نێزیکێ (٢٥)کم دکەڤیتە باکوورێ رۆژاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ، رووبەرێ

ڤێ گوندی یێ كو ب كێرێ چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیكێ (٣٢١٥) دۆنەمان، ل سەر ناڤێ گوندی وەكو بەربەلاڤ ئەوە كو بزن پەهلەوانترە ژ میهێ و پتر حەزا چیای هەیە، و ب حوكمێ جوگرافیا ڤی واری كو پتر دەشتە لەوا پتریبا تەرشێ وان پەز بوو و (بێ بزن) بوون لەوا ئەڤ ناڤ كەتیە سەر. بووچوونا دووێ ئەوە كو دبێژن پێ بزنێ ئانكو (پێ «لنگ» + بزن). وەسا دیارە كو سەرهاتیبا ڤی ناڤی پتر دگەل بزنێ یە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ مێرگەسۆرێ

**باشووری:** گوندێ كانی عەرەبێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گركەلێ

**رۆژئاڤای:** گوندێن باجدا كەندالی و باجدا میری

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریبا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٧١ كەس بوو[١٣١]. گوند دكەڤندا ژ (١٥) مالێن موسلمانان، (سلێڤانەیی ژ بابكێ شەمسا و ئێزدیێن هەوێرێ بابكێن تەحلكا و بەیركا و بلێسكا و رەشكا) پێكهاتییە، هەر ژ سالا ١٩٧٠ێ شەمسا ئەڤ وارە هێلایە، لێ دیسان هەتا ئیرۆ دگەل هەوێریان شریكێن ڤێ ئاخێنە.

گوندێ بێ بزنێ ژی چەندین جاران كەتیە بەر لەهیێن هێرشێن حكومەتێن بەغدا و هاتیە سۆتن و تالانكرن و خەلكێ وی دەربەدەر بووینە. جهێ گوندی چوار جاران ژبەر كاڤلكرنێ هاتییە گهورین و ڤەگوهاستن تایبەت سالێن: سالا ١٩٦٣ێ سەردەمێ هاتنا لەشكەرێ سووری، سالا ١٩٦٦ێ، ١٩٦٨ێ، سالا ١٩٧٤ێ بۆ داوی جار ل ژێر بریارا ب عەرەبكرنێ، هەموو گوندی ب زۆرێ هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گوندی باترشایێ و پاشی بۆ دەڤەرا فەیدیێ و ل سەر گوندێن ركاڤا و خەرشەنێ و گرێ پەحنێ و كەلە بەدرێ و شاریا و سینا و شێخ خدرا هاتنە بەلاڤكرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی هندی شەمسا بوون وان بەری هەر تشتی تۆڤچینی دكرن، پاشان خودانكرنا تەرشی و میشێن هنگڤینی، لێ هەوێریان بەروڤاژی، ئانكو خودانكرنا تەرشی ل بەراهیێ دهات، و پاشی جۆت ل رێزا دووێ دهات. نها (٢٢) جۆتیارێن شەمسانن و (٦٣) جۆتیارێن هەوێری ڤێ واری شیندكەن.

## سیمایێ گوندی:

وارێ گوندی دەشتەكا بەرینە و راستكەهیە و گونجایە بو چاندنا دەخل و دانێ و هەلبەت ژ ئەڤرازێ و نشیڤیا پێكدهێت، مینا:

**ژ گران:** گرێ قەسرێ، جهێ قەسرا (خەنجەرێ محو)یێ شەمسا بوو، خودانێ ڤێ واری (ل هنداڤ گوندی كەڤن، ئانكو باكوورێ گوندێ نها)، گرێ حەسكێ (ل باكوورێ گوندی).

**ژ نهالێن گوندی:** نهالا شكێركا (كو بێ بزنێ و قەرودەی ژێك جودا دكەت)، نهالا كون رووڤی (كو گوندی و گركەلێ ژێك جودا دكەت، نهالا گەرا خالتا (ل باشوورێ گوندی).

چەندین كانییان ژی ئەڤ گوند ڤەژین دكرن، مینا:

كانیا گوندی (ل گوندێ كەڤنە و نها هشك بوویە)، كانیا بلق بلق، ل جهێ گوندی كەڤنە، و نها ئاڤا وێ كێمە). دیسان كانییەكا بێ ناڤ ل بنێ گوندی هەیە و نها ئاڤیە، كانیا دەحل توورێكێ (دكەڤیتە سنوورێ گوندی و گوندی صۆریا)، ژبلی بركا حەجێ ئامێ (ل جهێ گوندی كەڤن و نها هشك بوویە).

پشتێ سالا ١٩٩١ێ خودانێن كەڤنێن گوندی ژ هەوێرێ و شەمسا ڤەگەریانەڤە سەر وارێ خۆڤە و نها گوند ل سەرجاددا سەرەكی پێشابوور دووریانا كرشینی هاتییە ئاڤاكرن، و تەنێ (١١٠) خێزانێن هەوێرێ لێ ئاكنجینە، و چەند پرۆژەیەك ل گوندی هاتنە ئەنجامدان وەك: خواندنگەهـ و هێلا كارەبێ و دو بیرێن ژێر ئەرد و بنكەهێ ساخلەمیێ ژی دهێتەكرن[١٣٢].

## گوندی باجدا میری:

گوند ب دووراتییا نێزیكی (٢٢كم) دكەڤیتە باشووری رۆژاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ، رووبەرێ ئاخا ڤی گوندی كو ب كێرێ چاندنێ دهێت دگەهیتە نێزیكی (١٠٤٩) دۆنەمان. گوند وارەكەهێ ئێزدیێن هەوێری یە بەلكی ل سەدسالیبا هەژدێ لێ ئاكنجی بوونە و (ئیشتو)ی[١٣٣] مەزناهیبا خەلكێ گوندی كریە و بوونە خۆجهێن وی واری، و تارۆژا ئیرو ئاكنجیێن وارێ خۆنە، دبێژن ئەڤ وارە گریدای باجدا كەندالی بوو و ب بزاڤ و رێبەرییا ئیشتۆی ب سەربەخۆیا وارێ خۆ شیا ب دەولەتێ ڤە گریدت، لەوا پارچا ئیشتۆ لێ ئاكنجی بوو. پارچەیەكا میری و پاشان ناڤ لێ هاتە كرن باجدا میری.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن كەروینێ و مێرگا سۆر

**باشووری،** گوندێ باجدا كەندالی

**رۆژهەلاتی،** گوندێ پێ بزنێ

**رۆژئاڤای،** گوندێن كێلا سپی و دێرەبوونێ

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٣٨ كەس بوون[١٣٤]، گوند پێكدهێت ژ هەوێریا بابكێن بلێسكا و شەهاڤكا و عیسایی و بەیركا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل دەستپێكا ئاكنجیبوونا وان ل ڤی واری ژیارا وان ل سەر خودانكرنا تەرشی بوو وەك دەرگەهێ سەرەكیێ ژیانا وان، ژ بلی تۆڤچینیێ كو ل رێزا دووێ دهات، تایبەت پشتی پەیدابوونا ئالاڤێن نوو كارێ چاندنێ ژی بەرفرەهتر كرن، د سالێن پێنجییاندا بۆ جارا ئێكێ تەراكتوور هاتییە گوندی و ئێدی چاندن پێشی خودانكرنا تەرش و كەوالی كەت.

گوندی باجدا میری چوار جاران ژ ئالیێ حكومەتێن عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و تالانكرن، جارا ئێكێ سالا ١٩٦٣ێ، جارا دووێ سالا ١٩٦٦ێ، جارا سیێ سالا ١٩٦٨ێ و داوی جار سالا ١٩٧٤ێ پشتی كەتیە بەر هەوا ب عەرەبكرنێ، خەلكێ وی ب زۆری هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گوندی باترشایێ و پاشی بۆ دەڤەرا فەیدیێ و ل سەر گوندێن شاریا و كەلەبەدرێ و سینا و شێخ خدر هاتنە بەلاڤكرن، پاشی ب فەرمانەكا دی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەها خانكێ تاكو سالا ١٩٩١ێ.

### سیمایێ گوندی:

گوندی نیشانێن گرنگ هەنە كو ب ئێزدیاتیێ ب گشتێ و هەوێریا ب تایبەتی گریداینە، وەكو نیشانێن (خدر الیاس و خدر نەبی)، ئەڤ گوندە دەشتە و چەندین نیشان و گر و و كانییان ب خۆڤە دگریت:

**ژ گران،** گرێ چاكەلاخا (باكوورێ رۆژاڤایێ گوندی، پشتا ڤێ گری دبیتە راستگەهی و وارەكێ فرەهە دبێژنێ بەستا چا كەلاخا)، گرێ سۆر (دناڤبەرا باجدا میری و گوندی مێرگەسۆرێ).

بانێ شكەفتێ، ئەوژێ بانییەكە ل رۆژهەلاتێ گوندی و ب شكەفتا گوندی هاتییە ناڤكرن.

**ژ نهالێن گوندی،** نهالا كرفێ (باكوورێ گوندی دبن ملا چاكەلاخا دا و كرف گیایەكە بۆ گێسكا ب كاردهێت)، نهالا گرێ حەسكێ (ل رۆژهەلاتێ گوندی)، نهالا هژیركێ.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

زەمبووقە (كانییەكا مەزنە و ژ ژێدەرێن ئاڤێ یێن كەڤنە)، كانییا نهالا گرێ حەسكێ.

ل ئاڤارێ ڤێ گوندی چەندین گر و هەنە لێ بێ ناڤن. ئەڤ گوند نها ئاڤایە و نێزیكی (٢٠) مالان لێ دژین و ژمارا خەلكێ ڤێ گوندی زێدەبووینە و دگەهنە نێزیكی (٦٠) سەروكخێزانان كو ل گوندی و خانكێ و ئەوروپا دژین. ژ خزمەتگوزاریێن گوندی هێلا كارەبێ و بیرەكا ئیرتیوازی بۆ خواندنێ ژی زارۆیێن وان دچنە باجدا كەندال[١٣٥].

## گوندی كەروێنیێ:

گوند ب دووراتییا نێزیكی (٣٣)كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** چیایە

**باشووری:** گوندێ باجدا میری

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مێرگەسۆرێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ دێرەبوونێ

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٧١ کەس بوو[١٣٦]. بەری سالا ١٩٧٥ێ ژ نێزیکێ (٣٠) مالێن ئێزدیێن هەوێری بابکێ (بلێسکا) پێکدهات، نها ژی هەمان بابك خوەدیێن ڤێ ئاخێنە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ وی ل دەستپێکا ئاکنجیبوونا وان دکەڤندا پتری ل سەر خودانکرنا تەرشی، پاشی چاندن بوو، ب هاتنا ئالاڤێن نوو چاندن کەتە رێزا ئێکێ و تا نها ل پێشە.

گوندی کەروێنیێ کەتیە ژێر هێرشێن حکومەتێن بەغدا و شامێ و چەندین جاران هاتیە سۆتن و تالانکرن و خەلکێ گوندی دەربەدەرێ گوندێن دەڤەرێن شنگال و باعەدرێ بووینە، داوی جار ل سالا (١٩٧٤)ێ هاتە وێرانکرن و کەتە ژێر پلانا ب عەرەبکرنێ و خەلکێ وی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ ئالێ شاریا و ل سەر گوندان هاتنە بەلاڤکرن، ل داوییا سالێن هەشتییان هاتنەڤە ڤەگوهاستن بۆ کۆمەلگەها خانکێ تاکو سالا (١٩٩١)ێ و پشتی کوردستان رزگار بووێ گوندی ڤەگەریانەڤە سەر ئاخا خۆ.

**سیمایێ گوندی:**

سیمایەکێ جوان ژ کومتە و گەلی و گر و نهال و شوینواران هەنە، ژ سەرێ چیای بەرەو دەشتێ ئەڤ کومتەنە:

کۆخێ گەلیێ میشێ و ل وی ئالی ئانکو ل نزارێ گەرا تەحلێ یا هەێ ئەو ژی ناڤپەحنەکە و پرێ تەحلیشکە لەوا ئەڤ ناڤ کەتیە سەر وپاشان گەرێ ب جووتك و گرێ کوورنجا و کەمپە[١٣٧].

**گەلیێن گوندی:** گەلیێ کێچێ (دناڤبەرا گوندی و مێرگەسۆرادا)، گەلیێ مێشێ (وەکو گوندی دبێژن کونەك د نیڤا ڤی گەلی دا هەیە و دەنگ ژێ دهێت و گوندی وەسا هزر دکەن کو دەنگێ بوورینا ئاڤا دێرەبوونێ یە)، گەلیێ کورتك، گەلیێ سەرێ کانیێ (دنیڤا ڤێ گەلێ دا کونەك– تونێل- سروشتی فرەهە و ب درێژییا نێزیکێ (٣٠م) هەیە و د کەڤرێ کۆلایە و دبێژنێ بەرێ قول)، گەلیێ کوتانێ (ب ڤێ ناڤێ هاتییە ب ناڤکرن ژبەر کو زنارەك بازنەیی دنیڤا ویدا هەیە وەکوو کوتانا پەزی)، گەلیێ بێدەرا، گەلیێ شەکر، گەلیێ عەلی ماسەکی (ماسەکێ بابکەك بوو ل دێرەبوونێ بوون لێ نها نەماینە، هەر نێزیکی ڤی گەلی نیشانەك هەیە دبێژنێ پیرە فاتێ).

بەر ب دەشتێ ڤە ژی چەندین خرابە و ناڤ نیشان هەنە مینا: هەڤشێ کوور (ل قونتارا چیای)، خربێ پۆرێ (ل رۆژهەلاتی و نها ژی بنسترێن ئاڤاهیێن کەڤن لێ دیارن)، و خربێ سەرێ کانیێ (ل رۆژهەلاتێ گوندی)، خربێ باژار (ل رۆژهەلاتێ و نیشانێن وارەکێ کەڤنار لێ دیارە).

**ژ نهالێن گوندی:** نهالا دێرکێ، نیشان و بنسترا دێرەکا کەڤن لێ دیارە و نهالا پشتا گرێ سۆر.

ژ گرێن گوندی: گرێن دکەڤنە رۆژئاڤای: گرێ سۆر، گرکێ بازیکا یێ کو پری بەرێ بازی، گرێ کورێ.

یێن دکەڤنە باشوورێ: گرێ کەرا، گرێ پیڤۆکا، گرێ دێرکێ، گرێ سێ دارکا ل باشوورێ رۆژهەلاتی.

ژ بلێ ڤان گران چەند ملەکێن بلند هەنە مینا، بانێ دەڤێ (تەراش) ملا خوەستێ، ملا ستوور و نیشانەك هەیە ب ناڤێ گورتك دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی.

گوند تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن، لێ ژمارا خەلکێ وی نها د گەهنە نێزیکێ (١٥٠) سەرۆك خێزانن، پترییا وان ل خانکێ و باعەدرێ و چەند مالەك ل دێرەبوونێ دژین[١٣٨].

## گوندی خانتەوەرێ:

گوندەکێ دەشتێیە ب دووراتییا نێزیکێ (٢٦کم) دکەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ. وەك مولك یێ

(عەزیزێ ئاقوێ) بوو، دكەڤندا نێزیكێ (٤٠) مالێن ئووجاخا (عەبا رەشا)[١٣٩] ئاكنجیێن ڤێ وارێ بووینە، ژیارا وان ل سەر چاندنا گەنم و جەهان و خوداكرنا پەزی و چێلان بوو و وان پەیوەندییەكا تایبەت دگەل مەللاكێ ڤێ واری هەبوون، پشتێ ڕاستڤەكرنا قانوونا چاندنێ، هەر جۆتیارەك بۆ خوەدیێ ئاخا خۆ. ڤێ گوندی نێزیكێ (٤٠) جۆتیاران لێ هەبوون و بۆ ئێكەم جار د دەستپێكا سالێن پێنجیاندا عەزیز ئاقو شیایە تەراكتوورێ بینتە ڤی گوندی.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ كانی عەرەبێ

**باشووری:** گوندێ مشارا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ صۆریا

**رۆژئاڤای:** گوندێ توسانا

گوندی خانتەوەرێ چەندین جاران ژ ئالیێ حكومەتێن عیراقێ ڤە هاتییەسۆتن و وێرانكرن، داوی جار ژی كەتە بەر هەوا عەرەبكرنا دەڤەرێ، خەلكێ وی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گوندێن گرەشی و باترشایێ و پاشی بۆ دەڤەرا فەیدیێ و پشتێ دەمەكێ كێم بۆ سەر گوندێن وێ دەڤەرێ مینا گرێ پەحنێ و ڕكاڤا و سینا و شێخ خدر و شاریا و كەلا بەدرێ.

## سیمایێ گوندی:

گوند یێ تێر و گر و كانی بوو و سیمایەكێ جوان نیشا ددا.

**كانیێن گوندی،** كانیا گوندی (كو دو توییێن مەزن ل سەر بوون و دكەتە نیڤا گوندی و ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندیان بوو)، كانیا پشت ئێشێ (ل باشوورێ گوندی)، كانیا كتنێ (دناڤبەرا گوندی باجد كەندال و گوندی دا). و چەند گەرەكێن دێ یێن كو ب دەست هاتینە كۆلان.

**نهالێن گوندی،** شۆڕكا پشت ئێشێ، نهالا گەڕا زیروێ، مێزكا خانتەوەرێ.

هەر وەسان گر هەنە لێ بێ ناڤن ، ژ بلێ چەندین

**گوندی خانتەوەرێ و پرۆژێ خودانكرنا گۆلكا ل پشت دیارە**



نیشانێن ب ناڤ و بەلکێ خەلك ب پیرۆز دزانن، مینا:

- زیارەتێ (قووچکا قـول)، یان قووچکا ئێزید، دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندی صۆریا و وەکو دانعەمرێن گوندی دبێژن دەمێ کەوالەکێ وان نەهاتبا بەری چەندین جـاران ل دۆر ڤێ قووچکێ دزڤڕاندن دا هاتبانە بەری.
- قوچکا کچك، یان یا بچویك، دناڤبەرا گوندی و گوندی صۆریا دایە.
- بەرێ پشت ئێشێ، دناڤبەرا گوندی و گوندی تووسـانادا.
- قولکا ب تەحتك، دکەڤیتە باشووری گوندی.

ئەڤ گوندە هەتا سالا (١٩٩١)ێ کەتبوو د ناڤ دەڤەرێن ب عەرەبکریدا، پشتی سەرهلدانێ خەلکێ گوندی ڤەگەریان سەر ئاخا خۆ و گوند ل رۆژهەلاتێ گوندی کەڤن ئاڤاکرن و نێزیکێ (٢٠) مالان لێ ئاکنجی نە، نها پەزی و کەوالی خوداندکەن و نێزیکێ (٢٥٠٠) سەرێ پەزی لێ هەنە، هەمان ژمارا جۆتیارێن کەڤن ئاخا ڤێ گوندی شیندکەن، ڤێ گوندی جهەکێ بەرفرەهێ خودانکرنا گولکا یێ کەرتێ تایبەت ژی لێ هەیە. ژ خزمەتێن بۆ ڤێ گوندی هاتینەکرن کۆلانا بیرەکا ژێرعەرد و گەهاندنا کارەبێ و بۆ خواندنێ ژێ زارویێن وان قەستا گوندی کانێ عەرەبێ دکەن[١٤٠].

## گوندی کانی عەرەبێ:

گوند ب دووراتیا نێزیکێ (٢٤کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتی سەنتەرێ ناحیێ ل سەر جادا سەرەکییا دچیتە پێشابوورێ. ناڤێ گوندی وەکـو گوندی ڤەدگێرن (عـەرەب) یێ ژ ناڤێ ژنەکا ئێزدی هاتێ کو خەلکا ڤێ دەڤـەرێ بوو و ئێکەم جار ئەڤ کانی یە بوویە وارگەهێ وێ. سالا (١٩٥٦)ێ (٤١) مالان ب سەر کێشیا هەسنێ عەمەرێ هەسنی ژ ئۆجاخا عیسایی یا بابکێ هەوێری. ژ پسمامێن خۆ یێن خانتەوەرێ جودابوون و ل وارێ کانییا عەرەبێ کومڤەبوون و گوندی خۆ ئاڤاکرن و پەیوەندییەکا تایبەت دگەل عەلیێ محوێ سلێڤانەی خودانێ مولکی گرێدان. خەلکێ گوندی هەموو یەك ئۆجاخن ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٧١ کەس بوو[١٤١].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** ئاڤارێ گوندێ پی بزنێ

**باشووری:** گوندێ خانتەوەرێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پێ بزنێ

**رۆژئاڤای:** کۆمەلگەها باجد کەندالێ

سالا (١٩٦٣)ێ بۆ ئێکەم جار ئەڤ گوندە ژ ئالیێ حکومەتا عیراقێ هاتە وێرانکرن، هەموو تەرش و کەوالی وان تالانکرن و (١٢) کەس ژ خەلکێ گوندی بۆ ماوێ دو سالان هاتنە حوکمکرن و ل زیندانێن بەسرە و ناصریێ، ب زۆری هەموو خەلکێ وی ڤەگوهاستنە شنگالێ. سالا (١٩٦٤)ێ خەلکێ وی زڤرینەڤە و گوند ئاڤاکرەڤە، لێ سالا (١٩٦٦)ێ ب زۆری ڤەگوهاستنە باعەدرێ. سالا (١٩٦٨)ێ جارەکادی زڤرینە گوندی و پاشێ هەموو هاتنە ڤەگوهاستنن بۆ شێخان، پشتی پێکهاتنا (١١ ئادارا ١٩٧٠)ێ ڤەگەریانەڤە سەر گوندی. داوی جار پشتی سالا ١٩٧٤ێ کانییا عەرەبێ دگەل گوندێن دەڤەرێ هاتە ب عەرەبکرن. پشتی سالا (١٩٩١)ێ خەلکێ گوندی زڤڕی سەر وارێ.

### سیمایێ گوندی:

گوند ب چەندین و کانی و گـر و دۆلان خەملاندییە:

**کانیێن گوندی:** کانییا گوندی (عەرەبێ) ل نیڤا گوندی، کانییا جەمۆ ل رۆژئاڤایێ گوندی، کانییا خازی ل رۆژهەلاتێ گوندی (ئەڤ هەرسێ کانیێن ناڤبری نها هشکن)، کانییا حەوشە بەرێ، کانییا خەموو ڤرنێ (نها هشکە)، کانییا قەرامووکێ ل باکوورێ گوندی (نها هشکە). ژ بلێ سێ کانیێن دێ کو بەرێ یێن ڤی گوندی بوون و نها دکەڤنە دناڤ ئاڤارێ گوندی پێ بزنێ دا ئەو ژی: گەرا خالدا، کانییا گاڤانا (نها هشکە)، کانییا دەحل توورێکێ.

**گرێن گوندی:** گرێ کـۆزێ، گرێ هەفشێ

چل پەزا، گرێ چالکێ حەجی ئەحمێ، گر هژیرك، گرێ وارێ بانێ (هەر پێنج ل رۆژهەلاتێ گوندی)، گر شڤیشك، گرێ وارگەهێ عەرەبا، گرێ پیر گۆهین ، دکەڤیتە نیڤا گوندی، گرێ خەما (ل نیڤا گوندی لێ نها بۆ ئاڤەدانیا گوندی هاتییە ڕاستکرن)، گرێ تەحت (ل رۆژاڤا)، گرێ نێرینێ قۆپ (ل باکوورێ).

**نهالێن گوندی:** شوورکا حەجی عەلی (ئالیێ کانی عەرەبێ)، شوورکا دەحل توورێکێ، نهالا ئاڤکا گاڤانا، نهالا گەڕا خالدا، نهالا حەوشەبەرێ، نهالا خومۆ ڤرنێ، نهالا گیا کرنی، نهالا قەڕامووکی.

ل ئاقارێ ڤێ گوندی بەرەك هەیە دبێژنێ (بەرێ ئازەپا).

پشتێ سالا (١٩٩١)ێ خەلکێ گوندی دیسان زڤرینەڤە سەر ئاخا خۆ و ل قانوونا ڕاستڤەکرنا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) نها هەر کەس خوەدیێ ئاخا خۆیە. نها نێزیکێ (٧٧) جۆتیاران ڤی گوندی هەر سال ب جەهـ و گەنمان شیندکەن. (٣٤) مال و (٧٣) سەرۆك خێزان لێ هەنە، ژبلێ تۆڤچینیێ خەلکێ گوندی کارێن خودانکرنا نێزیکی (٥٠٠٠) تەرشی ژ پەز و بزن و چێلان ژی دکەن. نها کارەب و بیرەکا ژێر ئەرد و خواندنگەهەکا بنەڕەت ل ڤێ گوندی هاتینە دروستکرن[١٤٢].

## گوندی ئینجکا صو:

گوند ب دووراتییا نێزیکێ (٣٢کـم) دکەڤیتە باکوورێ رۆژاڤایێ باتێلێ، هەڤسنۆرە دگەل گوندێن کەرویێنیێ و کێلا سپی ژ ئالیێ رۆژهەلاتی و ئەڤە داوی گوندە ژ ئالیێ رۆژاڤایێ ناحیێ و وارێ وێ دبیتە توخیب دگەل ناحیا رزگاری، ژ ئالیێ باکوور و رۆژاڤا و باشوور گوند دووڕێچکریە ب وارێن دێرەبوونێ و پێشابوورێ. ناڤێ گوندی وەکو هندەك دبێژن سەر دەمێ ئوسمانییا هاتییە دروستکرن و پێکهاتییە ژ دوپەیڤان (ئینجەق: ئانکو پشت ڕاستبوون ب دروستاهییا تشتەکی) و (صو ب واتایا ئاڤ). ئانکو (ئاڤا مسۆگەر). دکەڤندا گوند گرێدای رێڤەبەرییا ئەوقافا مووسلێ بوو و تا رۆژا ئیرو دووندەها شێخ سەعیدێ بەرزنجی ل رووڤیا، تابویا خۆ ب ناڤێ تەکیایێ ژ خەلکێ وی وەردگرن.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوندی ئینجکاصو ژ عیسایی و بلێسکا و بەیرکا و شەهابکا هەر چار بابکێن هەوێریا پێکدهێت، هەر ژ کەڤندا ل ڤێ گوندی ب هەڤڕا ژیانە و گوند ژ (٣٨) مالان پێکدهات.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا گوندیان ل سەر تۆڤچینیا جەهـ و گەنمان بوو، ل سالێن پێنجییان تەراکتور گەهشتیە گوندی و پاشی دەڕاسە، دیسان وی پەز و بزن و چێل و گۆلان ب خودان دکرن، وارێ ڤی گوندی کو ب کێری چاندنێ دهێت نێزیکێ (١١٥٥) دۆنەمانە.

### سیمایێ گوندی:

جوگرافیا گوندی ژ نهال و گرك و کانیك و نیشانان پێکدهێت، مینا نهالێن کولۆ ژ گوندی دەست پێدکەت تا دگەهیتە پێشابوورێ و نهالا گوندی ب ئینجکاصۆ دهێتە نیاسین و یا پڕی ئاڤ بوو.

وارێ ڤی گوندی نیشانەکا جودا تێدا هەیە دبێژنێ کووره بەرێ ئیشتۆ کو ژ ناڤێ کەسەکێ هەوێری هاتییە، دکەڤیتە سەر سنوورێ گوندی کەرویێنیێ. دیسان چەند گرەکێن بێ ناڤ ل ئاقارێ ڤی گوندی هەنە. ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنا گوندی ل سەر کانییەکێ بوو، بۆ کارێن دی و ئاڤدانا تەرشی ل سەر ئاڤا دێرەبوونێ بوو ژبەر ئاڤا وێ یا خورت بوو و دەربازی وارێ وان ژی دبوو.

گوند ل سەرهلدانێ هاتییە رزگارکرن لێ ژبەر کو گوند نێزیکێ کۆمەلگەها دێرەبوونێ یە نەهاتییە ئاڤاکرن، لێ خەلکێ گوندی هەموو سالان وارێ خۆ شین دکەن و تۆڤچینیێ دکەن[١٤٣].

# مەسیحی ل دەڤەرا سلێڤانەیا

ل دەڤـەرا سلێڤانەییان چەند گوندێن مەسیحینشین ژ ئەرمەن و کلدان و ئاشوری و سریان ژی هەنە، مینا گوندێن هەورێسکێ و ئاڤزوریکا میری و شکەڤدەلێ و ئاڤزوریکا شەنۆ و صۆریا و باجدا بەراڤێ و پێشابوورێ و دێرەبوونێ و قەڕەولا و هەر

تائیفەیەك ل دەمەكێ جودا هاتییە سەر ڤێ ئاخێ و لێ ئاكنجێ بووینە، تائیڤا ژ هەمیا مەزنتر ئەرمەنە و دیرۆکەکا تایبەت ب وانڤە دیارە؛

هەژێ گوتنێ یە کو ئەرمەن ل سالا (١٩٢٨)ێ ل دەڤەرا سلێڤانەییان ئاكنجی بووینە، کلدانی و ئاشووری و سریان ژی د سەردەمێن جودا جودا دا، ئەڤە چەند گوندێن مەسیحییانە ل دەڤەرێ؛

## گوندی هەورێسکێ[١٤٤]؛

## گوندی ئاڤزوریکا میرێ؛

ئێکە ژ گوندێن مەسیحینشین، مەسیحیێن (ئەرمەن، ئەرثدوکس) لێ دژین، سالا ١٩٣٢ێ هاتییە ئاڤاکرن، ب دووراتییا نێزیکی (٦کم) دکەڤیتە باشووری سەنتەرێ باتیلێ، سەبارەت ناڤێ گوندی دبێژن تەنێ کانییەکا ئاڤێ ل ئاڤزریکێ هەبوو ئەو ژێ کرمکێ (زوری) تێدا بوو لەوا ب ناڤێ وێ هاتییە ب ناڤکرن. ..

### سنوورێن گوندی؛

**باکووری؛** گوندێ سمایل ئاڤا

**باشووری؛** گوندێ حەزازا

**رۆژهەلاتی؛** گوندێ شەکراڤا

**رۆژئاڤای؛** گوندێ سێڤدین جنێ

نها گوند یێ ئاڤایە و دکەڤیتە سەر جاددا ناڤبەرا کۆمەلگەها سمایل ئاڤا و خراب دێمێ، پتریا ئاڤاهیێن گوندی کونکریتن و خواندنگەهەك و دێرەك ل سەر دەمێ حکومەتا هەرێما کوردستانێ لێ هاتینەئاڤاکرن، خەلکێ نها یێ ئاڤزریکێ دبێژن ئەم هەموو د بنیاتدا خەلکێ (گەزنەخ)ێ نە ل باکووری کوردستانێ، جۆلەمێرگێ قەزا بێت شەبابێ، و د ناڤبەرا سالێن ١٩١٤ - ١٩١٨ێ و د سەردا هاتینە ئاخا باشوور، ل فەرمانێن ئەرمەنیا خۆ ژ کوشتارێن ئوسمانیان قورتالکرینە، و موختارێ گوندی نێرسیك غریب مەتو دبێژت، ئەم هەردەمێ قەرداری بنەمالا شەمدین ئاغای نە کو ب رۆلەکێ ئێکجار مەزن رابووین و سینگێ هێزێن ئوسمانی گرتین و خۆ و عەشیرا خۆ کریە چەپەر بۆ قورتالکرنا ئەرمەنا و ل سەر وارێن خۆ ئاکنجیکرین.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی؛

پشتێ ئاڤارێ ئاڤزریکێ یێ کو رووبەرێ وێ دکەهیتە نێزیکێ (٢٧٨١) دۆنەمان، رادەستی (١٨) سەرۆك خێزانێن ئەرمەنان هاتییەکرن، وان بخۆ ب دەستێن خۆ هەڤجارێن خۆ دروست کرن و شیان ددەمەکێ کورت دا وێ دەشتێ ڤەژینن و وان چەندین هۆستا و شارەزا دچەند بواراندا هەبوون مینا (چووکە وەردە شمعون) یێ کو دارتاشی یا کەفچك و هەڤجار و هەسکوویان و گەلەك کەلو پەلێن ناڤ مالێ دکر، دیسان (غریب وانێس) یێ کو رۆلێ خۆ ب چێکرنا مێزەر و مەرش و تێر و تەحتی و چێکرنا پەرووکێ شەل و شەپکان ژ مەرەزی دیتی، هەر وەسان خودانکرنا تەرشی و بەرهەمهینانا شیری و ریچالی دەرگەهەکێ دی یێ ژیارا وان بوو ژیارا وان یا سەرەکێ بوو، پاشتر جۆت و جۆتیاری کەتە د دەستێ واندا و دبێژن هەر ژ سالا گوند هاتییە ئاڤاکرن و تاکو سالا ١٩٧٥ێ، ژمارا مالێن وان د گەهشتنە نێزیکێ چل مالان. لێ گوندێن وان ژی ژ هەوا خرابکرن و ب عەرەبکرنێ قورتال نەبوون و ئەو ژی ل وێ سالێ هاتە وێرانکرن و خەلکێ گوندی دەربەدەری باژێرێن مووسل و بەغدا و زاخۆ دهۆك و سێمێلێ بوون.

### سیمایێ گوندی؛

سیمایێ ئاڤزرویکێ ژی پێکهاتییە ژ گرك و زۆرك و کانێ و و شکەفتان، سەبارەت ب گرك و زۆرکان، گرێ کێل ڤەدووکا، کو وەکی ژ ناڤی دیار ل داوەت و شەهیانان گەنجان دکرە جهێ کێلانێ و ئارمانجانێ، و گرێ زیارەتا (جهێ گورێن گوندییانە) و چەندین گرێن دی. ژ نهالێن گوندی ژی مینا نهالا خرابێ مام ساخۆی و نهالا خرابێ نیسانی و نهالا خرابێ مێشێ

و نهالا چالا مەزن و نهالا خشیتانكێ و نهالا گەلە شینا و چەندین نهالێن دی. ل ئاقارێ ئاڤزرویكێ شكەفتەك هەبوو دگۆتنێ شكەفتا كووڤیا، ژبەر كو ئەو شكەفت هێلین و لیسێ كتكێت كووڤێ[١٤٥] بوو، لێ پشتێ تەعریبێ شوینوارێن ڤێ شكەفتێ نەماینە.

گوندی ئاڤزرویكێ ژێ كەتە بەر هەوێن وێرانكاریا سالا ١٩٧٥ێ و گوندی دەربەدەربوون، تاكو سالا ١٩٩١ێ دیسان خەلكێ گوندی زڤڕینە سەر مولك و مالێن خۆ، نها ئەو بنەمال زێدەبووینە و گەلەك ژوان نها ل دەرڤەێ وەلاتی دژین، ژ بلی كو گەلەك ژێ ل زاخۆ و دهۆك و سلێمانیێ و عەنكاوە و ئاڤجانیان رۆژهەلاتی مووسلێ و چەندین گوندێن دهۆكێ دژین[١٤٦].

## گوندی ئاڤزوریكا (شەنۆ)[١٤٧].

گوندەكێ مەسیحی نشینە، ب دووراتییا نێزیكێ (١٩كم) دكەڤیتە رۆژاڤایێ باتێلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ گركەلێ

**باشووری،** گوندێ صۆریا

**رۆژهەلاتی،** كۆمەلگەها كێلكێ

**رۆژئاڤای،** گوندێ كانی عەرەبێ

دكەڤندا ئەڤ وارە وەك ملك یێ بنەمالا عەلیێ محۆیێ سلێڤانەیی بوو، هەمموو خەلكێ لێ ئاكنجیێ كارێ كۆچەرایەتیێ دكرن، پشتی سنوورێن عیراقێ و تركیا هاتینە گرتن، گەلەك ژ كۆچەران ل دەڤەرێ ئاكنجیبوون و ژوان ژی خەلكێ ئاڤزوریكێ بوون و هەمموو مەسیحیێن گەزنەخێ نە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

دانعەمرێن گوندی دبێژن ژیارا خەلكی ل سەر خودانكرنا كەوالی و كۆچەراتیێ بوو، لێ پشتی ئاكنجیبوونا وان دەست ب چاندنێ كرن و ئەو چەند بوو دەرگەهێ سەرەكیێ ژیانا وان، ئەڤ گوندە ل دەسپێكێ تەنێ ژ (١٠ – ١٢) مالان بوون و وار هەمموو سالان ب دەستێ وان دهاتە شینكرن. وەكو پەیوەندی دگەل خودانێ ملكی تا سالا ١٩٧٥ێ و ل ژێر بڕیارا ڕاستڤەكرنا چاندنێ یا ژمارە (٩٠) یا حكومەتا عیراقێ ئەڤ ئاخە ل سەر هەمموو جۆتیاران هاتە پارڤەكرن و مەلالاكی ژێ بەهرا خۆ ژێ بر، پشتی ئاكنجیبوونا وان ل ڤی واری، گەزنەخیا تێكەلیێن جڤاكێ یێن موكوم دگەل دەوروبەرێن خۆ پەیداكرن وان ژی زانی تیتالێن دەڤەرێ بخوینن و نەقش بكن لەوا وان ژێ ئالاڤێن چاندنێ و ماهینێن كحێل و تڤەنگێن باش بۆ خۆ پەیداكرن بۆ سووار باشیێ و ئارمانجانێ و دەستكارییەكا باش د چێكرنا ئالاڤێن چاندنێ دا هەبوون وەكو هۆستایێ د دروستكرنا هەڤجاراندا، مینا (شەنۆێ و وەردەێ).

گوند مینا دەڤـەرێ چەندین جـاران ژ ئالیێ حوكمەتێن عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و وێرانكرن، بۆ جارا داویێ ل سالا ١٩٧٥ێ بوو، كەتە بەر هەوا ڤالاكرنا گوندان ب عەرەبكرنا وان دەڤەرێ، و خەلكێ گوندی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ گوندێن تنێ و داودیێ ل دەڤەرا بامەرنێ و گوند هاتە تەعریبكرن.

### سیمایێ گوندی:

ئاڤزوریكا شەنۆ سیمایەكێ تایبەت ژ كانی و نهال و گرك و وارگەهان هەیە.

**ژ كانییان،** كانییا گلۆ، (ل باكوورێ گوندی و نها هشك بوویە)، كانییا ژووری (نها هشك بوویە و بەرێ بیستان ل بەر ڤان هەردو كانییان دهاتنەكرن)، كانییا گوندی (بۆ ڤەخوارنێ بوو و نها هشك بوویە)، كانییا خرابێ مەعرووفی (دكەتە باشوورێ رۆژهەلاتی).

**ژ نهالێن گوندی،** نهالا زەڤیا ب سماق، نهالا خرابێ مەعرووفی، نهالا حەجی عەلی، كو سێ ئاشێن ئاڤێ ل سەر هەبوون لێ ئیرو تنێ شوینوار مانە. دیسان شكەفتەك ژی ل ئاقارێ گوندی هەیە و دكەڤیتە دڤێ نهالێ دا، هەروەسان گۆڕستانەك لێ هەیە ژ ١٠-١٢ گوڕان پێكدهێت و گوڕەكا هەری ب دەنگ یاكو دبێژنێ (كەچە بەچە) ل سەرێ ڤێ نهالێ

هەیە، ب شێوێ شکێر دهێتە دیتن، ئەڤ شکێرە ل دەمێن کەڤن جهێ سەرەدانێن خەلکی بوو و ژ هەموو ئایینان ب تایبەت ئێزدێ و مەسیحییان، ب هزرا وێ چەندێ ئەڤ شکێرە (گوڕ) هیڤی و دوعایێن وان ب جهـ دهینت.

**ژگرکێن گوندی:** گرکێ جەموێ (باشووری گوندی)، ملا شکەفتێ (رۆژاڤایێ باشووری گوندی)، گرکێ خرابێ مەعرووفی.

ژ زەڤییان ژی: زەڤیا سەر ئاڤارا (ل باکووری گوندی)، زەڤیا بەستێ (ل باکووری گوندی)، زەڤیا بەڕاددێ (ل باشووری گوندی).

ل بهارا سالا ١٩٩١ خەلکێ ڤی گوندی ڤەگەریانە سەر وارێ خۆ و نێزیکێ (٥٠) مالان بخۆڤە دگرت، و ژبەر ژیارا گوندیاتیێ و جیاوازێ دگەل ژیارا باژاران نها تەنێ (٣٥) مال ماینە دگوندی دا.

چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دابینکرن، وەکی کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازێ و (مولیدەکا 40KV)ێ یا کارەبێ و هێلا سەرەکییا کارەبێ و جادە و یەك دێر و خواندنگەهەکا بنەڕەت، نها گوند ئاڤایە[148].

## گوندی بەغلووجێ:

گوند ب دکەڤیتە هنداڤی رووبارێ دیجلە و نها ل جهەکێ بلند هاتییەئاڤاکرن، ب دووراتییا نێزیکێ (٢٢کم) رۆژاڤایێ باتیلێ. سەبارەت ناڤێ گوندی هندەك دبێژن ژ پەیڤا (باغ ل جهـ) هاتییە ئانكو باغێ خورستی یان سروشتی، و جهێ گوندی ژ کەسکاتی و شیناتی و خوم خوما ئاڤا دیجلە و جهەکێ ب خێر و بێر ژ هەژی ڤی ناڤی یە. مولکیەتا ڤێ ئاخێ دزڤرت بۆ بنەمالا شەمدین ئاغای و پاشان بنەمالا گورکیس توقتلی کو نها ئاکنجیێن مووسلن ژ وان کڕینە و تا نها ژێ نەبێ بەهرن ژ ئاخا گوندی.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن چیمەنیا و پەراڤۆك و کێلکێ و ئاڤزوریکا شەنێ

**باشووری:** رووبارێ دیجلە

**رۆژهەلاتی:** گوندێن هەفشێ ڕەش و چەمزراف و شکەفتێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ صۆریا

**سیمایێ گوندی:**

گوندێ بەغلووجێ پڕی نهال و زۆرك و گرك و کەندالە، گرکێن گوندی گرێ سوور و گرێ بورجێ[149] و ملا پیرە فاتێ و گرێ دار بەرویێ کو تا نها دار بەروویەکا کەڤنار ل سەر دیار دکەت و دکەڤیتە سەر توخیبێ گوندی چیمەنیا. ژ نهالێن گوندی، نهالا سکری و چەمێ پشتا بورجێ و چەمێ مەزن و چەمێ مریەمێ و نهالا چار دێمێ. ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی بۆ هەمی کاروباران ل سەر رووبارێ دیجلەی بوو کو ژێدەرەکێ گرنگ بوو بۆ ژیار و لڤینا خەلکێ گوندی هەر ژ ڤەخوارن و ماسی گرتن و خووك ژ بازرگانان ستاندن و...هتد، هەژی ئاماژەپێکرنێ یە کو پێنج ئاشێن ئاڤێ ل بەغلووجێ هەبوون و وەکی گوندی دبێژن هەموو رۆژان بارێن بازرگانان ب رێا ڤێ ئاڤێ دەربازی باژێرێ مووسلێ دبوون هەر ژ کاریتا و کەوالی و تۆڤی و هەرتشتێ پێویستی پێ هەی و وان ژی ب مەلەڤانییا رێ ل بەلەمان دگرتن و وانژی بەهرا مە دادمە و بەلەم ژی تەنێ چەند مەشکەك دهاتنە پوڤدان و ب هەڤڕا دهاتن گرێدان و هەموو بار ل سەر دهاتنە گرێدان و پترییا وان بەلەمان دو مرۆڤ ل سەر بوون و شەڤێن سەرما ئاگر ژی ل سەر هلدکرن و نێچیرا ماسیان ژی دکرن و خوارنا خۆژی ل سەر وان بەلەمان دخوارن تاکو دگەهشتنە مووسلێ و ئەو بازرگان هەموو توخم بوون ژ کورد و عەربان لێ پتر عەرەب بوون[150].

دیرۆکا گوندی دیار نینە لێ وەکو دیار نها ژی (٧) گۆڕستان ل دەوروبەرێن گوندی دیارن، و وەکو ریهـ سپیێن گوندی ڤەدگێڕن کو جهێ بارەگایێ هێزەکا لەشکەرێ ئوسمانی بوو و نها ژی گرەك ل هنداڤ گوندی هەیە دبێژنێ گرێ بورجێ و دبێژن بورجەکێ لەشکەری بۆ نۆبەداریێ و زێرەڤانیا دەڤەرێ ل سەر هەبوو، ل دەمێ شۆرشا ئەیلوولێ بەغلووجێ و ژ بەر ستراتیجییەتا گوندی نێزیکترین جهـ بوو بۆ

دەربازبوونا لەشکەرێ بەغدا و شامێ کو بگەهنە چیای و گەلیێ زاخۆ بڕبکەن و گەلیێ گەڕاڤێ و ڕێکا دێرەبوونێ بگرن، لێ پتریا جارا ل شکەستنێن خۆدا ل هەمان جهـ دەرباز دبوون.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٠٩ کەس بوو[١٥١]، بەری هەوا عەرەبکرنا گوندان گوند نێزیکێ (٥٠) مالێن فەللەیێن تیاری و (٤) مالێن کلدانی و (٤) مالێن کوردێن موسلمان بوون.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژبەر سرۆشتێ گوندی و نێزیکیا وی ژ رووبارێ دیجلەی هەردو رەنگێن چاندنێ دێم و ئاڤی دکرن، جەهـ و گەنم و نیسک و نۆک و گارس و برنج و گەلەك دەرامەتێن هاڤینی وەك باجان و خیار و بامی و کولند و زەبەش و گوندور....هتد. ئاکنجییەکێ گوندی ب ناڤێ مامێ سادە دبێژت: هەرسال من سلکێن شەکرێ دچاندن و ل کارگەهێن مووسل دفرۆتن، دەخل و دانێ مە و دەرامەتێ گوندی پڕی بازاڕێن بازێڕێن دەوروبەر دبوو، دیسان ماسی گری کارێ گەلەك گوندیان بوو، هەروەسان گەلەکان مینا گورگیس سەرقۆ و گورگیس ئیشوو شەل و شەپك چێدکرن و ئاسنگەری دناڤ گوندی دا هەبوو و یێ هەرێ شارەزا دڤێ پیشەیدا گورگیس رەشۆ بوو و هۆستەکاریا وی بۆ پێداویستیێن وێ سەردەمێ بوون مینا داسك و شالووك و گێسن......هتد.

نها خەلکێ گوندی نێزیکێ (٣٠٠) خێزانانە، لێ ب تنێ (٤٠) مال ل گوندی دژین، یێن دی ل بەغدا و مووسل و دهۆك و سێمێل و زاخۆ و گەلەك وەلاتێن جیهانێ و گەلەك بنەمال ل سالا ٢٠٠٦ێ ل بەغلووجێ ڤەگەریانە و ب نە ئامادەبوونا گوندیان نها جۆت و جۆتکار تەرازی هاتییە گهورین (٤١) مال بوسلمانن و تەنێ (٨) مال مەسیحی نە، ژبەر کو گەلەك ئاخا گوندی ما بەیار و خەلکێ وێ ژ بەغدا و مووسل نەهاتن و ئاخا وان ل سەر گوندیێن ئامادەهاتە بەلاڤکرن. نها خواندنگەهـ و دێرەك و هۆلەکا مەزن بۆ خزمەتێن گوندیا هاتینە ئاڤاکرن[١٥٢].

## گوندێ شکەڤدەلێ (شکەڤدەلا نوێ):

شکەڤدەلێ گوندەکێ مەسیحینشینە، ژ (گەزنەخی و پێشابووری و هووزی)یان پێکدهێت، ب دووراتیا نێزیکێ (٤کم) دکەڤیتە باکوورێ رۆژاڤایێ باتیلێ پتریا خەلکێ گوندی هەتا بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێ ژ بەغدا تاکو زاخۆ د بەریەلاڤن، نها ٣٠ خێزان ل گوندی دژین کو دبنە نێزیکێ ١٢٠ کەسان.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ سمایل ئاڤا

**باشووری:** گوندێ ئاڤخانێ

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئاڤزریکا میری

**رۆژئاڤای:** گوندێ سێڤدین جنێ

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر تۆڤچینیێ و خودانکرنا پەز و بزنی یە، رووبەرێ عەردێ چاندنێ ل گوندی نێزیکێ (١٠٢٠)دۆنەمانە.

## سیمایێ گوندی:

هەر چەند گوندەکێ گەلەکێ بچویکە لێ ب رێك و پێکێ هاتییە ئاڤاکرن و شینکاتیا دارێن مەزن و یێن فێقی و باخچێن ناڤ مالان سیمایەك جوان دایە گوندی، نها گوندێ نوو دکەڤیتە هنداڤی گوندێ کەڤن ژ ئالیێ رۆژهەلاتیڤە ب دووراتیا نێزیکی کیلومەترەکێ، (شکەڤدەلا کەڤن) دکەڤیتەد کووراتییەکێدا سەر نهالەکا تێر ئاڤ و تا نها ژێ ئەو نهال ئاڤی یە، شوینوارێن کەڤن یێن گوندی تا نها بەرچاڤن و کانییا (حیتان) یا ب ناڤ و دەنگە، دیسان شکەڤدەلێ کو ئاڤەکا زۆرا مەزن د بەررا دا دبووری، شەش ئاشێن ئاڤێ لێ کاردکرن و خەلکێ دەڤەرێ دان

# ناحیا فەیدیێ(*)

بەرهەڤكرن: موسەدەق تۆڤی
خالد سالح

فەیدیێ ئێكە ژ ناحیێن سەر ب قەزا سێمێلێ ڤە، دكەڤیتە دناڤبەرا هەردو پارێزگەهێن دهۆك و مووسلێ دا، ب دووراتییا (١٨كم) باشووریٚ رۆژهەلاتا بازێرێ دهۆكێ و (٤٠كم) باكوورێ رۆژئاڤایێ بازێرێ مووسل، ل دووڤ گۆتنان مێژوویا وێ ڤەدگەرێتەڤە سەدسالییا هەڤدێ زایینی، ناڤێ گوندی ژ زاردەڤێ خەلكی دبێژن ژ وێ چەندێ هاتییە كو ژبەر هەبوونا ئاڤەكا زۆر (فایدە- مفا) ژ عەردی وی دهاتەكرن.

رووبەرێ عەردێ ناحیا فەیدیێ دگەهیتە (١٢٩٠٠٠) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٩٤١٢) دۆنەم جهێ ئاكنجیبوونێ یە، (١٧٨٧٩) دۆنەم چەروانەیە، (٦٥٤٦٥) دۆنەم یێ چاندنێ یە و (٢٤٨٦٨) دۆنەم ژێ یێ بەردایە. رووبەرێ فەیدیێ بخۆ ژێ وەكی گوند دگەهیتە (٢٣٤٠) دۆنەمان، ژ وانان (٥٣٨) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (١٨٠٢) دۆنەم ب كێر چاندنێ ناهێن[1].

ژمارا ئاكنجیێن ناحیێ (٩٢٢٠) خێزان بوون، لێ پشتی چەندین دەستەیێن كۆچبەران هاتینێ ئەو ژمارە هاتییە گوهارتن و بەرەڤ زێدەبوونێ چوویە، نها دگەهنە نێزیكی (٣٨٢٣١) خێزانان، ژ وانان (٤٨٨٠) خێزان ل سەنتەرێ بازێری ل تاخێن (رێزان و گولان و نیوار و هەلات) و (٢٠١٨) خێزان ل كۆمەلگەهێن نوی هاتینە چێكرن، ل (وار ستی، وارڤین ستی، ئادار ١ - ٢، رۆژ) و (١٦٣٥) خێزان ل كۆمەلگەهێن كەڤن مینا شاریا، ژبلی (٢٨٢٥) خێزان ل گوندان، وەكی (٢٥٠) خێزان ل گرێپانا ئێزدییان، (٢٨) خێزان ل گرێپانا موسلمان و ئێزدییان، (١٥) خێزان ل گوندێ سیتك، (١٥) خێزان ل گوندێ وشتیان، (١٥) خێزان ل گوندێ زاوا، (٥) خێزان ل گوندێ ئالۆكا، (١٦٠) خێزان ل گوندێ باختمێ، (٣٠) خێزان ل گوندێ دێر جندی و... هتد.

وەكی دیار پشتی سالا (٢٠٠٤)ێ چەندین خەلكی قەست كرینە ڤێ ناحیێ، وەكی پەنابەرێن كوردێن رۆژئاڤایێ كوردستانێ ژ بازێرێ قامشلو سالا (٢٠٠٤)ێ و كوردێن رۆژئاڤا ل سالا (٢٠١١)ێ كو ل هەردو كەمپێن (دۆمیز-١ ٢) هاتینە ئاكنجیكرن، ژمارا وان دگەهنە (٥٨٢٨) خێزانان، ئاوارەیێن پشتی داگیركرنا مووسل ژ لایێ (داعش) ڤە قەستا دەڤەرێ كرین ژ (شنگار و زومار و وانكێ و...هتد) كو ئەو ژێ ل (كەمپا شاریا و كەبەرتو -١ ٢) هاتینە ئاكنجیكرن، ژمارا وان ژێ دگەهنە (٨١٧٣) خێزانان، ژبلی ب سەدان خێزانێن ئاوارە و پەنابەر كو ل چەندین گوند و جهان ژ دەرڤەی كەمپان هاتینە ئاكنجیكرن كو ژمارا وان (١٠١٧٦) خێزانێن ئاوارەنە و (٢٦٩٦) خێزانێن پەنابەرن، ژبلی ئاوارەیێن كت كت كو دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٧-٢٠١١)ێ ژبەر چەندین ئەگەران ژ جهێن جودا یێن

عیراقێ قەست کرینە دەڤەرێ. ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینکریا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا خەلکێ سەرانسەری ناحیا فەیدیێ ٧٩٨٦٩ کەسە، ژ وانا ٧٣٩٨٩کەس باژێری و ٥٨٨٠کەس گوندنشینن[٢].

## سنوورێن سەنتەرێ ناحیێ:

**باکووری:** نهێل و گوندێن گرێ پانێ و کەبەرتو.

**باشووری:** گوندێ کەرانێ.

**رۆژهەلاتی:** چیایێ فەیدیێ و مەزارێ عنزروەت.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زۆراڤا و نهالا دێر جندی.

## پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ وێ تێکهەلن ژ کورد و عەرەبان، ژ ئاینێن ئیسلام و ئێزدی و مەسیحییان، ژمارا ئاکنجیێن ناڤەندا فەیدیێ ل سالا (١٩٥٧)ێ ٢١٧ کەس بوون[٣]، رێژەیا موسلمانان ل ناحیا فەیدیێ دگەهنە (٧٨٪) و یا ئێزدیان (٢١٪)ێ و یا مەسیحییان (١٪) یە. کورد ژ عەشیرەتێن مزووری و دۆسکی و بەرواری و سندیانە، عەرەب ژی ژ سادە عبادە، طیاوی نە، خەلکێ گوندی ژ مالباتبن (مالا سەید سەعدون، مالا سەید قاسم، مالا سەید جەعفەر، مالا میخائیل، مالا یوسف یەعقوب، مالا سلێمان سندی، مالا محەمەد حەسەن بەرواری، مالا فەتاح دۆسکی) نە.

فەیدیێ مینا پتریا جهێن دەڤەرێ ژ لایێن حکومەتێن عیراقی ڤە هاتیە خرابکرن و ب عەرەبکرن، ناڤەندا گوندی بخۆ سێ جاران هاتیە خرابکرن، ژبلی کو چەندین گوندێن وێ ژی هاتینە خرابکرن و تەعریبکرن، ب تایبەت ل دەسپێکا سالێن نۆتان ژ سەدسالیا بووری، وەکی گوندێن (کەشك، رەحمانیە، دێر جندی، زۆراڤا، گرێ پانێ و... هتد)، دیسان ناڤێن چەند جهان ژی گوهارتن، بۆ نموونە پشتی عەرەبێن ژ عەشیرەتا حەدیدی ل کۆمەلگەها گرێ پانێ ئاکنجیکرین، ناڤێ کۆمەلگەهێ کرنە (عەدنانیە)[٤]. هەر وەسان چەندین گوند، یان ئاڤارێن وان کەتینە ژێر ئاڤا سکرێ مووسل ژی، ژ وان گوندێن هاتینە کاڤلکرن، یان بن ئاڤ کەتین وەکی (دێر جندی، گرێ پانێ، زاوا، باختمێ، تلخشا بچویك، تلخشا مەزن، سالەهیێ، دۆستەکا، کانی گولان، سیتك، وشتیان، خێراڤا، چەم رەش، خانك، قەبەغ، چەم بەرەکات، کوزیل، کەبەرتو، ریێبی، کری شکەستی، ئالۆکا، بازەلانێ، زینیات، مام شڤان، کەموونە، خرشنیا، شێخ خدر، کەلە بەدرێ، شاریا، سینا) و ب ڤی رەنگی:

لسیتا ناڤێن گوندێن سەر دەستێ رژێما عیراقی هاتینە خرابکرن و کەتینە ژێر ئاڤ

| ژ | ناڤ | تێبینی |
|---|---|---|
| ١ | دێرجندی | هاتیە ب عەرەبکرن |
| ٢ | خێراڤا | کەتیە بن ئاڤێ، خەلکێ وێ برینە کۆمەلگەها خانکێ |
| ٣ | چەم رەش | کەتیە بن ئاڤێ، خەلکێ وێ برینە کزك |
| ٤ | خانك | کەتیە بن ئاڤێ، خەلکێ وێ برینە کۆمەلگەها خانکێ |
| ٥ | قەپەغ | کەتیە بن ئاڤێ، خەلکێ وێ برینە کۆمەلگەها موسێریکێ |
| ٦ | چەم بەرەکات | کەتیە بن ئاڤێ، خەلکێ وێ برینە کۆمەلگەها خانکێ |
| ٧ | کوزیل | کەتیە بن ئاڤێ، خەلکێ وێ برینە زۆراڤا |
| ٨ | کەبەرتو | هاتیە چۆلکرن، خەلکێ وێ برینە کۆمەلگەها خانکێ |
| ٩ | ریێبی | هاتیە چۆلکرن، خەلکێ وێ برینە کۆمەلگەها خانکێ |
| ١٠ | کری شکەستی | هاتیە چۆلکرن |

| ١١ | ئالۆكا | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها موسێریكێ |
|---|---|---|
| ١٢ | بازەلان | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها موسێریكێ |
| ١٣ | زێنیات | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها خانكێ |
| ١٤ | مام شڤان | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها خانكێ |
| ١٥ | كمونە | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها خانكێ |
| ١٦ | ڕكاڤا | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها شاریا |
| ١٧ | خرشنیا | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها شاریا |
| ١٨ | شێخ خدری | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها شاریا |
| ١٩ | كەلە بەدرێ | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها شاریا |
| ٢٠ | شاریا | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها شاریا |
| ٢١ | سینا | هاتییە چۆلكرن، خەلكێ وێ برینە كۆمەلگەها شاریا |

## شوینوار و جهێن بەرنیاس:

فەیدیێ جهەكێ شوینوارێ كەڤنە، ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە كو خرابەكێ شوینواری لێ هەیە[٥]، ژبلی چەند جهێن دی یێن شوینواری لێ هەنە، وەكی:

گوندێ نەمریكێ كو جهەكێ كەڤنێ مێژوویی یە، جۆكا ئاشووریان ب تەنشت چیایێ داكا ڤە، كەلا بەدرێ ل گوندێ كەلە بەدرێ، خانا فەیدیێ كو مێژوویەكا كەڤن هەیە، گرێ هسالاناكا ل باكوورێ فەیدیێ، گرێ نیسكا ل خرشنیا كو ل دووڤ ئەو تشتێن لێ هاتینە دیتن دیرۆكا وی ڤەدگەریێتەڤە چاخێ بەردینێ نوی و چاخێ ئاشووریان (٩١١ - ٦١٢پ. ز)[١]، خرابێ (خربە) فەیدێ، چیایێ فەیدیێ، شكەفتا جاسم، سێ ئاشێن فەیدیێ، مار دانیال (مردنا)، مەزارێ فەیدیێ، چل كانی، شكەفتا فەیدیێ و... هتد.

دیسان چەند جهێن ئایینی ژی لێ هەنە، وەكی مەزارێن كەرەجال و ئێزی ل گوندێ سینا، شێشمس ل گوندێ گرێ پانێ، شێخ عەنزەروەت ل گوندێ خەرشەنیا، شێخ خدرێ شەمسا ل گوندی شێخ خدرێ، ژبلی كەنیسا باختمێ و مەردەنا كو سالانە ئەرمەنی بۆ رێ و رەسمەكێ ئایینی قەست دكەنێ.

بۆ گەشت و گوزارێ ژی چەند جهێن خۆش و دلڤەكەر لێ هەنە، ب تایبەت ئەگەر پویتەكێ باش پێ بهێتە كرن، وەكی سكرێ مووسل و چیایێ زاوا ل هنداڤی باژێرێ دهۆكێ.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل فەیدیێ:

چل كانی و كانییا بچویك، زێدەباری بیرێن ئیرتیوازی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ فەیدیێ:

ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ بوو و تا نها ژی بەردەوامی پێ هەیە، ب تایبەت چاندنا دێمی ژ گەنم و جەهـ و نۆك و...هتد، رووبەرێ عەردێ چاندی ب گەنم و جەهان دگەهیتە (٦٥١١٠) دۆنەمێن عەردی، زێدەباری بیستان و كەسكاتی كو رووبەرێ عەردێ چاندی دگەهیتە (٣٥٦) دۆنەمان، هەروەسان خودانكرنا تەرش و كەوالی و چێل و ماسی و مریشك و مێشێن هنگڤینی، كو چەندین پرۆژە لێ هەنە، وەكی (١١) پرۆژەیێن خودانكرنا پەزی كو (٩٠٨٦٢) سەران بخۆڤە دگریت و (١) پرۆژەیێ چێلان كو (٢٧٥) سەران بخۆڤە دگریت، ژبلی (٧) پرۆژەیێن مریشكان و (١٦) حەوزێن خودانكرنا ماسییان (١٢٦٢) سندۆقێن مێشێن هنگڤینی. ژبەر نێزیكبوونا فەیدیێ ژ سكرێ مووسل، راڤا ماسییان ژی بوویە ژێدەرەكێ ژیانا

خەلکەکی، ب تایبەت ئەو جهێن ل نێزیکی سکری. دیسان نها ژیانا خەلکەکی ل سەر رێنجبەریێ و مووچانە ژی.

## سەروبەریێ کارگێری:

فەیدیێ سالا (١٩٧٨)ێ بوویە ناحیە و (٣٠) گوند بخۆڤە دگرتن، ئەو گوندێن دکەتنە باشووریێ ناحیێ ب مەرەما ب عەرەبکرن ب ناحیا ئەلقۆش ڤە هاتنە گرێدان، بۆ نموونە گوندێ کەرانێ تنێ (١,٥کم) ژ فەیدیێ دوورە لێ ئێخستنە سەر ئەلقۆش ڤە، هەر وەسان گوندێن دەهکانا بچووك و دەهکانا مەزن و بێبۆزیێ و قەسرۆنێ و کانی شرین و... هتد[7]. ئەڤ ناحیە هەتا سالا (١٩٩١)ێ سەر ب قەزا سێمێلێ ڤەبوو، پشتی هینگێ و هەتا سالا (١٩٩٣)ێ ژبەر کاودانێ سیاسی ما هەلاویستی، سالا (١٩٩٤)ێ ب بریارەکا ناڤەندی یا عیراقێ ژ پارێزگەها دهۆکێ هاتە دابرین و ئێخستنە سەر پارێزگەها نەینەواڤە، نها ژی دکەڤیتە ژێر ماددێ (١٤٠) یێ دستووریێ عیراقی، لێ دناڤ سنووریێ دەستەلاتا هەرێما کوردستانێ دایە.

ژ لایێ کارگێری ڤە دو جۆرێن فەرمانگەهان لێ هەنە، هندەك سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەنە کو ژمارا وان دگەهنە (٢٦) فەرمانگەهان و هندەك سەر ب پارێزگەها مووسل ڤەنە کو ژمارا وان دگەهنە (١٢) یەکەیان.

## فەرمانگەهێن سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە پێکهاتینە ژ:

بازێرڤانیێن فەیدیێ و شاریا و فەرمانگەهێن ئاڤێ و کارەبێ و بنکەهێن ساخلەمیێ یێن فەیدیێ و شاریا و رۆژ و ئازادی و بنکەهێن پۆلیسێن فەیدیێ و شاریا و برایەتی و نەهێلانا گونەهباریا برایەتی و نەهێلانا تەند و تیژیێ دژی ئافرەتان و کارتێن زانیاریا و بنکەهێ بەرەڤانیا بازێری و جێگریا ئاسایشا فەیدیێ و پۆلیسێن دۆمیز و ئاسایشا دۆمیز و رێڤەبەریا گشتیا سایلۆیا فەیدیێ و رێڤەبەریا پەسەندکرنا تۆڤی و چاندنیا رۆژ و فیتەرنەریا فەیدیێ، هەر وەسان پۆستە و گەهاندنا دۆمیز و میزانا فەیدیێ و ناڤەندا لاوێن دۆمیز و بەنکا دۆمیز.

## فەرمانگەهێن سەر ب پارێزگەها مووسل:

چوار یەکەیێن خزمەتگوزاری و (٢) یەکەیێن ساخلەمیێ و (١) یا ئێمناهیێ و (٤) یێن چاندنێ دگەل جڤاتا ناحیێ.

## لایێ پەروەردەیی:

سالا (١٩٥٩)ێ یەکەم خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ڤەکرن و نها ل سنووریێ ناحیێ (٣٥) خواندنگەهـ و دایینگەهـ لێ هەنە، ژ وانان (٢١) کوردی نە و (١١) عەرەبی نە، ژبلی (٣) دایینگەهان، وەکی: فەیدیا کوران، فەیدیا کچان، فەیدیا بنیات، دوواناوەندیا فەیدیێ یا تێکهەل و... هتد.

سالا (١٩٧٤)ێ پرۆژەیێ کارەبێ گەهشتییە گوندی، هەر ل هەمان سال بنکەهێ ساخلەمیێ ژی لێ هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی سالا (١٩٧٥)ێ بۆ هاتییە دروستکرن.

# کۆمەلگەهـ و گوندێن سەر ب ناحیا فەیدیێ:

## دۆمیز رۆژ:

ئەڤ کۆمەلگەهە دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ سەنتەریێ ناحیا فەیدیێ، سالا (١٩٧٩)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ وی ناڤەکێ نوی یە و ژ ناڤێ (رۆژا ئازادیێ) هاتییە.

خەلکێ وی تێکهەلن ژ کورد و عەرەب و سریان و کلدانان، ژ ئایینێن ئیسلام و مەسیحی و ئێزدییان و چونکی بوویە پارچەك ژ بازێرکی، لەوما نها چەندین عەشیرەتێن جودا جودا تێدا هەنە، ژمارا ئاکنجیێن وی (٨٥٠) سەرۆکخێزانن.

ژ فەرمانگەهێن ل ڤێ کۆمەلگەهێ هەین: (ئاگر ڤەمراندن، لقێ باژێرڤانیێ، رێڤەبەریا ئاڤ و سۆلینان، فەرمانگەها کارەبێ، فەرمانگەها چاندنێ.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی بیرێن گوندێ زاوانە.

سالا (١٩٧٩)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، نها چەند خواندنگەهـ لێ هەنە، ژبلی باخچێ زارۆکان و مزگەفتێ.

## دۆمیز- تاخێ میتان:

دکەڤیتە دووراتییا (٢٠٠م) ژ سەنتەرێ ناحیا فەیدێ، ناڤێ وی ناڤەکێ نوی یە و ژ ناڤێ (دەولەتا میتانی) هاتییە.

ژمارا ئاکنجیێن وی (٨٥٠) سەرۆکخێزانان کو دبنە (٤٥٠٠) کەسان.

ژ فەرمانگەهێن ل ڤێ کۆمەلگەهێ هەین: (رێڤەبەریا ناحیا فەیدێ، بنکەهێ زانینان، بنکەهێ پۆلیسان).

ژێدەرێن ئاڤا گوندی پرۆژەیێ ئاڤا خانکێ یە.

خواندنگەهـ و مزگەفت لێ هەنە.

## دۆمیز هەلات:

دکەڤیتە دووراتییا (٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ وێ ژ ناڤێ رۆژ هاتییە.

خەلکێ وی تێکهەلن ژ کورد و تورکمانان، ژ هەرسێ ئایینێن ئیسلام و مەسیحی و ئێزدییان و ژ عەشیرەتێن جودا جودا، ژمارا ئاکنجیێن وی (١٧٥٠) سەرکخێزانن کو دبنە (٧٠٠٠) کەس.

ژخواندنگەهێن وێ ئازادی کو سالا (٢٠٠٦ - ٢٠٠٧ )ێ هاتییە ڤەکرن، کەیوان، هەڤدەم، ژبلی بنکەهێ ساخلەمیێ کو ئەو ژی سالا (٢٠١٠)ێ هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ کارەبێ سالا (٢٠٠٣)ێ گەهشتییە گوندی و یێ ئاڤێ سالا (٢٠٠٤)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن کو پرۆژەیێ ئاڤا وان ژ ئاڤا مەزنە (دیجلەی).

## دۆمیز نەورۆز:

دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، سالا (٢٠١١)ێ هاتییە دروستکرن، ناڤێ وێ ناڤەکێ نوی یە و ژ نەورۆز، ب واتایا رۆژا نوو هاتییە، چونکی تاخ پارچەك باژێرکی یە لەوما نها چەندین عەشیرەتێن جودا جودا تێدا هەنە. ژمارا ئاکنجیێن وێ نێزیکی (٩٥) سەرۆکخێزانانە کو دبنە نێزیکی (٦٠٠) کەسان، پرۆژەیێ ئاڤا وان ژ (خراب دیمێ) یە، سالا (٢٠١١-٢٠١٢)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن و کارەب ژی گەهشتییە گوندی و مزگەفت ژی لێ هەیە.

## دۆمیز بهار:

ئەڤ تاخە دکەڤیتە دووراتییا (١کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە دروستکرن، ناڤێ وی ژ ناڤێ وەرزێ بهارێ هاتییە، خەلکێ وی تێکهەلن ژ کورد و عەرەبان، ژ ئایینێن موسلمان و ئێزدییان و عەشیرەتێن جودا جودا. نێزیکی (١٠٠٠) خێزانان لێ هەنە کو دبنە نێزیکی (٧٠٠٠) کەسان، پرۆژەیێ ئاڤا وان ژ ئاڤا خانکێ یە، پرۆژەیێ کارەبێ سالا (٢٠٠٧) ێ بۆ هاتییە دروستکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ سالا (٢٠١٢) ێ هاتییە چێکرن. هەر وەسان مزگەفتا (رەیان) ژی لێ هەیە.

## دۆمیز نیوار:

سالا (٢٠٠٣)ێ هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ وی تێکهەلن ژ پتریا ئەو عەشیرەتێن ل پارێزگەها دهۆکێ دژین، پرۆژەیێ ئاڤا وان ژ بیرێن گوندێ زاوایە، خواندنگەها وان ب ناڤێ (نیوار)ە، سالا (٢٠٠٤)ێ هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ کارەبێ سالا (٢٠٠٧)ێ بۆ ڤی جهی هاتییە راکێشان، پرۆژەیێ ئاڤێ سالا (٢٠١٣) ێ گەهشتیێ.

## کۆمەلگەها ئازادی:

ئەڤ کۆمەلگەهە دکەڤیتە دووراتییا (٢٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، سالا (٢٠٠٧)ێ بۆ قەرەچان هاتییە ئاڤاکرن، ئەو ل داوییا سالێن حەفتییان ل تاخێ بەرۆشکێ بوون، پشتی سەرهلدانێ چوونە ناڤ جهێ

سەربازگەها دهۆکێ و لێ ئاکنجیبوون، پاشی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ دوریانا ئالۆکا و ژبۆ ئاکنجیکرنا وان ب شێوەیەکێ مودرن ئەڤ کۆمەلگەهە بۆ وان ل ڤی جهی هاتە ئاڤاکرن.

**سنوورێن کۆمەلگەهێ:**

**باکووری،** گوندێ بازەلانێ.

**باشووری،** دومیز دو.

**رۆژهەلاتی،** وار ستی.

**رۆژئاڤایی،** ستی ستار.

خەلکێ ڤێ کۆمەلگەهێ وەکی دیار قەرەچن و نها پارچەکن ژ خەلکێ دەڤەرێ، ژمارا سەرۆکخێزانێن وێ دگەهنە (٤٨٦) سەرۆکخێزانان کو دبنە (١١٣٠) کەسان.

ژێدەرێ ئاڤا وان بیرەکە کو ژ سەربازگەهێ بۆ دهێت.

کارێ وان یێ سەرەکی دارتراشینێن دەستی یە، مینا لاندك و تیرۆك و مۆخل و سەراد و خانك و تەشی و نابینك و بەفری و ملهێب و... هتد.

هەر وەسان کارێ چەرخا (خۆشکرنا کێر و داس و بڤر و...هتد) و گاز فرۆتنێ ژی دکەن.

خواندنگەها وان سالا (١٩٩٨)ێ ب ناڤێ (دوریان) هاتییە ڤەکرن کو بەری هینگێ ل جهێ ئاکنجیبوونا وان یا بەرێ بوو ل دوریانا ئالۆکا.

خزمەتگوزارییێن ئاڤ و کارەبان ژی سالا (٢٠٠٨)ێ گەهشتینە کۆمەلگەهێ.

## کۆمەلگەها قامشلو:

ئەڤ کۆمەلگەهە دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ سەنتەرێ فەیدێ، ناڤێ کۆمەلگەهێ ژ ناڤێ باژێرێ قامشلو ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ هاتییە کو خەلکێ رۆژئاڤایێ کوردستانێ لێ دئاکنجی نە، کۆمەلگەهـ سالا (٢٠٠٤)ێ هاتییە ئاڤاکرن.

**سنوورێن کۆمەلگەهێ:**

**رۆژهەلاتی،** کۆمەلگەها دۆمیز.

**رۆژئاڤایی،** کەبەرتو.

دۆمیز



**باشووری،** فەیدیێ.

پێکهاتەیێ خەلکێ وێ ژ عەشیرەتێن: (هەسنان، خێرکا، کیکان، ئومەری، مۆسا رەشا و... هتد)نە.

## جهێن شوینواری و دیار:

کەلایەك كو هاتییە خرابکرن و فرۆکخانەیا هەلیکوپتران.

سالا (٢٠١٤)ێ خواندنگەهـ بۆ ڤێ کۆمەلگەهێ هاتییە ڤەکرن.

پرۆژەیێ کارەبێ سالا (٢٠٠٧)ێ گەهشتییە گوندی و یێ ئاڤێ سالا (٢٠١٥)ێ، سەرەرای كو مزگەفتەك ب ناڤێ (بەدیع و لزەمان- بدیع الزمان) و جهێن ئاسنگەریێ و فرۆتنا فێقی ژی لێ هەنە.

## وار ستی:

دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ ناڤەندا فەیدیێ، سالا (٢٠١١)ێ هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ وی تێکهەلن ژ کورد و عەرەب و کلدو ئاشووریان، ژ عەشیرەتێن ئومەرکی و هارۆنا و پێداری و کیکان و مزووری و دۆسکی و شەبەك و گەرگەری و... هتد، ژ هەرسێ ئایینێن ئیسلام و مەسیحی و ئێزدییان، ژمارا ئاکنجیێن وێ دگەهنە نێزیکی (١٢٦٠) خێزانان كو دبنە (٧٢٠٠) کەسان، خواندنگەها وێ سالا (٢٠١٣)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ژ خزمەتگوزاریێن وی ئاڤ و کارەب لێ هەنە كو سالا (٢٠١١)ێ بۆ هاتینە دروستکرن.

## وارڤین ستی:

دکەڤیتە دووراتییا (١,٥کم) ژ فەیدیێ، سالا (٢٠٠٨)ێ هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ وی تێکهەلن ژ هەرسێ ئایینێن ئیسلام و مەسیحی و ئێزدییان و ژ عەشیرەتێن جودا جودا. ژمارا ئاکنجیێن وێ دگەهنە نێزیکی (٦٧٠) خێزانان دورێن (٥١٠٠) کەسانن، دو خواندنگەهـ ب ناڤێن (برایەتی و زانا) كو ل سالێن (٢٠١١و ٢٠١٣)ێ هاتینە ڤەکرن لێ هەنە. ژ خزمەتگوزاریێن وی ئاڤ و کارەب لێ هەنە كو سالا (٢٠٠٨)ێ بۆ هاتینە دروستکرن و مزگەفت ژی لێ هەیە.

## گوندێ تلخش کۆچەر (تلخش مەزن):

گوندەکێ ناحیا فەیدیێ یە ل نێزیکی کۆمەلگەها شاریا، دکەڤیتە دووراتییا (١٢کم) ژ ناڤەندا ناحیێ، ل دووڤ گۆتنان ناڤێ گوندی یێ ژ (تەل خفش)، ب واتایا گرێ خفشا (تێژکا خەزالێ) هاتی، گوند ژ هەردو تاخێن بەرگری و بەرکانێ پێکدهێت، رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەل تلخشا بچویك دگەهیتە (٥١٧٤) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٤٣٣٠) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٨٤٤) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٨].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سینا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سیتکی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ رکاڤا.

**باشووری،** سنوورێ ناحیا ئەلقۆش.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی پێکدهێت ژ مالباتێن (هەیدەرا، بریفکا، زندك، هەمزا، مزووری)، سەرژمێریا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٩٢ کەس بوون[٩]، نها ژمارا وان (٣٩) خێزانن كو دبنە نێزیکی (٢٠٠) کەسانە، ژبلی (١٥٤) کەسێن ئاوارە ژی.

ل دووڤ گۆتنان خەلکێ گوندی ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییەهەرفاندن و خرابکرن و سەرژنوو ئاڤاکرینە و داوی جار پشتی سەرهلدانێ بوو.

### جهێن شوینواری و ناڤدار ل گوندی:

وەکی دیار جهەکێ شوینواریێ کەڤنارە و ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە كو گرەك و دێرەکا شوینواری لێ هەیە[١٠]، هەر وەسان کانییا قاچوخانێ.

ژ جهێن بەرنیاس ژی: گرێ گوندی، گەلیێ بەندەوا، گرێ ئەسماڤا، کانییا گوندی.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

د بەرێ دا ژێدەرێ ئاڤا وان كانی بوون، مینا كانییا قاچوخانی و كانییا گوندی، لێ نها بیرەكا ئیرتیوازی بۆ هاتییە كۆلان.

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی و هەتا نها ژی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و... هتد.، زێدەباری خودانكرنا تەرش و كەوالی.

بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ پشتی سالا (١٩٧٠)ێ د خانیەكێ ئاخێ ڤە هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٩٧)ێ ئاڤاهیەكێ نوی بۆ هاتییە دروستكرن.

## گوندێ بازەلانێ:

گوندەكێ خۆشە لەوما د بەرێ دا دگۆتن (هەكە نەچیە زۆزانا، هەرە بازەلانێ)، وەكی دهێتە ئەڤ گوندە ل سەردەمێ ئوسمانییان هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دووراتییا (١٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ناحیا سێمێلێ.

**باشووری:** گرێ پانێ و كەبەرتو.

**رۆژهەلاتی:** هەردو گوندێن ئالۆكا و زاوا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باختمێ.

رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٤٨٢٧) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٤٦٧٤) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (١٥٣) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن[11]، ژمارا ئاكنجیێن گوندی (٢٠) خێزانن.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا كۆچەران، تیرەیا گەودا بوون، ژمارا وان نێزیكی (١٥٠٠) كەسانە.

ئەڤ گوندە هەتا نها پێنج جاران هاتییە خرابكرن و سەرژنوو ئاڤاكرن.

### جهێن شوینواری ل گوندی:

گوندەكێ شوینوارێ كەڤنارە، ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە كو خرابە گوندەك لێ هەیە[12]، ژێلی كەمپا ئنگلیزی، بەحرك، شكەفتا ئەجنا، كەندالی كفر حەمام.

### جهێن ناڤدار ل گوندی:

گرێ سۆر، كوركەمیت.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

كانییا گوندی، كانییا حاكمی، رووبارێ دهۆك.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆر و باقلك و... هتد، هەر وەسان بیستان ژی دهاتنە كرن، زێدەباری خودانكرنا تەرش و كەوالی.

## گوندێ سینا:

گوندەكێ كەڤنارە و ل سەر دەمێ ئوسمانیان هەبوو، دكەڤیتە دووراتییا (١٣كم) ژ سەنتەرێ ناحیا فەیدێ، ئەڤ گوندە ل بەری سەرهلدانێ سەر ب ناحیا فەیدێ ڤەبوو، پشتی سەرهلدانێ كەتە سەر قەزا سێمێلێ ڤە، چونكی ناحیا فەیدێ هێشتا ل ژێر دەستێ حكومەتا عیراقی ڤەبوو، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ و هەوا رزگاركرنا عیراقێ جارەكادی هاتەڤە سەر ناحیا فەیدێ، رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی (رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی) دگەهیتە (٤٠٨١) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٣٧٤٥) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (٣٣٦) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن[13]..

گوند ژ هەردو تاخێن سینا رۆژهەلات و سینا رۆژئاڤا پێكدهێت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** چیایێ زاوا (دهۆك).

**باشووری:** گوندێ تلخش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دۆستەكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شێخدرێ.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

سینا گوندەکێ ئێزدینشینە، پێکدهێت ژ مالباتێن (چرکی، هارۆنکی، مالا حەمو فەخرایێ، مالا هێلانێ، مالێت پیرا، مالێت شێخا، مالا هۆرێ، مالا قاسمێ کچکۆك، مالا مرادێ غەزێ، مالا مرادێ غەزێ)، سەرژمێریا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧) ێ ٤٢٥ کەس بوون[١٤]، ل دووڤ راپۆرتا پشکێنەری پەروەردا مووسلێ یێ ل رۆژا ٢/٤/ ١٩٥٨ ێ سەرا خواندنگەها گوندی دای، هژمارا خەلکێ گوندی ل وێ سالێ نێزیکی (٤٢٣) کەس تەخمینکرینە[١٥] و نها (٣٢٠) خێزانن کو دبنە نێزیکی (٥٠٠٠) کەسان.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە خرابکرن.

### شوینوارێن گوندی:

خرابێ کەرەجال، شۆرها شەمسێ پیرا کورێ گیلا میر کو ئەتلەسێ داسنی لێ یە، خرابەی.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا کۆترا، دادودێ پیرا، شکەفتا دیکلی، شکەفتا گەلیێ رەزی.

### جهێن دیارێن گوندی:

زڤنکێ، گەلیێ رەزی، گەلیێ سیلا، گەلیێ سەررەشکا، کونرۆڤیکێ، ملا خیر، سیکڤانك، بعزانۆکێ، دکیت کزنا.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانیا کەرەجال، کانیا داودێ پیرا، غەبرا گوندی و... هتد.

ژ خوارنێن دەڤەرێ: میرهە، کشك، کشام، حپل و... هتد.

ژ یاریێن بەربەلاڤ ژێ: هەوینە و مام پتینە، دابدابری و... هتد.

دەڤەرێ چەند جۆرێن فرندا ژێ لێ هەنە، وەکی کەو و سیسك و پۆر و کۆتر و تیتیتك و چەند جۆرێن چیچکان.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی مینا دەڤەرێ ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆر و باقلك و... هتد، هەر وەسان بیستان ژێ دهاتنە کرن، زێدەباری خودانکرنا تەرش و کەوالی.

سالا خواندنێ (١٩٥٧ - ١٩٥٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن و زارۆکێن گوندێن دراوسێ ژێ دهاتنە ڤی خواندنگەهێ، د سالا ئێکێ دو هۆبێن پۆلا ئێکێ ب رێژەیا ٣٧ خویندکاران بۆ هەر هۆبەکێ هەبوون[١٦]، سالا (١٩٨٩)ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییە دروستکرن. سالا (١٩٧٦)ێ کارەبا گەهشتییە گوندی، سالا (١٩٧٧)ێ نۆشدار هاتییە گوندی.

## گوندێ خرشینیا:

گوندەکێ کەڤنارە و ل دووڤ گۆتنا بابکالان ل سەدسالیا هەڤدێ هاتییە ئاڤاکرن، دەمێ کۆر نەمر ئاغایێ دنانی وەکی دیرۆکا ئیداری دیار دناڤبەرا سالێن (١٧٣٥-١٧٥٥)ێ هاتییە دەڤەرێ. گوند دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، گوند ژ هەردو تاخێن بنی و سەری پێکدهێت. ل دۆر ناڤێ گوندی ژێ دو بۆچوون هەنە:

**یا ئێکێ،** تەیرەك هەیە ب ناڤێ خەرشینیا.

**یادووێ،** پێکدهێت ژ دو پەیڤان، خەر ناڤێ خێرێ یە و شنیا یەعنی شیما مللەتێ خۆ کێشایە.

رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٢٣٦٠) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٧٢٨) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٦٣٢) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[١٧]، هژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٨١ کەس بوون[١٨]. نها ١٤٥ خێزان ل گوندی دژین.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ گرێ پانێ.

**باشووری،** سنوورێ کۆزا داکا کەچك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ڕکاڤا، گەلی کورتك، حەوت

بەرازی، سەرێ گەلی شێڤا، نەولا بیرکە.

**رۆژئاڤایی،** گەلیێ شێخ عنزرووەت، شکەفتا بۆك و زاڤا.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ ئێزدینشینە ژ ئێلا دوملی، پێکدهێت ژ مالباتێن: (خەلو سودویا، بنەمالا نەمرا، بنەمالا نعمانا، بنەمالا مەحمودا، بنەمالا سەلیم شەمویا، بنەمالا پیرۆزی، بنەمالا گشتویە، بنەمالا عەلی ئیسماعیل، بنەمالا حسێن رۆشا، بنەمالا عەیش قاسویا، بنەمالا ئیسماعیل هەسنا، بنەمالا شێڤا کوندوۆرێ کوریی مجێورێ گوندی). ئەڤ گوندە هەتا نها چوار جاران هاتییە خرابکرن.

### جهێن شوینواری و ناڤدار ل گوندی:

گرێ سلانەکا، گرێ نیسکا، ملا تووکا، گرێ کەرەشی، حەلانۆك، نەوالا بیرکی، نەوالا کۆر، شکەفتا بۆك و زاڤا، گرێ ستیا مامێ، گرێ شەری، گرێ قۆچ، مەزارگەهێ شێخ عنزرووەت ل چیایێ خەرشینا، مەزارگەهێ عەڤدێ رەش مەزارگەهێ بیراڤات، سلاڤگەها بەرمەزارگەهێ شێخ عنزرووەت، گۆرستانا کەڤن و نوو.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانییا گوندی د سەر گوندی دا، غەبرا گوندی، رووبارێ ئاڤارێ گوندی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

پتر ل سەر چاندنا دێمی بوو، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆر و باقلك و... هتد، هەر وەسان بیستان ژێ دهاتنە کرن.

سالا (١٩٦٩)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ رکاڤا:

ل دووڤ گۆتنان ئەڤ گوندە ل سەدسالییا نۆزدێ هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتییا (٤کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ل دۆر ناڤێ گوندی ژێ دو بۆچوون هەنە:

یا ئێکێ: دبێژن ل بەرێ ئاڤ ل گوندی نەبوو و ئاڤ تێرا دهاتە کێشان، ژبەر هندێ دگۆتنێ (رێك ئاڤا).

یا دووێ: گوند ل جهەکێ بلند و رك هاتییە ئاڤاکرن، ژبەر هندێ دگۆتنێ (رك ئاڤا) و پاشی بوویە (رکاڤا).

رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (١٦٥٠) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٤٠٠) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٢٥٠) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[١٩].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** نهێل.

**باشووری،** چیایێ داکا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تلخش.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن خەرشینا و رکاڤا.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ ئێزدینشنە ژ هەردو عەشیرەتێن (خالتا و دنا)، پێکدهێت ژ مالباتێن: (بنەمالا حاجوا، بنەمالا میرزوا، مالا حودیا، بنەمالا صەفەرێ حەیدەری)، هەژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٠١ کەس بوون[٢٠] و سالا (١٩٨٧)ێ نێزیکی (٤٠٠) کەسان بوون، نها (١٤٠) خێزانن کو دبنە نێزیکی (١١٠٠) کەسان.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە کاڤلکرن و پێنج جاران هاتییە ئاڤاکرن.

### جهێن شوینواری و ناڤدار ل گوندی:

گوندەکێ شوینوارییێ کەڤنارە، ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە کو گرەکێ شوینواری لێ هەیە[٢١]، ژبلی شوینوارێن شێخ سن، گەلی مالا، گەلی کورتك، گەلی عەرەب، گەلی کرڤریشك، شکەفتا گەلی کورتك، گرێ نهێلێ، مەزارگەهێ تربێت مەسیحییان، نیشانگەها مەلك شێخ سن، نیشانگەها پیرافات.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

کانییا ڕکاڤا ل نهێلێ و بیرەکا ئیرتیوازی یە.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

پتر ل سەر چاندنا دێمی بوو، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆر و باقلك و... هتد، هەروەسان بیستان ژی دهاتنە کرن.

سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی هەر ل هەمان سال بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، هێلا کارەبێ سالا (١٩٧٧) ێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان.

**گوندێ کەبەرتو:**

ئـەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (١٠کـم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ل دووڤ گۆتنان سالا (١٨٢٠) ێ هاتییە ئاڤاکرن. ناڤێ گوندی ژ دارا تووە هاتییە. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٦١٠٠) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٩٠٠) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٤٢٠٠) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٢٢]..

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ باختمێ.

**باشووری:** گوندێن نەمریکێ و کزك.

**ڕۆژهەلاتی:** گوندێن گرێ پانێ و زۆراڤا.

**ڕۆژئاڤایی:** گوندێ ریێبی.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

کەبەرتو گوندەکێ ئێزدینشینە ژ عەشیرەتێن بریمچی و دنانییان، پێکهاتییە ژ بنەمالێن: (قاسم کلو، حاجی شرو، عەبدی عەلی، کیکو حیدر، کچو هسام، حەجی خەلو)، ژمارا ئاکنجییێن ڤی گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧٢ کەس بوون[٢٣]. نها ژمارا خێزانێن وی دگەهنە نێزیکی (٨٠) سەرۆکخێزانان کو دبنە نێزیکی (٦٤٠) کەسان، لێ نها (١٢) خێزان ل گوندی دژین.

ئەڤ گوندە دو جاران هاتییە خرابکرن.

**شوینوار و جهێن ناڤدار ل گوندی:**

گوندەکێ شوینواریێ کەڤنارە، ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە کو خرابە گوندەك لێ هەیە[٢٤]، ژبلی شوینوارێن کفری گلورا، کر بزمار، شێخ یوغا، مەزارێ چاویش.

**زێدەرێ ئاڤێ ل گوندی بیرەکە.**

ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە و ب تایبەت چاندنا دێمی.

سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی سالا (١٩٧٦)ێ بۆ گوندی هاتییەدروستکرن، هێلا کارەبێ سالا (١٩٧٧)ێ گەهشتییە گوندی.

**گوندێ شێخدرێ:**

ئەڤ گوندە دکەڤیتە بن چیایێ زاوا ب دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیا فەیدیێ، ل دەسپێکێ سەر ب قەزا دهۆکێ ڤەبوو، پشتی سێمێلێ بوویە قەزا کەتیە سەر وێ قەزایێ و نها سەر ب ناحیا فەیدیێ ڤەیە. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٢٢٠٣) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٦٨٠) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٥٢٣) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٢٥]. گوندەکێ کەڤنارە و ناڤێ گوندی ژ ناڤێ شێخ خدرێ شەمسا هاتییە کو ئێکە ژ خاس و چاکێن ئێزدییان و هەتا نها گۆڕێ وی ل ڤی گوندی یە و چونکی گوند ل سەر ناڤێ ڤی چاکی یە، لەوما دیرۆکا گوندی ژی دبیت ل دووڤ گۆتنان بزڤریتە مێژوویا ڤی کەسی کو دزڤریتەڤە سالا (١١٠٠) زایینێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** چیایێ زاوا کو سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ دکەڤیتە پشت.

**باشووری:** گوندێن ڕکاڤا و تلخشا بچویك.

**ڕۆژهەلاتی:** گوندێ سینا.

**ڕۆژئاڤایی:** گوندێ شاریا یێ کەڤن.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

ئەڤ گوندە ئێکە ژ گوندێن ئێزدییان سەر ب عەشیرەتا قائیدیا ڤەیە، ژ چەند بنەمالان پێکدهێت، وەکی: (مالا ئلیاسێ عەبوزێدی، مرادێ خوٚڤێ، مرادێ بەهارێ، حەجیێ رەشو، جهوری کو مجێورێن گوندی نە، سەعدوی، عەلیێ سلۆی، بارۆیا، خەلویێ میرزای، حەسۆ رەوشا، عەلی مرادا، مرادێ کەچەلی کو گزیرێ گوندی بوو، مالا قەرۆی، مالا شەمویێ لاسوی، سمویێ عەیش)، ژمارا ئاکنجیێن ڤی گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٣٠١ کەس بوون[٢٦]، نها ژمارا سەرۆك خێزانێن خەلکێ ڤی گوندی دگەهنە (٥٠٠) سەرۆکخێزانان کو دبنە نێزیکی (٣٥٠٠) کەسان و ل دەڤەرێن جودا دبەربەلاڤن، لێ نها تنێ (٣٠٠) خێزان ل گوندی دژین.

ئەڤ گوندە مینا پتریا گوندێن کوردستانێ ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٧)ێ هاتییە وێرانکرن و هەر جارا هاتییە وێرانکرن پشتی هینگێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**شوینوار و جهێن ناڤدار ل گوندی:**

گرەکێ ناسیار ب ناڤێ گوندی هەیە و ئەڤ جوٚرە گرە ل دەڤەرێ دزۆرن، ڤوبا شێخ خدرێ سەمسا ل سەر گۆرێ وی هاتییە ئاڤاکرن، نهێلا گوندی کو ل بەرێ ئاڤ لێ هەبوو و چاندن ل بەر دهاتە کرن، قوچەك ب ناڤێ قوچکا (مهەندسی) ل راسەری گوندی ژ لایێ گوندێ سینا، ژبلی هەبوونا گەلەك شکەفتان ل ناڤ گوندی و دەور و بەران.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ئەڤ گوندە هەر دکەڤندا یێ کێم ئاڤ بوو، ئاڤ ژ کانییا کەرەجالی و کانییا دۆستەکا دهینان و هەر چەند نهێلا گوندی یا دویر بوو، لێ مفا ژێ دهاتە وەردگرتن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە و ب تایبەت چاندنا دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نوٚك و باقلك و گوندۆر و... هتد، هەر وەسان ل ڤان داویان کەسکاتی و دار و بارێ فێقی و زەیتوونان ژی لێ دچینن.

سالا (١٩٨٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٨٦)ێ هاتییە دائێخستن و هەتا نها لێ نینە، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی سالا (١٩٧١)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ سالەهیێ:

ئەڤ گوندە سالا (١٩٩٢)ێ هاتییەئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتییا (٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیا فەیدیێ. بنیاتێ ناڤێ گوندی ژ (صالح- صالحیە، سالەهیێ) هاتییە. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٣٥٤١) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٤٣٥) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٢١٠٦) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٢٧]...

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** درێژاهیا چیایێ زاوا.

**باشووری:** گوندێ سیتك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی گولان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دۆستەکا.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

خەلکێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەرانە ژ تیرەیا ئەرتۆشییان، ژمارا خەلکێ وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٦٧ کەس بوون[٢٨] و نها (٢١) خێزانن کو دبنە نێزیکی (١٠٠) کەسان.

ئەڤ گوندە دو جاران هاتییە خرابکرن و پشتی هەر جارەکا خراب بووی جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت گەنم و جەهان.

پرۆژەیێن خزمەتگوزاری ژ خواندنگەهـ و ئاڤ و کارەبان ژی سالا (٢٠٠٠)ێ گەهشتینە گوندی.

## گوندێ کەلە بەدرێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٧کم) ژ سەنتەرێ ناحیا فەیدێ، هەتا سالا (١٩٧٧)ێ سەر ب ناڤەندا سێمێلێ ڤەبوو، هەتا سالا (١٩٣٣)ێ فەللێن نستۆری لێ بوون و مەزنێ وان (یوسف خیدو ئەلبازی) بوو، پشتی هینگێ گوند کاڤل بوویە، و گوند ل سالا (١٩٣٩)ێ ژ لایێ (٢٠) خێزانێن هۆزا بەسیاڤە هاتییە ئاڤاکرن. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (١٤٠٣) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٠٩٨) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٣٠٥) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٢٩]. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ کەلا وێ و کانییا گوندی هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایێ کەلەبەدرێ (زاوا).

**باشووری:** نهێل.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شاریا (گوندێ کەڤن).

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زاوا.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ ئێزدینشینە و هەمی ئێك مالباتن (باسی نە)، هەژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١١٥ کەس بوون[٣٠] و ل دووڤ راپۆرتا سەرپەرشتیارێ پەروەردەیی ل سالا ١٩٥٨ێ هژمارا وان ١٥٠ کەس بوون[٣١]، نها نێزیکی (١٨٠) خێزانانە.

گوندێ کەلە بەدرێ دناڤ کاودانێ سیاسی دا پێنج جاران ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٤، ١٩٨٧)ێ هاتییە کاڤل و وێرانکرن.

### شوینوار و جهێن ناڤدارێن گوندی:

ڤی گوندی چەند جهێن کەڤن و شوینواری و ناڤدار هەنە، وەکی: کەلا کەلە بەدرێ، مناسبێ ناسرەددن، شێخ بابك، مەلك شێخ سن و ئیزی، شکەفتا سیخوری، شکەفتێن کەلی سڤۆك، کەلی هەفتار، دو گرکا، گرکێ تەحلێ، بەرێ نۆبەدار، بەرەها دەواری، بەرەها ریسیا.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانییا گوندی و بیرا ئیرتیوازی ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤا گوندی نە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە و ب تایبەت چاندنا دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و گوندۆر و... هتد، هەر وەسان یێن ئاڤی ژی مینا باجانسۆرك و خیاران.

سالا (١٩٧٧)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، ل هەمان سال هێلا کارەبێ ژی بۆ گوندی هاتییە راکێشان، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی یێ کەڤنە و سالا (١٩٥٨)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن.

## گوندێ شاریا:

شاریا دکەڤیتە دووراتییا (٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ل دووڤ گۆتنان نێزیکی سالا (١١٠٠ز)ی هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ گوندی ژ شاراندن، یان ژ ئەگەرێن فەرمان و دەردەسەریان هاتییە، عەردێ گوندی نیڤەك ژێ سەنەدێن تورکی نە و نیڤا دی مەلاك بوون کو خەلکێ گوندی ژێ کرینە. رووبەرێ وی دگەهیتە (٢٩٥٧) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٢٥٥٧) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٤٠٠) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٣٢].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایێ زاوا.

**باشووری:** گوندێ رکاڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شێخدرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کەلەبەدرێ.

### پێکهاتا خەلکێ گوندی:

شاریا گوندەکێ ئێزدینشینە، ژ عەشیرەتێن قائیدی و دنانی ژ مالباتێن: (مالێن حەیدویا، مالێن گوریا، مالێن حەجی بهارا، مالێن شێخا) پێکدهێت.

ژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢٧ كەس بوون[٣٣]، نها گوند بێ ئاڤایە و نێزیكی (٢٥٠) خێزانان لێ هەنە، ژوانان گەلەك ژێ ئاوارەیێن شنگارێ نە.

گوندێ شاریا چوار جاران ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٤، ١٩٨٧)ێ هاتیيە كاڤل و وێرانكرن.

## شوینوار و جهێن دیار ل گوندی:

وەكی دیار ددەمەكی دا مەسیحی ل ڤی گوندی ژیاینە و هەتا نها ژی گۆڕستانا وان یا دیارە، هەر وەسان نێزیكی چل شكەفتان ل ڤی گوندی هەنە، ژبلی غەبرا ئاڤێ، زەهمان نیشانا دارا ستیائیێ و... هتد.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی بیرا ئاڤێ (سیبا) و بیرەكا ئیرتیوازی یە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ ڤی گوندی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و گوندۆر و دار زەیتوون... هتد، هەروەسان چاندنێن ئاڤی ژی مینا باجانسۆرك و باجانرەشك و خیاران.

سالا (١٩٥٩)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەها سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتیيە ڤەكرن، سالا (١٩٨١)ێ قۆناغا ناڤنجی و سالا (١٩٨٣)ێ قۆناغا ئامادەیی ژی ل گوندی هاتنە ڤەكرن.

## گوندێ زۆراڤا:

گوندەكێ نێزیكی سەنتەرێ ناحیێ یە و تنێ (٧٥٠م) ژێ دوورە، سالا (١٩٥٠)ێ هاتییەئاڤاكرن. رووبەرێ عەردی ل گوندی دگەهیتە (٢٣٦٦) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٢٠٣٠) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (٣٣٦) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن[٣٤]، ناڤێ گوندی ژ هەبوونا ئاڤەكا زۆر هاتییە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** وار ستی.

گوندێ شاریا



**باشووری:** گوندێ دێر جندی.

**رۆژهەلاتی:** سەنتەرێ فەیدیێ.

**رۆژئاڤایی:** کۆمەلگەها رزگاری.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ نەتەوە عەرەبن ژ (بەنی رەبیعە) ژ مالباتێن (ئەبو شاهین و ئەبو حەمو)، ژمارا ئاکنجیێن وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٢٠ کەس بوون[٣٥]، نها (٢٢٠) خێزانن کو دبنە نێزیکی (١١٠٠) کەسان.

ئەڤ گوندە ژی جارەکێ هاتیە خرابکرن.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ڤی گوندی کانییەکا ئاڤێ هەر ب ناڤێ گوندی لێ هەیە، ژبلی پێنج بیرێن ئیرتیوازی کو سێ ژ وان سەر ب میری ڤەنە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

سالا (١٩٧٥)ێ خزمەتگوزاریێن ئاڤ و کارەبێ گەهشتینە گوندی، خواندنگەهـ سالا (٢٠١٢)ێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، ئەڤ گوندە نها دکەڤیتە د سنوورێ باژێرڤانیا فەیدیێ دا.

## گوندێ کزك:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٧کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، سالا (١٩١٥)ێ هاتییە ئاڤاکرن. رووبەرێ وی دگەهیتە (٣٢٨٥) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٣٨٢) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (١٩٠٣) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٣٦]. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ کچکا نازاندی هاتییە (کزك کچك).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کەبەرتو.

**باشووری:** سکرێ مووسل.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نەمریکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رەحمانیێ.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

ئەڤ گوندە گوندەکێ عەرەبنشینە و مالەکا کوردان ژی لێ هەیە، خەلکێ وی ژ عەشیرەتێن (ئەلبو منا، ئەلبو سەلام، گیا، بەنی تەمیم)، ژ مالباتێن گوندی ژی: (بەیت ئال ئیسماعیل، ئال موسا، ئەل ، ئال حەمیدە، ئال حسو، ئال کەمال و... هتد). ژمارا خەلکێ وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٩٥ کەس بوون[٣٧] و نها (٢١٨) خێزانن کو دبنە نێزیکی (١٣٠٠) کەسان.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی ژی سکرێ مووسلێ یە.**

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و کەسکاتییێن وەرزی و خودانکرنا تەرش و کەوالی و مریشك و ماسیانە.

سالا (١٩٧٨)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، هێلا کارەبێ ژی سالا (١٩٨٥)ێ بۆ گوندی هاتییە راکێشان، سالا (٢٠٠٦)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ هاتییە دروستکرن.

## گوندێ تلخش بچویك (زێری)

ب تلخش عەرەب ژی دهێتەناڤکرن:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٧کم) ژ سەنتەرێ فەیدیێ، سالا (١٩٦٦)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ گوندی دبیت ژ ناڤێ (خفشێ) ب واتایا تێژکا خەزالێ هاتبیت کو ل بەرێ ل ڤێ دەڤەرێ دمشە بوون. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەل گوندێ تلخشا مەزن دگەهیتە (٥١٧٤) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٤٣٣٠) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن و (٨٤٤) دۆنەم ب کێری چاندنێ ناهێن[٣٨].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ سینا.

**باشووری:** گوندێ داکا و چیایێ داکا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ تلخشا مەزن.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رکاڤا.

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، ژ بنەمالێن وان: (مغاری، سەید محەمەد، سەید مەحمود، سەید محیەددین)، ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٨ كەس بوون[٣٩]، نها (٢٠) سەرۆكخێزان ل گوندی دژین.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە كاڤل و وێرانكرن.

ژ جهێن بەرچاڤ ل گوندی: گەلیێ عەرەبی، گەلیێ چیچو.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ یە ب تایبەت یا دێم، مینا گەنم و جەهـ و زەیتوونان، هەروەسان بیستانان ژی دكەن.

سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، سیبا (بیر) ژی هەر ل هەمان سال بۆ گوندی هاتییە كۆلان.

## گوندێ نەمریكێ:

كەڤنترین گوندێ دەڤەرێ یە ل پارێزگەها دهۆكێ، سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە، دكەڤیتە دووراتییا (٤كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٦٠٩٨) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (١٨٥٥) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (٤٢٤٣) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن[٤٠]. ناڤێ گوندی ل دووڤ گۆتنان ژ ناڤێ كەسەكی ب ناڤێ نەمر بەگی هاتییە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** كۆمەلگەها رزگاری.

**باشووری:** سكرێ مووسل.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گومبص.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كزك.

گوندێ زۆراڤا



### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

گوندەكێ تێكهەلە ژ هەردو نەتەوێن كورد و عەرەبێن ژ عەشیرەتا (طئ)، ژ بنەمالێن وان: (ئەلئەمین، ئەلعومەر، ئەلحوسەین، ئەلعەلاوی، ئەلعەبدولا)، ژمارا ئاكنجیێن وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٦٢ كەس بوون [٤١] و نها (٢٠٥) خێزانن.

### جهێن شوینواری ل گوندی:

هەلبەت وەكی دیار كەڤنترین شوینوار ل عیراقێ ل ڤی گوندی هاتینە دیتن كو پێكهاتییە ژ گوندەكێ شوینواری و (نهالا تۆنیلا- وادی القنطرە).

ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ یە ب تایبەت یا دێمی، مینا گەنم و جەهان و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی و نێچیرا ماسییان.

سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، ژ خزمەتگوزاریێن دی ل گوندی كارەب سالا (١٩٨٣)ێ گەهشتییە گوندی و پرۆژەیێ ئاڤێ ژی سالا (٢٠٠٨)ێ ل سەر سكری مووسل بۆ هاتییە دروستكرن.

## گوندێ رەحمانییێ:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا (١١كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، سەر توخیبێ گوندێن خێراڤا و رێبە و كزك، سالا (١٩٦٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٣٠٦٢) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٩٠١) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (٢١٦١) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن [٤٢]. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ (الرحمن) هاتییە.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی ژ نەتەوا عەرەبن ژ عەشیرەتا حبیطی ژ مالباتێن ئەلنایف و ... هتد، ژمارا خەلكێ وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٩٦ كەس بوون [٤٣] و نها نێزیكی (٧٥٠) كەسانە.

خەلكێ گوندی بۆ ئاڤێ مفای ژ سكرێ مووسل دبینن و چاندنا وان پتر دێمی یە، ب تایبەت گەنم و جەهـ و خودانكرنا پەز و چێلان.

سالا (١٩٧٥)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، كارەب ژی سالا (١٩٨٦)ێ گەهشتییە گوندی، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی سالا (٢٠٠٤)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن.

## گوندێ دێر جندی:

ئەڤ گوندە سالا (١٩٢٢)ێ هاتییە دروستكرن، دكەڤتە دووراتییا (٢كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەهیتە (٢٣٥٠) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٢٣٣١) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (١٩) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن [٤٤]. ناڤێ گوندی پێكهاتییە ژ دو پەیڤان، پەیڤا دێر كو دێرەك لێ هەبوویە و جندی ناڤێ كەسەكی بوویە.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی هەمی كوردن و ئێك بنەمالن ژ عەشیرەتا كۆچەران، ژمارا ئاكنجیێن وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٢ كەس بوون [٤٥] و نها (١٨٩) سەروكخێزان ل گوندی هەنە.

ئەڤ گوندە سێ جاران ل سالێن (١٩٦١، ١٩٧٥، ١٩٩١)ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن.

### جهێن شوینواری ل ڤی گوندی:

ڤی گوندی مەزارەك ب ناڤێ (مردنا) و دستارێن كەڤن بۆ بەرهەمهینانا ئاری لێ هەنە، دیسان خرابە گوندەك ژی ب ناڤێ (خاتۆن) و شكەفتا (حەمام) ژی لێ هەیە.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ڤی گوندی كانییەك ب ناڤێ كانیا (مردنا) لێ هەیە، هەر وەسان كانییەكا دی یا كەڤن ب ناڤێ (عزرائیل) دناڤبەرا گوندی و گوندێ زۆراڤادا هەبوو.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر چاندنێ یە ب تایبەت یا دێمی، مینا گەنم

و جەهان و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی و چێلان.

سالا (١٩٧٨)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، هێلا كارەبێ ژی سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی، پرۆژەیێ ئاڤێ دناڤبەرا سالێن (١٩٨٤-١٩٨٥)ێ هاتییە دروستكرن و مزگەفت سالا (١٩٨١)ێ هاتییە ڤەكرن، نها ئەڤ گوندە ژی كەتییە د ناڤ سنوورێ بازێرڤانییا فەیدێ.

## گوندێ كانی گولان:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا (٨كم) ژ سەنتەرێ فەیدێ، ل دووڤ گۆتنان سالا (١٩٠٠) هاتییە ئاڤاكرن. رووبەرێ عەردی ل ڤی گوندی دگەل عەردێ گوندێ وشتیان دگەهیتە (٥٥٧٢) دۆنەمێن عەردی، ژ وانان (٢٤٦٧) دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێن و (٣١٠٥) دۆنەم ب كێری چاندنێ ناهێن[٤٦]. ل سەر ناڤێ گوندی وەكی دیار پێكهاتییە ژ دو پەیڤان، یا ئێكێ ئەوە گەلەك كانی ل گوندی هەنە و یا دووێ گەلەك (گول محەمەد)، یان (گولا ریلێ) لێ هەنە، ب ڤێ چەندێ ناڤێ گوندی دبیتە (كانی گولان).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن دۆستەكا و ووشتیان.

**باشووری:** ئەلقۆش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باساوا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سالەهی.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا كۆچەرانە ژ بنەمالێن: (بنەمالا خەلو، بنەمالا هەیدەرا، بنەمالا سرێ و... هتد)، ژمارا ئاكنجیێن وی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٥٧ كەس بوون[٤٧] و نها (٣٥) سەرۆكخێزان ل گوندی هەنە كو دبنە نێزیكی (٢٥٠) كەسان.

گوند چوار جاران هاتییە كاڤل و وێرانكرن.

گوندێ كانی گولان



**جهێن بەرنیاس ل گوندی:**

بانیا کوردو، بانیا مەلوی، زۆم، زویرەك، گوندێ بشێری کو خرابەکە ل نێزیکی گوندی، گەلیێ بشێرێ، گەلیێ کویر، گرێ کێرات، گەرا ساڤارا و... هتد.

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی کانی و رووبار و سیبانە (بیرن).

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە ب تایبەت یا دیم، مینا دەخل و دان و نیسك و نۆك و گژنیژ و رەزێن مێو و باهیڤان.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، بیرا (سیبا) ئاڤێ سالا (١٩٩٣)ێ بۆ هاتییە دروستکرن، کارەب ژی سالا (٢٠٠٧)ێ گەهشتییە گوندی، هەژی ئاماژێ یە بەرێ (مەقلەعا) بەرا لێ هەبوو.

## گوندێ زاوا:

گوندەکێ شوینواریێ کەڤنارە ل بنارا چیایێ زاوا، ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە کو گرەکێ شوینواری لێ هەیە[٤٨]، ئەو گر ژی گرێ (گرێ میریێ) یە. گوند دبنیاتدا یێ ئێزدییان بوو، وەکی ژ زاردەڤێ مەلا قاسم کۆچەر هاتییە بهیستن کو دەمێ میرێ کۆرە سالا (١٨٣٢)ێ ب سەر دەڤەرێ دا گرتی، زاوی ل سێریانا (مفرەقا) دهۆك- زاخۆ- مووسل چوونە بەراهیێ و گۆتنێ ئەم سەیدین ژ شەجەرا پێغەمبەری نە، میری گۆتێ ئەگەر هوین راست دبێژن و ژ شەجەرا وی نە بۆ من وێ چەندێ دیاربکەن دا هەوە خەلات بکەم، پشتی شەجەرا خۆ بۆ دیارکرین وی ژی هەردو گوندێن دولبێ و زۆراڤا دانێ، وان ژی ئەو هەردو گوند فرۆتنە بەگێن مووسلیان و گوندێ زاوا دناڤبەرا سالێن (١٨٤٠ - ١٨٥٠)ێ ژ بەگێن مووسلییان ب ناڤێن عەبدولرحمان بەگ و بەکر بەگ و هندەك ژ نۆر محەمەدێ بریفکی دهۆکی (١٩١٣ێ مرییە) ل شوونا وان هەردو گوندان پێ کری و دەمێ گوند ئاڤادکرن، زەنگینێن وان هۆستایێن ئاڤاکرنێ ژ ئەلکویش (ئەلقۆش) دهینان دا قەسرێن وان ئاڤاکەن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** چیایێ زاوا و گوندێ ئالۆکا.

**باشووری:** هەردو گوندێن گرێ پانێ و خرشنیا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کەلەبەدرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بازەلانێ.

**پێکهاتا خەلکێ گوندی:**

زاوا پێکهاتییە ژ سێ بنەمالێن سەرەکی، ئەو ژی بنەمالێن (حەجی سەرحانی، سەید یونسی، حسێن عەلی) و هەرسێ بنەمال رهێن خۆ دگەهیننە عەرەبا، بنەمالا ئێکێ دبێژن ئەم د بنیاتدا دگەهینە تایێ (حوتان) کو دبێژن یێ ژ دێرەزۆرا سوریێ هاتین و هەردو بنەمالێن دی خۆ دگەهینە (حەنزەلە- حنظلة)، کو ئەو ژی یێ ژ سۆریا هاتین. ژبلی ڤان مالان چەند مالێن دی ژی لێ هەنە، وەکی (زەنون زەهرا، سلێمان دەروێش، خزێما) و بنەمالا داوێ ل بەری نێزیکی سەد سالان چووینە گوندێ ئالۆکا و دگەل خەلکێ وی گوندی ژیاینە و کارێ چاندنێ کرینە و نها بووینە خەلکێ گوندێ ئالۆکا.

ئەڤ گوندە سالا (١٩٨٧)ێ هاتبوو وێرانکرن، خەلکێ وی پتر نها ل دهۆك و مووسل ئاکنجینە، ئێك ژ وان کەسان کو ژمێژە هاتییە دهۆکێ مالا (حەجی سەرحانی) یە کو ل سەدسالیا نۆزدێ هاتینە دهۆکێ و کورێ وی (سەید داود) ل سالا (١٩١٣)ێ ئێك بوو ژ خویندکارێن خواندنگەها ئوسمانی ل دهۆکێ و قەسرا وی دبن قەسرا کەمبەرلاندی دا بوو.

**جهێن دیار ل گوندی:**

رهیسا کو دکەڤیتە سەر باشوورێ گوندی ل سەر رێکا گرێ پانێ، شێخ بابك ل رۆژهەلاتێ گوندی ل سەر توخیبێ گوندێ کەلەبەدرێ و وەسان دیارە کو

ئەڤە گۆڕێ شێخەکێ ئێزدییانە و بەرەکێ گەلەك مەزن یێ ل سەر، هەروەسان شەش گەلی ل پشتا زاوا هەنە و هەر ئێك یێ بنەمالەکێ یە، ئەو ژی گەلیێ شەمەمە، گەلیێ عاسی، گەلیێ توخوب، گەلیێ خەجانێ، گەلیێ کونرۆڤی. و گەلیەکێ دی ل سەر سنوورێ گوندێ ئالۆکا.

## زێدەرێ ئاڤا گوندی:

ل بەرێ بیرەکا ئاڤا تەحل لێ هەبوو، لێ ل سالا (١٩٧٠)ێ بیرەکا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتە کۆلان و ئاڤەکا زۆر و شرین لێ دەرکەت کو ناڤ و دەنگێن خۆ ل دەور و بەران هەبوو.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ وی ل بەرێ پتر مژوولی چاندن و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوون، نها ژی هەر وی کاری دکەن و خانیێن پلاستیکی و حەوزێن ماسییان ژی لێ هەنە، ژبلی کو هندەك ژێ مووچەخۆر و کاسبکارن[٤٩].

## گوندێ ئالۆکا:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە سەر رێکا ناڤدەولەتی ترکیا- عیراق و گەلەك جاران خەلکێ عەشیرەتا گۆیان ب رەنگەکێ بەروەخت لێ ئاکنجی دبوون، عەرد یێ شێخێن بریفکایە و ب تایبەت یێ شێخ نور محەمەدی و شێخ عوبەیدێ کورێ شێخ نۆر محەمەدی (١٩٥٤ێ مربیە) دەمێ ئەندامێ پەرلەمانێ عیراقێ خانییەکێ مەزن لێ ئاڤاکربوو و ئەو شیا چەند بنەمالێن زاوییا وەکی جۆتیار ببەتە سەر گوندی ب تایبەت ئەڤ کەسێن بێ عەرد، ژ وانان مالا ئەحمەد مستو، مالا سولتان عەبدوللای و مالا خزێما و مالا زەنون زەهرای. ل داوییا سالێن هەشتییان گوند کەتبوو بەر هەوێن وێرانکرنێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**، سێریانا دهۆك- مووسل- زاخۆ.

**باشووری**، ئاڤارێ هەردو گوندێن بازەلانێ و زاوا.

**رۆژهەلاتی**، چیایێ زاوا و گوندێ قەسارا (کو نها بوویە پارچەك ژ دهۆکێ).

**رۆژئاڤایی**، دەڤەرا سێمێلێ (گوندێ دلب).

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢٠ کەس ل ڤی گوندی هەبوون[٥٠].

## گرێ پانێ:

گوندەکێ شوینواریێ مەزن بوویە، ناڤێ وی دناڤ ئەتلەسا شوینوارێن عیراقێ دا هاتییە کو خرابەکێ شوینواری لێ هەیە[٥١]، گوند هاتبوو تەعریبکرن و ببوو کۆمەلگەهـ ب ناڤێ (عەدنانیە) و عەشیرەتا حەدیدی لێ ئاکنجیکرن[٥٢]، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ دکەتە دناڤبەرا هەردو دەسەلاتدارێن کوردستانێ و حکومەتا عیراقی دا.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**، هەردو گوندێن بازەلانێ و زاوا.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ خرشنیا.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ کەبەرتو.

خەلکێ ڤی گوندی ئێزدینە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٠٩ کەس ل ڤی گوندی هەبوون[٥٣].

# گوندێ وشتیان

ئێکە ژ گوندێن کۆچەران- تیرەیا ئەرتووشییان سەر ب ناحیا فەیدیێ- قەزا سێمێلێ. مینا گوندێن دۆستەکا، کانی گولان، تلخش، سالەهیێ ل ژێر دەستهەلاتا شێخێن بریفکا بوون، گوندێ وشتیان دکەڤیتە سەر توخیبێ هەردو عەشیرەتێن مزووری و کۆچەران.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێن هێتیتێ و ئەڤریکێ

**باشووری**، گوندێن سالەهیێ و کانی گولان

**رۆژهەلاتی**، گوندێن مزووریانە مینا پاسەوا، پیرمووس و بێتاسێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ دۆستەكا

## پێكهاتا خەلكێ گوندی:

خەلكێ گوندی كۆچەرێن ئەرتووشی نە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٦٦ كەس بوون[٥٤] و نها ل دووڤ زانیاریێن رێڤەبەریا ناحیا فەیدیێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ ١٥ خێزان ل گوندی دژین. ژ بلی كۆچەران هندە مالێن هێتیتییان ژی لێ هەبوون و بەری فەرمانا فەللا هندەك مالێن وان ژی لێ هەبوون.

## جهێن بەرنیاس ل گوندی:

چەند جهێن دیار لێ هەنە، وەك: چیایێ ئاغای، گەلیێ كاڤران، گەلیێ نێرگزا، گرێ ب كێرات، كۆرە سێلكێ، بەرێ كەلشتی، گەلیێ هجرێ.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

گوند سەر ب كەرتێ چاندنێ ٦٤ كانی گولانە، رووبەرێ عەردێ وی یێ بكێر چاندنێ دهێت ١١٩٧ دۆنەمە[٥٥]، ژیانا خەلكێ وی ل سەر پەزی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، هەروەسان ل سەر چاندنا دێمی ژی مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆكان.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ڤی گوندی كانییەكا خۆش یا ئاڤێ ل رۆژهەلاتێ گوندی بۆ ڤەخوارنێ هەبوو، دیسان ئێكا دی ل ژێریا گوندی ژی ب ناڤێ ئاڤا شۆرێ بۆ پەزی و چاندنێ هەبوو.

گۆرستانەكا كەڤن ب ناڤێ (پیرێ خەلات) ل گوندی هەیە، دبیت یا ئێزدییان بیت چونكی موسلمان مریێن خۆ ل وێرێ نا ڤەشێرن و مریێن خۆ ل هندە گوندێن دی ڤەدشێرن[٥٦].

چەند گوندەكێن دی ب ناڤێن قاهیرە (ئاڤایە)، باختمێ (ئاڤایە)، جدیدكا (ڤالایە)، سیتكی (ئاڤایە) قبغ (ڤالایە)، ملێخیێ (ڤالایە)، كوزیلێ (ڤالایە) و كانی شینێ (ڤالایە) ل سنوورێ ناحیێ هەنە لێ ب مخابینی ڤە نە زانیاری دەربارەی وان گوندان دەست مەكەتن، نە ژی كەسەك دەست مە كەت زانیارییان ل دور وان گوندان كۆمكەت.

## ژێدەر و پەراوێز:

(*). زانیاریێن ناحیا فەیدیێ ب هاریكاریا بەرێزان حەجی مەغسو، سوزدار رەشید نەرمو، د. فەرسەت مەرعی، حەجی جەعفر، رێڤەبەریا ناحیێ، لڤێ چاندنێ ل ناحیێ هاتینە كومكرن و ژ ئالیێ دەستەیا ئینسكلوپیدیایێ هاتینە بەرهەڤكرن و دەولەمەندكرن ب زانیاری و ژێدەرێن دیتر.

١. پێزانینێن عەردی ژ هۆبا چاندنا فەیدیێ هاتینە وەرگرتن.

٢. زانیاری ژ رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆكێ هاتینەوەرگرتن.

٣. د. عەبدوللا غەفور، گوندەكانی باشووری كوردستان لە سەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا- ١٩٥٧، (هەولێر: ٢٠٠٥)، دەزگای ئاراس، بپ ٥٥.

٤. خضر دوملی، فەیدیێ (فایدة) والاسطورة الضائعة، كۆڤارا دهۆك، ژمارە ٢٠، سالا ٢٠٠٣، بپ٧٥.

٥. مدیریة الاثار العامة، اطلس المواقع الاثریة فی العراق، (بغداد: ١٩٧٦).

٦. هەمان ژێدەر.

٧. خضر دوملی، فەیدیێ (فایدة) والاسطورة الضائعة، ژێدەرێ بەرێ، بپ٧٣.

٨. پێزانینێن عەردی ژ هۆبا چاندنا فەیدیێ هاتینە وەرگرتن.

٩. دكتور عەبدللا غەفور، گوندەكانی باشووری كوردستان ...، بپ ٥٥.